# ئینسکلۆپیدیای مێژوونامە

## لە 1901/1/1 تا 1950/12/31

عەلی کەندی

بەرگی دووەم - چاپی دووەم

بژارکراو و پترکراو

باشووری کوردستان - هەولێر

2709 - 2009

گەنجینەیەکی پڕ لە مێژووی ڕووداوی کۆمەڵگاکانی جیهان لەهەموو بوارەکان لەماوەی بیست سەدە دا

# ئینسکلۆپیدیای مێژوونامە

## لە ١٩٠١/١/١ تا ١٩٥٠/١٢/٣١

عەلی کەندی

بەرگی دووەم - چاپی دووەم
بژارکراو و پترکراو
باشووری کوردستان - هەولێر
٢٠٠٩ - ٢٧٠٩

**وەزارەتی رۆشنبیری و لاوان**

**بەڕێوەبەرایەتی گشتیی رۆژنامەنووسی و چاپ و بڵاوكردنەوە**

**ناوی كتێب: ئینسكلۆپیدیای مێژوونامە**

**نووسینی: عەلی كەندی**

**دیزاینی بەرگ: دانەری مێژوونامەكە – عەلی كەندی**

**كۆمپیوتەر: نووسینگەی هیوا بۆ كۆمپیوتەر**

**بەرگ: بەرگی دووەم ٢٠٠٩**

**چاپ: چاپی دووەم ٢٠٠٩**

**چاپخانە: چاپخانەی وەزارەتی رۆشنبیری و لاوان - هەولێر**

**تیراژ: ١٥٠٠ دانە**

**نرخ: بۆ هەرچوار بەرگ (٢٠٠٠٠) دینارە**

**لەبەڕێوەبەرایەتی گشتی كتێبخانە گشتییەكان/ ژمارەی سپاردنی(٢٢٥٥) ساڵی (٢٠٠٩)ی پێدراوە.**


-------------------------


**بۆ هەر رەخنەیەك یان پێشنیارێك یان هەر زانیاریەك لە هەڵەو بەسەرچوون ئاگادارمان بكەنەوە بە ژمارەی مۆبایـــــل/ ٤٥٤٨٠٩٨ ، یـــان ژمـــارەی ئاریـــافۆنی / ٠٦٦٢٥٣٣٥٢٢- یـــان ئیمێلی:Alikendi@yahoo.com**

# دەسپێك بۆ چاپی دووەم

لە گەڵ پەرەسەندن وپێشکەووتن و گەشەکردن و بووژانەوەی بەردەوام بە پێی تێپەر بوونی قۆناخە یەك لە دوای یەکەکانی مرۆڤایەتی لە هەموو بوارەکانی رامیاری و نەتەوەیی و نیشتمانی و جووگرافی و زمان و مێژوو وکەلتوورو داب و نەریت و شووێنەوارو شارستانیەت ، و بازرگانی و پیشەسازی وکشتووکاڵ و .........هی دیکە

ئەمەش پێداویستی ژیان بە زانیاری تەواو لەم بوارانەدا هەیە ، لە پێناو هەلسەنگاندن و شیکردنەوەی رووداو بەسەرهاتەکان لە هەموو بوارە جیاجیاکان و گوونجاندنی لەگەڵ ئێستا دا ، ئەویش لە پێناو هێنانە کایەوەی بارێکی لە بارەو گوونجاوتر بۆ خزمەتکردنی مرۆڤایەتی ، بە دابین کردن و سەقامگیرکردن و مسۆگەر کردنی داد پەروەری کۆمەلایەتی و دانان بە مافی مرۆڤ و چارەسەر کردنی کێشە تەشەنە دارەکانی لەو بوارانەی کە لە سەرەوە باسمان کردن ، بە تایبەتی لە بوارەکانی نەتەوەیی ونیشتمانی و زمان و مێژوو و مێژووی جووگرافی و کەلتوور داب ونەریت و شووێنەوارو شارستانیەت وچارەسەر کردنی لە رێگەی دەست لەناو دەستدا و رازی بوون بە بەرامبەرەکە ، کە سەرچاوەی چارەسەری هەموو کێشەکانە ، بە دوورکەوتنەوە لە هەرەشە لێك کردن و پەلاماردانی یەکتری و بە پێچەوانەشەوە لە رێگەی گفتووگۆو دایلۆگ ودانی مافە زەوت کراوەکان لەلایەن دەسەلاتداران .

جا من نامەوێ بە درێژی بچمە ناو باسەکەم ، بەلکوو پێشەکیەکەی چاپی یەکەم وبەرگی یەکەمی مێژوونامەکە ، ئاماژەم بە هەموو لایەنەکان کردووە بە شێووەیەکی لە بار لە بوارەکانی پەرەسەندن و پێشکەووتن ، بە پێی تێپەربوونی قۆناخەکان .

وادیارە مێژوونامەکە جێگای خۆی کردۆتەوە لە دەرونی خووێندەواران وسەراکەوتنی بە پلەی ٨٥ ٪ ی بە دەست هێناوە . بەڵگەش بۆ ئەمە بەرگی یەکەمی مێژوونامەکە بە تیراژی ٤٥٠٠ دانەی لەلایەن وەزارەتی پەروەردەی حکوومەتی هەرێم لە باشووری

كوردستان كراوەتەوە و بۆتە سەرچاوەیەكی سوود لێوەرگرتن وەك سەرچاوەیەك . كە بووە هۆی ئەوەی كە داواكاری زۆری لە سەر بێت .

جا منیش بەو پەری دڵخۆشیەوە مێژوونامەكەم ، لە چوار بەرگدا دەخەمە بەردەستتان بە شێووەیەكی تێرو تەسەل لە هەموو بوارەجیاجیاكان . بە ناوێكی دیكە كە – ئینسكلۆپیدیای مێژوونامە – یە وەك بوارەكانی رامیاری و نەتەوەیی و نیشتمانی و جووگرافی و زمان و كەلتوورو مێژوو شووێنەوارو ئابووری و بازرگانی وكۆمەلایەتی و رۆشەنبیری و زانست و ئەدەب و گەردوون و یاساو شەڕو ئاشتی و بە بەڵگە نامەكان . ئافرەت و رووداوەكانی تیرۆرستەكان و فرۆكەو پزیشك و .... ئەوەی بتەوێ لە بەر دەستت دایە لە ناوەرۆكی مێژوونامەكەدا .

كە بەرگی یەكەم لە ١/١/ ١٠٠٠ دەست پێدەكات تا ٣١ / ١٢/١٩٠٠ ، هەروا بەرگی دووەم لە ١٩٠١/١/١ دەست پێدەكات تا ١٩٥١/١٢/١٣ ، بەرگی سێیەم لە ١٩٥١/١/١ دەست پێدەكات تا ٢٠٠٠/١٢/٣١ ، هەروا بەرگی چوارەم لە ٢٠٠١/١/١ دەست پێدەكات تا ٢٠٠٧/١٠/٣١ .

لە هەمان كات بە پێی پێویست وێنەكانیشی لەگەڵ دانراوە لەگەڵ نەخشە جیاجیاكان بە پێی رووداوو بەسەرهات و ئەنجام دانی بەرۆژو مانگ و ساڵ . بەلام بۆ ئەوەی وێنەو نەخشەكان دووبارە نەبنەوە دەتوانرێت لە جێگەی دیكە سەیری بكەیت لە ناوە رۆكی ئینسكلۆپیدیای مێژوونامەكەدا ، لە هەمان كات نەم ویستووە وێنەكان دووبارە ببنەوە . وەك بەڵگەیەكی راست و دروست و رێك و پێك .

لە كۆتایی هیوادارم خزمەتێكی بچووكی كتێبخانەی كوردی و خووێنەری كوردم كردبێت لە كوردستان و وولاتانی دراوسێی كوردستان و هەرێم و ناوچەو جیهان .

**عـــەلی كـــەندی**

دانەری ئینسكلۆپیدای مێژوونامە

٣١ / ١ / ٢٠٠٩

# بەرەو چەندین ئینسکلۆپیدیا
# کە هەموو لایەنەکانی ژیان بگرێتەوە

**پارێزەر/ تارق جامباز**

ئەم خەمخۆریە تاقە کەسییە کە لایەن مامۆستا عەلی کەندی ئەنجامدراوە شایانی سوپاس و پێزانینە ، چونکە پشوویەکی فراوان و ماوەیەکی زۆرو ئارامیەکی ئەیووبیانەی گەرەکە ، لە بەر ئەوەی ئەم ئینسکلۆپیدیایە چەندین ئینسکلۆپیدیا لە خۆدەگرێ .
لە وولاتاندا بۆ هەر بوارێك لەم بوارانەدا دەزگایەك بە کۆمەڵێ پسپۆرو شارەزاو لێزان بەماوەیەکی دیاریکراو بەمەرجێ هەموو کاتێکیان بۆ جۆرێك لەجۆرەکانی ئینسکلۆپیدیا تەرخان دەکەن وەك – ئینسکلۆپیدیای زمان ، فۆلکلۆر ، سیاسەتمەداران ، شاعیران ، رۆژنامەنووسان ، ...هتد
ئەم ئینسکلۆپیدیانە لە کتێبخانەکانە و لەسەر تۆری ماڵپەرەکان هەن و هەروەختێ یەکێك ویستی لە چ بوارێك پێویستی پێی هەبێ ئەوا بە ئاسانی دەتوانێ سوودی لێ وەربگرێ ، بەڵام بەداخەوە لایەنی پەیوەندار لە کوردستان چ حکوومەت و دەزگاکانی تایبەتمەند نەمزانیووە پلانێکیان بۆ ئەم بوارانە هەبێ کە بەشێوەیەکی بابەتی و زانستی زانیارییەکان لەلایەن خەمخۆرانەوە بەووردی و قووڵی بنووسرێنەوەو پێداچوونەوەیان بۆ بکرێ .
ئینجا چاپ و بلاوبکرێنەوەو جارێ خەرمان بەرەکەتی زمانی کوردی بەهەموو شێووە زارەکانی کۆنەکراونەتەوەو تاکو لەبەردەست دابێ ، ئەوجا دەزانین چ زمانێکی زەنگین و رەنگینمان هەیە .

لە بەر ئەوەی زمان ناسنامەو گیانی نەتەوەیە هەر نەتەوەیەك بێ ، بۆیە هەرچەندی بایەخ و گرنگی و بەها بەزمانی کوردی و زمانی نەتەوەکانی دیکە کە لە کوردستان دەژین بدرێ هێشتا کەمە .

چونکە هێندەی تر هزرو رۆناکبیری و ووشیاری نەتەوایەتی پێگەیشتن و پێشکەوتنی بەخۆیەوە دەبینێ و گەر خاك نیشتمان و وولات بێ ، ئەوا زمان گیانەکەیەتی و هەڵگری ناسنامەی تایبەمەندیەتی لەنێوو زمانانی جیهاندا هەیە .

ئەندامی پەرلەمانی کوردســـــتان
باشووری کوردســـــــتان – هەولێر
٢٠٠٩/٨/١

# کارێکی کەلتووری مەزن

• • • ئەم کارەی پیشەسازییەی ووشە :

الزمان
AZZAMAN.COM

... ئەم کارەی پیشەسازییەی ووشە :
(( ئینسکلۆپیدیایە - مێژوونامە - ))
قەلایەکی کلتووری مێژووی مەزنە ، وەکو
قەلاکەی شاری مێژوو - هەولێر - ،
هەردەم زیندووە .
بەلێ ، کارگە پیشەسازییەکەی
ماموستا عەلی کەندی ، مەزنترین
سەرمایەی کوردو کوردستان و مروڤایەتییە .
لە لایەنی دارشتن و زمانەوانییەوە ، خۆزگە
باشتر بوایە ..
مومتاز حەیدەری
٢٠٠٩/٧/٧

(( ئینـــــسکلۆپیدیایە — مێژوونامـــە )) قەڵایـــەکی کلتووری مێژووی مەزنە ، وەکـــو قەڵاکـــەی شـــاری مێـــژوو — هـــەولێر — ، هەردەم زیندووە .

بـــەڵێ ، کارگـــە ووشـــە سازیەکەی مامۆستا عەلـی کەنـــدی ، مـــەزنترین ســـەرمایەی کـــوردو کوردستان و مرۆڤایەتیە .

لـــە لایـــەنی دارشـــتن و زمانەوانییـــەوە ، خۆزگـــە باشتر بوایە .

مومتاز حەیدەری

باشووری کوردستان — هەولێر

٢٠٠٩/٧/٧

# پــــێشـــــەکی

لە یەکێك لـە ژمارەکانی گۆڤاری مێرگ چەند تێبینیەکم لـە سەر چاپی یەکەمی کتـێبی – مێژوونامـە – ی نووسـەر – عـەلی کەنـدی – نووسـیبوو ، دیـارە ئەمـەش لـە بایەخی بەرهەمەکەی کەم ناکاتەوە ، چونکە ئەگەر بزانم کتێبێك لاوازە و کەم بایەخە کاتی خۆم و خوێنەرانی پێ ناکوژم و هەر لە سەری نانووسم ، بەڵام دیارە کتێبەکەی نووسـەر عـەلی کەنـدی لـەم جـۆرە نییـە ، پـاش ماوەیـەك عـەلی کەنـدی بـە تەلـەفۆن پەیوەندی پێووە کردم و باسی لەوە کرد کە مێژوونامەکەی کردووە بە چوار بەرگ و دەیەوێت بۆی بەسەردا بچمەوە و پێشەکی بۆ بنووسم .

منـیش خۆشـحاڵی خـۆم پێـشانداو کاتێکمـان بـۆ یـەکتر بیـنین دانـا ، ئـەوە بـوو ئێوارەیـەك سـەردانی بارەگـای کۆمەڵـەی رۆشـنبیری مێـژوویی کوردسـتانی کـردو دڵخۆش بووم بەوەی کە هاورێیەکی نوێم بۆ پەیدابوو ، بەڵام بینیم کە چوار بەرگەکە زۆر گـەورەن و ژمـارەی لاپـەرەکانی زۆرە ، بۆیـە داوای کـاتێکی باشـم کـرد بـۆ ئـەوەی بتـوانم پێداچـوونەوەی بـۆ بکـەم ، بەڵام دیـارە ئـەویش بـە پەلـە بـوو بۆیـە بریارمـدا لـە کـاتێکی کـەمتردا ئەرکەکـەم ئـەنجام بـدەم ، بـەڵام بـە هـۆی سـەرقاڵیم و کـەمی کـات و گەورەیی بابەتەکە لە چوار بەرگدا نەمتوانی بە تەواوی بەسەر بابەتەکەدا بچمەوە ، بۆیـە لەوانەیـە ئەم بەرهەمـە وەکو بەرهـەمێکی تـر لـە هەڵـەی چاپ و هەنـدێ جاریش هەڵەی زانیاریش بەدەرنەبێت ، بەڵام لە هەمان کات کارێکی مەزنە بە مانـدووبوونێکی زۆر ئەنجام دراوە .

نووسـەرێکی دڵـسۆزی وەك عـەلی کەنـدی پێـی هەڵـساوە ، کە پێویـستە هـان بـدرێت و پشتگیری لـێ بکـرێ تـاکو بەرهـەمی زیـاتر پێشکەشی کتێبخانەی کوردی بکـات ، بە تایبەتی کە هێشتا کتێبخانەی کوردی لە زۆر بواردا هەژارەو، ئێستاش نەوەی نـوێ لـە کوردستانی ئێراقدا پتر هەر زمانی کوردی دەزانـن ، بۆیـە چاپکردنی کتێبی کـوردیش لە هـەموو بوارەکانـدا بەشداریکردنە لـە بەرەو پێشبردنی رەوتی رۆشـنبیری کـوردی ،

بۆیـە داوا لـە خوێنـەران و ڕەخنـەگرانی کـورد دەکـەم کـە بـە بایەخـەوە سـەیری ئـەم بەرهەمە
بکەن و بیخوێننەوە و لە سەری بنووسن و لایەنە چاك و خراپەکانی بە دیار بخەن ، تاوەکو گەر هەر کەم و کوڕیەکیشی هەبێت لە چاپەکانی تردا ڕاست بکرێتەوە .
نووسەر کارێکی زۆر باشیش دەکات کە نووسینی خۆی پێش چاپ کردن بە خەڵکانی تر پیشان دەدات ، چونکە مرۆڤ ناتوانێت هەموو هەڵەکانی خۆی ببینێ ، لە کۆتایشدا هیـوادارم کـە عـەلی کەنـدی ئـەم توانـا باشـەی هەیـەتی لـە بـواری کۆکردنـەوەو ساغ کردنـەوەی بەڵگەنامـەی تایبـەت بـە میـژووی کـورد و لێکۆڵینـەوەی مێژوویـدا بەکاربهێنێت . بەمـەش بابەتـەکانی نووسـینی لـە باشـەوە بەرەو باشـتر دەچێت و هـەر نووسـەرێکیش لە پرۆسەی نووسیندا بریتیە لە چەند قۆناغێك .

د . محەمەد عەبدوڵڵا کاکە سوور

جێگری سەرۆکی کۆمەڵەی ڕۆشنبیری مێژوویی کوردستان و سەر نووسەری گۆڤاری مێژوو سەرۆکی بەشی مـێژوویی ئێواران / لـــە کۆلیـژی ئاداب لە زانکۆی سەلاحەدین

٢٠٠٩/٧/ ٢٥

# پێشــەکی

## دوکتۆر مارف خەزنەدار

فەرهــەنگی زمــان و ئــەدەب و زانــستی و هونــەر بەهــەموو بابەتەکانیــەوە، هــەروەها ئەنسیکلۆپیدیاو رێبەری هەموو شتێك و بیبلیۆگرافیای تایبەتی و گشتی لەگەڵ گۆڕان و پێشکەوتنی کۆمەڵ نرخیان گرانترو پێویستیان زیاتر دەبێ. ئەگەر لەڕۆژگاری ئەمڕۆی تەکنۆلۆجیاو ئەنتەرنێت و مۆبایل بیری کەسانێك بۆ ئەوە بچێ سەرچاوەکانی فەرهەنگی زمان و ئەنسیکلۆپیدیاو بیبلیۆگرافیا ئەو نرخەیان نامێنێ، یا کەس پێویستی پێ یان نابێ بەهەڵە چووە، چونکە هێشتا ئەم ئامارە تازە داهاتوانە بەسەرهات و کردەوەو پاشماوەی مەدەنیەتی چەندان هەزار ساڵەی ژیانی ئادەمزادیان تۆمار نەکردووە لەمرۆڤی نیاندرتالەوە تا ئادەمزادی سەردەم.

ئەمە ماوەیێکی زۆری دەوێ، جگە لەوەی ئەم ئامارانەش لەبەردەستی هەموو کەسێك نین، تەنیا خوێندەوار کەڵکیان لێ وەردەگرێ. ئەدی نەخوێندەوار لەسەر رووی زەوی ژمارەیان چەندە! نەك تەنیا ئەمە، بەڵکو بەتایبەتی لەهەموو ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست و کوردستان ژمارەی نەخوێندەوار چەندە !... لەبەر ئەوەی ئەو سەرچاوانەی باسم لێوەکردن لەناو کۆمەڵی ئێمەی کوردەواری بایەخیان پێ نەدراوە، لەم لایەنەوە نامەخانەی کوردی هەژارە، لێرەدا پێویستە ئەوەمان لەیاد نەچێتەوە یەکێ لە مەرجە هەرە گرنگەکان ئەگەر کۆمەڵە خەڵکێك خۆیان بە نەتەوە (الأمة Nation) بزانن پێویستە تۆماری زمان و ئەدەب و مێژوو و جوگرافیاو کولتووری نەتەوەیی یان هەبێ، ئەوەی ئەم هەموو مەرجە کولتووریانە دەپارێزێ و ڕێکی دەخا ئەو کارەیە کە بەشێکە کەوتۆتە ئەستۆی عەلی کەندی.

تاقیکردنەوە لەناو کوردەواری ئێمەدا لەم بابەتەوە کەمە، ئەوەی کراوە لەو پلەیەدا نییە باوەڕی تەواوی پێ بکرێ، چونکە دوو هۆی سەرەکی دوژمنی ئەم جۆرە کارە زانستییانەن، یەکەمیان ئیدۆلۆجییەت و دووەمیان سۆزی نەتەوەیی (قەومی)، ئەم دیاردانە هەوێنی کاری داهێنانی ئەدەبی و هونەرین، بەڵام پێویستە زۆر دووربن لە کاری لێکۆڵینەوەی زانستی، بەتایبەتی فەرهەنگ و ئەنسیکلۆپیدیا. لەناو میللەتانی کەم پێشکەوتوودا شوێنەواری ئەم دوو ڕەوشتە سایکۆلۆجی و کۆمەڵایەتیە تا پلەیێك دەمێنێ.

عەلی کەندی خۆی لەم کارە قورس و پڕ هەوەس و بە کەڵکە داوە، بۆ ئەوەی ئەم لایەنەی نامەخانەی کوردی هەندێ دەوڵەمەند بکا. بەناوی ڕێز لێنانەوە پێی خۆش بوو دوو قسەی بۆ بکەم، منیش بەناوی ڕێز لێنانەوە پێویستە داواکاریەکەی بهێنمە دی.

ئەم کارەی دانەر بەبێ سەرچاوە نەگەیشتۆتە ئەنجام. ئەم سەرچاوانەش دەکرێن بە دوو بەشەوە، سەرچاوەی ڕۆژئاوایی و ڕۆژهەلاتی. ئەوانەی ڕۆژئاوا مەرجی ڕاستی و بابەتیان تێدا هەیە، بەلام سەرچاوە ڕۆژهەلاتیەکان، بەتایبەتی کوردییەکان هەندێ جار جێی متمانە نین، چونکە ئیدیۆلۆجییەت و سۆزی نەتەوەیی تیایاندا کاری خۆیان کردووە، لەو کاتەی ئەو جۆرە فیکرو سۆزە پێویستە لەکاری لەم بابەتەوە دوور بکەونەوە، هەر چۆنێ بێ ئەگەر شێوازی ئیدیۆلۆجی و عاتیفی لەهەندێ جێگە لەم کارە گرنگەدا بەرچاو بکەوێ دەگەڕێتەوە بۆ سەرچاوە ڕۆژهەلاتیەکان بەتایبەتی کوردییەکان، هەروەها ئەم دیاردەیە هەندێ جار لەسەرچاوە ئەوروپاییەکانیش دەکەونەبەرچاو، بەوەی ئەو کتێبانەی لەزمانانی ئەوروپاییەوە وەرگێڕدراونەتە سەر زمانی کوردی لەهەندێ شوێن ئەمانەتی زانستیان تێدا وون بووە یا بەشێوەیێك دەسكاری كراون.

هەر چۆنێ بێ ڕۆشنبیری کورد عەلی کەندی کارێکی گەورەی کردووە، ئەمە تەنیا لە کتێبی "مێژوونامە"دا ناکەوێتە ڕوو، بەڵکو لەپێش ئەوە هەندێ کاری دیکەی لەم بابەتەوە بەرهەمی ئەو کۆششە بووەو بلاوکراوەتەوە. هەروەها لەکارەکەی دا بەردەوامە بۆ بەرهەمهێنانی فەرهەنگو ئەنسیکلۆپیدیای بەکەڵکی دیکە.

لەم مەیدانە گرنگەی کولتووری هەموو نەتەوەیێك عەلی کەندیش دەبێتە سەربازی نەناسراوی ئەو جۆرە کارە زانستیانە. ئەمانە نەك تەنیا لای ئێمە، بەڵکو لەهەموو گێتی دا سوود بەخوێندەوارو ڕۆشنبیران دەگەیەنن، کەچی نووسینەکانیان دەبن بەسەرچاوەی بنچینەیی بۆ هەموو جۆرە بەرهەمێك، بەلام ناویان ناچێتە ناو بیبلیۆگرافیای ئەو کتێبانەی خاوەنیان سوود لەکارە فەرهەنگیەکانیان وەردەگرن.

دەسخۆشی لەبەڕێز عەلی کەندی دەکەم، هیوام وایە لەسەر کارەکەی بەردەوام بێ، هەمیشە ئەوەی کردوویەتی بەکەمی بزانێ بۆ ئەوەی زیادی بکا.

**هەولێر : مەڵبەندی ڕووناکی**

**٤ ی مایسی ٢٠٠٧**

# دەســپێك بۆ چاپی یەكەم

خووێنەری بەڕێز :- ئەوەی دەیخەمە بەر دەستتان كارێكی مێژوویی گرنگە لە مێژووی رووداوەكانی كوردو كوردستان و وولاتانی جیهان لە ٢٠٠١/١/١ زاینی تاكوو ٢٠٠٦/٦/١ بەپێی قۆناخە تێپەر بووەكانی پەرەسەندن و پێشكەووتن و گەشەكردن لە هەموو بوارە جیاجیاكانی نەتەوەیی و نیشتمانی و رامیاری و ئابووری و سەربازی و زمان و مێژوو كەلتوورو داب و نەریت و شووێنەوارو شارستانیەت.

لەسەرەتای سەرهەڵدانی مرۆڤ و مرۆڤایەتی بەرەو دامەزراندنی كەسایەتی تاك و خێزان و بنەماڵەو كۆمەڵگاو نیشتمان و نەتەووەو زمان و مێژوو و داب و نەریت و كەلتوورو شووێنەوارو بەرەو شارستانیەت، بەپێی قۆناخە یەك لە دوای یەكەكان ، كە هەر هەمووی لە ئەنجامی كێشەو ململانێی بەردەوام بووە چ لە ململانێی مرۆڤ لەگەڵ سرووشت و سەلماندنی بوونی خۆیی و چ لە ململانێی ناو خوودی مرۆڤایەتی . لەپێناو پێك هێنانی یەكەم:- نیشتمان و، دووەم :- نەتەووەو دووایی بە چەسپاندنی سنوورو دەسەلات و دەووڵەت و بەرەو دام و دەزگاكان .

كە كوردیش نەتەوەیەك بووە لەپێشەوەی بەر لە نەتەوەكانی دیكەی سەر زەوی لەناو ئەو كێشەوململانێیەدا خوولایتەوە ، كورد بەر لە ٢٨٤٥ ساڵ خاوەنی ٢٧ وویلایەتی خۆیی بووەو ٢٧ سەرۆك و شانشین دەسەلاتداریەتی نیشتمان و گەلەكەیان كردووەو بەردەوام بوونە لە پاراستنی دەسەلاتەكەیان ، كە پایتەختەكەیان هەمەدانی رۆژهەلاتی كورستان بووە، خاكی كوردستان و گەلەكەی سەرچاووەی یەكەمی بە دەست هێنانی باری پیشەسازی و كشتووكاڵ و بناسازی و بازرگانی بوونەو سەرچاووەی پەرەسەندن و

پێشکەوتن و گەشەکردنی گەلانی دیکە بوونە . بە تایبەتی سۆمەری و بابلی و هەروا،... هەتا لە بوواری نووسین بەهەموو بووارەکانی کە بەر لەو مێژووەی سەرەوە لەسەر خاکی کوردستان گەلەکەی نووسین و خوێندنی بەدەست هێناوە . لە بەرئەوەی مێژوو و جووگرافیا جەستەیەکی زیندووی هاوبەشن لە دوو رێگای هاوسەنگ بە سەلماندنی بوونی یەکیان بۆ ئەویدیکە بە پێچەوانەش راستە.

جا هەر کارێکی سەربازی یاخوود نەتەوەیی . یاخوود جووگرافی و ئابووری ، کە رۆڵی بنەڕەتی خۆی هەبووەو هەیە لە کاردانەوەی لەسەر لایەنەکەی دیکە بە هۆی دابەش بوونی کۆمەلگای مرۆڤایەتی بەدوو بەشی دژ بەیەکتر لەسەرەتای سەرهەڵدانی مرۆڤ و کۆتایی نایەت تا کووتایی مرۆڤ ئەویش بە نەمانی ژیان لەسەر زەویدا .

زانستەکانی مێژوو سرووشت و کۆمەلایەتی ئەوەیان سەلماندووە کە مێژوو گەنجینەیەکە و باش و خراپ دەچێتە ناو لاپەرەکانی... مێژووی پەرەسەندنی قۆناخە یەك لە دووای یەکەکانی مرۆڤایەتی لە کردارە نالەبارو لەبارەکان ... لە نێووان چەووسانەووەو چەووسێنەرەوە ... لە داگیرکردن و لە رزگار کردن... لە سەرکەووتن و لە ژێرکەووتن و بەزاندن... لەئاوەدان کردنەووەو لە ووێرانکردن ... لە دەووڵەمەند بوون و لە بەهەژار کردن... لە بوون و لە مردن... لە سەرهەڵدان و لە تووانەوە ... لە قەدەخەکردن و لە ماوەدان ... لە دادپەروەری و لە ستەمدیدەیی ... لەدزین و تالانکردن و لە یارمەتیدان و پێدان و دابین کردن... لە راست گۆیی و لە ناراستی و فرت و فێل ... لەخۆشی و لە کارەسات ... لەداگیرکردن و لە ئازادکردندا.

ئەمانە هەرهەمووی بەکاری مێژوویی دەچێتە ژوورەکانی تۆمارکردن هەر یەکەو لە لاپەرەکانی خۆی بەجیاو ، هەر یەکێش لەووانە بەیەکەوە بەستراووەنەتەووەو هێزیش نیە بتووانێ یەك دێر لە دێرە تۆمارکراوەکانی مێژووی تۆمار کراو بشێووێنێ، چونکە بە ملیۆنەها لاپەڕە خۆی تۆمار

کردووەو بێ ئەوەی کرداری کارەکە هەستی پێ بکات لە بەرامبەریدا.

بەڵام لە دوای خۆتۆمار کردنەکانی وردە وردە خۆی دەردەخات و راست و چەووتەکان و باش و خراپەکان بە رووی کرداری کارەکە دا دەداتەوە بەپێی قۆناخە یەك لەدوای یەکەکاندا .

خوێنەری بەڕێز :- چ سرووشت و چ مرۆڤ ، دوو جەمسەری بەیەکەوە بەستراون لەخەبات و هاوبەشی بەیەکەوە ژیان و یەکیان بەبێ ئەویدیکەیان بەمردوو دەمێنێتەوە، لەهەمان کات دژ بە یەکترن لەپێناو خزمەتکردنی یەکتری لە ناو هەر یەکیان ، بە مانایەکی دیکە، کۆمەڵگای مرۆڤایەتی خۆی لە خۆیدا کێشەو ململانێیە لە دوو جەمسەردا ، هەروا لەناو سرووشتیشدا... بەپێی یاساکانی کۆمەڵ و سرووشت وەك یاساکانی (وحدة وصراع الاضداد- نفي نفي- كمية و نوعية- الشكل والمحتوى- الصدفة والضرورة).

جا لە بەرئەوە بەپێی پەرەسەندنی تەمەن ، پەیتا پەیتا ساتەکان و کاتەکان و رۆژەکان و چاخەکان ، سەرکردەکان دێن و دەڕۆن و رادەبوورن... چونکە هەر کارێك گەر سەرەتای هەبێت کۆتایی هەیەو بەپێچەوانەش زۆر راستە ... لەبەر بوونی کێشەو ململانێ و تەنگ و چەلەمەی نێووان ئایین و زانست لەناوچەو هەرێم و جیهان ، لە پێناو سەرکەووتنی یەکیان بەرامبەر ئەوویدیکەیان و لەناووبردنی یەکیان بەرامبەر ئەوویدیکەیان بەردەوامە.

ئەوەی من بیری لێدەکەمەووەو کردوومەتەوە . هیچ شتێك کۆتایی نیەو مالانهایەیەو هەردەم لە گۆڕیندایە بۆ گۆڕانێکی دیکە ، گەر وونیش بێت لە قۆناخێك بۆ قۆناخێکی دیکە.

واتە مێژوو خوول دەخوواتەووەو ژیانیش بەردەوامەو بەردەوام دەبێ ، گەر قەدەری لێك ترازانی گۆی زەوی لەگەڵ کۆمەڵەی رۆژەکانی دیکەو بە بوونی بەزریانێکی خوڵاوی و بەرەو ئەستێرەیەکی دیکەی بەهێزتر، ئەوکات ژیان لە سەر ئەو زەویە کۆتایی دێت لە سەر ئەم هەسارەیەدا .

دڵنیاشم لەووەی کە ژیان لە سەر ئەستێرەی دیکە لە گەردوون دا هەیە وەك

ئێستای ئێمەو هەمان باروو دۆخ دەگرێتە خۆ، بەڵام لە شێووەو شێووازێکی دیکە ، بە هەمان یاساکانی کە لە سەرەوە باسم کردووە . کە ئەو پێنج یاسایە بەندە بە پەرەسەندنی کۆمەلایەتی و سرووشت... سەرجەم رۆژەکانی هەفتەو مانگو ساڵ پڕن لە رووداو کارەساتی پر لە خۆشی و ناخۆشی و فرمێسك رشتن و پێکەنین لە هەموو بووارو لایەنە جۆراو جۆرەکانی ژیان چ بە نەخشێنراو چ بەخۆڕسکیەوە.

خووێنەری بەڕێز:- بەر پابوونی رووداوەکان چ ناخۆش و جەرگبڕبن یاخوود رووداوی مووژدەبەخش و دلخۆشکەر بن ... لاپەرەکانی مێژوو بەدەست پاکی و بەئەمانەتەوە لە لاپەرەکانی رۆژنامەی ژیانی خۆی تۆماریان دەکات ، گەر تۆو هەر کەسێکی دیکەو لایەنێك و هێزێك و بنەماڵەیەك بەرگری لە خۆی بکات... چونکە مێژوو لە گەڵ پەرەسەندنی ژیان بەردەووامە، مرۆڤ مێژوو دورست دەکات بەپێچەوانەش راسترە ، بێ ئەوەی هەستی پێ بکات و مردنی بۆ نیە ، تەنیا مرۆڤ و ئاژەڵ و گیان لەبەروو داروودرەخت و شاخ و داخ نەبێت . کە بوون و مردنی تیا بەردەوامە هەر یەکەو بەپێی بارودۆخی تەمەن.

کارووانی پەرەسەندن و پێشکەووتنی مرۆڤایەتی لە قۆناخە جیاجیاکاندا ،. کە نەتەوە سەرهەڵدەدەن و دەتووێنەوە ، چیاو شاخ و دۆڵ تەخت دەبن و چیاو دۆڵ و شاخی دیکە سەرهەڵدەدەن، دەریا لەجێگەی خۆی وون دەبێ و لەجێگەی دیکە سەر هەڵدەدەن ،. هەروا بەرامبەر بە سرووشت و گەردوون و مرۆڤ و کەش و هەواو ئەستێرەکان ، کە هەر هەمووی بە یاساکانی سەرەوە بەستراوەتەوە ،. لەهەمان کات مێژووش لەناو ئەو یاسایانە لەکارەکانی خۆی بەردەوام دەبێ ، لە بە ئەنجام گەیاندنی کاری فەرمانبەریەتی خۆی لەکات وساتەکان و کاری ئەمرۆی ناخاتە رۆژی دوواتر لەهەموو بوواره جیاجیاکاندا.

جا بە هەر حاڵ ئەمڕۆ بەچاوی خۆمان دەبینین ، کەباروودۆخی ناوچەو هەرێمە جیاجیاکان و وولاتانی جیهان بەقۆناخێکدا تێپەدەڕێت کە لەژێر دەستی

سەرەك كۆمارو شانشینو ئەمیرو سەرەك پارتو گرووپو رێكخراوی نەتەوەییو نیـــشتمانیو ئیـــسلامیو كۆمەلایـــەتیو ئـــابووریو بنەماڵـــە بـــەبوونی داد پەروەریو نەبوونی دەكەوونە بەر دەستی سزای گەلْ بەپێی تۆماركراوەكانی مێژوو بۆ دادگایكردنیان لەدزینی سامانە هەمەجۆرەكانی گەلْ ونیشتمان ، لە هــەموو بــواره جیاجیاكــانو هــەنگاوونان بــەرەو چەســپاندنی دادپــەروەری بەرێنماییــەكانی مێــژوو، بــەرامالْینی بــیروو بۆچــوونی چــەووتی خۆپەرســتیو خۆویــستیو فەســادو دزی وگەنــدەلْی، بەهێنانەكایــەوەی دادپــەروەری لــەكارو ژیانو لەئەركو مافدا...!!

بۆ مێژوو دەڵێم توركو فارسو عەرەب ، لە هـەمووكاتو سـاتێكدا دووژمنــی یەكتر بوونە بەپێیْ رووداوەكانی مێژوو . لە هـەموو بوارەجیاجیاكان،.. تـەنیا لەسەر چاسـەرەنەكردنو پێشێلْ كردنی مافی كورد، هاووخـەباتو هاووبـەشو هاووخـــەمی یـــەكتر بوونـــە ، . بەتایبـــەتی لـــە دوای دروســـت كردنـــی ســـنووری جووگرافی وولاتەكانیان لەسەر خاكی گەلانیَ هەرێمەكە بەتایبەتی لە سـەرخاكی كوردستان...!.

سـەركردایەتی كوردیش بگرە لـە سـەرەتای بوونی دەسەلاتیان لەسـەر تـیرەو هـۆزو ئیمـارتو بنەماڵـەو پارتو رێكخـراو لـە هـەموو بـواره جیاجیاكـان دژی یـــەكتر بوونـــەو مێـــژوو بـــوونی گـــەلو نیـــشتمانیان پڕكردۆتـــەوە لـــە شـــەڕی خۆكـــووژیو كێـــشەو ململانـــیْ ، لـــە ئاســـانكاری كـــردن بـــۆ دووژمنـــانی گـــەلو نیشتمان، تەنیا لە سەر دەسەلاتو سامان كۆك بوونە ، كە ئەمـەش دوو هۆكـاری سەرەكی بنەڕەتی بوونە لە نەگەیشتنی كورد بە وولاتێكی سنووورداری قەوواره سەربەخۆ . وەك وولاتانی دیكەی جیهان، كە كورد لەكیشووەری ئاسیا لەنەتـەوه یەكەمــەكانی ئـــەو كیـــشووەره بوونـــەو دوا نەتـــەوەش بوونـــە لـــە بەدەســـتهێنانی وولاتێكی سەربەخۆدا..!!..!!..

جا هیـوواداڕم لـەناوەڕۆكی پێـشەكیەكەم گەیـشتبن ، كـە ئـەوەی لەتووانامـدا هـــەبووەو دەســـتم كـــەوتووە لـــە مێـــژووی رووداوەكـــانی كـــوردو كوردســـتانو

داگیرکەرانی کوردستان و ناووخۆی کوردستان و گەلانی جیهانم کۆکردۆتەوە بەرۆژو مانگ و ساڵ لەو کتێبە تۆمارم کردووە بەدڵنیاییەوە .

دڵنیاشم لەووەی کە مێژووەکان لە ٩٩٪ راستن بەپێی مێژووی سەرچاوە کوردیەکان و عەرەبیەکان وبە تایبەتی بیانیەکان ، وەك لە کۆتایی کتێبەکە سەرچاوەکان هەمووی تۆمار کراوە ... لە هەمان کات بەشێووەیەکی رێك و دورست لە زجیرەیەکی یەك لە دووای یەك و ساڵ بەساڵ بەپێی دەست کەووتن و برووا پی بوون تۆمارکراون.

خووێنەری بەرێز:- لە کۆتاییدا هیووادارم خزمەتێکی بچووکی مێژووی گەل و نیشتمانەکەم و سەرجەم مێژووی گەلانی دیکەی جیهان و مرۆڤایەتیم کردبێ ، بە دەووڵەمەند کردنی کتێبخانەی کوردی، هیووادارم کە ئەم کتێبە ببێتە هۆکارێکی زیاتر دەووڵەمەند کردن و پەرەپێدان بە پەرتووکخانەی کوردی و بیانی . بەتایبەتی وولاتانی دراووسێیی داگیرکەری کوردو خاکی کوردستان ، بە تێگەیشتنیان لە راستیەکان و هەڵەی رابردوویان و گەرانەوە بە گرتنەبەری بنەماکانی ژیانی بەیەکەوەی سەردەمیانە لە هەموو بوارە جیاجیاکانی خۆیی و بوونی دراووسێیەتی برایانە...

هیوادارم کە یارمەتی دەرم بن لە هەر رەخنەیەك یاخوود کەمووکووریەك کە لەناوەرۆکی کتێبەکەم بەدی دەکرێ،.. تا بەهاووکاری و یارمەتی ئێووەی بەرێز راستبکرێتەوە ، بۆ زیاتر پووختکردنی ، کە مایەی خۆشحاڵی و دەستخۆشییە... ئەویش بە پەیووەندی کردن بەژمارە مۆبایلی ٤٥٤٨٠٩٨ یاخوود ثاریافۆنی ژمارە (٠٦٦٠٢٥٣٣٥٢٢)..

لەگەڵ رێزم بۆ هەڵگری ئەم مێژوونامەیە.

عـەلی کـەندی

باشووری کوردستان – هەولێر

٢٠٠٣/٣/١

گەر مێژووی کورد ٧٠٠ ساڵ بەر لە مێژووی زایینی بووبێت داخۆ جوولانەوەو خەبات و هەوڵەکانی بوونی کورد دەبێ چەندین ساڵ بەر لەو مێژووەش بوو بێت ، کە توانای گوونجان و لە باری کەش و باری دروستکراوی بۆ ڕەخسابێ ، تا توانیویەتی ئەو مێژووە بە چەسپاوی سەقامگیر بکات و لاپەڕەی تۆمارەکانی مێژووی پڕکردبێتەوە لە ناەچەکەدا .

گەر کورد خاوەنی دەسەڵاتێکی ئیمپراتۆریەتی چەند سەدەیەکی بەر لە مێژووی زایینی هەبووبێ ، دەبێ چەندین سەدە خاوەنی دەسەڵاتی ناوچەیی و ئیمارەتی و کەسایەتی بووبێ لە سەر خاکی کوردستان ... هەر وەك پێنووسەکانی ڕۆژهەڵاتناس و جووگرافیناس و مێژووناس و زماننـاس ، پێیان لەسەر چەندین لایەنی بواری بوونی هەر نەتەوەیەك و تیرەو هۆزو بنەماڵەیەك بەراوردو توێژینەوەی لە سەر لاپەڕەی نووسینەکانیان تۆمار کراوە ، بەر لە مێژووی زاین و دوای زاینیش . چەندین لایەنی ڕاستی و بێگومانی تیا مسۆگەر کراوە سەرەڕای وون بوونی هەندێ لە وردەکاری ڕاست کردنەوە لە هەموو بوارە جیاجیاکاندا .

بگرە لە تۆفانەکەی نوح پێغەمبەر بە دوواوە ، بە سەدا بەڵگە هەن کە بوونی سەرەتاییەکانی بوونی زمان و مێژووی کورد دەسەلمێنن . کە دەگەڕێتەوە بۆ ٧٠٠٠ ساڵ زیاتر بەر لە ئێستا ... بەڵگەش شووێنەوارو ناوەکانیان لە سەرەتای بوونیان تاکوو ئێستا ، وەك ئەشکەووتی شانەدەرو ئەشکەووتی هەزار مێرد ، کە بە کۆنترین شووێنەوار دادەنرێت لە کیشووەری ئاسیادا... واتە بوونی ووشەی زمانی کوردی لە کچەکەی نووح پێغەمبەر دەردەکەووێت کە ، ناوی شەونم بووە (شەونم یانی خوناو ... خوناو مانای ئەو دڵۆپە ئاوانەو تەڕاتیانەی لە بەیانیانی سەرەتای بەهارو مانگی بەهار لە سەر گژوو گیا دەکەوون لە سەر زەویدا ).

بەڵام من وەك نووسەرو ڕۆژنامەنووس نامەوێ لە هێڵە ڕاستیەکە لابدەم و خووێنەران هەست بەوە بکەن ، کە من مرۆڤێکی کوردی شۆڤێنیم . یاخوود بەرچاو تەنگم . کە ١٠٠٪ بە پێچەوانەم ...، بەڵام مافی خۆمە لە چۆنیەتی بوونی نەتەوەکەم بگەم لە هەموو بوارو لایەنە جیاجیاکاندا ، بگرە لە زمان و مێژوو داب و نەریت و کەلتوورو کەلەپوورو شووێنەوارو پیشەسازی و کشتووکاڵ و بازرگانی ... هەروا .

بەویژدانی خۆم و هەستی نەتەوایەتیم و تووێژینەوەم و شیکردنەوەم لە

بوارەکانی بوونی سەرەتای مرۆڤایەتی و ، لە سەرەتای پێکهاتەکانی ، بگرە لە بنەمای تاك وکۆمەڵ و تیرەو هۆزو نەتەوەو گەڵ ... ناڵێم کورد یەکەم پێکهاتەی نەتەوەیی بووە لەسەررووی زەویدا ، بەڵام گەر یەکەم نەتەوەش نەبووبێت دووەم نەتەوە بووە لە هەموو کیشوەری ئاسیاو هندستان و خاکە پێدانی مرۆڤ ومرۆڤایەتی بوو لە هەموو بوارەکاندا .

لە بەرئەوەی داڕشتنی زمان بە چەندین سەدەدا تێدەپەڕێ تاکوو ئەو زمانە جێگەی داڕشتنی لە یەکتر ناسین و لە یەکتر گەیشتن دەنووێنێ ، هەروا مێژوو وداب و نەریت و کەلتوورو شووێنەواردا .

بۆ نموونە چاندن و دوورینەوە، هەروا بۆلایەنی دیکەش . ئاژەڵداری و دۆزینەوەی مەڕو مالات و وولاخ و ڕەشەوولاخ ، ئەمانە هەموو ماوەی زۆری بێ هەژماری وویستوە ، کە لە سەرەتاوە لە خاکی کوردستان سەریان هەڵداووەو پەرەی سەندووە و بەرەو ناوچەو هەرێم و جیهان پەرت و بلاوی لە ڕێگەی بازرگانی کردن پی کراوە بەرەو جیهاندا .

بۆ ڕاستی ئەم مەبەستەش ، ئەم پەرتووکە ساکارە چەندین بەڵگەو ڕاستی لە لایەنەکان دەردەخات لە ماوەی ١/١/١/٠٠٠٠ تاکوو تەواو بوونی ئەم مێژوونامەیە ... بەر لەوەش هەوڵدان باشە بۆ گەیشتن بە بڕوای تەواوو ڕاستەقینە ، لە داهاتوو وەك گەیشتن بە مێژووی ئیبراهیم خەلیل ، باوکی پێغەمبەران .

هەروا گەیشتن بە مێژووی ڕاستەقینەی پێغەمبەر زەردەشت و پەرتووکە پیرۆزەکەی – ئاڤێستا – و بەدەیا کارو کردارو توویژینەوەی دیکە ، لە بارەی کوردو ڕووداوە پڕ لە مەرگەسات وکارەسات و دەربەدەر بوون و پەرت وبلاوە پێکردنی ، کە خۆی لە خۆیدا سەرچاوەی ئاوڕلێدانەوەیە لە هەموو بوارە جیاجیاکان بەتایبەتی چ لە بواری پەیووەندی ناو خوودی نەتەوەی کورد لە ناو خۆیداو، چ لە پەیووەندی دەرەوەی لەگەڵ نەتەوەکانی دیکە لە شەڕو ئاشتی و گفتگۆو ڕێکەووتن و پەیمان و سەرکەووتن و هەلاتن و شۆڕش و دورکەووتنەوە لێی و دژایەتی و ململانێ و ملکەچی و بەرگریدا .

نموونەی ڕابردووشمان لە هەموو بوارەکانی ئەو بابەتە دەرکەووتنە لە داهاتووی ئەو سەدو شەش ساڵەی کە لە ١٩٠٠ تاکوو ٢٠٠٦ ، کە کورد خاوەنی دەسەلاتی ئیماراتی نیمچە حکوومەتی سەر بەخۆ بوونە ، بگرە لە ساڵی ١٩٠٠ تاکوو ساڵی ١٩٠٦ ، بە دەیان ئیمارەتی هەبووە ، وەك ئیماراتی مەریوان لە

باکووری کوردستان لە ناوچەکانی دیاربەکرو ئەرزەڕۆم‌و بادینان‌و ئەردەلان‌و سنجاردا ، لە ساڵی ۱۱۰۰ تاکوو ساڵی ۱۲۰۷ چەندین ئیمارەت هەبوونە ، لەوانە ئیمارەتی شاهەرامین ، کە ئەمانە ڕاستیەکی چەندین لایەنەن.لە سەر خاکی کوردستاندا .

بەڵام من پێنووسی نووسەرو رووناکبیرو ڕۆشنبیرو ڕۆژنامەنووسان دەکەمە دەرخستنی ڕاستیەکان ، بە بێ دوو دڵی . لە هەموو بوارە جیاجیاکاندا ، بە تایبەتی لە دوو بواری بنچەیی نەتەوەیی‌و نیشتمانیە کە کوردو کوردستانە لە کێشووەری ئاسیاو جیهاندا .

لەبەرئەوەی سەردەم سەردەمی نەك بەرگریە ، بەڵکوو سەردەمی شاڵاو بردنە لە سەر ڕاستی‌و دەرخستنی ڕاستیەکان ، لە هەموو بوارەکان چ لە سەرەتای بوونی کوردو پەیوەندی ناوخۆی کوردو چ لەگەڵ دەرەوەی هەتا لە لایەنی ئاینی ، کە سەرچاوەیەکی بەهێزە لە دەرخستنی ڕاستیەکان‌و شێکردنەوەی ، یاخوود بەراوورد لە نێوان ئاینەکان ، بە تایبەتی لە نێوان ئایینی زەردەشتی‌و جوولەکەو مەسیحی‌و ئیسلامدا .

هیوادارم ئەو چەند دێرەی سەرەوە جێگەی گرنگی پێدان بێت ، لە بەر ئەوەی من ماوەی سەدەیەك‌و چەند ساڵێك دەکەمە نموونە لە دەرکەووتنی ڕاستی‌و چەوت ، لە هەموو بوارەکان چ لە پەیووەندی نێوودەووڵەتی بەتایبەتی ووڵاتانی ڕۆژئا ، واتە ووڵاتانی هاوپەیمان‌و گەلانی ژێردەستەوە ، ووڵاتانی جیهانی سێیەم‌و ووڵاتانی تازە پێگەیشتوو ، لە بوارەکانی ڕامیاری‌و ئابووری‌و سەربازی‌و چۆنیەتی دەسەڵات لە جیهانگەری‌و مافی مرۆڤ‌و مافی چارەنووسی گەلان‌و دیموکراسی‌و ژیان لە سەر گۆی زەویدا.

عەلی کەندی

۱۰ / ۹ / ۲۰۰٤

## ١٩٠١

١٩٠١/١/١ ئوستراليا توانی سەربەخۆیی خۆی لەناو کۆمەنوولسی بەریتانیا بەدەست بێنێ و نووێنەرێکی شانشینی بەریتانیا سەرپەرشتی ڕژێمی نوێی ئوستراليا بکات ، وەك دادوەری مەدەنی گشتی لە وولاتەکەدا ئەم سەربەخۆییەش بە ناوی – یەکیەتی وویلایەتکانی ئوستراليا – بوو . کە ناوی پایتەختەکەی – کانبیرا – یە و ژمارەی دانیشتووانەکەی ، ٤٥٠,٠٠٠ هەزار کەسە . هەروا ژمارەی دانیشتووانی وولاتەکەی ، ٢٠,٩٩٠,٠٠٠ ملیۆن کەسە . هەروا ڕووبەری وولاتەکەی ، ٧,٦٨٦,٣٠٠ کیلۆ مەتر چوار گۆشەیە .
هەروا چڕی دانیشتووانەکەی ، ٧ کەس لە یەك میل چوار گۆشەدا . هەروا نژادەکانی ، قەوقازیەکان ٩٣٪ . ئاسیایەکان ٣٪. دانیشتوانی ڕەسەنی وولاتەکە ١٪ . لە وولاتەکەدا .

١٩٠١/١/٢٢ کۆچی دوایی شانشین – فکتۆریا – شانشینی بەریتانیا لە دوای دەسەلاتێکی دوورو درێژ لە سەر بەریتانیای مەزن ولە هەموو بوارە جیاجیاکاندا .

١٩٠١/٢/٢٠ نووسەرو ڕووناکبیری ڕووسیایی وبەناوبانگی جیهانی – لییف تۆلستۆی– ئەم کەسایەتیە ناودارە بێ بەشکرا لە بڵاوکردنەوەی بابەت و نێردراوەکانی بۆ ڕۆژنامەو گۆڤارەکانی ڕووسیای قەیسەری ، لە لایەن کنێسەی ئەرسۆزۆکس . بە بڕیاری کۆمەڵی بیرووبۆچوون لە شاری پترسبۆرگی پایتەختی ئەوکاتی ڕووسیای قەیسەری لە کێشووەرەکەدا .

٢٠/ ١٩٠١/٤ لــە یەکــەمین تاقیکردنــەوەی گوواســتنەوەی بــۆ شــووێنە دوورەکــان – عـبرالاپیر– کـە لـە کۆتـایی سـەدەی نـۆزدەم بـوو ، کـە لـە لایـەن هەوڵـەکانی– مــارکۆنی یەکــەمین ئــامێری دەنــگ نــاردنی تــاقیکردەوە . کــە یەکــەم تاقیکردنەوەی لە رادیۆ بوو لە سالی ١٩٢٠ دا لـە ئەمەریکا ، دوای ئەوەش لـە فەرەنساو ئەلمانیاو ئوسترالیاو کەنەدا . دوای ئەو هەولانەش بەشێووەیەکی بـەر فـراوانتر لـە سـاڵی ١٩٢٤ رادیـۆ بـەر بـڵاوو بـووەوە لەزۆربـەی وولاتـە پێشکەووتووەکاند .

لـە دوای سـاڵی ١٩٦٠ زیـاتر لـە ٧٥٠ وویـستگەی رادیـۆ لـە سەرتانـسەری جیهانـدا بەرنامـەکنی خۆیـان بڵـاودەکردەوە بە هـەرێم و ناوچـەو جیهـان ، کـە رۆڵی بەرزو کاریگەری هەبوو لە سەر ئاگادار کردنەوەی کۆمڵگا جیـا جیاکـان لە جیهان لە هەموو بوارەکاندا.

سەرچاوە :– فارس مەنسوود – لەبارەی راگەیاندن – تەموزی/١٩٩٨.

١٩٠١/٥/١١ لە دایك بوونی نووسەرو رۆژنامەنووس و شاعیری بوولگاری و جیهان خـاتوو – رۆزائلیا شیرتسەری – لە شاری – شیرنۆڤیتش – ئیمپراتۆریەتی نەمسا – مەگــەر ئــەوکات ... ئــەم خاتوونــە لــە دوای تــەواوکردنی قوتابخانــەکانی خووێنـدنی سـەرەتایی و ناناوەنـدی لـە سـاڵی ١٩١٩ بەشـی ئاداب و فەلـسەفە

هەرلــە شــارەکەیدا تــەواو دەکات ..

دوای ئــەوە بــاوکی کۆچــی دوایـی دەکـات و بـەو هۆکـارە دەســـــت لەخووێنـــــدن هەڵـــــدەگرێ... لەســـــەر ئامۆژگــاری دایکــی لەگــەل ئینگـــاتس ئۆســـلەندەری هــاوڕێی خووێنــدنی بــەرەو وویلایەتــە یــەکگرتووەکانی ئەمـەریکا دەچێت و لـەوێ لـە رۆژنامـەی – westlichen nerld – دەبێتـە نوسـەر ... لەسـاڵی ١٩٢٣ لـە شـاری نیویـۆرك شـوو بەئینگاتسی ئۆسلەندەری هاوڕێی دەکـات ، هـەر دوای ئەوە رۆزا ئۆسلەندەر ناوزەند دەبێت و دەناسرێت .

لەســاڵی ١٩٢٦ لــە یــەکتر جیادەبنــەوە ... هــەر لــەو ســاڵەش رەگەزنامــەی ئەمــەریکی پــێ دەبەخـشرێ ... دوای ئـەوە دەسـت دەکـا بـە بڵاوکردنـەوەی چامەکانی کە بەزمانی ئـەلمانی دایرێـژتبوون ... دوای ئـەوە دەگەڕێتـەوە بـۆ ووڵاتەکـەی و لەسـاڵی ١٩٣٦ روو لەشـاری بۆخارسـت دەکـات ... دوای ئـەوە لەساڵی ١٩٣٩ بەر لەوەی ئاگری جەنگی دووەمی جیهان لە چەخماخە بدات یەکــەم دیــوانی بــەناوی – پەلکــە زێرینــە – بڵاودەکاتــەوە . کــە لەلایــەن رەخنەگران بەکارێکی بەرزیان دانا .

لەساڵی ١٩٤١ کە هێزەکانی سووپای نازی ئـەلمانیا بە یارمـەتی هاوپـەیمانی هیتلـەر – ئـەنتۆ نیکـۆی ژەنـەراڵ –هێـرش دەکەنـە سـەر یەکیـەتی سـۆڤیەت ، خـاتوو رۆزا ناچـار دەبێت لەگـەڵ خێزانەکـەی بەرەو جیتـۆ بـروات و لەوێـدا هاوڕێیەتی لەگەڵ پاوڵ سیلانی شاعیر پەیدا دەکات .

لـە دوای ئـەوەی کـە سـووپای سـووری سـۆڤیەت شـاری شـێرنۆڤینش رزگـاری دەکات و رۆزا بەرەو شـاری نیویـۆرکی ئەمـەریکی دەگەڕێتـەوە ... دوای ئـەوە لەساڵی ١٩٦٥ دووەم دیوانی بەناوی – هاوینی کوێر – بڵاودەکاتـەوە ... ئـەم

خاتوونه لەکارەکانی بەردەوام دەبێت تاساڵی ١٩٧٢ دەکەوێت ناوخانەی پەك کەوتووەکانی شاری دەرسلدۆرف لە ئەلمانیاو تا لە ١٩٨٨/١٢/٣ ماڵئاوایی لە شیعرو گەلانی وولاتەکەی و جیهان دەکات.

سەرچاوە :– www.wikapedye.com.

١٩٠١/٧/١٥ لە دایك بوونی فەیلەسوف وجوودی سەردەمی ئیتالی – نیکۆلس ئینیانۆ – ... لە دوای تەواوکردنی قۆناخەکانی خوێندنی بووە مامۆستای مێژووی فەلسەفە لە زانکۆی تۆرنیۆ لەساڵی ١٩٣٩ ... ئەم فەیلەسوفە دانەری – فەرەنگ بووە لەفەلسەفە – بیری ئینیانۆ و جوودی بووە لە یەکەم بیرکردنەوەو دانراوەکانی کەلە دانراوەکەی بەناوی (ینابیع اللاعقلیە للتفکیر – دەرکەوت لە – نابلی لەساڵی ١٩٢٣ – لە دژی میسالی – واتە دژی بیرووبۆچوونەکانی ئایین – وەستاوە .

لەماوەی ژیانیدا چەندین دانراوی بلاوکردۆتەوە وەك : کێشەی هونەر لە ساڵی ١٩٢٥. فەلسەفەی ئەمیل مایرسۆن لەساڵی ١٩٢٧ ... فیزیای نوێ – بنەماکانی تیئۆری لەزانست لەساڵی ١٩٣٤ ... مەبدەئی میتافیزیکا لەساڵی ١٩٣٥ ... دەروازەی وجوودی لەساڵی ١٩٤٢ و چەندین دانراوی دیکە .

سەرچاوە:– موسوعەی فەلسەفە – بەرگی /٣ – دکتۆر عەبدولرەحمان .

١٩٠٢/١٢/٧ لە دایك بوونی شاعیری هاوچەرخی پێشکەوتووخوازی تورك – نازم حکمەت – لە شاری ئەستەمبوڵی ئێستای تورکیا ... جێگەی ئاماژە پێکردنە کە ئەم شاعیرو نووسەرە ناودارەی تورکیاو جیهان پاش تەواوکردنی خوێندنی سەرەتایی و ناوەندی و ئامادەیی بەشێوەیەکی سەرکەوتووانە لە ساڵی ١٩١٩ چووەتە ڕیزی پەیمانگای سەربازی دەریایی.

بەلام دوای ماوەیەك بەهۆی باری نا لە باری تەندروستی دەستی لە پەیمانگاکە هەڵگرتووە ... لە.شیعر، سەرەتاییەکانی بەرگری کردن بووە لە چینی چەوساوە و گیانی سۆشیالستی لەناو هۆنراوەکانی بەدی دەکران .
دوای ئەوە لە پەیمانگای گەلانی ڕۆژهەلات لەساڵەکانی ١٩٢١ – ١٩٢٤ خوێندنی تەواوکردووە ، هەر لەم ماوەیەشدا کەوتۆتە بەر کاریگەری شیعری نوێی ڕووسی بەتایبەتی شیعرەکانی مایکۆفیسکی ،.

لە دوای گەڕانەوەی بۆ تورکیا هەموو تواناکانی بەرەو بەهرەیەکی شیعریەوە

هەنگاوی ناوەو رووی لە تێکۆشان کردووە لە دژی کۆنە پەرستی و خەباتکردنی لە پێناو ئازادی و سۆشیالستی لە ولاتەکەیدا ، بەهۆی ئەم هەڵوێستە بوێرانەی لەلایەن رژێمی تورکیا لە نێوان ساڵەکانی ١٩٣٧ – ١٩٥٠ بۆماوەی ١٤ ساڵ خراونەتە زیندان ... گەورەترین داستانی شیعری لەبەندیخانە بووەو دوای دوو ساڵ لەپاش ماڵئاوایی ئەم داستانەی بلاوکراوەتەوە ... کەلە رۆژی ١٩٦٣/٧/٣ ماڵئاوایی لەگەل و نیشتیمان پەروەران و شۆرشگێرانی دەکات .

سەرچاوە :- لە شیعرەکانی نازم حکمەت . وەرگێرانی – عەلی سەعید –١٩٥٢.بەیروت .

١٩٠١/٩/١٥ رۆژنامەی کوردستان لە ژمارە/ ٢٨ی بابەتێکی بلاووکردەوە لە سەر دامەزراندنی رێکخراوی حەمیدیەکان بە هۆی ئەوەی ، کە حەمیدیەکان هەموو هەوڵەکانیان لە پێناو دورستکردنی ناکۆکی و کێشەو گرفت بوو ، لە نێوان تیرەو هۆزە کوردەکان لە باکووری کوردستان ، هەروا لە نێوان کوردو ئەرمەن بە بەرگری کردن لە دەسەلاتی ئیمپراتریەتی عوسمانی دژ بە کوردو ئەرمەن لە باکووری کوردستاندا .

## ١٩٠٢

١٩٠٢/١/٣٠ رێکەوتنامەی هاوکاری لە نێوان هەردوو وولاتی بەریتانیاو یابان مۆرکرا ، بەناوی – ئەنگلۆ – یابانی- کە بووە هۆی بەهێزکردنی جێپێگەی بەریتانیا لە کیشوەری ئاسیا بە مانەوەی رووسیا وەك جاران و لاواز بوونی رێکەووتنامەی – ئەنگلۆ- ئەڵمانی- لە نێوان بەریتانیاو ئەڵمانیادا .

١٩٠٢/٢/٤ گرێدانی کۆنگرەی جوولانەوەی ئیتحادیەکان لە پاریسی پایتەختی فەرەنسا ، کە ٤٧ نووێنەر بەشداریان لەم کۆنگرەیە کرد ، لە وانە سەرنووسەری رۆژنامەی کوردستان- عەبدولرەحمان بەدرخان- لە پاڵ نووێنەری تورك و کوردو عەرەب و ئەرمەن و یۆنانیەکان ، لە هەمان کات ، گەلانی ژێر دەسەلاتی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی بریاریاندا . بەیەکگرتن لە پێناو رزگار بوون و رووخاندنی دەسەلاتی عوسمانی بەسەرکردایەتی – سولتان عەبدولحەمید- .

١٩٠٢/٢/٢١ دکتۆری بەناوبانگی نەشتەرگەری ئەمەریکی- هارڤ کوشینگ- یەکەم

نەشــتەرگەری دەمــاغی بــۆ مــرۆڤ ئەنجامــدا بەســەرکەووتویی لــە وویلایەتــە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا.

١٩٠٢/٣/١٢ مـۆرکردنی ڕێکەووتننامـەی نێـوان ئیتالیـاو بـەریتانیا ، بـە هـەمان شـێووەی ڕێکـەووتنی نێـوان فەرەنـساو ئیتالیـا و دەسـەڵاتەکانی فەرەنـسا و بـەریتانیا ڕێکـەووتن لـە سـەر ئـەوەی کـە تەرابلـسی ڕۆژئـاوا بدرێتـە ئیتالیـا ، بەبۆنـەی جیابوونەوەی لە هاوپەیمانیەتی سێ لایەنەی ئەوکات ، لە نێوان فەرەنسا و بەریتانیاو ئیتالیا ، لە سەر دابەشکردنی ناوچە جیاجیاکانی جیهان.

١٩٠٢/٤/٢ بۆ یەکەم جار لە مێژووی جیهان و سینەما ، کە فیلمی سینەمایی بۆ بینـەران بڵاو کرایەوە لە پاریسی پایتەختی فەرەنسا.

١٩٠٢/٤/١٠ کۆچــی دوایــی نووســەرو شــاعیری ناوداری کورد مامۆستا – حاجی میرزا عەبـدولرەحیم غــەفور – ناســراو بــە وەفایی ... جێگەی باسکردنە وەفایی لە٢٢/١/١٨٤٤ لە شاری سابلاخ چاوی بە جیهـان هـەڵهێناوە ... وەفـایی هـەر لـەو شـارەدا خوێنـدنی تـەواوکردووە ... پـیری نـەهرێ – بەهەشـتی شـێخ عوبێـــــدوڵلا عاشــــق و شـــــەیدای شیعرەکانی وەفایی بـووەو وەفـایی بانگەشـەی لای خـۆی کـردووەو بۆتـە هـاورێ و نووسـەری تایبـەتی شـێخ . وەفـایی لـە تەمـەنی خۆیـدا دوو جـار سـەردانی کەعبـەی ئیسلامی لەمەککە و مەدینە کردووە ... دوای ئەوە هاتۆتە شاری سلێمانی و لەگەڵ شێخ سەعیدی حەفید و سەید ئەحمەدی خانـەقا و حـاجی تۆفیق بـەگ – پیرەمێرد – لەگەڵ ئەوانەی بەرەو ماڵی خـوا بـەرێ دەکـەون ... کـە بـەرێگای شامدا دەڕۆن و لەبیابانەکان – وەفایی – کۆچی دوایی دەکات و تـەرمەکەشی هــەر لــەو بیابانــە بــەخاك دەســپێردرێت ... دیوانەکــەی وەفــایی لەلایــەن کەسـایەتی نـاوداری کـورد – گیـوی موکریـانی – لـە سـاڵی ١٩٥١ بەچـاپ دەگەیەنرێت .

١٩٠٢/٤/١٤ بڵاوکردنەوەی دوا ژمارەی ڕۆژنامەی کوردستان لە شاری ژنێف ، کە ژمارە ٣١ی ڕۆژنامەکە بوو لە دەرچوونیدا .

١٩٠٢/٥/٢٠ هەرێمی کووبا سەربەخۆیی خۆی ڕاگەیاند ، لە ژێر پارێزراوی ئەمەریکا سەرەڕای بەردەوام بوونی تێکۆشان و خەباتی گەلی کووبا دژی ئەمەریکا تاکوو بە دەست کێشانەوەی ئەمەریکا لە سەر وولاتی کووبا لە ساڵی ١٩٣٤، لە دوورگەکەدا .

ڕاگەیاندنی ئەم سەر بە خۆییە بە ناوی – کۆماری کووبا – بوو لە دوورگەکەدا ، کە پایەتەختەکەی ناوی– هاڤانا– یەو ژمارەی دانیشتووانی ، ٢,٣٦٥,٠٠٠ملیۆن کەسە . هەروا ژمارەی دانیشتووانی وولاتەکە ، ١١,٨٥٠,٠٠٠ ملیۆن کەسە . هەروا ڕووبەری وولاتەکە، ١١٠,٨٦٠ کیلۆ مەتر چوار گۆشەیە . هەروا چڕی دانیشتووانی ، ٢٧٨ کەس لە یەك میل چوار گۆشەدا . هەروا نژادەکانی ، مۆڵتۆ ٥٢٪ . سپی پێست ٣٥٪. ڕەش پێست ١١٪ . لە وولاتەکەدا .

١٩٠٢/٥/٣١ مۆرکردنی ڕێکەووتننامەی ئاشتبوونەوە لە نێوان بەریتانیاو هێزەکانی بووێرزەکان لە شاری فیرینجییگ ، بەڵام شەڕی پارتی زانی دژی بەریتانیا بەردەوام بوو ، لە لایەن بووێرزەکان تاکوو کۆتای ساڵی ١٩٠٤ ، ئەویش لە دوای کۆچی دوایی سەرکردکەیان سەرۆك – پۆل کرۆجر– لە شاری کلارینسی وولاتی سویسرادا .

١٩٠٢/٦/١٤ نووســەرو رووناکبیری نـاوداری جیهانی- کەواکبی- ناچار دەبێ پارێزگــای حەلــەبی ئێــستای ســووریا بــەجێ بێڵــێ و روو لــە وولاتی میسر بکات ، لەگەڵ کورە گەورەکەیدا .

کـە دوای سـێ سـاڵ لـە خۆشـی و شادیان و هەوڵی بە چاپگەیاندنی بەرهەمــەکانی دەبــێ . بــەڵام ســولتان عەبدولحەمیـدی دووەم ، لەوێش دەستەبەرداری نەبوو ، تا ئـەو کاتـەی هـەلی بـۆ رەخـسا و تـوانی لـە رێگـەی پیاوەکـانی خـۆی لـە شـاری قـاهیرەی پایتـەختی میـسر دەرمـانخواردی بکـات و بەو هۆیـە کۆچـی دوایـی کـرد ... زۆر لـە سەرچاوە عـەرەبی و فارسـی و ئێراقـی و ئێرانـی و فەرەنـسی ، نـژادی کـەواکبی بـە کـورد دادەنێن .

١٩٠٢/٧/٢٨ لە دایك بوونی گەوورە فەیلەسوف زانـستەکان — ی کـارل ئارمۆنـد پۆپــەر — لــە شــاری ڤییێنــای پایتـــــەختی ئیمپراتۆریــــەتی نەمسای ئەوسا ... شایانی باسە ئـەم فەیلەسـوفە ناودارە سـەرەتا لــەزانکۆی ئــەم شــارە فەلــسەفەو فیزیـاو زانـستی گـشتی و مۆزیکا دەخـووێنێ ، لـە هـەمان کـات بـۆ بــژێووی ژیــانی کــاری دارتاشــی دەکـات ... لــە ســاڵەکانی ١٩٢٠

بـیری مارکـسیەت هەڵـدەگرێ و دوای ماوەیـەك لـە بـیری مارکـسیەت دوور

دەکەوێتەوە. لەساڵی ١٩٢٨ بڕوانامەی دکتۆرا لەمینۆدی دەروونناسی و دەرککردن وەردەگرێ .
لەساڵی ١٩٣٤ یەکەم پەرتوکی بەناوی - لۆژێکی توێژینەوە - بڵاودەکاتەوە . لە ساڵی ١٩٤٥ روو لەوڵاتی فنزویلا دەکات و وانە زانستیەکان دەڵێتەوە ...
لەساڵی ١٩٤٥ پەرتوکێك بەناوی - کۆمەڵگای کراوەو دووژمنەکان - بڵاودەکاتەوە . ئەمەش بووە هۆکاری دەرکەوتنی لە جیهان وەك فەیلەسوفێکی رامیاری ناوداری جیهان ,
دوای ئەوە تا ساڵی ١٩٦٩ ژیان لە شاری لەندەنی پایتەختی بەریتانیا بەسەر دەبات . ئەم فەیلەسوفە ناودارە بەردەوام دەبێت لەکارەکانی تاکوو ماڵئاوایی لە جیهانی زانست دەکات لە ١٩٩٤/١٢/١٧ لە شاری لەندەنی پایتەختی بەریتانیا . دیاریدەترین کارەکانی ئەم فەیلەسوفە تووێژینەوەی پێوەری زانست و عەقلانیەتەکەی بوو ... جگە لەپەرتووکەکانی کە ناومان هێنان.

١٩٠٢/١٠/٢٢ جوولانەوەی سەهیۆنیزم بەرامبەر تاقی کردنەوەیەکی سەخت بیووەوە لە دوای قەسابخانەکەی- کیشنیف - لە لایەن ڕژێمی ڕووسیای قەیسەری ، کە لە کاتی چاوپێکەووتنەکە سەرکردەی جوولانەوەی سەهیۆنیزم - هرتزل و وەزیری موستەعمەراتی یریتانی تشمیرلن - نامەیەکی هاوبەشیان ئاراستەی سولتانی عوسمانی عزت پاشا کرد ، ئەویش بەپێدانی دەسکەووت و

داگیرکردنی وولاتی نێوان دوو زێێ لەباشووری کوردستان .
ئەویش لە ناوچەکانی کۆتایی شاری هەولێرو عەکاو فەلەستین هەولیدا ، لە پێناو مۆرکردنی رێکەووتننامە لەسەر رێکەووتنەکانیان، بەلام هەولی دامەزرێنەری جوولانەوەی سەهیۆنیزم بێ سوود بوو لەو کاتدا .
لە هەمان کات دامەزرێنەری جوولانەوەی سەهیۆنیزم هرتزل لەگەڵ وەزیری موستەعمەراتی بەریتانیا – جۆزێف تشمیرلن – کۆبۆە لە پێناو دامەزراندنی دەوولەتی یەهوودی – جوولەکە – لە هەرێمی شامدا ، بەلام وەزیری بەریتانیا ئەو پێشنیارەی هرتزلی پێشکەشی بە – لۆرد کرۆمر– کرد لە پێناو چارەکردن لە ناوچەکەدا .

١٩٠٢/١١/١ مۆرکردنی رێکەووتننامە لە نێوان فەرەنساو ئیتالیا ، بەدانانان بەمافی هەر یەك بۆ ئەویتریان و گفتووگۆی نهێنی کردن ، لە دژی یەکتری لە هەر جەنگێکی هەلگیرساو لە نێوان هاوپەیمانی سێ لایەنەو فەرەنسادا . لە سەر ئەو ناوچانەی کە کێشەیان هەیە بە پێی بارو دۆخەکە لە جیهاندا .

## ١٩٠٣

٥ / ١٩٠٣/٣ مۆرکردنی رێکەووتننامەی بە دەست هێنانی دورستکردنی هێلی ئاسنی شەمەندەفەر لە بەغدا ، لە نێوان ئەلمانیاو دەسەلاتی عوسمانی بەهاوکاری

کۆمپانیاکانی هندستان و کۆمپانیەکانی ئەلمانیا ، ئەویش لە بە دەست هێنانی دامەزراندنی هێلی ئاسنی لە چەند لایەنێکی ئیراقی ئێستادا.
لەوانە هێلی ئاسنین لە نێوان کەرکوك و بەغدا ، هێلی ئاسنین لە نێوان موسڵ و بەغدا .
شایانی باسە کە زۆر لە بەرپرسانی وولاتانی گەوورە هەولی ئەوەیان دەدا ، کە ئەوان ئەو دەسکەووتە بەدەست بێنن لە ناوچەکەدا .

بـەڵام بـەهۆی پەیووەنـدی کـۆنی نێـوان ئـەڵمانیاو دەووڵـەتی عوسمـانی ئـەو دەسکەووتانە بەر حکوومەتی ئەڵمانیا کەووت ، کە هێڵی ئاسنین و لقەکانی ، لە ئەرزەرۆم‌و بایەزید . کە دەست پێکردنەکەی بە ناو شاری نەسێبین بڕوا بەرەو بەناو خاکی باکوورو باشووری کوردستان تێدەپەری ، ئەویش بە هۆی هەڵکەووتەی باری جووگراڤ هەرێمەکە لە کێشووەری ئاسیادا .

١٩٠٣/٣/١٤ سـەرکردەی بزووتنـەوەی ڕزگـاریخوازی کـورد لـە وویلایـەتی مووسـڵی ژێـر دەسـەڵاتی عوسمـانی کـۆن و ئێـستای باشـووری کوردسـتانی لکێنـراو بـەئێراقی دورستکراو .

مستەفا بارزانی لـە ناوچەی بارزان لـە بنەمالەیـەکی ئاینی‌و کوردایـەتی شۆڕشـگێر چـاوی بـە جیهـان هەلهێناوە لە هەرێمەکەدا .

تێبینی :- تێکۆشان و خەباتی ئەم سەرکردەیە بە شێوەیەکی ڕێك و پێك لە ناوەرۆکی مێژوونامەکە دیاریکراوە لەهەموو لایەنەکانی تێکۆشانیدا .

١٩٠٣/٣/٢٣ لـە دوای دامەزرانـدنی جووولانـەوەی کرێکـارانی سـەهیۆنیزم‌و جوولانـەوەی کـشتووکاڵکاران‌و هاوکـاری کـردن لـە نێـوان یـەهوودی ئەرسـۆزۆکس ، لـە نـاو ڕێکخراوی سەهیۆنیزم ... کە لە کاتی کۆنگرەی پێنجەمی سەهیۆنیزم .

کـە بەسـەرکردایەتی حاخـام ئیـزال‌و یـەعقوب رابـنس بـوو ، هـەروا داوای کۆبوونـەوەی سـالانەیان کـرد . کـە ژمـارەی ئەنـدامانی ئـەو جوولانەوەیـە لـەو کـات گەیـشتە ١١هـەزار ئەنـدام ئـەویش بەمسۆگەر کردنـی داواکاریەکـەیان لـە داهاتوودا بەدامەزراندنی دەووڵەتی یەهوودی لە فەلەستینندا .

١٩٠٣/٣/٢٥ لـە دوای ڕووداوەکـانی بـیری دامەزرێنـەری جوولانـەوەی سـەهیۆنیزم ، سـەرکردەکەیان - هرتـزل - لـە پێنـاو بەدەسـت هێنـانی کوورسـی‌و بە هەڵووەشاندنەوەی‌و بەرەو چاوپێکەووتنی لەگەڵ - کۆنت بارانی- بالوێزی پورتووگال لە شاری ڤیەنادا .

دوای ئەوە هەنگاوینا بۆ وەرگرتنی زانیاری لە بارەی كۆمپانیای مۆزامبیق ، كە ئایا كۆمپانیایەكی سەربەخۆیەو ئایا هێزی سووپای پارێزراوی هەیە یان نا ، ئەویش لەپێناو بەدەست هێنانی ئاوی زێی نیل و ناوچەی قووبرسی یونانی بوو لە كێشووەرەكەدا .

١٩٠٣/٣/٣٠ ئیبراهیم پاشای مللی كە لە عەشیرەتی رۆژهەڵاتی ئێزیدیەكان بوو لەگەڵ ئەوەشدا دژی ئیسلام بوو، هەڵسا بەكووشتنی ئەفسەرێك لە سووپای عوسمانی- بوزباش - لە باكووری كوردستانی ژێر دەسەڵاتی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی ، لەگەڵ كووشتنی بیست لە سەربازەكانی لە هەرێمەكەدا .

١٩٠٣/٩/١١ لە دایك بوونی فەیلەسوف ومۆزیكا ژەنی ئەلمانی - ئەدورنۆ بهجتل - (theoder wesengrand) لە شاری فرانكفۆرت لە سەر زێی ئەلمانیا لە بنەماڵەیەكی ئاین جوولەكە ... دایكی گۆرانی بێژ بووەو لە بنەماڵەیەكی جوولەكە بووە ..

لە سەر باری ژیانی خۆی دەڵێ :-

من فەلسەفەو مۆزیكام خووێند بێ ئەوەی لێی جیاببمەوە كە هەردوو بواریش لێك جیاوازان ... لە ساڵی ١٩٢٤ بروانامەی دكتۆرای بەدەست هێناوە لەبواری فەلسەفەو لە ساڵی ١٩٣١ بروانامەی ئامادەكاری بەدەست هێناوە بۆ ئەوەی لە زانكۆ وانە بڵێتەوە ...لە زانكۆی فرانكفۆرت وانەی گتۆتەوە تاكوو نازیەكان دەریان كردووە .

لەو كاتەی نازیەكان لە ١٩٣٣/١/٣٠ دەسەڵاتیان گرتە دەست لەزانكۆ بەیەكجاری دەریان كرد لە بەر ئەوەی لە ئایین جوولەكە بوو .

دوای ئەوە لە ساڵی ١٩٣٤ بەرەو ئینگلتەرە كۆچی كردوو دوایی لە ساڵی ١٩٣٨ چووە ئەمەریكاو لەوێ دامەزرا بە بەرێوەبەری مۆزیكا لەكارگێری پرۆژەی تووێژینەوە لە رادیۆی برنستۆن/٢ لە ساڵی ١٩٣٨ تا ١٩٤١ ... لەساڵی ١٩٤٧ كتابی دیالیكتیكی تەنویری دانا .

دوای چەندین بەرهەم لە ساڵی ١٩٤٩ گەراوە ئەلمانیا ، ئەم نووسەرو رووناكبیرە لە ماوەی ژیانیدا ١٢ بەرهەمی هەبوو لە بوارەكانی فەلسەفەو مۆزیكا تاكوو لە ٢٠/ ٣/ ١٩٦٩ كۆچی دوایی كردووە لەئەلمانیا .

موسوعەی فەلسەفە - بەرگی/٣ /د.عەبدولرەحمان بەدوی .

١٩٠٣/١١/٣ لــە دوای هــەوڵ و خــەباتێکی بــەردەوام هــــەرێمی پەنـــــەما ســـەربەخۆیی خـــۆی ڕاگەیانــد ، بــە نــاوی کۆمـــاری پەنـــەمای سـەربەخۆی تـەواو لـە ڕیـــزی وولاتـــانی جیهاندا . کـــــە پایتـــــەختی وولاتەکـــەی نــاوی – پەنەما سیتی– یەو ژمارەی دانیشتووانەکی ، ٦٣٥,٠٠٠ هەزار کەسە . هەروا ژمــارەی دانیــشتووانی وولاتەکــەی ، ٣,١٣٠,٠٠٠ ملیــۆن کەســە . هــەروا رووبــەری وولاتەکـەی ، ٧٧,٠٨٢ کیلـۆ مـەتر چـوار گۆشـەیە . هـەروا چڕی دانیشتووانەکەی ، ١٠٥ کەس لە یەك میل چوار گۆشەدا . هـەروا نژادەکانی ، مـستیزۆ ٧٠٪ . هنـدی ڕۆژئـاوا ١٤٪ . سـپی پێـست ١٠٪ . هنـدی ٦٪ . لـە وولاتەکەدا .

١٩٠٣/١٢/١٧ دورستکردنی یەکەم فڕۆکە لە جیهان بەیەك ماشێن و بەرەو ئاسمان هەلکشا لە شـاری لەندەنی پایتـەختی بەریتانیا ، لەئەنجام بووە هۆکاری ئەوەی کە تـوانرا جۆرەکـانی فڕۆکـەی جـەنگی و بارهـەلگرو مـرۆڤ و ئـاگر کووژێنـەوەو فریاکـەووتن و مـەدەنی دورسـت بکرێـت. لـە چـەندین وولاتـی ئـەوروپا، وەك ئەمەریکاو بەریتانیا و فەرەنسا .

١٩٠٣/١٢/١٧ نووســەرو ڕوونــاکبیری جیهــانی – ئەرکـسین کالــدویل– لــە شارۆچـکەی کاویتای وویلایەتی جۆرجیای ئەمەریکی لە دایك بووە .

١٩٠٣/١٢/١٩ گەڕانــەوەی ئەنــدامانی کــۆنگرەی ڕووســیا لــە شــاری خــارکۆف لــە لێژنەی کاری نووێیدا ، کە شاعیری گـــەورەی رووســـیا پۆشـــکین دایمەزرانــد بــوو بــۆ وولاتەکــەیان ، ئەویش بە بڕیاردان بەڕەوانەکردنی لێژنــە لەلایــەنی خۆیــان بــۆ شــاری ڤیــەنا ، لــە پێنــاو داواکــردن بــە دامەزرانــدنی بزووتنــەوەی ســەهیۆنیزم بــە نووسینی دەست نووسینی بەلێن بەواز هێنانی لە پرۆژەی بوکندا .

ئــەویش پــێش گرێــدانی کــۆنگرەی حەوتــەمی ســەهیۆنــیزم ، هــەر لــەو کاتــە خووێندکارێکی ڕووســی توونــدڕەو – حاییم سیلیك لوبا– هەلسان بە تیرۆر کردنی – ماکس نوردۆ – لە پاریسی پایتەختی فەرەنسا . لـە کاتی ئاهـەنگی سەما لە یەکێك لە ڕیستۆرانتەکانی شاری پاریس ، کە ماکس دەستە ڕاستی هرتزل بوو لە جوولانەوەکە لە جیهاندا .

١٩٠٣/١٢/٢١ بۆ یەکەمجار – ئەنتۆن نوو – ی ڕۆمانووس لە بەرامبەر نووسینی ڕۆمانی – هێزێکـی دژوار – خـەلاتی ئـەدەبی – گۆنکـۆر – ی فەرەنـسی دابەشـکرا . جێگـەی باسلێکردنە کە ئـەم خەلاتـە بـۆ یەکـەم جار لـە١٢/٦/ ١٨٩٦ دامـەزرا بەناوی – ئەدمۆن گۆرنکۆر – ی نووسەری فەرەنسی .

بــەلام کۆمەلــەی ئــەدەبی خەلاتەکــەی بــە ڕەســمــی لــە ســالی ١٩٠٢ بــۆ پاداشــتکردنی ڕۆماننووســان دامــەزرا . جــا لــە چ ڕەگــەزو نەتەوەیــەك بــن . بەمەرجێك بەزامانی فەرەنسی بنووسن ... کە تاکوو ئێستاش بەدەیا خـەلاتی گۆنکـۆر – بەســەر ڕۆماننووســان دابەشــکراوەو دوا خــەلاتیش بەخــشرا بــە ڕۆماننووس – جیل لۆرا – بەناوی خەلاتی گۆنکۆر – ی ١٠٠٧ لە جیهان .

## ١٩٠٤

١٠/ ١/ ١٩٠٤ کۆچی دوایی نیگارکێشی سوویسری بەناوبانگ– گیرۆم– لـە شـاری پاریسی پایتەختی فەرەنسا.

٢٣/ ١/١٩٠٤ سەرکردەی جوولانەوەی سەهیۆنیزم هرتزل چاوی کەوت بەشانشینی ئیتالیاو گفتووگۆی لەگەڵ شانشین کرد ، لە سەر پرۆژەی سەربە تەرابلسی رۆژئاواو لەپێناو کۆچ پێکردن بە یەهوودیەکان بۆ ئەو ناوچەیەو کردنی بەخاکی یەهوودی ، لە ژێر یاساکانی ئیتالیاو دامودەزگاکانی لیبرالی و شانشیندا .

لەوەڵامەکەیدا شانشینی ئیتالیا بە هرتزلی گووت:- بۆ هرتزل گووتی ئەمە خاکی کەسانی دیکەیەو یەهوودی ناتوانن ژیان لەو ناوچەیە بەر نەسەرلە بەر دروست بوونی کێشە لە ناوچەکەدا .

٥ / ٢ /١٩٠٤ بەرپابوونی شەڕی نێوان ڕووسیای قەیسەری و ئیمپراتۆریەتی یابان بە ناوی - شەڕی مەسکوب و، یابان- کە دەگەڕاوە سەر ناوی مۆسکۆی پایتەخت ، کە خۆی لە دوو هۆکار دەگرت ئەویش:-

یەکەم :- بەریتانیاو یابان بەیانی دەویست ڕووسیا پێشکەوێ لە ناوچەی رۆژهەڵاتی دوور ، بە تایبەتی لە مەنشووریاو کوریا بە هۆی رەتکردنەوەی ڕووسیا بەکشانەوەی لەکۆریا.

دووەم :- ڕووسیا خۆی لەوە دەدیتەوە کە سەرکەووتنەکانی ئاسان و بەپەلە بوون ، سەرەرای ئەوەی کە بەلشەفیەکان لە دەووروبەری ڕووسیا هەولی شاڵاو بردنیان دەدا ، بۆسەر رژێمی قەیسەرو سەرکەووتنیش لەناوچەکە دەبوایە ببوایە .

٧ / ٢/١٩٠٤ هێزەکانی سووپای دەریای یابانی هیرشیان کردە سەرکەشتیە جەنگیەکانی ڕووسیا بەرامبەر کەنارەکانی کۆریاو داگیری کرد، لەهەمان کات تەرداکانی یابان بۆردوومانی ناکاوی کردە سەر بەندەرەکانی - بوور- ئارتوور- و توانیان کەشتیەکانی جەنگی روسیا تێك بشکێنن .

کە هێزەکانی سووپای ڕووسیا ١٣٥,٠٠٠ هەزار سەرباز دەبوو ، لە گەڵ ئەوەشدا ١,٢٠٠,٠٠٠ ملیۆن چەکداری هەبوو . گەر چی هێزەکانی سووپای یابان ٨٥٠,٠٠٠ هەزار سەرباز بوون ... بەڵام بە هۆی تەواو نەبوونی هیلی ئاسنی شەمەندەفەر لە نێوان ڕووسیای ئەورپاو ڕووسیای رۆژهەڵات .

کە ببووە رێگەگر لەپێش ڕووسیا بەسوود وەرگرتنی لە ووزەی سەربازی دوور ، کە شاری فلادیگۆستۆك بەسترابووەوە بە تۆرێکی گەیاندنی

ڕووســـەکان بەشـــێووەیەکی وا ، کــە مـــاوەی دەدا بـــە گوواســـتنەوەی پێداویستیەکانی سەربازی بۆناو جەنگەکەدا .

٩ / ٢ /١٩٠٤ لــە ئـەنجامی کێـشەکانی نێـوان ڕووسـیای قەیـسەری‌و شانـشینی ئیتالیـا هێزەکانی سووپای یابان لەناکاو پەلاماری هێزەکـانی ڕووسیای قەیسەری ، بێ ئەوەی ئاگادار بێت یاخوود ئاگادار بکرێتەوە.

١٠/٢/ ١٩٠٤ بە هۆی ئەو بارودۆخەو بوونی کێشەو گیروگرفت‌و هەڵکەووتەی خاك‌و باری هێزەکانی سووپای ڕووسیای قەیسەری ، بووە هـۆی ئەوەی کە یابان جـەنگ دژی ڕووسیا ی قەیسەری بەیەك لایەنە رابگەیەنێ لە ناوچەکەدا .

لـە ئـەنجام یابـان تـووانی سـەرکەووتن بەدەسـت بێنـێ لـە چـەندین ناوچـەی جیاجیـا لـە سـەر کـەنارەکانی کۆریـاو ناوچـەی بـاڵۆ، دوایـی کـەنارەکانی منـشووریا .، دوای ئەوە لـە ١/٥ ی... هـەمان سـاڵ گـەمارۆی بەنـدەری ئـارتۆر بڕیار بدات لە هەرێمەکەدا .

١٨/٣/١٩٠٤ لــە دایـك بـوونی ڕوونـاکبیرو ڕۆشـەنبیرو نووسـەری نـاوداری کورد – شێخ محەمـەدی خـاڵ – لـە شـاری سلێمانی لـە هـەرێمی باشـــووری کوردســـتان ، باوبـاپیرانی ئـەم کەسـایەتیە خووێنـدنی ئایینی و زانستیان لـە شـاری مـەریوانی ڕوژهـەلاتی کوردســـتان و شارۆچـــکەی قەلاّچـۆلان و سـلێمانی تـەواو کـردووەو گرنگـی زۆریـان بـە ئـایین وزانـست و ئـەدەب داوە بەزاناکتی عـەرەبی و کـوردی بـە هۆی بەرزی بیرووباوەریان بە ئایینی ئیسلام وگرنگی پێدانی لە ناوچەکەدا.

هەر لە سەرەتای منداڵیەوەو لـە تەمـەنی نۆ ساڵیدا محەمـەدی خـاڵ لـە باپیرە گەوورەی فێری خووێندن بووە لە لای شێخ ئەمین خاڵ بە تەواوکردنی قورئان

هەروا ئەو بنەماڵەیە جێگەی برواوخۆشەویست بوونە لە نێوان دانیشتووانەکان چ لە رۆژ هەلاتی کوردستان و چ لە باشووری کوردستان .
مامۆستای سەرەکی فێرکردنی ، مامۆستا شێخ ئەمین قرەداخی بووە ، کە گرنگی بە دانراوەکانی شێخ محەمەد رەشیدو محەمەد عەبدە داوەو بۆتە سەرچاوەی وەرگرتنی زانیاریەکانی لە بوارەکانی ئایین وزانست وئەدەب.
هەروا لەساڵی ١٩٣٩ بۆتە قازی لە پارێزگای سلێمانی و پارێزگای کەرکوك و موسل . هەروا بۆ ئەندامی ئەنجوومەنی تەمییزی شەرعی و بەردەوام بوولێیی تاکوو ساڵی ١٩٦٧، دوای ئەوە خانەنشین کراوە.
هەروا لە سالی ١٩٥٤ بۆتە ئەندامی بەرز لە کۆری زانیاری لە شاری دیمەشقی پایتەختی سووریا . دوای ئەوە بۆتە ئەندامی کۆری زانیاری ئێراق لە دوای دامەزراندنی لە ساڵ ١٩٧٨ ، هەروا بۆتە ئەندامی کۆری زانیاری کورد لە شاری بەغدا ی پایتەختی ئێراق .
هەروا لە ساڵ ١٩٣٥ شێکردنەوەی بشی سیی لە قورئان نووسیووە بە زمانی کوردی وبەردەام بووە تاکوو بەشی نۆیی ئەم کتێبە ، نامەیەکی فەلسەفەی ئایینی ئیسلامی و نامەیەکی ژیاننامی پێغەمبەر –د،خ – نووسیووە ، لە گەڵ چەندین نووسراوو بابەتی دیکە ، لە سەر ئایین و فەلسەفەو ئەدەب و ژیاننامەی کەسایەتی ئایینی بە ناوبانگ و بەردەوام بووە تا لە ١٩٨٩/٧/١٥ مالئاوایی لە توویژی نووسەرو رووناکبیران دەکات ، لە دوای دوو ساڵ لە بەربەرەکانی کردنی لە گەڵ نەخۆشیە کووشندەکانی لە شاری سلێماندا .
سەرچاوە :– من اعلام التلریخ الکرد المعاصر.

١٩٠٤/٥/١١ نیگارکێش و نووسەرو نەخشەسازو هونەرمەندی سینەماکارو کەسایەتی ناوداری جیهان و وولاتەکەی مامۆستا – سلڤادۆر گاستۆد دالی– لە شاری تالۆنیای باکووری ئەسپانیا چاوی بە جیهان هەلیهێناوە لە وولاتەکەدا .

١٩٠٤/٥/٢١ هێرشمان هۆڵەندی و ڕۆبیرگیرانی فەرەنسی و بە ئامادە بوونی نووێنەری حەوت دەووڵەت کە هەموویان لە کیشووەری ئەوروپا بوون .
یەکیەتی تۆپی پێی جیهانیان دامەزراند ، کە ناسراوە بە – فیفا – لە جیهاندا ، هەروا لە ساڵی ١٩٢٠ بۆ یەکەم جار تۆپی پیّ چووە ناو یاریەکانی ئۆلەمپیاتی نێوودەووڵەتی لە

گەڵ گروپەکانی دیکەی یانەی وەرزشوانانی وولاتانی جیهان .

١٩٠٤/٦/١ پێشبڕکێی یاریەکانی پاڵەوانیەتی جامی جیهانی – ئۆلەمپیات – لە ئەمەریکا – ستۆیس ئەنجامدراو بەردەوام بوو تاکو ١١/٢٣ ی هەمان ساڵ لە نێوان یانە وەرزشیەکانی وولاتانی بەشدار بوو لەم وولاتەدا.

١٩٠٤/٧/٢ کۆچی دوایی نووسەرو ڕووناکبیرو ئەدیبی ڕووسی – چیخۆف – بووە ، ئەو کەسایەتیە ناودارە جیهانیە ڕۆڵی کاریگەری هەبووە لە بوارەکانی ڕامیاری و ئابووری و کۆمەلایەتی و ڕۆشنبیری ، تاکوو ئێستاش زیاتر لە جاران گرنگی پێدەدرێت و ڕێز لە نووسینەکانی دەگیرێت لە ڕووسیا و وولاتانی جیهاندا . کە لەو کاتە نووسەری گەورەی ڕووسی – چیخۆف – جانتاکەی هەڵدەگریّ و بەیانی زوو لەگەڵ هاوسەرەکەی هونەرمەندی شانۆیی – ئۆلگاکنیپەر – لە ماڵەکەی خۆی

لەشاری یالتا دەچێتە دەرەوەو بەرەو شاری شوارزوالدی ئەڵمانی بەڕێ دەکەوون و جارێکی دیکە ناگەڕێنەوە شاری یالتا.

١٩٠٤/٨/٢٠ بڵاو بوونەوەی نەخۆشی – تاعوون– لەپارێزگای هەولێرو دەووروبەری ، لە هەرێمی باشووری کوردستان ، بەتایبەتی لە شارۆچکەی عەنکاوەی ئەوکات ، کە ڕۆژانە زیاتر لە ٦٠ شەست هاووڵاتی لە شارەکەدا بەهۆی ئەو نەخۆشیە گیانیان لەدەست دەدا .

## ١٩٠٥

٣ / ١٩٠٥/١ بڵاوکردنەوەی یەکەم ژمارەی ڕۆژنامەی بۆ پێشەوە– الی امام– بەشێوەیەکی نهێنی لە شاری ژنێف لەلایەن ڕابەرو سەرکردەی شۆڕشی ئۆکتۆبەرو دامەزرێنەری رژێمی سوشیالیستی – لینین – لە ڕووسیای قەیسەری ئەوکات لە کێشووەرەکەدا .

٧ / ١٩٠٥/١ تێکۆشەری کورد عوسمان سەبری – ئاپۆ عوسمان – لە گوندی نارنجەی ئاریمان لە باکووری کوردستانی ژێر دەسەڵاتی عوسمانی چاوی بەجیهان هەلهێناوە لە ناوچەکەدا .

١٩٠٥/١/٩ گابۆن سەرکردایەتی ڕێپێووانی جەماوەری کرێکاری و هەژاران و چەساوەکانی کرد ، بە دەست پێکردنی بەرەو کۆشکی قەیسەری ڕووسی – نیقۆلای دووەم – و بووە هۆی ئەوەی کە پۆلیس ڕێپێوانەکەی بە گوللە باران وەلامداتەوە لە شارەکەدا . کە ئەمەش بووە هۆکاری سەرەتای دەستپێکردنی شۆڕشی گەلانی ڕووسیا لە پترۆسیۆرگی پایتەختی رووسیا ی قەیسەری ئەوکات ، لەچینی کرێکارو جووتیارو کاسبکاران ، بەسەرکردایەتی پارتی کرێکاری دیموکراتی سۆشیالیستی ڕووسیا بەڕابەرایەتی لینین لە ووڵاتەکەدا .

١٩٠٥/١/٢٢ لە دوای خەبات و تێکۆشانی بەردەوام و بە دەست پێکردنی شۆڕشی یەکەمی برژوازی لە ڕووسیای قەیسەری ، کە بووە هۆی ناچارکردنی قەیسەرو هەڵسان بە چاکسازیکردن، ئەویش بە دامەزراندنی ئەنجوومەن لە نووێنەرانی گەل لە ڕووسیادا .

جێگەی باسکردنە کە سەرکردەی شۆرش و راپەرینەکانی ڕووسیای یەکەم -گابۆن- هەڵگری بڕوای ئاینی مەسیح و لە مەزهەب ئۆرسۆزۆکس ئۆرانی ، کە لە ساڵی ١٨٧٣ لەدایك بووەو رێنماییەکانی تۆلستۆی کاری تێکرد بوو ، هەلسا بەچاکسازی کۆمەڵایەتی بە دامەزراندنی یەکیەتی کرێکاران

لە ساڵی ١٩٠٥و دەست کردن بەخۆ پیشاندان و رێپێواندا .

کە باشترین رێگە چارەسەر کردن بوو ، لەپێناو بەدی هێنانی کارە چاکسازیەکان ، کە رێپێوان لەشاری پترۆسبۆرگ دەستی پێکرد بەرەو کۆشکی زستانەی قەیسەرو لە گۆرەپانی بەر کۆشکەکە کۆتایی هات بەقەسابخانە بەدناوەکە . کە ئەو رۆژ ناوی نرا بە رۆژانی - رەش -و ئەو راپەرینە خۆی گوواستەوە بۆ وولاتی سوویسراو وولاتانی دیکەی جیهاندا .

١٩٠٥/١/٢٦ لە دوای گەرانێکی بەردەوام لە کانزا ژێر زەویەکان ئەویش توانرا بە دۆزینەوەی گەووەرەترین پارچە - ئەلماس- لە جیهان ، لە مەنجەمی - بریمیر- لە باشووری ئەفریکیا .

کە کێشەکەی-٣,١٠٦ قیران - بوو دوایی ناونرا بە- کۆلینان- و دوای ئەوە ئەلماسەکە دابەشکرا بۆ ١٠٦ پارچە ئەلماسەکە لە ئەلماسە درەوشدارەکان بوو لە ناوچەکەدا .

١٩٠٥/٢/١٩ ئەنجامدانی قەسابخانەکەی دژ بە ئەرمەن لە شاری باکۆ ، لە هێرشەکەی ئازربایجانیەکان بۆ سەریان ، ئەو هێرشەش بۆماوەی دوو ڕۆژ بەردەوام بوو

لە شارەکەدا .

کـە هێزەکـانی سـووپاو دەسـەڵاتی ڕووسـیای قەیـسەری بـە هانـای داواکاریەکانی ئەرمەنەکان نەهاتن، لە پێناو بەرگری کردن لێیان و ڕاگرتنی هێرشەکانی ئازربایجانیەکان .

١٩٠٥/٥/١٦ هونەرمەندو ئەکتەری ناوداری جیهان – هنری فۆندا – لە دوورگەی نیراسکا چاوی بە جیهان هەڵهێناوە ... هەروا لە منداڵیەوە ئارەزوی نواندنی لیّ دەرکەوتووە . لە ساڵی ١٩٢٨ دەچێتە ناو خانەی نواندنی کۆمەڵەی نۆهاما ، کە تیپێکی شانۆیی ناوخۆیی بوو ، کە دوروسی پراندۆ بەرێوەی دەبرد .
دوای ئەوە لە زانکۆی کیپ کۆرد دراما دەخووێنیٚ ، ئینجا لە سەر سەکۆش شانۆی بروا دوای بەناوبانگ بەدیار دەکەوێت ... لە ساڵی ١٩٣٥ یەکەم ڕۆلی سەرەکی لە شانۆگەری ژنەکە کێلگەکە دەبات وەردەگرێت ... دوای ئەوە روو لە سینەما دەکات و کە یەکەم بەشداری کردنی لە فلیمی سینەما لە ساڵی ١٩٣٥ بوو لە فلیمی بەناوی ڕێگاکەم لە خوارەوەی ڕۆژهەڵات .
هەروا لە فلیمی مانگ مالمانە لە ساڵی ١٩٣٦. بە دەیا کاریدیکەی و سینەمایی بەردەوام دەبێت تا لە ١٩٨٧/٤/٢ ماڵئاوایی لە بواری شانۆیی و سینەماو جەماوەری دەکات لە جیهان .

١٩٠٥/٦/٢١ لە دایك بوونی دوا فەیلەسوفی ناوداری فەرەنساو جیهانی – ژانپۆڵ سارتەر– لەپاریسی پایتەختی فەرەنسا ، کە لە خێزانێکی بۆرژوازی بووەو هەر لەمنداڵیەوە باوکی مردووەو دایكوباپیری بەخێویان کردووە ، دوای ئەوە توانی خۆی لەپێناو گەیشتن بە خواستەکانی بە بەردەوام بوونی لەو بوارانەی کە ئاواتی بوون ، تاکوو بۆتە فەیلەسوفێکی ناودارو کەسایەتیەکی ناوداری لێهاتووی فەرەنسا و ناسراوی

جیهان.

١٩٠٥/٧/١١ کۆچـی دوایـی روونـاکبیرو فەیلەســوف و پێــشرەوی چاکــسازی کۆمەڵایــەتی و ئـاینی – محەمـەد عەبـدە – .– شایانی باسـه ئەم مرۆڤه لە ١٨٤٩/١١/٧ لـه گوندێکی سـەرکەناری زێـی دەلتـا لـه میـسر چـاوی بــه جیهـان هەڵهێناوه . لـه بنەماڵەیەکی مام ناوەندی بووه لـه میسر ... لـــــه ســــاڵی ١٨٦٦ پەیوەندی بە زانکۆی ئەزهەر لە شاری قاهیرەی پایتەختی میسر کردووه .

هـەروا پەیوەنـدی لـه گـەڵ جەماڵـەدین ئـەفگانی هـەبوو لـه زانکـۆی ئیـسلامی . بروانامـەی جیهـانی لـه زانکـۆی ئەزهـەر وەرگـرت لـه سـاڵی ١٨٧٧ . لـه سـاڵی ١٨٧٩ بـووه مامۆسـتای مێـژوو لـه قوتابخانـەی – دار العلـوم – لـه کۆلێـژی خانووی زانستەکانی ئالان – هـەروا مامۆستای ئاداب بوو لـه قوتابخانـەی – ئالالسن – و دوای ئەوه بەرەو جمووجۆڵی رۆژنامەگەری هەنگاوینا.
دوای ئەوه تاوانبارکرا بەلایەنگیری کردنی محەمـەد عرابی و بە بەنـدکردنی و دوای دەربـەدەرکرا بـۆ فەرەنـسا لـه سـاڵی ١٨٨٤، لـەوێ چـاوی کـەووت بـه جەلالـەدین ئـەفگانی و کۆمەڵـەی رۆژنامـەی ئیـسلامیان دامەزرانـد بـەناوی – المروة الوثقي – کە یەکەم رۆژنامەی عەرەبی بوو کە لە ئەورووپا دەرچێت .
دوای ئـەوه لـه سـاڵی ١٨٨٤ بـەرەو بـەریتانیا بەرێکـەووت ، دوایـی گـەراوه بـۆ فەرەنـساو دوایـی بـەرەو شـاری بـەیروت پایتــەختی لوبنـان بەرێکــەووت . خووێندنی زانستی کەلامی تەواوکرد , کە چەندین بابەت و کۆمەڵەی نهێنی پێکهێناو لە ساڵی ١٨٨٨ گەراوه میسر .
دوای ئـەوه بـه دادوەری شــەرعی راوێـژکاری لـه دادگـای پێداهەڵـچوونەوه دامەزراو دوای بووه موفتی لەمیسر ... لەیەکەمەکانی دامەزراندنی کۆمەڵەی

خێرخوازی ئیسلامی بووه ... ئەم مرۆڤە بەردەوام بووه لەکارەکانی تاکوو کۆچی دوایی کردووه لە میسر .

١٩٠٥/٨/٦ بۆ یەکەم جار لە مێژووی ڕووسیای قەیسەری ئەنجوومەنی یاسادانان پێك هێندرا بە ناوی – دۆما– یانی پەرلەمان ، کە هەندێ لە ئەندامانی بە هەڵبژاردن و هەندێکیان بە دامەزراندنی لە لایەن قەیسەری ڕووسیا بۆماوەی پێنج ساڵ ، کە لە ٤٤٢ ئەندام پێك هاتبوون. بە قێی ژمارەی دانیشتووانی ڕووسیا لە کێشووەرەکەدا .

١٩٠٥/٨/١٧ هێزەکانی سووپای عوسمانی بە یارمەتی سوارەی حەمیدی هێرشیان کردە سەر شاری لاهیجان لە رۆژهەڵاتی کوردستان بە بەبیانووی کۆکردنەوەی باج و ناوچەکەیان داگیر کرد.

١٩٠٥/٨/٣٠ رۆژ گیران لە سەر وولاتی توونس و دەوورووبەری کە بە تەواوی بەری رۆژ گیرا، ئەویش بە کەووتنە بەر مانگ بەرامبەر بەزەوی، واتە مانگ کەووتە نێوان ڕۆژو زەوی بە بەرگرتنی ڕۆژ بەرامبەر بە زەویدا .

١٩٠٥/٩/٥ بە هۆی لاوازی هێزەکانی سووپای ڕووسیاو کشانەوەی تا ئەو کاتەی ڕووسیای قەیسەری و ئیمپراتۆریەتی یابان گەیشتنە ئەوەی، کە پەیمانی پۆرتسمۆس لەئینگلترا مۆربکەن ، بە جووڵانەوەی و یابان بەئازادی سەربازی و رامیاری لە هەموو کۆریاو مەنشووریا. کە لەو کاتەش ڕووسیا لە هەموو کۆریاو مەنشووریا کشاوە ، بە گەرانەوەی بۆ ڕووسیا بەپێی ئەو ڕێکەوتنەی لە نێوانیاندا .

١٩٠٥/٩/٢٣ هونەرمەندو ئەکتەری سینەمایی خاتوو – گریتاگاریۆ– لە شاری ستۆکهۆلمی پایتەختی سووید لە چاوی بە جیهان هەڵهێناوە لە وولاتەکەدا .

١٩٠٥/١٠/٢٧ وولاتی نەرویژ سەربەخۆیی خۆی ڕاگەیاندو دوای ئەوە داواکانی شانشینی سوویدی ڕەتکردەوە ، بە کردنەوەی نووسینگەیەکی دبلۆماسی و بە هێزکردنی پەیووەندی لە نێوان هەردولایەندا.

ئـەم راگەیاندنـەش بـە نــاوی شانـــشینی ســووید بــوو . كــە پایتەختەكەی ناوی – ســــــتۆكهۆڵم – ە و ژمـــــــارەی دنیـــــشتووانەكەی ، ١,٧٥٨,٠٠٠ ملیـــۆن كەسە . هەروا ژمارەی دانیـــــــــشتووانی وولاتەكـەی ، ٩,٥٢٠, ٠٠٠ ملیـۆن كەســە . هــــەروا رووبــــەری وولاتەكـــەی ، ٤٤٩,٩٦٠ كیلـــۆ مـــەتر چـــوار گۆشـــەیە . هـــەروا چـــڕی دانیشتووانەكەی ، ٥٥ كەس لە یەك میل چوار گۆشـەدا . هـەروا نـژادەكانی ، سوویدیەكان ٩٣٪ . فنیوون ٢٪ . كچبەرانی ئەوروپی وكوردو لایبۆن ٦٪. لە وولاتەكەدا .

١٩٠٥/١١/١٦ لە دایك بوونی نووسەرو رووناكبیری كەسایەتی ناوداری كورد – حەسـەن فـەهمی جـاف – لـە شارۆچـكەی هەڵەبجـەی سـەر بە پارێزگـای سلێمانی لـە هەرێمی باشووری كوردستان .

ئەم كەسـایەتیە لـە مـاوەی ژیانیـدا توانیوویـەتی چـەندین بەرهـەم بابـەتی بـە سوود بگەیەنێتە دەست خوێنەری كوردو كتێبخانەی كوردی ، بە تایبـەتی لـە هەردوو بواری نەتەوەیی و نیشتیمانیدا لە هەرێمەكە و كوردستان .

## ١٩٠٦

١٩٠٦/٢/٢٥ کۆچی دوایی نووسەرو شاعیرو مامۆستای ئایینی – مەلا محەمەد مەلا عوسمان باڵخییە – ناسراو بە – مەحوی – لە شاری سلێمانی لە باشووری کوردستان ، هەر لە ژوورێکی خانەقاکەی خۆی بەخاك سپێردراوە ... جێگەی ئاماژە پێکردنە کە لە دایك بوونی مامۆستا مەحوی چەند بیروو بۆچوونی لە سەرە ، کە

مەحوی

محەمەد ئەمین زەکی دەڵێ :– مامۆستا مەحوی لە ساڵی ١٨٣٦ – ١٨٣٧ لە دایك بووە .

هەروا مامۆستا عەلائەدین سجادی دەڵێ :– مامۆستا مەحوی لە ساڵی ١٨٣٠ لە دایك بووە ... هەروا کاکەی فەلاحیش دەڵێ :–

–مامۆستا مەحوی لە ساڵی ١٨٣٦ – ١٨٣٢ لە دایك بووە . کە باوکی خەلیفەی شێخ عوسمان سیراجەدین بووە لەگوندی تەوێڵە لە باشووری کوردستان , مامۆستا مەحوی لەتەمەنی حەوت سالیدا خراوەتە بەر خووێندن و هەروا لەلای باوکیشی فێری خووێندەواری بووە ... دوای ئەوە بۆ خووێندن چۆتە سنەو سابلاخ و دوای ئەوە گەراوەتەوە شاری سلێمانی ، دوای ئەوە چۆتە شاری بەغداو لەلای مامۆستای ئاینی کورد –موفتی زەهاوی– خووێندنی تەواوکردووە و مۆڵەتی مەلایەتی پێ بەخشراوە .

دوای ئەوەی کە خووێندنی مەلایەتی تەواوکردووە بۆتە مەلای مزگەووتی ئیمامی ئەعزەم لە شاری بەغدا ، بەڵام لەساڵی ١٨٦٢ گەراوەتەوە شاری سلێمانی . بووە بەئەندامی دادگای سلێمانی .

دوای ئەوە باوکی لەساڵی ١٨٦٨ کۆچی دوایی دەکات و بەم هۆیەوە دەستی

لەكاری میری كێشاوەتەوەو بووەتە مەلاو دەستی كردووە بە وانە ووتنەوە بە فەقێیەكان ... دوای ئەوە مامۆستا مەحوی لە سالی ١٨٧٤ – ١٨٧٥ لە گەڵ چەند مەلایەك لەشاری سلێمانی دووردەخرێنەوە بۆ باشووری ئیستای ئێراق ... مامۆستا مەحوی لەژیان بەردەوام بووە لەكارەكانی لەوكات لە پێناو خزمەتكردنی گەل و نیشتیمانەكەیدا .

١٩٠٦/٤/١٨ گومەلەرزەیەكی گەورە لە شاری سان فرانسیسكۆ ڕوویدا ، كە بووە هۆی گیان لە دەستدانی زیاتر لە ٣٠٠,٠٠٠ هەزار هاوولاتی لە شارەكە و وێرانكردنی زیاتر لە ٣٠,٠٠٠ هەزار خانوو و باڵەخانەو پرۆژەو كێڵگە كشتووكاڵیەكان لە وولاتەكەدا .

١٩٠٦/٦/٦ مۆركردنی ڕێكەووتنامەی شاری ژنێف تایبەت بە چاكردنەوی ئەو كەسانەی كە تووشبووی نەخۆش و برینداری شەڕو زامداربوونیان لەكاتی جەنگ و لەپێناو یارمەتی دانیان لە جیهاندا .

١٩٠٦/٧/٤ پادشای قەجەریەكان – موزەفەرەدین شا – بەناچاری ڕەزامەندی لە سەر كەمكردنەوەی دەسەلاتەكانی خۆیدا كرد ، لە هەمان كات بەمەرسوومێكی شایانەی بڕیاریدا بە پێك هێنانی لێژنەی دامەزراندنی پەرلەمانی ئێران .
كە لەو كاتەوە تاكوو شۆڕشی ئیسلامی لە ئێران ، ئەو ڕۆژ بە ڕۆژی نیشتمانی ئێران دانراوەو یادی دەكرێتەوە ، دوور لە ڕێزگرتن لەنەتەوەكانی دیكە . بە تایبەتی گەلی كورد لە هەرێمی ڕۆژهەلاتی كوردستاندا .

١٩٠٦/٨/٥ لە ژێر پاڵەپەستۆی داواكاری موزەفەرەدین شا ئەو بڕیارەی ڕاگەیاند كە ماوەیەك بوو چاوەڕوانی لێدەكرا ، كە فەرمانەكان لە دوو مەرجدا خۆی دەگرت ، كە بۆ یەكەم جار لە مێژوودا وولاتی فارس بووە دەوولەتێكی دەسەلاتی دەستووری لە وولاتدا .
هەروا لێژنەی زانایان پێك هێنرا ، لەگەڵ هەندێ كەسایەتی نیشتیمانی و لیبرالی ، هەروا هەندێك لە ئەندامانی حكوومەت كە ئەمانە هەڵسان بە نووسینەوەی یاسای هەڵبژاردن ، دوای ئەوە پەرلەمان پێك هێنراو دەستوور ڕاگەیاندرا .
كە بڕگەی سەرەكی دەستوورەكە مەزهەبی شیعەو ئیمامەی كردە مەزهەبی

.فەرمی ووڵاتی فارس ، لەگەڵ ئەمەشدا دەووڵەتی عوسمانی سوونته بەرامبەری بوو ، بە مەزهەبی حەنەفی . کە ئەویش لیژنەی زانایانی پێك هێنا بۆ گرتنە دەستی چاودێری کردنی و دەستگیربوون بە یاساکانی شەریعەتی ئیسلام .

١٩٠٦/١٠/١٤ زاناو فەیلەسوفی ناوداری جیهانی و ئەڵمانی – هانا ئارنەت– لە شاری هانۆڤەری ئەڵمانیا چاوی بە جیهان هەڵهێناوە ، کە باوکی ئەندازیار بووە ، ناوی پاڵ ئارنەت بووە ، دایکی ناوی مارشا بووەو لە ساڵی ١٩٣٣ لە لایەن پارتی نازی لە ئەڵمانی دەستگیر دەکرێت و دوای ئەوە دایکی لە ساڵی ١٩٢٩ شوو بە کۆنترانشوون دەکات لە شاری بەلین لە ئەڵمانیا .

١٩٠٦/١٠/١٦ لە دایك بوونی رۆماننووسی بەناوبانگی ئیتالی و جیهانی – دیتۆبۆزاتی ... شایانی باسە ئەم نووسەرە لە ١٩٧١/١/٢٩ لە تەمەنی ٦٦ ساڵیدا کۆچی دوایی کردووە ... بەشی ماف لەزانکۆی میلانۆ خوێندووەو ژیانی خۆی لە شاری میلانۆ بەسەر بردووە .

یەکەم رۆمانی بەناونیشانی – برنایۆی شاخان – لە ساڵی ١٩٣٣ دەستی کرد بە نووسین و کە نووسینەکەشی رۆمانێکی کورت بوو . دوای ئەویش رۆمانی – نهێنی دارستانە کۆنەکە – لە ساڵی ١٩٣٥ نووسی ... دوای ئەویش رۆمانی – بیابانی ئەتار – ی نووسی ... ئیتر ئەم رۆماننووسە بەردەوام بوو لە نووسینی رۆمان و چیرۆك ... دوای ئەوە بەهۆی فلیمێکی

فەرەنسی – ئیتاڵی ناوبانگی دەركردو بەردەوام بوو تاكوو ماڵئاوایی لە گەل و ئیتاڵیاو جیهان كرد لە وولاتەكەیدا .

١٩٠٦/١١/٩ بە هۆی بەردەوامی خەبات و كۆششی چەوساوەكان و كرێكارو جووتیاران ، قەیسەری ڕووسی نیكۆلای دووەم ، لە ڕاگەیاندنی مەرسوومێكی قەیسەری جووتیارانی لە ژێر ڕژێمی دیلایەتی ڕزگار كرد .
ئەویش بە ئازاد كردنیان و پێدانی زەوی و خەریك بوون بەكاری كشتووكاڵی و رزگاربوونیان بە سەربەخۆی و خاوەن زەوی كشتووكاڵ لە وولاتەكەیاندا .

١٩٠٦/١٢/١ ڕژێمی شایانەی فارسی لە تاران بڕیاری هەلبژاردنی گشتی كۆمەلەی دامەزراندنی دەستووری وولاتی فارسیدا ، بێ ئەوەی بیر لە بوونی نەتەوەی كورد بكاتەوە . لە گەڵ نەتەوەكانی دیكەی ژێر دەسەلاتی خۆی بەتایبەتی لە ڕۆژهەلاتی كوردستاندا .

١٩٠٦/١٢/٢٨ تەواو بوونی دارشتنی دەستووری دەسەلات و وولاتی فارسی ، كە لە ٥١ مادە پێك هاتبوو ، لە گەڵ پاشكۆیەكی ١٠٧ مادەیی . كە لە ١٩٠٧/١١/٥ ئەو دەستوورە لەلایەن پەرلەمان پەسەند كرا.

● ● ● ●

١٩٠٧/٥/١٣ نووسەرو ڕۆماننووسی ناوداری بەریتانی و جیهان خاتوو – داڤینی دومۆرێ – لە بنەماڵەیەكی دیاری شانۆیی لە شاری لەندەنی پایتەختی بەریتانیا چاوی بە جیهان هەلهێناوە .. سیرگیرالد دومۆرێ باوكی ئەكتەرێكی بەناوبانگی شانۆیی ئینگلیزی دیاربووە ... هەروا دایكیشی – مۆریال بیمۆندی – بەهەمان شێووە هونەرمەند بووە . خاتوو مۆرێی لە بنەماڵەیەكی رۆشنبیری ئەو شارە بووە .
بۆ یەكەم جار كەسایەتی سفینگالی لە ڕۆمانی – تریلی – داهێنا . ئەم شتانە بوونە باكگراوندو ڕێگا خۆشكەر لە بەردەم چوونە ناوجیهانی نووسینی خاتوو دومۆرێی . كە لە تەمەنی منداڵی ئاشنای كۆمەڵە ئەكتەرێكی شانۆیی هاورێكانی باوكی دەبێ ، لەوانەش تامی سەركەووتن كە بەمە ناوبانگی دەركرد .

دوای ئـــەوە بـــەرەو بەنـــدەری کۆرتۆیەلی سەر دەریا دەچێت و ماوەیەکی درێژ لە ژیانی لەم جێگایــەدا بەســەردەبات ، کــە شــەپۆلی بــێ ئامــانی دەریــا و شـنە بـای فێنـك و باڵنـدەکانی ئاسمان دەبن بەئیلهام بەخشی ... دوای ئـــەوە روو لەشـــاری باریـــسی پایتـــەختی فەرەنـــسا دەکات و لەوێ خوێندن تـەواو دەکـات و دوای ئـەوە شـوو بـە فرودیـــك براونگـــی ژەنـــەرالی سەربازی دەکات .

یەکـەم رۆمـانی بـەناوی – گیـانی ئاشـق – لـە سـاڵی ١٩١٣ بڵاودەکاتـەوە و سـەرکەووتنێکی گـەوورە بەدەسـت دێـنێ ... ئـەم نووسراوەشـی بەیـەکێك لـە رۆمانە بەپێزەکانی ئینگلیزی دادەنرێت .

دوای ئەوە چـەند چیرۆك و رۆمـانی دیکـە دەخاتـە بەردەسـتی خوێنـەرانی . لەوانە :– جارێکی دیکە گـەنج نابمـەوە لـە سـاڵی ١٩٣٢ . جۆلیۆس لـە سـاڵی ١٩٣٣ . جامایکـا لـە سـاڵی ١٩٣٦ . رێبیکـا لـە سـاڵی ١٩٣٨ ، کـە ئەمـەیان لەلایـەن گـەووروە دەرهێنـەری ئەمـەریکی – ئەلفریـد هیتـشۆکی – دەکرێـت بەفلیمی سینەمایی و چەندین خەڵاتی ئۆسکاریشی پێ دەبەخشرێ .

بە دەیا بەرهەمی دیکەی بەدەستی خوێنەران دەگات و دوا بەرهـەمی بـەناوی – مــالی ســەرکەناری دەریــا – لــە ســاڵی ١٩٦٩ دەبــێ . ئــەم نووســەرو رۆماننووسە بەناوبانگە لەکارەکانی بێ ووچان دەبێ تاکوو لـە ١٩٨٩/٩/١٤ ماڵئــاوایی لــە رۆمــاننووس و نووســەرو دەرهێنــەرە ســینەمایی و ئەکتــەرو خوێنەرانی هاوخەباتی دەکات لە جیهان .

سەرچاوە :– www.wakapedya.com

٥ /١٩٠٧/٨ شاعیری بەناوبانگی فەرەنسی – ئۆگین گیلفیك– لە شارۆچکەی – کرنك – لە ناوچەی بەریتانیا ، چاوی بە جیهـان هـەڵهێناوە . جێگـەی ئامـاژە پێکردنـە کـە ئۆگین بـاوکی دەریـاوان بووەو دایکیشی بەرگدووربووە . بەهۆی بـاری ژیـانی

خێزانەکەی باوکی بۆتە پاسەوان لە سەر سنووری بەلژیکا . کە ئەمەش کاری کرد بووە سەرباری دەروونی ئۆگین .
دوای ئەوە خێزانەکەی لە ساڵی ١٩١٩ بەرەو ناوچەی – ئەلئەزاس – لە نزیک سنووری هاتووچۆی دەکرد ، لە پێناو ئەنجامدانی کارەکەی و دابینکردنی بژێووی ژیانی خێزانەکەیدا .
بە هۆی بەردەوامی لە خوێندنەوە ئەویش بە دۆزینەوەی هەردوو ئیماراتی فیکتۆر هیگۆ و رۆسۆو ، دوای ئەویش رامبۆو یودلێر و فیرلین ... کە ئەمەش یارمەتی دەری بووە بۆ وەرگێرانی شیعری شاعیران وەك – هۆلدراین و تراکل و گۆتە – بە هۆی فێربوونی زمانی ئەلمانی بەشێوەیەکی باش .
دوای ئەوەی کە قۆناخەکانی خوێندن تەواودەکات و بەهرەی شیعر نووسینی بە هەستەکانیدا دەخولێتەوەو دەگاتە قۆناخی ئەوەی ، کە ئەو شعرانەی بۆ زیاتر لە ٤٠ زمان وەردەگێردرێت و چەندین پاداشتی بە نرخ بەدەست دێنێ ، وەك پاداشتی مەزنی ئەکادیمیای سویسرە نیشتەجێ بوون . کە لەوکاتەش باوکی ماوەی چوار کاتژمێر فەرەنسی ... بەرهەمەکانی ئەم شاعیرە – هونەری شیعر – سروود – دوای ئەوە پێشانگایەکی فۆتۆگراف کردەوە بە ناوی – ووشەکان ووێنەی گیلفیك – ... لەگەڵ چەندین بەرهەمی دیکەی شیعری ، کە بۆتە هێمایەکی بەرزی فەرەنساو جیهان .

سەرچاوە:– دار الحیاة –٢٥/١٠/٢٠٠٧

١٩٠٧/٨/١٤ لە وتارەکەی – ماکس نوردۆ – لە شاری لاهای پایتەختی هۆلەنداو هەڵوواسینی جمووجۆڵی جوولانەوەو دەستکەوتەکانی لە ماوەی ١٠ ساڵی رابردووی ، ئەویش بە رەتکردنەوەی ئەو رەفتارانەی کە بەرامبەر جوولانەوەی سەهیۆنیزم دەکرا .
بە هۆی ئەوەی کە گوایە سەهیۆنیزم بەرچاو تەنگی ئاینی هەیە لەگەڵ دواخستنی پێشکەووتنی مەدەنیەت و زانست لەسەردەمی نوێدا ، هەروا گوتی:– بەڵام لە راستی ئەویش وانیە ، کە لە ناوەرۆکی وتارەکەی ماکس نوردۆدا هاتبوو ئەویش بەهۆی بەرژەوەندیە تایبەتمەندیەکانیان.

١٩٠٧/٨/٣٠ مۆرکردنی رێکەووتننامەی نێوان رووسیای قەیسەری و بەریتانیا ، بە مۆری قەیسەر نیکۆلای دووەم و شانشینی بەریتانیا ئەدواردی حەوتەم ... ئەم رێکووتنەش بووە هۆی ئەوەی کە نیووەی باکووری ئێران بکەوێتە ژێر

دەسەلاتی رووسیا ، هەروا نیووەکەی دیکەی باشوور بکەوێتە ژێر دەسەلاتی بەریتانیا .

بەلام ناوەراستی ئێران لە ژێر دەسەلاتداریەتی شای ئێران مایەوە، گەر چی ناوەندیش لە ژێر ئامۆژگاری بەریتانیا کاروبارەکەی هەلدەسوورێندرا ، کە شای ئێران وەك پۆلیسێکی جیّ بە جێکەر بوو لە وولاتەکەدا .

١٩٠٧/١١/١٤ بۆ یەکەمجار فرۆکەی هیلیکۆپتەر بەرەو ئاسمان هەلسا بەسەرکەوتووانە ... کە لە لایەن داهێنەری فەرەنسی – بۆل کۆرتۆ – بە ئەنجام گەیەندرا ... ئەمەش لەدوای چوار سال لە دواکەووتنی ئەم داهێنانە ...کە نموونەکەی بۆ یەکەمجار لەسەر شاری – کیتی هۆك – لەئەمەریکا لە سالی ١٩٠٣ سوورایەوە . ئەم داهێنانەش بەمەبەستی دامەزراندنی پیشەسازی فرۆکەوانی بوو ، کە لە بنەرەتا پیشەسازیەکی سەربازیە .

بەلام لە ئەمەریکا بۆ هەردوو لایەنی مەدەنی و سەربازی بەکاردەهێنرا . وا رێکەووت کە یادکردنەوەی ١٠٠ سالەی دروستکردنی فرۆکەی هێلیکۆپتەر کەوتە کاتەکانی لێدانی ئەفگانستان وئێراق ، کە زیاتر لە ١,٥ ترلیۆن دۆلار خرجیەکانی بووە .

سەرچاوە :– دار الحیاة ... ١٠٠٧/١١/١٩.

١٩٠٧/١٢/٢٠ مۆرکردنی رێکەووتنامە بە ناوی پەیمانی – واشنتۆنی پایتەختی ئەمەریکا – ، لە نێوان کۆمارەکانی پێکهاتووی ئەمەریکای ناوەندی پێنجەم ، کە هەلسان بە دامەزراندنی دادگای دادپەروەری بۆ پێنج وویلایەت لە ئەمەریکا ، کە ئەم وویلایەتانە ئەمەریکای لیّ پێکهاتووەو بەپێی مادەی /٣٠

لەپـــەیمانی فرسـای سـاڵی ١٩١٩، کـه دوای ئـەوه بـووه یاسـایەك لەیاسـا بنەڕەتیەکانی یەکگرتنی وویلایەتەکانی ئەمەریکا لە کێشووەرەکەدا .

## ١٩٠٨

٣ / ١٩٠٨/٢ شـاری مـەهابادی ڕۆژهـەڵاتی کوردسـتان لـه لایـەن هێزەکـانی سـووپای عوسمـانی داگیرکـراو دوای سـێ هەفتـه لێـی کـشانەوه لـه دوای بـه ئەنجامگەیاندنی مەرامەکانیان له هەرێمەکەدا .

٨ / ١٩٠٨/٣ لـه دوای هـەوڵ و خـەباتێکی بـێ ووچـانی سـەر کردەکـانی ئافرەتـان و کەسایەتیه ناودارەکانی ئافرەتـان ، کە ئـەنجامی بووه هـۆی ئـەوەی کـه ئـەم ڕۆژه بکرێ بە ڕۆژی جەژنی ئافرەتان له جیهان .
ئـەویش لـه ڕاگەیەندنیکـدا کـه هـەموو سـالێك یـادی ئـەو ڕۆژه دەکرێتـەوه بەبەرگری کردن لە مافەکانی ئافرەت ، لـەپێناو کـارو هاوکـاری شـان بەشـانی پیاوان له هەموو بواره جیاجیاکان له جیهاندا .

١٩٠٨/٣/١٨ له دایك بوونی زاناو فۆلکلۆرستی ناوداری کورد پرۆفیسۆر مامۆستا حاجی جوندی له باکووری کوردستانی ژێر دەسەڵاتی ئیمپراتۆریەتی عوسمانیدا .

١٩٠٨/٤/٢٧ پێشبڕکێی یارییەکانی جامی جیهـانی پاڵەوانیـەتی – ئۆلـەمپیات– لەشـاری لەنـدەنی پایتـەختی بـەریتانیا ئەنجامـدراو بـەردەوام بـوو تـاکوو ١٠/٣٠ ی هەمان ساڵ شارەکەدا .

١٩٠٨/٥/٢١ دامەزرانـدنی قوتابخانـەی هونـەره جوانـەکان لـه شـاری قـاهیرەی پایتـەختی میسر ، له لایەن ئەمیر یوسف کەمال ، لـه شـەقامی ڕێگـا جـەمامیز لـەخانووی ژمـاره/١٠٠ . ئـەم قوتابخانەیـه ڕۆلـی گرنگـی گێـرا لەدەرچـوواندنی بەسـەدا کـەس لـه دوای فێرکردنیـان لـه هـەموو بوارەکـانی هونـەری مۆزیکـا و پەیکەرتاشی و وێنەکێشان و چەندین هونەری شێووەکاری دیکه .
سەرچاوه:– دار الحیاة –٢٠٠٧/٥/١٦

١٩٠٨/٦/١٦ به هۆی هێرشی هێزی چەکداره کوردەکان بۆ سـەر ئاشـوورییەکانی لایـەنگری ڕووسـیای قەیـسەری ، کـه بـەو هۆیـه کوونـسلی ڕووسـی لـه شـاری تـەبریز . بروسکەیەکی ئاراستەی وەزارەتی دەرەوەی ڕووسیا کرد له هەرێمەکەدا .

کە کاری بە پەلە نەکرێت بۆ ڕزگار کردنی دانیشتووانی ئاشووری لە ناوچەکانی ، کە گیروگرفت و کووشتاری تیایە لە ڕۆژهەلاتی کوردستانی ژێر دەسەلاتی فارسی و عوسمانی، لە بەردەست تێووەردانی لایەنە پەیووەندداراەکان..

١٩٠٨/٦/٢٢ سەرەك وەزیرانی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی – سەدر ئەعزەم- فەرمانی دا بە تاهر پاشای نووێنەری تورك و ئەندامی لیژنەی – جێگیر کردنی سنوور- ، کە هەموو هێزەکانی سووپای عوسمانی لەو ناوە بکشێنەوە ، بۆ ناوچەکانی دیکە کە کێشەی لەسەرە و ماوە نەدرێت بۆ پەلاماردانی دانیشتووانە تورکەکان لە باکووری کوردستان بەپێی ئەو بەلێنانەی کە لێیان وەرگیراوە ، لە لایەن کاربەدەستانی عوسمانی لە هەرێمەکەدا .

١٩٠٨/٦/٢٣ لە دوای مردنی شا موزەفەرەدین لە سالی ١٩٠٦ قۆناخێکی نویٚ دەستی پێکرد لەگەلٚ شای قاجاری نویٚ – مەحەمەد عەلی – کە بڕوای بە کارەکانی شا موزەفەرەدین نەبوو لەبنەڕەتا ، هەرچەندە لەوکات دەنگی بۆ دەستوورو پەرلەمانیشدا .

دوای ئەوە هەلوویستی خۆی ڕاگەیاند دژی جوولانەوەی دەستووری و بووە هۆی ئەوەی ، کە بڕواشی بە ئەنجوومەنی نووێنەران کە ئەندامانی لە مەلایەکان پێك هاتبوو ، نەبێت ئەمانە هەمووی هۆکاری ئەوەبوون ، کە ڕووسەکان پشتی مەحەمەد عەلی بگرن و وەك کودەتایەك . ئەویش بەچەند فرقەیەکی قوزاقی فارسی و بە پشتیووانی سەرکردەی ڕووس هەلووەشاندنەوەی پەرلەمانی ڕاگەیاند و حکوومەتی سەربازی پێکهێنرا .

ئەمەش لەدوای دووسالٚ لەبەسەرچوونی یەکەم هەلبژاردن و یەکەم پەرلەمان و یەکەم دەستوور لە وولاتی فارسی و ئەم داروودەستەیان گرت و زۆربەی هەرەزۆریان لە سێدارەدان .

١٩٠٨/٦/٣٠ دۆزینەوەی کەشتییەکی ئاسمانی کە لە دورستکراوی مرۆڤ نەبووەو تەقیتەوە لە ناوچەی- تفگوسگای- هەرێمی سیبیریای ڕووسی، کە زانایان لێکۆلینەوەیان لەسەر پارچەیەك لەو کەشتیە کردبوو. کە کێشەکەی پەنجا

کیلـۆگرام دەبـوو ، کـە ئـەویش بـووە هـۆی وێرانکردنـی زیـاتر لـە ۲۰۰۰ کیلۆمـەتر چـوار گۆشـە لـە دارسـتانەکانی سـیبیریا. شـایانی باسـە کـە تاکوو ئێستا نهێنیەکانی ئەو کەشتیە بەتـەواوی ئاشـکرا نـەکراوە لەلایـەن دەسـەڵاتە یەك لـە دوای یەکـەکانی ڕووسـیا، کـە چـەند کیلـۆ مـەترێك لـە زێـی تفگوسـگا دور دەبێ لە سیبریادا .

۱۹۰۸/٦/۳۰ ڕوودانـی پێکـدادان لـــە نێـــوان زەوی و نیـزك ... لـەم ڕۆژەدا ئەسـتێرەی نیـزك لـە ناوچـــەی ســـیبیریا بەکێـشی ٤٥ هــەزار تـەن خۆیـدا لـە زەوی بەقەبارەی ٤٠ مەتر . لـــەو خـــۆ بـــە زەوی دادانـە بـووە هـۆی لـە

ڕیشەکێـشانی ۸۰,۰۰۰,۰۰۰ ملیـۆن لـە دارو درەخـت و ۲۰۰ قـۆرتی لـە زەوی دروستکرد .

... هـەروا خـۆدانی نیـزك لـە زەوی لـە وویلایـەتی ئیریزونـا لـە ئەمـەریکا کـە کێشی ۹۲۰۰ هەزار تەن بوو . ئەو قۆرتە یاخوود کەندەکە بە بازنـەی ۱,۹۲ کـم دروسـتکرد بـە قـووڵی ۱۷۰ مـەتر ... ئەسـتێرەی نیـزك بـەدەیا جـار پارچەکانی کە لەو ئەستێرە جیادەبنـەوەو دەکەونـە سـەر زەوی مەترسـیدارەو گەر لە شارێك یاخوود لـە ناوچـەیەك بـدات دەبێتـە هـۆی وێرانکردنـی بـە پێـی قەبارەو گرانی ئەو پارچە جیابووەو لە سەر گۆی زەویدا.

هـەروا ئەسـتێرەی – مزنـب – لـە هـەر ۷٦ سـاڵ جارێك دەردەکـەوێت , کـە یەکـەم دەرکـەووتنی لـە سـاڵی ۱۹۱۰ بـووەو دوا دەرکەووتنیـشی لـە سـاڵی ۱۹۸٦ بووە ، بەرامبەر بە دانیشتووانی سەر گۆی زەوی لە جیهان .

هـەروا مزەنـەبی – بنیـت – لـە مـانگی/٤/۱۹۷۰ دەرکـەوتووە ... مزەنـەبی – بیلیـە – لـە سـاڵی ۱۸۲٦ دەرکـەوتووە ... مزەنـەبی – هیـل ویـب – لـە سـاڵی

١٩٩٧ دەرکـەوتووە ... سـەرەرای دەرکـەوتنی دیکـەی لـە ماوەکـانی رابـردوو لـەنێوان ئـم سـاڵانەدا ... ئـەویش بـەهۆی بـوونی کـامێرای تلسکۆبی هابل و چەندین رێگـەی دیکـەی تەکەنەلۆژیا , کە بەپێچەوانەی بەر لـە ناوەندەکانی سەدەی رابردوو بووە لە جیهان .

سەرچاوە :– آیات العلوم الکونیة – بەرگی ½ ل/١٦٣ دانانی کۆمەڵە زانایەکی جیهانی کە ژمارەیان ٢٦٩ زانایە . چاپی یەکەم /٢٠٠٧ .

١٩٠٨/٧/٦ نووێنـەری کـورد – شـەریف پاشـا – وازی لـە کـاری بـاڵوێزی دەسـەڵاتی عوسمانی تورکی هێنا ، کە باڵوێزی عوسمانی بوو لە وڵاتی سووید بەهۆی توونـد ڕەوی و شۆڤینی دەسەڵاتی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی و ئازاردانی کورد لە بـاکووری کوردسـتان و ناوچەکانی دیکـەی ژێـر دەسـەڵاتی عوسمـانی لـە کوردستاندا .

١٩٠٨/٧/٩ لـە کۆبوونـەوەی ئەنجوومـەنی وەزیرانـی دەسـەڵاتی عوسمـانی تـورك سەرهەڵدانی کێشەکان دەرکەووتن ، کە ناکۆکی گەیشتە ناو ئەنجوومەن ، کە لەوکات ڕەزا شا بەرگری لـە ئیتحادیـەکان دەکـرد ، بەڵام ئیسماعیل شـا دژی هەلوویستی ئیتحادیەکان وەستا.

١٩٠٨/٧/٢٣ کۆبوونـەوەی کۆمـەڵێك لەپێنووسـە ڕۆشـنبیرو ڕووناکبیری خێرخـوازی کـورد لەشـاری ئەسـتەمبۆڵی تورکیـا ، لـە پێنـاو دامەزرانـدنی کۆمەڵـەی کـوردی بـۆ ڕاست کردنەوەی ڕۆژنامەی کوردی لە پێناو خزمەتی زمان و کـەلتوورو داب و نەریت و مێژووی کورد لە کوردستاندا .

١٩٠٨/٧/٢٣ بـەرپابوونی کودەتـای کۆمەڵـەی ئیتحادیـەکان لـە تورکیـای ژێـر دەسـەڵاتی عوسمانی ، کە بووە هۆی دامەزراندنی دەووڵـەتێکی دەسـتووری ئیمپراتـۆری عوسمانی تـورك ، کـە ئـەویش کاردانـەوەی خراپـی کـردە سـەر بزووتنـەوەی ڕزگاری کورد لە کوردستان بەتایبەتی لە باکووری کوردستان .

١٩٠٨/٧/٢٣ بە هەفتەیەك لە دوای ڕاگەیاندنی شۆڕشی دەستووری دەووڵەتی عوسمـانی ، ئیـبراهیم پاشـای مللـی ڕاپـەڕینی خـۆی ڕاگەیانـد لـەپاریزگای دیاربـەکر لـە بـاکووری کوردسـتان ، کـە لـەو کاتـە بـەرەو شـاری منـەوەرەی سـعوودی

دەگەراوە

بەلام ئالای راپەرینی دژی دەسەلاتی عوسمانی راگەیاندو گەراوە شاری ویرانشەهرو گەمارۆی هێزەکانی سووپای عوسمانیدا لە شارەکەو دەووروبەری ، بەلام لە دوای بلاوبوونەوەی ئەو کارە دانیشتووانی پارێزگای دیاربەکر تووشی دلخۆشیەکی سەرسوورمان بوون ، لەهەمان کات وەزیری جەنگی عوسمانی راگەیاندنی بلاوکردەوە ، ئەویش بە ناونووس کردنی هێزی سووپای یەدەگی فریاکەووتن لەپارێزگای دیاربەکر لەباکووری کوردستان .

١٩٠٨/٧/٢٤ لە ئەنجامی هەولو توانای کۆمەلەی ئیتحادو تەرەقیو بەرپابوونی راپەرین لە لایەن ئەندامەکانی ، لە ئاکامی ئەو راپەرینەو لە باری بارودۆخەکە پرژانە ناو هێزەکانی سووپای عوسمانیو دامودەزگا هەمەجۆرەکانیدا .

کە کاردانەوەی کردە سەر دەسەلاتی عوسمانیو پالەپەستۆی لە سەر دەسەلاتی سولتانی عوسمانی سولتان عبدالحمیدی دووەم ، بە لەکار وەستاندنی دەستووری سالی ١٨٧٧دا .

١٩٠٨/٨/١٧ دامەزراندنی لقی کۆمەلەی ئیتحادیو تەرەقی لە شاری سلێمانی لەباشووری کوردستان لە لایەن ئاغا فەتحوللا چەلەبی .

١٩٠٨/٨/٢٢ یەکەم دورستکراوی شەمەندەفەر دەستی بەکارکرد ، کە لە شاری مەدینەی منەوەرەی سعوودی گەیشتە شاری دیمەشقی پایتەختی ئێستای سووریا ، کە ئەمە خەونێکی بێ وێنە بوو لەلایەن وولاتانی ئیسلام لە هەرێمی شام کە سێ رۆژی خایاند .

١٩٠٨/٩/٢٥ بۆ یەکەم جار لە مێژوی کورد لە تورکیای عوسمانی یانەی کوردی لە تورکیا دامەزرا ، بە مەبەستی کردنەوەی قوتابخانەو کردنی زمانی کوردی بە زمانی رەسمیو دامەزراندنی فەرمانبەری کورد لە دامو دەزگا هەمەلایەنەکانی دەوولەتی عوسمانی داگیرکەری خاکی کوردستان.

١٩٠٨/٩/٢٥ دامەزراندنی کۆمەلەی هاوکاری و تەرەقی کورد لە دوای سەرکەووتنی کودەتای مانگی/١٩٠٨/٧ دژی سولتانی عوسمانی سولتان عەبدولحەمیدی دووەم .

ئەم کۆمەڵەیە توانی گۆڤارێك دەربکات بەناوی – کورد هاوکاری تەرەقی گەرتسی – کورد و تعاون وترقی گەزتسی – کە ببێتە زمانحاڵی و ئەم کۆمەڵەیە بە نووسەرو شاعیری ناوداری کوردی – پیرەمێرد – بەخاوەنی ئیمتیاز دەست نیشان کراوو ، لە هەمان کات بەرپرسی نووسین ...لە هەمان کات ئەحمەد جەمیل دیاربەکری بەسەر نووسەر هەڵبژارد .

کە گۆڤارەکە لە چاپخانەی – سیلانیك – و – ناوەند – دەرکرا لەشاری ئەستەمبوڵ لە تورکیا ، ئەم گۆڤارەش دەگەیشتە زۆربەی شارەکانی کوردستان بەگشتی و کاردانەوەیەکی گرنگی بینی لەبەرزکردنەوەی هەستی نەتەوەیی و رۆشنبیری و بووە هۆکاری ئەوەی ، کە ئەم کۆمەڵەیە چەندین لقی لەشارەکانی کوردستان بکاتەوە لە هەموو شارەکانی کوردستان بە باکوورو باشووریەوە .

١٩٠٨/٩/٢٥ دامەزراندنی کۆمەڵەی بەرزی پێشکەووتنی کوردی لە شاری ئەستەمبوڵ لە لایەن – ئەمیر عالی بەدرخان –ژەنەراڵ شەریف پاشا– شەهید سەید عەبدولقادر، لە پێناو بە رۆشنبیر کردنی گەلی کوردستان و لە پێناو بەهێزکردنی بزووتنەوەی رِگاریخوازی کورد لە باکووری کوردستان.

١٩٠٨/١٠/٥ وولاتی بوولگاریا سەربەخۆیی خۆی راگەیاند ، بە جیابوونەوەی لە ژێر دەسەلاتی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی و لەژێر سەرکردایەتی ئەمیر فردینالند ، بەلاّم دوای ئەوە نازناوی خۆی گۆڕی بۆ ناوی قەیسەری بوولگاریا ... و بەردەوام بوونی تاکوو ساڵی

١٩٤٦/٩/٨ به راگەیاندنی کۆماری بوولگاریا
کە ناوی پایتەختەکەی – سۆفیا – یەو ژمارەی دانیشتووانی ، ١,٣٩٠,٠٠٠ ملیۆن کەسە . هەروا ژمارەی دانیشتووانی وولاتەکەی ، ٩,٨٥٠,٠٠٠ ملیۆن کەسە . هەروا رووبەری وولاتەکەی ١١٠,٩١٠ کیلۆ مەتر چوار گۆشەیە . هەروا چڕی دانیشتووانەکەی ، ٤٠٨ کەس لە یەك میل چوار گۆشەدا . هەروا نژادەکانی ، بوولگاریەکان ٨٧٪ . تورك ١١٪ ز لە وولاتەکەدا .

١٩٠٨/١١/٧ بە پێی پەیمانی هەرێمەکانی تەوەری شەڕو ڕێکەووتن لە نێوان نەمساو ئیمپراتۆریەتی عوسمانی مۆرکرا ... کە نەمسا قەرەبووی داگیرکردنی بۆسنەو هرسکی گێراوە ، کە دەسەلاتی تێدا دەگێڕا هەر چەندە وویلایەتی کانتا لە ژێر دەسەلاتی عوسمانیدا بوو، بەلام دوای ئەوە ئیمپراتۆریەتی نەمسا خستیە ژێر دەسەلاتی خۆی ، کە بووە هۆی لێك ترازانی پەیووەندی لە نێوان بۆسنەو هرسك لەگەڵ نەمسا لە بەر ئەوەی سربیا داوای خاوەنداریەتی بۆسنەو هرسکی دەکردەوە لە هەرێمی بەلکاندا .

١٩٠٨/١١/٩ بلاو کردنەوەی یەکەم ژمارەی ڕۆژنامەی – کورد – لەلایەن زاناو کەسایەتی و شاعیری نەتەوەی کورد تۆفیق بەگ – پیرەمێرد – لەشاری ئەستەمبۆلی پایتەختی ئەوسای ئیمپراتۆریەتی عوسمانی ، کە سەرنووسەرەکەی – ئەحمەد جەمیل پاشا – بوو. لە شارەکەدا .

١٩٠٨/١١/٢٣ جێگری کوونسلی ڕووسیای قەیسەری – ئکیمۆفیتش – لە شاری ئەستەمبۆلی پایتەختی دەسەلاتی عوسمانی نامەیەکی ئاراستەی وەزارەتی دەرەوەی ڕووسیا کرد .
به ناوی ئەوەی کە نادی کورد لەهەرێمی یەریڤان و باکووری کوردستان، کە ژمارەی ئەندامەکانی لە ٧٠,٠٠٠ هەزار ئەندام زیاتر بووە. لە دوای دامەزراندنی نادیەکە لە هەرێمەکەدا .

١٩٠٨/١١/٢٩ بلاوکردنەوەی یەکەم ژمارەی ڕۆژنامەی – التعاون والترقی الکردی – لە شاری ئەستەمبۆل لەلایەن تۆفیق بەگ – پیرەمێرد – ی شاعیری گەورەی نەتەوەی کورد بووە لە کوردستان.

## ۱۹۰۹

٥ / ۱۹۰۹/۱ لە دوای ناردنی شێخ سەعیدو بنەماڵەکەی بۆ شاری مووسڵ ، بەپێی پیلانێکی داڕێژراو لەلایەن کار بەدەستانی وویلایەتی موسڵ ، لە ئەنجام شێخ سەعیدو شێخ ئەحمەدی کوڕیو چەندین کەسایەتی دیکەی کورد شەهید کرانو شێخ مەحمودی حەفید بریندار کرا لە کردەوەیەدا .

۱۹۰۹/۱/۲۲ لە دایك بوونی فەیلەسوف سۆفیگەری رۆژئاوای سەدەی رابردوو – مارتن لێنگس – لە هەرێمی لانکشاری وولاتی ئینگلتەرا ... خووێندنی لە کۆلێژی ماگدلینی لەزانکۆی ئۆکسفۆرد تەواوکردووە ...لەچەندین زانکۆی دیکە خووێندنی تەواو دەکات و بۆ ووتنەوەی زمانی ئینگلیزی بەرەو لیتوانیا دەچێت . لە ساڵی ۱۹۲۹ روو لە شاری قاهیرەی پایتەختی میسر دەکات و لەزانکۆی قاهیرە دەبێتە یاریدەدەری گوینۆن ی فەلسەفەی فەرەنسی .
لەدوای شۆرشی میسر لە ساڵی ۱۹٥۲ و ئەم وولاتە بەجێ دێڵێ .
هەروا بروانامەی دکتۆرا لە سەر ئەحمەد ئەلحەوی سوفی پێشکەش دەکات و لە ساڵی ۱۹٦۱ بە ناوی وەلی سۆفی ، لە سەدەی بیستەم بلاوی دەکاتەوە .
هەروا لە ساڵی ۱۹۷٥ پەرتووکێك بەناوی – هێماونموونەکان لە ئیسلامدا – بلاودەکاتەوە .
ئەم مرۆڤە لە ژیاندا پێنووسەکەی بەرهەم هێنانی لە پەرتووکی گرنگ بەردەوام دەبێت تاکوو لە ۲۰۰٥/٥/۱۲ کۆچی دوایی دەکات و بەرهەمەکانی وەك خەزنەیەکی پر لە بەهاکانی جێ دێڵێ لە وولاتەکەیدا .

۱۹۰۹/۲/۸ سوڵتانی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی سولتان عەبدولحەمیدی دووەم لەلایەن تورکە ئیتحادیەکان لەدەسەلات لابرا .

۱۹۰۹/۲/۲٥ شاندێکی کوردی ئێزدی بە سەرۆکایەتی – ئیسماعیل پۆل – لە گەڵ بەرپرسانی دەسەلاتی عوسمانی کۆبوونەوەیەکی رێکەووتنیان لە سەر ئازاردانی ئێزیدیەکان مۆرکرد ، بەلام ئەنجامەکەی بێ سوود بوو ، بەهۆی هەلوویستی شۆڤینیانەی دەسەلاتی عوسمانی بەرامبەر بە کورد لە

کورستاندا . بەتایبەتی لە هەرێمی باشووری کوردستان .

١٩٠٩/٣/٣١ بە هاندان و پشتگیری سولتان عەبدولحەمید شۆرشی بەناو دژی دەستوور بەرپابوو ، بە ناوی شۆرشی دەروێشەکان . ئەویش بەلابردنی بنەما بنەرەتیەکانی دەستووری عوسمانی وگەرانەوەی بۆ جێ بەجێکردنی تەواوی شەریعەتی ئیسلامی لە سەر هەموو ناوچەو هەرێمەکانی ژێر دەسەلاتی عەبدولحەمید ، لە ئەنجام بووە هۆی لابردنی سولتان عەبدولحەمید و کردنی محەمەد رەشاد بە سولتانی عوسمانی ، بە ناوی سولتان محەمەدی پێنجەم لە سەر ئیمپراتۆریەتی عوسمانی تاکوو هەرەس هێنانی ئیمپراتۆریەتەکە.

١٩٠٩/٤/٢٧ سولتان رەشاد بە ناوی سولتان محەمەدی پێنجەم ، دەسەلاتی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی گرتە دەست ، لەدوای لە دەسەلات لابردنی سولتان عەبدولحەمیدی دووەم ، لە سەردەسەلاتی ئیمپراتۆریەتی عوسمانیدا .

١٩٠٩/٤/٢٧ کۆبوونەوەی ٢٤٠ ئەندامانی ئەنجوومەنی ئەعیان ، لە کۆبوونەوەی هاوبەش و بریاری تەواویاندا بەدامالینی دەسەلات لە دەست سولتان عەبدولحەمیدی دووەم و رەشنووسەکەی دەستوور بۆ بریاردان لەسەری ئامادە کرا .

بەلام ئەمیندادی فتواکە نوری ئەفەندی بوو خۆی داوای ئەو کۆبوونەوەی کرد بوو ، ئەو داوایەی رەتکردەوە تەنیا هەندێ لە بەشەکانی کۆتایی نەبێت ، کە ئەمەش کودەتایەکی سەرەکی بوو لە بەلاوەنانی دەسەلاتی عوسمانی لە پێناو بەهێزترکردنی دەسەلاتی عوسمانی بەپێی گۆرانکاری سەردەمیانەدا .

١٩٠٩/٤/٣٠ بە هۆی کار لێکردنی رامیاریەتی لە کۆمەڵەی ئیتحادو تەرەقی و کودەتای دەستووری لەسەر دەسەلاتی عەبدولحەمید ، بە یارمەتی دانی جوولەکە لە داهاتووی دەسەلاتی نووێی تورکیا ، کە ئەم کارە لە ئەنجام سەرکەووتنی بەدەست هێنا لە هەموو بوارەکان . کە ئەم رۆژە ناوزەند بوو بە رووداوی ٣١ / مارت لە ساڵەدا .

١٩٠٩/٧/١٦ بە هۆی درووست بوونی کێشەو ململانێی لە نێوان جوولانەوەی دەستوریەکان و دەسەلاتی سەربازی لە وولاتی فارس ، هێزێکی ٥٠٠٠ پێنج هەزار چەکدار لە بەختیاریەکان – هۆزە ئێرانیەکان – بەرەو تارانی پایتەختی وولاتی فارس بەرێکەووت لە ئەنجام فرقەی قۆزانیەکان دەسەلاتی

مەحەمـەد عـەلی بـەلاوەنا و زۆربـەی زۆری شـارەکانی وولاتـی فارسـیان داگیرکـردو بـووە هـۆی ئـەوەی کـە مەحەمـەد عـەلی شـا ڕوو لـە باڵوێزخانـەی ڕووسیای قەیسەری بکات و دوای ئـەوە بـەرەو ڕووسیا هـەڵات ، دوای ئـەوە سـەر لـە نـووێ پەرلـەمان پێـك هێنرایـەوە و بڕیـاری لەدەسـڵات خـستنی مەحەمەد عەلی شایان داو عەزد ئەلمەلك سەرەك هۆزی قاجار كرا دەسەلاتدار لەسەر ولاتی فارسدا .

کـە ئەمـەش بـووە هـۆی بـەرپابوونی شـەڕ لـە نێـوان ڕووسـیای قەیسەری و دەسـەلاتی مەشـروتیەکان ، کـە بەریتانیـەکان لەگـەڵ عـەزد ئەلمـەلك و لایەنگرانی بوون – واتە جوولانـەوەی دسـتووری – کـە ئەمـەش ڕوون بـوو ، بـە جیـاوازی لـە نێـوان هـەردوو دەوڵـەتی دەرەکـی ڕووسـیاو بـەریتانیا کـە کاریگـەری لەسـەر وولاتـی فـارس هـەبوو هەریـەك بـۆ ئـەوەی دیکـە پشتگیری دەکردلە پێناو بەرژەوەندی تایبەتیان لە وولاتەکەدا .

١٩٠٩/٧/٢٦ لـە دوای بڵاوبوونـەوەی دەنـگ وباسـی هەڵوواسـینی فلیمـی سـینەمایی لـە شاری پاریسی پایتەختی فەرەنسا لـە ١٨٩٥/٤/٢٨، کە دانیـشتووانی شـاری بەغـداش بـەم کـارە سـحراویەیان زانـی و بـەکارێکی هونـەری بـێ وێنـەیان لەقەڵەمدا ، لە دوای هەوڵێکی زۆر لـەم ڕۆژەشـدا لـە دارولشەفا کـە دەکەوێتـە کەرتی گەرەکی کەرخ بۆ یەکەمجار نیشانی دانیـشتووانی شـاری بەغدایان دا کە لەوکاتە فلیمەکان پێیان دەگووترا فلیمی یاریەکان .

دوای ئـەوەش بـە دووسـاڵ واتـە لـە ١٩١١/٩/٥ بەچـاودێری والـی بەغـدا – ئەحمە جەمال بەگ –ولـە دوای ڕۆژئاوابوون فلیمێکی بێ دەنگیـان نیشانی دانیشتووانی شاری بەغدا دا لـە گۆرەپـانی – پستان – لەگـەرەکی عوینـە لـە تەك کەرتی رەسافە .

کـە تابلۆیـەك لـەو فلیمـە دەردەکـەووت ، ئـەویش تەرمەکـەی شانـشینی ئینگلتـەرا ئـەدواردی حەوتـەم بـوو ... دوای ئـەوەش کـە بـەریتانیا لـە ١٩١٧/٣/١١ گەیـشتە نـاو خـاکی ئێـراق و شـاری بەغـدا ، وزەی کارەبـاش لـە شاری بەغدا داگیرساو زیاتر گرنگی بەبواری سینەمە درا لـە گۆرەپانـەکان و لە هۆڵە شانۆییەکان .

بـەلام بەشـێوویەکی فـەرمی شاشـەی سـینەما لـە ئێـراق لـە سـاڵی ١٩٢٧

هەڵوواسـرا لـە سـینەمای نیـشتیمانی ئێراقـی لـە شـاری بەغـدای پایتـەختی ئێستای ئێراق .

١٩٠٩/١٠/١٥ بڵاوکردنـەوەی یەکـەم ژمـارەی گۆڤـاری – شـروقیەت– بـە زمـانی فەرەنـسی لەپاریـسی پایتـەختی فەڕەنـسا ، لەلایـەن کەسایەتی نـاوداری کـورد ژەنـەراڵ شەریف پاشای خەندان .

١٩٠٩/١١/٢١ ڕۆژنامـەی – ڕەقیـب– کـە باشـترین ڕۆژنامـەی ئـەو کـاتی وویلایـەتی بەغـدا بووەولە بابەتێکی بلاوکروەیدا لە ژمارە/ ٦٦ی دا ، کە لە بەغدا چاپکرا داوا لە لە تورکەکان دەکات و دەڵێ :–

پێوویـستە لەسـەر حکوومـەتی دەسـتووری عوسمـانی لـە وویلایەتـەکانی ئـەو کەسـایەتیانە دابمـەزرێنن ، کـە زمـانی ناوچـەکەو نەتەوەکـە دەزانن ، واتـە لـە کەســایەتی نەتــەوەی دانیــشتووانی ناوچــەکە بــێ نــەك یــەکێکی دیکــە دابمەزرێنن و ببێتە هۆکاری چەوسانەوەو ئێش و ئازاردان.

## ١٩١٠

١٩١٠/ ١ /١٣ تـیرۆر کردنـی سـەرەك وەزیرانـی میـسر – بـترۆس غـالی – لەلایـەن ئیـبراهیم ناسف وەردانی لە کۆمەڵەی هاوکاری برایەتی لەمیسر.

١٩١٠/ ١ /١٣ کۆچـی دوایـی شـاعیرو نووسـەری نەتـەوەیی نـاوداری کـورد – شـێخ ڕەزای تالـەبانی – لـە شـاری بەغـداو گۆڕەکـەی لەمەزارگـەی شـێخ عەبـدولقادری گەیلانیە لە شارەکەدا .

١٩١٠/ ٢ / ٨ دامەزرانــدنی کۆمەڵــەی هــەیڤی لــە شــاری ئەســتەمبوڵ ، کــە ئێــستا ئــەو پارێزگایە زیاتر لە ٣,٠٠٠,٥٠٠ ملیۆن هاووڵاتی کوردی لێی نیشتەجێن .

. یەکەم :– بە هۆی گواستنەوەیان لەجێگەی ڕاستەقینەی خۆیان کە باکووری کوردستانە .

دووەم :– بە هۆی هەژاری و گەڕان بە دوای دابینکردنی بژێووی ژیاندا .

شایانی باسـە کە لـە دوای بەکۆمـەل کوژیەکـەی ئەرمـەن و کـورد لـە باکووری کوردسـتان لـە سـاڵی ١٩١٥ لەلایـەن دەسـەڵاتی ئیمپراتۆریـەتی عوسمـانی زۆربـەی زۆری دانیـشتووانی کوردسـتان پەرگەنـدەو تووشـی ئـاوارەی بـە کۆمـەڵ بـوون وهـاتن ، کـە باکووری کوردسـتانی ژێـر دەسـەڵاتی تورکیـای ئێستا کە زیاتر لە ٢١٢,٠٠٠ هەزار کیلۆمەترچوار گۆشەو ژمارەی کورد لە

تورکیا زیاتر لە ۲۲,۰۰۰,۰۰۰ ملیۆن کورد دەبێت لە دوای ساڵی ۲۰۰۵دا .

۹ / ۳ / ۱۹۱۰ مۆرکردنی رێکەوتنامە لە نێوان ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکاو ئیمپراتۆریەتی عوسمانی ، بۆ ماوە زیاتر پێدانی ئەمەریکا بە دورستکردنی سێ/ ۳ هێلی ئاسنی شەمەندەفەرو گەڕان بە دوای دۆزینەوەی چاوگەی نەوت بە درێژی/۲۰ کیلۆمەتر لەسەر هەردوو لایەنی ئەو سێ هێلە ئاسنیەدا

.

ئەویش دوای دامەزراندنی کۆمپانیاکە بەناوی – شركة الانماء العثمانية – الامريكية – و هەلکەناندن ، ئەویش لە باشووری کوردستان ، بە تایبەتی لەبابە گوڕگوڕی کەرکوکی کوردستان و ناوچەی کەندێناوەو ناوچەی خانەقین

کە جێگەی دەرخستنە کە نەوت لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست یەکەم جار لە ناوچەکانی باشووری کوردستان بەر لە وولاّتانی ئێستای کەنداو بووە ۰۰۰ بەلاّم کورد بە هۆی کێشەو ململانێی ناوخۆو پاراستنی بەرژەوەندی دەسەلاّت و تیرەو ئاین نە ۰۰۰؟ ۰۰۰! ۰

۱۲/ ٤ /۱۹۱۰ هێزە چەکدارەکانی کورد لە باشووری کوردستان بەشداری ڕاپەڕینە جۆراو جۆرەکانی دژ بە بەریتانیاو ئیمپراتۆریەتی عوسمانیان کرد ، لە هەردوو بواری نەتەوەیی و نیشتیمانیدا .

۱۹۱۰/٤/۲۱ کۆچی دوایی ڕۆمان نووسی ڕۆژئاوای ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا – مارك توین – لە ویلایەتی کرنکیك ...شایەنی باسە ئەم ڕۆژنامەنووسە لە مانگی/ ۱۸۳۵/۹ ، لە ویلایەتی میسووری لەدایك بووە ، مارك توین لە تەمەنی دە ساڵان باوکی دەمرێت و ناچاردەبێت ڕوولەکارکردن بکات لە پێناو دابینکردنی بژێوی ژیانیدا ، دوای ئەوە بەهۆی شەڕی ناوخۆی نێوان ویلایەتەکانی باکوورو باشوورلە ئەمەریکا و بەناچاری لە ساڵی ۱۸٦۱ دەبێتە سەرباز.

دوای ئەوە لە ساڵی ۱۸۷٦ ڕۆمانە بەپێزەکەی– تۆم سۆیەر – دەنووسێت ، کە باس لە دوومنالْ دەکات ، دوای ئەوەی لە ساڵی ۱۸۸٤ ڕۆمانێکی دیکە دەنووسێ بە ناوی – هۆگلیریڤن– و بلاّوی دەکاتەوەو بەردەوام دەبێت لە

نووسینه هەمەجۆرەکان.

١٩١٠/٥/٣١ ئـەفریکیای باشــوور ســەربەخۆیی خــۆی ڕاگەیانـدو لـە هـەمان کات پارتی نیشتمانی ئەفریکی دامـەزرا ، کە لەلایـەن کەسـایەتی و ڕۆشــنبیرانی تــیرەی بــووێر سـەرکردایەتی دەکــرا ، هــەر لــەو کاتـــــەش پــــارتی کـۆنگرەی نیـشتمانی ئەفریکیا دامەزرا

لە پێناو بەرگری کردن لـەمافی زۆرینـەی ڕەش پێستەکان لە وولاتەکەدا .بە ناوی کۆماری باشووری ئەفەریکیا . و پایتەختی یاسابی شاری – کاپ – ە و ژمـارەی دانیـشتووانی ، ٢,٠٦٠,٠٠٠ ملیـۆن کەسـە . و نـاوی پایتـەختی کـارگێری وولاتەکە – بریتۆریا – یەو ژمارەی دانیشتووانی ، ١,٤٠٠,٠٠٠ ملیۆن کەسە . هـەروا ژمارەی دانیشتووانی وولاتەکە، ٤٥,٨٧٥,٠٠٠ ملیۆن کەسە . هەروا رووبەری وولاتەکە . ١٢,٢١٠,٤٢٠ کیلۆ مەتر چوار گۆشەیە . هـەروا چڕی دانیـشتووانی . ٩٧ کـەس لـە یـەك میـل چوار گۆشـەدا . هـەروا نژادەکانی ، ڕەش پێست ٧٥٪ . سپی پێست ١٤٪ . ڕەنگاورەنگەکان ٩٪ . لە وولاتەکەدا .

١٩١٠/٦/١٤ دەرچـوونی گـەلانی ڕووسـیا لــە کۆیلایــەتی و هەژاریــەتی ژێــر دەســتەی دەســەلاتی قەیــسەری ڕووســیاو بوونیــان بــە جووتیــارو دابەشــکردنی زەوی بەسـەریان و ڕووکردنە بواری کشتووکالی ، کە کۆیلایـەتی لە ژێر دەسـەلاتی قەیـسەرە یــەك لــەدوای یەکــەکان زۆر گــران و کووشــندەو دژووار بــووە لــە وولاتەکەدا .

بــە تایبــەتی لــە دوای کۆتــایی جەنگــەکانی نێــوان فەرەنــساو ڕووســیا.

لەلایـەکی دیکـە بـەرپابوونی جـەنگی یەکـەمی نێـوان ڕووسـیاو دەسـەڵاتی عوسمانی لە سەر خاکی کوردستان.

١٩١٠/٩/١٠ نووسەرو ڕووناکبیرو ئەدیبی ناوداری جیهانی – تۆلستۆی– کۆچی دوایی کـردووە ، کـە تـاکوو ئێـستاش بەرهەمـە ناودارەکـانی لـە هـەموو بوارەکـان کاردانەوەی کاریگەری خۆی هەیە لەجیهاندا .

١٩١٠/١٠/١٠ کۆمەڵـەی هـەیڤی لەلایـەن عومـەر جـەمیل بـەگ پاشـا و قـەدری جـەمیل پاشـاو فوئاد تەمۆ بـەگ و ئـەکرەم جـەمیل پاشـاو مەمدوح سـەلیمەوە دامـەزرا ، دوای ئـەوە دەسـتی کـرد بـەبلاو کردنـەوەی گۆڤارێـك بـە نـاوی ڕۆژی کـورد ، دوای گـۆڕا بـە نـاوی هـەتاوی کـورد ، لـە پاشـان گـۆڕا بـۆ نـاوی ژیـن. لـە باشـووری کوردستان .

١٩١٠/١٢/١٩ لە دایك بـوونی نووسـەرو وێنەکێشی فەرەنسی بـەناونگ – ژان ژینیـێ– لـە باوکێکی نادیـارو دایکێـك ، کـە دوای چـەندین مـانگ وازی لێـدێنێت و دواتـر لەپەناگەی هەتیوان سپاردیە خێزانێك لەگوندی – لبنی– لە فەرەنسا.

## ١٩١١

١٩١١/١/١٤ لــە مــاوەی ٧٢ ڕۆژ بــەفرێکی بــێ وێنــە لەشــاری هــەولێرو دەوروبــەری لەهـەرێمی باشـووری کوردسـتان باری بـەبێ پـچران ، کـە بـووە هۆیگـۆڕینی بـاری کـەش و هەوایەکـە بـارێکی بەسـتەلەکی و کاردانـەوەی لـە سـەر بـاری ژیـانی دانیـشتووانە کـە بـە بلاوبوونـەوەی برسـیەتی و نەخۆشـی نالـەبار بـە تایبـەتی گرتنـەوەی ئـاژەڵی کێـوی وەك ، گـورگ و چـەقەل و کـەمتیار، لەهـەمان کات کاری کردە سەر دانیشتوانی ناوچەکەدا .

١٩١١/١/٣١ کۆمپانیـــــــــه نەوتیـــــــــەکانی ئـــــــــەڵمانیا ناچاربوون کە ماف بەرهەم دەرهێنانی نەوتی ئێراق ، کە زۆربـەی لـە سـەر خـاکی کوردستان بـوو لـە پارێزگـای کەرکوك وخانـەقین و کەنــــدیناوەی ســـەر بەناحیـــەی دیبەگـــــــەی پارێزگـای هـەولێر لـــه باشـــووری کوردســــــتان

بفرۆشێتە کۆمپانیەکانی بەریتانیا – ئەنگلۆ – پێرشیان نۆبل کۆمپانیا – و – ئەنگلۆ – سگۆینە – بەرامبەر ٢٤ بەش لە کۆی ٨٩ هەزار بەشدا لە بەرهەم هێنانی نەوتی خام لەخاکی ئێستای ئێراق کە ئەوکاتە لە وویلایەتی مووسل ئەو نەوتانە بەرچاوی بەرهەم هێنانی بەرەو بە ئەنجام گەیاندن هەنگاوی دەنـا ، لـه ئەنجامـه داهاتووەکـان بـەریتانیا و ئەلمانیابەهاوکاریـەتی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی بەتایبەتی لە سەرخاکی باشووری کوردستان .

١٩١١/٢/٦ لـه دایك بوونی ئەکتـەری نـاوداری ئەمـەریکی – ڕۆناڵد ریگـان ، دوای ئـەوە رووی لـە بـاری رامیـاری کـردو بـە هـۆی زیرەکـی تـوانی ببێتـە دادوەری وویلایەتی کالیفۆرنیا ، دوای ئەوە بووە سەرۆکی ئەمەریکا کە بووە ژمارە/ ٤٠ لە گرتنە دەستی پۆستی سەرۆکایەتی لە ئەمەریکادا .

١٩١١/٢/٢٤ بڵاوکردنەوەی یەکەم ژمارەی ڕۆژنامەی – حواث – کـە رۆژنامەیـەکی تورکی

بـوو ، بـە سەرپەرشـتی ئەحمـەد قـوودس زادە ، بـۆ مـاوەی حـەوت سـاڵ بەردەوام بوو لەدەرچوونی لە شاری کەرکوك لەهـەرێمی باشووری کوردستان ، بـە پـشتیووانی یارمـەتی دارایـی دەسـەڵاتی عوسمـانی لـە پێنـاو بڵاوکردنـەوەی هەسـتو بە هێزکردنـی بە بوونی بیری نەتـەوەیی تـورك لە پارێزگاکەدا .

١٩١١/٣/٧ دەسەڵاتی ووڵاتی یەمەنی ئەوکات نووێنەریان ڕەوانەی باکووری کوردستان کرد ، لەپێناو پەیووەندی کردن لەگەڵ هەندێ لە کەسایەتیە ناودارەکانی کورد ، لە ناوچەی شارەکانی دیاربەکرو موشو خنسو ناوچەکانی دیکە لە باکووری کوردستان ، کە لە گەڵ نووێنەری ئاینی – ئیمام یحیا– کۆبوونـەوە یان ئەنجامدا لەشاری مۆش لە هەرێمەکەدا .

١٩١١/٦/٦ بڵاو کردنەوەی یەکەم ژمارەی گۆڤاری – ڕۆژی کورد – لە شاری ئەستەمبۆڵ تورکیا ، کە ڕۆلی گرنگی هەبوو لە بەڕۆشنبیر کردنو بەرز کردنـەوەی هەستی نەتەوەیی نیشتیمانی لە کودستان بەتایبەتی لە باکووری کوردستان.

١٩١١/٧/١٣ هەندێ لە داواکاری تۆرانیەکان کۆمەڵەیەکیان پێك هێنا بەناوی – کۆمەڵـەی تـورك ئۆجـاغی– لـە ژێر دەسـەڵاتی عوسمـانی کە بەمانای نیشتمانی تـورك دێتو دوای ئەوە چەندین لقیان لە زۆربەی شارەکانی تورکیا کردەوە .

ئـەویش لـە پێنـاو دەرخـستنی بـوونی نەتـەوەی تـوركو سـەرکردەکانیان لەجـەنگیزخانو ئۆغـوزو هۆلاکـۆو تـەیمووری لـەنگ... لـە هـەمان کـات داواکاریـەکانیان بە نـاوی ئـەوە بـوو ، کـە ٤٠ ملیۆن تـورك لـە ژێـر دەسـەڵاتی ڕووسیا دایە لەئاسیای بچوكو قەفقاردا ، کە ئەمانـە دەووڵـەتی عوسمانیان لێپکهاتووە لە ناوچەکەدا ...!.

بـەڵام لەڕاسـتی ئـەوە ڕاسـتی تێدانیـە ، کـە بـەم شـێووەیە کۆمەڵـەی تـورك ئۆجـاغی کـاری بـۆ کردبـوو تـەنیا بـیری شـۆڤینی نـەبێت لـەژێر بـاڵی ئیمپراتۆریەتەکەدا .

١٩١١/١٠/٢ لـە دایـك بـونی –جـاك ڤینـی– لـە وویلایـەتی ویسکنـسن لـە شارۆچـکەی هیلۆکی ، کەخاوەنی بەدەیا چیرۆکی خەیالی بووەو کاری کردۆتە سەر بواری

پیشەسازی ڕاگەیاندن .

١٩١١/١٠/٢١ مــۆرکردنی ڕێکەوتننامــە لــە نێــوان ڕژێمــی فارســی ئێــران و ڕژێمــی ئیمپراتۆریــەتی ، ئــەویش لــە پێنــاو چارەســەرکردنی کێشــەی ســنووری لــە نێوانیاندا کە زۆربەی زۆری سنوورەکانی نێوان هەردوو دەسەڵاتەکە لەسەر خاکی ڕۆژهەلات و باکووری کوردستان بوولە کێشوەری ئاسیادا .

١٩١١/١١/٨ دامەزرانــدنی پــارتی- حــزب الحریــة والائـتلاف- لــە پێنــاو یــەکبوونی یــەك ووشەی بەرهەڵستکاری و ، لە پێناو ڕاکێشانی نەتەوەکانی کە تورك نین و دژی ئیتحادیەکان... شایانی باسە ئیتحادیەکان بیری شۆڤینیان بەهێزبوو لە بە تورك کردنی نەتەوەکانی دیکەی ژێر دەسەڵاتی عوسمانی ، بە تایبەتی لە باشوورو باکووری کوردستاندا .

١٩١١/١٢/٨ بۆ یەکەم جار لە شاری بەغدا بەردی بناخەی پەیمانگای مامۆستایان دانرا ، ئــەویش لــە پێنــاو پێگەیانــدنی مامۆســتای فێرکردنــی خوێنــدکاران لــە شارەکەو شارەکانی دیکەی ویلایەتی بەغدا .

١٩١١/١٢/١١ لــەدایك بــوونی ئــەدیب و نووســەرو ڕوونــاکبیری نیشتیمانی گەورەی عەرەبی - نــەجیب مــەحفوز - لــە گــەرەکی جەمالیــە لــە شــاری قاهیرەی پایتەختی میسر ، ئەم نووســەرە ناوەکــەی بــەناوی دکتــۆرێکی جیهــانی کــراوە ، کە ئەو دکتۆرەی سەرپەرشتی لــەداکیك بــوونی نــەجیب مەحفوز کردبوو لە شارەکەدا . شایانی باسە ئەو ئەدیبە لە ساڵی ١٩٣٤ خەڵاتی لیسانسی لە ئاداب لەبەشی فەلسەفە وەرگرتووە . هەروا لە ساڵی ١٩٨٨ خەڵاتی نۆبلی پێبەخشراوە ، لەدوای ساڵەکانی ١٩٣٦ دەستی کردووە بە نووسینی کورتە چیرۆك لە دوای دامەزراندنی

بەفەرمانبەری میری ، دوای ئەوە بەردەوام بووە لە بوارەكانی نووسینی ڕۆمان و چیرۆك و چەندین لایەنی دیكە تاكوو كۆچی دوایی كردووە لە وولاتەكەیدا .

١٩١١/١٢/١٤ گەیشتنی یەكەم مرۆڤی نەرویژی - ڕۆلد ئاموندسن- بۆ جەمسەری باشووری گۆی زەوی ، دوای سێ ڕۆژ لە گەڕانەوەی چەترەكەی جێ هێشتبوو، واتە لە یادی كرد لە ناوچەكەدا .

## ١٩١٢

١٩١٢/١/١ لە دوای هەوڵێكی زۆر ئەویش بە ڕاگەیاندنی كۆماری چین لەلایەن دكتۆر - سن بات سن - بە هەڵووەشاندنەوەی ڕژێمی شانشینی بە دامەزاندنی ڕژێمی كۆماری لە وولاتەكەدا . بەڵام كێشەكان هەر بەردەوام بوون لەم بوارەدا لە نێوان دەسەڵاتداران لە نێوان خۆیاندا لە ناو خۆی وولاتەكەدا .

١٩١٢/١/١٨ گەیشتنی - ڕۆبەرت فالكۆن - بۆ جەمسەری باشوور.

شایانی باسە سەدەی بیستەم سەردەمی پێشبڕكێی نێوان گەریدە گەرۆكەكانی جیهان بوو ، لە گەیشتن بەهەردوو جەمسەری باشوورو باكوور لەسەر گۆی زەویدا

١٩١٢/١/١٨ بڵاوكردنەوەی یەكەم ژمارەی ڕۆژنامەی - حقوق - یانی ماف - لە شاری بەغدا لەلایەن نووسەرو ڕۆژنامەنووسی ناوداری كورد مامۆستا مەعروف چاووك لە شارەكەدا .

١٩١٢/٢/١٢ دامەزراندنی كۆماری چین لە ناوەندەكانی كێشەو ململانێی نێوودەووڵەتی لەبەرەو چوون بۆ جەنگی یەكەمی جیهانیو دابەشكردنو گۆڕینی نەخشەی جیهان ، بەتایبەتی لە ئاسیای بچووكو نیمچە دوورگەی كۆریای یەك بووی ئەو كات لە كێشوەرەكەدا .

١٩١٢/٤/١٠ كەشتی تایتانیك كە كەشتیەكی گەشتیارە دەووڵەمەندەكان بوو ، لە دوای بە ڕێكەووتنی بە گەشتی تایبەتی خۆی بەناو دەریای ئامپتۆن لە ئینگلتەرە بەرەو نیویۆرك ، بە ڕێكەت كە ٢٣٤٠ هاووڵاتی هەڵگرتبوو ، لەئەنجامی بەر یەك كەووتنی لەگەڵ چیایەكی بەستەلەكی بەفری . كەشتیەكە تێك شكاو بووە هۆی گیان لە دەستدانی هەلگرانی . تەنیا ٧٠٠ هاووڵاتی لێ ڕزگار بوو لە ناو كەشتیەكەدا .

ئەمــەش لــە دوای گەیــشتنی کەشــتی تایتانیـك و نزیـك بوونــەوەی لــە کەنارەکانی ڕۆژهەڵاتی ووڵاتی کەنەدا لە ١٩١٢/٤/١٤ و بەهۆی خۆدانی بە چیایەکی بەفری بەستەکەکە کەشتیکە نگرۆ بوو لەم ڕۆژەدا .

١٩١٢/٥/٥ بڵاوکردنـەی یەکـەم ژمـارەی ڕۆژنامـەی – پراڤدا– لـە شـاری پترۆسـبۆرگی پایتــەختی ڕووســیای قەیــسەری ئــەوکات ، لــە لایــەن پــارتی کرێکــاری سۆشیالیــستی دیمــوکراتی ڕووســی ، کــە زمانحــاڵی پارتەکــە بــوو ، بــە سەرکردایەتی لینین .

کە تاکوو ئێستاش ئەو ڕۆژنامەیە لە بلاو کردنەوە بەردەوامە لەلایەن پارتی کۆمۆنیستی ڕووسیا ، سەرەڕای چەندین جار لەپچڕانیدا بەتایبەتی بەر لە شۆڕشــی ئۆکتۆبــەری ســاڵی ١٩١٧ و دوای هەلووەشــاندنەوەی یەکیــەتی سۆڤیەت لە ساڵی ١٩٩١ دا ، لە ئەوروپای ڕۆژهەڵات و جیهاندا .

١٩١٢/٥/٢٠ هێزەکـانی سـووپای ئیمپراتۆریـەتی عوسمـانی تـورك پـەلاماری گونـدەکانی ناوچــەی خــانێی ڕۆژهــەلاتی کوردســتانیدا ، بــەنیازی داگیر کــردن ، بــەڵام هێزەکانی سمکۆی شکاك توانیان ئـەو پـەلامارە ڕەتبکەنـەوەو پاشەکشە بە هێزەکانی سووپای عوسمانی بکەن‌ودووریان بخەنەوە لە ناوچەکەدا .

١٩١٢/٦/١ وەرگێــڕی – مترجـم– ی بـالوێزی ڕووسـیاو بـالوێزی بـەریتانیا لـە شـاری ئەســـتەمبۆلی پایتــەختی ئــەوکاتی ئیمپراتۆریــەتی عوسمــانی ، چــەند ئامۆژگاریانــدا بــە دەســەڵاتدارانی ئەســتەمبۆل ، کــە تیایاهــاتبوو . ئــەو جمووجۆلە جەنگاوەرانەی کە لە ناوچەی قونووی باکووری کوردستان هەیە لادانێکی ئاشکرایە لە پەیمانی بەرلیندا.

١٩١٢/٧/٥ ئەنجامدانی پێشبڕکێی یاریەکانی جامی جیهانی – ئۆلـەمپیات– لـە شـاری ستۆکهۆلم ئـەنجام دراو بـەردەوام بـوو تـاکوو ٧/٢٧ی هـەمان سـاڵ لـە نێـوان یاریزانانی ووڵاتانی بەشدار بوو لە شارەکەدا .

١٩١٢/٨/١٠ ڕۆماننووســی بــەناوبانگی بــەرازیلی – جــۆرج ئــەمادۆ – لــە باشــووری وویلایەتی – باهیا – چاوی بە جیهان هـەڵهێناوە ، کە مەڵبەنـدێکی بازرگـانی کردن بوو بە کوییلە ئەفریکیەکان لە وویلایەتی بەرازیل .

لــەدوای تــەواوکردنی قۆناخــەکانی خوێنــدن و هــەر لەســەرەتاوە پێنووسەکەی بەرەو نووسینی ڕۆمان هەنگاوینا ، کە یەکەم ڕۆمانی لەساڵی

١٩٣١ بڵاوکردەوە بەناوی - خاکی کەرنەڤاڵ - بەڵام بەر لەو رۆمانەش - نووسینەکانی بەناوی - کاکاو - مێگەلی لمەکان - کە بووە هۆکاری دەرکەوتنی کەسایەتی ئەمادۆ لەووڵاتی بەرازیل و جیهان .

بەهۆی بوونی بە ئەندام بوونی لە پارتی کۆمۆنیستی بەرازیل و لەوکاتەدا دەسەڵاتی بەرازیل دەسەڵاتێکی کۆنەپەرست بوو ، بەم هۆکارە کە دوورخراوەتەوە بۆ پاریس و لەوێش بۆ براگی پایتەختی ئەوکاتی یۆگۆسلافیا و لە و ووڵاتە ژیانی بەسەر دەبرد لەنێوان ساڵەکانی ١٩٣٠ - ١٩٤٠ - بەڵام دوای ئەوە لە ساڵی ١٩٥٢ گەرایەوە بەرازیل .

لە دوای گەرانەوەی دەستی کرد بە نووسینەکانی کە لەوکات هەوڵیدا لە گەڵ دەروونی گەلی بەرازیل بگوونجیٚ لە بوراەکانی کۆمەڵایەتی و رەگەزی گەلی بەرازیل و کیشوەر و جیهان . شانازی بەو رۆماننووسە بەتوانایە دەکەن . ئەمادۆ بووە ئەندامی شەرف لە فەیلەقی فەرەنساو لە ساڵی ١٩٩٥ پاداشتی کاکۆسی پرتووگالی پیٚ بەخشرا .

جۆرج ئەمادۆ خێزانەکەی بە ناوی - زیلیا - یەو کچوو کورێکی هەیە . ئەم مرۆڤە لە کارەکانی بەردەوام بوو تاکوو لە ٢٠٠١/٨/٨ لە تەمەنی ٨٨ ساڵیدا ماڵئاوایی لەگەڵ و بەرازیل و جیهان کرد . ئەم مرۆڤە نووسینەکانی بۆ ٤٨ زمان وەرگێردراون و زیاتر لە ٢٠ ملیۆن دانەی لیٚ فرۆشراوە لە بەرازیل وووڵاتە جیا جیاکانی جیهان .

١٩١٢/١٠/١٧ بـــــالوێزی دەســــەڵاتی ئیمپراتۆریــەتی عوسمـانی لـە پترســــبۆرگی پایتـــــەختی ڕووسـیای ئـەوكات ، لـە لایـەن بـەر پرسـی بـاڵای ڕووسـیای قەیــــسەری - ســــازانۆف - ئاگاداری دەسـەڵاتی عوسمـانی تـورکی کـرد کـه بڕیـاری داوه هێزەکـــانی لــەو ناوچـــانه بکشێنێتەوە ، کە دووبەرەکیان تیایـەو لەسـەرەوە دایـان بنـێ ، کە لەساڵی ١٩١٠ بڕیاری بۆ دراوە لە نێوان هەردوو وولاتدا ،

١٩١٢/١٠/٢٥ زۆر جـار هێزەکـانی سـووپای ڕووسـیای قەیـسەری و چـەکدارانی کـورد لـە ڕۆژهـەلاتی کوردستان بەگژ یەکدا دەچوون ... بۆ نموونـه ئـەو شـەڕەی کـه لـەنزیك - زندێشتەوە - ڕوویـدا . کە ڕووسـەکان لـەو بڕوایـە نـەبوون ، کـه چارەســەری کێـشەکه بـە هێزکردنـی دەســەلاتی ڕووسـیا لـە ڕۆژهــەلاتی کوردسـتان بـە هێـزی چـەك چارەسـەر بکرێـت لەگـەڵ کـورد ، بـەلکوو دەبـێ بەکاری دبلۆماسی و یارمەتی دان چارەسەر بکرێت لە ناوچەکەدا .

١٩١٢/١١/١٧ بالوێزی دەسەڵاتی عوسمانی لە پترسبۆرگی پایتـەختی ڕووسیای ئـەوكات ، داوای لە - سازانۆف - کرد بۆ جێهێشتنی ناوچەکانی سـەر سـنووری کـورد لە باکووری کوردستان بەهۆی پەرینـەوەی کاری شۆڕشـگێڕی هەمـە لایەنـەی کورد لە هەرێمەکەدا .

١٩١٢/١١/٢٨ وولاتی ئەلبانیا بەر لەجەنگ سەربەخۆیی خۆی ڕاگەیاند ، بەلام لەجەنگی یەکەمی جیهانی بووە گۆڕەپانی بنەڕەتی جەنگ لە نێوان هاوپەیمانان و سووپای ڕووسیا، کە لەو کات ئەحمەد زوگۆ

سەرکردایەتی ئەلبانیای گرتە دەست ، کە دەرەبەگێکی خاوەن زەوی و بە سامانی زۆری چەوسێنەر بوو لە وولاتەکەدا
ئەم ڕاگەیاندنەش بە ناوی کۆماری ئەلبانیا بوو . کە پایتەختەکەی ناوی – تیرانا – ە یەو ژمارەی دانیشتووانەکەی ، ٣٥٠,٠٠٠ هەزار کەسە . هەروا ژمارەی دانیشتووانی وولاتەکەی ، ٣,٩٥٠,٠٠٠ ملیۆن کەسە . هەروا ڕووبەری وولاتەکەی , ٢٨,٧٥٠ کیلۆ مەتر چوار گۆشەیە . هەروا چڕی دانیشتووانەکەی ،٣١٧ کەس لە یەك میل چوار گۆشەدا . هەروا نژادەکانی ، ئەلبانیەکان ٩٨٪ . لە وولاتەکەدا .

١٩١٢/١٢/٦ کوونسلی ئەمەریکا لە شاری حەلەبی ئێستای وولاتی سووریا ڕاپۆرتێکی ئاراستەی سەرۆکەکان کرد ، بە گەشتەکانی لۆرانس و مستر لیۆناردۆو کۆمەلێك لە شاندی شووێنەواری بەریتانیا لە کرکمیش ، کە لە ناو ڕاپۆرتەکەی دەری خست بوو ، کە دەنگو باسی وا بلاو بۆتەوە .
کە بنەمالەی خدێووی لە میسر ، واتە محەمەد عەلی پاشاو شەریفی شاری مەککەو عەزەت پاشا سکرتێری سولتان عەبدولحەمیدی پێشوو، عەبدوالرحمان ، ئەمیرحاج ، پیلانیان ئامادە کردووە .
لە پێناو ڕووخاندنی دەسەلاتی خەلافەت لە تورکیاو سووریاو فەلەستین و

ئێراق و نیمچە دوورگەی عەرەبی ، بە گەڕاندنەوەی خەلافەت بۆ یەکێك لە بنەماڵەی قورەیشیەکان لە شاری مەککەو دوورخستنەوەیان لە سیاسەت لە ناوچەکەدا .

١٩١٢/١٢/٦ لە بەردەوام بوونی کاری شووێنەوار ناسان ، ئەویش بە دۆزینەوەی پەیکەری شازادە – تادۆیها – ئینفەرتینی – ی هاوسەری فیرعەونی میسر ، لەلایەن – لودفیك یوزفات – لەووڵاتی میسردا ... شایانی باسە شووێنەوارەکانی ووڵاتی میسر ، بەتایبەتی ئەهراماتەکان کە یەکێکە لە شووێنەوارە هەرە گرنگەکانی حەووتی جیهان و لەهەمان کات سەرچاوەیەکی ئابووری گرنگە بۆ ووڵاتەکە لە بواری گەشت و گوزاردا .

١٩١٢/١٢/١١ لە شاری بەیرۆتی پایتەختی لوبنان کۆمەڵەیەك پێکهات بەناوی لێژنەی چاکسازی ، کە داوای ئیدارەی کاروباری ناوخۆییان کردو زمانی عەرەبیان کردە زمانی فەرمی و لە هەمان کات دژی زمانی تورکی وەستان و لە ئەنجوومەنی نووێنەرانی عوسمانی و خزمەتی هەمیشەیی عەرەبیان لەناو ریزەکانی سووپای عوسمانی لەناوخاکی ناووخۆی بەیروت بێت و نەچێتە دەرەوە .

بەڵام لە هەمان کات ئیتحادیەکان هەڵسان بەداخستنی بارەگای ئەو لێژنە ... بەپشتگیری کردنی کوونسولیەی فەرەنسا ، و ئەو کۆمەڵەیە هەلسا بە هاوکاری کردن لەگەڵ کۆمەڵەی راستبوونەوەی لوبنان لە دەرەوەی لوبنان و پەیووەندی بەردەوام بوو لەگەڵ کوونسلییەی فەڕەنسا .

هەروا داوای کرد کە فەڕەنسا پەلاماری دەسەڵاتی عوسمانی بدات و

هەرێمەکە بخاتە ژێر دەسەلاتی خۆی... بەلام خاوەن بیری نەتەوەیی لە ئێراق پەیووەندی لەگەڵ بەریتانیا کردو واش دەرکەووت کە ریکەووتنەکە لەسەر ناوچەگەریە.... ئەمەش بووە هۆی مەترسی ئیتحادیەکان و لە ئەنجام بووە هۆی سەر هەڵدانی کێشەو ململانێی توونـدو تیژو بووە هۆی ئەوەی کە کۆمەڵەی گەنجانی عەرەب لەپاریس داوای کۆنگرەیەك بکەن .

١٩١٢/١٢/١١ لە مێژووی رووداوەکانی رابردوو خەبات و تێکۆشان و قوربانیدانی گەلی کوردستان ، دەبێ دووبارە بێتەوە بە پێی مێژووی جووگرافیاو ، یاخوود جووگرافیای مێژوو .

هەروەك مێژووی نووسراوە ، کە کتێبی – کتاب لدواوین العسمانین – دا

هاتووەو لە سالنامەی عوسمانی دا بە ناوی – رسالەالسنە – ی عوسمانی و چەندین بەلگەی دیکە کە دەڵێ :-

پارێزگای کەرکوك کوردیە و دانیشتووانەکەی پێك هاتوون لە نژادی کوردو عەرەب ودوایی تورکمان و کلدان . بەلام کورد بە پلە یەك دێت و عەرەبیش بە پلە دوو لە پارێزگاکەدا .

لە گەڵ ئەوەشدا بە لگەنامەکانی عوسمانی و ئێراقی دووپاتی ئەوە دەکەنەوە کە لە ٨٥٪ دا نیشتووانی شارو قەزاو ناحیەکان و گووندەکان دانیشتووانە رەسەنەکانی کوردن ، ئەم رێژەیەش بەر لە وەرگرتنی

دەسـەلأت لـە ئێراق بـوو لـە سـالّی ١٩٦٣دا. کـە دانیشتووانی کـەرکوك و دەووروووبەری کوردن .

ئـەوەش دووپاتکراوەتـەوە کـە بـەر لـە شۆڕشـی ١٩٥٨/٧/١٤و بـە شـایەتی دانیشتووانی کەرکوك و دەووروووبەری لە کەسایەتیە تەمەن گەوورەکان لـە کوردو عەرەب کە دەڵێن :-

لـەوکات لـە ناوشـاری کـەرکوك ٢٠٠ ماڵـە عـەرەب نیشتەجێی نـاو شـارەکە نەبوونە ،

بەلأم شەپۆلی بە عـەرەبکردن بـەردەوام بـوو ، وەك ئـەوە نـەبوو ، کـە لـە دوای کودەتای بەعسیەکان روویـدەدا لـە پارێزگـای کـەرکوك و بـە تایبـەتی لـە نـاو شـاری کـەرکوك ، ئامـاری سـالّی ١٩٥٧ یـش شـایەتی ئـەو راسـتیانەیە لـە پارێزگاکەدا .

١٩١٢/١٢/١١ لـــە رامیاریـــەتی نێـــوو دەوولـــەتی لـــە ســـەرەتای ســـەدەی بیـــستەم ، بـــە بەســـتنەوەی مـــافی چـــارە نووسـی گـەلانی ژێـر دەسـتە لـــە کێـــشووەری ئاســـیاو ئەفـــەریکیا لـــە گـــەڵ راگەیاندنەکـەی سـەرۆکی ئەمـەریکا – وورد ولـسن – کە لە ١٤ خال پێك هاتبوو، ئـــەو وتارانـــەی کـــە لـــە سـەردەمی جـەنگی یەکـەمی جیهـان بـە دەسـەلأتداران و گـەلانی جیهـانی بلاوکـردەوە ، بـە تایبـەتی لـەو هەرێم وناوچانەی کە کەوتبوونە ژێر دەسەلأتی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی بە تایبەتی لە کێشووەری ئاســـــیادا.

بەلأم بەر لەوەش جۆزێف ستالین سـەرۆکی یەکیـەتی سـۆڤیەتی پێشوو بـەر لـە شۆڕشـی ئوکتۆبـەری بەلـشەفی لەسـالّی ١٩١٧ و لـە سـالی ١٩١٢ بـوونی

نەتەوەی لە پێنج خاڵ دیاری کردووە بۆ بەدەستهێنانی قەوارەی دیار کراو بەمافی چارەنووس و پێك هێنانی دەوڵەتی خاوەن سنوور لە هەموو بوارە جیا جیاکانی ئەویـــــش:-

١- بوونی مێژووی هاوبەش .

٢- بوونی زمانی هاوبەش ٣- بوونی خاکی هاوبەش ٤- بوونی ژیانی ئابووری هاوبەش <

٥- بوونی رۆشنبیریەکی هاوبەش . ئەم خالانەش بە بیرووبۆچوونی ستالین نەتەوە پێك دێنن ، کە ئەویش بە خەباتکردن لە پێناو بەدەست هێنانی مافی چارەنووس و سەربەخۆیی بوونی لە سەر ئەو قەوارە زەویەی کە لە سەری دەژی بە پێی بوونی ئەو خالانە لە هەر نەتەوەیەك لەو هەرێمە ، یاخوود ناوچە لە هەر کێشوەرێك لە کێشووەرەکانی ، کە جیهانی لێ پێك هاتووە لە سەر گۆی زەویدا.

تێبینی:- ئەم خالانەی ستالین لە یەکەم و بە ناوبانگترین بابەت دادەنرێت لە کتابی - الماركسية والمسألة القومية - بلاو کراوەتەوە .

١٩١٢/١٢/٢٤ بیرەوەریەکانی - گێرس- کە بۆ بەرپرسی رووسیا سازانۆفی نوسیبووی ، کە تیایدا هاتبوو دەڵێ :- نابێ رێگە بەو جۆرە کەسانەی کە وەك سەید تەهاو عەبدولقادر بدرێت بگەرێنەوە ناوچەکانی سەرسنووری نێوان ئێران و ئێراق و تورکیا ، لەمیانەی شەڕو کێشەو ئاژاوەدا... شایانی باسە سنووری هەرسێ دەوڵەتی دروستکراو لە سەر خاکی کوردستان جێ بەجێکرا لە کێشووەرەکەدا .

١٩١٢/١٢/٢٦ بڵاو کردنەی یەکەم ژمارەی ڕۆژنامەی – بانکی کورد– لە لایەن بنەماڵەی بەدرخانیەکان لە کوردستاندا .

١٩١٢/١٢/٢٩ دەرهێنەرو شاعیرو رەخنەکارو شێووەکاری ئیتاڵی – مایکل ئەنتۆنیۆتی – لە شاری میرارای ناوەراستی ئیتاڵیا چاوی بە جیهان هەڵهێناوە. هەر لەسەرەتای ژیانی بەهرەو حەزی هونەری بۆ شێووەکاری و هونەری سینەما دەبزوێت لە وولاّتەکەیدا .

لە پاڵ ئەمەشدا شعرو بابەتی هونەریش دەنووسێت. دوای ئەوە بەشی ئابووری لە زانکۆی پۆلۆنیا تەواودەکات. وەك رەخنەگرێکی سینەمایی لە چەندین رۆژنامە بابەتەکانی بلاّودەکردەوە .

دوای ئەوە بەرەو شاری رۆمای پایتەختی وولاّتەکەی دەچێت و لەوێدا کار لەگەڵ کۆمەڵە دەرهێنەرێك دەکات و لەچەندین فلیم رۆڵی یاریدەدەری دەرهێنەر دەبینیّ .

لەوانە فلیمی گەرانەوەی فرۆکەوانەکەی رۆبێرتۆ روسیللینی دەرهێنەرو فلیمی راوی تراژیدی جۆزیا دسانتیی دەرهێنەر لە ساڵی ١٩٤٦دا.

ئەم کەسایەتیە ناودارە ئیتالیەو جیهانیە دوای ئەوە لە ساڵی ٢٠٠٤ بە ناوی دواداو دەرهێنیّ.

ئەمەش لە دوای بەدەیا فیلیم و کاری شێووەکاری و لەئەنجامی کارە سەرکەوتووەکانی لەبواری شیعرو فلیمی سینەماو کاری شێووەکاری بەسەرکەوتووانە ئەنجامداوەو بەدەیا خەلاّتی پیّ بەخشرا لەوانە خەلاّتی ئۆسکاری ساڵی /١٩٩٥.

خەلاّتی شێری زێرینی لە ڤیستیڤالی ڤێنیای ساڵی ١٩٩٧.

ئەم کەسایەتیە بە نەخۆشی لە ٢٠٠٧/٧/٣٠ لە ئیتا کۆچی دوایی دەکات بە ماڵئاوایی کردنی لە هونەرو هونەرمەندانی ئیتالیاو جیهان.

## ١٩١٣

١٩١٣/١/٤ کردنەوەی قوتابخانەیەکی کوردی لەشاری – خوویی– لەهەرێمی ڕۆژهەلاتی کوردستان لەلایەن عەبدولڕەزاق بەدرخان بەزمانی کوردیو بە ئەلفو بیّو پیتی زمانی ڕووسی دەستکرا بە خووێندن ، کە ٢٩ خووێندکاری تێدابوو لەو کات لە شارەکەدا .

١٩١٣/١/٢٣ ئیتحادیەکان هەڵسان بەکودەتایەکی سەربازی بە سەرکردایەتی ئەنوەر

تەلعەت پاشاو لە ئەنجام لێی سەرکەووتن بە گەراندنەوەی دەسەلآتیان...
بەلآم هاوکاریەکان وازیان لەجمووجۆلی خۆیان نەهێنا کە هەر ئەوانیش
بوون بە دارشتنی پیلانی کووشتنی مەحمود شەوکت پاشا .
دوای ئەوەی کە ماوە بە ئیتحادیەکان درا ، لە پێناو لێدانیان و بووە هۆی
ئەوەی کە پارتی – الحریە والائتلاف– سەر لە نووێ ببووژێتەوە لە دوای
شەڕ کردن لەژێر داگیر کەری بێگانە .
بەلآم ئەو پارتە زۆری هەولدا ، کە کورد بۆلای خۆی ڕاکێشێ
بەسوورانەوەیان لەناوچە جیا جیاکانی باکووری کوردستان ، دوای ئەوە
توانیان چەندین هاوولاتی کورد بۆلای خۆیان ڕابکێشن ، ئەمەش بەهۆی
هەلوویستی هەلەی ئیتحادیەکان.

١٩١٣/٢/٢٧ لە دایك بوونی رووناکبیرو فەیلەسوفی هزرمەندی دژ بەجەنگ – پۆل ریکۆر –
لە شاری ڤالینسای فەرەنسا... ئەم فەیلەسوفە لە تەمەنی سێ سالیدا دایك و
باوکی کۆچی دوایی دەکەن و لەلای باپیری ژیان بەسەر دەبات و
قۆناخەکانی خوویندن تەواودەکات.
لە دوای تەمەنی ١٨ سالیدا دانراوەکانی مۆنتانی و باسکال و ڤۆلتێرو
رۆسۆ دەخووێنێتەوەو دووچاری هێدمەی فەلسەفە دەبێت... چونکە
نەیدەتوانی ململانێی نێوان پێگەیشتنی پروتستانت و پێکهاتەی فەلسەفی
خۆی یەکلابکاتەوە.
ئیتر بەردەوام بوونی لەناو ئەو کێشە هەمە لایەنانە تاکوو لە سالی ١٩٣٣
توانی لەسەر دەستی فەیلەسوف و مێژوونووسان لەزانکۆی سۆریۆن وانەی
فەلسەفە وەردەگرێت. لە سالی ١٩٣٩ پۆل ریکۆر وەك ئەفسەرێك رەوانەی
بەرەکانی جەنگی دووەمی جیهان دەکرێت و دوای ماوەیەکی کەم لەلایەن
نازیەکانی ئەلمان بەدیل دەگیرێ وتاکوو سالی ١٩٤٥ لەبەندیخانەی شاری
پۆلۆنیا ژیان بەسەر دەبات . دوای ئازادکردنی لە سالی ١٩٥٧ بە مامۆستای
مێژووی فەلسەفە لەزانکۆی ستراسبۆرگ دادەمەزرێت.
ئەم فەیلەسوفە لەکاری نووسین و داهێنان بەردەوام دەبێت و لەماوەی
ژیانیدا چەندین دانراوی بەبەهای گەیاندۆتە کتێبخانەو دەست خووێنەران

ئەویش وەك :-

١- فەلسەفەو هزر لە ساڵی ١٩٦٥.

٢- ٢- مێژوو وشووێنەوار لە ساڵی ١٩٦٥. ٣

٣- - فرۆید و سروشت لە ساڵی ١٩٦٦. ٤

٤- - مرۆڤ و هەڵە. ٥

٥- - فرۆیدو فەلسەفە لە ساڵی ١٩٧٠،

لە گەڵ چەندین دانراوی دیکە و لەگەڵ بڵاوکردنەوەی بەدەیا بابەت لـەبواری مێـژووی فەلـسەفە تـاکوو لـە ٢٠٠٥/٥/٢٠ لـە شـاری جایتنـای ڕۆژئـاوای فەرەنسا کۆچی دوایی دەکات.

١٩١٣/٤/٢٤ بڵاوکردنـــەوەی یەکـــەم ژمـــارەی گۆڤـــاری نیوومـــانگی بـــەزمانی تـــورکی بەسەرپەرشـتی ئەحمـەد مـەدەنی قوودسـی زادەو ئەو گۆڤـارە بـەردەوام بـوو تاکوو ساڵی ١٩١٥ لە دەر چوونیدا .

١٩١٣/٥/١٨ دەسـت پێکردنـی گەشـتەکەی- ئۆرلـوڤ- ی کوونـسلی ڕووسـی لـە شـاری بەغداوە بۆ ناوچە جیاجیاکانی باشوورو ڕۆژهـەڵاتو باکووری کوردسـتان ، ئەویش لە پێناو کۆکردنەوەی زانیـاری هەمـە لایەنە لەسـەر چۆنیەتی باری بوونی نەتەوەی کورد لە کوردستاندا .

١٩١٣/٥/٣٠ مۆرکردنی ڕێکەووتننامەی لەندەن لەکۆشـکی - سـنت جیمس- لـە لەنـدەنی پایتـەختی بـەریتانیا ، لـەپێناو کۆتـایی هێنـان بـە شـەڕی بـەلکان لـە نێـوان دەسـەڵاتی عوسمـانی لەلایـەكو بوولگاریـاو سـربو چـیای ڕەشو یۆنـان لەلایەکی دیکەدا .

ئەو ڕێکەووتننامەیەش لەسەر کێشەی تورکیاو یۆنان بوو ، ئەویش لە سەر دوورگـەی کرێـتو سـنووری ئـەو بەشـە تورکیایـەی کـە کـەوتبووە نـاو کێشووەری ئەورووپا ، لە سەر هێڵـی درێژی لـە ئینـۆس تـاکوو میدیا ، بـەڵام ئەو ڕێکەووتنە جێبەجێ نەکرا بەهۆی کێشەکانی نێوانیان.

١٩١٣/٦/٦ بڵاوکردنەوەی یەکەم ژمارەی گۆڤاری هەفتەنامـەی - ڕۆژ کـورد- لـە شـاری ئەسـتەمبۆلی تورکیـا ، لەلایـەن مامۆسـتا عەبدولکـەریم سـلێمان. هـەروا

بڵاوکردنەوەی یەکەم ژمارەی گۆڤاری هەتاوە کورد لە هەمان رۆژدا >

١٩١٣/٦/١٨ گرێدانی کۆنگرەی پاریس لە هۆڵی گەورەی کۆمەڵەی جووگرافیا لە شەقامی سان گرمین ، کە نووێنەری کۆمەڵەی لامەرکەزی میسری و شەش نووێنەری کۆمەڵەی چاکسازی بەیروت و سێ نووێنەری موجاهدینەکانی ئەمەریکاو یەك نووێنەر لە موجاهیدەکانی مەکسیكو دوو نووێنەری ئێران بەشداریان لەو کۆنگرەیە کرد ، هەروا عەبدولکەریم خەلیل نووێنەری شەبیبەی عەرەبی لە ئەستەمبوڵ بەشداری تێداکرد.
بەڵام تۆفیق سوێدی کە نووێنەری ئێراق بوو لەکۆنگرەکەو لە وتەکانیدا ناوی کونگرە نرا ، بە کۆنگرەی سووریاو مۆری بۆ دروستکرا ، بەڵام دوای ئەوەی کە ناوی کۆنگرەکە گۆڕا بۆ ناوی کۆنگرەی یەکەمی عەرەبی و کۆنگرەکە دابەش بوو ، لە نێوان سێ بیروو بۆچوون ئەویش :-
١- ئیسلامیەکان نەیاندەویست لە ڕژێمی تورکیا جیا ببنەوە .٢- مەسیحیەکانی دژ بەرژێمی تورکیا . ٣- ڕاڕاکانی عەرەب نیازی پارەیان هەبوولە کۆنگرەکەدا .

١٩١٣/٦/١٨ لە پەراوێزی کۆنگرەی پاریسدا ، کۆنگرەی یەکەمی سەرکردەکانی عەرەب لەپاریسی پایتەختی فەرەنسا بەسترا ، کە نووێنەری کوردیش لەم کۆنگرەیە ئامادە بون و سەرۆکی هەڵبژێردراوی کۆنگرەکە . کە عبدالحمید زەهاوی بوو لە ووتارەکەیدا باسی کورد دەکاو دەڵێ:-
بناخەی پەروەردەی ڕامیاریمان لە ئێستا دوور بێت لە لامەرکەزی و بەرچاو تەنگی و شۆڤێنی ، کە ئەمە کارێکی باش نیە ، چونکە ئەو بیرەی لای عوسمانیەکان باوە ، لەبەر ئەوەی ئەرمەن و کورد زمانیان وەك ئێمە هەیەو پێوویستە بەدادوەرانە چارەسەر بکرێت لە هەردوو بوارە جیا جیاکان ، لە کێشووەرەکەدا .

١٩١٣/٧/١٧ لە دایك بوونی نووسەرو فەیلەسوف و رووناکبیری فەرەنسی - ڕۆجیە کاڕودی- لە پاریسی پایتەختی فەرەنسا.

١٩١٣/٧/٢٩ مۆرکردنی رێکەووتننامەی - ئەنگلۆ، تورکی - بە دیاریکردنی ناوچەی لایەنگری لە کەنداوی بەناو عەرەبی و نیمچە بیابانی عەرەبی ...بەپێی ئەو

ڕێکەووتنە تورکیا دانینا بە دەسەڵاتی بەریتانیا لەسەر کەنداوو ڕازی بوو لەسەر کێشانی نەخشەی- هێلی بەنەفسەجی بەدانانی سنووری نێوان شاری نەجدی سعوودیو پارێزراوی شاری عەدەنی ڕۆژهەلات- لە ناوچەکەدا .

١٩١٣/٨/٥ فەرمانی سوڵتانی عوسمانی دەرچوو بە لەخۆ گرتنی هەندێ خاڵ لەناوەڕۆکی ڕێکەووتنامە ، لەکاتـژمێر سێی پاش نیووەڕۆی ئەم ڕۆژەدا ژمارەیەکی زۆر لە عەرەبەکان لەگەڵ کورد لە هۆڵی مونتەدای ئەدەبی لە سەرداوای عەبدولکەریم خەلیل کۆبوونەوە .

ئەویش بە پێکهێنانی شاندێك لە شەریف عەلی حەیدەر پاشاو دوو کوڕەکەی محی الدینو مجید ، مەعروف ئەفەندی ڕسامی، شێخ عەبدالعەزیز شاوێس، شوکری پاشا ئەیوبی- بەدیع بەگ نەجیب بەگ شفیر- سامی بەگ عەزیم- ئیبراهیم بەگ سووسە- محیەدین پاشا جەزائیری- موونسنیور شریم- دکتۆر حوسێن حەیدر- عەبدوالکەریم ئەفەندی خەلیل- ...؟...!.
ئەمەش بەهۆی نەهێشتنی کێشە لە نێوان تورکو عەرەب ، لە سەر حیسابی کورد ، کە زۆربەی ئەو ئەندامانە کوردبوون ، کەچی باس لەکێشەی کوردو خاکی کوردستان نەکرا...؟...!.

١٩١٣/٩/٨ گرێدانی کۆنگرەی پانزەهەمی جوولانەوەی سەهیۆنیزمی جیهانی لەشاری ڤیەنا کە ٥٠٠ نووێنەر ئامادەی کۆنگرەکە بوون ، کە – لفسۆن – لە سەرۆکایەتی بانکی سەهیۆنی و دراوی نەتەوەیی یەهوودی مایەوە لەگەڵ سەرۆکی لیژنەی هەمیشەیی ، کە حایم وایزمان ، بۆ جاری یەکەمو بەهەڵبژاردنی – واریورك- بۆ سەرۆکایەتی کردنی لیژنەی کاری بچووك ، لەگەڵ سەهیۆنی ڕووسی-تشکینۆڤ – بە جێگری لەکۆنگرەکەدا .

١٩١٣/١٠/١٠ لە دایك بوونی ڕۆشنبیرو ئەدیبی بەناوبانگی فەرەنسی- لکود سیمۆن- لەشاری تەناناریفی دوورگەی مەدەغەشقەر ، کەیەکێك بوو لە ژێردەستەکانی ئەو کاتی دەسەڵاتی فەرەنسا.

١٩١٣/١٠/١٢ ڕژێمی فارسی لە ئێران دانینا بە دەسەڵاتی ڕووسیا لەسەر ناوچەیەکی فراوان لە نێوان سنووری هەردوو لایان ، کە زۆربەی ناوچەی کوردستانی

ڕۆژهەڵاتی دەگرتەوە ، بە بەجێهێشتنی بۆ ڕووسیا كە ڕووسەكان پێیان دەگووت- كوردستانسكی ئۆیەزید- لە ناوچەكەدا .

١٩١٣/١١/١٤ دامەزراندنی كۆمەڵەی ڕۆشنبیری كوردستان ، لەلایەن مامۆستا عبدولڕەزاق بەدرخان لەشاری – خوویی- لە ڕۆژهەلاتی كوردستانی ژێردەسەڵاتی فارسی لە ئێراندا .

١٩١٣/١١/٣٠ گرێدانی كۆنگرەی پاریسی پایتەختی فەرەنسا بەئامادە بوونی نووێنەرانی وولاتی شامو هەرێمەكانی عەرەبی دیكەو دەرەوەی هەرێمەكانی عەرەبو وولاتی شام ، كە ژمارەی ئەندامانی مەسیحیەكان بەرامبەر بە ژمارەی ئەندامانی ئیسلامیەكان بوون لە كۆنگرەكەدا ، لەو كاتەش فەرنسا پشتگیری ئەو كۆنگرەیەی كردو ئیتحادیەكان هەوڵیان دا كە كار لەهەلوویستی فەرنسا بكەن ، بەهەڵووەشاندنەوەی ئەو كۆنگرەیە لە پاریسدا .

بەڵام فەرنسا هەوڵەكانیانی پشتگوێ خستن و فەرەنسا سەركەووتنی بە دەست هێنا لەو هەوڵە هەمەلایەنەی كە بەرامبەری دەركرا بە كەم كردنەوەی نرخی رایەلەی بەئیسلامەكان و هەولی بووژانەوەی بیری نەتەوەیی عەرەب دەدرا دژی ئاین ، هەتا عەبدولحەمید زەهاوی مۆری لەسەر ئەو پەنجەرەیە كردو لەكۆنگرەی پاریس ووتی:-

ئەو راپەرینە تووشی گرژی بووە ، كە هەموو كات لەپێناو دۆزینەوەی ڕێگەچارەسەری كێشەكانی رامیاری بدرێت ... بەڵام دوای ئەوە ئیتحادیەكان نووێنەریان رەوانەی پاریس كرد ، كە ئەمینداری نهێنی كۆمەڵەی ئیتحادو تەرەقی مەدحەد پاشا بوو، پەیووەندی لەگەڵ سەركردەكانی عەرەبو بەشدار بووانی كۆنگرەكە كردو لەگەلیان ڕێكەوت بەدوو ڕێكەوتن .

كە یەكیان چوار خاڵ بوو ، دووەمیان پێنج خاڵ بوو ... بەڵام دوای ئەوە جەنگی یەكەمی جیهانی هەلگیرساو ئەو ڕێكەووتنە هەرەسی هێنا، بە هۆی دروستبوونی بارێكی نووێ لە جیهاندا .

١٩١٣/١٢/١٧ لە دایك بوونی فەیلەسوفی ئازادیخواز – ئەلبێرت كامۆ – لە دایك و باوكێكی فەرەنسی و نیشتەجێ بووی شاری جەزائیر چاوی بە جیهان هەڵهیناوە ...شایانی باسە ساڵێك دوای لەدایك بوونی ، باوكی لەجەنگی

یەکەمی جیهانی دەکوژرێ .

بەمەش سەردەمی منداڵی بە هەژاری و نەداری لە جەزائر بەسەردەبات و دوای تەواو کردنی قۆناخەکانی خوێندن لەخوێندنی زانکۆدا ، تووشی نەخۆشی سیل دەبیت و لەوکاتیش یاریزانێکی دیارو بەرچاو دەبێ .

لەساڵی ١٩٣٤ بەهۆی ناڕەزایی دەربڕین لە رامیاریەتی خراپی وڵاتی ئیسپانیا ، پەیووەندی بە ڕیزەکانی پارتی کۆمۆنیست دەکاو بەردەوام دەبێ لە چالاکیەکانی پارتی کۆمۆنیستی جەزائیر ، کە بانگەوازی سەربەخۆییان دەکرد لە وڵاتەکەدا .

دوای ئەوە لە ساڵی ١٩٣٨ دەچێتە فەرەنساو تێیدا نیشتەجێ دەبێت و دەست بەبڵاوکردنەوەی ووتار لە ڕۆژنامەکان دەکا . هەروا لەساڵی ١٩٤٤ یەکەم پەرتووکی بەناوی نامۆو ئەفسانەی بیرف بڵاودەکاتەوە، لە ساڵی ١٩٥٦ ڕۆمانە بەناوبانگەکەی بەناوی – کەوتن – بڵاودەکاتەوە و بەشداری لە دەیا چالاکی و کاری ڕۆژنامەگەری دەکردوو و بەردەوام بووە لە کارەکانی تا لە ١٩٦٠/١/٤ بەکارەساتی ئۆتۆمبێل گیانی لەدەست دەدات لە وڵاتەکەدا .

## ١٩١٤

١٩١٤/١/٤ بە پێی فەرمانی سوڵتانی عوسمانی ، ئەویش بە بەدامەزراندنی حەووت کەس لەسەرکردەکانی عەرەب ، لە ئەنجوومەنی ئەعیان ، یەکەمیان شێخ عەبدولحەمید زەهاوی بوو ، کە لە نژاد کورد بوو ، گەرچی بەعەرەب لەقەڵەم درا بوو،لە ئەنجوومەنەکەدا.

دوای ئەویش دامەزراندنی شوکری عەسلی و، عەبدولوەهاب ئینگلیزی و، ئەمین تمیمی و ، ناجی سوویدی ، لە پلەی بەرزدا .. دوای ئەوە دوو قوتابخانەی ناوەندی لە شارەکانی دیمەشق لە شام و لە بەیروتی لوبنان کرایەوە.

١٩١٤/٢/٨ بڵاوکردنەوەی یەکەم ژمارەی گۆڤاری – دەنگی کورد– لە تورکیا لەلایەن ماموستا جەمالەدین بابان.

١٩١٤/٢/٨ بلاوکردنەوەی یەکەم ژمارەی گۆڤاری - بانگی کورد- لەشاری بەغدای پایتەختی وویلایەتی بەغدا... لە بەر ئەوەی ئەو کات سێ وویلایەت هەبوو ئەوانیش :-
١- وویلایەتی بەسرە ٢- وویلایەتی بەغدا ٣- وویلایەتی موسڵ ، کە هەر یەکەو چەندین پارێزگاو ناوچەی لە خۆ دەگرت بەتایبەتی باشووری کوردستان ، کە لە ژێر دەسەڵاتی وویلایەتی موسڵدا بوو ، تاکوو دامەزراندنی دەووڵەتی ئێراق لەسەر خاکی هەرێمی باشووری کوردستان .

١٩١٤/٢/١١ دەسەڵاتدارانی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی لەڕاگەیاندنی فتوایەکیاندا ، کە دژی بەریتانیا جەنگ بکات . کە ئەو فتوایەش کاریگەری بە سەر دانیشتووانی وولاتەکە هەبوو ، بۆ بەرزکردنەوەی کێشەو ململانێ لەپێناو بەهێز کردنی دەسەڵاتی عوسمانیدا .

١٩١٤/٣/١ دەسەڵاتی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی سەرژمێری ساڵی ٩١٩ ی لەم رۆژەدا بلاو کردەوە ، کە بە پێی ئەو سەرژمێریە ژمارەی دانیشتووانی کورد لە ناوچەو پارێزگاکانی - وان ، بەدلیس ، خەربوت ، دیار بەکر، ئەرزەڕۆمدا - لە باکووری کوردستان ، ٤٨٠,٥٢٧,٢ ، هاووڵاتی کورد بووە ، بە پێی ئەو سەر ژمێریە لە هەرێمەکەدا .

١٩١٤/٢/١١ لەو کاتەی کە سوڵتانی عوسمانی داوای جیهادی دەکرد دژی بەریتانیەکان لە فەتوایەکدا لەناوچەی دارفوور... جێگەی ئاماژە پێکردنە. کە مێژووی رەگەکانی کێشەی دارفوور دەگەڕێتەوە بۆ راگەیاندنی سەربەخۆیی بە پێی سنووری ئەو کاتە لە ساڵی ١٨٢١، لەلایەن دامەزرێنەرو والی وولاتی میسر- محەمەد عەلی پاشا، پێك هێنرا.
کە لەو کاتە بە دارفوور دەگووترا - دیارفوور - ئەویش بەناوی ئەو هۆزە سەرەکیە ناوزەند کرابوو کە لەو ناوچەیە دا نیشتەجێ بوون.
ئەم دەست بەسەراگرتنە لەو کاتە هات کە لە دوای ساڵی ١٨٨٥ ژەنەرال گۆردون دادوەری سوودانی کووژراو، محەمەد عەلی پاشاش دەستی بەسەراگرت لە کێشووەرەکەدا.

دوای سەركەووتنی بەریتانیەكان لە سوودان لە شەڕی ئومدرمان لە ساڵی ١٨٩٨ بەسەركردایەتی – كتشنر – كە ئەو بە نیازی دەست بەسەراگرتنی چاوگەكان لە زێی نیل و بێ بە شكردنی هێزەكانی ئیستعماری ئەورووپی دیكە... دوای ئەوە بەریتانیا توانی دوای ساڵێك حكوومەتی میسر رازی بكات بەخەرج كردنی خەرجیەكانی وولاتی سوودان، بەم هۆكارە رێكەوتنی دوو لایەنە لەنێوانیان مۆركرا. لەكاتی هەڵگیرسانی جەنگی یەكەمی جیهانی لە ساڵی ١٩١٤ بەریتانیا چووە ناو شەڕ دژی توركیا كە لەو كاتەش بەریتانیاو توركیا دەسەڵاتی هاوبەشیان هەبووە لەسەر سوودان.

ئەم فتوایەش كاری كردە سەر دەروونی ئیسلامەكان بەشێووەیەكی گشتی و جێ بەجیكردنی داوای سوڵتان بوو لەسەر دراوی – دینار – كە لەو كاتە دەسەڵاتداریەتی دارفووری دەكرد... و بەریتانیا توانی ئەو دەسەڵاتەی كە لە دارفوور هەبووە بە ئامۆژگاری و پشتگیری والی میسر محەمەد عەلی پاشا

لە ناوی بیات دارفوور بخاتە ژێر دەسەڵاتی تەواوی سوودان لەساڵی ١٩١٦.

لەو كاتەش ناوچەی دارفوور زیاتر لە ١٠٠ هۆزو تیرەی جیاجیای لێی نیشتەجێ بوو جگە لە عەرەبەكان كە بە هۆی فتووحاتی ئیسلامی گەیشتوونە ئەو ناوچەو لێی نیشتەجێ بوون، كە كۆی ژمارەی دانیشتووانی ئەو هۆزانە خۆی لە ٦٠٠٠٠٠٠ ملیۆن كەسی دەداو رووبەرەكەشی لە رووبەری خاكی فەرەنسا زیاتر دەبوو... ئەو هۆزە ئەفریكیە فوورەكان لە – زگاوەو میسالیت و برتی و ئاماو برحەق و فلاتە

پێك هاتبوون و هۆزە عەرەبییەکانیش لە — زریقان و تعایشە و مسیریەو بەنی هلبە و معالیە و سەلامات و هەوامدە پێك هاتبوون.
کە ئەمانەش لەدوای فتووحات گەیشتنە ئەم ناوچەیەو نەك بەمیوانی بەڵکوو خۆیان کردە خاوەنی ناوچەکە، بە هۆی ئیسلام و دەوڵەتی ئیسلامی و باڵا دەستیان لەوکاتدا... لەگەڵ ئەوەشدا لەپاڵ ئەو ناوچەیە هەرێمی کوردڤانی دراوسێی هەبوو کە بەناوچەیەکی سەرەکی دادەنرا بەهۆی بەرهەم هێنانی پێنجەکی بەرهەمی سمغ لەجیهان.
هەروا نوحاس و یۆرانیۆم و کۆگایەکی نەوتی بوو لەوکاتدا... ناوی کوردڤان لەوە هاتووە کە لەکاتی دەسەڵاتی سەلاحەددینی ئەیوبی کورد لەو ناوچەیە دەسەڵاتداربوونە لەسەر دارفوورو نیشتەجێی هەرێمی کوردڤان کورد بوونە.
ئەویش لەخێزانەکانی بەرپرسانی دەسەڵاتی ئەییوبی و هێزە چەکدارەکانی بووەو تاکوو ئێستاش هەر بەناوی کوردەو کورد لێی نیشتەجێن، بەڵام لەشێوەو شێوازی نەتەوەیی وەك کاتی دەسەڵاتی سەلاحەددین نین بە هۆی کارلێکردن و کاردانەوەی باری ناوچەو هەرێم و کێشووەرەکەدا.
لەگەڵ ئەوەشدا هۆزە عەرەبەکان تاکوو دوای جەنگی دووەمی جیهان نیشتەجێی تەواو نەبوونە لەو ناوچەیە، بەڵکوو مەڕ لەوەرێن و رەوەند بوونەو هەر کاتەو لەناوچەیەکدا ژیانیان بەسەربردووە بەپێچەوانەی هۆزو تیرە ئەفریکیەکان کە دانیشتووانی رەسەنی ناوچەی دیارفوور بوونە لەگەل هەرێمی کوردڤان. کە هۆزە ئەفریکیەکان لە چاکەو پیاوەتی خۆیان ماوەیان بەعەرەب دابوو کە مەڕو ماڵاتیان لەو ناوچەیەدا بلەوەرێنن بەهۆی بوونی لەوەرگەی باش و زەویە بەپیتەکەیدا.
ئەم لەلایەك و لەلایەکی دیکە هۆکارەکانی سرووشت و کەش و هەواش کاریگەری لەسەر ئەوە هەبوو، کە رەوەندەکان روویان لەجێگەی سەوزی خاك و لەوەرگە دەکردو هۆزە ئەفریکیەکانیش ماوەیان نەدەدانێ بەئارەزووی خۆیان لەناوچەکەدا بسوورێنەوە. ئەمەش بووە هۆکاری ئەوەی کە شەڕو کێشەو ململانێ لەنێوان رەوەندە عەرەبەکان لە هۆزو تیرەکان و دانیشتووانە ئەفریکیەکان و بەرز بوونەوەی ئەو کێشەیە گەیشتە قۆناخی کێشەی نەتەوایەتی و سرووشت و کەش و هەوا لەلایەك و باری رامیاری و ئابووری

ناوەخۆو دەرەوە لەلایەکی دیکە.
ئەمەش بووە هۆکاری کاردانەوەی لە سەر ناوچەکە بەپشتگیری هۆزو تیرە عەرەبە رەوەندەکان لەلایەن حکوومەتە یەك لەدوای یەکەکانی سوودان و دژایەتی کردنی دانیشتووانە ئەفریکیە رەسەنەکان .
کە ئەمەش وای کرد کە کێشەکە بەرەو کێشەیەکی نێوو دەوولەتی هەنگاوبنیٚ، کە ئێستاش بۆتە ئالۆزترین و نالەبارترین کێشە لەکێشوەری ئەفریکیا. کە ئەویش حکوومەتی سوودان و دراوسێکانی لێیبەرپرسیارن بەهۆی بەعەرەبکردنی ناوچەکە لەهەموو بوارە جیاجیاکان وهەتا لە هەرێمی کوردڤان بەهەمان شێووەو شێوازدا.
کە ئەمرۆش ئەو ئەرکە کەوتۆتە ئەستۆی کۆمەڵگای نێوو دەوولەتی لە پێناو چارەسەرکردنی لە هەموو بوارە جیاجیاکان و لە ئەنجامدا سوودان بەرەو دابەشبوون هەنگاو دەنیٚ... لەلایەن جوولانەوەی میللی سوودان لەباشوورو لەلایەکی دیکە ناوچەی دیارفوورو لایەنی سێیەم کوردڤان لە وولاتەکەدا.

سەرچاوە :- BBc.arkabic

١٩١٤/٣/١ ئیمپراتۆریەتی عوسمانی هەستا بە ئامارێکی خواستیاری لە ناوچەو هەرێمەکانی ژێر دەسەلاتی خۆی، کە یەك لەوانە باکووری کوردستان بوو، کە ئەنجامی ئامارەکەی لە ساڵی ١٩١٩ بلاوکردەوەو ژمارەی دانیشتووانی کورد لەشارەکانی بەدلیس و دیاربەکرو ئەرزەرۆم و وان و خەربووت بە ٢,٥٧٠,٨٤٠ ملیۆن کەس دیاریکرد لە هەرێمەکەدا.

١٩١٤/٤/٤ گرێدانی کۆبوونەوەی کۆمیتەی ڕێکخراوی – ئیتحادو تەرەقی– تورك لەمەڕ کێشەی کورد ، لە پێناو سەرکووت کردنی ڕاپەڕینەکانی بزووتنەوەی کورد لەباکووری کوردستان.

١٩١٤/٥/١ ژەنەرال – زلنگی – لە بارەی ئامار لە تورکیا دەڵیٚ :– ژمارەی کورد لە تورکیا دەگاتە ٣,٨٠٠,٤٧٥ کەس... هەروا لە ئاماری ساڵی ١٩١٩ دا کە ڕژێمی تورکیا لە ٥,١ بلاوی کردۆتەوە لە پارێزگاکانی – وان – بەدلیس – خەربووت – دیاربەکر – ئەرزەرۆم – کە ژمارەی کورد لەو پارێزگایانە

٢,٥٢٧,٨٤٠ کەس بووە، کە چەندین پارێزگاو ناوچەی دیکەی لەئامارەکەدا دیارنەخستووە.

لەلایەکی دیکە بە پێی کتێبی بچووك کە لە فەرەنسا بلاوکراوەتەوە لە ساڵی ١٨٩٢، لەو کتێبەدا هاتووە کە ژمارەی دانیشتووانی کورد لە باکووری کوردستانی ژێر دەسەڵاتی عوسمانی تورك ٣,٠١٢,٨٧٩ کەسە... بەڵام ئەو ئامارو مەزندانە راستیان تیانبە بە هیچ شێووەیەك.

یەکەم :- بە هۆی نەبوونی ئامارێکی تەواو لەسەر بنەماکانی زانستی.

دووەم:- بەهۆی داگیرکردن و ئێش و ئازاردان و بە توورککردن نەیان ویستووە ژمارەی کورد لەسەر خاکی کوردستان بەراستی دەربخەن.

سێیەم :- لە ئێستای باکووری کوردستان ٢٤ پارێزگایەو ژمارەی دانیشتووانی زیاتر لە ٢٣,٠٠,٠٠ ملیۆن کەسە، جگە لەوانەی دەربەدەرکراون بۆ هەندەران. لەوانە شاری ئەستەمۆڵ، کە ئێستا شارێکی کوردیە لە بەر ئەوەی ئێستا زیاتر لە ٣,٥٠٠,٠٠ ملیۆن کورد تیایا نیشتەجێن... هەروا لە ئێران زیاتر لە ١٢,٥٠٠,٠٠ ملیۆن کورد لە رۆژهەڵاتی کوردستان نیشتەجێن...هەروا لە ئێراق زیاتر لە ٦,٧٥٠,٠٠٠ ملیۆن کورد نیشتەجێن و... هەروا لە سووریا زیاتر لە ٢,٧٥٠,٠٠٠ ملیۆن کورد نیشتەجێن.

جگە لە وولاتەکانی دیکەی وەك لوبنان و ئەفگانستان و پاکستان و هندستان و فەلەستین و ئوردن و ئیسرائیل و چینی مللی و وولاتانی دیکەی کە کۆمارەکانی سۆڤیەتی جارانی لێی پێك هاتبوو... ئەمە لە پارێزگای یەریڤان و دەوورووبەری، کە خاکی کوردستانەو کۆی دانیشتووانی خۆی لە ٢,٥٠٠,٥٠٠ ملیۆن کورد زیاتر دەدات.

بەڵام بەداخەوە کوردو، بە تایبەتی سەرکردایەتی کورد هەر لەکۆنەوە تاکوو ئێستاش ئاواتیان سامان و دەسەڵاتە زیاتر بووە لە وەی ئاواتیان رزگارکردنی گەل و نیشتیمانەکەیان بێت.

وەك وولاتانی دیکەی کە ژمارەو رووبەری نیشتیمانەکەیان چوار یەکی خاکی کوردستان نابێت و خاوەنی دەسەڵات و سنووری دیاریکراوی نیشتیمانەکەیانن لەهەموو بوراە جیاجیاکان لە جیهاندا.

١٩١٤/٦/٢٨ پارێزگـــــاری هــەرێمی ســربیا هەلسا بـە تـیرۆر کردنـــــــی– ئەرشـــــەدیف فرانـــــسیس فرونانــــد– ی میراتگــــــری کورسـی نەمسا– مـەژەر ،لـە شـاری سـەرایڤۆ ، لـە ڕێگـەی هاوولاتیـەکی سربی ،کـە بـووە هـۆی پەلـــەکردن لـــە هەلگیرســـاندنی جـــەنگی یەکـــەمی جیهـــان بـــە شـــێوەیەکی ڕاستەوخۆ دوای یـەك مـانگ. لـە نێوان ڕووسـیاو ئـەڵمانیاو وولاتـانی لایـەنی تەوەردا.

جێگـەی ئامـاژە پێکردنـە کـە جیهـان لـەو کاتـەدا لـە بـارێکی شـلەژاوو کولاّندا بوو ، هەلوویستی نێوو دەووڵەتی ئـەو ساکەش گـەفی تەقینەویـەکی گەوورەی دەکردو تەنیا یەك بلێسە بەس بوو بۆ داگیر ساندنی ئاگرێکی بێ ئەمانی و جەنگێکی وێرانکەری وا کە تەڕوو وشك بە یەکەوە بسووتێنێ

لـەو کاتـەش ئوتومبێلە شوومەکە کە ڕەنگێکـی سووری گـەشی هـەبوو ، کـە بووە هۆی ئەو بلێسەیەی هەڵگیرسانی ئاگرەکەی جەنگ کـە جـارێ کـەمتر لـە دووسەد میل ڕێگای بڕی بوو ، بۆ رووکـەش لـە بنەماڵـەی شـاهانەی نەمسا دروستکرابوو.

ئەوانیش جێنشینی شـای نەمسا و مـەژەر – ئەرشـیدف فرانـز فەردینانـد و هاوســەرەکەی بـوون . ئـەویش لـە کـاتی چـوونیان بـۆ شـاری سـەرایڤۆی پایتەختی هەرێمی بۆسنیای سەر بە سربیا لەم ڕۆژەدا .

هەروا بە سوواری ئەم ئوتومبێلە شوومەو گەرانیان بە ناو شەقامەکانیدا ، لە ناکاو بۆمبایەك بە ئوتومبێلەکەدا درا بە – ئیفریزەکەی – کەوت و گەرایـەوە سەر ڕێگایەکەی و لـە گـەڵ تەقینەوەیدا چوار لـە پاسـەوانەکانی ئەرشـیدۆف

کە ئەسپ سووار بوون و لە دواوەی دەرۆیشتن بریندار بوون .
شای نەمسا کەمێك وەستا تاکوو لە باری بریندارەکان دڵنیا بوو ، ئینجا درێژەی بە گەرانەکەیدا و لە پڕ شوفێرەکە لە رێی دیاریکراو بۆی لاداو بۆ کۆڵانێکی دەرنەچوو رۆیشت و لەویٚ لاوێك لە پشت دەرگای ئوتومبێلەکە پەیدا بوو و چووە بەردەمی و بە جنێودانەوە گوللەی دەمانچەکەی دەستی گوللەکانی بە تاڵکرد و هەردووکیان گیانیان لە دەستدا... کە ئەمەش بووە هۆکاری هەڵگیرساندنی جەنگی یەکەمی جیهان لە ١٩١٤/٨/١ لە جیهاندا .

١٩١٤/٧/٢٧ وەزارەتی دەرەوەی رووسیای قەیسەری ئاگاداری بالوێزی خۆی کرد لەتارانی پایتەختی ئێرانی فارسدا ، کە راپەرینی ئاشوورییەکان دانپێنانێکی داوا کراوە لە ئێستادا . وەزارەتی جەنگی رووسی ئاشوورییەکان چەکدار دەکات بەهۆی شالاوە دووژمنکاریەکانی تورکیا بۆ سەر رووسیاو ئاشوورییەکان لە باکووری کوردستان ... واتە ئەرمەنەکان بە پلەی یەکەم و کورد بەپلەی دووەم ، لەو کات لەسەر رۆژهەلات و باکووری کوردستاندا .

١٩١٤/٧/٢٨ هەڵگیرساندنی جەنگی یەکەمی جیهان بەشێووەیەکی فەرمی راگەیەندرا ، لەلایەن وولاتانی تەوەرو رووسیاو هاوپەیمانان لەگەڵ ئەڵمانیاوئیمپراتۆریەتی عوسمانیدا ،ئەویش :- یەکەم بەهۆی تیرۆر کردنی جێگری خاوەن شکۆی نەمسا - مەژەر ، لە سەرایڤۆو دووەم بەلێك ترازانی پەیووەندی نێوودەوڵەتی لەلایەك و ، بۆگەن بوونی رژێمەکانی ئەڵمانیاو عوسمانی لەلایەکی دیکەدا .
بە تایبەتیش بە دامەزراندنی حکوومەتی بۆرژوازی لە رووسیاو نەمانی توانای دەسەڵاتی قەیسەری رووسیا لەسەر بارودۆخەکەدا ، و بەردەوام بوونی ئەم جەنگە تا ١٩١٨/١١/١١ لە جیهاندا .

١٩١٤/٨/١ لە گەڵ هەڵگیرسانی جەنگی جیهانی یەکەم و هۆکارەکانی ، سەرەکی کە نیازی ئیمپراتۆریەتی بەریتانیا ، لە پێناو کۆتایی هێنان بوو بە ئیمپراتۆریەتی عوسمانی و دابەشکردنی پاشماوەی دەسەڵاتی عوسمانی و کەل و پەل و خاوەنداریەتی و دورخستنەوەی جیهانی عەرەبی بە تەواوی لە ژێر دەسەڵاتی عوسمانی و ئەڵمانیادا ، کە خواستەکانی ئەوە بوو . کە

ڕێگاكانی پێش خۆی ببڕێ و بەرەو كەناڵی سوێس هەنگاو بنێ لەمیسردا .
ئەویش بە هاوكاری توركیای هاوپەیمانی ، كە بووە هۆی ڕێگەگرتن لە بەریتانیاو نیازەكانی چ لە ناوەندی شەڕو چ دوای سەركەووتن لەشەڕ لە هەموو بوارەكاندا .

١٩١٤/٨/٢ ڕۆژی دەستپێكردنی كارەكانی سەفەر بەلگ... شایانی باسە سەفەر بەلگ مانای ئەوەیە ، كە دەسەڵاتی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی لەسەرەتای هەڵگیرسانی جەنگی یەكەمی جیهان ، داوای لە هەموو گەلانی توانا داری چەك هەڵگرتنی هەبوو بچنە ڕیزی هێزەكانی سوپای عوسمانیدا .
ئەویش بۆ شەڕ كردن دژی ڕووسیاو وولاتانی تەوەری شەڕكەر . واتە – نەفیر عام –. كە گەلی كوردستانیش یەكێك بوو لەو گەلانەی ژێر داواكارییەكانیان بوو لەهەرێمەكان و بە تایبەتی لە باكوورو باشووری كوردستاندا .

١٩١٤/٨/٢ مۆركردنی ڕێكەووتننامەی نێوان ئیمپراتۆریەتی عوسمانی و حكوومەتی ئەلمانیا ، سەبارەت بەناوچە كوردیەكان ، بەتایبەتی باكووری كوردستان و دەست پێكردنی لە دوای سەركەووتنیان لەجەنگ ، لە باشوورو ڕۆژهەڵاتی كوردستان ، بەهۆی بوونی چاوگەی نەوت و گازو بەرهەمەكانی دیكە لەهەموو بوارەكانیدا.

١٩١٤/٨/٢ دەست پێكردنی چەندین كاری جەنگی لە ئەورووپاو ، لە هەمان كات مۆر كردنی ڕێكەووتننامەی هاوپەیمانی و یارمەتی دانی یەكتر لە نێوان ئەڵمانیاو دەسەڵاتی عوسمانیدا ، كە بووە هۆی وریا بوونەوەی ڕووسیای قەیسەری ، ئەویش لە پێناو ڕاكێشانی ئاشووریەكان بۆ لای خۆیان بۆ هەر كاریكی ناكاودا .

بەڵام توركەكان هەستیان بەوە كردو دەستیان كرد بە ناونووس كردنی ئاشووریەكان لە ڕێزی سەربازی بە مەبەستی ڕاكێشانیان بۆ لای خۆیان و بە بەرەنگار كردنەوەیان دژی هەر كارێكی دژ بە دەسەڵاتی عوسمانی ، بە تایبەتی بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی كورد لە كوردستان ، لەسەرەتای جەنگی یەكەمی جیهانی هەڵگیرساو لەهەرێمەكاندا.

١٩١٤/٨/٣ ئاشکرا بوونی هۆکارەکانی هەڵگیرسانی جەنگی یەکەمی جیهانی بووە هۆی دارِشتنی نەخشەی هەمەلایەن چ لە ناوەندەکانی شەرِو چ لە کۆتایی شەر ، لە پێناو دابەشکردنی جیهان ، لە نیوان وولاتانی هاوپەیمان و زاڵ بوون بەسەر هەرێم و وولاتانی دورستکراوی خۆیان و داگیر کردنلە هەموو بوارەکان لە جیهاندا .

١٩١٤/٨/٢٢ لە پێناو ملکە چ پێکردن بە ئاشووریەکان و کەسایەتی ناوداری ئەرمەنەکان – مار شەمعوون – یان بانگهێشت کرد ، لە سەر داوای دەسەلاّتی عوسمانی . کە لە لایەن پارێزگاری وان لە باکووری کوردستان بانگ کرابوو ، داوایان لێکرد گەر لایەنگیری پشتگیری دەسەلاّتی عوسمانی و ئەلمانیا نەکەن ، ئەوا لە ناو دەبرێن و دوور کەووتنەوەتان لە لایەنگیری رِووسیا و هاوکارینەکردنتان لەگەڵ شۆرِشگێرە کوردەکان لە باکوری کوردستان .

١٩١٤/٨/٢٩ کلیم نامەیەکی ئاراستەی مێژوونووسی رِووسی مینۆرسکی کردو تیایا هاتبوو:– کە کردەوەکانی سمکۆی شکاك ئەبێتە هۆی ئەوەی ، کە کێشەی نەخشەکێشانی سنوور ئاڵۆز بکات ، لەم رِووەوە ئامۆژگاری بۆ کوونسلەکانی ورمێ و خوویی و تەورێز رِەوانە کردو دەڵێ:– پێوویستە سمکۆی شکاك هوشیار بکرێتەوەو ناچار بکرێت کە واز لە پەیووەندی دوژمنانەکەی بهێنێ و پەلاّمار نەدانی بۆ سەر تورکیا ، ئەگینا ناچار ئەبین پشتگیری لێ نەکەین لە هەرێمەکەدا .

١٩١٤/٨/٣٠ دامەزراندنی لێژنەی جێبەجێکردنی کاروباری سەهیۆنیزمی گشتی بە سەرکردایەتی دادوەری سەهیۆنیزم – لویس براندنیس– کە ئەم لیژنەیە بووە هۆی دڵە رِاوکێی حکوومەتی ئەمەریکا بەرامبەر بە سەهیۆنیزم لەماوەی هەولەکانیدا ، بە یارمەتی دانی جوولەکەکانی دانیشتووی فەلەستین لە ناوچەکەدا .

١٩١٤/٨/٣٠ شاندێکی ئاشووریەکانی ژێر دەسەلاّتی فارس لە ئێران سەردانی کوونسلیەی رِووسیای کرد ، لەشاری ورمێ لە رِۆژهەلاّتی کوردستان و لە دوای گفتووگۆ کردنیان ، بەڵێنی برِوا بە یەکبوونیان بەیەکتری مۆرکرد ، ئەویش بەچەکدار کردنی ئاشووریەکان .

هەر لە دوای ئەوە ئاشوورییەکانی ناوخۆی شارەکە هەلسان بە خۆپیشاندان بەلایـەنگیری کردنـی ڕووسـیای قەیـسەری ، بـەڵام چـەکەکانیان بەدەسـت نەگەیشت تـاکوو کۆتـایی مـانگی/ ٩ی هـەمان سـاڵ لـە لایـەن بـەر پرسـانی ڕووسیا لە هەرێمەکەدا .

١٩١٤/٩/١٨ سـەرکردایەتی ئاشـوورییەکان ڕاسـتەوخۆ ڕوویـان لـە وەزارەتـی دەرەوەی ڕووسیای قەیسەری کرد ، بەڕونکردنەوەی باری ئاشووریو ئەرمەنەکان لـە ڕۆژهەلاتی کوردستان ، کە ژەنەرالی ڕووسی لەجەنگی فارابانۆڤ ٣٠٠ پارچە چـەکی هەمـەجۆری دابـە ئاشـوورییەکانو دوای ئـەوە لـە ٩/١٩ نووێنـەری کوونسلیەکە بروسکەیەکی بەپەلـەی ئاراسـتەی وەزارەتـی دەرەوەی ڕووسـیا کرد.

ئەویش بۆ بەچەکدار کردنی ئاشوورییەکان بەهۆی هەڕەشەی کوردو تورکەکان بـۆ سـەر ئەرمـەنو ئاشـوورییەکان ، واتـە مەسـیحیەکان بەگـشتی ... شـایانی باسـە لـەو کاتـە ڕژێمـەکانی فـارس لـە ئێـرانو عوسمانیـەکانی تـورك ، کـە هەموو هەولیان لەپێناو نانەوەی دژایەتیو دروستکردنی کێشە بوو لە نێوان کوردو ئەرمەن ، بە هەموو توانایەکیان لەسەر خاکی کوردستاندا .

١٩١٤/٩/٢٠ بەهاندانی هێزەکانی سووپای عوسمـانی ، چەکدارە کوردەکـان لـە بـاکووری کوردسـتان هێرشـیان کـردە سـەر ناوچـەی ڕۆژهـەڵاتی کوردسـتان دژی هێزەکانی سووپای ڕووسیای قەیسەری ، کە لـەو کات بنکە سـەربازیەکانیان لەو ناوچەکەدا بوون .

١٩١٤/٩/٢٤ هێزەکـانی سـووپای عوسمـانی لەناوچـەی شـاری شـەمدینان لـە بـاکووری کوردسـتان کۆبوونـەوە ، لەلایـەن سـەرکردایەتی گـشتی ئـەرکانی سـووپای عوسمـانی تـورك، لـەو کاتـە- مـترو پولیـت مارحنـا نیشۆ - ی سـەرکردەی ئەرمەنـەکان ڕووی کـردە ڕووسـیاو داوای یارمـەتی لێکـردن، لـەو کاتـەش - شێخ جەلالەدین - بەفیتی عوسمانیە تورکەکانو ساکاری هەلوێستی کورد لە باکووری کوردستان .

پـەلاماری ئاشـوورییەکانی شـاری ورمـێو شـنۆیدا ، کـە ئەمـەش بـووە هـۆی جـەنگی تـەواو لەسـەر دانیـشتووانی بـاکووری کوردسـتانو ڕۆژهـەڵاتی

کوردستان ، بەتایبەتی لە باکووری کوردستانی ژێر دەسەڵاتی ئیمپراتۆریەتی عوسمانیەکاندا .

١٩١٤/١٠/١٠ هێلە فراوانەکەی سەهیۆنیزم – زیرەك وایزمان – لە ماوەی پیش ڕاگەیاندنی بەریتانیاو فەرەنساو ڕووسیا بە شەڕی دژ بە تورکیاو ئەلمانیا ، کە وایزمان باش ئەوەی دەزانی ، کە وولاتانی هاوپەیمان و تەوەری شەڕ سەرکەوتن بەدەست دێنن و فەلەستین دەکەوێتە ژێر دەسەلاتی بەریتانیا .

بەمەش دامەزراندنی دەوڵەتی سەهیۆنی مسۆگەرە ، کە دەسەلاتی بەریتانیا درێژدەبێتەوە لەسەر وولاتی میسرو پەرژینی جیاکردنەوەی کەنالی سوێس لەدەریای ڕەش ، کە هیواکانی ئێمە وەك بەلژیکای ئاسیەوی دەبێ لە داهاتوودا لە جیهان .

١٩١٤/١٠/٢٢ ئەنوەر پاشا دەست پێشخەری سەرەکی بوو لە شالاوەکانی دژی هێزەکانی سووپای ڕووسیا. ئەوەی دیت کە هێزەکانی سووپای ڕووسیا لە ناوچەی قەوقاز پێشەکیەکی سەرەکی پێك دێنێ و بۆ ئەوەی وولاتی فارسیش بخاتە ژێر رکێفی خۆی و دژی ڕووسیا بووەستێ و هەوڵی ئەوەی دا کە بارێکی نا لەبار لە ناو موسڵمانەکانی ڕووسیا دروست بکات، ئەوەی لە دەرەوەی سنووری ئیمپراتۆریەتی عوسمانی بوون لەبەر ئەوەی ئەنوەر پاشا باشی دەزانی کە هەڵگری ئایینی ئیسلام جا لەهەر نەتەوەیەك بێت بەرگری لەدەسەلاتی عوسمانی دەکات.

بەلام هێزەکانی سووپای ڕووسیا لە بەرەی قەفقاز ئەو هەولانەی دەسەلاتی عوسمانی هەڵووەشاندەوە لە مانگەکانی یەکەمی شەڕەکە و لە دوای تێك شکاندنی هێزەکانی سووپای عوسمانی لە شەڕی – سەریگامێش کە لە ١٠/٢٢ بەردەوام بوو تاکوو ١٩١٥/١/١٨، لەدوای هێرشە سەرکەوتووەکانی سووپای ڕووسیا لە ئەرمینیای رۆژئاوا لە مانگی /١٩١٥/٢ و مانگی /١٩١٥/٣. کە ئەمەش بووە هۆی ئەوەی کە – مەلازگردو، پاسکالاو، شاتاخ و، کتوورو، وارزیش و وان، لە هێزەکانی سووپای عوسمانی پاککرانەوە.

واتە ئەم شارو گوندو شارۆچکانە هەمووی لەسەر خاکی باکووری کوردستان بوون، کە خاکی کوردستان ببووە گۆرەپانی شەڕی نێوان هێزەکانی سووپای ڕووسیاو ئیمپراتۆریەتی عوسمانی لەلایەك و هێزەکانی سووپای فارس و هێزەکانی سووپای عوسمانی لە لایەکی دیکە، گەلی کوردو ئەرمەنیش

وەرەقەیەکی مەزادی ئاشکرابوون بۆ سەرکەووتنی هەر لایەنێك لەو لایەنانە لەهەرێمەکەدا.

سەرچاوە :- تاریخ تورکیا المعاصر... دانانی کۆمەڵە توێژێنەرێکی سۆڤیەت.

١٩١٤/١٠/٣٠ بەهۆی نزیك بوونەوەی ئەستوولی - کەشتی گەلی- جەنگی تورکیا لە کەنارەکانی ڕووسیا بەسەرکردایەتی سوشۆن پاشا ، بە بۆردومان کردنی ئۆدیساو سییاستووبۆلی ڕووسی ، لەلایەن کەشتیەکانی جەنگی یاوزو میدل ، کە بووە هۆی هەلگیرسانی شەڕ لە نێوان ئیمپراتۆریەتی عوسمانی تورك و ڕووسیای قەیسەری لەو کات لە ناوچەکەدا .

١٩١٤/١١/١ لە دوای کشانەوەی هێزەکانی سووپای ڕووسیا لەناوچەی ورمێ لە ڕۆژهەلاتی کوردستان بە ڕاگەیاندنی هەلوویستی ئێران ، بە خۆ دوورە پەرێز گرتن ، ئەمانە بووە هۆ کاری ئەوەی کە سووپای عوسمانی ئەو جێگایانە داگیر بکەن و پاشماوەی جێ هێلراوی ڕووسەکان دابەش بکەن ، بەتایبەتی چەك و تەقەمەنی و دانیان بەکوردو هێرش کردنە سەر دوا بنکەکانی هێزەکانی سووپای ڕووسیا و کاری جەنگی لەولاو لەملا بەردەوام بوو لە هەرێمەکەدا .

١٩١٤/١١/١ هێزەکانی سووپای تورك لە ئەنجامی سەرنەکەووتنیان لە هەرێمەکانی قووبرس و بۆیان نەگوونجا هێزە پێشڕەوەکانی هێزی سووپای ڕووسیا بپشکنن ، دوای ئەوە لەگەڵ هێزەکانی ڕووسیا زەرەر مەند بون و ناچار بوون بۆ دواوە پاشەکشە بکەن لە ناوچەکەدا .

١٩١٤/١١/٢ لە دوای سێ ڕۆژ لە شالاوبردنی کەشتی جەنگی هێزەکانی سووپای عوسمانی و ئەڵمانیا ، بۆ سەر بەندەری ڕووسیا لە دەریای ڕەش ، ئەویش بە دیاریکردنی سەرەتای بەشداری ڕاستەوخۆی تورك دادەنرێت لەجەنگی یەکەمی جیهانیدا .

دوای ئەوە هێزەکانی پیادەی دەشتایی تورك هێرشیان کردە سەر پارێزگای قارس لە باکووری کوردستان ، بەلام بە هۆی لاوازی هێزەکەیان نەیانتووانی شارەکە داگیر بکەن و ڕوویان کردە شاری ئەرزەڕۆم و سزایان لێ وەرگرتنەوە ، بەهۆی بەرگری بەهێز لەشاری قارس ... دوای ئەوە لە مانگی/ ١٢ی هەمان

ساڵ ، شەڕ لە نێوان کوردو ئاشووری چووە ناو مێژوو لە باکووری کوردستان بە ناوی شەڕی – سەری گامێش– لە هەرێمەکەدا ... ؟ .

١٩١٤/١١/٥ هێزەکانی سووپای بەریتانیا شەڕی دژ بەهێزەکانی سووپای ئیمپراتۆریەتی عوسمانی راگەیاند بەهاوکاری هاوپەیمانان.

١٩١٤/١١/٦ هێزەکانی سووپای بەریتانیا توانی تاکە بەندەری فاوی وویلایەتی بەسرەو ، ئێراقی ئێستا داگیر بکات ، بە هۆی لاوازیو پاشەکشەی هێزەکانی سووپای عوسمانی بە کشانەوەیان لەو ناوچەکە دا.

١٩١٤/١١/١٠ لە پێکدادانی بەناوبانگی کیبرکایا– یەکەم شانۆی تورکی ئاسیەوی– کە نووێنەری ئاشووریەکان چووە لای – بنیامین مارشمعون– لە باکووری کوردستان ، لە دوای گەڕانەوەیان نامەیەکی بەتریکی مەسیحیەکانی هەلگرتبوو ، ئەوزیش بە دوپاتکردنەوە ، لەپێناو خۆ ئامادەکردن بە بەرپاکردنی ڕاپەڕین – مار شمعونیش– داوای سەرکەووتنی ڕاپەڕینەکەی کرد . بەهێرشی هێزی سووپای ڕووسەکان بۆ سەر باسقەلعەو دێزو چوونە ناویەوە .

هەر لەو کاتە چەکدارەکانی ئاشووری لە ئێران بەرەو ناوچەی مێرگەوەرلە ڕۆژ هەلاتی کوردستان هەلکشانو لە ئەنجام بووە هۆی هێرشی تورکو لە ئەنجام شەرەکە دوو ڕۆژی خایاند لە ناوچەکەدا .

١٩١٤/١١/١٥ بەهاندانی دەسەلاتی عوسمانی تورکو ئەلمانیا ، شەڕی پارتی زانی لە ڕۆژهەلاتی کوردستان دەستی پێکرد ، کە بووە هۆی دەرکردنی هێزەکانی سووپای ڕووسیا لە ناوچە کوردیەکان لە باکووری کوردستاندا .

١٩١٤/١١/١٩ هێزەکانی سووپای عوسمانی کەپێکهاتبوون لەهەشت فرقە لە وولاتی شام بەرەو کەنالی سوێس ، بە ڕێگەی بیابانی سینا بەرێکەووتن بە نیازی داگیر کردنی کەناڵەکە لەدوو قۆڵەوە ، یەکیان لە قۆڵی رەفەحو ئەویتریان لە قەنتەرەکە ، ئەمەش نزیکترین ڕێگا بوو بەدرێژی ٢٢٥ کیلۆمەترو دوەمیان ڕێگای مەعان – سوێس بوو ، کە ڕێگەی کاروانەکان بوو لەگەل درێژی ٣٢٥ کیلۆمەتردا .

بەلام لەدوای سێ هێرشی یەک لەدوای یەک ئینجا سەرکەووتنیان بەدەست

نەهێنا ، ئەویش بەهۆی بەرگری کردن لەلایەن هێزەکانی هندستان و ئەڵمانیا ، شـایانی باسـە هێزەکـانی سـووپای عوسمـانی لەسـەر داواو پـشتگیری ڕێکخراو دانیشتووانە ئیسلامیەکان هەڵسان بەنیازی داگیرکردنی سوێس و میسر، بەڵام هۆکارەکانی جەنگی یەکەمی جیهانی ماوەی پێ نەدان.؟؟؟

١٩١٤/١١/٢١ لە دایك بوونی سەرەك کۆمارو دامەزرێنەری رژێمی کۆماری لە ئێراق عەبدولکەریم قاسم لە شاری بەغدا .

کـــە نـــاوی تـــەواوی – عەبدولکـەریم قاسـم محەمـەد ئەبوبـەکری– ە و لـە لایـەن باپیری بەخێووکراوەو گەورە بـووە ، دوای ئـەوە بـووە بـە بازرگـانی پێـست لەگـەڵ کـورە خالەکـــەی فـــازل عـــەباس مەهداوی و کاریان بە یەکەوە کردووە لە بەغدادا .

١٩١٤/١١/٢٢ لە گەڵ داگیرکردنی وویلایەتی ئەوسای بەسرە لەلایەن بەریتانیا ، کە ئەوکات ڕۆژنامە بووە چەکێك لەپێناو بەرز کردنەوەی هەستی ڕامیاری و جمووجۆڵی سـەربازی و ڕامیـاری ، ئـەویش بـە دەرکردنـی ڕۆژنامەیـەك بـەناوی – بەسـرە تـایمس– لـە ١٩١٤/١١/١٩ ، بەزمانی ئینگلیزی و دوای ئەوە بوو بە زمـانی عـەرەبی لـە سـاڵی ١٩١٥، دوای ئـەوە بوو بە زمـانی فارسـی لەسـاڵی ١٩١٦، لـەکاتی داگیرکردنـی شـاری بەغـدا لـە ١٩١٧/٣/١١ ڕۆژنامـەی – بەغـداد تایمس– دەرکرا بەهەردوو زمانی ئینگلیزی و عەرەبی لە شارەکەدا .

دوای ئـەوە هـەنگاوینا بـەرەو هـەرێمی باشـووری کوردسـتان ، کـە یەکـەم هەنگاوی ئەوە بوو بە دەرکردنی ڕۆژنامـەی کوردی ، بەناوی – تێگەیشتنی

ڕاستی - لەهەرێمی باشووری کوردستان لە ١٩١٨/١/١ و ١٩١٩/١/٢٧ لە شاری سلێمانی لەو کاتدا .

١٩١٤/١١/٢٢ یەکەی پێشەوەی فرقەی - ئەنگلۆ- هندی - شەشەم ، کە گەوورەترین مەلبەند بوو لەباشووری ئێستای ئێراق ، کە دەسەڵاتی بەسەر پاریزگای بەسرادا مسۆگەر کردو کارەکانی خۆی ئەنجامدا.

١٩١٤/١١/٢٣ ڕژێمی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی بانگی جیهادی دژی بە هاوپەیمانان ڕاگەیاند ، لە جەنگی یەکەمی جیهان ، بەهۆی شلەژانی باری سەربازیو ئابووریو بازرگانی و پەیووەندیەکانی ومەترسییەکانی لە هەرەسهێنانی دەسەلاتەکەیدا.

١٩١٤/١١/٢٧ لە دایك بوونی نووسەری ناوداری ویلزی - ڕاشیل توزیس - کە خاوەنی کورتە چیرۆکی - سێووە تازەکان - کە خاوەنی گەوورەترین خەڵاتی ئەورووپیە لە جیهان ، بۆ نووسەرە گەنجەکان بەدەست دێنێت - سێووە تازەکان - کۆمەڵێك کورتە چیرۆکی هەڵێنجاو لە ژیانی سادەی ئاسایی دۆڵ و دەشتەکانی ویلزدا .

کە نووسەر خۆی خەڵکی ئەم وولاتەیە بەهای خەلاتی - دیلان تۆماس- ٦٠ هەزار جوونەیهی ئیستەرلینی یە .

ئەم خەلاتە دووسالٚ جارێك بۆ ئەو نووسەرانەی کە بەزمانی ئینگلیزی دەنووسن دەبەخشریٚ ، وەك ڕێزلێنانێك بۆ شاعری ویلزی - دیلان تۆماس - . ئەم نووسەرە لە ١٩٥٣/١١/٩ کۆچی دوایی کردووە لە وولاتەکەدا .

١٩١٤/١٢/١ شێخ عبدالسلام بارزانی لە شاری مووسڵ لە دوای دەستگیرکردنی لە دەڤەری بارزان لە هەرێمی باشووری کوردستان بەپێی بریاری دادگاییکردنەکەیدا لە سێدارەدرا ، لەگەڵ دوو لە هەڤالانی لەلایەن تۆرانیەکانی ناو دەسەلاتی عوسمانیدا .

١٩١٤/١٢/١٠ چاوپێکەووتن لە نێوان - مستر سکوتو وایزمانو هربرت شموئیل - بە ئامادە بوونی - حاخام موزی گاستر - کە سموئیل ململانێیەکی زۆری لە گەڵیا کرد ، لە دوای کۆبوونەوەی وەزیری بەریتانیاو ووتاری ئەسکۆت لەو

كۆبوونەوە ڕایگەیاندرا .

بۆ ئەوەی كە بەریتانیا واز لە سیاسەتی هەمیشەیی خۆی بێنێ بەرامبەر بە ئیمپراتۆریەتی عوسمانیو هەوڵی پارچە پارچە كردنی بدات ، لە پێناو دورست كردنی دەووڵەتی سەهیۆنی لە فەلەستین . هەر وەك – لوید جورج – بڕیاری بۆ دابوو لەگەڵ وەزیری دەرەوەی بەریتانیادا .

## ١٩١٥

١٩١٥/١/٢ مۆركردنی پەیمانی نێوان حكوومەتی بەریتانیاو عەبدولعەزیز سعوود ئەمیری حیجاز... لەو پەیمانە بەریتانیا دانینا بە دەسەڵاتی عەبدولعەزیز لەسەر شارەكانی نەجدو حەساو مەنتیفو دەووروبەری و كەنارەكانی كەنداوی فارسدا .

شایانی باسە كەنداوی فارسە نەك كەنداوی عەرەبی ، بەپێی ئەو پەیمانە– كە بەریتانیا دان بەدەسەڵاتی عەبدولعەزیز دەنێ وەك دادوەرێك لەسەر ئەو ناوچانەو بەرگری لێدەكات لەهەر پەلامارێك بۆ سەر دەسەلاتەكەی ، بە تایبەتی لە لایەن دەسەڵاتی فارس لەسەر دوورگەكەدا .

١٩١٥/١/٢ هێزەكانی سووپای قەیسەری ڕووسیا ئاگاداری دانیشتووانە ئاشووریەكانی شاری ورمێو– دەووروبەری كرد ، لەرۆژهەڵاتی كوردستان بە بەجێهێشتنی ناوچەی ورمێ بەتایبەتی گوندی– بەنگیجا– لە شارەكەدا .

كە ئەمەش بووە هۆی هەلاتنی دانیشتووانی گوندەكەو ماوەدان بە هێزەكانی سووپای عوسمانی تورك ، بۆ پەلاماردانی ئاشووریو كورد كە ئەوانەی پشتگیری هێزەكانی قەیسەری ڕووسیان دەركرد لەهەرێمەكەدا.

١٩١٥/١/٤ هێزەكانی سووپای عوسمانی تورك لە ناوچەی شاری ورمێ لە ڕۆژهەڵاتی

کوردستان ، به فەرمانی سەرکردەی سووپا – ڕۆستم بەگ – دەستیان کرد به لەناو بردنی ئاشووریەکان بەبێ ویژدانانە بەهەموو شێوەیەك نەك هەر ئاشووریەکان بەلکوو ئاشووری و ئەرمەن و کوردو گەلانی دیکەی دژ به خۆیان تەنیا فارس نەبێت .

ئەویش لە دوای دەست بەسەر کردنی زیاتر لە ٧٠٠ هاوولاتی لە نەتەوە جیاجیاکانی دانیشتووانەکەی پارێزگای ورمێیان ڕەوانەی شاری– خەسرۆف و گافیوان– کردو دوایی ئەوە هەموویان کووشت و زیندە بەچاڵ کردن لە ناوچەکەدا .

١٩١٥/١/٧ بەرز کردنەوەی ڕاپۆرتی بەرپرسی سەهیۆنیزم وایزمان بۆ لێژنەی جێبەجێکردنی ڕێکخراوی سەهیۆنیزمی جیهانی ، لەبارەی کارە جۆراوجۆرەکان .

که لەگەڵ هربرت سمۆئیل وبەیاوەری حاخام گاستر ئەنجامی دابوو ، له پیناو بەدەست هێنانی ئاواتە هەمەلایەنەکانی جوولانەوەی سەهیۆنیزم لە جیهاندا ، ئەویش بە دامەزراندنی دەوڵەتی جوولەکە لە شامدا .

١٩١٥/١/١٣ هێزەکانی سووپای عوسمانی پەلاماری ئێرانی دا ، لە ڕێگەی ڕۆژهەلاتی کوردستان و ، دوواتر شاری تەورێزی داگیر کرد ، کە بە ئارەزوی خۆی مامەلەی لەگەڵ گەلانی ئێران و بەتایبەتی کورد دەکرد لە سەر خاکی کوردستان .

١٩١٥/١/١٥ دامەزراندنی چاپخانەی کوردستان ، لەشارۆچکەی رواندز ی سەر بە پارێزگای هەولێر ، لەلایەن نووسەرو رووناکبیرو کەسایەتی ناوداری نەتەوەیی کورد – حوزنی موکریانی – لە باشووری کوردستان ، کە ڕۆڵێکی گرنگی هەبوو لەسەر بەچاپگەیاندنی ڕۆژنامەو گۆڤارو نامیلکەدا .

دوای ئەوە چاپخانەکەی گواستراوە بۆ شاری هەولێرو لە چاپکردن بەردەوام بوو تاکوو تەواو بوونی ئەو مێژوونامەیە لە شارەکەدا .

١٩١٥/٢/١٦ هێزەکانی سووپای قەیسەری ڕووسیا لە هێرشێکی تووندو دژوواردا پارێزگای ئەرزەڕۆمی کوردی لە باکووری کوردستانی ژێر دەسەلاتی

ئیمپراتۆریەتی عوسمانی تورك داگیر کردلە هەرێمەکەدا .

١٩١٥/٣/٤ وەزیــــری دەرەوەی ڕووســــیای قەیــــسەری – ســـــازانۆف – یاداشـــتێکی ئارەزومەندانـــەی ئاراســـتەی بـــالوێزی بـــەریتانیا و فەرەنـسا لەپترسـبۆرگی پایتـەختی ڕووسیای ئەوکات کرد .

که له یاداشتەکەی داوای کرد ، کە شـــاری ئەســـتانەی کـــەنارەکانی بۆســـفۆر لـــە ڕۆژ ئـــاوای دەریـــای مەرمـــەرەو گـــەرووی – تەنگەبـــەر – دردەنیل دا. کە خۆی بەسەر هێلی ئینوز– میدیەی کەنارەکانی ئاسیای بچوك دا دەڕوانی لە ناوچەکەدا. کە دەکەوێتە بسفۆر تاکوو زێی سقاریە . لەگەڵ مەلبەنـدەکانی لەســـەر کەنـداوی ئـەزمیرو دوورگـەی مەرمـەرە بۆخۆیـان بگەڕێتەوە ، هەتا گەر خاوەنداریەتیشی هی فەرەنساو بەریتانیا بێت .

شایانی باسە زۆربەی ئەو ناوچەی کە لەیاداشتەکەیدا باسی کردبوو خاکی کوردستانی دەگرتە خۆ لە کێشووەرەکەدا .

١٩١٥/٣/٥ ڕۆژنامەی باکۆ لە بابەتێکی هەواڵیدا بلاوی کردەوە ، کە لەوکاتـەی هێزەکانی سووپای ڕووسیا قەیسەری ناوچەی دیلمانیان گرتە دەست کە زیاتر لە ٢٠ گوندی مەسیحی وێرانکرابوو ، لەگەڵ بلاوبوونەوەی لاشەی کوژراواندا .

کە ئـەم کارەش لـە لایـەن سـەرکردەی سووپای عوسمـانی تـورك جـودت پاشا ئەنجامـدرابوو ، ئەمـە جگـە لـە گونـدی کـوردو تێکـەلاوی دانیـشتووانی ئـەو گوندانـە لـەباکووری کوردســتان ، کـە لـە کـوردو ئەرمـەن و ئاشـووری پێـك هاتبوون لە هەرێمەکەدا .

١٩١٥/٣/١٤ دەسـت پێکردنـی لـە نـاو بردنـی کـورد لـە لایـەن ئەرمەنـەکان بەپـشتیووانی هێزەکانی سووپای ڕووسیا ، لەناوچەکانی سـەری قامیش و بایەزید و وان و بەرەو خوویی و ئورمیەو ڕواندوزو خانەقین لە باکوورو ڕۆژهـەلات و باشووری

کوردستاندا .

کە هێزەکانی سووپای ڕووسیا داوای چۆڵکردنی ناوچەکانی بایەزیدو جێگاکانی دیکەی کردو لە هەمان کات هەڵسا بەوێران کردنی بە سەدان گوندو کووشتنی ئافرەتو منداڵ بە دەستی چەکدارە ئەرمەنو ڕووسەکان .

لە دوای شۆڕشی بەلشەفی لە ساڵی ۱۹۱۷ دا ، کە بەگەورەترین قەسابخانە دادەنرێت لەلایەن ئەرمەنەکان ، لەپێناو خزمەتکردنی ڕووسەکانو ڕووسەکانیش بەڵێنیان دا ، کە شاری وان ببێتە پایتەختی دەوڵەتی ئەرمەنی ، کە لە داهاتوو ئاواتیان بوو لەسەر خاکی کوردستان .

۱۹۱۵/٤/٦ ئەنجوومەنی هەڵبژێردراو لە کۆنگرەی نێوودەوڵەتی مەسیحیەکانی جیهان ، کە بریارێکی پیرۆزی ڕاگەیاند بەکۆتایی هاتنی هەموو کێشە هەڵوواسراوەکانی نێوان مەزهەبەکانی ئاینی مەسیحیەکانو بیروو بۆچوونە جیاوازەکان لەئەورویا دا .

سەرەرای مانەوەی چەندین کێشەی هەڵوواسراو ، بەتایبەتی لەلایەن یوحەنای بیستو سێیەم و گریگۆری‌وبندکنت بە دەست کێشانەوەی لەپۆستی دەسەلاتی پاپا .

ئەویش بەهۆی سەرهەڵدانی دووبەرەکی بوو لە نێوان کەنیسەکانی یۆنانو رۆماو فەرەنساو ئیتالیا ، ئەویش بەهەلبژاردنی نکۆلای پێنجەم ، بەپاپای مەسیحی لەسەر هەموو جیهاندا .

۱۹۱۵/٤/۱٤ هێزەکانی سووپای بەریتانیا دژە هیرشی گەوورەیان کردە سەر چەکدارانی کوردو عەرەب لە ناوچەی شووعەیبە لە باشووری ئێستای ئێراق ، کە لە ئەنجام هێزە چەکدارەکانی کوردو عەرەب شکانو بەناچاری کشانەوە ، کە کەووتبوونە ڕۆژئاوای شووعەیبەو لە شەڕدا زیانی هێزی سووپای بەریتانیا ۱۲۵۷هەزار سەرباز بوو لە کوژراو زامدار لە ناوچەکەدا .

هەروا زیانی کوردو عەرەب زیاتر بوو، بەڵام ژمارەکەی بەتەواوی نەتوانرایە دیاری بکرێت لە ناوچەی شەڕەکەدا .

ئەمەش لە پێناو داگیر کردنی وولاتی نێوان دووزێ چ لەلایەن بەریتانیاو چ لەلایەن ڕەوکەرە عەرەبەکانی سعوودی بۆ ئێراقی ئێستا ، بەساکاریو ئاسانکاری کردنی کورد بە هەردوو لایەن ، لە پێناو داگیر کردنی خاکی

کوردستان ....؟ ...!.

١٩١٥/٤/٢٠ زیاتر لـه ٢,٥٠٠ هـەزار چـەکداری ئەرمـەن دەسـتیان بەسـەر شـاری وان لـە باکووری کوردستان داگرت ، ئەویش بە دامەزراندنی حکوومـەتێکی کاتی و لـە هـەمان کـات ئـەو ئەرمەنیانـەی کـە هـەڵاتوو بـوون لـە ڕیزەکـانی سـووپای عوسمـانی تـورك ، هێزێکی چەکداری یاخی بوونیان پێکهێنا و دەستیانکرد بەکاری نالەبار بەرامبەر بەدانیشتووانی دیاربەکرو سیواس و مەرعەش و قەرە حەسار لە باکووری کوردستان.
هەروا دەستیان کرد بە هێرش کردنە سەر هێزەکانی سووپای عوسمانی لە دواوە ، لەکاتی جەنگدا لەگەڵ هێزەکانی سووپای ڕووسیای قەیسەریدا .
کـە ئەمـەش بـووە هـۆی ئـەوەی کـە سـووپای عوسمـانی بکەوتـە نێـوان دوو ئـاگری دژ بـە تورکیـا لـە دواوە ، یەکـەمیان :- ڕووبـەڕوو بونـەوەیان لەگـەڵ ڕووســەکان لەپێـشەوەو دووەم :- لێـدانیان لـە دواوە لەلایـەن چـەکدارە ئەرمەنەکان.
ئەمـەش بـووە هۆکـاری کاردانـەوەی نالـەبار لەسـەر رامیاریـەتی دەسـەڵاتی عوسمـانی بەتایبـەتی وەزیـری نـاوخۆ تەلعـەت پاشـاو بیرکردنـەوەیان بـە لـە ناوبردنی ئەرمەن و ڕزگاربوون لە دەستیان لە هەرێمەکەدا .

١٩١٥/٤/٢٤ هێزەکـانی سـووپای عوسمـانی بـە ئامۆژگـاری سـەرکردایەتی دەسەڵاتی عوسمانی ، لـە هێرشـێکی بـەرفراوان بـۆ سـەر بـاکووری کوردسـتانی داگیرکـراوی ژێـر دەسـەڵاتی ئیمپراتۆریـەتی

عوسمانی ، کە زیاتر لە ١,٥٠٠,٠٠٠ ملیۆن و نیوێك لە ئەرمەنی لەناو برد ، بـە بـەکارهێنانی ڕامیاریـەتی جینۆسـایدی نـژادیو کووشـتنی زیـاتر لـە ٣٠,٠٠٠ سـی هـەزار کوردو دەربـەدەر کردنـی بەسـەدا هـەزار خێزانـی کـوردو ئەرمەن بەرەو هەندەران

بەتایبـەتی بـۆ ڕووسـیاو شـامو لوبنـان ، کـە ئێـستاش هـەر بـەئاوارە دەژمێـردرێنو ناسـنامەیان پێنـەدراوە ، بە تایبـەتی لـە سـووریا ، کـە سـەر هەمان ڕامیاریەتی بەردەوامە لە ڕەش کردنەوەی نژادیو داگیر کردنی ڕژێمی بەعسی لە ئێراق گرتۆتە بەر لە هەموو بوارەکاندا .

١٩١٥/٤/٢٦ مۆرکردنی پەیمانی لەندەنی پایتـەختی بەریتانیا لـە نیوان سووێند خۆرانو ئیتالیا ، بەمەبەسـتی ڕاکێشانی ئیتالیا بۆ لایـەن خۆیـانو هاوکاری کردنـی تـورك لـە پێنـاو لێـدانی بزووتنـەوەی ڕزگـاریخوازی کـورد لـە کوردسـتانو داگیرکردنی بەتایبەتی لە باکووری کوردستان.

١٩١٥/٥/٢ ئەنجامـدانی یەکـەم قەسـابخانەی ئەرمەنـەکان لەلایـەن هێزەکـانی سـوپای عوسمـانی لـە دوای قەسـابخانەکەی ٤/٢٤ لـە بـاکووری کوردسـتان لـە شـاری ورمێی ڕۆژهەڵاتی کوردستان .

لـه دوای داگیركردنـی شـارەكە ، ئـەو هێرشـەو كـرداره بـەردەوام بـوو تـاكوو ٥/٢٤ ی هەمان ساڵ ، ئەمەش بە هاوكاری و لایـەنگیری كردنـی رژێمـی فـارس بـوو لـه ئێـران بەرامبـەر مەسـیحیەكانی ئەرمـەنی ، كـە زیـاتر لـە ١٠٠٠ هـەزار هاوولاتی لەژن و منداڵ و پیاوی كوشت لە پارێزگاكەدا .

١٩١٥/٥/١١ هێزەكـانی سـووپای ڕووسـیای قەیـسەری ناوچـەی ورمـێ و دەووروبـەری لەرۆژهەلاتی كوردستان داگیر كرد ، بەهۆی شەڕی نێوان كوردو تورك ئـەویش بـە گـەمارۆدانی هێـزە چـەكدارەكانی كـورد لـە ڕۆژهـەلاتی كوردسـتانی ژێـر دەسەلاتی ئێرانی فارس لە پارێزگاكەدا .

١٩١٥/٥/١٥ سـكرتێری بەشـی ڕامیـاری بـۆ رۆژهـەلاتی ناوەراسـت لـە وەزارەتـی دەرەوەی بەریتانیا بیرخەرەوەیەكی خستەڕوو دژ بەداگیركردنی شـاری موسـل ، بەهۆی دورست بوونی كێشەو گیروگرفت لەناوچەكەدا لەگەڵ كوردەكان ، كە ئەو كاتە لە ٨٥٪ دانیشتووانی پارێزگای موسل كوردبوونە لە ناوچەكەدا .

١٩١٥/٥/١٤ ڕوودانی گەورەترین قەسابخانە بە سەر كورد لە پارێزگای وان لـە باكووری كوردسـتان لەلایـەن هێزەكـانی ئەرمـەن، كـە خزمـەتی هێزەكـانی سـووپای ڕووسـیایان دەكـرد، وەك پێـشەنگ كـە ڕووسـیا بـەڵێنی بـە ئەرمـەن دابـوو دەووڵەتی ئەرمەنیان بۆ دابمەزرێنێت و پارێزگای وان لە باكووری كوردستان بكاتە پایتەختی دەووڵەتەكەیان.

بەو بۆنەش زیاتر لە ٢٥٠ هەزار ئەرمەن روویان لەناوچەكە كردبوو بۆ چوونە ڕیـزی ئـەو دەووڵەتـە نوێیـە لـە شـێوازی دەووڵـەتی ئیـسرائیل... هـەروا ڕاگەیانـدنی دەووڵـەتی ئەرمـەنی و پلانـی داگیركردنـی وویلایـەتی بـەدلیس و دیاربەكر – ئامەد – ئامادەكرابوو بۆ ڕەشكردنەوەی نژادی كـورد لـە باكووری كوردسـتان و ئـەو شارانەشـی بـە پـشتیووانی هێزەكـانی سـووپای ڕووسـیا، بـەڵام هێزەكـانی سـووپای ڕووسـیا تێكـشكێنران لەلایـەن هێزەكـانی سـووپای عوسمانی بەهاوكاری شۆرشگێرانی كورد لە هەرێمەكەدا.

هـەروا ڕاپۆرتـەكانی بـەریتانیا دووپـاتی ئـەوە دەكەنـەوە كـە ڕوودانـی قەسـابخانەیەكی دیكـە لەلایـەن هێزەكـانی ڕووسیاو ئەرمەنـەكان لـە شـاری

خانەقین و دەوورووبەری زیاتر لە ٥٠٠ هاولاتی کوردیان شەهید کرد.
کە ئەمەش بووە هۆکاری ئەوەی کە دانیشتووانی خانەقین و لادێکانی پەنا ببەنە بەر هێزەکانی سووپای بەریتانیا لەناوچەکەدا... هەروا شاری رواندز و گوندەکانی دەوورووبەری ئەوەیان بەچاوی خۆ دیت، هەر وەك بەسەر سبرینکا داهات لە ساڵی ١٩٩٧، لە بۆسنە لە دەست هێزەکانی نازیە سربەکان. کە – ئەندرانیك – ماندونەناسی ئەرمەن و تێنوو بەخووێنی کورد هەڵسا بەکۆکردنەوەی نزیکەی ٦٠٠٠ کەس لە منداڵ و ئافرەت و پیرو گەنجی کورد لە شارەکەو دەوورووبەری و فەرمانی کووشتنی بۆ دەرکردن، کە لە ٣٠٠٠ هەزار ماڵ تەنیا ٦٠ ماڵ مایەوەو ئەویدیکە بە دەستی ڕووس و ئەرمەن وێرانکران لە گەڵ وێرانکردنی ٣٠ گووند لە ناوچەی برادۆست لە باشووری کوردستان. کە ئەمەش بووە هۆی ئەوەی کە دانیشتووانەکانی بەرەو شاری مووسل رابکەن بەتایبەتی لەناوچەی بادینان.
هەروا زیاتر لە ٨٠٪ لەدانیشتووانی پارێزگای سلێمانی لە باشووری کوردستان تووشی کارەساتی وێرانکردن و دەربەدەری و کووشتن و هەلاتن هاتن لەلایەن چەکدارانی ڕووسیاو ئەرمەن لەسەر خاکی کوردستان.
سەرچاوە :– عەزیز ئەلحاج. کێشەی کورد لە بیستەکان – بەیروت /١٩٨٤ ل ٩١.

١٩١٥/٥/١٥ گرێدانی کۆبوونەوەی ڕۆژهەلاتناسانی ڕووسیا ، کە لەو کۆبوونەوەیە مێژوونووس و جووگرافیناسی ڕووسی مینۆرسکی ووتارێکی لەبارەی جووگرافیای کوردستان بەگشتی خووێندەوە. بەرامبەر بە ئامادە بووانی کۆبوونەوەکە .

١٩١٥/٥/١٩ هێزەکانی سووپای ڕووسیای قەیسەری لە هێرشێکی بەرفراوانیدا بۆ سەر گوندو شارۆچکەو شارەکانی ڕۆژهەلاتی کوردستان ، کە لە ئەنجام ناوچەی شنۆیان داگیر کرد لە هەرێمەکەدا . ئەویش لە پێناو بە ئەنجامگەیاندنی

خواستەكانیان .

١٩١٥/٥/٢٣ مـۆركردنی ڕێكـەووتن لـە نێـوان فەیـسەل حوسـێن و سـەركردەی ڕێكخراوە عەرەبیەكانی نەتـەوەیی لــە ســووریا ، ئــەویش بــەناوی پرۆتۆكــۆلی دیمەشــق بــەناوی سەركردە عەرەبەكان ، كە بڕوایـان بە ڕاپەڕین هەیە لـەژێر دەسـەڵاتی عوسمانیـدا ، بەرامبـەر بەداننانی بـەریتانیا بـە دەووڵـەتی عـەرەبی سـەربەخۆ ، كـە ئێـراق و سووریاو لوبنان و فەلەستین و حیجاو نیمچە دوورگەی عەرەبی بگرێتەوە .

كە ئەو كاتە نە ئێراق و نە سووریاو نە لوبنان و نەفەلەستین دەووڵەت نەبوون . هـەر هـەمووی ژێـر دەسـتەی ڕژێمـەكانی عوسمـانی و بەریتانیا بوون . لـەو كاتیـشدا ڕێـژەی دانیـشتووانی عـەرەب لـەو هـەرێم و ناوچـانە ، وەك ئـەوەی دوای دامەزراندنی دەوڵەتەكان .

١٩١٥/٥/٢٥ هـەر لەگـەڵ بەردەوام بوونی هێزەكـانی سـووپای ڕووسیای قەیـسەری شـاری ورمێـی ڕۆژهـەڵاتی كوردستانیـشی داگیر كـرد، لـە پێنـاو جـێ بـە جێكردنـی ئامانجەكانیان لە هەرێمەكەدا .

١٩١٥/٥/٢٧ ئەنجوومـــەنی وەزیرانـــی دەســـەڵاتی عوسمـــانی تـــورك ڕەزامەنـــدی لەســـەر گوواسـتنەوەی ئەوكەسـانە كـرد ، كـە خیانـەت لەگـەڵ ڕژێمـی تـورك دەكـەن بەتایبـەتیش بیانووەكـە بـۆ كـوردو ئەرمـەن و ئاشـووری بـوو لـە باكووری كوردستان ، لەگەڵ ئەوەشدا پێش ئەو بڕیارە كارەكانی ئەنجامدا بوو بـەدەیا ڕێگـای گوونجـاوی دیكـەی بەرژەوانـدكاری دیـار كرابـوو ، لـە ناوچـەوە هەرێمەكەدا .

١٩١٥/٥/٢٨ هەر لەگەڵ بەردەوام بوونی هێرشەکانی سووپای ڕووسیای قەیسەری بۆ سەر ڕۆژهەڵاتی کوردستان ، لە دوای شاری شنۆو ورمێ شاری سابلاخ و مەهابادیش داگیر کرد لە هەرێمەکەدا .

١٩١٥/٦/١ یەکێك لەو نامانەی کە تاڕادەیەك بە درێژی باس دەگرێتە سەر باری ڕامیاری دوا ڕۆژی ئەرمینیاو کوردستان لە باکووری کوردستان بە بروسکەی ژمارە/٣٧٧ بووە ، کە لە باڵوێزی ڕووسیا لەپاریسەوە بۆ وەزیری دەرەوەی ڕووسیا – سازانۆف – نێردراوە . لەبرووسکە کە باس لە هاتنی نووێنەرانی ئەرمەنی بۆ پاریس دەکات ، وەکوو زافریف و نۆبار پاشا .
هەروا بەشێك لەناوەرۆکی نامەکە بەم جۆرەیە:– دکتۆر زافریف و نۆبار پاشا گەیشتنە پاریسی پایتەختی فەرەنسا... دیارە گەلێ کار بەدەستانی دەسەڵاتدار لە فەرەنسا لەسەر ئەو باوەڕەن کە پێویستە ئەرمینیای ئۆتۆنۆمی دابمەزرێت لەژێر باڵی ڕووسیاو فەرەنساو ئینگلستان.
هەروا لەو نامەیەی کە پێشکەشیان کردبوو ،. ئەم پێشنیارەشیان داناوە ، ئەویش ئەوەیە . کە پێویستە کوردستانی ئۆتۆنۆمی بە هەمان شێواز دابمەزرێت لەژێر چاودێری یەکێك لە و دەوڵەتانە یاخوود لە هەرسێ دەوڵەتە گەوورەکاندا.

١٩١٥/٦/٤ یاداشتێکی باڵوێزی ئەڵمانیا ، کە ئاراستەی سەرەك وەزیرانی دەسەڵاتی عوسمانی – سەعید حەلیم – پاشای کردبوو ، بە پشتگیری کردنی ئەڵمانیا . بۆ دەسەڵاتی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی بە دوورخستەوەی ئەرمەن لە ڕۆژهەڵاتی ئەنازۆڵ ، کە ئەمەی بەکارێکی بە ڕاست لە قەلەمدا ، لەپێناو بەرگری کردن لەدەووڵەتی عوسمانی لە ناوچەکەدا .

١٩١٥/٦/١١ لەکۆبوونەوەی ئەنجوومەنی وەزیرانی ڕژێمی عوسمانیدا ، باری ئەرمەن تاووتۆکرا ، بەبڵاوکردنەوەی ڕاگەیاندنێکی بەزەیی هاتنەوە بەئەرمەن بە ئاشکرا ، بەڵام بە نهێنی لەژێرەوە نەخشەی لەناووبردنی ئەرمەنەکان و دروستکردنی بارو بە گوونجاندنی بارودۆخێك بۆ لەناوبردنیان. لە باکووری کوردستان.

١٩١٥/٦/١٢ ئیسماعیل ئاغا لە ناوچەی ئەرتوو لە باکووری کوردستان بەرەو تیاری باڵا هەڵکشا ، کە لەو کاتە کوردەکان لەکوردستان باشترین هێزی چەکداریان

هەبوو ، لەگەڵ ئەوەشدا مـەلیکی ئاشووری شـەڕی بەسـەرکوردەکاندا سـەپاند لەماوەیەکی درێژی دەسەلاتەکەیدا ، بەڵام بەهۆی هێرشی هێزەکانی سووپای عوسمانی لە ناوچەکە بۆ سەر ئەرمەنەکان کشانەوە دواوە لە ناوچەکەدا .

١٩١٥/٦/١٤ بـاوەڕپێکراوی پرۆتۆکـۆلی دیمەشـق شـەریف حـسین نامەیـەکی ئاراستەی مەندووبی سامی بەریتانیا – مکماهۆن – لە شاری قاهیرەی پایتەختی میسر کردو پێشنیارەکەی ئەوە بوو ، کە لە سەر بەریتانیا پێوویستە دان بنێ بە عەرەب ، بەپێی پرۆتۆکۆلی دیمەشق بە بەرپاکردنی ڕاپـەڕین دژی دەسـەلاتی عوسمانی بەرامبەر بەیارمەتی سەربازیو ئابووریدا ، لە هـەمان کات داننان بەدامەزراندنی دەوڵـەتی عـەرەبی سـەربەخۆ، لـەو کاتەشدا مەندووبی سامی بەریتانیا پشتگیری داواکەی کرد بەوەلامدانەوەی لە ڕۆژی ٨/٣٠ ی هـەمان ساڵ .

کـە ئەنجامەکـەی عـەرەب بـەئامانجی ٧٥٪ی خۆیـان گەیـشتن لەسـەر خـاکی گەلانی ڕۆژهەلاتی ناوەڕاست ، بەتایبـەتی لەسـەر خـاکی باشوورو ڕۆژ ئاوای کوردستانی کورد لە کوردستاندا .

١٩١٥/٦/٢٨ نووێنـەری کەسـایەتیە مەسـیحیەکان لــە بـاکووری کوردسـتان مـارشمعون سـەردانی ڕووسـیای قەیـسەری کـرد ، لـەپێناو پـشتگیری لێکردنـی بـە هـۆی بەرپابوونی شەڕ لە نێوان تورکو نەتەوەکانی دانیشتووی ڕەسەنی باکووری کوردستان.

کە لە کوردو ئەرمەن پێکهاتبوون لەگەڵ هێزەکانی سووپای عوسمـانی، بـەڵام بـێ سـوود بـوو ، دوای ئـەوە بـەرەو شـاری ورمـێ کەوتـەرێ بـۆ وەرگرتنـی یارمـەتی لـە لایـەن بەرپرسـانی ڕووسـی ، بـەڵام یارمـەتی ڕووسـەکان بـێ هێـز بوون.

١٩١٥/٦/٢٨ هێزەکانی سووپای عوسمانی بەهاوکاری جاشـە خـۆ فرۆشـەکانی کوردەکـانی بـۆ تـورک لـە شـاری موسـل ، هێرشـیان بـەرەو بـەرواری خـواروو لە باشـووری کوردسـتان ، کـرد کـە چـەکداری تـەواوی هـەبوو بەچـەکی ئۆتۆمـاتیکیو نارنجۆکو تۆپی چیایی ، بەسەرکردایەتی پارێزگاری موسل – حەیـدەر بـەگ – و قائمقـامی جۆلـە مێـرگ بـە هاوکـاری دانیـشتووانی ناوچـەی ئـەتروش لەهەرێمی باشووری کوردستان.

هەروا هێرشی دوەمیان بۆ سەر بەرواری بالا کردە سەر ئاشووریەکان. بەڵام ئاشووریەکان توانیان بەرگری لەخۆیان بکەن بەو چەکەی کە مارشەمعون لە ڕووسیای قەیسەری وەرگرتبوو، بەڵام دوای ئەوە چەکەکانیان دا بەدەست هێزەکانی سووپای عوسمانی لە ناوچەکەدا .

١٩١٥/٧/١٠ هێزەکانی سووپای عوسمانی تورك بەرەو پارێزگای مۆش لە باکووری کوردستان بە ڕێکەووتن و ناوچە ئەرمەنیەکانی بە مووشەك بۆردومان کرد بەشێووەیەکی بێ وێنەو لە ماوەیەکی دیاریکراو زیاتر لە بەهەزاران لە کوردو ئەرمەنی لەناو بردو بەدەیا هەزار خێزان لە کوردو ئەرمەن دەربەدەر بوون بۆ وولاتانی دیکەی سەر سنووری کوردستان بەتایبەتی باکووری کوردستان.

١٩١٥/٨/١٠ سەرکردەی مەسیحیەکان بەتایبەتی ئەرمەنەکان مارشەمعون نامەیەکی لەپارێزگاری موسل – حەیدەر بەگ – بەدەست گەیشت و داوای لێکرد کە واز لە شەڕ بێنێ و چەکەکان بداتەوە دەست هێزەکانی سووپای عوسمانی، گەرنا هرمزی برات لەبەردەستمانەو دەیکووژین ، بەڵام مارشەمعون لەوەڵامداو ووتی:– گەلەکەم براو بنەماڵەمن و هرمز برامەو یەك کەسەو ئێمە بەردەوام دەبین لە ڕاپەڕینەکەماندا .

١٩١٥/٨/١٠ نووێنەری مەسیحیەکان و شاندێکی یاوەری لە ڕێگەی باشقەلا بەرێکەووتن ، لەپێناوچاوپێکەتنیان بە چرنۆزوبۆف لەشاری سەلماس لەرۆژهەڵاتی کوردستان ، لەپێناو وەرگرتنی یارمەتی لە ڕووسەکان، بەڵام هەولەکانیان بێ سوود بوو ، بەهۆی هاوپەیمانیەتی نهێنی لە نێوان ڕووس و تورك ، لە ئەشکەنجەدانی کوردو ئەرمەن و پاراستنی بەرژەوەندی تایبەتیان ، لەسەرخاکی کوردستان بەتایبەتی لە باکووری کوردستان.

١٩١٥/٨/٢٠ شانشینی ئیتالیا جەنگی دژ بە ئیمپراتۆریەتی عوسمانی ڕاگەیاند بە هۆی لێك ترازانی باری ڕامیاریەتی نێوودەوڵەتی ، بەتایبەتی لەناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی عوسمانی لەهەرێمە جیاجیاکاندا .

١٩١٥/٩/١٥ سەرکردەی هێزەکانی سووپای ڕووسیای قەیسەری ژەنەرال جیرنۆزۆبۆف لەئێران سەردانی بەتریارك مارشەمعونی کردو داوای مانەوەی لە پاشقەلا لێکرد ، لە هەمان کات ماوەی پێ نەدا بە پەڕینەوەیان بۆ ئێران .

که وەك وەرەقەیەکی بەرگری کردن بوو بۆ ڕووسەکان و دووبارە ئەرمەنەکان تووشی بارێکی ناڕێك بوون لەسەر سنووری نێوان ئێران و تورك ، کە لەسەر خاکی کوردستانە لە کیشووەرەکەدا .

١٩١٥/١٠/٢٤ حکوومەتی بەریتانیا لە نامەیەکیدا بۆ شەریف حوسێن ئەمیری شاری مەککەی سعوودیە ، بە مەبەستی چاکەدانەوەی ئەمیرو بەپێشکەش کردنی هەردوو دوو وویلایەتەکەی بەغداو بەسرە لە دژی تورکەکان.

١٩١٥/١٠/٢٤ نامەی دووەمی مەندووبی سامی بەریتانیا – مکماهۆن– لە میسر بۆ شەریف حوسێن بە ڕەزامەندی کردنی لەسەر داواکانی، بەڵام ئەوە بخرێتە ژێر ڕێکەوتنەکە ، کە شاری بەیروت و حەلەب و دوایی وویلایەتی بەسەرەو بەغدا ، کە ئەمانە دەکەوونە ژێر دەسەڵاتی بەریتانیا .
بەڵام دامەزراندنی دەوڵەتی عەرەبی سەربەخۆ لە کیشووەری ئاسیا بۆ عەرەب مسۆگەرە ، بەمەرجێ لایەنگیری تەواوی بەریتانیا بکەن و دژ بە دەسەڵاتی عوسمانی بن ، لەهەموو بوارە جیاجیاکاندا ، بەتایبەتی لە لایەنی سەربازیدا.

١٩١٥/١٠/٣٠ هێزەکانی سووپای ڕووسیای قەیسەری ئامانجێکی گەورەیان بەدی هێنا ، کە بەشێك لە هێزەکانی ژەنەرال باراتۆف لە بەندەری ئینزیل لەسەر دەریای قەزوین دابەزی و بەرەو باشوور کەووتە هێرش بردن و بڵاوەی بەهێزەکانی تورك و کورد کرد ، دوای ئەوە بەرەو شاری هەمەدانی ڕۆژهەڵاتی کوردستان کشانەوە ، لەگەڵ ئەوەشدا سزایەکی باشی ئەو خێلە کوردانەی ناوچەکەی دا بەهۆی دژایەتی کردنیان.

١٩١٥/١١/٢ بە هۆی پەلاماردانە درندانەو نامرۆڤایەتیەکەی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی دژ بە ئەرمەن و هەڵگری بڕوای ئایینی مەسیحی و کورد

.لە باکووری کوردستان لە ١٩١٥/٤/٢٤ کە بووە هۆی گیان لە دەستدانی ١,٥٠٠,٠٠٠ ملیۆن ئەرمەنی و ٣٠,٠٠٠ هەزار کوردو دەربەدەربوونیان بەرەو وولاتانی دراوسێیّ و ناوچەکان، لەوانەش روویان لە شاری شەنگال و ناوچەکەی کرد.

جێگەی روونکردنەوەیە کە شەنگالْ لە سالْی ٩٤٨ ی زایینی یەکەیەکی کارگێری بووەو سەر بە وویلایەتی جەزیرە.

بەر لەوەش شەنگالْ و ناوچەکەی پێناسەی بە نیشتیمانی ئێزیدیەکان ناوزەند بوو، چەندین رەهبانیان هەبووە بۆ خودا پەرستنیان لەشاخەکانی شەنگالْ و ئەشکەووتەکان، لە هەمان کات پەیوەندی ئێزیدیەکان لەگەلْ دانیشتووانەکان باشبووەو چەندین مەزاری پیرۆزیشیان هەیە لەناوچەکەدا.

لێرەدا دەگەرێینەوە بۆ دوای سالْی ٩٤٨، دوای ئەوە شەنگالْ چووەتە ژێر دەستی – حەمدانیەکان – پاش ئەویش چۆتە ژێر دەستی سەلجووقیەکان و هەروا کەووتۆتە ژێردەسەلاّتی تورکمانەکان، لە سەردەمی دەسەلاّتی خەلیفەی عەباسی و داگیریان کردووە، دوای ئەوانیش لە سالْی ١١٢٧ لەلایەن دەسەلاّتی ئەتابەکیەکان لە مووسل شەنگالْ و ناوچەکەیان داگیرکردووە , لەباشووری کوردستان.

١٩١٥/١١/٢٣ دەست پێکردنی گفتووگۆی پەیمانی – سایکس – بیکۆ، لە نێوان فەرەنسا و بەریتانیا، کە لەلایەن فەرەنسا کوونسلی گشتی پێشووی لە بەیروت پایتەختی لوبنان – فرانسوا جۆرج بیکۆو – لەلایەن بەریتانیا جێگری وەزیری دەرەوەی – ئاسەر نیکلش – دوای ئەوەش شارەزایەکی لە کاروباری رۆژهەلاتی ناوەراستدا – سیرماك سایکس – دانرا...

هــەردوو لــە کــەش و هــەوایــەکی زۆر کــەپ و نهێنیـدا کەووتنـە بگـرەو بـەردەی دابەشکردنی ئەو شووێنانەی کە مەبەستیان بوو، لە تێروانینی ئەو ڕۆژەیان وەك بنەمایەك بۆ هەڵسووکەوت و ئەگەرەکانی ئایندەیان.

دوای یەك مانگ , لەو کۆبوونەوە، کە چۆنی شام و لوبنان و فەلەستین لە پاڵ وویلایەتی مووسڵ و بەندەری ئەسکەندەرۆنەو کیلیکا بەشبکەن , هـەر لایـەو دەیویـــست بـــەباری بەرژەوەنـــدی خۆیـــدا چـــەمکی بەرەکـــە ڕاکێـــشیٚ و زۆرترینبەشی بەرکەویٚ.

ئەویش بە ئامادەکردنی ڕاپۆرتێکی بنەرەتی لە ماددەو برگـەو خـاڵی تـەواو لـە پێناو مۆرکردنی لە پەیمانێکی بنـەرەتی، لـە نێـوان وولاّتـانی تـەوەری شـەڕ لـە دوای هەرەس پێهێنانی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی، لـە هـەموو بوارەکـان کـە لـە ئاداری /١٩١٦ بە پەیمانی سایکس – بیکۆ ناوزەند کراو مۆرکرا.

١٩١٥/١١/١٨ هێزەکـانی سـووپای عوسمـانی تـورك بەسـەرکردایەتی ئـەنوەر پاشـا لەگـەڵ

ژەنـەراڵێکی ئـەلمانی سـەرکردایەتی هاوبەشـیان کـرد بـۆ سـەرهێزەکانی سووپای ڕووسیا ، بەڵام لەئەنجام سەرەو نگوم کران و فرێ درانە ئەو دیووی سنوورەوە ، کە زیاتر لە ٩٠ هەزار سەرباز بەشداریکرد و ٧٠ هەزار چەکداری تورك لەناو چوون، بەڵام ڕووسیا ٢٠هەزار چەکداری لێکوژرا لەو شەرە لە ناوچەکەدا .

١٩١٥/١١/٢١ وەزیـری دەرەوەی بـەریتانیا – ئـەدورد گـیری– داوای لـە وەزارەتـی دەرەوەی فەرەنسا کرد ، بۆ ناردنی شاندێك بۆ لەندەنی پایتەختی بەریتانیا ، ئەویش لە پێناو تاووتۆ کردنی داهاتووی دامەزراندنی دەوڵەتی سووریا .

شایانی باسە کە ئێستا دەوڵەتی سووریا زیاتر لە ١٧ هەزار کیلۆمەترچوار گۆشە لەخاکی ڕۆژئاوای کوردستان و زیاتر لە٢,٥٠٠,٠٠٠ ملیۆن کوردی پـێ لکێنـراوە . بـە پێـی پـەیمانی لـۆزان لـە ١٩٢٣/٧/٢٤ ی وولاتـانی هاوپەیماندا .

١٩١٥/١١/٢٢ پـێش ئـەوەی – سایدبواسـم– یاداشـتەکەی ئاراسـتەی وەزارەتـی دەرەوەی بـەریتانیا بکـات ، بابـەتێکی دیکـەی نووسـیبوو . ئـەویش بـەدیاریکردنی یاداشـتەکە ، کـە وویلایـەتی مارسـین و ئەسـکەندەرۆنەو چـەندین پارچـە لـە وولاتـی شـام ، کـە دەکەوویتـە لایـەنی ڕۆژئاوای وویلایـەتی دیمەشـق، شـام و حمـس و حـەماو حەلـەب ، کـە ئەمانـە نـاتوانرێ بلـێین خـاکی عـەرەبن لـە ناوچەکەدا .

لە گەڵ ئەوەشدا بەنداوی مارسین ، کە وویلایـەتی ئەدەنە– دیار بەکری – لەباکووری کوردستان پێووە لکاوەو بەنداوی ئەسکەندەرۆنەش لە وویلایـەتی حەلـەب ... کـە شـارەکانی دیمەشـق و حمس و حـەماو ویولایـەتی سـووریای شام، کە پایتەختەکەی شاری دیمەشق بێت لە ناوچەکەدا .

١٩١٥/١٢/١٢ پیلانی دەوڵەتە سوویند خۆرەکان بۆڕێکەووتن بە نهێنی لەگەڵ کاربەدەستی ناسراوی عوسمانی – جەمال پاشا– یان دانابوو بۆ وەرگێڕانی دەسەلاتی حکوومەتی تورك و بە هاتنی ئەو بۆسەر حوکمرانیەکەدا .

ئەویش بەپێی ڕێکەووتنێکی تایبەت ، لەم نامەیە کە دیسان باس لە ئۆتۆنۆمی ئەرمینیاو کوردستان دەکرێتەوە ، بەڵام ئەمجارە لە ژێر باڵی عوسمانی دابێت ، ئەم بەڵگەنامەیە لەشێووەی بروسکەیەك بوو لەژێر ژمارە /٦٣٩١ لەم ڕۆژەدا ، کە لە وەزیری دەرەوەی ڕووسیاوە بۆباڵوێزی ڕووسیا لەپاریس ڕەوانە کراوبوو.

١٩١٥/١٢/٧ یەکەم قوتابخانەی کچان لە شاری سلێمانی لە باشووری کوردستان کرایەوە ، لەلایەن ئافرەتی ناوداری کورد خاتوو حەلیمە نەزهەت خانم لەناو خانووەکانی دەسەلاتی عوسمانیدا .

## ١٩١٦

١٩١٦/٢/٣ داگیر کردنی پارێزگای ئەرزەرۆم لە باکووری کوردستان لەلایەن هێزەکانی سووپای ڕووسیای قەیسەری ، کە ئەم پایزگایە جێگەیەکی ستراتیژی و رامیاری و ئابووری گەورەو گرنگی هەبووە لە وویلایەتی ئەنادۆڵی ڕۆژهەلاتی ژێر دەسەلاتی عوسمانیدا ، کە دەسەلاتی عوسمانی تورکیای خستە بارو دۆخێکی ناهەموارو نالەبار لە ناوچەکەدا .

١٩١٦/٢/١٧ دوای ئەوەی کە هێزەکانی سووپای ڕووسیا سەرکەووتنی باشیان بەدەست هێنا بەداگیرکردنی خاکی باکووری کوردستان. هێرشەکانی بەردەوام بوو بەرەو ئامانجە سەرەکیەکان رووەو شاری فارس و ئەرزەرۆم کە لە ماوەیەکی کەم توانی ئەم شارو دەورووبەرەکانی داگیربکات و هێزەکانی سووپای عوسمانی دەربکات، کە شاری ئەزەرۆم وەك هەرێمێکی گرنگ لە بوارەکانی جووگراف و کەش و هەواو گونجانی لەباری – ئیستراتیژی سەربازی کە لە ١/١١ تاکوو ١٩١٦/٢/١٧ هێزەکانی سووپای ڕووسیا سەرکەووتن بەدەست بێنێ و زیاتر لە ٦٠,٠٠٠ هەزار سەربازی تیا کووژرا.

دوای ئەوەش هێزەکانی سووپای ڕووسیا بەردەوام بوون لە هێرشەکانی تاکوو توانی – تەرابزون و ئەرزنجانیش بخاتە ژێر دەسەلاتی خۆی... کەچی هێزەکانی سووپای عوسمانی لەهەموو هەوڵەکانیان هەرەسیان هێنا.

لە هەمان كات هێزەكانی سووپای عوسمانی لەبەرەكانی شامیش بەرەو هەرەس هێنان و رووخان هەنگاویان دەنا، بە هۆی دروست بوونی بارودۆخێكی لەبار بۆ وولاتانی هاوپەیمان و تەوەری شەڕكەرو نا لەباری بارودۆخێكی نەگوونجاو بۆ دەسەلاتی عوسمانی لەبەركانی جەنگدا لەناوچەو هەرێمە جیاجیاكان.

سەرچاوە :- تاريخ توركيا المعاصر... دانانی كۆمەڵە توێژەنەرێكی سۆڤیەت.

١٩١٦/٣/٤ هاوپەیمانیەتی سێ لایەنەی نێوان رووسیاو فەرەنساو بەریتانیا گەیشتە مۆركردنی پەیمانی نهێنی نێوانیان لە شاری پترسبۆرگی پایتەختی رووسیای قەیسەری ، كە ماوەی سالێك لە گفتووگۆی بەردەوامی لەسەر دەكرا ، بۆ رزگار كردنی وولاتی عەرەبو پارێزگاری لێكردنی‌و ، دامەزراندنی حكوومەتی ئیسلامی سەبەخۆ، كە بەریتانیا چاودێری كارگێری بكاتو هەر رێكەووتنێكی لە دابەشكردنی وولاتی ژێردەسەلاتی عوسمانی ، بەتایبەتی كوردستان بۆ ناوچەی ژێردەستەی لایەنگیریان .

تێبینی :- بڕوانە نەخشەی سایكس- بیكۆ كە چۆن ناوچەكان دابەش كراون.

١٩١٦/٣/٢٥ لەدایك بوونی كەسایەتی ناسراوی كورد هۆزانەوان شێخ محمد ئەمین بیارەیی لە باشووری كوردستان كەناسراو بوو بەكاردۆخی.

١٩١٦/٣/٣١ بالوێزی فەرەنسا لە پترسبۆرگی پایتەختی رووسیای قەیسەری بیر خەرەوەیەكی ئاراستەی رووسەكان كردو تیایدا ڕایگەیاند ، كە فەرەنسا واز لە ناوچەكانی كوردستانی خواروو ، لە بەتلیس‌و وان لە باكووری كوردستان دەهێنێ .

بەلام دەست بەرداری ئەوناوچانە نابێت ، كە بە نێوان مۆش‌و بەدرێژایی زێی دیجلە بەرەو رۆژهەلات دەرِوات‌و لە ئاشیت داغەوە تا دوورگەی ئیبن عومەرو سنوورەكانی ئێران‌و بەرزاییەكانی مۆشدا، هەروا حكوومەتی فەرەنسا رازی نابێت لە جیاتی ئەوانە ناوچەكانی سیواس‌و خاربوت‌و كایسەری پێ بدرێت.

شایانی باسە كە ئەمانەی لەناو ڕاپۆرتەكەی بالوێزی فەرەنسا هاتووە هەموو باكوری كوردستانە.

١٩١٦/٤/٥ لە نامەیەكی - جۆرج بیكۆ - كە ئاراستەی وەزیری دەرەوەی رووسیا

سازانۆف دەکاتو دەڵێت:- سنووری کوردستانی ڕووسیا (!) پێویستە لە مۆشەوە دەست پێ بکات ، تاوەکوو دەگاتە عمادیەو نزیکی سنووری ئێران لەناوچەی مەرگەوەردا .

١٩١٦/٤/٢٦ دوا بیروو چوونی حکوومەتی فەرەنسا لە لایەن نوێنەری فەرەنسا – پالیولوگ – لە سەر ڕێکەووتنی لەگەڵ ڕووسیا لە بارەی دابەشکردنی کوردستان بەحکوومەتی ڕووسیا ئەگەیەنێت لە نامەکەی کە بۆ وەزیری دەرەوەی ڕووسیا دەنێرێتو دەنووسێت:-

١-ڕووسیا ناوچەی ئەرزەڕۆمو وانو بەتلیس لە باکووری کوردستان بەخۆیەوە ئەبەستێتەوە.

٢- هەرێمی کوردستان لەخوارووی وانو بەتلیسو لەنێوو مۆشو سەعرت تا دۆڵیزێی دیجلەو جەزیرەو لووتکە شاخەکانی سەرووی ئامێدیو ناوچەی مەرگەوەر ، ئەمانەش بە ڕووسیا ئەبەسترێتەوەو لەژێر دەسەڵاتیا دەبێ.

ئابەم جۆرە پەیمانی ، سایکس-بیکۆی ، بەناوبانگو ڕێکەووتنی سازانۆف- پالیوولۆگ ، نەك کوردستانیان لەبیر نەچووبووەوە بەڵکوو زۆربەی وەختو بێ بەزەییان تەرخان کرد بوو ، بۆ پچر پچر کردنی کوردستان بۆ ئەم هەموو بەشانەدا.

ئەم هەموو دەووڵەتە گەوورانە کەوتبوونە گیانی وولاتی کوردی بچووك لەکێشوەری ئاسیادا...!...!.

١٩١٦/٤/٢٨ لە ئەنجامی کێشەو ململانێی نێوان رامیاریەتیو هێزی سووپای داگیرکەرانی باشووری کوردستان ، لەو کات ببووە قەڵای هێزەکانی سووپای عوسمانیو کورد بەهۆی ئاکامی ڕووبەڕووبوونەوەی هێزەکانی سووپای بەریتانیا.

کە لەو کات ژەنرال – تۆمسن – سەرکردەی هێزەکانی سووپای بەریتانیای دەکرد ، لە کووتو عمارەو لە هەمان کات سەرکردایەتی فەیلەقی سووپای ڕووسیا بەسەرکردایەتی برانۆف بوو .

کە بەرەو ئێران دەچوو ، ئەویش لە پێناو لەناو بردنی بنکەکانی سووپای تورکو ئەلمان . بۆ ئەوەی پەیووەندی بەهێز بکاتەوە لەگەڵ سەرکردایەتی هێزەکانی سووپای بەریتانیادا .

١٩١٦/٤/٢٩ هێزەکانی سووپای بەریتانیا رازی نەبوون بەهاوکاری کردنی هێزەکانی سووپای ڕووسیا ، لەو کاتەش هێزەکانی سووپای ڕووسیای قەیسەری بۆیان

نەکرا ئامانجە ستراتیژیەکانی تەواوی گۆڕەپانی تورکیا لە کیشووەری ئاسیایدا بەدی بێنن .
هەر ئەوەش بوو ، کە ئەو هەلەی بۆ تورکیا ڕەخساند کە بە توونـدی پەلاماری هێزەکانی بەریتانیا لە ئێراق بدات و کووت و عیمارە داگیر بکات و دوای ئەوە خۆیاندا بەدەست هێزەکانی سووپای تورکیا لە ناوچەکەدا .

١٩١٦/٥/٩ مێژونووسی ڕووسی بڕوای وابوو بەهەموو توانا هەوڵ بدرێت کوردەکانی ڕۆژهەڵاتی کوردستانی ژێر دەسەڵاتی ڕژێمی شای ئێران بەلای ڕووسیادا وەر بگێڕن ودەڵێ:-
کورد وەك هێزێکی جەنگاوەری چالاك بۆ ئێمە پێویست نیە لە هەرێمەکەدا ... بەلکوو ئێمە تەنیا ئەوەمان لە کورد ئەوێ ، کە کورد بێ دەنگ و هێمن بن و دۆستانە لە گەلمانا بجوولێنەوە لە هەرێمەکەدا .

١٩١٦/٥/١٢ لە بەڵگەنامەیەکی دیکەدا ، کە لەلایەن کاربەدەستی بڕواپێکراوی بەریتانیا- سیرمارك سایکس- وە بۆبالۆیزی ئەنگلستان لەپترۆسبۆرگ ناردراووەو بەشێك لەم نامەیە بەم جۆرەیە کە:-
١- ڕووسیا ئەم ناوچانە وەردەگرێت ، ئەرزەڕۆم ، بەتلیس، وان، کەمێك لە ئەرمەن... لە بەر ئەوەی هەرێمی- ا - بەتەواوی کوردیە لە هەرێمەکەدا .
٢- فەرەنسا ناوچەکانی ئەرمەن و ئەو وولاتانە - کە کوردبن- وەردەگرێت لە پارێزگاکانی ، دیاربکر، میا فارقین، مۆش ، لە باکوری کوردستان . هەروا . بەم جۆرە ئەم ڕامیاریەتە لە بارەی کوردستان لەچەند ڕوویەکەوە بەرە بەرە بەرەو نارەوایی هەنگاوی دەناو سەربەخۆیی و ئۆتۆنۆمی پشتگوێ دەخرا ، بەپێی بەڵگەنامەکان لە سەر کوردستان لەپەیمانی سایکس ـ بیکۆدا.
هەر بە هۆی ناوەڕۆکی ئەم بەڵگەنامانە ، وەزیری دەرەوەی ڕووسیا سازانۆف پیلانێکی نهێنی لەسەر ڕۆشنایی پیلانەکانی مارك سایکس و جۆرج بیکۆ پێشکەش کردووە ، ئەویش لە ژێر ژمارەی -بەڵگەنامەی/٤٧- دا .
لە بارەی دابەش کردنی کوردستان و ڕۆژهەلاتی تورکیا - کوردستان . بە سەر سێ پارچە بەش دەکات ، بەشی ڕووسیا ، بەریتانیا و فەرەنسا ، کە سنووری لە نێوان ئەو سێ بەشە بەسەر لووتکە شاخەکانی خاکی کوردستاندا تێدەپەڕێت . ئەویش -چیاکانی زاگرۆس ، تۆرس- سازانۆف

دەڵیَ:- لەڕووی تۆپۆگرافیەوە، سنووری دانانی بەم جۆرەی کە لەم پیلانە دیاری کراوە لەگەڵ سرووشت ئەگوونجێت.

لە بەر ئەوەی سنوور شان بەشانی چیاکان دەڕوات ، بەڵام لە ڕووی ڕامیاری لەگەڵ کەم کەس دەگوونجیَ... سازانۆف سنووری بەشی ڕووسیا بە پێی پیلانەکە ئەگەیەنێتە شاری عمادیە لە باشووری کوردستان و جەزیرەو دیاربەکرو مۆش. لە باکووری کوردستاندا .

جێگەی روونکردنەوەیە کە کوردستان بۆ دوو بەش دابەش دەبێت ئەویش :- باکووری کوردستان و باشووری کوردستان ... نەك وەك دیاریکردنی پارچەکانی ، یاخوود بەشەکانی کوردستان بە پێی دابەشکردنی بە سەر وولاتانی داگیر کەر ، کە ئێران و تورکیایە و ، هەروا لکاندنی بە هەردوو دەوولەتی ئێراق وسووریا ، و پێك هێنانی ئەم وولاتانە لە سەر خاکی کوردستاندا .

کە ئەمەش بووە هۆکاری کاردانەوە لە دابەشکردنی کوردستان بۆ چوار بەش ، باکوور و ، باشوور و ، رۆژهەلات و ، رۆژئاوا... کە ئەمەش تاوانێکە بەرامبەر بە خاکی کوردستان ئەکرێت و لێك جیا کردنەوەی کوردستانە بۆ دوژمنان کە خوازیاریانن ، لە کێشووەرەکەدا . کە ئەمەش کارێکی ناڕەوایە ، کە بەرامبەر گەل و نیشتیمان دەکرێت لە هەرێم و ناوچەو کێشووەرەکەدا .

١٩١٦/٥/١٣ هێزەکانی سووپای ڕووسیای قەیسەری شارۆچکەی رواندزی لەباشووری کوردستان داگیر کردو دوای ٦٧ ڕۆژ لێی کشانەوە بە هۆی بەرپابوونی شۆڕشی برژوازی لەڕووسیادا

١٩١٦/٥/١٦ مۆرکردنی پەیمانی ، سایکس- بیکۆ ، بەنهێنی لە نێوان بەریتانیاو فەرەنسا لە قاهرەی پایەتەختی میسردا ، لە پێناو دابەشکردنی پاشماوەی دەوڵەتی عوسمانی لە دوای سەرکەووتنیان لە جەنگی یەکەمی جیهاندا .

دوای ماوەیەك ئەو پەیمانە لەلایەن ڕووسەکان ئاشکرا کرا ، ئەویش بەهۆی نەبوونی بەرژەووەندیان لەو پەیمانە، کە ئەو پیمانە چەندین ڕێکەووتنی نهێنی دیکەی لە خۆ گرتبوو ، بە تایبەتی لە بواری دابەشکردنی گەلی کوردو خاکی کوردستان و دورستکردنی بەدەیا دەووڵەت لەسەر خاکی گەلانی دیکە لە ناوچەکەدا .

جێگەی روونکردنەوەیە کە کۆشش کردن بۆ دەست بە سەرا گرتن و داگیر کردنی سامان و ناوچە بە بەهاکانی جیهان لە رووی ئابووریەوە ، هەروا دابەشکردنی بازارو بەرژەووەندی ئابووری ... لە فاکتەرە هەرە گرنگ و سەرەکیەکانی هەڵگیرسانی ئاگری جەنگی یەکەمی جیهان بوون ، بە تایبەتی لە کێشووەری ئاسیادا .

له گەرمەی شەڕکەدا ، هەوڵدان له پێناو دابەشکردنی وولاٌتی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی و دەست بە سەرا گرتنی هەرێم و ناوچە بە هادارەکان بوو لە لایەن هەر سێ دەووڵەتی تواناداری ئەوکات ، وەك بەریتانیا و ڕووسیای قەیسەری و فەرەنسادا.

هــەروا دوای ئــەوانیش ئیتاڵیــا ، بــووە تــەوەری هــەموو چــالاٌکیەکان و جمووجۆڵێکی دبلۆماسی و سەربازی ، . لە بەر ئەوەی ئەو هاووپەیمانە لایان ڕوون و ئاشکرا بوو کە عوسمانیەکان ، وەك دەووڵـەت دابەشکرێ ... بەلاٌم چۆن . ..؟.

لە بەر ئەوەی کار گەیشتە ئەو قۆناخەی کە ڕووسیای قەیسەری ، جگە لەوەی هەر هڵپەی دەست بە سەرا گرتنی تەنگە ئاویەکان بوو ، هاتە سەر ئەوەی کە مری لە شاری ئەستمبۆڵی پایتەختی عوسمانیدا خۆشکرد لە ناوچەکەدا .

لە راستیدا وەنەبێ هاوپەیمانان نامۆ بوو بن بەو جێگاو شووێنانەی کە هەر یەکیان چاوی تێبریبوو ، .

بۆ نموونە ، هەر یەك لە بەریتانیاو فەرەنسا ، بە دەیان گەریدەی لێهاتوویان ، لە پێناوی شارەزاو ئەفسەری پسپۆری نهێنیان ڕەوانەی ناوچەکانی بەری ئاسیای ژێـر دەســەلاٌتی ئیمپراتۆریــەتی عوسمــانی دەکــرد ، و زۆر بــاش ئاگــاداری و زانیاریــان هــەبوو لــە ســەر چــۆنیەتی ناوچــەکان ، لـە ڕووی

سرووشتی و ئابووری و دانشتووانەکانیدا .
هەر بۆ نموونە :- لە سەرەتای سەدەی بیستەم ، بە هۆی دۆزینەوەی چاوگە نەوتیەکان ، بە تایبەتی بایەخ و گرنگیدان بە ناوچەی نێوان دووزێ - میزۆبۆتامیا - بایەخ پێدانی ئینگلیزەکان بوو بە کوردستان پەرەی بەر چاوی سەند لە ناوچەکەدا .
لە بەر ئەوەی دەیانویست ، کە ئەو دوو شووێنە بکەنە بنکەیەکی گرنگ بۆ بلاوکردنەوەی دەسەلاتیان لە هەردوو رۆژهەلاتی نزیك و ناوەراست و بە پاراستنی بوونیان تیایدا .
هەروا لەم کاتەشدا ژمارەی ئینگلیزەکانی کە روویان لە کوردستان دەکرد و دەگەران لە زیاد بووندا بوون ، لەوەش زیاتر لێکۆلینەوەیان لە سەر ژیانی کورد و باری وولاتەکەیان لە هەموو بوارەکاندا هەلدەسەنگاند و یارمەنیان دەدان ، بە شێووەیەکی بەرچاو ، ئەوە بوو کە هەندێکیان فێری زمانی کوردی ببوون ، لە پێناو زیاتر زانیاری بەدەست هێنان لە سەر ناوچەکەدا .
بۆ نموونە :- گەشتە بەناوبانگەکەی - مێژەر سۆن - و نووسینەکانی نموونەیەکی زیندووی ئاشکران لەم رووەوە -٤-ل/٣٦.
هەروا لە نێوان سالەکانی ١٨٩٩- ١٩٠٦ دا . سێرم - سایکس ، گەشتێکی بە باکووری کوردستاندا ئەنجامداو لە ناوچەکانی موسل و فووراتی سەروودا کەوتە گەران ، لە ئەنجامدا دوو کتێبی دانا ، بە ناوی - گەشتێك بە پێنج وویلایەتی تورکیادا - لەندەن /١٩٠٠ - دوا میراتی خەلیفەکان - لەندەن / ١٩١٥ ، کە ئەمەی دوایی گەشتێکە لە ناوچەکانی سەرووی جەزیرەو موسل و کوردستان . ٢٦-ل/٣٦١ . واتە لە سەر خاکی کوردستاندا .
بۆیە دەلێن ، کە ئەوانە بەو شووێن و جێگایانە گەراون و هەر یەکیان چاوی تێبریبوو و نامۆ نەبوون ، فەرەنساو رووسیاش هەر یەکە بە پێی خواستی خۆیان زانیاریان کۆ کردبووەوە لە سەر ناوچەکەدا .
هەر بۆیە لە لاپەرەکانی مێژووی تۆمار کراو نموونە زۆرن ، لەوانە کە ئەمسەرو ئوسەری هەرێم و ناوچەکەیان کردبوو ، شارەزای دەشت و دۆل و شاخ و شیوو بوون ، لە هەمان کات شار بە شار و گوند بە گوند گەراون و شارەزایی و ناسینی باشیان هەبووە لە گەل هۆزو تیرەو دانیشتووانەکانیدا .

جگە لەوەش زۆر جار خۆیان وەستای ئەو بینایە بوون کە بنیاتیان نابوو ، یا لە دەست پیا هێنانیدا بە شدار بوون .
لە بەر ئەوە شارەزایی هەمە جۆرە لە ئینگلیز و ڕووس و فەرەنساو لە ناو سەربازگەو هێزەکاندا مەشقیان بە سەر بازە عوسمانیەکان دەکرد ، ئەندازیارانیان لە ڕێگاو بان و لە راکێشانی هێلی شەمەندەفەرو لە پشکنین بە دوای نەوت و کانزاکانیدا کاریان دەکرد ، بازرگان و پیاوانیان کرین و فرۆشتنیان لە هەموو لایەکدا هەبوو ، پسپۆرەکانیان هەمیشە بەشداری ناوبژیووانی دووژمنایەتی و پێکدادانی عوسمانیەکان و دراوسێکانیانی دەکرد ، لە هەرێم و ناوچەکەدا .
هەروا بۆ نموونە :– لە ساڵی ١٩١٣ دا کاتیٚ کە شێخ مەحمودی حەفید لە شاری سلێمانی لە باشووری کوردستان پەیووەندی بە نوێنەری ئینگلیز و فەرەنسا و ڕووسیا دەکات ، بە دەست نیشانکردنی سنووری نێوان ئێراق و عوسمانیەکانی دەکرد ، لەو کاتدا پێی دەڵێن :–
بریار بە دابەشکردنی رۆژهەلات دراوە ، ئێراق بۆ ئینگلیز ، سووریە بۆ فەرەنسا ، جەزائر بۆ ئیتاڵیا ، وویلایەتی موسل بەر ڕووس کەوتووە .
بەلاّم دووەم جار کە نوێنەر دەنێرێتەوە لای ڕووسەکان لە ئێران ، وەلاّمەکەی ئەوە دەبیٚ کە :– بریار وابوو وویلایەتی موسل ببیٚ بە بەشی ڕووس ، بەلاّم بریارەکە هەڵووەشێندرایەوە .
کە ئینگلیزەکان ئەو هەڵوویستەیان قۆستەوە و لە شاری بەسرە شەڕی دامەزراند ، و هێزی ئێمەش لە ناوچەی قەزوین ، نیازیان وایە لە خانەقینەوە خۆمان بگەیەنینە بەعقوبە . ٥–ل/٦٢– ٦–ل/٢٣ .
بەلاّم لەو کاتەشدا ڕووسیا جگە لە تەنگە ئاویەکان و شاری ئەستموّڵ ، هاتنە سەر ئەوەی کە دەست بگرن بە سەر چەندین جێگەی دیکەدا لە ئەرمینیا و کوردستان . هەروا فەرەنسا ، سووریا و فەلەستین و ئەسکەندەرۆنەو ئەردەن و بۆ خۆی دیارکردبوو ، هەر زوو لە ١٩١٤/١١/٢١ ، بالوێزی فەرەنسا – مۆریس پالیۆلۆك – بۆ نیکۆلای دووەمی قەیسەری ڕووسیای ڕوون کردەوە ، کە وولاّتەکەی بەرژەوەندی گیانی و ماددی هەر لە کۆنەوە لە سووریا و فەلەستین بۆ ماوەتەوە . ٧–ل/٣٨.

بەلاْم ئینگلیز ، ئەوە هەر لە دێرزەمانەوە — حسەت الاسد — ی بۆ خۆی داناوەو هەر كام لە هاوپەیمانەكانی كە دەهاتنە سەر باسی بەشەكەی خۆیان ئەم وەك بلیمەتی گورج دەستی دەدایە لاملی و دەیگووت :— هەقتانە بە گەردەنم هەقتانە و ئێوەش ماندووبوون ، ئەمەش هەر بۆ ئەوەی لە رۆژی خۆیدا ئەوانیش نمەك بینگرێ و لە بەشەكەیدا متەقیان لێوە نەیەت .

هەروا بەریتانیا زۆری بەلاوە گرنگ بوو ، كە ڕووسیا بەردەوامبێ لە شەڕەكەدا لە پاڵ هاوپەیمانەكانەوە ، بۆ یەكەم جار لە مێژوودا دەستی كرد بە زۆر لێكردنی لە قەیسەری ڕووسی ، كە توانای ئەوەی هەیە ئاواتە دێرینەكەی خۆی و باو باپیرانی بێنێتە دی لە دەست ئەستەمبۆڵ ، زۆر نەبوو دەوڵەتی عوسمانی چووبووە ناو شەڕەكە و لە ١٩١٤/١١/١٥ ، عوسمانیەكان بە فەرمی چوونە ناو شەڕەكە . ا.ب— كە وەزیری دەرەوە — سێر ئەدوارد گرای — پەیووەندی بە بالوێزی ڕووسیەوە لە شاری لەندەن كردوو لەم بارەیەوە لە گەڵی دەستی كرد بە گفتووگۆ كردن .

ئیتر خێرا كێشەكە رواڵەتێكی رێكەووتنی سێ لایەنەی نهێنی وەرگرت ، لە ١٩١٥/٤/٣ دا ، ڕوونووسی دوو بیرخەرەوەی نهێنی لە نێوان لایەنە پەیووەندارەكاندا ئاڵ و گۆر كرا ، كە تیایدا داننرا بە — مافی — ڕووسیا لە سەرپەرشتی كردنی تەنگە ئاویەكان و ئەستەمبۆڵ داو لە گەڵ مسۆگەر كردنێكی تەواوی بەرژەووەندیەكانی دوو هاوپەیمانیەكەی دیكەدا ، فەرەنساو بەریتانیا . ٤—ل/٣٠٥ .

ئەمەیە بەراییەكانی مۆركردنی پەیمانی، سایكس— بیكۆ ، و دوای ئەوە مۆركردنی پەیمانی ، سیڤەر و لۆزان و سەعد ئابادیش ، هەر لە سەر ئەم رێنماییانە ئەنجامدران بە مۆركردنی لە نێوان وولاْتانی پەیووەندار و ، كوردیش ....!...؟.

١٩١٦/٥/٢١ كار بەكاری كاتژمێری هاوینە كرا لە بەریتانیا ، كە بووە هۆی ڕێكخستن و بەڕێووەبردنی كاروباری دامو دەزگاكانی حكوومەت و پرۆژەو كارگە تایبەتیەكان لە وولاْتەكەدا .

١٩١٦/٥/٣١ حكوومــەتی فەرەنـسا داوای لــە دەســەڵاتی ڕووســیای قەیــسەری كـرد لــە پترۆســبۆرگی پایتــەختی ڕووسـیا ، كــە بڕیــاری جێبــەجێكردن لــە بـەجێ هێـشتنی ناوچــەكانی خــوارووی كوردســتان و بــەتلیس و وان لــە بــاكووری كوردستان لە توركیادا .

١٩١٦/٦/١ هێزەكانی سووپای ڕووسیای قەیسەری پەلاماری شارۆچكەی خانەقینی لە باشــووری كورســتان داو داگــیری كــرد ، بــەهاوكاری هێزەكانی ســووپای بــەریتانیا بــەهۆی بــەپیتی دوا ڕۆژی ناوچــەكە لــە چـاوگە نەوتیــەكان لــە هەرێمەكەدا .

١٩١٦/١٠/١ ئــەمیر فەیــسەل حوسـێن گەیـشتە نــاو شــاری دیمەشـق لــە شــام ، بـەنیازی فراوانكردنی دەسەڵاتی جووگرافی عەرەب بوو، لەسەر خاكی گەلانی دیكەی غــەیرە عــەرەب لەهەرێمــەكان ، بــە تایبــەتی لــە ڕۆژئــاواو باشــووری خــاكی كوردستاندا .

١٩١٦/١٠/٢٨ بەستنی كۆنگرەی ئیسلامی لە شاری مۆسكۆی پایتەختی ئێستای ڕووسیا ، كــە ٩٠٠ نووێنــەر لەهــەموو شــارو شارۆچــكەوگوندەكانی ژێــر دەســەڵاتی ڕووسـیا بەشـداریان لەو كـۆنگرەدا كـرد ، لـەو كۆنگرەیـە دوو بیروو بۆچـوون ســەری هەڵـدا بــە هەماهــەنگی لــە نێـوان ئیـسلامی سۆشیالیـستی ، واتــە گوونجاندنی بیروبۆچوون بە هۆی دواكەوتوویی گەلانی ئەو كاتدا .

ئەوبیروو بۆچوونەش یەكەم تەتەرەكان دەیان ویست ئیسلام سەربەخۆ بێت لەژێر دەسەلاتی ڕووسیا ، بەڵام گەلانی ئسلامی تركستان و ئازربایجـان دەیـان ویست یەكیەتی ئیسلام بپارێزن و لە ڕووسیا جیا ببنەوە .

بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا نژادی ڕووسەكان زۆرتر بوون و ماوەیان بۆ نەدەگوونجا هــەر یــەك لــەو دوو بیروو بۆچـوونە سـەركەوێت ، لەگـەڵ ئەوەشـدا ئەنـدامانی كۆنگرەكە لەسەر چەند خاڵێكی هاوبەش رێككەووتن، ئەویش:-

بەپێك هێنــانی ئیدارەیــەكی ناوەنـدی بـۆ هەماهــەنگی لـەكاروباری دارایـی و كاروبــاری ئیــسلامی و پێكهێنــانی ئەنجوومــەنی ئیــسلامی ناوەنــدی - ملــی شووری- و پێك هێنانی لێژنەی ئیسلامی جێبەجێكردن.

ئەو كۆنگرەیەش بەپاڵپشتی دەسەڵاتەكانی عەرەب بوو لەبیروبۆچوونەكانی جیــاواز لــە نێـوان مەزهەبــەكانی شــیعەو ســوونە لەگــەل وەهــابی و فــاتمی و ئیسماعیلی لە ئایینی ئیسلامدا .

لەپێناو شێوواندنی باری پەیووەندی ئیسلام ، لەگەڵ ئاینە جیاجیاکانی دیکەی ژێر دەسەڵاتی ڕووسیای قەیسەری ئەوکاتدا .

١٩١٦/١١/١٩ لەدوای مۆرکردنی پەیمانی سایکس –بیکۆی نهێنی لە نێوان فەرەنساو بەریتانیا ، نەخشەی دابەشکردنی پاشماوەی کەل‌و پەل‌و خاوەنداریەتی عوسمانیش مۆرکرا ، بەتایبەتی لە هەرێمەکانی نێوان دوو زێ – میزۆبۆتامیا – لەباشووری کوردستان.

١٩١٦/١٢/٣ مۆرکردنی ڕێکەووتننامەی نێوان بەریتانیاو فەرەنسا بە ڕەزامەندی ڕووسیای قەیسەری لەگەڵ دەسەڵاتی عوسمانی لە ناوچەکانی باکوورو ڕۆژهەڵاتی کوردستان ، کە لە ٩٥٪ی دانیشتووانی کورد بوون‌و دوای ئەوانیش ئەرمەن و ئاشووریەکان لە هەرێمەکاندا .

١٩١٦/١٢/٦ بە بیانووی ئەوەی کە جوانترین ئافرەتی سان پترۆسبورگ دەخوازی لە کۆشکی مۆیکا بیبنێ. ڕاسبۆرتین بانگهێشتی ئەم شووێنەکرا لەکاتی چاوەڕێ کردنیدا – برێك– شیرمەنی و خواردنەوەی پر لە سیانیدی بۆتاسیۆمی دەرخواردکرا . سەیریش لەوە دابوو جەستەی ڕاسبۆرتین نەکەوتە ژێر کاریگەری ئەو ژەهرە. ئەوە بوو دواتر دووژمنان هەوڵیاندا بە دەمانجە بیکووژن... بۆسبۆیۆڤ دەمانجەکەی دەرهێناو تەقەی لە نێچیرەکەی کردو ڕاسبۆرتێن گیانی لە دەستدا.

## ١٩١٧

١٩١٧/٢/٥ ڕاگەیاندنی دەستووری نووێی ڕژێمی شانشینی مەکسیك ، کە بووە هۆی چاکسازی کردن لە بوارەکانی ڕامیاری‌و ئابووری‌وبازرگانی و ڕۆشنبیری‌و کۆمەڵایەتیدا ، سەرەڕای کێشەو ململانێی لەگەڵ ئەمەریکا ، تا ئەو کاتەی کە کێلگە نەوتیەکانی بیانی خۆماڵی کرد، دوای ئەوە ڕێکەووتنی لەگەڵ خاوەن زەوییەکان مۆرکرد بە قەرەبوو کردنەوەیان لە وولاتەکەدا .

١٩١٧/٢/٩ بەرپرسی هێزەکانی سووپای ڕووسیا– شاخۆفسکی– لەگەڵ کامیل بەگ کەووتنە گفتووگۆ کردن ، لەو گفتووگۆیەدا کامیل بەگ ، شاخۆفسکی تێی گەیاند کە ئەبێ ناوچەی بۆتان لەباکووری کوردستان لە ژێر سایەی ڕووسیاو نەوەکانی بەدرخاندا بێت ، کە کامل بەگ خۆشی یەکێك بوو لەو

ئەوانە لە هەرێمەکەدا .

١٩١٧/٢/١٥ کاتێك دەوڵـەتی تـورك بڕیـاری کوشـتارو ڕاودوونـانی ئەرمەنیەکانیکـە لـە بـاکووری کردسـتان ڕوویان لـە ناوچـە ئارامـەکان کردبـوو بـۆ بیابانـەکان دەرکـرد ، کـوردە ئێزیدیـەکان نزیکـەی شـەش هـەزار ئەرمـەنیان لەدەست بکوژەکانی تورك ڕزگار کردو پەنایان دان و لەئامێزیان گرتن لە هەرێمەکەدا . هـەر لەبـەر ئـەوە دەوڵـەتی تـورك و ئـەڵمان ئێزیدیـەکانیان وەك دووژمـنی سـەرەکی خۆیـان تـاوان بـارکرد ، بـەڵام سـەرەڕای ئـەوەش خۆیـان ڕاگـرت و درێژەیان بەیارمەتیدانی ئەرمەنەکاندا لە باکووری کوردستان.

١٩١٧/٣/١٥ بـەرپابوونی ڕاپـەڕین دژی ڕژێمـی قەیـسەری ڕووسـیا لـە پترۆسـبۆرگی پایتـەختی ڕووسـیای ئـەوکات ، کـە بـووە هـۆی کـەرت بـوونی هێزەکـانی سووپای قەیسەری و بەرز بوونـەوەی هەستی چینایەتی لـە لایـەن جووتیـارو کاسـبکارو بـە تایبـەتی چـینی کرێکـارو مـافی مـرۆڤ و دیمـوکراتی لـە کارگەوکێلگەو کارگێریە حکوومیەکان، ئەویش بووە هۆی دەست هـەلگرتنی نیکۆلای دووەم لە دەسەڵاتی ڕووسیا .

١٩١٧/٤/٦ حکوومەتی ئەمـەریکا شـەڕی دژ بە دەسـەڵاتی ئـەڵمانیا ڕاگەیاندو دوایـی لـە کـانوونی دووەمـی هـەمان سـاڵ ، شـەڕی دژ بە نەمسا ڕاگەیانـد، کە وڵاتـی نەمسا لایەنگیری ئەڵمانیا بوو لە جەنگی جیهانی یەکەم لە کێشووەرەکەدا .

١٩١٧/٥/١٠ نووێنەری بەریتانیا سـۆکۆلف بەیاوەری سیر مـارك سـایکس بـەرەو پاریـسی پایتەختی فەرەنسا کەوتنە ڕێ بۆ بەشـداریکردنیان لـە چـەندین کۆبوونـەوە لەگەڵ هەندێ لە بەرپرسانی وەزارەتی دەرەوەی فەرەنسا ، هـەر یـەك بـەجیاو ، دوای ئـەوە بـەرەو ئیتالیـا و بارەگـای فاتیکـان بەرێکـەووت ، کـە سـۆکۆلف تـوانی چـاوپێکەووتن لەگـەڵ قەداسـەتی پاپابنـدیکتی یانزەهـەم بکـات ، لـە پێناو چارەسەرکردنی پرۆژەی جوولانەوەی سەهیۆنیزم لەجیهاندا .

١٩١٧/٥/١٠ هێزەکانی سووپای ڕووسیا بەسەرۆکایەتی باولۆف لەڕێگەری خاکی ئێران ، شاری خانەقین و ناوچەی سەعدیەو قەلای شێرۆنی لەباشووری کوردستان داگیر کرد ، بەلام لەئەنجامی بەرپەچدانەوەی لەلایـەن شۆڕشگێڕانی کوردو

کێشەی ناوخۆی ڕووسیا بەناچاری کشانەوە دواوە لەناوچەوکەدا .

١٩١٧/٦/١٤ دامەزراندنی یەکەم ئیدارەی کارگێڕی کاروباری بەڕێووەبردنی ئەوقاف لەشاری بەغدا ، کە نووێنەری کورد بەشداری لەو دەزگا ئاینیە کردو لەجێگەی خۆی ، کە کادرانەوەی بەرچاوی هەبوو لە بوارە جیاجیاکانی ئاینیدا.

١٩١٧/٧/٤ کاربەدەستانی بەریتانیا لەشاری بەغدا ڕۆژنامەیەکی ڕۆژانەیان بە ناوی- العرب - بڵاو کردەوە ، بەسەرکەووتنی هێزەکانی سووپای هاوپەیمانان بەسەر هێزەکانی سووپای عوسمانیو ئەڵمانیاو مووژدەی بەخشینی بەگەلانی عەرەب دا لە داهاتوویان لە ناوچەکەدا .

١٩١٧/٧/١٢ هێزەکانی سووپای ئەڵمانیا بۆ یەکەم جار گازی خەردەیان لەجەنگی - یبرس- بەکارهێنا ، لەجەنگی یەکەمی جیهان دژی هێزەکانی سووپای ڕووسیای بوورژوازی ئەوکات لە گۆڕەپانی شەڕەکەدا .

١٩١٧/٧/١٣ بەهەوڵێ بەرپرسانی ڕووسیا لەشاری کرمانشای وولاتی ژێردەسەڵاتی فارسو ، لە گوندی بریندار ، یەکەم کۆنگرەی مێژوویی لە ڕۆژهەڵاتی کوردستانی ژێر دەسەڵاتی فارس لە ئێران گرێدرا ، کە کۆنگرەکە سێ ڕۆژی خایاندو سەرکردەکانی کوردو نووێنەری ڕووسیاو بەریتانیاو ئێران بەشداریان تێدا کرد لە هەرێمەکەدا .

١٩١٧/٧/١٦ قەیسەری ڕووسیا نیکۆلای دووەم لەناوەندەکانی بەردەوامی شۆڕشی بەلشەفیەکان کووژراو، بووە هۆی دامەزراندنی دەسەڵاتی بوورژوازی دیموکراتی کاتی بەسەرکردایەتی ئەمیرلفۆف ، بەرەو کۆتایی هاتن بە دەسەڵاتی قەیسەر لە ڕووسیادا .

١٩١٧/٧/١٧ لە ئاکامی هەوڵەکانی بەرپرسانی ڕووسیا - زاخاریچینکۆ - بۆ یەکەم جار لە مێژووی کوردستان ، کۆنگرەی سەرکردەکانی کوردو نووێنەرانی ڕووسیاو بەریتانیاو ئێران ، بەسەرکەوتوویی کۆتایی هات لەو کاتەی کە لەو کۆبوونەوە ٢٠٠٠ دوو هەزار کورد بەشداری تێدا کردو کۆنگرەکە لە بەرژەوەندی ئەو کاتی کوردستانو بەتایبەتی ڕۆژهەڵاتی کوردستان بوو لە هەرێمەکەدا .

١٩١٧/٧/٢٠ وولاتی ڤیلەندە سەربەخۆیی خـــۆی ڕاگەیانـــدو - کارلوســـنالیرنگ - یەکـــەم پۆســـتی ســـەرۆکایەتی ڤیلەندەی گرتە دەست ، کە لەو کاتە کێشەو ململانێی لەگـەڵ شۆڕشـی ڕووسـیا لەسەر هەلداندا بوو .بە هۆی لێك ترازانی پەیووەندیەکان لە نێوان وولاتانی جیهاندا .

ئەم راگەیاندنەش بەناوی - کۆماری ڤیلەندا- بوو ، کە پایتەختەکەی ناوی -هلسنکی - یەو ژمارەی دانیشتووانەکەی ، ١,١٦٧,٠٠٠ ملیۆن کەسە . هەروا ژمارەی دانیشتووانی وولاتەکەی، ٥,٦٥٠,٠٠٠ ملیۆن کەسە . هەروا ڕووبەری وولاتەکەی ، ٣,٣٨١,٤٣٠ کیلۆ مەتر چوار گۆشەیە . هەروا چڕی دانیشتووانەکەی ، ٤٣ کەس لە یەك میل چوار گۆشەدا . هەروا نژادەکانی ، ڤیلەندیەکان ٩٥٪ . هەروا سوویدیو وویلایەتی دیکەش هەن . لە وولاتەکەدا.

١٩١٧/٩/٤ گرێدانی کۆنگرەی ٢٧ خێلی کورد لەناوچەی دادوونی ئەنجامدرا لە دەووروبەری شاری سنە لە رۆژ هەلاتی کوردستان ، بە هەولی نووێنەری ڕووسیا ، زاخاریچینکۆ ، کە سوودی بەرچاوی هەبوو بۆ ڕامیاریەتی ڕووسیا لەناو کوردو ناوچە کوردیەکانی ژێر دەسەلاتی شای فارسدا .

لە هەمان کاتیش کە پاراتۆف خۆی بەشداری لەو کۆنگرەیە کرد لەگەڵ کوردو پەیمانی ڕەسمی کوردی تۆمار کرد ، کە ڕۆلی سەرەکی بینی لە یەکیەتی هەموو خێلەکانی کوردو یەکخستنی هێزو توانایان لە پێناو پاراستنی نیشتمان ... بەلام کورد... ؟ ... !.

١٩١٧/٩/١١ نووسەری ناوداری فەرەنسیو نووسەری کتابی - کورد- باسیلی نیکتین

سەردانی ناوچەکانی باکوورو ڕۆژهەڵاتی کوردستانی کردەووەو چەندین لێکۆڵینەوەی لەسەربوونی کوردو مێژوو ڕووداوەکانی نووسیووە ، لە هەمان کات بەشداری لەکۆنگرەی جیهانی مێژووی ئاینەکانی کردووە لە ساڵی ١٩٢٣دا.

هەروا ڕاپۆرتی هەمە لایەنی لەسەر کوردو بزووتنەوەی کورد پێشکەش بە کۆنگرەکە کردووە ، چیرۆکی سۆتۆوتاتۆی کوردی وەرگێڕاوەتە سەر زمانی فەرەنسی، لە کوردستان زۆر سووڕاوەتەوە بەتایبەتی لە ڕۆژهەڵاتو باکووری کوردستان ، کە زمانی کوردی بەباشی زانیووە ، لەهەمان کات نوێنەری بەریتانیا – میجەرسۆن – لەچەندین بوار یارمەتی داوە ، لە باشووری کوردستاندا .

١٩١٧/١٠/٧ بەرپابوونو سەرکەووتنی شۆڕشی ئۆکتۆبەری بەلشەفیەکان لە ڕووسیا بەسەرکردایەتیو ڕابەڕایەتی – لینین– بەرووخاندنی ڕژێمی بۆگەنی ڕووسیای قەیسەریو دامەزراندنی ڕژێمی سۆڤیەتات لە وولاتەکەدا ، کە دەسەڵاتی چینی کرێکارو جووتیار، لە هەمان کات جیهان بوو بە دوو جەمسەری دژ بە یەکتر لە جیهاندا

تێبینی:- لە بارەی شۆڕشی بەلشەفی لە ناوەڕۆکی مێژوونامەکە بخوێنەوە لە سەر ڕووداوەکاندا .

١٩١٧/١٠/١٧ کۆچی دوایی سولتانی عوسمانی سولتان عەبدولحەمید لە دوای دەست لەکار کێشانەوەی‌و دانانی براکەی محمد رەشاد بە سولتانی عوسمانیەکادا .

شایانی باسە ئەو مرۆڤە درندەیە دژ بە هەموو کردەوەو هەلوویستو رەفتاری مرۆڤایەتی بووە لە ماوەی دەسەلاتداریەکەیدا ، ئەویش لە نەخشەکانی قەسابخانە یەك لەدوای یەکەکانی ئەرمەن‌و کوردو دابەشکردنی کوردستانی دارشتبوو ، لەگەڵ وولاتانی هاوپەیمان لەگەڵ بەریتانیاو ئەمەریکاو فەرنسادا .

١٩١٧/١٠/٢٦ گرێدانی یەکەم کۆنگرەی گشتی هەموو ئەنجوومەنی سۆڤیەتاتی رووسیا .

ئەویش بە هەلبژاردنی - لینین - بەسەرۆکی حکوومەتی شۆڕشگێڕی نوێی بەلشەفیەکان ، کە مێژووی ڕاپەڕین‌و شۆڕشەکان یەکەم حکوومەتی کۆمۆنیستی دامەزراوجیهان بووبە دوو جەمسەری دژ بەیەکتری ، ئەویش بە ڕژێمی سۆشیالیستی جیهانی‌و ڕژێمی سەرمایەداری جیهانی ، لە هەموو بوارە جیاجیاکاندا .

١٩١٧/١١/٢ مۆرکردنی پەیمانی - بەلفۆری- بەناوبانگ لەلایەن هاوپەیمانان بە سەرکردایەتی بەریتانیا ، کە ئەو پەیمانە یاریدەدەری پەیمانەکانی دیکەی نێوودەووڵەتی بوو لە دوو لایەنی گرنگ ئەویش:-

صورة لنص الوعد المشؤوم

یەکـــەم :- دارشـــتنی نەخـــشەی دابەشـــکردنی کوردســـتان بـــە دامەزرانـدنی دەوڵـەتی نـوێ لـە هەرێمەکـــەدا ، بـــەپێی بڕگـــەو ماددەکـانی پـەیمانی سـایکس - بیکۆو

دووەم :- دارشـــتنی نەخـــشەی دەوڵـــەتی جوولەکـــەی داهـــاتوو لەهـــەرێمی شـــامدا ، واتـــە لـــە فەلەستیندا .

١٩١٧/١١/٢ بلاو بوونەوەی ووتاری وەزیـری دەرەوەی بەریتانیا - ئەرسدبلڤۆر- لـەدوای دامەزرانـــدنی چـــەند کۆمـــەلگایکی یـــەهوودی - جوولەکـــە- و پـــشتگیری لێکردنیان لەهەموو بوارە جیاجیاکان ، بەتایبەتی لە دامەزراندنی دەوڵەتی یەهوودی لە داهاتوودا.

١٩١٧/١١/٧ بەڕابەرایـەتی - لـینین - و هەڤالـە هاوخەباتەکەی ترۆتـسکی سـەرکەووتنی یەکجارەکی شۆڕشی ئۆکتۆبەری مەزنیان ڕاگەیاند، کە ئەویش کاردانـەوەی کاریگەری کردە سەر ڕامیایەتیو پەیووەندی نـوویێ نێوودەووڵـەتی ، لـەدوو تیئۆرو بیروو بۆچوونو هەڵوویستو دەسەلاتی جیاواز لەجیهاندا، لە ڕژێمی سۆشیالیستیو سەرمایەداری دژ بەیەکتری لە جیهاندا .

١٩١٧/١١/٨ کۆنگرەی نووێنـەرانی کرێکـارو سـەربازو جووتیـارانی سـەرانسەری ڕووسـیا بڕیاریدا ، کە هەموو ئەو ڕێکەووتنانەی بەنهێنی لە نێوان دەسـەلاتی ڕژێمی ڕووسـیای قەیـسەری کـە لـە گـەڵ ووڵاتـانی هاوپـەیمانیو ووڵاتـانی دیکـەی جیهان مۆر کرابوو ، بۆ دابەشکردنی جیهان بەبێ مـەرج هەلوەشـێندرێتەوە ، بەڕێنماییویاسـای نـوویێ دەسـەلاتی سـۆڤیەتات تـاوتۆ بکرێـت ، لـە هـەموو بوارە جیاجیاکـان . بـە تایبـەتی لـە پەیووەندیـە نێـوو دەوولـەتیوبازرگانیو ئابووری و کاری دیبلۆماسی دا.

١٩١٧/١١/١٣ کۆچـی دوایـی پەیکـەرتاشو نیگارکێـشی فەرەنـسا - تۆگێـست جـات

رۆدانی- لە پاریسی پایتەختی فەرەنسا.

١٩١٧/١١/١٥ لـە دوای سـەركەووتنی شۆرشـی ئۆكتۆبـەر ، حكوومـەتی نـوێی ڕووسـیای سۆڤێتی ، بە ڕاگەیاندنی بریاری پێدانی مافی چارەنووسی گەلانی ڕووسیای بلاوكـردەوە ، بـە بەیەكسانیو سـەربەخۆییو مـافی چارەنووسـی هـەتا بـەمافی جیابوونەوەو ڕاگەیاندنی سەربەخۆیی لە دەسەلاتی ڕووسیای نوێدا .
ئـەویش بـە هەلوەشـاندنەوەی هـەموو جـۆرە بەندایەتیـەكی نەتـەوەیی ونیشتیمانی و بوارەكانی دیكەدا . لە پێناو پەرەسەندنو پێشكەووتنی كەمە نەتەوایەتیەكانی ، كە لە ناو سنووری دەسەلاتی نووێی ڕووسیای سۆڤیەتیدا دەژین لە كێشووەرەكەدا .

١٩١٧/١١/١٨ كووشـتنی - فـەریق مـۆد- بـە شـیری ژەهـر كـراو ، كـە جوولەكـەكانی شـاری بەغـدا بۆیـان ئامـادە كردبـوو ، دوایـی ئـەو - فـەریق مارشـال- سـەركردەی فەیلــەقی هینــدی جێگــەی گرتــەوە ، كــە لــەو كاتــە لەشــكرەكەی خــۆی بـۆداگیركردنی شارۆچكەی هیتو دەووروویـەری ئامـادەكردبوو لـە رۆژئـاوای شاری بەغدا لە ناوچەكەدا .

١٩١٧/١١/١٩ دامەزرانـدنی كۆمەڵـەی - تـەعالی كوردسـتان- لـە بـاكووری كوردسـتانی ژێـر دەسەلاتی عوسمانی توركدا .

١٩١٧/١٢/٥ مـۆركردنی رێكەووتننامـەی - گـرێ بەسـتەی وەسـتانی شـەڕی- لـە نێـوان دەسەلاتی ڕووسیای نووێو دەسەلاتی عوسمانی شاه ژاو لە جیهاندا .

١٩١٧/١٢/٩ هێزەكـانی سـووپای بـەریتانیا تـوانی هێزەكـانی سـووپای عوسمـانی تـورك لەشام ، بەتایبـەتی لـە هەرێمـەكانی فەلەسـتینو ئیسرائیلی ئێستا دەربكاتو بیخاتـە ژێـر دەسـەلاتی ئینتیـدابی خـۆی ، بـە پێـی بریـاری ئەنجوومـەنی كۆمەلەی گەلان.
كە ئەمـەش بـووە هـۆی دەسـت پێكردنـی كۆچڕەوی خێزانـە جوولەكـەكان لـە ولاتانی جیهانو بە تایبـەتی لـە وولاتـانی عـەرەبی بـەرەو هەرێمەكـە ، لـەپێناو دامەزراندنی دەوولەتی یەهوودی لە فەلەستیندا .

١٩١٧/١٢/١٣ ژەنەرال – نیسك – بەتەلگراف هەموو كار بەدەسـتانی حكوومـەتی فەرەنسـای لەناوچەكان ئاگاركردەوە ، بەهاوكاری كردنی ئەرمەنو مەسیحیەكان بەگشتی

لەقەفقاز ، ئەویش بە خەرجیەکی کەم ، لەپێناو جێبەجێکردنی ئامانجەکانی وولاتانی هاوپەیمان لەسەر خاکی باکوورو ڕۆژهەلاتی کوردستاندا .

١٩١٧/١٢/١٥ ڕژێمی شوورەوی نوویێ بەلشەفیەکان ڕاگەیاندنێکی بلاو کردەوە ، کە تیایدا هاتبوو ، ئەو هەموو بەیاننامە نهێنی و ئاشکرایانەی هەلووەشاندەوە . کە ڕژێمی سزاری سەبارەت بە تورکیاو ئێران بەستبووی بە مۆرکردنی لە نێوان هەر سی لایەندا .

١٩١٧/١٢/١٨ یەکەم پەیووەندی دەسەلاتی ڕووسیای نوێ لە دوای شەش هەفتە لە سەرکەووتنی شۆڕشی بەلشەفی ، لەگەڵ تورکە عوسمانیەکان گفتووگۆی نێوانیان دەستی پێکرد .

لە پێناو بەدەست هێنانی نیازەکانیان لە ناوچەی قەوفقازو پەلامارادانی ئەرمەنەکان و کورد لە باکووری کوردستان بەهۆی ڕووخساوی هەل ومەرجی لەباری کات لە ناوچەو هەرێمە جبیا جیاکاندا .

## ١٩١٨

١٩١٨/١/١ دادوەری گشتی بەریتانیا لە ئێراق- ئارنولدولسن- بەفرۆکە گەیشتە شاری سلێمانی لە باشووری کوردستان ، دوای گەیشتنی چاوی کەوت بەشێخ مەحمود حەفید و ژمارەیەك لە کەسایەتی و گەوورە پیاوانی لە شارو ناوچەکە ، لەپێناو هێوور کردنەوەی بارودۆخەکەدا .

١٩١٨/١/١ لەدوای کشانەوەو نەمانی هێزەکانی سووپای ڕووسیا لە خاکی ئێستای ئێراق ، ڕۆژنامەی - تێگەیشتنی ڕاستی- بلاوکرایەوەو ڕووسەکان هەولیاندا گرنگی بە باری کورد بدەن ، یەکەم :- لەپێناو بەرژەووەندی

تایبەتی خۆیـانو، دووەم :- یارمـەتی دانـی کـورد لـە داهاتوویـدا بەتایبـەتی لەرۆژ هەڵاتی کوردستان.

١٩١٨/١/٨ ســـــەرۆکی وویلایەتـــــە یــــەکگرتووەکانی ئەمـــــەریکا - ویلــسون- لــە ووتارێکیــدا وەك بەڵگەنامەی ئاشتیو چارە سـەری کێـشەی نەتـەوەیی و نیـشتیمانی و ڕامیـاری ، ئـەویش ١٤چـواردە خـالی گرنگـی بەســەر وولاّتــانی جیهان ڕاگەیاند .

کــە لــە خــاڵی/ ١٢ ی ئــە و ڕاگەیاندنـەدا ، داوای بـۆ ئـەو نەتەوانـەی کـە دەکەوونـە ژێـر دەسـەلاتی عوسمـانی ، پێوویـستە بـە ئازادانـە هەڵـسووکەووت بکـەنو مـافی خۆیـان پێبدرێ لە ناوچەکەدا

جێگـەی باسـکردنە کـە ئـەو ١٤ چـواردە خاڵـەی کـە سـەرۆکی ئەمـەریکا رایگەیاند ئەمانەن :-

١- وەســتاندنی رامیاریەتــە نهێنیــەکان و ، گرێــدانی رێکەووتننامــە ئاشکراکانی ئاشتی ...٢- ئازادی هاتوو چوون لە دەریاکانـدا ...٣- هــەڵگرتنی بەربەســتە گومرگیــەکان و ، پیــادە کردنــی ئــازادی و یەکسانی لـە بازارەکانیدا ...٤- کەمکردنـەوەی چەك و چۆڵ ...٥- چارەســەری رەوای کێـشەی کۆلۆنیـەکان ...٦- چـۆڵکردنی خـاکی ســۆڤیەت ... ٧- ســەر بــەخۆیی دووبــارەی بەلــژیکا ... ٨- چـۆڵکردنی فەرەنـسا و گەڕاندنـەوەی ، ئـالزاس و لـۆرین ، بـۆ ئـەم وولاّتـە... ٩- پێدا چـوونە بـە سـنوورەکانی ئیتاڵیـا... ١٠- خـوود مووختاری کەمینەکانی نەمسا و هنگاریا ... ١١- چۆڵکردنی خاکی ســیبیریا و مــۆنتینیگرۆ و رۆمانیــا ، چــارە ســەرکردنی رەوای کێشەکانی بەلکان... ١٢- سـەربەخۆیی نێووخۆیی نەتـەوەکانی ژێر دەسـەلاّتی تورکیـای عوسمـانی بـە نیوونەتـەوەیی کردنـی دەردەنیل

...١٣- دامەزراندنی دووبارەی دەوڵەتی پۆڵندا ...١٤- دامەزراندنی کۆمەڵەی نەتەوەکان .

تێبینی :- خاڵی /١٢ بە مانای سەربەخۆیی ئەو نەتەوەداگیرکراوانەی ژێر دەسەڵاتی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی دێت .

کە هەموو نەتەوەکانی ژێر دەسەڵاتی عوسمانی سەر بە خۆییان بە دەست هێنا ، تەنیا کرد بەبێت ...! .

ئەویش هۆکارەکەی دەگەڕێتەوە بۆ نەبوونی یەك بیروو بۆ چوونی کوردو بوونی کێشەی نێوانیان لە سەر دەسەڵات و سامان و بە ئاواتی وەرگرتنی کورسی ، کە بەرژەوەندیەکانیان بپارێزێت ، نەك بە دەست هێنانی ئاوات و ئامانجەکانی گەلی کوردستان لە سەر خاکی کوردستان .

١٩١٨/١/١٠ سەرکەووتنی ڕووسیاو هاوپەیمان بە سەر ئەلمانیاو ئیمپراتۆریەتی عوسمانی و جەنگی یەکەمی جیهانی کۆتایی هات ، بە تایبەتی هەرەس هێنانی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی ودابەشکردنی پاشماوەی بەجێ ماوی ژێردەسەڵاتی لە کەل و پەلی هەمە جۆری ئابووری و سەربازی و خاوەنداریەتی مولك و سامان و زەوی لە کیشووەری ئاسیاو ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا.

١٩١٨/١/١١ لێژنەی داواکاری ، ئێران – ئەمەریکا ، بروسکەیەکی ئاراستەی باسیلی نیکیتین کرد لەژێر ژمارە / ١٣ ، بە وەڵامدانەوەی نامەی نیکتین لە ١٩١٨/١١/٧ ، لەبارەی کێشەی کورد لەناوچەکەدا و داوای گرنگی پێدانی کێشەی کورد دەکات ، بەڵام نامەو بروسکەکە بە هۆی درەنگ گەیشتنی بۆ کۆنگرەکە نامەکە بۆتە بەڵگەی ڕەسمی لە ئەرشیفەکاندا.

١٩١٨/١/١١ دەسەڵاتی ڕووسیای سۆڤیەتی نووێ لە مەرسوومێکیدا پشتگیری لەماف سەربەخۆیی چارەنووسی ئەرمەنیەکانی ژێر دەسەڵاتی عوسمانی کرد ، لەکاتی داگیرکردنی زۆربەی خاکی ئەرمینیا لەجەنگی یەکەمی جیهانی لەلایەن هێزەکانی سووپادا .

١٩١٨/١/١٨ هێزەکانی سووپای عوسمانی تورکی بەزیوو جارێکی دیکە بەشێکی زۆری لەخاکی ڕۆژهەلاتی کوردستانی داگیر کرد ، بە پیلانێکی نێوان هێزەکانی

سـووپای تورك و ڕووسـەكان كە ئەو پیلانـە لـە ئازربایجان لـە لایـەن هـەردوو وولاَت لە سەر ناوچەكە مۆركرا .

١٩١٨/١/٢٨ كابتن – د.ف گریس– گەیشتە شاری ورمێ لە ڕۆژهەلاَتی كوردستان و داوای راسـتەوخۆی كۆبوونـەوەی لەگـەڵ بـەتریرك مـارشمعون كـرد ، كـە نووێنـەری فەرەنـسا دكتـۆر– كۆبـول– و نووێنـەری ئـەمریكا مـلازم – مكـدافیل– و بلاوكـەرەوەی ئـەمریكی و كوونـسلی دكتـۆر فاشـید و خێزانەكـەی بـوون لـە هەرێمەكەدا .

بەلاَم نووێنەری سەركردەی دوواوەی قەفقاز ، كەجێگری كوونسلی وەرمێ– ف.پ.نیكتین– بوو ، لەو كۆبوونەوە ، كابتن گریس ڕایگەیاند بەناوی شاندی سـەربازی بـەریتانیا ، لەسـووپای روسـیا لـە قـەفقازو بـەناوی بـەریتانیاو لـە ووتەكانی بەردەوام بوو ، بە هاوپـەیمانی ئەرمەنـەكان بەیەكسانیان لەكێشەی شـەڕیان لەگـەڵ ئـەلمانیاو توركیا كـە ڕووسـیا بـەهۆی سـەركەووتنی شۆڕشـی بەلـشەفی لەجـەنگ دوور كەوتنـەوەو پێوویـستە ئەفـسەرە ڕووسـەكان لـە سووپای ئاشووریەكان بێنە دەرەوەو بەریتانیا لە جێگـەی ئـەوان ڕاوێـژكاری شارەزایان بۆ ڕەوانە دەكات .

ئەویش لە پێناو دامەزراندنی دەوولەتی ئەرمەنی سەربەخۆ گەر ئەوان لەشەر بـەردەوام بـوون شـان بەشـانی بـەریتانیاو هاوپـەیمانان كـە ئـەم مـشتوومرەو كێشەو ململانێیەش لەسەر خاكی كوردو كوردسـتان بـوون بـون بەتایبـەتی لـە بواری نەتەوەیی نیشتماندا .

١٩١٨/٢/٨ كۆچی دوایی سولتانی عوسمانی سولتان عەبدولحەمید ، كە بێ وێنە بـوو لـە داگیر كردن ودەربەدەر كردنو وێران كردنی خاكی گـەلان ، بە تایبـەتی كـوردو ئەرمەن و دەربەدەر كردنیان لەسـەر خـاكی دێرینـی خۆیـان ، كە كوردسـتانەو بــەرەو وولاَتــانی دراوســێ و ئــەورووپای ڕۆژئــاوا ، كۆچــیان پێكــردن لــە هەرێمەكەدا.

١٩١٨/٢/١٥ لەهێرشـێكی هـەزار سـەربازی – جیلـۆ – لەسـەر داوای كاپیتـان گاسـفیلد گـەیشتنە نـاو شـاری ورمـێ لـە ڕۆژهـەلاَتی كوردسـتان ، لـەناو بـازاڕی شـاری ورمێ بەزۆر داوایان لـە دانیـشتووانەكە دەكـرد، كـە چەكەكانیان لێ دەكـرن ، لەئەنجامدا بووە هۆی دروست بوونی ناكۆكی و شەڕ كە سێ هاوولاَتی كرد لـە

شارەکە گیانیان لەدەست دا بەهۆی گولله باران کردنیان.

١٩١٨/٢/١٩ بەرپابوونی شەڕ لە نێوان هێزەکانی سەربازی – جیلۆ– و هێزەکانی سووپای ئێران لە شاری ورمێ لە ڕۆژهەڵاتی کوردستان ، لە ئەنجام بووە هۆی کووژرانی چوار هاووڵاتی کورد لە شارەکەدا .

١٩١٨/٢/٢٠ فەرماندەی ورمێ – ئیجلال ئەلمەلیك–و سەرۆکەکانی مەسیحی– مسیۆ کوژل– کە سەرۆکی نەخۆشخانەی فەرەنسا بوو– سونتاکی– نووێنەری پاپا بۆ بارەگای حکوومەت بانگهێشت کرد ، لەپێناو گفتووگۆ کردن لەبارەی ڕووداوەکان.

کە لەو کاتەدا چەند کەسێکی دانیشتووی گوندەکان ڕژانە ناو بارەگاو گازاندەیان کرد لەدەست ڕەفتاری جیلوەکان لەدەووروبەری شارەکەدا ، کە ڕێ بەدانیشتووانی گوندەکان دەگرن و هەر کەسێك ببینن دەیکووژن لە ناوچەکەدا .

١٩١٨/٢/٢١ بەرپابوونی شەڕی ناوخۆ لە نێوان مەسیحیەکان و ئیسلامەکان لە پارێزگای ورمێ لە ڕۆژهەلاتی کوردستان ، کە لە ماوەی ١٥٩ ڕۆژدا زیاتر لە ١٣٠هەزار لە هاووڵاتی پارێزگاکەو دەووروبەری لەهەردوولا کوژران لە دانیشتووانی شارەکانی ورمێ و سەلماس و دەووروبەری کە لەو شەڕەدا ژمارەیەکی زۆریش کورد کوژران بەنانەوەی ئاژاوە لەلایەن لایەنگرانی دەسەڵاتی فارس و تورك و ، لەهەمان کات سوودمەندبوونییان لەو ڕووداوەدا .

١٩١٨/٢/٢٢ دەست پێکردنی گفتووگۆ لە نێوان فەرماندەی شاری ورمێ وکونسلەکانی ڕووسیای قەیسەری و ئەمەریکاو سەرپزیشکی فەرەنسا ، بۆ هێوور کردنەوەی بارودۆخی پارێزگای ورمێ لە ڕۆژهەلاتی کوردستان ، بەڵام بێ سوود بوو ، کە بووە هۆی پەرەسەندنی بارودۆخەکەو هەلگیرسانی شەڕی نێوان ئیسلامە مەزهەب شیعەکان و مەسیحیەکان ، کە زیاتر لە ١٥٥ ڕۆژی خایاند لەناو شاری ورمێ دەووروبەری لە هەرێمەکەدا .

١٩١٨/٢/٢٤ هەرچەندە نوێنەری مەسیحیەکان – مارشەمعون– بەڵێنی شەڕ وەستاندنی ڕاگەیاندبوو ، بەڵام شەڕەکە لەشاری ورمێ لە ڕۆژهەڵاتی کوردستان بەردەوام

بوو، كه بووه هـۆی دژوواریو نا لـەباری باری شارەكه ، لـەو كاتـەدا پیاوه گەورەكانی شاری ورمێ پەنایان بردە بەر كونسلخانەی ئەمەریكا ، لەپێناو ڕاگرتنی شەڕو ئارام كردنەوەی باری شارەكەو دەوورووبەری له هەرێمەكەدا .

١٩١٨/٢/٢٥ له كۆتایـەكانی جەنگی یەكـەمی جیهان ، سەركردایەتی سووپای بەریتانیا ئارەزوی دەكرد ، كه كوردو سمكۆی شكاك و ئەرمەن دژی دەسـەڵاتی توركی عوسمانی یەك بخات . بەمەش تۆڵەی هەرەس هێنانی هێزەكانی سووپای له بەرەی ڕووسیا بكاتـەوه ، بـەڵام سـەركردەی كـورد لـه ڕۆژهـەڵاتی كوردستان سمكۆی شكاك خۆی لەو كاره دوورخستەوەوهەوڵی له ناوبردنی سەرۆكی ئاشووریەكان– مارشەمعوەن– له ناوچەكەدا .

١٩١٨/٢/٢٨ بەهۆی باری ئاڵۆزی ناوچەی ورمێو دەوورووبەری له ڕۆژهـەڵاتی كوردستان ، ئـەویش بـه بـەرپابوونی ڕاپـەڕینی ئیسلامەكان دژی ئەرمـەنو ئاشـووریه مەسیحیەكان ، كه خوازیـاری لـەناوبردنی مەسیحیەكان بوونو ئەو ڕاپەڕینه گەیشته شـەڕی چەكداری بەشێوەیەكی گشتی ، كه لەوكاتـەش ڕووسـەكان پـشتگیریان لـه مەسـیحیەكان بەگـشتی دەكـردو هـەوڵی یـەكبوونی كـوردو ئەرمەنو ئاشووریەكانیان دەدا له هەرێمەكەدا .

١٩١٨/٣/١ بـەهۆی توانـاو لیهـاتوویی و زیرەكـی مێـژونووسو ڕوونـاكبیری كـورد – محەمـەد ئـەمین زەكـی – بـەگ لـه باشـووری كوردسـتان – خـەڵاتی خاچـی پۆلاینی لەلایەن حكوومەتی ئەڵمانیا پێ بەخشرا .

١٩١٨/٣/٣ مـۆركردنی ڕێكەووتنامـه لـه نێـوان ڕووسـیای بەلـشەفیو ئـەڵمانیای نـازی ، ئەویش به ڕاگەیاندنی كۆتایی هێنـان بەشـەڕی یەكـەمی جیهـان ، كه ئەمـەش بـووه هـۆی ڕاگەیانـدنی ڕاگەیانـدنی سـەربەخۆیی وولاّتــەكانی ئۆكرانیـاو فیلەنداو پۆڵنداو ناوچەی بەلكان ، له كێشووەرەكەدا .

١٩١٨/٣/٣ مـۆركردنی پـەیمانی چـوارلایەنه لـه نێـوان ڕووسـیا لـه گـەڵ وولاّتـانی هاوپـەیمانی چـوارلایەن ئـەویش :– ئـەڵمانیا، نەمسا، مەجـەر، بوولگاریـا، توركیا – له ئەورووپای ڕۆژ ئاواو ڕۆژ هەڵاتدا .

كه دوای ئەوه كۆنگرەی چوارەمی سۆڤێتاتی ناكاوی بوو له هەموو ڕووسیا

لـە ٣/١٥ ی هـەمان سـاڵ پەسـەندی ئـەو ڕێکەووتنـەی کـرد ، کـە بـووە هـۆی زەرەر مەند بۆ ڕووسیا بە بەملکەچ بوونی بە بجێهێشتنی ناوچەی بەلکان و پۆلۆنیا و هەندێك لـە ڕووسـیای سـپی- بـیلا ڕووسـیا- بـۆ ژێـر دەسـەڵاتی نەمسا- مەجەر.

دوای ئەوە بە جیاکردنەوەی ئۆکرانیا لـە ڕووسـیای سـۆڤیەتی نـوێ ، بـۆ ژێـر چاودێری ئـەڵمانیا. هـەروا شـارەکانی قـارس و بـاتۆم و وردهـان لـە بـاکووری کوردستان کەووتە ژێر دەسەڵاتی تورکیای عوسمانیەکان لە هەرێمەکەدا .

١٩١٨/٣/٣ مۆرکردنی ڕێکەووتننامەی وەستاندنی شەڕلە نێوان ڕووسیای بەلشەفی نوێ و ، ئەلمانیاو نەمسای هاوپەیمانی ، کە بووە هۆی ئەوەی کە کۆمۆنیستەکان بەرابەرایەتی – لینین – توانیان دەسـەڵاتی تـەواوی خۆیـان بەسـەر ڕووسـیادا بگرن و دەسەڵاتی کرێکارو جووتیار بەناوی سۆڤیەتات بـچەسپێنێ لەهـەموو بوارەکاندا .

١٩١٨/٣/٥ مـۆرکردنی ڕێکەووتننامـە لـە نێـوان ڕووسـیا بەلـشەفی و، لەگـەڵ ئـەڵمانیا و نەمسا و مەجەرو بوولگاریـاو تورکیـا ، ئـەویش لـەپێناو دابەشـکردنی ناوچـە کوردیەکان لەکوردستان و ئۆکرانیا لە کێشووەرەکەدا .

١٩١٨/٣/٥ دوای سـەر کـووتنی شـۆڕشـی بەلـشەفی لـە ڕووسـیا شـاری مۆسـکۆی دێرینـی شارسـتانی و شـوونێنەواری ڕووسـیا کـرا بەپایتـەختی یەکیـەتی سـۆڤیەت ، لـەجیاتی شـاری پترسـبۆرگ و دوای ئـەوە نـاوی گـۆڕا بـۆ لینینگـراد لـە وولاتەکەدا

١٩١٨/٣/١٦ لەدایك بوونی ڕووناکبیرو ڕۆمـان نووسـی بەناوبانـگ – خـوان سـینۆ کـارلۆس بیرز ڕۆلف – لەگوندی فالیسکۆی وولاتی مەکسیك.

١٩١٨/٣/١٧ چـوونی نوێنـەرو سـەرکردەی مەسـیحیکان – مارشـەمعون – بـۆ کۆنەشـار ، بۆئەوەی چاوی بە سمکۆی شکاك بکـەوێت ، کـە ٥٠ چەکداری لەگەلدا بـوو ، لە ئەنجام سمکۆی شکاك مارشەمعونی کووشت و چەکدارەکانیشی بەدەسـتی چەکدارانی سمکۆ لـەناو بـران، کـە ئـەم کـاەش بـووە هـۆی دەسـت پێکردنـی شـەڕ لـە نێـوان ئاشـووریەکان و کـورد لـە شـاری ورمـێ لـە ڕۆژهـەلاتی کوردستان و بەردەوام بوو تاکوو ٣/٣٠ی هەمان ساڵ کە لـە ئـەنجام زیاتر لـە

٤٠٠ كەس لەنێوانیان كووژران لە هەرێمەكەدا .

١٩١٨/٣/٣١ كــارپێكردن بــەكاتی هاوینــە لەلایــەن ئیــدارەی حكوومــەتی وولاتــە یەكگرتووەكتنی ئەمەریكا پەسەند كراو كاری جێبەجێكردنی لە ئەمەریكا ئەنجام درا.

١٩١٨/٤/٧ هێزەكانی سووپای بەریتانیا لە هەوڵە بەردەوامەكانید پارێزگای كەركوكیان لە باشووری كوردستان داگیر كرد ، بە سەركردایەتی ژەنەرال – مارشال ویلسن– لە هەرێمەكەدا .

١٩١٨/٤/١٩ بلاوكردنــەوەی ڕاگەیانــدنێك بــەزمانی ئاشــووری و فارســی لەلایــەن – ئاغا پەترۆس– لەپێناو ئاشتبوونەوەی ئیسلامەكان و مەسیحیەكان لەپارێزگای ورمێ لە ڕۆژهەلاتی كوردستان.

١٩١٨/٤/٢٨ هێزەكانی سووپای بەریتانیا شارۆچكەی كفری و خوورماتوویان لەباشووری كوردســتان داگــیر كــردو بــەردەوام بــوون لــەپێناو كــۆنترۆلكردنی هــەموو كوردستان و دوایی ئێراق لە ناوچەكەدا .

١٩١٨/٥/٣ لــە دوای ڕەچــاوكردنی بەرژەوەندیــەكان مــۆركردنی پــەیمانی – بریــست – لینۆفسك – لەنێوان دەسەلاتی ڕووسیای بەلشەفی نوێ و ئەلمانیای نازی و نەمسا– مەژەر– ی هاوكار ئەنجامدرا ، كە كاردانەوەی ناهەمواری كردە سەر باری ڕۆژهەلات و باكووری كوردستان.

١٩١٨/٥/٧ داگیركردنــی شــاری كــەركووك و دەووروبــەری لەلایــەن هێزەكــانی ســوپای بــەریتانیا ، ئــەویش بــەهۆی گرنگــی و هەڵكەوتــەی جــووگراڤ ناوچــەكە ، كــە شــارێكی كوردســتانیەو ئــاواتی دوا ڕۆژی چــاوگە نەوتیــەكان بــووە لــە لایــەن وولاتانی داگیركەر لە هەرێمەكەدا .

١٩١٨/٥/٢٩ لە دوای كووشتنی بەتریارك مارشەمعون ، براكەی – پۆلس مارشەمعون – بە جێگرتنــەوەی بــووە بــەتریاریركی كەنیسەی ئاشــووریەكان لــە ڕۆژهــەلاتی كوردستان .

واتــە مەســیحیەكان بەگــشتی كــە ڕێــوورەسمی هــەلگری پلــەی بــەتریرك لــە كەنیــسەی – مــارت مریــەم – ئەنجامــدراو دوای ئــەوە ئــاوارە بووەكــان بــەرەو بــەرەی شــەڕ بەڕێكــەوتن لــە دەووروبــەری شــاری شــنۆی ڕۆژهــەلاتی كوردستان و بەردەوام بوونی شەڕەكە لە هەرێمەكەدا .

١٩١٨/٦/٢٣ دامەزراندنی كۆمەڵەی كورد لەشاری ئەستانەی ژێر دەسەلاتی تورك بەناوی

کوردستان تەعالی جەمعیەتی.

١٩١٨ /٦/٢٨ گـەلانی وولاتـی ئۆکرانیا سـەربەخۆیی خۆی بەدەرچوونی لـەژێر دەسـەلاتی داگیرکـەری ڕووسـیای بەلـشەفی نـوێ ڕاگەیانـد ، بـەلام دوای چـەندین شـەڕو پێکدادان لە نێوان هێزەکانی سـووپای ڕووسیا و ئۆکرانیـا ، لـە ئـەنجام تـوانرا ئۆکرانیا داگیر بکاتەوەو دوای ئەوە بووە کۆمارێك لـە پێکهاتـەی کۆمارەکـانی یەکیەتی سۆڤیەت لە کێشووەرەکەدا .

١٩١٨/٧/١٠ فرۆکەیـەکی سـەربازی بـەریتانیا لەشـاری ورمـێ لـە ڕۆژهـەلاتی کوردسـتان نیشتەوەو بە ئاشووریەکانی ڕاگەیانـد ، کـە بەهیوای پـشتیووانی بـەریتانیا نەبن لەپێناو بەرگری لێکردنیان لە هەرێمەکەدا .

١٩١٨/٧/١٣ گـەنجێکی تـورکی شـۆڤینی توونـدڕەوی ئیـسلامی ، بەگوللـە پاپـا یوحنـا پۆلیسی دووەمی پاپای فاتیکانی زامدار کرد.

١٩١٨/٧/١٦ کۆمـەلێك لـە شۆڕشـگێرە کۆمۆنیستە بەلـشەفیەکان لـە پترۆسـبۆرگ پـەلاماری بالەخانەی قەیسەری ڕووسیان داو – نیکۆلای دوەمیان– لـە ئـەنجام دەسـتگیر کرد لەگەلّ بنەمالەکەی لە شارەکەدا .

١٩١٨/٧/٢٥ لە ئاکامی شۆڕشـی ئۆکتبـەری بەلـشەفی لـە ڕووسیای قەیسەری ، کـە هـەموو نەتـەوەکان مـافی ئازادیـان لـەناو دەسـەلاتی سـۆڤیەت بە دەسـت هێنـا ، بـەلام تەنیا کورد نەبێت .

ئەویش بەپێی دەرچوونی یاسای بەماوەنەدان بەڕاوەدوونانی هیچ نەتەوەیـەك ، بەتایبـەتی نەتـەوەکانی لـە نـەژاد سـامیەکان ، ئـەویش بـەپێی بەلگـەنامـەی ئەنجوومەنی مفەوەزییەی گەل لەیەکیەتی سۆڤیەت لە وولاتەکەدا .

١٩١٨/٨/١ وەسـتانی شـەڕ لـە نێوان ئیسلامەکان و مەسیحیەکان لـەناو شـاری ورمـێ لـە ڕۆژهەلاتی کوردستان ، کە بووە هۆی کـوژرانی هـەزاران هـاوولاتی لـە هـەردوو لایــەنی شــەڕکەری ئیــسلامی و مەســیحی لەشــارەکەو دەووروبــەری لــە هەرێمەکەدا .

١٩١٨/٨/٣٠ ڕابـەرو سـەرکردەی کـورد ، شـێخ مـەحمودی حەفیـد ، لەلایـەن هێزەکـانی سووپای بەریتانیادەستگیر کراو بەرەو شاری کەرکوك ڕەوانـە کـرا.لـە هـەرێمی باشووری کوردستان .

١٩١٨/٩/٥ لـە دایـك بـوونی مێژوونووسـی بەناوبانگی کـاری ئەمـەریکاو ڕاگـری تیئـۆری بەڕێوەبەردن لە شاری گیسنکۆرت لە وویلایەتی دبلاوێر... شایانی باسە ئەم

مرۆڤە هەر لە تەمەنی ٧ساڵیدا کە کاتێك باوکی پەرتووکی ویلبر رفنیسکی بۆ دەکرێت، ئارەزووی دەچێتە سەر خووێندنەوەی مێژوو. لە ساڵی ١٩٤٠ زانکـۆی هارڤـارد دەبرێـت و بروانامـەی دکتـۆرا لـەبواری مێـژووی کـار وەردەگرێت. لە رۆژانی جەنگی دووەمی جیهانی کار لەشێکردنەوەی وێنە هەواڵگرییەکان بۆ هێزی دەریایی وولاتەکەی دەکات.

دوای ئـەوە لەهـەر یـەك لـە پـەیمانگای ماساشۆسـتی تـەکنیکی و زانکۆکـانی جـۆن هـۆبکنز و هارڤـارد وانـەی مێـژوو دەڵێتـەوە، بـەهۆی شـارەزایی و پێـشکەش کردنـی پـەرتووکی بـەپێزیش هـەردوو خـەلاتی پۆلیـستزەرو بانگرۆفتی

پـێ دەبەخـشرێ، ئـەم کەسـایەتیە لـە کارەکـانی بـەردەوام دەبێـت لـە سـەر نووسینەکانی تاکوو لـــــە ٢٠٠٧/٥/٩ ماڵئـاوایی لەگـەل و نیشتیمانەکەی دەکات لە وولاتەکەیدا.

١٩١٨/٩/١١ راگرتنی بەکارهێنانی مینرێژو تۆرەکـانی تـەلی کارەبـایی – ئەسلاك شائك – بە پێی بەندی/٨ لـە رێکەووتنامـەی ئاگربەسـتی مۆرکراو لـە جیهان، لـە دوای جـەنگی دووەم و دەسـتگیر بـوونی ئەلمانـەکان بـەم بریـارە لـە دوای جـەنگی دووەمی جیهان. کە ٥٢٠ میلۆن مین چاندراو بووە لەلایەن ئـەلمانیاو یەکیـەتی سـۆڤیەت و ئەمـەریکا، کـە خـۆی لـە ١٦ جـۆر لـەمینی تانـك و ١٠ جـۆریش لەمینی دژە کەسی دروست کرابوون.

١٩١٨/٩/١٥ هێزەکانی سووپای ئەڵمانیا بەهۆی هێرشەکانی سووپای هاوپەیمانان وردە وردە پاشەکشەیان لەناوچەکانی شەڕدا کرد لە ناوچەکەو بەرەو وولاتەکەیان گەڕانەوە .

١٩١٨/١٠/١ کۆمەڵەی عەرەبی نەتەوەیی بەسەرکردایەتی حوسێن شـەریف هێرشیان کردە سـەر هێزەکـانی سـووپای ئیمپراتۆریـەتی عوسمـانی، لـە ئـەنجام بیابـان و دوورگەی عەرەبیان ڕزگار کرد .

دوای جـەنگی یەکـەمی جیهـانی بەدەسـت پێکردنـی قۆنـاخی سـێیەمی بەعەرەبکردن و داگیر کردنی خاکی گەلانی دیکە ، بەتایبەتی خاکی گەلی کورد لە ڕۆژئاواو باشووری کوردستان لە ناوچەکەدا .

١٩١٨/١٠/٢ نووێنـەرانی حکوومـەتی بـەریتانیا و دەسـەلاتی عوسمـانی رێکـەووتنی خۆبەدەسـتەوە دانـی کـەل و پـەلی هێزەکـانی سـووپای عوسمـانی و دام و

دەزگاکانی مۆرکرا بە بەجیهێلانی، ئەویش بە مۆرکردنی ئەو رێکەووتنە لەسەر پشتی باخیرەی بەریتانیا- ئەگاممنون- بوو لەبەنداوی مۆردوس دا .
لەدوورگەی لیخوونی ئەمیرالی بەریتانی نووسراوەو لە مادە /١٦ی رێکەووتنەکەدا هاتبوو .
ئەویش بە دەرچوونی هەموو هێزەکانی تورك لە لوبنانو سووریاو فەلەستینو ئێراقو حیجازو عیرەو یەمەن ، هەروا لە سەر کووێتو ئیماراتی عەرەبی بکشێتەوە بەرەو ئەو ناوچانەی کە بۆی دیاریکراوە بەپێی رێکەوتنەکە لە کێشووەرەکەدا .

١٩١٨/١٠/٥ دامەزراندنی دەووڵەتی سووریا لەلایەن ئەمیر فەیسەڵی سعوودی بەپشتیووانی بەریتانیاو هاوپەیمانان .
ئەویش لەسەر خاکی گەلانی سووریا بەتایبەتی گەلی کورد لە رۆژئاوای کوردستان ، کە زیاتر ١٧٠٠٠هەزار کیلۆمەتر چوارگۆشە لە خاکی کوردستان بووە ، گەرچی سووریاو سنووری ئێستای خاکی عەرەب نیەو نەبووە بەهیچ جۆرێك لەو ناوچەیەدا ، بەلکوو بەرێگەی فتووحاتی ئیسلامیو بەزەبری شمشێرو بەعەرەبکردنو داگیر کردن بۆتە وولاتی عەرەب لە ناوچەکەدا.
ئەویش بە دەرکردنو دەربەدەرکردنی گەلانی وولاتەکە ، کە کوردو ئەرمەنو ئاشووریو ئارامی بوون لە ناوچەکەدا .
نەوەی داهاتوی کورد دەبێ هەولی گەڕاندنەوەی دووبارە بوونەوەی مێژوو بدەن بەگەڕاندنەوەی عەرەب بۆدوورگەی بیابانی عەرەبی ...؟ .... !..

١٩١٨/١٠/٧ لە هەوڵێکی کەسایەتی شۆڕشگێری ناوداری کورد لە باکوری کوردستان – ئەحمــەد ســوورەیا بــەدرخان – ســـکالایەکی بـــەناوی کۆمەڵـــە ئاراســـتەی هاوپــەیمانان کـــرد ، لەپێناو دامەزراندنی کیانی کورد لە بـــاکووری کوردســـتان ، ئـــەویش بەجیابوونـــەوەی لـــەژێر دەســـەڵاتی دەوڵەتی تورکیا کەخاك کە نەتەوە لە هەرێمەکەدا .

١٩١٨/١٠/٧ لـە دوای کۆتـایی هـاتنی جـەنگی یەکـەمی جیهـان لـە هـەموو بـوارە کانیـدا لـە لایـەن شـەرکەران ، ئەویش بە هـەڵاتنی هێزەکانی سـووپای ئیمپراتۆریـەتی عوسمانی و هاوپەیمانییەتی لە گەڵ ئەڵمانیا ، بووە هۆی مۆرکردنی پەیمانی دابەشـکردنی ناوچـەگەری لـە ناوچـەو هەرێمـە جیـا جیاکـان لـە کێـشوەری ئاسیادا .

ئەویش بەکشانەوەی والی عوسمانی لە شاری سەنعای پایتەختی ئێستای یەمەن – محەمەد نەدیم – لەگەڵ هێزەکانی لەرێگای شاری عەدەن ، کە ئیمام یـەحیا دەسـەڵاتی تـەواوی لـەو ناوچـانە گرتـە دەسـت کـە لـەژێر دەسـەڵاتی عوسمانیدا بوو، بە شەکەی دیکەی یەمەن لە ژێر دەسەڵاتی بەریتانیا مایەوە لە ناوچەکەدا .

١٩١٨/١٠/١١ ســەرۆکی ئەمــەریکا – ویلـسن– لـە وتـارێکی بایەخـداری بەســەر هــەموو وڵاتـانی جیهـان بڵاوکـردەوە کـە لـە ١٤ خـاڵ پێکهـاتبوو بـۆ داننـان بـەمافی نەتـەوەیی و سـەربەخۆییان ، لەهـەر وڵاتێـك کـە دەچەوسـێرێنەوە لەلایـەن دەسـەڵاتدارانی ئـەو وڵاتـەی کـە لـە فرە نەتـەوەیی پێـك هـاتوون بـە تایبـەتی تورکیا.

١٩١٨/١٠/١١ حکوومــەتی ئــەو کــاتی ڕۆمانیــا بــووە خــاوەن زۆرتــرین ڕووبــەری خــاك و گەورەترین دەوڵەتی بەلکان ، بەهۆی لکاندنی چەندین ناوچەی ڕووسیا بەو

وولاّتـەدا ، وەك :- بسئارابیاو ، هـەرێمی ترانـسلفانیاو هـەرێمی پۆكڤینـاو ، ناوچەی باتانی مەژەریەكان ، كە بەر دابەشكردن كەووتن ، لە نێوان ڕۆمانیاو وولاّتی یۆگسلاڤیا ، بەپێی باری گوونجاوی نێوودەوولّەتیو هەرێمەكاندا .

١٩١٨/١٠/١٢ لــە دوای كۆتــایی هـــاتنی جـــەنگی یەكـــەمی جیهـــانو هـەرەس پـێ هێنـانی ئیمپراتۆریـــــەتی- نەمسا ، مەژەر - كە ئـەویش بـووە هـۆی ئـەوەی كـە هـەرێمی تـشیك سـەربەخۆیی خـۆی ڕاگەیـەنێ وەك دەوولّەتێكی نێوودەوولّەت لە ناوچەی بەلكان و جیهاندا .

دوای ئەوە لە ١٩١٨/١١/١٤ ، تشیكیەكان لە گەلّ سلۆڤاكیكان لە شـاری بـراگ یەككگرتووی وولاّتەكەیان ڕاگەیاند و ئەم یەككگرتنـە بەردوام بوو تـا ١٩٩٢/٤/١ ، بـە دووبـارە بوونــەوەی ســەر بــەخۆیی وەك وولاّتێكــی نێوودەوولّــەتی لــە هەرێمەكەو جیهاندا ، بەناوی كۆماری تشیك . كە پایتەختەكەی ناوی- براگ - ەو ژمارەی دانیشتووانەكەی، ١,٥٨٥,٠٠٠ملیۆن كەسە.

هەروا ژمارەی دانیشتووانی وولاّتەكەی ، ١١,٤٣٦,٠٠٠ ملیـۆن كەسـە. هـەروا ڕووبــەری وولاّتەكـەی ، ٧٨,٨٦٤ كیلـۆ مـەتر چـوار گۆشــەیە. هـەروا چـڕی دانیشتووانەكەی ، ٢٧٦ كەس لە یەك میل چوارگۆشـەدا . هـەروا نـژادەكانی ، تشیكیەكان ٩٥٪ . سلۆڤاك٥٪ . لە وولاّتەكەدا .

١٩١٨/١٠/١٥ شـەریف پاشـا نامەیـەكی ئاراستـەی - سـێرپێرس كـۆكس بـە ژمـارە/٣ - لـە میزۆبۆتامیا كرد. كە تێیدا هاتووە :-

بـۆ - سـێرپێرس کـۆکس - لـە میزۆبۆتامیا - لـە وەتـای دوای چاوپێکەووتنمان لە مارسیلیا ، چـــــەندین رووداری نــــویّ سـەریانهەڵداوەو ئێـستا ئێمـە لـەدوای تاوانــەکانی سـەرکردە تورکە لاوەکان کەوتوونەتە ناو قۆنـاخێکی نـوێی سـتراتیژێك وسیاسـی، ئـەو رق و کینەیـەی کــــە ئەرمەنیـــــەکان و کـــــوردەکان لـــە یـــەك جیادەکاتەوە، لە دەوورانـی رژێمـی حەمیدییە، هـەروا لـەدەووورانی کۆمیتـەی ئیتیحـاد و تـەرەقی لـە سـونگەی دەسیسەی تـەواوو سیاسـیەوە سەرچـاوە دەگرن و بەهیچ لکۆجیّ سونگەی ئاینی و نەتەوەییان نییە لە هەرێمەکەدا .

ئـەمرۆ هـەردوو نەتـەوە کـە بە زۆر ناچارکراون لەتاقـە یـەك ناوچـەدا بـژین وا پێویست دەکات ئاشت بکرێنەوە، موسلمانەکان کە زۆربەی رەها پێك دێنن و ئەرمەنییەکان کە کەمینەیـەکی بەرچاون , ئەوانـەی کـە مـاق هاویـەکیان هەیـە.

بۆ پێداگرتنم لەسەر هەقی هاونیشتیمانیەکانم و بەهەمان شێووە لە سـەر مـاق ئەرمەنیەکان، چ ئەوان و چ لە لایەن حکوومەتەکانی بەریتانیاو فەرەنسا.

من باوەش بۆ وەدیهێنانی بناخەکانی ئاشتبوونەوەو رێکەووتن دەکەمـەوە لـە ستاتووی نەتەوەیی دوا رۆژیاندا. بۆ ئـەوەی هەوڵدانەکەم بەچاکی بەئەنجام بگەیـەنم، پێویـستە دەسـتەو جیّ کۆمیتەیـەك لـە پـاریس و لەنـدەن پێکـەوە بنریّ، جا ئەگـەر لـە سونگەی بیّ کاتی ئێوە نـەتان توانی بـەتالوو کە چەند ئەلیکاریم بۆ رەوانە بکەن.

مـن تـا ئـەوکات ئۆفیـسەکانی خـۆم لـە لەنـدەن و پـاریس تـەرخان دەکـەم بـۆ داکـۆکیکردن لـە بەرژەوەندیـە زۆر گـرنگ و رەوایـەکانی هاونیـشتیمانیان و هاوئاینـەکانم. کۆمیتـەی ناوەنـدی کـە دەبـیّ دەسـتەو جیّ لـە ژێـر چـاودێری حکوومـەتی خاوەنـد شـکۆی بـەریتانی سـەرەتا لـە میزۆبۆتامیـا و دواتـر لـە

کوردستان پێك بێ. دەتوانێ لەمبارەیەوە لەرێنوێنیەکانی و دەسەڵاتی تەواوی خۆی خەبەردارم بکاتەوە.

سەرچاوە:-گۆڤاری k21 ژمارە/١ ساڵی ٢٠٠٨.

١٩١٨/١٠/١٥ شەریف پاشا خەندان نامەیەکی ئاراستەی باڵیۆزی بەریتانیا – لۆرد دەربی – کرد بە... بە ژمارە/١ کە تێیدا هاتووە :–

باڵیۆزی بەرێز :– بێ کۆتایی منەتباری ئێوە دەبم ئەگەر بفەرموون ئەم راگەیەنراوەم کە هاوپێچە لەگەڵ ئەم نامەیە ناردووە لەبەر بەپەلەیی ئەو بابەتەی کە تێیدا باسم کردووە بە کالیۆگرام بیگەننە دەست – سێرپێرس کۆکس – من تەواو خۆشنوود بووم بە و پێشووازییەی کە سیادەتی بەرێزتان ئەو رۆژە لێتان کردم و بەو هیوایەی کە سیادەتتان لە یەکێك لەم رۆژانە بە دوورو درێژی چاوپێکەوتنمان بکات. بۆ ئەوەی لە سەر بابەت گەلێك قسە بکەم کە بەشێوەیەکی تایبەتی جێگەی بایەخی حکوومەتی خاوەند شکۆی بەریتانی دەبێ و بە لوتفەوە ئەم هەلە دەقۆزمەوە تا دەربرینی زۆر بەرزی و رێزلێنانی خۆمتان پێشکەش بکەم.

سەرچاوە:- k21 ژمارە/١ ساڵی ٢٠٠٨.

١٩١٨/١٠/٢٠ لەدایك بوونی شاعیرو ئەدیب و رووناکبیری نەتەوەیی – یونس رەئوف مەحمود – ناسراو بە– دلدار– لە شارۆچکەی شاعران و ئەدیبان و رۆشنبیرانی شاری کۆیسنجق لە پارێزگای هەولێر لە باشووری کوردستان .

لەخێزانێکی ئاینی شارەکەو و خاوەن سروودی –ئەی رەقیب هەرماوە قەمی کورد– کەبۆتە سروودێکی نەتەوەیی ونیتشتیمانی رەسەن لە سەر ئاستی کوردستان ، هەروا کاتی کردنەوەی رادیۆو تەلەفزیۆنە ناوخۆیی و ئاسمانیەکانی کورد بەو سرووده دەست بە پەخشەکانیان دەکەن لە کوردستان بەرەو جیهاندا .

١٩١٨/١٠/٢٠ مۆرکردنی رێکەوتنامەی – مۆدرۆس– لەلایەن هاوپەیمانان و ووڵاتانی بەرەو دورستکردن ، کە بەشێوەکی فەرمی کۆتایی بەجەنگی یەکەمی جیهانی هێنرا ، لە نێوان بەریتانیاو ئیمپراتۆریەتی عوسمانیدا ، ئەویش بە کشانەوەی هێزەکانی سووپای عوسمانی لەپارێزگای موسڵ بەتەواوی ، کە ئەو کات دانیشتووانی پارێزگای مووسڵ ٨٠٪ ی کورد بوون ، بە تایبەتی لە

باکوورو باکووری رۆژئاواو رۆژهەلاتی مەلبەندی شاری مووسل ، کە ئەو ناوچانەی بەشێکن لە هەرێمی باشووری کوردستاندا .

١٩١٨/١٠/٢٥ لە دوای داگیر کردنی شاری کەرکوك و دەوورووبەری لە باشووری کوردستان ، لەلایەن هێزەکانی سووپای بەریتانیا ، ئەویش بەبەرز کردنەوەی ئالای بەریتانیا لەسەر باڵەخانەو جیگا بەرزو بەڕێووەبەرایەتیەکانی شاری کەرکوك لە هەرێمەکەدا .

١٩١٨/١٠/٢٩ وولاتی کرواتیا سەربەخۆیی خۆی ڕاگەیاند ، دوای ئەوە چووە ناو یەکیەتی لەگەڵ چیای ڕەش – جبل الاسود– دوای ئەوە لەساڵی١٩٢٩ لەگەڵ هەرێمەکانی دیکەی ناوچەکە یەکیان گرت وەك هەرێمی سربیاو سلۆڤینیاو کروات و دەوولەتی یۆگسلاڤیایان پێك هێنا بە ناوی یەکگرتووی یۆگسلاڤیا لە هەرێمەکەدا هەروا ئەم یەکگرتنە بەردوام بوو تا لە ١٩٩١/٦/١٥ دووبارە سەربەخیی تەواوی خۆیان ڕاگەیاند ، وەك دەوولەتێکی سەربەخۆی نێوودەوولەتی ، بەناوی کۆماری کرواتیا لە هەرێمەکەدا . کە پایتەختەکەی ناوی –شیزینۆ– یە و ژمارەی دانیشتووانەکەی ،٦٧٥,٠٠٠ هەزار کەسە.

هەروا ژمارەی دانیشتووانی وولاتەکەی ، ٤,٨٦٠,٠٠٠ ملیۆن کەسە . هەروا ڕووبەری وولاتەکەی ، ٢٣,٧٠٠ کیلۆ مەتر چوار گۆشەیە . هەروا چڕی دانیشتووانەکەی ، ٣٧٤ کەس لە یەك میل چوار گۆشەدا . هەروا نژادەکانی ، مۆڵدافی و رۆمانی ٦٥٪. ئۆکرانی ١٤٪. ڕووسی ١٣٪. قەوقازی ١,٤٪ . لە وولاتەکەدا.

<u>تێبینی :–</u> بۆ زانیاری زیاتر دەتوانی بگەڕێیتەوە سەر کتێبی ئینسکلۆپیدیای

کوردستان و وولاّتانی جیهان .

١٩١٨/١٠/٣٠ لە دوای مۆرکردنی رێکەووتننامەی مۆدرۆس و کۆتایی هاتن بە دەسەلاّتی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی و خۆبەدەستەوەدان ، کاردانەوەی خراپی کردە سەر کوردو کوردستان ، دوای ئەوە بووە هۆی دابەش کردنی کوردو نیشتمانەکەی ، لەسەر چوار دەووڵەتی دورستکراو ئەویش: - ئێراق و ، ئێران و ، تورکیا و ، سووریاو ، بەشێکیش بەر کۆماری ئەرمینیای سۆڤیەت کەووت لەم لەت لەتکردنەدا ، کە پارێزگای یەریڤان و دەووروبەریەتی لە کێشووەرەکەدا ، بە هەرێمەکانی نەخچەوان و شوشەو چەندین ناوچەی دیکە لەخاکی کوردستاندا.

**تێبینی:- تورکیاو ئێران ، هەردوو وولاّت داگیر کەری خاکی کوردستانن بەر لەو پاچە پارچەکردنەدا ، ئەویش لە دوای مۆرکردنی رێکەوتننامە زەهاو لە ساڵی ١٦٣٩ ، لە دوای شەڕی حالیدێران. بەلاّم ئێراق و سووریا و پارێزگای یەریڤان و دەووروبەری لە دوای کۆتایی جەنگی یەکەمی جیهان پێیان لکێندراوە لە کێشووەرەکەدا .**

١٩١٨/١٠/٣١ مۆرکردنی رێکەووتننامەی وەستانی شەڕ لە نێوان هاوپەیمانان لەگەڵ ئیمپراتۆریەتی عوسمانیدا ، ئەمەش بووە هۆی چالاکی نەتەوە پەروەری کورد- کۆمەڵەی تەعالی کوردستان- سەر لەنوێ دەستی کرد بە چالاکیەکانی خۆی لەباکووری کوردستان .

١٩١٨/١٠/٣١ پاش دانووسانێکی چڕ لەنێوان نووێنەرانی تورك و بەریتانیا و دوای ئەوە لەلایەن هاوپەیمانانەوە ، کە - ئەدمیرال کارلورت- و نووێنەرانی تورك - حوسێن ڕەئوف بەگ و ، ڕەشاد حکمەت بەگ و، سەعدوللابەگ - بەلگەنامەی فەرمی ئاگر بەستیان لەناو کەشتی بەریتانیا- ئاگاممنون- لە بەندەری مۆدرۆس ، لە دەریای ئیجە مۆرکرد . کەبە فەرمی جەنگ لە ڕۆژهەلاّتی ناوەراست کۆتایی هات لە کێشووەرەکەدا .

١٩١٨/١١/١ قەزای هەولێر لە هەرێمی باشووری کوردستان ، کە سەر بە وویلایەتی مووسڵ بوو ، لە ژێر ئیمپراتۆریەتی دەسەلاّتی عوسمانیدا ، بڕیاری بۆ درا بە بوونی بە پارێزگار و - ئەحمەدە فەندی عوسمان - بووە یەکەم پارێزگاری هەولێر ، کە قەزاکانی کۆیەو رواندزو مەخموری پێووە لکێنرا .

١٩١٨/١١/١ دادوەرو نووێنـەری بـەریتانیا لـەئێراق – میجـەر نوئیـل – کـە لـە لایـەن سێر ئارنولد ویلسنی فەرماندارى سەربازی بەریتانیا لە بەغدا بەرەو دورستکردنی بارو دۆخێکی لەبار سەردانی شاری سلێمانی کرد ، لە باشووری کوردستان و ، لـە بەردەرگای سـەرای سلێمانی کۆبوونـەوەی بەزانا ئاینیو شێخەکانو شێخ مـەحمودی حەفیـد کـرد ، بـەناوی نووێنـەری بـەریتانیا ، لـە وتارەکـەی شێخ مەحمودی بەدادوەری سلێمانی دانا.

لە هـەمان ڕۆژ سـەردانی شـاری کـەرکوکی کـرد ، بـەهۆی بـوونی بـە دادوەری گشتی بەریتانیا لە پارێزگای کەرکوك ، کە لەو کاتە لەزێی بچوك تاکوو دیالـە لە ڕۆژهەلاتو تاکوو سنووری تورکیاو ئێرانی دەگرتە خۆ لە هەرێمەکەدا .

بە هەمان شێووە کۆبوونـەوەی لەگـەڵ کەسایەتیو سـەرەك هـۆزە کوردیـەکان ئەنجامـدا لەشـاری کـەرکوكو لەوتارەکـەیـدا ڕایگەیانـد کـە بـەریتانیا نیـازی دامەزراندنی دەوولەتێکی کورد یە لە هەرێمەکەدا .... بەڵام کورد .... ؟.

١٩١٨/١١/٤ ڕژێمی تـورك کەوتـە ڕاگەیانـدن ، بـە نـاوی ئـەوەی ، کـە وویلایـەتی مووسـڵ بەشێکە لـە تورکیای داهـاتوودا ، کەچـی زۆربـەی دانیشتووانی وویلایـەتی موسـل کـوردنو داواکـەیان وای کـرد، کـە دەسـت بکـەن بـە کـشانەوە لـە وویلایەتی مووسڵ وردە وردە تاکوو کۆتایی بەدەسـەلاتەکەی لە وویلایەتەکە هات لە ناوچەکەدا .

١٩١٨/١١/٥ هێزەکانی سووپای بەریتانیا لە دوای کشانەوەی هێزەکانی سووپای تورك لـە وویلایـەتی مووسـڵ ، بەتایبـەتی لـە شـاری مووسـڵ گەیشتنە نـاو شـارەکە . بەمـەش دەسـەلاتی تـەواوی بەسـەر ئێراقـدا سـەپاند لەبـەر مەترسـی ڕاپەڕینـەکانی ناوچـەی بـارزانو دەووروبـەری لـە هـەرێمی باشـووری کوردستان .

هـەر بـەو هۆکـارەش لـە بڕیارێکیـدا ناوچـەی بـارزانی لەقـەزای ئـاکرێ جیـاکردەووەو بـە قـەزای ڕوانـدزی لکانـد ، کـە پـێش ئـەو هـەنگاوە سـەر بـە پارێزگای موسل بوو لە هەرێمەکەدا .

١٩١٨/١١/٦ مەندووبی سامی فەرەنسا لە سووریاو ئەرمینیا - مسیۆ جۆرج بیکۆ- لە بەندەری لوبنان هاتە خوارێ ، کە لەو کات ترسی زیاتر لە بەریتانیا هەبوو ، کە نیازەکانی بەریتانیا بەهاندانی لایەنە رامیاریو نەتەوەیەکان دژی فەرەنسا بووە . کە لەو کات سەرکردەکانی سووپای بەریتانیا لە سووریا سەرقاڵی کۆبوونەوە هەمەلایەنەکانی ناوچەکە بوون لە پێناو جێبەجێکردنی نەخشەکانیان .

١٩١٨/١١/٧ نووسەرو مێژوونووسی فەرەنسیو نووێنەری فەرەنسا لە رۆژهەلاتی ناوەراستدا - باسیلی نیکتین - نامەیەکی ئاراستەی لێژنەی داواکاری کرد . لەبارەی کێشەی کوردو گرنگی دان بە چارەکردنی مافەکانی لە کوردستان . بەلام نامەکەو بروسکەکە تەنیا بۆتە بەلگەیەکی رەسمی مێژوویی لەئەرشیفەکاندا .

١٩١٨/١١/٧ ژەنەراڵ شەریف پاشای خەندان نامەی دووەمی ئاراستەی - لۆرد رۆبێرت سێسیل- لە لەندەنی پایتەختی بەریتانیا کردووە ئەمەش دەقی نامەکەیە:-شەرەفی ئەوەم هەیە کە بۆ ئاگاداری سێنسۆرتان چەند لێکدانەوەیەك کە بەمێشکمدا هاتووە بۆ تاوتوێکردنتان راگەیەنم کە جەنابتان حوکم لەسەر ئەوە دەدەن، کە لە بەرژەوەندی هەردوو وولاتماندا کە بەگوێرەی من بە هەمان شێوە لە بەرژەوەندی رۆژهەلات و مرۆڤایەتی و ئاشتی دوا رۆژیش دا بێت.

گەنجە تورکەکان خۆیان وا ببیننەوە وەك ناچاربن پەنا ببەنە بەر تەلەکەیەکی نوێ بۆ سەر لە نوێ فریووە دانی راوێژکار - سەرۆك کۆمارەکان - هاوپەیمانان بەوەی بروایان پێبیەنن کە ئەوەی کۆنستانتینۆپل روویدا ئەوە گۆرانکاریەکی رامیاری بوو .

دوای هەرەس هێنانی - بوولگارستان - تەلعەت پاشا وای دەبینی کە نۆرەی هەرەس هێنانی تورکیاش هاتووە و باوەریشی وابوو کە وریایی لەوە دایە خۆی لە شانۆی رووداوەکان بکێشێتەوە بۆ ئەوەی جلەوی حکوومەتی نهێنی بە دەستەوە بگرێ، بەوەی کە بە رەسمی ژەنەراڵ عزەت پاشای ئەلمانخوازی ناسراو جێگەی بگرێتەوە کە سەر بە دووەم رێزبەندی جەمعیەتی ئتحادو تەرەقیە وەك ئالیکارە سەرسەخت و وەحشیەکانی

ئتحادیەكانی وەك – فەتحی بەگ، فەخری بەگ، جواد بـەگ و رەئووف بـەگ – هتد.

ئـەوە تـەواو جێگـەی ئەسـەفە كـەوا هاوپـەیمانان هـەول و مەرجـەكانی ئـاگر بەستیان لـە گـەل سـەرەرۆ تاوانكارەكـان كـە حكوومـەتی رەسمـی توركیـا پێـك دهێنن مۆركرد، كە لە پـەنای ئـەم حكوومەتـەوە سـەرۆك گـەلێكی شـاراوە هـەن كە بۆ حسابی حكوومەت كار دەكـەن بە دەستكردن بە وتوویێژ لـە گـەلٌ ئـەم كۆمەڵـە جینایتكارەكـە لـە وەتـای دەسـاڵ دەبـێ هـەر سـەروەت و ســـــامان دەخەنـە سـەریەك، ئێـوە پێتـان وانیـە كـەوا هاوپەیمانـەكان بیـچمێكی خـراپ نیشان دەدەن لە بەرامبەر هەموو عوسمانیكان بەبێ جیاوازی رەگەز كە ئـەوان ئەوەندە تەلاوی ئەو حكوومەتە نەفرەتلێكراوە یان چەشتووە... ؟

بۆ هێنانەكایەی عەدالەت وپرنسیپەكانی یاســـا، دەبێ سەرەتا دەست بكرێ بـە جیاكردنـەوەی بـەر پرسـیاریەتیەكان لـە وانـەی كـە رێزیـان لـە یاســـــا نـەگرتووە...؟ تاوانـەكانی ئەلمانـــــیا، بوولگارسـتان وكـووژرانی چـەند سەربازێكی فەرەنسی لە شەقامەكانی شاری ئەسـینا دەخـەنە پالٌ بنەماڵـەی – هۆهێنزیـۆلێن – پاشـا فیردینـاد – و – پاشـا كۆنـستانتین – لـە كاتێكدا كـە ئەوانـەی لـە كۆمیتـەی ئتحـادو تـەرەقی كـە ناسـراوبوون لـە بەرامبـەر نەتـەوەی عوسمانی كەمتر تاوانبارتر نەبــوون.

ئەم كۆمەلە شوومەیە بەردەوام بوو لـەوەی تـاوانی هـەرە قێزەون لـە بەرامبـەر عوسمانیـە لیبرالـەكان، لایـەنگرانی ئەنگلستان وفەرەنسا لـە دژی دورزەكـان، ئـەلبانیكان، عەرەبەكان و ئەرمـە نیـەكان دا بكـات. یـەكێك لـەو تاوانانـەی كـە كـەمتر تۆقێنـەرتر نـبن،... ئایـا ئـەوە نییـە كـە بـە فێـلٌ و تەڵكـە، توركیایـان خســـــتە نـاو جەنگێك بـە تـەك ئیمپراتۆریـە ناوەندەكان، بووە ترسـناكترین ئاستەنگیان بۆ هاوپەیمانەكان دروستكرد هەر بۆ ئەوەی تێنـوێتی خۆیـان لـە دەسەلاٌتگیری و لە زێری ئەلمان تێر بكەن...؟.

پـێم وایـە دەبـێ بـە دەنگـی بـەرز ئـەوە راگەیـەنرێ، كـەوا توركیـا ئـارامی و ئاسـایش بەخۆیـەوە نـاگرێ تـا وەكـوو كۆمیتـەی ئتحـادو تـەرەقی بمێنـێ و تاوەكوو مۆنتالیتەی شوومی لە وولاٌت قەلاٌچۆ نـەكرێت، واتـە كـردەی هێـز دژ بـە بێ هێزەكـان لـە بەرامبەرگـەل بـە پێـچەوانەیە پرەنسیپەكانی بـەرێز سـەرۆك

کۆمـاری ئەمـەریکا – ویلـسن– گوایـە هاوپەیمانـەکان لـە رووی ئەخلاقیـەوە بەرپرسـیارن وەك چـۆن کـاتی خـۆی گەنجـە تورکـەکانیان دنـەدەدا، ویـرای ئەوەی کە من لە وەتای نۆسالّ دەبێ راستقینەیانم پێناساندوون.

بۆ ئـەوەی ئاشـتی بـالّ بەسـەر تورکیـادا بکێـشێ دابەشـکردنێکی عادیلانـەی خاکەکەی دەبێ بە گوویرەی زۆرینـەی ئـەو نەتەوانـەی لـە تورکیا دان دابـەش بکرێ و، ئەمەش تەواو بە رێـز گرتن لـە مافـە یەکسانیەکانی کەمینـە نەتـەوە ییەکانی ئاشتەواییکردنەوەی گشتی دەبێ لـە نێوان هـەموو پێك هاتـەکانی وولاّتدا بکرێ و دەبێ متمانەی هەمووان لە سـەر بنچینەی مـاف و ئەرکەکاندا بچەسپێ.

بۆ گەیشتن بەم ئەنجامە تەندروست دەبێ پێش هەموو شتێك بە شێووەیەکی زۆر توونـد بـەر پرسـانی کۆمیتـەی ئتحـادو تـەرەقی، تاقـە بـەر پرسـیاری ویـرا نبـوونی ئیمپراتۆریـەتی عوسمـانی و هـەموو ئـەو تاوانـە هەمـە چەشـنانەی لـە دەوورانی ئەواندا لە تورکیادا کراون، سزا بدرێن.

ئـا بـەم شـێووەیە گـەلی عوسمـانی بـەبێ جیـاوازی رەگـەز و ئـایین هەناسـەی متمانــەو ئاسـایش دەدات. بـەم شـێووەیە سـولتان چـیتر کۆیلـەی بانـدێکی سـەرەرۆی تاوانکـار نابێـت و دەتـوانی بـە ئـازادی و پیـاوانی دەوولّـەت هەلبـژێری هۆشـیار بـەو مەترسـیەی کـە لـە ژێـر دەسـەلاّتی شـاراوەی ئـەم بـەر پرسـانەی ئێـستەیدا هەمیـشە یـاخی دەبـێ بـۆ ریفـرۆم، بـۆ ئـازادی و بـۆ دادپـەروەری کـە هـەموو خـەلك تینوویـەتی، بـەم شـێووەیە سـولتان گـەرەنتی دەوورانێکی نوێ و بووژاندنەوەی وولاّت دەدات.

سەرچـاوە:– ئەرشـیێفی وەزارەتـــی دەرەوەی بـــەریتانیا. دۆســـیەی ژمـــارە/ FO/٣٧١/٣٣٩٨

١٩١٨/١١/٧ بـەریتانیای مـەزن و فەرەنـسا بلاّوکراوەیـەکی هاوبەشـیان ڕاگەیانـدو بـەڵێنی سەربەسـتیان بەگـەلانی ژێردەسـالاّتی عوسمانیـدا بـەو مەرجـەی بـە ئـازادی چارەنووسی داهاتووی خۆیان دیای بکەن ، لە ناوژەو هەرێمە جیا جیاکاندا .

١٩١٨/١١/٧ سـەرکردەی هێزەکـانی سـووپای بـەریتانیا ژەنـەرال– مارشـال– جـاڕی سـووپاکەی داو شـاری موسـلی بەتـەواوی داگیر کـرد ، لـە دوای مـۆرکردنی پەیمانی مۆدروس. لە نێوان هاوپەیماناندا .

١٩١٨ /١١/٨ لە دوای داگیر کردنی سەرکردەی هێزەکـانی سـووپای بـەریتانیا ، شـاری مووسـڵیان داگیر کـردو - کۆلۆنێـــل لیـــچمان -کـــرا بـــە فەرمانـدی گـشتی لـە پارێزگـای مووسڵ .
کـە شـارەکانی هـەولێرو دهـۆك و دەووروبەریشی دەگرتـە خۆ لـەو کـــات لـــە هـــەرێمی باشـــووری کوردستان .

١٩١٨/١١/١١ لێژنـەی داواکـاری لـە وولاّتـی فـارس -ئەمـەریکی بروسـکەیەکی ئاراسـتەی باسیلی نیکتین کرد لەژێر ژمارە/ ١٣ ، بە وەلاّمدانەوەی نامەی نیکتین لەسەر بارو کێشەی کورد لە کوردستان .

١٩١٨/١١/١٤ گـەلانی تـشیك و سـلۆفاکیا لەشـاری بـراگ پـەیمانی یـەکگتووی وولاّتەکـەیان ڕاگەیانـدو تـشیك بـووە ئەنـدام لـە هێزەکـانی دەووڵـەتی تـشیکۆسلۆفاکیای یەکگرتووی نوێ لە هەرێمەکەدا .

١٩١٨/١١/١٤ بلاّوکردنەوەی وتارەکـەی - لێکۆلینـەوە لەسـەر مێـژووی کۆمەلاّیـەتی کـورد- لەلایەن کامران عالی بەدرخان لە ژمارە/ ١٣٠ی گۆڤاری - ئیتحاد- بـەزمانی تورکی لە باکوری کوردستان .

١٩١٨/١١/١٦ لە دوای ناردنی نامەی - شێخ مـەحمودی حەفید - بۆ ئەفسەری بەریتانیا لە کفری - رائد نۆئیل - کە لەم رۆژە گەیشتە شاری سلێمانی لە باشـووری کوردسـتان ، هـەر لـەوێ بروسـکەیەکی ئاراسـتەی بەغدا کـرد . بەدەرخـستنی پیاو چاکی و ئازایەتی کوردو هەروا لەنامەکەیدا گوتی:-

بە هیچ شێوەیەك كۆسپ لەبەردەم پێك هێنانی دەوڵەتی كوردی لە باشووری كوردستان نییە لە ژێر پارێزگاری بەریتانیا بەڵكوو بەپێچەوانەیە لە هەرێمەكەدا .

١٩١٨/١١/١٧ بڵاوكردنەوەی یەكەم ژمارەی ڕۆژنامەی – ژین– لە شاری سلێمانی لەباشووری كوردستان.

١٩١٨/١١/١٧ نووێنەری بەریتانیا – میجەر نۆئیل – و سەرۆكی ئەمەریكا – ویلسن– جاڕی دامەزراندنی یەكەمین كابینەی حكوومەتی شێخ مەحمودی حەفیدی دا لە باشووری كوردستان ، ئەویش لە سەر ئامۆژگاری ویلسن ، و دوای یەك ڕۆژ لە گەیشتنەوەی بۆ شاری سلێمانی ، بەڵام ئەنجامەكەی پشتگوێ خراو دژی وەستان.

١٩١٨/١١/١٨ بڵاو كردنەوەی ڕاگەیاندنی هاوبەشی فەرەنساو بەریتانیا ، كە تیایدا هاتبوو:– نەتەوەكانی ژێر دەسەڵاتی عوسمانی مافی سەربەخۆییان هەیە ، كە كوردیش یەكێكە لەو نەتەوانە لە سەر خاكی خۆی كە كوردستانە لە كێشووەرەكەدا .

١٩١٨/١١/١٨ وولاتی لاتفیا سەربەخۆیی خۆی ڕاگەیاند ، بەڵام بە هۆی لەباری بارو دۆخی ناوچەكە ، هێزەكانی سووپای ڕووسیای سۆڤیەتی پەلاماری كۆمارەكەی داو بە داگیر كردنیەوە لكاندیە ژێر دەسەڵاتی خۆی ، دوای ئەوە بووە یەكێك لە كۆمارەكانی پێك هاتەی یەكیەتی سۆڤیەت تاكوو هەڵووەشاندنەوەی یەكیەتی سۆڤیەت لە كێشووەرەكەدا .

هەروا لە ساڵی ١٩٩١ ، دووبارە سەربەخۆیی خۆی ڕاگەیاند ، بە جیا بوونەوەی لە سۆڤیەتی جاران لە كێشووەرەكەدا .

١٩١٨/١١/٢١ لـه یاداشـتەكانی وەزارەتـی دەرەوەی بـەریتانیا ، كـه لـه ٢٣ لاپـەڕەی گـەووره پێكهاتبوو ، كه تەواوی ڕاستیەكان دیاری دەكات ، كه كوردستانی لكێنراو بـه ئێـراق لـه ڕۆژهـەلاتی زێـی دیجلـەوه تـاكوو دواوەی چـیای حەمرینـه بـه درێژایەكەی خاكی كوردستانه له هەرێمەكەدا .

١٩١٨/١١/٢٦ پارێزگـای هـەولێر لـه هـەرێمی باشـووری كوردسـتان ، بـەبێ بـەرگری لێكـردن لەلایـەن جـەماوەری شـارەكەدا ، لەلایـەن هێزەكـانی سـووپای بـەریتانیا داگیر كرا.

١٩١٨/١١/٢٧ كۆبوونـەوەی لێژنـەی سـەر بـه ئەنجوومـەنی وەزیرانـی بـەریتانیا ئەنجامـدرا ، لەپێناو چاو پێخشاندنەوەی باری ڕامیاری لـه ئێراقی بەرەو دورسـتكردن لـه سەر خاكی گەلانی وولاتی نێوان دوو زێیٚ ، كه لـه لایـەن– لارندولد ویلسن– سەرپەرشتی دەكرا.

١٩١٨/١١/٢٨ سـەركردەی بزووتنـەوەی ڕزگـاری كـورد – شـێخ مـەحمودی حەفیـد – زمـانی كوردی لەدامو دەزگاكـانی حكوومەتەكـەی كـرده زمانیفـەرمی و هەولێـدا كـه پارێزگـای كـەركوك بخاتـه سـەر حووكمداریەكـەی لەسـلێمانی ، لـه هـەرێمی باشووری كوردستان .

١٩١٨/١٢/١ دادوەری گشتی بەریتانیا له ئێراق ، سەردانی شـاری سلێمانی له باشـووری كوردسـتان كرد، دوای گەیشتنی بۆ شارەكه لەگـەڵ شـێخ مـەحمودی حەفیـدو سەرەك عەشیرەت و كەسایەتی ناوداری شـارەكه كۆبوونەوەیەكی ئەنجامـدا لـه بارەی بارودۆخی ناوچەكەدا .

١٩١٨/١٢/٤ له دوای كۆتایی هاتنی گفتووگۆی نهێنی لـه نێـوان – لوید جـۆرج و كیمنسـۆ – كـه – وایزمـان – پێـشڕكێیەكانی ئاراسـتەی وەزارەتـی دەرەوەی بـەریتانیا كرد ، بۆ دەست پێكردنەوەی پەیووەندی لەگەڵ مستر بلفۆڕو ئاگـادار كردنـی لـه پێـشنیارەكانی جوولانـەوەی سـەهیۆنیزم ، لـه كـۆنگرەی ئاشـتبوونەوه لەپاریسی پایتەختی فەرەنسادا .

١٩١٨/١٢/١١ شاعیرو نووسرو رووناكبیری سۆڤیەت و جیهان – ئەلكسەندەر سۆلگنستین

– لەناوچەی لە شاری– كیسلۆڤۆدیسك– قەوقاز چاوی بەجیهان هەڵهێناوە. لەدوای تەواوكردنی قۆناخەكانی خوێندن، هەر لەمنداڵیەوەش بیری شۆڕشگێری و زانستی بیركاری لەهەستەكانی دەخولایەوە.

دوای ئەوە وەك سەربازێكی ئازا دژی نازیەكان جەنگاوە لەوساتەوە وەختانەدا كە ڕووسیا كەوتبووە ژێر هەرەشەی داگیركردن لەلایەن هێزەكانی سووپای ئەلمانیا لە ساڵی ١٩٤١، بەلاّم لەساڵی ١٩٤٥ دەستگیردەكرێ و حووكمی ٨ ساڵ زیندانی لە ئۆردوگاكانی بەدیلگیراوان بەسەری دادەچەسپێ... كاتێ ڕەخنەی لە توانای ستالین گرتووە كە ناتوانێ بەرەنگاری تواناكانی هێزی نازیەكان ببێتەوە... ئەمەش كاتێ ئاشكرا بوو كە سۆلگتسینن لەناوچەكەیدا نووسیبووی بۆ هاورێكەی خۆی ناردووە.

لە ساڵی ١٩٧٠ كە ناوی ئاشكراكرا بۆتە خاوەنی یاداشتی نۆبل بەو كەسایەتیە دبەخشرێ... لەبریاری خۆی پەشیمان بۆوە بچێتە سووید بۆ وەرگرتنی خەلاّتەكەی... گرنگترین بەرهەمەكانی نووسی لەوانەش – ئەرخەبیل گۆلاج –كە لەساڵی ١٩٧٣ بلاّویكردەوە... لە ساڵەكانی ١٩٧٤ لە رەگەزنامەی ڕووسی بێ بەشكراو ڕووی لە ئەلمانیاكرد... ئەویش بەهۆی هەڵوویستەكانی دژی ستالین و سەركردەكانی سۆڤیەت... دوای ئەوە بەرەو سویسرا و دوایی لە وویلایەتە یەكگرتووەكانی ئەمەریكا نیشتەجێ دەبێت.

لە ساڵی ١٩٩٤ جارێكی دیكە دەگەرێتەوە ڕووسیا... لەدوای

هەڵوەشانەوەی یەکیەتی سۆڤیەت... دوای ئەوە لە ساڵی ٢٠٠٧ سەرۆکی ڕووسیا فلادمیر بۆتین خەلاتی ڕووسیای بە سۆلگنستین بەخشی، کە گەورەترین خەلاتە لە ڕووسیا و لەهەمان کات داوای لە بۆتین کرد، ئەو نووسراوە مێژووییانە ببێتە بەشێك لە ڕۆشنبیری ڕووسیا... ئەم کەسایەتیە لەکارەکانی بەردەوام دەبێت تا لە ٢٠٠٨/٨/٤ ماڵئاوایی لە ڕووسیاو جیهان دەکات.

١٩١٨/١٢/١٥ لە دوای دەرچوونی هێزەکانی سووپاو دامو دەزگاکانی دەسەڵاتی عوسمانی تورك لە شاری کەرکوك لە باشووری کوردستان ، بەرپرسانی بەریتانیا یەکەم ژمارەی ڕۆژنامەی- نەجمە- یان بڵاو کردەوە ، کە بۆ ماوەی هەشت ساڵ لە دەرچوونی بەردەوام بوو ، کە بەزمانی عەرەبی و تورکی بوو تاکوو ١٩٢٦/١٠/٢٥ لە شارەکەدا .

١٩١٨/١٢/١٥ لەوکاتەی کەجەنگی یەکەمی جیهانی کۆتایی هات ، هێزەکانی سووپای بەریتانیا بەسەرکردایەتی کاپتن- های- گەیشتنە شاری کۆیە لە هەرێمی باشووری کوردستان ، پێش هەموو شتێك کاپتن های باری کارگێری شارو ناوچەکەی چارە سەرکرد .

هەروا حەما غای غەفوری کە کەسایەتیەکی بەدەسەڵات بوو ، بەحاکمی شار دامەزراو جەمیل ئاغای حەوێزی بەجێگری حاکمی شارەکەو مەلا محەمەدی جەلیزادە – مەلای گەورە- بە قازی شارەکەی دامەزراند لە ناوچەکەدا .

١٩١٨/١٢/١٨ بەستنی کۆنگرەی جوولانەوەی سەهیۆنیزم لەشاری حەیفای فەلەستین ، لە پێناو بەدی هێنانی کیانی یەهوودی – جوولەکە- لەناوچەی شامو دەوڵەتی ئیسرائیلی ئێستا.

١٩١٨/١٢/٢٥ لە دایك بوونی سەرۆکی میسر ، محەمەد ئەنوەر سادات – لەگوندی میت – ئەبوو ئەلکومی– سەر بە پارێزگای مەنوفیە لە میسر، لە بنەماڵەیەکی هەژاری گوندەکان بووە ، فەرمانبەر بووە لەیەکێ لە نەخۆشخانەکانی سەربازی ، دوای تەواوکردنی خووێندنی ناوەندی پەیووەندی بەکۆلێژی سەربازی کردووە ، لەساڵی ١٩٣٨ بەپلەی ملازم دەرچووە لە ریزی سووپادا .

انور سادات

هەروا محەمەد ئەنوەر سادات پیاوێکی ڕامیاری بووەو چەندین جار لەلایەن هێزەکانی سووپای بەریتانیا دەسگیرکراوە بەهۆی گومان لێکردنی بەیارمەتی دانی ئەڵمانیاو لایەنگیری کردنی لەجەنگی یەکەمی جیهاندا.

شایانی باسە محەمەد ئەنوەرسادات خەلاّتی نۆبڵی بەدەست هێناوە بەهۆی مۆرکردنی رێکەووتنامە لەگەڵ ئیسرائیل بەگوواستنەوەی باری پەیووەندی لە نێوان عەرەب و ئیسرائیل لە قۆناخی شەڕو ململانێ بۆ قۆناخێکی ئاشتیانەی نوێ لەڕۆژهەلاّتی ناوەڕاستدا .

## ١٩١٩

١٩١٩/١/١ ئەمیر فەیسەڵی سعوودی لە حیجاز ، بەنووێنەرایەتی باوکی ، کە شانشینی حجاز حوسێن بوو ، لەگەڵ دەستەیەك بەسێ نووێنەری هاوڕێی لەگەڵ– لۆرەنس– ی بەناوبانگ گەیشتنە پاریسی پایتەختی فەرەنسا ، دوای ئەوە یاداشتێکیدا بە ئەنجوومەنی بالاّی ئاشتی و داواکاریەکەی شا فەیسەڵ لەلایەن هاوپەیمانان بە جێبەجێکردنی بەلێنەکان پێدا.

لەبارەی دان پێنان بە مافی سەربەخۆیی دەسەلاّتی عەرەب بێتەدی بە

دەووڵـەتێکی عـەرەبی یـەکگرتوو لەئاسـیا ، کـە لـە ئەسـکەندەرۆنەوە دەسـت پێـدەکا بـەرەو ڕۆژهـەلاتی تـا سـەر سـنووری وولاتـی فـارس و بـەرەو خواروتاسەر زەریای هندی .

جێگەی وەبیر هێنانەوەیە کەنەوەکانی داهاتووی کورد ئەوە باش بزانن ، کە لـە ڕابـردو لەئێـستادا . بـەریتانیا بەپلـە یـەك و ئەمـەریکا بەپلـە دوو ، دابەشکەرو داگیر کەری خاکی کوردو کوردستان بوونـە لەگـەڵ نۆکـەرەکانیان لەعەرەب و فارس و تورك و دوایش ڕووسیا و هـەروا بەئاسانکاریەکانی کورد بۆیان..؟...!.

١٩١٩/١/١٢ لێژنـەی شـارەزایانی ئەمـەریکا ڕاپۆرتێکیـان بـەرز کـردەوە لـە دوا ئاکـامی کارەکانیـان بـۆ سـەرۆکی ئەمـەریکا - ویلـسن - بەچـەندین پێـشنیار ، کـە بەندبوون بەکێشەی فەلەستین و گەلی یەهوودی لـەو هەرێمـەدا ، ئـەویش بـە سێ خاڵ .

ئەویش بەڕەزامەندی دوو دەووڵەتی دراوسێی جیاوازو ئەو دەووڵەتـە لـەژێر پـارێزراوی بـەریتانیا بێـت ، داوا لەیەهوودیـەکان بکرێـت بەگەڕانـەوەیان بـۆ فەلەستین و نیشتەجێ کردنیان لە ناوچەکەدا .

١٩١٩/١/١٥ دامەزرانـدنی ئەنجوومـەنی کۆمەڵـەی گـەلان لەلایـەن وولاتـانی هاوپـەیمان لەکۆنگرەی ئاشتی لەپاریسی پایتەختی فەرەنسادا .

١٩١٩/١/١٥ لــە دوای جــەنگی یەکــەمی جیهــان - ڕۆزا لۆکــسمبۆرگ - بەشــداری دامەزراندنی کۆمەلـەی سپارتاکۆس کـردووە ، بـەلام لەگـەڵ هاوڕێکـەی کـارل لبکخت دەستگیر دەرکێن و دوایی شەهید دەکرێن لەلایەن ڕژێمـی ئەڵمانیا لـە وولاتەکەدا .

١٩١٩/١/١٨ بەسـتنی کـۆنگرەی ئاشـتی لـە پاریـسی پایتـەختی فەرەنـسا ، کـە شـەریف پاشـای خەنـدان بەنوێنـەرایـەتی کـورد بەشـداری لـەو کۆنگرەدا کـردو داوای مافـە نەتەوەییـەکانی کـوردی لـە کوردسـتان کـرد بـە تایبـەتی لـە بـاکووری کوردستاندا بەڕاپۆرتێکی تێرو تەسەڵدا .

١٩١٩/١/١٨ جەنگی یەکەمی جیهانی کۆتایی پێ هێنرا ، ئەویش بەگرێدانی کۆنگرەی ئاشتی لە پاریسی پایتەختی فەرنسا ، کە ٢٧ وولات بەشداریان لەو کۆنگرەدا کرد ، بە گۆرینکاری نەخشەی جووگرافی ئەوروپای نوێ و جیهان .

کە کوردو کوردستان بەر ئەو نەخشە بەدناوە کەووت و بەتیری ژەهراوی کوردستان لەتکرا لە نێوان چوار دەوولەتی دامەزراوی نوێی دژ بە یەکتر ئەویش وەك :- ئێرانو ، ئێراقو ، تورکیاو ، سووریا لەسەر خاکی گەلان بەتایبەتی گەلی کوردستان .

١٩١٩/١/٢١ لە دامێنی کێوی شەکربازی لە نێوان شارەکانی خوویی و سەلماس لە رۆژهەلاتی کوردستانی ژێر دەسەلاتی فارس ، هێزەکانی سووپای ئێران و کورد ، تووشی شەر هاتن و لە ئەنجام شۆرشگێرە کوردەکان سەرکەووتن بەسەر هێزەکانی سووپای فارس لە ئێران و سەرکردەیان کوژراو بەدەیانیان لێ بە دیل گیران لە هەرێمەکەدا .

١٩١٩/١/٢٣ لەدوای داگیرکردنی ئێراقی ئێستا لەلایەن بەریتانیا ، زاناو کەسایەتی ناوداری ئاینی ، شیرازی فتوایەکی دەرکرد ، کە کەس لە موسڵمانەکان زیاتر نابێ دەسەلات بگرێتە دەست و نابێ نە لەهەڵبژاردن و نە لە پشتگیری

کردنـی غـەیری ئیـسلام هەڵبـژێردرێ و دەسـت نیـشانی بکـات تـەنیا دەبـێ ئیسلام بێت.

١٩١٩/١/٢٥ لــە دوای دامەزرانــدنی ئەنجوومــەنی کۆمەڵــەی گــەلان لەلایــەن هاوپــەیمان لەپاریـسی پایتـەختی فەرەنـسا ، بارەگـای سـەرەکی گوواسـتراوە بـۆ شـاری ژنێڤی پایتەختی سویسرا ، لەپێناو چارەسەر کردنـی کێشە هەڵواسراوەکان لە جیهاندا

جێگەی باسکردنە کە لە سەر بنەماکانی بیروو بۆ چوونی وەزیری دەرەوەی بـەریتانیا — ئـەدوارد گـرای —بـوو ، هـەروا سـەرۆکی ئەمـەریکا — وودروود ویلسن — ئەو بیرەی بە باش زانی و بە پێی پەیمانی فرسـای ، کە یـەك لە بەنـدەکانی دامەزرانـدنی رێکخراوەیـەکی ئوومەمیـە و ئەمــەش بـووە هـۆی ئـەوەی کـە کۆمەڵـەی گـەلان لـە ١/٢٥ ، دابمـەزرێت لـە نێـوان چـوار ئەنـدامی هەمیشەیی ، کە لە چوار کورسی پێك هاتبوو ئەویش:—

بەریتانیای مەزن و، ئیتاڵیا و ، فەرەنسا و ، یابان ... لە گەڵ ئەوەشدا دەرگا کراوە بوو بۆ ئەندامانی دیکە ، کە لە دوایی گەیشتە ٦٣ دەووڵەتی ئەندام لە کۆمەڵــەی گــەلان و نووێنــەرەکانیان و بریارەکـانیش بـە کۆمــەڵ بـوون لــە دەنگداندا.

ئـەویش بـە سـێ زمـانی— فەرەنـسی ، ئینگلیـزی ، ئەسـپانی — بـوو . هـەروا یەکـەم کۆبوونـەوەی کۆمەڵـەی گـەلان لـە ١٩٢٠/١/١٠ بـوو ، هـەروا لـە دوای جـەنگی دووەمـی جیهـان ، بە هـۆی بـارو دۆخـی نـوێی جیهـان ، کۆمەڵـەی گــەلان لــە ١٩٤٦/٤/١٨ خــۆی هەڵووەشــاندەوە و رێکخــراوی نەتــەوە یــەکگرتووەکان راسـتەو خـۆ دامـەزرا لـە نێـوان — فەرەنـساو ڕووسـیاو بەریتانیاو ئەمەریکا و ئەسپانیا ، لە جێگەی کۆمەڵەی گەلان لە جیهاندا .

١٩١٩/١/٣٠ ئەنجوومـەنی بـالای کۆنفرانـسی ئاشـتی بریاریـدا ، کـە هاوپـەیمانان و ئـەو دەووڵەتانەی چوونەتە ڕێزی ئەوانەوە رێککەووتن .

لـە سـەر ئـەوەی ، کـە ئـەرمینیا و سـووریاو میزۆبۆتامیـاو کوردسـتان و فەلەسـتین و نیـووە دوورگـەی عـەرەبی بەیـەکجاری لـە ژێردەسـتی عوسمـانی جیابکرێتەوە لە کێشووەرەکەدا .

شایانی باسە کە وولاتی نێوان دوو زێ واتە – میزۆبۆتامیا – زۆربەی زۆری خاکی کوردستان دەگرتە خۆیو ئێستا عەرەب بەنیشتمانی خۆی دەزانێ .
بەر لە دورستکردنی دەوولەتی ئێراقو سووریا ، کە ئەو دوو دەوولەتە تا دوای فتووحاتی ئیسلامی لە سالی/٧٦٢ یش ، ٣٠ سی هەزار مالی عەربی تیا نەبووە ، تەنیا ئەوانە نەبن کە بەکاری بازرگانیو یاریدەدەرو خزمەتکارانو پاسەوانەکانیان نەبێت لەو ناوچەیەدا .
بەلام بە عەرەبکردنو داگیر کردنی خاکی کوردستان لە هەردوو وولاتی سووریاو ئێراق بەچوار قۆناخدا تێپەڕیووە ئەویش :–
یەکەم :– فتووحاتی ئیسلامی لە سالی ٦٣٤ دەستی پێکرد بەناوی شەڕی قادسیە بەزەبری شیر لەپێناو بەهێزکردنی جێپێگەی خۆیان بەفراوانکردنی سنووری جووگرافی نیشتیمانی عەرەبو بە دەرچوون لە دوورگەی عەرەبیدا .
دووەم :– بلاو کردنەوەی ئاینی ئیسلام لە پێناو جێبەجێکردنی مەبەستی یەکەمدا .
سێیەم :– لەگەل داگیر کردنی ئەوهەرێمانە لەلایەن دەسەلاتی ئیمپراتۆریەتی عوسمانیو هێنانی عەرەبی هاوردە بەلێشاوی گەوورە وەك :– شەپۆلێکی کۆچکردنو داگیرکردنی خاکی گەلان ، بەتایبەتی خاکی کوردستان ، لە دامەزراندنی چوار دەوولەتی دژ بە یەکتری بەتایبەتی ئێراقو سوریا .
چوارەم :– بە عەرەب کردنو داگیر کردنی خاکی کوردستان لەسووریاو ئێراق لەگەل وەرگرتنی دەسەلات لە لایەن هەردوو پارتی بەعس لە سووریاو لەئێراق ، کە ئێراق لە ١٩٦٣/٢/٨ بوو، هەروا سووریاش لە ١٩٦٣/٣/٨ ، کە بەدرنەترین شێووە لەبەعەرەبکردنو داگیر کردنو گۆڕینی جووگرافیاو دیموگرافیا لە خاکی کوردستان دادەنرێت ، لەهەموو بوارەکاندا . هەروا لە تورکیاو ئێرانیش بەهەمان شێووە لە شێوازو ناوەرۆك و بەردەوامن لەم کارانەیندا .

١٩١٩/١/٣٠ بلاوکردنەوەی یەکەم ژمارەی گۆڤاری کوردستان.

١٩١٩/٢/٦ نووێنەری کورد شەریف پاشا لە گەل– کیمانسۆی– سەرەك وەزیرانی فەرەنساو سەرۆکی کۆنگرەی ئاشتی لە پاریس کۆبوونەوەو داخوازیەکانی

گەلی کورد لە کوردستان لەدوای روون کردنەوەی پێشکەشی کرد.

١٩١٩/٢/٢٠ سـەرۆکی ئەمـەریکا – ویلسن– بروسـکەیەکی ئاراسـتەی هندسـتان کـرد کـە چەندین خـالی لـەخۆگرتبوو ، ئـەویش بـە دیـاری کردنـی بـاری ئێراقـی بـەرەو دورستکردن ، بە تایبەتی سەربەخۆیی کورد لەهەرێمی باشـووری کوردسـتان ، لەچوار چێووەی سنووری ئەو ئێراقە بە زۆر دورستکراوەی دیـاریکراو ، کە ئـەو کـات بـەریتانیا لێـی بەرپرسـیار بـوو لەهـەموو روویەکـەوە لـە ناوچـەکەدا ...؟...!.

١٩١٩/٣/١ نووێنـەری کـورد شـەریف پاشـای خەنـدان بیرخەرەوەیـەك و دوونەخـشەی کوردسـتانی ئاراسـتەی کـۆنگرەی ئاشـتی کـرد ، لـەبارەی مافـەکانی کـورد لەپاریسی پایتەختی فەرەنسا.

١٩١٩/٣/٤ لە دوای سەرکەووتنی شۆڕشی بەلشەفی لە سالی ١٩١٧دا ، لە ڕووسیاو بە دامەزراندنی بەرەورژێمی سوشیالیستی و لە باری باردۆخی نێوودەوولەتی ، بووە هـۆی ئـەوەی کـە بـە یەکگرتنی جوولانـەوەی کۆمۆنیـستی لـەجیهان لـە ڕێکخـراوی – کۆمـۆنترین–ئومەمیـەتی یەکـەم– لەلایـەن رابـەرو دامەزرێنـەری یەکیەتی سۆڤیەت – لینین– دامەزرا.

ئەویش لەپێناو دامەزراندنی پارت و ڕێکخراو گرووپی مارکسی بوو لەجیهان ، بــەهاوکاری کردنــی یــەکتری و بــەرگری کــردن لــە رژێمــی کۆمۆنیــستی سۆشیالیستی لەجیهان ، بە فراوانکردنی دەسەلاتی کۆمۆنیستی لە جیهاندا .

دژی ســەرمایەداری و پاشــایەتی شانــشینی و دەرەبــەگی لەهــەموو بــوارە جیاجیاکان ، بە تایبەتی بە بنبڕکردنـی چەووسـانەوەی مـرۆڤ لەلایـەن مـرۆڤ لـە هەموو لایەنێك لە جیهاندا .

١٩١٩/٣/٩ یەکـەم رووبەڕووبوونـەوە لـە نێـوان دانیـشتووانی شـاری نەجـەف و دەووروبـەری لـە گـەڵ هێزەکـانی سووپای بەریتانیا روویـدا... ئەمـەش لەوکاتـە هـات کـە ئاهـەنگێکی یەکـەم سـاڵی داگیرکردنـی بـەریتانیا بـۆ ئێراقـی نوێ دەست پێکرابوو، کە ئـەم رووبەڕووبوونـەوەش وەك راپـەرینێك بۆ ماوەی ٤٥ رۆژ بەردەوام بوو.

کە هێزەکانی سووپای بەریتانیا زیاتر لە ٨٠٠٠ هەزار سەرباز بوون، لە پێنـاو بـوونی دەسـەڵاتیان بـە تـەواوی لەسـەر ناوچـەکەدا... کـە ئەمـەش یەکـەم رووبەڕووبوونەوە بوو دژی بەریتانیاو لایەنگرانی. هـەر لەوکاتـەش کـاری لـە سێدارەدانی لە ئێراق دەستی پێکرد، بە لـە سێدارەدان کەسایەتی ئایینی لـە شارەکە، کە هەڵگری بیروورای ئیسلامی مەزهەب شیعە بوون.

کـە ئـەم راپەرینـەش هۆکـاری بـەرپابوونی شۆرشـی /٢٠ بـوو لـە ئێـراق کـە کاردانەوەکەشی هۆی ئەوە بوو، کە حکوومـەتی ئێراق لایـەنگیری بـەریتانیای دەکرد دژی گەلانی ئێراق لە رژێمێکی شایەتی سەر بەبەریتانیا.

سەرچاوە :- الحرکة الاسلامیة في کوردستان العراق - د.محەمەد نوری بازیانی - چاپی یەکەم/٢٠٠٦.

١٩١٩/٣/٢٠ سەرکردەی بزووتنەوەی رزگاریخوازی کورد لە هەرێمی باشووری کوردسـتان شێخ مەحمودی حەفید ، نامەیەکی ئاراستەی سـەرۆکایەتی کۆنگرەی ئاشـتی لەپاریسی پایتەختی فەرەنسا کرد ، کەتیایدا هـاتبوو - گـوێ لـەدەنگی مـافی ڕەوامان بگرن بەرزگار کردنمان لەژێر دەسەڵاتی تورك- لە هەرێمەکەدا .

١٩١٩/٣/٢٢ نووێنـەری کـورد شـەریف پاشـای خەنـدان لـە پاریسـی پایتـەختی فەرەنسـا ، سکالایەکی بە ناوی کورد ئاراستەی هاوپەیمانان کرد .واتە - کۆمەڵەی گەلان

– لە بارەی باری کوردو مافی سەربەخۆیی کورد لەسەر خاکی کوردستان.

١٩١٩/٣/٢٣ دامەزراندنی جوولانەوەی فاشی لە لایەن- بینیتۆ مۆسۆلینی- لە ڕۆمای پایتەختی ئیتاڵیا ، بەشداری جەنگی دووەمی جیهانی کرد لەپال ئەڵمانیا ، کە بەرامبەر هاوپەیمانان هەڵاتن لە شەڕدا .

١٩١٩/٣/٢٤ مستەفا کەمال ئەتاتورك لە شاری ئەدەنە – دیار بەکر- لە باکووری کوردستان ، دەربارەی خۆی و هاوڕێکانی بەرامبەر بەو پروپاگەندەیەی کراوە . نامەیەکی تایبەتی ئاراستەی وەزارەتی کاروباری شەڕ دەکات لەستەمبۆڵ و تیایدا دەڵێ:-

بۆ ئەو تاوانە ناشیرینەی بەرامبەر هاورێکانم کراوە – واتە کورد- نازانم بلێم چی..تەنها دەتوانم لەسەر ناوی خۆم قسە بکەم ، ئەویش ئەوەیە کە من ئەنافار تالارو کوردستان و سووریادا ، بەسەر سووپای قارەمانەوە ماومەتەوە – شانازی بەوە دەکەم . کە ئەوە چەتەنین بەڵکوو رۆڵەی بەناموسن و لە نەتەوەی عوسمانیی دروست بوونە .

لەنامەکانی تایبەت بەئەتاتورکەوە . سەعدی بۆراق. چاپخانەی سەردەم- ئەستەمبول ساڵی ١٩٨٠ لاپەرە/١٣٩.

١٩١٩/٤/٤ نووسەری کتێبی – الرجل الصنم – داهاتوو، کە ئەفسەرێکی تورکی نزیك لە مستەفا کەمال ئەتاتوورك – واتە باوکی تورکان – ە ئەفسەرێکی مەزنی ئینگلیز کە برای لۆرد کیرزۆن بووە لە پارێزگای ئەرزەرۆم لە باکووری کوردستان.

لە گەڵ مستەفا کەمال کۆبوونەوەی ئەنجامداوە و بزاڤەکەی کەمالیەکان هەر بۆ ئەوە بوو، کە هیچ بزاڤێکی میللی لەنێوان کوردەکانی باکووری کوردستان بەرپانەبێ... کە لەوکات ئینگلیز و حکوومەتی توورك لە ئەستەمبۆل یەك مال بوون. ئەمانەش بوونە هۆکاری ئەوەی کە بیرسۆن بەدەستی یەکێك لەکوردانی هۆزی – گۆیان – بکووژێ.

لە گەڵ ئەوەشدا بەریتانیەکان بۆ ماوەی پێنج رۆژ گوندەکانی گۆیانیان بۆردومان کردو فشاریان خستە سەر تورکەکان بۆ ئەوەی هێزەکانیان بنێرن بۆ ناوچەکە، ئەویش بۆ لێدان و کەپ کردنەوەی راپەریووەکان لە گۆیانی باکووری کوردستان.

هەروا توورکەکانیش هێزێکی گەورەیان رەوانەی — سەرشاخ و گۆیان و جەزیرەو بەشێکی دیکەشیان نارده سەر هۆزەکانی نێوان — ئیزیپ و موسل — و کۆبوونەوە تارێگای پەیوەندی کردن بەهۆزەکانی باکووریان لێبگرن.
بە و هۆکارە ئینگلیزکانیش بروایان بەتورکەکان نەبوو. لەوە دەترسان کە گەمەیەکی دوو لایەنە بکەن. بەباشیان زانی نووێنەرێکی خۆیان لەگەڵ هەڵمەتەکەدا بێ... دوای ئەوە لە ٤/١٣ ی هەمان ساڵ شالیاری جەنگی توورك — شاکر پاشا فەرمانێکی بۆ دەسەلاتدارانی سنوور دەرکرد کە رێگای هیچ بزاڤێك نەدرێت لە باکووری کوردستان. لە دژی بەریتانیاکان — چونکە ئینگلیزەکان پەیوەندیان لەگەڵ کەمالیەکان و ئیتحادیەکان هەبوو دژی بزووتنەوەی رزگاری کورد لە باکووری کوردستان.
لەوکاتەشدا سەرانی کورد لە باکووری کوردستان ببوونە دووبەش کە هەندێکیان باوەریان بەحکوومەتی ئەستەمبوڵ هەر مابوو لەگەڵ پەیوەندیان لەگەڵ ئیتحادیەکان کەچی هەردوو لایەن دژی کورد بوون لە کوردستان.

١٩١٩/٤/١٣ ئەنجامدانی قەسابخانەی — ئەمریتسا ر— ی بەد ناو لە هندستان لەلایەن داگیرکەرانی بەریتانیا کە ٣٧٩ هاوولاتی بێ تاوانیان گوولله باران کرد لە پێناو چەسپاندنی رامیاریەتی ئیمپریالیزم لەم وولاتەدا بە سەر دانیشتووانی هەژار، کە هیندستان کیشوەرێکی سەر بە خۆیە لە جیهان... کاروکرداری رژێمە شۆڤینی وبەر چاوتەنگەکان و چاولێکردن لەرژێمی سەرمایەداری و ئیمپریالیزم و کۆنۆلیانی و دەرەبەگایەتی هەموو شتێکیان ئەنجامداوە دوور لە ئەخلاقیەتی مرۆڤایەتی.
هەروا لە پێناو بەدەست هێنانی سەرمایەو قازانج و بەهێزکردنی جێ پێگەی خۆیان لە بوارەکانی رامیاری و سەربازی ئابووری و بازرگانی و فرۆشتنی کالاکانی خۆیان، یاخوود شمەکەکانیان بەمەبەستی بەدەست هێنانی قازانج لە سەر بەرژەوەندی گەلانی ژێر دەستەو رزگارنەبوو بەهۆی داگیرکردن و دەست بەسەرا گرتن.
بە تایبەتیش لە سەرتای سەدەی هەڤدەم تاکوو ئێستاش، کە نەیان ویستووە کێشە تەشەنە دارەکات چارەسەر بکەن، بە تایبەتی کێشە نەتەوەیی و خاك کە زمان و مێژوو داب و نەریت و کەلتوورو کە شارستانیەتی ئەو نەتەوە لە

خـۆ دەگرێـت لـە ناوچـە جیاجیاکـانی جیهـان بەتایبـەتی کێشەی گـەلی کوردستان لەسەر خاکی خۆی کە کوردستانە لە کێشووەری ئاسیادا.

سەرچاوە :– الهویە و العنف... ئەمارتیاسن – وەرگێرانی. سەحەر تۆفیق مانگی/٢٠٠٨/٧.

١٩١٩/٤/١٧ لـە بارەگـای وەزارەتـی دەرەوەی بـەریتانیا لەشـاری لەنـدەنی پایتـەختی بـەریتانیا ، کۆنگرەیـەکی بچووك بەسـترا بەسـەرۆکایەتی وەزیـری دەرەوەی بەریتانیا– لورد کیرزن – بە ئامادە بوونی ژمارەیەك لە گەوورە بەرپرسـانی پەیووەنـدار لـە رۆژهـەلاتی ناوەراسـتدا ، لـە نووێنـەری وەزارەتـی دەرەوەی بەرگری و ، جەنگی و ، دارایی، هەروا نووێنەری هندستان .

سەرەرای بەشداری جێگری دادوەری مەدەنی بەریتانیا لە ئێراق – ئەرنولد ویلـسن –...ئـەویش بـەراپۆرتێکی نهێنـیّ کارەکـانی کـۆنگرەی تـارانی ئامادەکردبوو . کە لە هەشت لاپەرەی گەوورە پێك هاتبوو ، لە بارەی زانیاری لەسەر وویلایەتی موسلو باری کورد لە نێووەندەکانی وولاتانی ناوچەکە ، بە تایبەتی لە باشووری کوردستان.

جێگەی ئاماژە پێکردنە کە لەم کۆبوونەوەیەدا ئەرنۆلد وولسن دوو پێشنیاری ئاراسـتەی سـەرۆکی کۆبوونەوەکـە – لـۆرد کـیرزن – کـرد ، لـە بـارەی بـاری ناوچەکاندا ئەویش :–

یەکەم :– دامەزراندنێکی ئۆتۆنۆمی و ناوەندەکەی لە شاری موسڵ بێت ، کە ئەمەش دەبێتە هۆی ئەوەی ، کە کورد لە داهاتوودا بە مافی چارە نووسی خۆی بگات لە کیانێکی سەر بەخۆی کورد .

دووەم :– کردنی وویلایـەتی موسڵ بە پارچەیەك لە وولاتـی نێوان دوو زێـیّ ... ئەویش بە دروستکردنی پژبێنێکی دیاریکراو لـە دوو وویلاتـی کوردی لـە مـافی ئۆتۆنۆمیـدا ...وەك :– شـارەکانی سلێمانی و ، روانـدزو ، عمادیـە و، جەزیرەو ، ئیبن عومـەرو ، بۆتـان . کـە کـارو بارەکـانی سـەرۆکی نـاوخۆیی بە راوێـژکاری رامیـاری بـەریتانیا بـەرێووە بـچێت و سـەر بـە شـاری بەغـدا بـن راستەو خۆ .

هـەروا لـەو کاتـدا کـیرزن رازی بـوو بـە خـاڵی دووەم . لـەو کاتـەی کـە پێشنیارەکەی پارێزگاکانی دیاربەکر و ، تەبلیس و ، ئۆرفە ، بگرێتـەوە ... لە ناوچەکەدا .

لـەو کاتەشـدا نووێنـەری کـورد شـەریف پاشـای خەنـدان و عەبـدولقادر شـەمدینان و بنەماڵـەی بەدرخانبـەکان بەرپرسـیاریەتی هەڵـسووراندنی کاروبارەکانیان خستە ئەستۆی خۆیان .

بەڵام کیرزن کە ئەوەی زانی رەزامەندی نەکردو گووتی :- ئەم ناوچەو شارانە لە باکووری کوردستان هەر با لە ژێر دەسەڵاتی تورکەکان بمێنێتەوە و نەبێتە هۆکاری ئەوەی ، کە کورد لە دوای بوونی دەسەڵاتی لە ویلایەتی موسڵ و بە هێزکردنـی دەسـەڵاتی لـە سـەر هـەموو کوردسـتان ...؟...!. بـەڵام ئـەی هەڵوێستی کورد ....!.

١٩١٩/٤/١٨ دامەزرانـــــدنی ئەنجوومەنی کۆمەڵەی گـەلان بەشـێوەیەکی فەرمی لەدوای کۆتایی جـەنگی یەکـەمی جیهانـدا ، لـەپێناو چـارەی کێـشە نێوودەوڵەتیـەکان بەهۆی دورست بوونی دوو جەمـسەری سۆشیالـستی و سـەرمایەداری دژ بەیـەکتری لەلایـەن وولاتانی هاوپەیمان بەتایبەتی بەریتانیاو ئەمەریکاو فەرەنسا .

١٩١٩/٤/١٨ لە بـەردەوامی گفتووگـۆ کـردن نووێنـەری فەرەنسا- برینگـەر- و نووێنـەری بەریتانیا – والتەرلۆنگ – رێکـەوتنی دابەشـکردنی کوردسـتانیان مـۆرکرد ، بـەو مەرجـەی کـە ، کـە لـە ٢٥٪ بەشـەکەی ئـەلمانیا لەباشـووری کوردسـتان بدرێتە فەرەنسا ، کە بەریتانیا دەستی بەسـەردا گرتبـوو ، ئەمـەش لـەناوەوەی گفتووگۆکانی دامەزراندنی کۆمەلەی گەلان بە ئەنجامگەیەندرا .

١٩١٩/٤/٢٣ حکوومـەتی فەڕەنسا بڕیاری یاسـای کـارپێکردنی بـە ٨ کاتـژمێر ڕۆژانـە بـۆ هەموو کرێکارو کارمەند لە کارگەو پڕۆژەو داموو دەزگاکانی فەڕەنسا دەرکرد بە ٤٨ کاتژمێر لە هەفتەیەکدا.

١٩١٩/٤/٢٤ بـەرپابوونی ڕاپـەڕین لەلایـەن جـەماوەری شـاری زاخـۆ لـە هـەرێمی باشـووری کوردسـتان ، ئـەویش بـە رووبـەروو بوونـەوەیان لەگـەڵ هێزەکـانی سـووپای بـەریتانیا ، لەئـەنجام دادوەری بـەریتانیا – لیـچمەن– بـە دەسـتی راپـەریووە شۆڕشگێڕەکان کوژرا.

١٩١٩/٤/٢٦ لـە هـەوڵکی رووناکبیرو زانـای یۆنـانی– ونزلـوس– لەوتەیـەکی دا گـووتی:– لـەدوای هـەولێکی زۆر، کـە سـووێند خـۆران – واتـە وولاّتـانی هاوپـەیمان – لـەکۆنگرەی ئاشتی لـە پاریـسی پایتـەختی فەرەنـسا ، بڕیـاری داگیرکردنـی شاری ئەزمیر و دەوروبـەری لـە لاکووری کوردسـتان بـدەن لەلایـەن هێزەکانی سووپای یۆنان .

بـەلاّم هەولـەکان بـۆ چـارەی ئـەو گرفتـە بـێ سـوود بـوون لـەنێوو ئەنـدامانی کۆنگرەکەدا .

١٩١٩/٤/٢٨ بەرەزامەندی هەموو هاوپەیمانان کۆمەڵەی گەلان دامەزرا ، کە بـەناوی ئـەوەوە رێکەووتنەکان لەگەڵ وولاّتانی بەزیوو لە جەنگی یەکـەمی جیهـانی مـۆر دەکرا کە بەم شێوەیە بوون ئەویش:–

١– مـۆرکردنی رێکەووتننامــەی ڤرسـای لـە ١٩١٩/٦/٢٨ لـە گـەڵ وولاّتـی ئـەلمانیادا ... ٢– مـۆرکردنی رێکەووتننامــەی سـان گرمـان ئـانلای لـە ١٩١٩/٩/١٠ لە گەڵ وولاّتی نەمسادا ...٣– مۆرکردنی رێکەووتننامەی نوێی لە ١٩١٩/١١/٢٧ لە گەڵ وولاّتی بوولگاریادا ...٤– مۆرکردنی رێکەووتننامەی تریانۆن لە ١٩١٩/٦/٦لە گەڵ وولاّتی مەژەردا .

٥– هــەروا مـۆرکردنی رێکەووتننامــەی سـیڤەر لـە ١٩٢٠/٨/١٠ لـە گـەڵ دەسـەلاّتی تورکیـادا ... بـەلاّم ئـەو رێکەووتننامەیـە لـە دوای شـەڕی ڕزگـاری تورکیـا و شـەڕی تورکیـا– یۆنـان ، بـە رێکەووتننامـە بەدناوەکـەی لـۆزان لـە ١٩٢٣/٧/٢٤ کۆتایی پێهات .

ئـەویش بـە دابەشـکردنی کـوردو خـاکی کوردسـتان بـە سـەر وولاّتـانی

دروستکراو لە کێشووەرەکەدا .

٦- مۆرکردنی ڕێکەووتننامەی ڕاپاڵۆ لە نێوان هەردوو وولاتەکانی ئیتاڵیا و یۆگسلاڤیا لە ١٩٢٠/١١/١٢دا ...٧-مۆرکردنی ڕێکەووتننامە لە نێوان یەکیەتی سۆڤیەت و پۆلۆنیا لە ١٩٢١/٣/١٨ دا . بەڵام ئەو هەموو ڕێکەووتننامانە هەر هەموویان سەر کەووتوو نەبوون لە جێ بە جێکردندا بە تایبەتی لە لایەن ئەڵمانیادا.

خارطة قديمة لولاية الموصل موضحا فيها الساحة الثلا

١٩١٩/٥/٤ نازناوی بزووتنەوەی ٤/ئاداری ١٩١٩، ئەویش بە ڕێپێوانی ٤٠٠٠ هەزار خووێندکاری چینی دەگووترێ لەم ڕۆژەدا دژی یەکێك لە مەرجەکانی ناو ڕێکەووتننامەی ڤێرسای سەبارەت بە گرێدانی بەندەری - کیاجۆ- بوو بە ژاپۆنیەکانی بەرێووە چوو لە ناوچەکەدا.

دوای ئەوە لق و پۆپی ئەم خۆپیشاندانە و مانگرتنە تەشەنەیان کردە سەر شاری شەنگەهای و شمکەکانی ژاپۆن لە لایەن خەلکی چینەوە گەمارۆی خرایە سەر، چینیەکان لە مۆرکردنی ڕێکەووتننامەکە خۆیان بواردوو ڕۆشنبیرانی ئەم وولاتەش دەستیان بە ڕەتکردنەوەی فەلسەفە کۆنەکان کرد

کە پشتیووانی و بەرگریان لە بیانییەکان دەکرد، ئەم کێشەیەش بووە هۆی بەرزبوونەوەی ئاستی وشیاری رامباری گەلی چین لە کێشووەرەکە و جیهاندا.

١٩١٩/٥/٩ وەزیری دەووڵەتی بەریتانیا بە راپۆرتێك ئاگاداری- ئارنۆلد ویلسن- ی کردەوە بە پێکهێنانی پێنج پارێزگا لە ئێراقی بەرەو دورستکردن... کە پارێزگایەکی عەرەبی پێك بێت لە موسڵ لە تەك دەووڵەتی کوردی لە هەرێمی باشووری کوردستان .

واتە مووسڵ پارێزگایەکی کوردیە وەك پارێزگای کەرکوك ... بەڵام لە سامانی نەوتو هەلکەووتەی جووگرافی ناوچەکە جیاوازیان کەمی هەیە لە هەرێمەکەدا .

١٩١٩/٥/١٠ حکوومەتی بەریتانیا لە رێگەی دادوەرەکەی لە ئێراق فەرمانیدا بەپێکهێنانی چەند میرنشینێکی کوردی لە کوردستان بە تایبەتی لە باشووری کوردستان لەژێر دەسەلاتی شێخ مەحمود لە ناوچەکەدا ، بەڵام بە مەرجێ ئەو میرنشینانە دەبێ لە ژێر فەمانی ئەفسەرە بەریتانیەکان بە رێووە ببرێن ... ؟ ئەی کورد.....!..

١٩١٩/٥/١٥ دامەزرێنەری دەووڵەتی تورك – مستەفا کەمال – ئەتاتورك ، واتە باوکی تورکەکان ، بەدرندانەترین کرداری نامرۆڤانەی پەلاماری شاری ئەزمیری دا لەباکووری کوردستانو داگیری کرد ، ئەویش بە یارمەتی هێزەکانی سووپای ئیتالیا . دوای ئەوە بەهاوکاری بەرپرسانی ئیتالیا بەرەو ناوچەی – سامسۆن – بەرێکەووتن ، لە پێناو بەهێزکردنی دەسەلاتو نانەوەی ترسو دلەراوکێ لە ناو هەست و دەروونی گەلانی ژێر دەسەلاتی تورکەکان لە ناوچەکەدا .

١٩١٩/٥/٢٠ نووێنەری کورد شەریف پاشا داوای لە بالوێزی بەریتانیا لویس مالتی لەپاریس کرد ، کە هەلبژاردنی ئەو بۆ بەدەست هێنای ئیماراتی کوردستانە لەلایەنی نەتەوەیی ونیشتمانی لەسەر خاکی کورستان.

١٩١٩/٥/٢٠ بەهۆی گوونجاوی بارووودۆخی لە باری ناوچەکەو باشووری کوردستان جەماوەری گەلی کورد دەستی بەراپەرین کرد ، بەسەرکردایەتی شێخ مەحمودی حەفید بەتایبەتی لە شاری سلێمانیو دەووروبەری لە هەرێمەکەدا .

١٩١٩/٥/٢٠ بە هۆی دژوواری بارودۆخی شاری سلێمانی و دەروورووبەری لە دوای بەرپابوونی ڕاپەڕین دژی هێزەکانی سووپای بەریتانیا .
نووێنەری بەریتانیا - میجەر سۆن- توانی بە نهێنی شاری سلێمانی جێ بهێلێ‌و- گرینهاوس- لەجێگەی خۆی دابنێ ، بە هەڵسووڕاندنی کاروبارەکانی خۆیان لە ناوچەکەدا .

١٩١٩/٥/٢١ سەر کردەی بزووتنەوەی ڕزگاری کورد شێخ مەحمودی حەفید دەنگیدا بە مەحمود خانی دزلی بەداگیرکردنی شاری سلێمانی لە باشووری کوردستان . دوای ڕزگار کردنی شارەکە ، هەرچەند ئەفسەرو سەربازی هێزەکانی سووپای بەریتانیا هەبوو هەمووی دەستگیران لە شارەکەدا .

١٩١٩/٥/٢٢ نووێنەری کورد شەریف پاشا لە پاریسی پایتەختی فەرەنسا سکالایەکی بەناوی کورد ئاراستەی هاوپەیمانان کرد ، لەپێناو چارەسەری کێشەی کورد لە کورستان بەتایبەتی باکووری کوردستانی ژێر دەسەڵاتی تورکە کەمالیەکان.

تێبینی:- سکالاو نامەکانی نوێنەری کورد لە ناوەرۆکی مێژوونامەکە نووسراوەو دیاری کراوە .

١٩١٩/٥/٢٣ بە هۆی ئاڵۆزی باری کوردو بوونی هەڵوویستی یەکگرتوو کەسایەتی ناوداری کورد محمد خانی دزلی بەخۆیوو بە ٣٠٠ چەکدار گەیشتنە شاخی گۆیژە ، دوای ئەوە شاری سلێمانی بەتەواوی ڕزگاری کرد لە باشووری کوردستان.

١٩١٩/٥/٢٣ لە گەڵ ڕزگارکردنی شاری سلێمانی لە باشووری کوردستان ڕاپەڕینەکانی شێخ مەحمودی حەفید پەرەی سەندو چەندین ناوچەی گرتەوە بەرزگارکردنی لەژێر دەستی هێزەکانی سووپای بەریتانیا ، کە لە ئەنجام چوار زرێپۆش‌و ١٩ ئۆتۆمبێل سووتێنران ، لەهەمان کات ئالای کوردستان لە ناوچەکان بەرزکرانەوە لە هەرێمەکەدا.

١٩١٩/٥/٢٤ پەیووەندی لە نێوان دانیشتووانە ئێراقیەکان لە سووریا ، کە زۆربەیان خەڵکی مووسڵ بوون ، لەم ڕۆژەدا لقی پارتی – عەهد– بەسەرکردایەتی ڕەئوف گولامی لەشاری موسڵ دامەزرا ، کە ئەمەش هۆکاری بەرچاوی هەبوو لە بەهێزکردنی پەیووەندی لە نێوان ئێراق و سووریادا ، بەر لەدامەزراندنی ئەودوو دەوڵەتە لە سەرخاکی کوردستان ، لەگەڵ ئەوەشدا ڕۆژنامەکانی سووریا دەگەیشتنە ئێراق بە تایبەتی ڕۆژنامەی عقاب لەڕێگەی بیابانەکاندا .

هەروا دەگەیشتنە کەنداوو ناوچەکانی دیکەی ئێستای ئێراق کە لەو کاتەش سێ جۆر پروپاگەندیان هەبوو، ئەویش پروپا گەندەی تورکەکان و پروپا گەندەی بەلشەفیەکان .

ئەمانەش هاوکار بوون دژی دووژمنی سەرەکی ئەویش بەریتانیاو هاوپەیمانان بوون لە جیهاندا .

١٩١٩/٥/٢٥ لە ئاکامی ڕاپەرینەکانی گەلی کورد لە باشووری کوردستان بە سەرکردایەتی شێخ مەحمود حەفید ، کە یەکەم شەڕی ڕووبەڕووبوونەوەی لەگەڵ هێزەکانی سووپای بەریتانیا بەرپاکرد .

کە لە ئەنجام هێزەکانی سووپای بەریتانیا پاشەکشەیان پێکرا بەهۆی بەرزی هەستی نەتەوەیی و نیشتمان و بەرگری لێکردنی لەلایەن چەکدارانی کورد لە ناوچەکەدا .

١٩١٩/٥/٢٥ نوێنەری کورد شەریف پاشا بە بالوێزی بەریتانیا میرۆلۆنی مالتی ڕاگەیاند ، کە گفتووگۆی مۆرکردنی پەیمانی بەلفۆر خۆی بۆ ئەمیری کوردستان ئامادە دەکات وەك چۆن مافی تورك و عەرەب و فارس جێبەجێ دەکات لە کێشووەرەکەدا .

١٩١٩/٥/٢٦ گەیشتنی شاندی کورد لە باکووری کوردستان بەسەرۆکایەتی شەریف پاشای خەندان بۆشاری پاریسی پایتەختی فەرەنسا ، لە پێناو بەشداریکردنی لە کۆنفرانسی ئاشتی لە بارەی دابەشکردنی میراتی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی و هەرێمەکاندا . کە لەوکاتیش کوردستان لە ژێر دەسلاّتی ئیمپراتۆریەتەکەدا بوو لە کێشووەرەکەدا .

١٩١٩/٥/٢٦ رزگار کردنی شاری هەڵەبجەی سەر بە شاری سلێمانی لە باشووری کوردستان لەلایەن هێزە شۆرشگێرەکانی شێخ مەحمودی حەفید لە ژێر دەستی هێزەکانی سووپای بەریتانیا لە هەرێمەکەدا .

١٩١٩/٥/٣٠ هێزەکانی سووپای بەریتانیا ویستیان شارۆچکەی چەمچەمال لەباشووری کوردستان داگیر بکەن .
بەلاّم بەهۆی بەرەنگاربوونەوەی هێزە چەکدارەکانی کورد ، توانیان هێزەکانی سووپای بەریتانیا پاشەکشە پێبکەن لە ناوچەکەدا .

١٩١٩/٦/١ سولتانی عوسمانی دەستەیەك لە سەرکردەکانی – کۆمەڵەی بەرزی کوردستانی– لە پێناو گفتووگۆ کردن لەگەڵ وەزارەتی عوسمانیدا بانگکرد ، کە شاندەکە پێك هاتبوون لە– عەبدولقادر شەمزینی، ئەمین عالی بەدرخان ، موراد بەدرخان– شاندی تورکیش پێك هاتبوون لە –شیخ الائیسلام ئیبراهیم ئەفەندی حەیدری ، ئەحمەد عبوق پاشای وەزیری ئەشغال– عەونی پاشای وەزیری جەنگ – پاش ئەو گفتووگۆیە ، سولتانی عوسمانی بەلێنی پێدانی مافی ئۆتۆنۆمیدا بە کوردستان لە باکووری کوردستان ، بەو مەرجەی لە چوار چێووەی دەسەلاّتی عوسمانیدا

بمێننــەوە... بــەڵام ئــەو بەلێنانــە دواخــران و نەهاتنــە دی و لاوانــەوەو هەلخەلەتاندنی کورد بوولە هەرێمەکەدا ...؟.

١٩١٩/٦/٣ یەکــــــــەم کۆبوونــــــەوەی کــــــۆنگرەی دامەزرانــــــدنی دەوولەتی سووریا ئەنجامدرا لە لایەن نووینــــــەرانی عــــــــەرەب و هاوپەیمانان .

کــە ئــەو کــات رۆژهــەلات و رۆژئــاواو باشــوور ، کــە ســووریای نــاوەوەو کەنارەکانی فەلەستینی دەگرتەوە .

ئــەو کۆبوونەوەیــە بــەردەوام بــوو تــاکوو ١٩٢٠/٧/١٩ ، کــە بەرەزامەنــدی ئەنجوومەنی نووێنەری و دامەزرێنەری بوو، لەهەمان کات ئەویش دوو بڕگەی سەرەکی هەبوو ، یەکەمیان:- دەرکەووتنی ئارەزووی گەلی عەرەب لە سووریا بــەرەو دورســتکردن ، دووەم :- لەدامەزرانــدنی چــۆنیەتی حکوومــەتی سووریاو یاسا بنەڕەتیەکانیدا لە سەر خاکی رۆژئاوای کوردستان.

١٩١٩/٦/٤ لیژنــەی - کینــگ ـ کراین - لــە پاریــسی پایتــەختی فەرەنسا کۆبــۆوەو دوای ئــەوە چــوونە شــاری ئەســتەمبۆلی تورکیــا ، دوای ئەنجامــدانی کارەکــانی ئەندامانی لێژنەکە گەیشتنە فەلەستین سەرەڕای بوونی ناڕەزایی لە لایــەن رێکخراوەکــانی جوولەکــە لەناوچــەکەدا ، لــە١٠/٦ی هــەمان ســاڵ گەیــشتنە شــاری دیمەشــق و لــە ٦/٢٥ و لــە٧/٣ ئەنــدامانی لێژنەکــە لەگــەڵ شــاندی کۆنگرەی سووریا بەیەك گەیشتن لە پێناو تەواو کردنی کارەکانی لیژنەکە لە ناوچەکەدا .

١٩١٩/٦/٥ دوای ئەوەی کە سەرکردەی کورد لە رۆژهەلاتی کوردستانی داگیر کراو لە لایەن رژێمی ئێران سمکۆی شکاك داوای یارمەتی لە بەریتانیا کرد لەپێناو بەرەو باش بردنی باری رۆژهەلاتی کوردستان ، سکرتێری گشتی وەزارەتی هندستان لە شاری لەندەنی پایتەختی بەریتانیا ، بە تەلەگرافی ژمارە/ ١٩٢ ، وەلامی فەرماندەی گشتی بەریتانیای لە شاری بەغدا داوە و تیایدا هاتبوو ، کە بە هیچ جۆرێك ئامۆژگاریتان ناکەین ، کە یارمەتیو بەلێن بە سمکۆی شکاك بدەن لە هەرێمەکەدا .

١٩١٩/٦/١٢ دادوەری گشتی بەوەکالەت لەئێراق – عەقید ولسن– پێشنیاری پێشکەش بەحکوومەتی بەریتانیا کرد ، لەپێناو دامەزراندنی حکوومەتێکی کوردی لە وویلایەتی بەتلیسو دیاربەکرو مەعموریەو عەزیز ، بەپێی داواکاریەکانیو باری کورد لەباکووری کوردستانی ژێردەسەلاتی تورکە کەمالیەکاندا .

١٩١٩/٦/١٣ سەرەك وەزیرانی ئەمەریکا – وولسن– پێشنیارێکی کرد کە کوردستانێکی سەربەخۆ لە باکووری کوردستانی ژێر دەسەلاتی تورکیا دروست بکات... بەلام لەژێر رکێفی ئینگلیز بێت... ئەو بەشەی کوردستان کە نەکەوتبووە ژێر رکێفی سەربازی بەریتانیا.
هەروا ئەو بەشەی کوردستان کە هەرچەندەبێ کە بروای ئینگلیزەکانەوە ترسی بلاوبوونەوەی کۆمۆنیستەکان لێدەکرا... لەم بروایەش ئینگلیزەکان بەهەلە دانە چووبوون لەوکاتدا لە بەر ئەوەی مستەفا کەمال ئەو ناوچەیەی بە زۆر خسبووە ژێر کاریگەری خۆی و بەجۆرێ لە حکوومەتی ئەستەمبوڵ یاخی ببوو لەو کاتدا.

هەروا لەلایەکی دیکە سۆڤیەتیەکان توانییوویان مستەفا کەمال بۆخۆیان دەستەمۆ بکەن... میجەر نۆئێل ، فایەق تاپۆی لەگەڵ خۆی برد بۆ ئەو بەشەی کوردستان لەوێووە لەگەڵ جەلادەت وکامەران بەدرخان بەهەندێ بەشی ئەو بەشەی کوردستان سوورانەوە بەنیازی دوورخستنەوەی کورد لە توورکەکانی سۆڤیەتیەکان بوو.

هەروا سۆڤیەتیەکان مستەفا کەمال لەمانگی /۱۹۱۹/۷ کۆنگرەی ئەرزەرۆمی گرێدا کە ۳۵ نووێنەری لە وویلایەتەکانی ئەرزەرۆم و بەدلیس و وان و سیواس و تەرابزۆن لە باکووری کوردستان بەشداریان تێداکرد... کە ئەمەش بووە هۆکاری ئەوەی کە کەمالیەکان جێ پێگەی خۆیان زیاتر فراوان بکەن لەباکووری کوردستان.

دوای ئەوە لەمانگی /۱۹۱۹/۹ کۆنگرەیەکی دیکەیان لەشاری سیواس گرێدا بۆ هەمان مەبەست لەباکووری کوردستان.

۱۹۱۹/٦/۱۳ لەدوای کۆتایی جەنگی یەکەمی جیهان توورکەکان گەلێك دڵنەوایی شێخ مەحمودی حەفیدیان کرد، دوای ئەوە کە نازناوی – نەقیبی – پێداو کردیان بە پارێزگەری سلێمانی... ئینگلیزەکان ئاگایان لەم رووداوانە هەبوو کە ئەو کارانەشیان بەدژی بەرژەوەندی خۆیان لەناوچەکەدا دەزانی و نووێنەری رامیاری ئینگلیزەکان لەبەغدا سەبارەت بە سنووری کوردستان و ئێراق...کە بەگوێرەی بریار دەبووایە پاش جەنگ دروستکرایا. تەلەگرافێکی بۆ وەزیری

هندستان لێداو تێیدا گووتبووی :-

لە بەر هەندێ هۆی ئابووری و رامیاری و ستراتیژی وا باشە ناوچە شاخاویە گرنگـەکانی سلێمانی... رانیـە - کۆیـە - زاخـۆ - و دهـۆك - بخرێنـە سـەر ئێراق. هـەولێر، ئاکرێ و موسلیش کە هێڵێکی ئاسنیان پێدا دەرواو هـەروا ئامێدیش لە کوردسـتان جیابکرێتەوە... کەچی شێخ مەحموود ئاگاداری ئەو کارانە نەبوو لەهەرێمی باشووری کوردستان.

١٩١٩/٦/١٤ دەستپێکردنی گەشتەکەی - میجەرنوئێل- بۆ باکووری کوردستان لەپێناو کۆکردنـەوەی زانیـاری لـە هـەموو لایەنـەکانی زمـانو مێـژوو وداب و نـەریت و شووێنەواری کورد لە کوردستان.

١٩١٩/٦/١٥ مۆرکردنی رێکەووتننامەی سەربازی لە نێوان حکوومەتی فەرەنساو بەریتانیا ، لـەپێناو جێبـەجێکردن و دابەشـکردنی ناوچـەی دانیـشتووانی لایـەنگیری خۆیان ، بەپێی پەیمانی سایکس- بیکۆ ، کە ناوچەی داگیر کراوی باکوور، دوای ئـەوە کـرا بەناوچـەی رۆژئاوا G....ET. west کەوتـە ژێـر دەسـەڵاتی فەرەنسا .

١٩١٩/٦/١٧ سـەرکردەی کـورد شـێخ مـەحمودی حەفید لـە شـەڕی دەربەنـدی بازیـان لـە هـەرێمی باشـووری کوردسـتان زامـدار کـرا ، دوای ئـەوە هێزەکـانی سـووپای بەریتانیا بەدیلی دەستگیریان کرد .

کـە لەلایـەن ئارنۆلـد ویلـسن نووێنـەری بـەریتانیا ، کـە لـەناو بردنـی شـێخ مـەحمودی بەپێوویـست دەزانـی لـەو بـارو دۆخـەو پەیووەندیـەکان ناوچـەو هەرێمەکـەدا ، کـە بـە هـۆی ئازایـەتی و خـۆراگری لەسـەرکردایەتی کردنـی ڕاپەڕینـەکان دژی بـەریتانیا و لایـەنگرانی لـە شـاری سلێمانی و دەووروبـەری لەباشووری کوردستاندا .

١٩١٩/٦/١٨ سەرکردەی سووپای بەریتانیا– فرایــزه – بــەخۆیی و هێزێکــی گــەووره بــەرەو ناوچــە راپەڕیووەکانی شێخ مەحمود لە شاری کەرکوك کەووتە ڕێ و لە هــەمان ڕۆژ بڕیــاری لەسـێدارەدانی شـێخ مـەحمود لەلایـەن ئەنجوومـەنی عـورفی سـەربازی بـەریتانیا دەرکـرا ، بـەڵام ئـەو بڕیـارە جـێ بـەجێ نەکرا ، دوای ئەوە بۆ هندستان ڕەوانە کرا بۆ ماوەی دەساڵ بە دورخـستنەوەی لــە هەرێمەکــەدا ... بــەڵام لــەدوای ئــەوە گەڕاندیانــەوە کوردستان.

١٩١٩/٦/١٨ بڵاو کردنـەوەی ڕاگەیانـدنی ژمـارە/ ٥٠ لەلایـەن حکوومـەتی شـێخ مـەحمود سەبارەت بە برینـدار کردنـی شێخ لەدەربەنـدی بازیان. لە هـەرێمی باشووری کوردستان .

١٩١٩/٦/١٩ بە هـۆی خیانـەتی هەنـدێ لـە کـوردە خۆفرۆشـەکان لـە سـەرەك عەشیرەت و ئاغاکـان ڕاپەڕینەکـەی شـێخ مـەحمود لــــــــە ناوچـەی تاسـلوجەو دەربەنـدیخان لەباشـووری کوردسـتان دامرکاندرانـەوە لەلایـەن هێزەکـانی سووپای بەریتانیا .

شایانی باسە ئاغاکان و شێخەکان لە هیچ کات و ساتێك هەوڵ و کۆشش و خەباتیان لە پێناوی بەرژەووەندی تایبەتی و گشتی کوردو کوردستان نـەبووە ، گـەر هەشـبووبێت گوونجـاو بـووە لەگـەڵ بەرژەووەنـدی تایبـەتی خۆیـان ،. چـونکە ئاغـاو شـێخ خـاوەن عەشـیرەت و هـۆزو تـیرە نەبوونـەو تـەنیا وەك بنەمالـەی تـاك . بـۆ نموونـە خێزانـە ئاغاکـانی هـەموو دەشـتی هـەولێر کۆبکەیتەوە بە قەدەری گوندێکی بچووکی عەشیرەتێك نابن ... ؟...!

١٩١٩/٦/٢٢ فەرمانداری گشتی بەریتانیا لە شاری بەغدا – ویلسن– نامەیەکی بە زمانی

فارسی ئاراستەی سەید تەهای شەمزینی کردو تیایدا گلەییەکی زۆری لە هەلوویستەکانی شێخ مەحمودی حەفید کردبوو ، لە هەرێمی باشووری کوردستان .

ئەویش لە بوارەکانی سەرکردایەتی کردنی ڕاپەڕیوانی گەلی کوردستان .

دەستەی نوێنەرانی کۆنگرەی ئەرزەرۆم لە ساڵی ١٩١٩

١٩١٩/٦/٢٣ گریێ دانی کۆنگرەی ئەرزەڕۆم ، لە کۆمیتەی سەرۆکایەتی ئەم کۆنگرەیە سێ کورد بەشداری تێدا کرد کە ئەوانیش – شێخ فوزی– سەعدوللا بەگ –حاجی موسا بەگ میرزادە– بوون ، لە باکووری کوردستان ، کە بە یەکێك لەخالە هەرەگرنگەکانی شۆڕشی شێخ سەعیدی پیران دا دەنرێت لە باکووری کوردستان ، بۆ داهاتووی لەلایەنی نەتەوەیی و نیشتماندا .

١٩١٩/٦/٢٤ دامەزرێنەری کۆماری تورکیا – مستەفا کەمال ئەتاتورك – وەك بەرپرسی سێیەمی پشکێنەری سەربازی لە شاری ئەماسیا پەیامێکی ئارستەی کازم قەرە بەکر پاشا لە پارێزگای ئەرزە رۆم لە باکووری کوردستان کرد .

کە لە خاڵی یەکەمی پەیامەکەدا دەڵێ:–

کاپتنێکی بەریتانیا بەناوی – Mr .novid– لەشاری ئۆرفەوە ، کاتێك لەرێی قەزای سیڤەرەکەوە رۆیشتووە بەرەو قەزای پیران شەهر لە وولاتی فارس ، لەوێ چاوپێکەوتنی لەگەڵ عەشیرتە میللیەکاندا سازداوەو

گەڕاوەتەوە بۆ شاری ئورفە ، کە لەو سەردانەی کە دژ بەحکوومتی عوسمانی گەلێك پڕوپاگەندی ناهەموارو خراپی کردووە لە گەشتەکەیدا .

١٩١٩/٦/٢٨ لە دوای جەنگی یکەمی جیهان رێکەووتننامەی – ڤێرسای –لە گەڵ ئەلمانیا مۆرکرا لە هۆڵی ئاوێنەی کۆشکی ڤێرسایدا. خالەکانی ئەم رێکەووتننامەیە کە لە ٤٤٠ مادە و لە ١٥ بەشدا دارێژرابوو، بریتیبوون لە:-
بەدەست وە دانی تەواوەتی کۆلۆنیەکانی ئەلمانیا بۆ ئەوەی بەسەر سیستەمی سەر پەرستیاریدا دابەش بکرێن، بە گەراندنەوەی ئالزاس و لۆرین بۆ فەرەنسا ، هەروا گەراندنەوەی سپاردنی ئۆپێنی مالمێدی بۆ بەلژیکا.
دوای ئەوە بەرێووە بردنی راپرسی گشتی لە ئێشلێزڤیکی باکوور، ئەسپاردنی پرۆسی پۆلۆنیا .
هەروا هەندێك لە بەشەکانی پرۆسی رۆژهەلات و سیلیزیای سەرەوە بۆ پۆلۆنیا، ئسپاردن و بەرێووە بردنی دانتزیگ لە لایەن کۆمەڵی نەتەوەکان، ئەسپاردنی ناوچە چۆلەکانی دەووروبەری – هۆڵتشین – بە چیکسلۆڤاکیا، ئەسپاردنی مێسێل – کە لە دواییدا لیڤانیا داگیری کرد داگیر کردنی – سار– لە لایەن فەرەنسا بۆ ماوەی ١٥ ساڵ دوواخستنی راپرسی، ناسەبازی کردنی راینلەند و داگیر کردنی لە لایەن هاوپەیمانەکان بۆ ماوەی ١٥ ساڵ، قەرەبووکردنەوەی زیانەکانی شەڕ، کەمکردنەوەی ژمارەی هێزە سەربازیەکانی ئەلمانیا بۆ ١٠٠ هەزار سەرباز بە بیٚ فەرماندەیەکی گشتی، خزمەتی ژێر ئالآ، تانك، تۆپخانەی گەوورە.
هەروا بەرهەم هێنانی گازە ژەهراویەکان، فرۆکە یان زیلین، کەمکردنەوەی ژمارەی پاپۆرەکانی هێزی دەریاییی ئەلمانیا، کە نەتوانن زیاتر لە ١٠ هەزار تەن زیاتر هەڵگرن، بە بیٚ مافی هەبوونی ژێر دەریایی و چەك و چۆلە ئاسمانیەکان.
هەروا لە گەڵ چەندین بابەتی دیکە کە لە رێکەووتننامەکە دیارکرابوو بۆ کەمکردنەوەی توانای ئەلمانیاو چارەسەری کێشەکانی لە دەووڵەتانی دیکەی داگیرکراو و زیان لێکەوتوو لە جیهان لە ئەنجامی شەڕی یەکەمی جیهانیدا.

١٩١٩/٦/٣٠ لە دوای تەواو بوونی مۆڵەتی پشووی دانی– دیلیۆ ئارهی– لە رێگەی شاری

حەلـەبی ئێـستای سـووریا گەیـشتە شـاری مووسـڵو لـەوێ بـەرەو شـاری هەولێرلـە باشـووری کوردسـتان بەڕێکـەووت ، بەپلـەی یاریـدەدەری دادوەری ڕامیاری – ڕائد مۆری– کە لە ڕۆژی ٧/٣ی هەمان ساڵ گەیشتە شاری هەولێر .

بەڵام ڕائد مۆری تاکوو ٧/١٣ هەر لە هەولێر مایەوە لەنێوان ئەو دوو مێژووە ڕووداوی زۆر بەرپابوو لە لایەن جەماوەری پارێزگای هـەولێر دژی داگیرکـەری بەریتانیا .

١٩١٩/٧/٩ وەزیـری دەرەوەی بـەریتانیا بروسـکەیەکی ئاراسـتەی ویلـسن لـە شـاری بغـدا کردو ئاگاداری کردەوە ، بە ڕەزامەندی کردنـی حکوومـەتی بەریتانیا لەسـەر پێشنیارەکان ، ئەویش بەپێك هێنانی پێنج هەرێم لە دامەزراندنی حکوومـەتی ئئێراق لە داهاتوودا لەگەڵ وویلایەتی کوردی لە باشووری کوردستان.

١٩١٩/٧/١٥ بـەرپابوونی ڕاپـەڕین لەناوچـەی قـەزای عەمادیـە لـە باشـووری کوردسـتان بەسـەرکردایەتی کەسـایەتی کـورد شـەعبان ئاغـا ، کـە لـە ئـەنجام دادوەری بەریتانیا لە پارێزگای مووسڵ– ماکدۆنالـد– کووژرا ، کە کاردانـەوەی کـردە سەر باری هێزەکانی بەریتانیا لە ناوچەکەو بەرز بوونەوەی هەستی نەتـەوەیی و نیشتمانی جەماوەری کورد لە کوردستان .

١٩١٩/٧/١٨ بەهۆی بێزاری و ناڕەزایی جەماوەری شارۆچکەی ڕواندزی سەر بە پارێزگـای هـەولێر لەباشـووری کوردسـتان ، بـە دژیـەتی کردنـی هێزەکـانی سـووپای ڕووسـیا . لـە ئـەنجام هێزەکـانی سـووپای ڕووسـیای نـوێ پاشەکـشەیان لەناوچەکەدا کرد.

١٩١٩/٧/٢٣ لە ناوەندی کۆنگرەی یەکەمی کەمالیەکان لە پارێزگـای ئـەرزەرۆم لـە باکووری کوردستان ، جگە لە کۆمیتەکانی پارێزگاری مافی وویلایەتەکانی ڕۆژهـەلات ، کـە ژمارەیـك لـە گـەووره پیـاوانی کـورد بەتایبـەتی سـەرەك هـۆزو تیرەکـان بەشداریان تێدا کرد .

کە کەمال ئەتاتورك لەپێناو بەرژەوەندی تایبەتی خۆیو فێل کردنی لـە کـورد نامەی داواکاری بەشدار بوانیانی بۆ نووسیبوون.

١٩١٩/٧/٢٥ دادگـای عـورفی سـەربازی لـە شـاری بەغدا بڕیـاری لـە سـێدارەدانی بـۆ شـێخ مەحمودی حەفید دەرکرد .

بەســەرکردایەتی و ئامۆژگــاری بەرپرســانی بــەریتانیا ، بــەڵام حوکمەکــە جێبەجێ نەکراو دوای بەرەو هیندستان دوورخرایەوە بۆ ماوەی ١٠ ساڵ لە هەرێمەکەدا .

١٩١٩/٧/٢٩ شـــەریف پاشـــا نامەیـــەکی ئاراســـتەی ســـکرتێری یەکـــەمی باڵیۆزخانە لە پاریس – رۆبێرت ڤانسیتارت – بە ژمارە/٧ کرد. کـــە تێیـــدا هـــاتووە :- وەك پاشماوەی وتوێژی ئەوێ رۆژێ , بەپەلـــەم لـــەوەی وا لەگـــەڵ ئـــەم نامەیـــەم هـــاوپێچ، یاداشـــتنامەی خۆمنتـــان بـۆ دەنێـرم ، کە ئێـوە ئـەو پـەری لوتفتـان هەیـە بـەوەی بیدەنـە دەسـت جـەنابی بـەرێز– بـەلفۆر– و زۆر منـەتبارتان دەبم ئەگـەر هەرچـی زووتـرە , وەڵامـی ئەو بریاردانەم لێبگێرنەوە کەپێخۆشە لەو بریارە بیدات , چونکە من دەبێ بگەرێمەوە بەردەوام بم لەچارە سـەری حەسـانەوەم و چارەسـەری بە ئـاوی کانزایی، کە ناچار بوون بەهۆی گەیشتنی وەفدی کوردی داببرێم , بۆ ئەوەی بـێ ئـەوەی لەگـەڵ حکوومـەتی خـاوەن شـکۆی بـەریتانیا باشـتر وایـە واز لـە چارەسەری یەکەم بهێنم بۆ ئـەوەی سـەرقاڵی کاروباری کوردستان ببم لەگـەڵ ئـــەو کەســـانەی کـــە بـــەرێز بـــەلفۆر دەستنیـــشانیان دەکـــات بـــۆ ئـــەوەی بەشـــێوەیەکی رەســـمـــی لەهـــەموو ئـــەو پرســـیارانە بکۆڵێتـــەوە کـــە مـــن بەشێوەیەکی بەشیی لە یاداشتنامەکەمدا گێراومەتەوە .

بێگومان هێشتا زۆر شتی دیکە هەیە کە لەو کەمتر گرنگتر نین، کە ئێمە ل دەسـەریان بـیروورا بگۆرینـەوە. بەهـەر حـاڵ ئـەو ئاژاوەیـەی کـە وولات تێـی کـەوتووە زۆر زیـان بەخـشە بـۆ ژیـانی ئـابووری و بەهـەمان شـێوە بـۆ

ئەنگلستانیش , کارێکی بەپەلە هەیە کە من بەتایبەتی سەرنجی ئێووەی بۆ رادەکێشم.

بە تکا کردن لەوەی رێزلێنانم پێشکەش بە بەرێز بلفۆر بکەن , بەپەلە ئەم دەرفەتە دەقۆزمەوە بۆ ئەوەی رێزداری خۆشەویست کە سلاوی رێزلێگرتووانەی ئەوپەری دلسۆزانەم قەبوول بفەرموون.

١٩١٩/٨/٤ لە دوای داگیرکردنی شاری بۆدابستی پایتەختی مەژەر لەلایەن هێزەکانی سووپای رۆمانیا ، کە ئەویش بووە هۆی کۆتایی هێنان بە دەسەلاتی کۆمۆنیستەکان ، کە لەو کاتە رۆمانیەکان مەژەریان جێ هێشتو – ئەدمیرال هۆرس – بەهێزی سووپا چووە ناو پایتەختی هەنگاریا –مەژەر بەهۆی بارودۆخەکە لە ناوچەکەدا .

١٩١٩/٨/٦ لە هێرشێکی بەر فراوانیدا هێزەکانی سووپای بەریتانیا و لە ئەنجام شارۆچکەی ئامێدی لەباشووری کوردستان داگیر کرد.

١٩١٩/٨/٨ شۆرشگێرانی دەووروو‌بەری دەربەندی – مزوورگە– لە ناوچەی بادینان بە سەرۆکایەتی رەشید بەگ و لە ئەنجام هێزەکانی سووپای بەریتانیا پاشەکشەی پێکرا لە ناوچەکەدا .

١٩١٩/٨/٩ مۆرکردنی ریکەووتننامە لە نێوان رژێمی شایەتی فارس و بەریتانیا بەناوی – ئەنگلۆ ، ئێرانی– لەپێناو پاراستنی بەرژەووەندیە تایبەتیەکانیان لەبواری رامیاری و ئابووری و بازرگانی و سەربازی لەسەر خاکی رۆژ هەلاتی کوردستان.

١٩١٩/٨/١٣ بەرزبوونەوەی ئاواتەکانی کورد لەوکاتەی کە لەگەل لێژنەی – کنك – کراین – چاویان بەیەکتر کەوت لە کۆمەلەی گەلان لەگەل نووێنەری پارتی دیموکراتی کوردی.

کە داواکانیان بەدامەزراندنی دەوولەتێکی کوردی بوو لەو ناوچانەی کە زۆربەی هەرە زۆری کورد بوون... لەشارەکانی – فەریون و دیاربەکر و وان و بەتلیس و هەندێك لە ئەرزنجان لە باکووری کوردستان، هەروا داوای وویلایەتی مووسلیشیان کرد تاکوو دەروازەی دەریاو هەروا دەوولەتەکەیان بە سەربەخۆیەکی زاتی بێ لە ژێر ئینتیدابی بەریتانیا، کە بە عەرەب و تورك و فارس نەبەسترێتەوە.

دوای ئەوە لێژنەکە لە دوا راپۆرتی خۆیدا دیاریکرد بەپێکهێنانی دەوولەتی

كـوردی، كـە هـەموو ئـەو ناوچـانە بگەڕێتـەوە كـە بـە زمـانی كـوردی ئاخـاوتن دەكـەن كـە كەوتوونەتـە ژێـر دەسـەڵاتی ئێـران و ئێـراق و توركیـا لـە سـنووری پێشنیاركرا... كە بەریتانیاش پشتگیری كوردی دەكرد، بەڵام خوازیـار نـەبوو زۆر ناوچـە بخاتـە ژێـر دەسـەڵاتی كـورد لـە باشـووری كوردسـتان. بەتایبـەتی لەویلایەتی مووسل و كۆنگرەی ئاشتیش هەرێمی باشووری كوردستان جیا كردبووەوە لە كوردستانی گەورەو مامەڵەی تایبەتیان لەگەڵدا دەكرد جیا لـە ڕۆژهەڵات و باكوورو ڕۆژئاوای كوردستان.

١٩١٩/٨/١٩ لە دوای هەوڵ و كۆشـــــش و مانــدووبوونێكی زۆر وڵاتـــــی ئەفگانـــــستان ســــەربەخۆیی خـۆی ڕاگەیانـد بـەپێی پـەیمانی — الدروالیندی— . لــە ناوچـــەو كێــشووەرەكەدا

ئەویش بەناوی — كۆماری ئەفگانستان و بەردەوام بوونی تا ساڵی ١٩٣٦ ، ئـەویش بـە دامەزرانـدنی ڕژێمـی — شانـشینی ئەفگانـستان— لـە لایـەن ئـەمیر ئەمانووللە ، تاكوو ساڵی ١٩٧٣ .

ئـەویش بـە ڕووخانـدنی ڕژێمـی شانـشینی و ڕاگەیانـدنی ڕژێمـی كۆمـاری بـە پشتیوانی یەكیتی سۆڤیەت لە كێشووەرەكەدا .

كـە نـاوی پایتەختەكـەی شـاری —كـابوول—ە و ژمـارەی دانیـشتوانەكەی ٣,١٤٣,٠٠٠، ملیـۆن كەسـە . هـەروا ژمـارەی دانیـشتووانی وڵاتەكـەی، ٢٧,٧٥٥,٠٠٠ ملیـۆن كەسـە . هـەروا ڕووبـەری وڵاتەكـەی، ٢٥١,٧٧٢ كیلـۆ مەتر چوار گۆشەیە . هەروا چڕی دانیـشتووانەكەی ، ١١١ كـەس لـە یـەك میل

چوار گۆشـەدا . هـەروا نـژادەکانی ، ئەفگانستان ١٤ گروپی نـژادی جیاوازی تێدایە ئەوانیش :- داری ، بشتۆن ، ئۆزبەکی ، تورکمان ، کورد ، بالووش ، بنجابی . لە وولاتەکەدا .

١٩١٩/٨/٢٤ ڕاپەرینەکەی سوارەتووکەی قەلاَی سەعیات لە دۆڵی مەلا عارەب لە باشووری کوردستان ئەنجامدرا دژی هێزەکانی سووپای بەرتانیاو لە ئەنجام فڕۆکەیەکی جەنگی هێزەکانی سووپای ئاسمانی بەریتانیا خرا خوارەوە لەناوچەکەدا .

١٩١٩/٩/٤ گرێدانی کۆنگرەی - سیواس- ی تورکە کەمالیەکان لە باکووری کوردستان ، کە لە ڕۆژانی کۆنگرەکەدا - میجەر نوئیل و ، جەلادەت بەدرخان‌و ، ئەکرەم جەمیل پاشا - لەگەشتەکەیاندا گەیشتنە شاری - مەلاتیە- ئەم سەردانە کێشەیەکی زۆری بۆ کەمالیەکان دورستکرد لە بەرپابوونی ڕاپەڕینی کورد دەترسان ، لە بەر ئەوە مستەفا کەمال بڕیاری گرتنی شاندەکەیدا ، کە بەناو خاکی کوردستان دەسووڕانەوە دەرکرد بە دەستگیر کردنیان لە هەرێمەکەدا .

دەستەی نوێنەران لە کۆنگرەی سێواس . لە ساڵی ١٩١٩

١٩١٩/٩/١٧ مستەفا کەمال ئەتاتورك لە نامەیەکیدا بۆ فوئاد پاشای ئەندامی پەرلەمان لە ئەستەمبوڵ کە تیایدا دەڵێ:-

وەزیری کاورباری شەڕو وزیری ناوخۆ بوونەتە هاوکاری جینایەتی دامات

فرید پاشای سەرەك وەزیران . ئەوانەش بۆ خنکاندنی دەنگی نەتەوەو نەناسینی کۆبوونەوەی فەرمی - کۆنگرەی سیواس- رووبەروو کردنەوەی کوردو تورك و موسڵمانانن لەگەڵ یەکتر لەناو هەوڵی خیانەتدان .

لە هەڵبژاردنی ئەرشیفی تایبەتی ئەتاتورك.بڵاو کراوەی وەزارەتی رۆشنبیری/ لاپەرە/٧١.

١٩١٩/٩/٢١ کۆتایی هاتنی گەشتەکەی میجەر نوئێل لەباکووری کوردستان لەگەڵ شاندەکەی کوردو گەڕانەوەی بۆ باشووری کوردستان.

١٩١٩/٩/٢٤ مستەفا کەمال ئەتاتورك لە پارێزگای سیواس لە باکووری کوردستان راپۆرتێکی وردی ئاراستەی ژەنراڵ - هاربۆرد- ی سەرۆکی دەستەی تووێژینەوەی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا کرد ، کە تیادا دەڵێت:-

پارچەکردنی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی دەبێتە هۆی دروست کردنی شەڕێکی برا کوژی لە نێوان کوردو تورکدا ، بە بەشداری کردن لە پلانی دروست کردنی کوردستانێکی سەربەخۆدا دەردەکەوێ... کوردەکانی پڕ کرد لە هەرێمەکەدا .

ئەو دۆزەی هێناویانەتە پێشەوە هەرچۆنێك بێت ئیمپراتۆریەتەکە هەڵدەوەشێندرێتەوە ، هەروا بۆ بەئەنجام گەیاندنی ئەم بیروو بۆچوونەی خۆیان پارەیەکی زۆریان خەرج کردوو هەموو جۆرە سیخووڕیەکیان تاقیکردۆتەوە ، دژی کوردو داهاتووی کورد لە سەرخاکی کوردستاندا .

١٩١٩/١٠/٤ لە هەڵمەتێکی شۆڕشگێرانی کورد لەناوچەی ئاکرێ لە باشووری کوردستان هێرشیان کردە سەر هێزەکانی سووپای بەریتانیا ، لە ئەنجام - کۆلۆنێل بیل و ، کابتن سکۆت- یان کووشت لە نزیك گوندی - بیرەکەپرە - لەناوچەکەدا .

١٩١٩/١٠/٩ رێکەووتننامە لە نێوان سەرەك وەزیرانی فارس و وەزیری موختاری بەریتانیا سیر پریس کوکس مۆرکرا ، کە لە زنجیرەیەك گفتووگۆی چڕی بەردەوام ئەم رێکەووتنە گەیاندرا ئەنجام ، کە لە دوو بەش پێك هاتبوو ، بەشی یەکەم:- لەسەرەتایەك و شەش مادە ، بەشی دووەم :- لە چوار مادە بەپێی

خواستەکانی بەرژەوەندی هەردوو دەسەڵاتی فارس و بەریتانیادا .

١٩١٩/١٠/١٢ بەرپرسی بەریتانیا – مستەربیل – پلەی دادوەری رامیاری لەشاری موسڵ و دەوورووبەری گرتە دەست ، لە دوای دادوەری رامیاری – لچمەن– کە بۆ کوویت گواسترابووەوە ، مستەر بیل لەگەڵ نەقیب سکۆتی یاریدەدەری دادوەری رامیاری لەشاری عەقرە لە هەموو پارێزگای هەولێرلە باشووری کوردستان سووڕانەوە ، لە پێناو هێوورکردنەوەی باروودۆخەکە ، ئەویش بە هۆی جمووجوڵی شۆرشگێرانی پارێزگاکەدا .

١٩١٩/١٠/١٢ نووسەرو رووناکبیر خاتوو دۆریس لیسینگ لەدایك و باوکێکی ئینگلیز لە تارانی پایتەختی ئێران لەدایك دەبێ... جێگەی ئاماژە پێکردنە کە باوکی لیسینگ فەرمانبەرێکی بانکی ئیمپریالی و دایکیشی پەرستیاربووە. لە ساڵی ١٩٢٥ ئەم خێزانە ئێران بەجێ دێڵن و بەرەو رۆدیسیای باکوور – زمبابۆی ئێستا – دەچن... لیسینگ ژیانی سەرەتایی منداڵی خۆی بەوە وەسف دەکات، بە تێکەڵ بوون لە نێوان ژیانی پر لەخۆشی و ئازاردا لە بەر ئەوەی لە ژیانێکی

کۆڵەمەرگیدا دەژیا.

بـەڵام بەهـەوڵ و توانـای کـارکردن و خووێنـدن بـەجۆرێك تـام و چێژ لـە ژیـان وەردەگرێـت... هـەر وەك دۆریـس لیسینگ خـۆی دەڵێـت :- پێم وایـە ژیـانی منـداڵێتی کۆڵـە مەرگانـە باشـترین رێگـاو هۆکـار بوونـە بـۆ دروسـتکردنی رۆماننووسـێکی گـەوورە، هەرچـەندە مـن لـە منداڵیەتیمـدا هەسـتم بـەوە نەدەکرد... بەڵام هەر ئەوەش منی بەم رۆژە گەیاندووە.

لەگەڵ ئەوەشدا لیسینگ لە ژیـانی خۆیـدا بەنووسـین لـە دەرگـای زۆر پرسـی و رامیـاری و هـزری و کۆمەڵایـەتی داوە. زۆر ململانێـی رۆشـنبیریەکان یـان بەزاروە نوێیەکـەی پێکـدادانی شارسـتانیەکانی نووسـیووە و بەهـەمان شێووە لـە بـارەی سیسـتەمی کۆمەڵایـەتی و رەگـەز پەرسـتی زۆری نووسـیووە بـەر لـەوەی دۆریـس خـەڵاتی نـۆبڵ وەربگرێـت و چـەندین خـەڵاتی دیکـەی جیهـانی لەبواری ئەدەبدا بەدەست هێناوە وەکوو :-

خـەڵاتی وولاتـی نەمسا بۆ ئـەدەبی ئـەورووپی و خـەڵاتی شکسپیر لـە کۆمـاری ئـەلمانیا و مـەدالیای شـەرەف شـاژن ئـەلیزابێت و خـەڵاتی شـا ئاسنورپاسـی ئیسپانی... دوای ئـەو هـەموو خەڵاتـە تـوانی لەتەمـەنی ٨٨ سـاڵیدا خـەڵاتی نۆبلی /٢٠٠٧ بباتەوە کە بووە مایەی شانازی بۆ سەرجەم ئافرەتانی جیهان.

سەرچاوە :- گۆڤاری دووبەی الثقافیة /٣٠.

١٩١٩/١٠/٢٢ نووێنـەری کـورد شـەریف پاشـاو سـەید عەبـدولقادر ئەفەنـدی سـێ نامـەی هاوبەشـیان ئاراسـتەی ئەنجوومـەنی بـاڵای کـۆنگرەی ئاشـتی لـە پاریـسی پایتـەختی فەرەنـسا کـردو داوایـان کـرد ، کـە کوردسـتان دابـەش نـەکرێت و یارمەتی تورك نەدرێت لەلایەن هێزەکانی سووپای هاوپەیمانان لە سەر خاکی کوردستاندا .

١٩١٩/١٠/٢٦ لە دایك بوونی - محەمەد رەزاشای ئێران- خووێنـدنی ناوەنـدی لـە سویسرا تـەواو کـردو لەگـەڵ برابچووکی عـەلی ، دوای ئـەوە گـەراوە بـۆ ئێران و چووە کۆلێـژی سـەربازی ، دوای ئـەوە لـە تەمـەنی ١٩ سـاڵان فوزیـەی کـچی مـەلیك فوئادی یەکەمی شانشینی وولاتی میسری خواست و بووە هاوسەری .

شایانی باسە کە شانشین فوئادی یەکەم لە بنەماڵـەی محمد عـەلی پاشا بووە بەناوی بنەماڵەی خدێووی و لەنژاد کوردن ، کە لەبنـەڕەتا خـەلکی پارێزگـای

دیاربەکری باکووری کوردستان بوونە .

١٩١٩/١٠/٢٧ نووێنەری بەریتانیا لە ئێراق - میجەرنوئێل - نووسراوەیەکی ئاراستەی سەرۆکی ئەمەریکا ویلسن کردو داوای لێکرد . کە یارمەتی کورد بدرێت بە هۆی چەوسانەوەو داگیر کردنی نیشتمنانەکەیان بە درێژایی ٤٠٠ پێش ئێستا لەلایەن ئیمپراتۆریەتی عوسمانی و دەسەڵاتە یەك لە دوای یەکەکانیادنا لە هەرێم و کێشووەرەکەدا .

١٩١٩/١٠/٣١ نووێنەری کورد شەریف پاشای خەندان سەردانی شانشینی سوویسرای کرد ، لە پێناو بەشداریکردنی لە کۆنگرەی ئەوروپا لەبارەی کێشەی مافەکانی گەلی کورد ، کە لە لایەن - سەیام ئەدین - پێشوازی لێکرا، کە یەکێك بوو لە تورکە ئازادیخوازەکانی لایەنگیری کورد لە باکووری کوردستان.

١٩١٩/١١/١ لە لایەن بەرپرسانی بەریتانیا بریاری کردن دامەزراندنی پارێزگای هەولێر درا وەك پارێزگا لە هەموو لایەنەکانی کاروباری بەرێوەبەرایەتی و کارگێری لە پێناو هەڵسووراندنی ئیش و کارە هەمە لایەنەکان لە باشووری کوردستان .

١٩١٩/١١/٨ بڵاو کردنەوەی یەکەم ژمارەی ڕۆژنامەی – پێشکەوتن– لەشاری سلێمانی لە باشــووری کوردســتان ، کــە بــۆ مــاوەی ســێ ســاڵ بــەردەوام بــوو لــە بلاوکردنەوەیدا.

١٩١٩/١١/١٢ وەزیــری دەرەوەی ڕژێمــی فــارس – نەســرەت دەوڵــەت– ســەردانی وەزیــری دەرەوەی بەریتانیا– کیرزن– ی کرد ، ئەویش بەپێشکەش کردنی یاداشتێك لــە بــارەی خواســتەکان بەنەخشــەیەکی شــووێنە داواکاریــەکانی فــارس ، کــە زۆربەی داواکانی لە سەر خاکی ڕۆژهەڵاتی کوردستان بوولە ناوچەکەدا .

١٩١٩/١١/١٣ لەنامەیەکی وەزیری دەرەوەی بـەریتانیا– لـورد کـیرزن– بـۆ نووێنــەری بــەریتانیا لــە ئێراق– سیر پرس کۆکس – لــە بــارەی یاداشــتەکەی وەزیــری دەرەوەی فــارس نەسرەت دەولەدا کە دەڵێ:– پێشنیا ری یەکەمی نەسرەت دەوڵــەت– پەیووەنــدی بــە دەســتکاری کردنــی هێڵــی سنووری ئێران . لـەلای ڕۆژئـاوای وولاتەکـەی هەبووە . کە دەبێ بەشێکی گەوورە لە خاکی کوردستانی ژێر دەسەڵاتی عوسمانی پێبدرێو بخرێتە سەر بەشە کوردستانی ژێر دەسەڵاتی فارسدا . واتە جگە لە هەرێمی ڕۆژ هەڵاتی کورستان بەڵکوو خواستەکانیان هەرێمەکانی باشوورو باکووری کوردستانیشی هەبووە لە ناوچەکەدا .

١٩١٩/١١/١٤ بـەهۆی بـەرز بوونـەوەی جمووجـۆڵی جـەماوەری ناوچـەی ئـاکرێ لەباشـووری کوردسـتانو داگیر کردنـی لەلایـەن هێزەکـانی سـووپای بـەریتانیا ، لـە ئاکـام بووە هۆی هەڵگیرسانی شەڕ لە نێوانیان لە ناوچەکەدا .

١٩١٩/١١/١٧ وەزیــری کاروبــاری دەرەوەی دەســەڵاتی فــارس– فــەیروز مــیرزا نەســرۆ–

لەیاداشتێکی بۆ وەزیری دەرەوەی بەریتانیا- لورد کیرزن- دا دەڵێ:- کورد بەسەر ژمارەیەکی زۆر لەخێڵو هۆز دابەش بوونو لەگەڵ یەکتری ناکۆکن ،و ئەم خێڵانە نەتەوە پێك ناهێننو ناتوانن یەکیەتی رامیاری دورست بکەن لە ناوچەکەدا ...؟..

١٩١٩/١١/٢٠ نووێنەری کورد شەریف پاشا لە کۆنگرەی ئاشتی لە پاریسی پایتەختی فەرەنسا لەگەڵ - ئۆگۆس نۆبار پاشا- پاشای نووێنەری ئەرمەن رێکەووتنامەیەکیان مۆر کرد ، لەبارەی هاورێیەتیو پەیووەندی کوردو ئەرمەن ، لەپێناو ڕزگار بوونیان لەژێر دەسەلاتی تورك لەرۆژهەلاتو باکووری کوردستان.

جێگەی باسکردنە کە نووێنەری کورد شەریف پاشای خەندان لەم رۆژەدا نامەیەکی بە ژمارە/٦ ئاراستەی بڕێز -کلیمۆنسۆ- سەرۆکی کۆنفرانسی ئاشتی لە پاریسی پایتەختی فەرەنسا کرد ، کە ئەمەی خوارەوەش دەقی نامەکەیەتی:-

ئێمە ئیمزاکارانی ئەم نامەیە ، نووێنەرانی نەتەوەکانی ئەرمەن و کورد ، شەرەفی ئەوەیان هەیە ئەوە بە کۆنفرانسی ئاشتی ڕابگەیەنین کەوا هەردوو نەتەوەی ئێمە ، کە هەردووکیان ئارین ، یەك بەرژەوەندی و یەك ئامانجیان هەیەو ئەمە واتە ئازادی و سەربەخۆییان ، بە تایبەتی بۆ ئەرمەنیەکان .

بە رزگاربوونیان لە دەسەلاتی ستەمکارامەی حکوومەتی تورك و بەگشتی ، هەم بۆ ئەرمەنیەکان و هەم بۆ کوردەکان ، ئازاد بوونیان لە تۆقی کۆمیتەی ئیتحادو تەرەقی ، مە حکوومەتە رەسمیەکان و شاردراوەکان بۆ هەر یەکیان ئەو هێندە شووم بوون .

ئێمە بە تەواوی لە سەر ئەوە رازین کە پێکەوە داوا لە کۆنفرانسی ئاشتی بکەین کوا بە گوێرەی پرنسیپەکانی ناسیۆنالیستی ، ئەرمەنستانێکی

یەکگرتووی سەربەخۆو کوردستانێکی سەربەخۆ بە کۆمەکی گەورە هێزێك دروست بکرێ . دوای گوێ لێگرتنی لە خواستی هەردوو نەتەوەکان یەك لە دوای یەك ، بۆ ئەوەی کۆمەکی تەکنیکی و ئابووریان لە ماوەی دووبارە بوونیاتنانەوەی پێشکەش بکات .

ئەوەی پەیووەندی بە بەخشینی ناوچە ناکۆکی لە سەرەکان هەیە ، کە لە ناو یاداشتنامەکانی هەر یەکماندا دیاریکراوە کە یەك لە دوای یەك پێشکەش بە کۆنفرانسی ئاشتی کراون و دیاریکردنی هێلکێشانی دواین سنووری نێوان هەردوو دەووڵەتی دوا رۆژ هەیە ، ئێمە شێلگێرانە رایدەگەیەنین کە ئێمە بە تەواوی دەچینە ژێر باری بروانامەکانی کۆنفرانسی ئاشتی ، لە پێشا قەناعەتمان بەوە هەیە ، کە بریارەکەی لە سەر بنەوانی دادوەری و مافەوە دیاری دەکرێ.

ئێمە جگە لەوە دووپاتی دەکەینەوە ، کە تەواو رەزامەندین لە سەر رێزگرتنی مافی شەرعی کەمینە نەتەوایەتیەکان لە ناو هەر دوو وولاّتدا . بفەرموون بەرێز هەستی رێزگرتووانەی لە هەمووان دڵسۆزانە ترمان قەبووڵ بفەرموون .

بۆ ئەرمەنستان ، ئۆهان جیهانیان ... سەرۆکی شاندی ئەرمەن

،.. بۆ کۆنفرانسی ئاشتی ... بۆ نووێنەری کوردستان ، شەریف

...بۆ ئەرمەنستان ... بۆگس نۆبار ... سەرۆکی شاندی نیشتمانی ئەرمەن .

١٩١٩/١١/٢٦ بلاّوکردنەوەی یەکەم ژمارەی گۆڤاری – بەیان – لەشاری سلێمانی لەباشووری کوردستان .

١٩١٩/١١/٢٧ وەزیری کاروباری دەرەوەی بەریتانیا – لورد کیرزن– سەبارەت بەکێشەی کورد لە وەلاّمی یاداشتەکەی وەزیری دەرەوەی ئێران ، کە بۆسیر پرسی کوکس نووسیبووی دەڵێ:–

بەپێی ئەو زانیاریانەی بەدەست گەیشتوون ، کە هەموو شاخەکانی دەووروبەری و پارێزگای و رمێ لە رۆژهەلاّتی کوردستان لە ژێر دەستی جەردەکانی سمکۆی شکاك دایە... لورد سەبری بەو یاداشتنانە دەهات کە لەبارەی هەلوویستەکانی رژێمی فارس بلاّودەکرانەوە لەهەرێمەکەدا.

١٩١٩/١٢/٣ وێنە کێشی بەناوبانگی جیهانی– ئۆگست رینوار– کۆچی دوایی کرد لە شاری لیموکی باشووری فەرەنسا.

١٩١٩/١٢/٦ یاریدەدەری ئەفسەری رامیاری نوێی بەریتانیا – نەقیب کیرک – سەرکردایەتی هێرشێکی سەربازی کرد بە پەلاماردانی هۆزی سوورچی لە ناوچەی ئاکرێ، بەسەرکردایەتی شێخ رەجەب و لە ئاکامی شەڕی نێوان هێزەکانی بەریتانیاو چەکدارانی هۆزی سوورچی و لە ئاکامدا سەرکەووتنیان بەدەست هێنا بەسەر هێزەکانی بەریتانیا . لە ئەنجام زیاتر لە ٣٠٠ کووشتارو برینداریان هەبوو لە ریزی سووپای بەریتانیا.
که بووه هۆی ئەوەی هێزەکانی سووپای بەریتانیا سووپاکەیان لە ناوچە کە بە هێزبکەن و هێزی دیکە رەوانەی ناوچەکە بکەن و دەستیان کرد بە بۆردومان کردنی پێگەی سوورچیەکان بە فرۆکەی سەربازی و تانگ و زرێپۆش، لەئاکامدا هێزەکانی سوورچی پاشەکشەیان کرد بۆ ناوچەی بارزان و شاخە بەرزەکانی باشووری کوردستان.

١٩١٩/١٢/٢٩ بە هۆی جێبەجێکردنی خواستەکانی – حایم وایزمان – سەرکردەی جوولانەوەی سەهیۆنیزم ، نامەیەکی ئاراستەی سەرەك وەزیرانی بەریتانیا – دیفید لوید جۆرج– کرد لەبارەی باکووری فەلەستین–سەهیۆنی ، ئەویش بەداواکردنی کەنارەکانی ئاوی بەناو عەرەبی بەتایبەتی ئاوی ناوچەی لوبنان و ئوردن لە ناوچەکەدا .

## ١٩٢٠

١٩٢٠/١/٣ بلاوکردنــــەوەی یەکـــــەم چـاپی – مـەم و زیـن– ی نووســـەرو روونـــاکبیری کـــورد لـــە بـــاکووری کوردســتان – ئەحمــەدی خانی – بەزمانی کوردی و بـەپیتی عـەرەبی لەشاری ئەســتەمبوڵ ، بــەلام لــە دوای ئـــــەوە رژێمـــــی شـۆڤینی تـورک هـەمووی کـۆکردەوە و سـووتاندی ئـــەوەی لـــەناو تورکیـــا بەردەسـتی کـەوت ، لەبـەر ئەوەی تەنانەت بەزمانی ڕەسەنی کوردی بوو لە وولاتەکەدا .

١٩٢٠/١/٧ دامەزرێنـەری کۆماری تورکیا مستەفا کـەمال ئـەتاتورك لـە شـاری ئەنکـەرە تەلـەگرافێکی ئاراسـتەی رەشـید بـەگی بـرای ئەدهـەمی چـەرکەس کـرد ، کـە لەبەشێکی تەلەگرافەکەدا دەڵێ:– بەدەر لەبابەتەکە دەمەوێ بڵێم:–
ئانزا فۆری سووك و ئینگلیز هـەوڵی جوولە پێکردنـی ئەوانە دەدەن، ئـەم برا چـەر کەسـانەمان هاوولاتیـەکی بـەرێزن لـە ئـایین و دەوڵـەتمان. ستایـشی هەموویان دەکەین و دەیانکەینە تاجی سەرمان .
لەراستیدا ئەمرۆ دووژمنان چواردەووری کوردو تورك و چەرکەس و برایانی دیکـەی ئاینمانیـان گرتـووە . دەسـتان بخەنـە نـاو دەسـتی یـەك لـەپێناو رزگـار کردنی ژیان و ناموسمان ئەمە زەرورەتێکە.
لەوکاتەدا دەسەلاتی تورکە پاشماوەکانی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی لەوپەڕی بێ هێزی و بێ توانا بوون و دەستیان بۆ هەموو مل کەچیەك درێژ دەکرد ،

لەپێناو بەهێز کردنی دەسەڵاتیان بەتایبەتی لەباکووری کوردستان و ناوچەکانی دیکەی ژێر دەسەڵاتیان ... گەر کورد ئەوکات سەربەخۆی خۆی رابگەیاندابایە سەرکەووتنی مسۆگەر بوو لەپێك هێنانی دەووڵەتی کوردی لە باکووری کوردستاندا...!.

١٩٢٠/١/١٦ لە دوای دامەزراندنی کۆمەڵەی گەلان لەلایەن ووڵاتانی هاوپەیمان بە تایبەتی بەریتانیاو فەرەنساو ئەمەریکاو رووسیا ، یەکەم کۆبوونەوەی خۆی گرێدا لەشاری جنێڤدا .

مستەفا کەمال لە گەڵ چەند کەسایەتیەکی کورد لەسالی ١٩١٩

١٩٢٠/١/١٨ شاعرو نووسەری چەوساوەو هەژارانی ناوداری کورد مامۆستا – ئەحمەد مستەفا ناسراو بە – دلزار– لە بنەماڵەیەکی رۆشنبیری شاری شاعرو نووسەران و رووناکبیرانی کورد شاری کویسنجقی ، سەر بە پارێزگای هەولێر لە باشووری کوردستان چاوی بە جیهان هەڵهیناوە لە شارەکەدا .
لە ساڵی ١٩٢٥ دەستی بە خوێندن کردووە لە لای مەلای ئایینی و دوایی خوێندنی سەرەتایی و ناوەندی لە شارۆچکەی کۆیە تەواو کردووە .

دوای ئـەوە لـە سـاڵی ١٩٥٩ پەیوەنـــدی كـــردووە بـــە ڕێكخراوەكـــان و دوایـــی پەیوەنـدی كـردووە بـە پـارتی كۆمۆنیستی ئێـراق و بەردەوام بـووە لـە كاری پارتایـەتی و لـە پلـــەكانی ئـــەو پارتـــە كـــاری كردووە .

دوای ئـەوە لـە سـاڵی ١٩٧٠ لـە شـــاری مۆســـكۆی پایتـــەختی ســـۆڤیەت پـــەیمانگای زانـــستە كۆمەڵایەتیەكانی تـەواو كـردووە و هـــەروا لـــە ســـاڵی ١٩٨٨ لـــە شاری سۆفیای پایتەختی بولگاریا لە هەمان پیمانگا خوێندوویەتی .

هـەروا مامۆسـتا دلـزار ئەنـدام بووە لـە یەكیـەتی نووسـەرو ڕۆژنامەنووسـان و ئەدیبان و چەندین لرێكخراوی دیكەدا .

هەروا چەندین دیوانی شیعری لە ماوەی ژیانیدا بەرهـەم هێنـاوەو بە شـاعیری چەوساوەكان ناوزندە لە كوردستاندا .

تا تەواو بوونی ئەم كتێبە مامۆستا دالـزار لـە ژیـان مـابوو ، بـەڵام لـە تەمـەنی ٨٩ سـاڵیدا كـە لـە شـاری هـەولێر نیشتەجێ بـوو كـە بـرا گـەورەی مامۆسـتای نووسەرو ڕۆژنامەنووس كەریم شارەزایە .

١٩٢٠/١/٢٢ بە هۆی سەركەووتنی كەمالیە توركەكان لـە شـەڕی ئەنبونۆو لـە ئـەنجامی ئـەو سـەركەووتنە لـە پاریـسی پایتـەختی فەرەنـسا كۆنگرەیـەك گرێـدرا ، كـە نووێنـەری ئیتالیـا بەشـداری تێـدا كـردو داوای دەسـتكاری كردنـی پـەیمانی سیڤەری كرد .

وەك ئـەوەی كـە توركـەكان داوایـان دەكـرد ، كـە ئەمـەش بـووە هـۆی گرێـدانی كۆنگرەی هاوچەشن لە لەندەنی پایتـەختی بەریتانیا ، لەگـەڵ ئەوەشدا كورد

ڕۆلی گرنگیان بینی لەسەرکەووتنی کەمالیەکان...؟.

١٩٢٠/١/٢٨ نووێنەرە نەتەوە پەرستەکانی ناو پەرلەمانی عوسمانی لە شاری ئەستەمبۆلْ پرۆگرامێکی /٦ خالیان ئامادە کردبوو ، کە بە ئەنجوومەنی ئەنکەرەو بە پەیمانی نەتەوەیی دادەنرا . کە لەو کاتە کێشەی کورد لەتورکیا لە باکووری کوردستان ببووە یەکێ لەکێشە هەرە گرنگەکانی تورکیا ، هەرچەند لە ناو نەتەوەیی پەیمانی تورك کێشەی کورد پشت گوێ خرابوو لە ناوچەکەدا .

١٩٢٠/١/٢٨ گرنگی دانی رژێمی تورکیا بەپارێزگای کەرکوك کارێکی نوێ نیە لە رامیاریەتی تورکیای دوای هەرەس هێنانی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی و دەگەرێتەوە بۆ رۆژانی سەربەخۆیی تورکیا بەر لەساڵی ١٩١٩ -١٩٢٢ کە وویلایەتی مووسڵ لەژێر نەخشەی تورکیادابوو... کە ئەنجومەنی نیشتیمانی تورکیا بریاری بۆ دابوو لە کۆبوونەوەیەکی نهێنی لەم مێژووەدا لەشاری ئەستەمبوّل کە ناسراو بوو بە - میساقی نیشتیمانی - و لەمانگی /٤/١٩٢٠ ئەنجامی ئەم کۆبوونەوەیە راگەیاندرا بەهۆی پاڵەپەستۆی بەریتانیاو ئەمەریکاو وولآتانی هاوپەیمان نە وازهێنانی لە ویلایەتی مووسل بەرامبەر چەند دەست کەوتێك لەوکاتدا.

سەرچاوە:- تاریخ تورکیا المعاصر - دانانی کۆمەڵە توێژەرێکی سۆڤیەت.

١٩٢٠/٢/٢١ کەسایەتی و سەرکردەی ناوداری کورد - سەید عەبدولقادری شەمزینی - لە شاری ئەستەمبوّڵ تورکی چاوی کەووت بە مەندووبی سامی بەریتانیا ، هەر لەو کاتیشدا داخوازیەکانی کوردو کوردستان وباری کوردستانی پێ ڕاگەیاند ، بەهۆی چەوساندنەوە لەژێر رژێمی تورك بە تایبەتی لە باکووری کوردستان .

١٩٢٠/٢/٢٤ مۆرکردنی رێکەووتننامە لە نێوان کوردو ئەرمەن لە باکووری کوردستان ، لە پاریسی پایتەختی فەرەنسا ، لەلایەن نووێنەری کوردو ئەرمەن ، کە شەریف پاشا بەمۆری خۆی رێکەووتنەکەی مۆرکردو بلآوکردەوە بەسەر هەردوو نەتەوەدا.

١٩٢٠/٢/٢٥ سەرەك وەزیرانی بەریتانیا - لوید جورج - لەبەردەمی کۆبوونەوەی ئەنجوومەنی گشتی بەریتانیا رایگەیاندو گووتی :- ، کورد مافی چارەی خۆنووسینی لە سەر خاکی خۆی هەیە لە کوردستان.

١٩٢٠/٢/٢٧ نووێنەری کورد عەبدولقادر شەمزینی لەلای تورك لە ڕۆژنامەی - ئەل ئیقدام

– وتارێکی لە دژی رێکەووتنی کوردو ئەرمەن ، بلاو کردەوە کە شەریف پاشاو ، ئۆغز پاشا لە پاریسی پایتەختی فەرەنسا مۆریان کردبوو لە سەر رێکەوتننامەکە ، لە پێناو کۆتایی پێ هێنانی کێشەی نێوان کوردو ئەرمەن لە باکووری کوردستان .

١٩٢٠/٣/١ لە دوای کۆتایی جەنگی یەکەمی جیهان و ئارام بوونەوەی بارودۆخەکانی پەیووەندی لە نێوان وولاتانی جیهانو ناووخۆی وولاتان – ئەدمیراڵ هۆری – بە شانشینی هەنگاریا – مەژەر هەلبژێردراو ، کۆنت ئستفان بێلن – بە سەرەك وەزیران هەڵبژێردرا، کە ڕژێمی ئەو کاتی مەژەر بە ڕژێمێکی توونـدڕەو دژ بە هەموو بیروو بۆچوونو جوولانەوەیەکی مرۆڤایەتی و نیشتمانی دادەنرا لەناوچەکەدا .

١٩٢٠/٣/٣ نووێنەرانی هاپەیمانان لە ئەنجامی گفتووگۆی نێوانیان لە ناو کۆمەڵەی گەلان لە شاری ژنێڤ بڕیاری ئەوەیان دا کە ئێراق لە دوای دامەزراندنی بچێتە ژێر ئینتیدابی بەریتانیا.

١٩٢٠/٣/١١ لەو کاتەی کە ئەنجوومەنی راوێژکاری دەووڵەتی هاوپەیمانان رەشنووسی پەیمانی سیڤەریان دا بە دەست شاندی عوسمانی، کورد لە تورکیا لە رادەبەدەر پێی دڵخۆش بوون، هەرچەندە عوسمانیەکان ئەم لاو ئەولایان دەکردو هەنجەتیان هێنایەوە، بەلام بێ سوود بوو، و ناچار بوون لە رۆژی ١٩٢٠/٨/١٠ دا پە یمانەکە مۆر بکەن.

جێگەی روونکردنەوەیە کە مادەی /٦٢ لە پەیمانی سیڤەر ئەوەی گرتە خۆ کە زەمینە خۆش بکرێ بۆ دامەزراندنی حووکمێکی ئۆتۆنۆمی لەو ناوچە

کورد نشینەی کە کەوتۆتە رۆژهەلأتی زێی فووراتی و باشووری ئەرمینیا، کە لـە گینـە دابمـەزرێ، بـاکووری سـنووری تـازەی هـەردوو دەوولـەتی ئێـراق و سوریا، وکورد لە سایەیدا لە رووی رۆشنبیری و رامیاریـەوە حووکمی زاتیان هەبێ، بە مەرجێ لیژنەیەکی نێوودەوولەتی هاوبەش لـە نووێنـەری فەرەنساو بەریتانیاو ئیتالیاو ئێران و کورد ، سەرپەرشتی ئەو کێشانە بکات کە لەمەر دیـاری کردنـی سـنوورو زامنکردنـی مـافی کەمینـەی ئاسـووری — کلـدانی لـە ئاراداان و هەن.

هەروا لە مادەی /٦٣ لە پەیمانی سیڤەردا، ئەوەی لە خۆ گرتووە کە تورك بە لێنـی ئـەوە بدەن کە دان بە بریارەکـانی ئـەم لیژنەیـە بکـات و جـێ بـە جێـی بکـات. بـەلأم مـادەی /٦٤ لـەوەش زیـاتر هاتۆتـە پێـشێ وهیـوای زۆرتـری خستۆتە بەر کوردان، کە دەرگـای لـە بەردەم ئەگەری یەکێتیـەك لـە نێـوان ئـەم ناوچە سەر بەخۆیە داو کوردستانی ئێراقدا خستە سەر پشت و دامەزرانـدنی دەوولەتێکی سەر بەخۆی کورد.

دوای تاقیکردنەوەیـەکی یـەك سـالی و بـە راوێـژکردنی لـە گـەل کۆمەلـەی نەتەوەکاندا، کـە لـەم ماوەیـەدا ئەوە هـاتووە کـە دەوولـەتی هاوپـەیمان رێ لـە هـیچ یەکێتیـەك ئـارەزوو مەندانـەی کوردەکـانی بەشـی باشـووری کورسـتان نـەگرن، کـە بەشـێك لـە وویلایـەتی مووصـل، نـاگرن. لێگـەش بینـی و کـەیف خۆشی کوردان زۆری نەخایاند، چونکە هاوپیمانان رازونیازی خۆیان کردبوو بێ ئەوەی چ حسا بێك بۆ تورك بکەن.

ئا لەو سەروبەندەدا ناکۆکی و کێشەی ناو خۆیی بە پشتیووانی عەشایەری کوردو کۆمەکی سووپای دەوولـەتی سـۆڤیەتی تـازە کـورە براندوە و بنج بـری کـرد. ئیدی ئـەتاتورك دەسـتی بـە تـالێ بـوو، و سـەرکردایەتی یـاخی بـوونێکی نەتەوەیی عوسمانی لە ئەستەمبۆل.

ئەنجوومـەنی نیـشتمانی تـورك لـە شـاری ئەنکـەرە لـە ١٩٢١/٤/٢٣ کۆبـۆوەو دامەزرانـدنی حکوومـەتی ئۆپۆزسـیۆنی راگەیانـد. هـەروا ئـەتاتورك کـە دەسـەلأتێکی دکتاتۆریانـەی زۆری درایـێ، تـوانی رێبـەری و سـەرکردایەتی چەند هێرشێك بکات و دوا سـەنگەری سەربە سولتان لـە نێوو بەرێ و ئەوە بوو لـە مـانگی/١١/١٩٢٢ دا بە لابردنـی سولتان لـە سـەر دەسـەلات راگەیاند. بـەمجۆرە واژووی سـولتان مـەحمودی چـوارەم لـە سـەر پـەیمانی سـیڤەر، بە

نیسبەت رژێمی تازەی تورکیەوە شەرعیەتی نەما.
لـە بـەر ئـەو هۆیـە ئـەتاتورك هێرشـێکی چـڕی دژی پـەیمانی سـیڤەر دەسـت پێکـرد، کەوتـە کـارکردن بـۆ هەڵووەشـاندنەوەی و گـۆڕینی بـە پـەیمانێکی دیکـەی لـە بـارترو گوونجـاوتر بـێ لـە گـەڵ بـاودۆخی تـازەدا. ئـەم هـەوڵ و کـــۆششـانەی لـــــە ١٩٢٣/٧/٢٤ دا سـەری گـرت و پـەیمانی لـۆزان لـە ئەنجامی هەڵوویستی تووندی تورك و رامـیاریەتی دووفاقی ریاکارانەیاند، و جێگەی پەیـمانی سیڤەری گرتەوە.
هەرچـەندە پـەیمانی تـازە هەنـدێ مافی کـەمی کەمینـەکانی وەك – ئەرمـەن و جوولەکـەو یۆنـانی- گرتـە خـۆ، بـــەلاّم کـەموو زۆر باسـی دەووڵـەت یـان ناوچەیەکی کـوردی سـەربەخۆ لـە ئارادا نـەماو تەنانـەت پەیمانەکـە بـە هـیچ جۆرێك – ووشەی کورد – ی نەگرتە خۆ، دەستکەووتی کورد تـەنیا ئەوە بـوو بـە پێـی مـادەی / ٣٨ و ٣٩ حکوومـەت بـەلێنی دا، کـە پارێزگـاری هـەموو خـەلکی تورکیـا بکـات، ژیـان و ئازادیـان بپـارێزێ بـێ گوێـدان بـە زێـدو وابەستەگی نەتەوەیی و زمان و نەژادو ئاینیان... !...؟.
سەرچاوە:- کـورد:- گـەلی لـە خشتە براوی غـەدر لیکراو – دانانی دکتۆر – گوێنـەر دێسنەر – وەرگێرانی بۆ کوردی – حەمە کەریم عارف – چاپی دووەم /١٩٩٩.

١٩٢٠/٣/١٢ بەترازیکی مەسیحیکان مارشەمعوونی نووێنـەری ئەمـەن و ئاینی مەسـیحی لـە باکووری کوردستانی ژێر دەسەلاّتی رژێمی تورکیا کۆبوونەوەیەکی فراوانـی ئەنجامدا ، لە پێناو دیاریکردنی هەلوویستی ئەرمەن ، ئەویش بەهۆی شـەڕی نێـوان تـورك و رووسـیای بەلـشەفی، ویـستی ئـەو کۆبوونەوەیـە بەلایـەنگیری کردنــی رووســیاو دژی تورکیــا بــوو، ئــەویش بــەنیازی بەدەســت هێنــانی مافـەکانی ئەرمـەن لـە کۆمـارێکی سـەربەخۆی ئەرمەنیـەکان بـەناوی کۆمـاری ئەرمەنستان لە ناوچەو کێشووەرەکەدا .

١٩٢٠/٤/٦ یاریـەکانی پێـشبڕکێی جـامی جیهـانی – ئۆڵـەمپیات – لـە شـاری برۆکـسلی پایتـەختی بەلـژیکا ئەنجامدراو بەردەوام بوو تـاکوو ٩/١٢ ی هـەمان سـاڵ لـە نێوان یاریزانانی وولاّتانی بەشدار بوو لە یاریەکان لە جیهاندا .

١٩٢٠/٤/١٥ مـۆرکردنی پـەیمانی – سـان ڕیمـۆ- ئـەویش لـە ئاکـامی مـۆرکردنی پـەیمانی

سایکس – بیکۆ بوو ، ئەویش بەدابەشکردنی ناوچەکە لە نێوان وولاتانی هاوپەیمان ، کە سووریا و لوبنان کەووتنە ژێر ئینتدابی فەرنساو – ئێراق و ڕۆژهەلاتی ئوردن و فەلەستین کەووتنە ژێر ئینتدابی بەریتانیا.

١٩٢٠/٤/١٩ گرێدانی کۆبوونەوەی ئەنجوومەنی بالای هاوپەیمانان لە شاری سانڕیمۆی ئیتالیا ، کە لەم کۆبوونەوەیە بەریتانیاو ، فەرەنساو، ئیتالیاو ، ئەمەریکا بەشداریان تێداکرد ، ئەویش بە پەسەند کردنی ناوچە ئینتدابیەکانی ژێر دەسەلاتی فەرەنسا و بەریتانیا بوو بەتایبەتی لکاندنی باشووری کوردستان و وویلایەتی موسل بە ئێراقی بەرەو دامەزراندن و لکاندنی رۆژ ئاوای کوردستان بەسووریا ، واتە دەستکرا بە دابەشکردنی کوردستان ...بەلام ...؟...!.

١٩٢٠/٤/٢٣ لە کۆبوونەوەی ئەنجوومەنی نیشتمانی مەزن لەلایەن تورکە کەمالیەکان لە شاری ئەنکەرە ، کە ٧٢ نووێنەری کورد لە باکووری کوردستان بەشداریان لەو ئەنجوومەنە کرد ، لە پێناو سەقامگیری بڕیارو هەلوویستی کورد بە دابین کردنی مافی کورد لە باکووری کورستانی ژێر دەسەلاتی تورکە کەمالیەکان .
کە دانیان بەحکوومەتی ئەستەمبوڵ عوسمانی نەناو هەولیان دا عوسمانیەکان بنبڕ بکەن .
کە لەو کاتە مستەفا کەمال بەسەرۆکی تورک هەلبژێردرا...شایانی باسە مستەفا کەمال ئەتاتورك لە پارێزگای سیواس لەگەڵ نووێنەری کوردستان چوونە ئەنکەرەو ئەو پەرلەمانەیان دامەزراند بۆ دەوولەتی تورك ...ئەی کورد ...؟.

١٩٢٠/٤/٢٣ بە پێی برگەو خاڵەکانی پەیمانی سانڕیمۆ ، کە بەشە نەوتی کوردی لەلایەن کۆمپانیای نەوتی ئەڵمانی داگیر گرابوو درایە فەرەنساو کۆتایی بەکێشەی نێوان هاوپەیمانان هات لە ناوچەکەدا .
کە چاوگە نەوتیەکان هەمووی لە سەرخاکیهەرێمی باشووری کوردستان بوو ، بەتایبەتی لە پارێزگای کەرکوك ، بەلام کێشەی ڕژێمی تورك بەهەڵوواسراوی لە سەر خاکی باکووری کوردستان مایەوە تاکوو ئێستا .

١٩٢٠/٤/٢٤ گرێدانی کۆنفرانسی ئاشتی لە شاری سانڕیمۆی ئیتالیا ، لەپێناو

دۆزینــەوەی چـارەیەکی گوونجـاو . لـە نێـوان سـەرەتای مـافی داگیرکردنـی وولاّتـان – حـق الفـتح– کـە دەوولّـەتانی ئـەوروپا پێووەریـان ئـەکردو لـە رێکەووتنـە نهێنیـەکانی سـەردەمی جـەنگی یەکـەمی جیهـان و گوونجانـدنی بۆیان .

کـە سـەرەتای مـافی ئازادیو بڕیـاردانی چارەنووسـی گـەلاّنی ژێـر دەسـتە، بـەپێی وتارەکـەی سـەرۆکی ئەمـەریکا ویلـسۆن ، ئـەویش بـە پێـدانی مافـە ڕەواکانی گەلاّنی ماف خوراوەکان لە جیهاندا ، بەتایبەتی مافی گەلی کورد لـە باکوورو باشووری کوردستان لەئێراق و تورکیادا .

١٩٢٠/٤/٢٤ بـەپێی بڕگـەو خالّـەکانی پـەیمانی سـانڕیمۆ ، فەرەنـسا بەفـەرمی وازی لـە ویولایـەتی موسـل هێنـا ، بەبەرامبـەر بـە وەرگرتنـی هەنـدێك لـە ناوچـەی ژێـر دەسەلاّتی بەریتانیا . بە بوونی بەش لە کۆمپانیای نـەوتی کـورد لـە باشـووری کوردستان .

کـە لەسـەردەمی سـولتان عەبدولحەمیـدی سـولتانی عوسمـانی بـە هاوکـاری ئـەلّمانیا دامـەزرابوو لـەپێناو دۆزینـەوەی نـەوت لـە باشـووری کوردسـتانی لکێنراو بەئێراقی بەرەو دامـەزراو ، لەشاری کـەرکوك و ناوچەی کەندیناوەی سەر بە پارێزگای هـەولێرو بە تایبـەتی لـەو کات لـە شارۆچکەی خانـەقین لـە ناوچەکانی هەرێمەکەدا .

١٩٢٠/٤/٢٥ ئەنجوومـەنی بـالاّی هاوپـەیمانان بڕیـاری دامەزرانـدنی یـەك پارچـەیی خـاکی ئێراقیاندا ، کە ئێـراق بچێتە ژێـر ئینتـدابی بـەریتانیا و سووریاش بچێتە ژێـر ئینتدابی فەرەنسا ، کە پێش ماوەیـەك ئـەو بڕیـارە جێبەجێ کرابوولـە لایـەن ئەم وولاّتانەدا .

شایانی باسە کە هەردوو وولاّتی دامەزراو کە ئێراق ، زیاتر لە ٨٤٠٠٠ هـەزار کیلۆمەتر چوارگۆشەی لەخاکی باشووری کوردستان پێ لکێنراو ، سووریاش زیاتر لە ١٧٠٠٠هـەزار کیلۆمـەتر چوارگۆشـەی لـەخاکی ڕۆژئـاوای کوردسـتان پێ لکێندرا.

جێگـەی باسـکردنە کـە بـاروو دۆخـی ئـەوکات لـە بـارو گوونجـاو بـوو لـە پێداگرتنی کورد لە بە دەست هێنانی مافەکانی لە کوردستان ، نـەك تـەنیا لـە بەشێکی کوردستانی داگیر کراوی ژێـر دەسـەلاّتی تـورك و ئێرانـی فـارس و،

هەروا باشوورو رۆژئاوای کوردستانی لکێندراو بە ئێراق و سووریا .
کە عەرەب و تورك خاوەن خاك و کەش و هەوا نەبوون بە پێچەوانەی کورد لە سەر خاکی کوردستان ، کە چی ئەوان بوونە خاوەن دەوڵەتی سنووورداری زەوی و دەسەڵات لە هەموو بوارە جیا جیاکان ، بە تایبەتی لە بواری نەتەوەیی و دەستکەوتنی نیشتیمان بۆیان ، کە تەنیا بە خەون لە هەستیان دەخوولایەوە.
کەچی کورد خاوەنی نیمچە دەسەڵات بوو لە ئیمارەتەکان لە سەر خاکی دێرینی خۆیدا ... ! . بەلآم بە داخەوە سەرکردەکان و سەرکردایەتی کورد نەتەویەکی خۆخۆر بووەو بەرژەوەندی کەسی و بنەماڵەو دەسەڵات و سامانی لا گرنگتر بووە لە کوردو خاکی کوردستان ، لە سەرتای بوونیەوە تا تەواوکردنی ئەم مێژوونامەیە و... ! .
گەر بارو دۆخی بۆ دروستکرابێت بە شەقی زەمانەو شلەژانی باری ناوچەو هەرێم و جیهان بووە ... ئەویش لە ئەنجامی هاتنە پێشەوەی بەرژەوەندی وولآتی هاوپەیمانان لە جیهانـــدا .

١٩٢٠ /٤/٢٥ بەرپرسانی بەریتانیا لە ئێراقی دامەزراو چەندین کۆمەلەو رێکخراو گروپی نهێنیان پێك هێنا ، لە پێناو جێبەجێکردنی نیازە گلاوەکانیان وەك:- کۆمەلەی راست بوونەوەی ئیسلامیو ، کۆمەڵەی پاسەوانی سەربەخۆیی- کۆمەلەی لاوان- کۆمەلەی سەردەمی ئێراق- لە ناوچەکەدا .

١٩٢٠/٤/٢٧ نووێنەری کورد شەریف پاشای خەندان دەستی لەکاری فەرمانبەری کێشاوەو رووی لەکارە هەمەلایەنەکانی بەرگری کردن لە تاوانو ئامانجەکانی گەلو نیشتمانەکەی کرد لە باکووری کوردستان.

١٩٢٠/٤/٢٩ هەفتەنامەی پێشکەوتن لە شاری سلێمانی لە باشووری کوردستان بلآوکرایەوە ، کە بۆ جاری یەکەم - میجەر سۆن- سەرپەرشتی دەرچوواندنی دەکرد بۆ ماوەی دووساڵ. لە پێناو گەیاندنی ئەنجامی پەیامەکەیان لە سەر هەرێمەکەدا .

١٩٢٠/٥/١ نووێنەری کورد شەریف پاشای خەندان بۆ جاری دووەم بەناوی کورد سکالآنامەیەکی ئاراستەی کۆنفرانسی ئاشتی کرد لە پاریسی پایتەختی فەرەنسا ، لەگەڵ دوو نەخشەی کوردستان.

١٩٢٠/٥/١١ دەستکرا بە نووسینەوەی ڕەشنووسی پەیمانی سیڤەر کە – مسیۆ ملیدان – نووێنــەری وولاّتــە ســووێند خۆرەکــان و بەڕێووەبەرایــەتی حکوومـــەتی ئەستەمبوّلی عوسمانی واژوویان لە سەر کرد ، کە بریتی بوون لە – فەرید پاشا وەك ڕاوێژکاری ئەنجوومەنی وەزیران و ، هادی پاشا سەرۆکی ئەرکانی جەنگ و ، ڕەشاد خالیس بەگ ڕاوێژکاری دەرەوە .

لە دوای ئەوە مسیۆ ملیدان بڕیاری کۆتایی دا بە سەرۆك وەزیرانی تورك – تۆفیق پاشا – بە مۆر کردنی پەیمانی سیڤەر ، کە لە بەرژەووەندی کورد بوو لە باکووری کوردستان و دژی ڕژێمی تورکیا بوو لە تورکیا.هەروا لە باشوورو ڕۆژهــەلاّت و ڕۆژئــاوای کوردســتان بــوو دژ بــە ئێــران و ئێــراق و ســووریا لــە کێشووەرەکەدا .

١٩٢٠/٥/٢٠ دامەزراندنی یانەی سەرکەووتن لەلایەن کوردە نیشتەجێ بووەکان لە شاری بەغدای پایتەختی ئێراقی دورستکراو لە سەر خاکی کوردستاندا .

١٩٢٠/٥/٣٠ مۆرکردنی ڕێکەووتننامەی وەستاندنی شەڕ لە نێوان تورکیاو فەرەنسا لە شاری ئەنکەرە . کە فەرەنسا هەوڵی جێبەجێکردنی خواستەکانی کۆنگرەی سانڕیمۆ دەدا ، ئەویش بە مسۆگەر کردنی دەسەلاّتی لەسەر شارەکانی ئەسکەندەرۆنەو حەلەب و دیمەشق و لوبنان و فەلەستیندا .

لەلایەکی دیکە مستەفا کەمال ئەتاتورك هێزەکانی خۆی لەبەرەی ئەرمەنی کۆکردەوە ، لەپێناو گەڕاندنەوەی شارەکانی باکووری کوردستان وەك:– ئەرزەرۆم و ، موش و ، وان .

کە کەوتبوونە ژێر دەسەلاّتی کۆماری ئەرمینیا ، بەپێی پەیمانی ڕانەگەیەندراوی سیڤەر، کە ئاواتی مستەفا کەمال دوای ئەوە هاتە دی بەپشت گوێ خستنی پەیمانی سیڤەرو دابەشکردنی کوردستان.

١٩٢٠/٦/٥ ڕاگەیاندنی دامەزراندنی کۆماری – گیلاف– لە ئەنجامی سەرکەووتنی جەنگەلیەکان ، بەلاّم ئەو کۆمارە دوای ساڵێك لەناو براو سەرکردەکەی – میرزا کۆچەك خان– لە شاخی تالش لەلایەن جەندرمەکانی تورك تیرۆرکرا لە باکووری کوردستان.

١٩٢٠/٦/١٧ ڕژێمی شانشینی بەریتانیا بڕیاریدا ، بە دامەزراندنی حکوومەتێکی عەرەبی بەناوی ئێراق ، کە – سیر کۆکس– بە دادوەری گشتی سامی بەریتانیا لە

ئێراق دامەزرێنرا ، بە تایبەتی بەرەو هەرێمەکانی باشوورو رۆژئاوای کوردستان .

کە ئەویش رۆڵی سەرەکی هەبوو لە بە عەرەبکردنی خاکی کوردستان ، بە هێنانی خێلە رەوەندو بەدووەکانی بیابانی عەرەب ، کە بەکاری سێیەمی بە عەرەبکردن دێت لەووڵاتی نێوان دووزێ ، لە دوای رووخانی رژێمی عوسمانی تورك لە كێشووەرەكەدا .

١٩٢٠/٦/٢٢ لە دوای رێکخستنی شانەو رێکخراوەکان ، یەکەم کۆنگرەی پارتی کۆمۆنیستی ئیران گرێدرا ، لە بەندەری – ئنزلی – کەدوای ئەوە ناسرا بە ناوی– بەندەر بەهلەوی– لە سەر دەریای قەزوین... کە چەندین لابالی سۆشیالیستی بوونو لەو پارتە یەکیان گرت بەراگەیاندنی پارتی کۆمۆنیستی ئێرانی (توودە) لە ووڵاتەکەدا .

١٩٢٠/٦/٢٣ لە دوای دەست لە کار کێشانەوەی – وسوق ئەلدەولە – لە سەرەك وەزیرانی ئێران ، کە موشیر ئەلدەولە پەیمانیدا بە رەزامەندی وەرگرتن لە بالوێزی بەریتانیا بەپێك هێنانی ئەنجوومەنی وەزیرانو کۆبوونەوەی لەگەڵ کردن لە ووڵاتەکەدا .

هەروا لەناو ئەو وەزیرانە موئتەمەن مەلیكو ، مستوفی ممالیكو ، موسەدەق سەلتەنە ، واتە محەمەد موسەدەقو ، موخبیر خاوەنی جەماوەرێکی زۆر بوو لەهەرێمی ئازربایجان ، دوای ئەوە سەرەك وەزیرانی ئێران موشیر ئەلدەولە ، کە رەزامەندی لە بالوێزی بەریتانیا وەرگرت بە رەوانەکردنی شاندێك بۆ شاری مۆسکۆ ، ئەویش لە پێناو وەرگرتنی رەزامەندی لەحکوومەتی بەلشەفی مۆسکۆ ، بە کشانەوەی هێزەکانی لە ووڵاتی فارس ، بە تایبەتی لە رۆژهەڵاتی کوردستانی ژێر دەسەڵاتی ئەوکاتی فارس . ئەویش بە راگرتنی پروپاگەندەی کۆمۆنیستی بەرەو ووڵاتەکەیدا .

لە هەمان کات بەراگرتنی ئەو رێکەوتننامانەی کە بەر لە دامەزراندنی حکوومەت مۆر کرابوونو دوای دەست کردن بە هەلبژاردنی نوێ لە ئێران ، ئەوانە هەمووی بووە هۆی بەرەو باشکردی پەیووەندی لە نێوان ئێرانو ئەمەریکادا .

١٩٢٠/٦/٣٠ بە هۆی شۆرشی بیستی ئێراق لە باشووری کوردستان راپەرینو

خۆپیـشاندان دەسـتی پێکـردو زۆربـەی ناوچـەکانی گرتـەوەو کاردانـەوەی کارێگـەری باشـی هـەبوو ، لـە پێنـاو بـەرز کردنـەوەی هەسـتی نەتـەوەیی و نیشتمانی لە هەرێمەکەدا.

١٩٢٠/٧/٣ کـۆنگرەی بـاکۆی پایتـەختی ئازربایجـانی گـەلانی ڕۆژهـەلات ، لـە ڕۆژنامـەی پراڤدای ڕووسیای بەلشەفی ، بلاوکراوە .

که نووێنەری کورد لە کۆنگرەکە ڕۆلی بەرچاوی هەبوو لە شیکردنەوەی باری کورد لە کوردستاندا .

١٩٢٠/٧/١٢ ڕۆژنامەی – دیلی دیل – ی بەریتانی لەم ڕۆژەدا بابەتێکی بلاوی کردەوە لە سەر باری ئابووری و داهاتەکان ، کە ئەو باجانەی لە گەلانی ئێراق وەرگیراوە بڕی ٠٠٠ر٥٠٠ر١ ملیۆن پاوەند بووە ، کە لە هیچ وولاتێکی دیکە ئەو باجە کۆنەکراوەتەوە لە جیهاندا .

١٩٢٠/٧/٢٤ هێزەکانی سووپای فەرەنسا و بەرپرسانی ئەمیر فەیسەلی سعوودیان لە شاری دیمەشـق دەرکـرد ، بـەهۆی لاوازیو بـێ توانـاو گەنـدەڵ لـە هـەلس و کەوتەکانیدا، لە ئاکام بەرەو دەشتاییەکانی وولاتی ئێستای ئوردون ڕۆیشت ، کە پیاوێکی بەنابانگ لە دەبەنگیدا . کە لە دایك بووی وولاتی سعوودیەی ئێستا بوو.

جێگـەی ڕوونکردنەوەیـە کـە ئـەمیروو شانـشینەکانی ئێـراق و ، ئـوردن و، سـووریا و ، کووێـت و ، ئیمـاراتی ئێـستای کەنـداو ، خـەلکی ئـەم وولاتانـە نەبوونـە و لـە دایـك بـووی ئـەم وولاتـەش نەبوونـە ، بـەر لـە دامەزرانـدنی ئـەم دەوولەتانـە لـە دوای کۆتـایی هـاتنی جـەنگی یەکـەمی جیهـان و هـەرەس پێهێنـانی ئیمپراتۆریـەتی عوسمـانی ، لـە لایـەن وولاتـانی هاوپـەیمان هێنراونەتە ئەم وولاتانە و کردوویانەتە شانشین لە سەر ئەم وولاتانەدا .

ئـەم کـارەش پەیووەنـدی هـەبوو بـە مـاددەو برگـەو خالـەکانی ، پـەیمانی سایکس – بیکۆ ، و جێ بە جێکردنی لـــــە پـەیمانی لۆزانی ١٩٢٣/٧/٢٤ دا ، بە دابەشکردنی خاکی گەلانی دیکە ، بە تایبـەتی خاکی کوردسـتان ... بەلام ... کورد ... ؟ ...! .

١٩٢٠/٨/٢ کەسایەتی ناوداری کورد – حەماغای – کۆیە کۆچی دوایی کـردو جەمیل ئاغـای حـەوێزی بـووە حـاکمی شـاری کۆیـەی سـەر بـە پارێزگـای هـەولێر لـە هەرێمی باشووری کوردستان ، دوای دامەزراندنی دەوولەتی ئێراق ، جەمیل

ئاغا کرا بەقائیمقامی شاری کۆیە تاکوو ساڵی ١٩٣٢، لە قەزاکەدا .

١٩٢٠/٨/٦ بەرپابوونی ڕاپەڕینی جەماوەری شارۆچکەی بەعقوبەو شارەبان لەهەرێمی باشووری کوردستان ، دژی داگیرکەری هێزەکانی سووپای بەریتانیا لە ئێراق.

١٩٢٠/٨/٩ لە دوای مۆرکردنی تورکیا لە سەر پەیمانی سیڤەر ، بووە هۆی لە دەست دانی ٢,٤٠٠,٠٠٠ ملیۆن کیلۆمەتر چوارگۆشە ، لەو خاکەی کە بە زۆر داگیری کردبوو ، کە ٦٠٠ هەزار کیلۆمەتر چوار گۆشەی بۆماوە لە دوای ڕاگەیاندنی کۆمای تورکیا لەلایەن کەمال ئەتاتورک لە کێشووەرەکەدا .

١٩٢٠/٨/١٠ لە دوای گفتووگۆی بەردەوام کە ئەنجامەکەی گەیشتە مۆرکردنی پەیمانی سیڤەر ، لە لایەن وولآتانی هاوپەیمان لە کۆمەڵەی گەلان ، کە چەندین بڕگەو خالی باشی لە خۆگرتبوو سەبارەت بە مافی کورد ، لەوانە بڕگەکانی ٦٢،٦٣،٦٤ لە ماددەی/٣ لەژێر ناونیشانی کوردستان ، بەلآم بە هۆی مۆرکردنی پەیمانی لۆزان پشتگوێ خرا .

ئەویش لە پێناو پاراستنی بەرژەووەندی هاوپەیمانان بەتایبەتی بەریتانیاو ئەمەریکاو فەرەنساو ئەلمانیا ، بە تایبەتی لەسەر خاکی کوردستان.

تقسيم الامبراطورية العثمانية بموجب معاهدة سيفر
– Unsal Yavuz, Ataturk imparatorluktan Milli Devlete, (Ankara:1999)

جێگەی ئاماژە پێکردنە کە هۆکارەکانی مۆرکردنی پەیمانی سیڤەر لە نێوان هاوپەیمانان ، بە هۆی ئەو گۆڕانکاریانە بوون کە لە دوای جەنگی یەکەمی جیهان سەریان هەڵدا .

لەوانەش ڕاگەیاندنەکەی سەرۆکی ئەمەریکا – وورود وولسن – بوو لە ١٩١٨/١١/٨ دا ، کە خۆی لە ١٤ خاڵ دەگرت ، کە بەندی / ١٢ ی ڕاگەیاندنەکە داوای مافی سەربەخۆیی گەلانی ژێر دەستەی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی دەکات ، کە کوردستان یەکێك بوو لەو هەرێم و ناوچەو وولاّتانەی کە لە ژێر دەسەلاّتی عوسمانیدا بوولە کێشووەرەکەدا .

هەروا لەو کاتەشدا مۆرکردنی پەیمان لە نێوان بەریتانیاو فەرەنسا لە ١٩١٨/١/١٨ دا ، ڕاگەیاندرا ، ئەویش داوای سەبەخۆیی گەلانی ژێر دەستەی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی دەکرد ، کە لە هەمان پەیمانیش کورد یەکێك بوو لەو هەرێم و ناوچەو وولاّتانەی کە کەوتبووە ژێر دەسەلاّتی عوسمانی لە کیشووەرەکەدا .

هەروا ئەم گۆڕانکاریانەش ڕۆڵی کورد تێیدا بەر چاو بوو لە هەردوو لایەنی شۆڕش و خەبات و ، لە لایەنی دبلۆماسی کە ژەنەراڵ شەریف پاشای خەندان

نووێنەری كورد بوو ، لە كۆنگرەی ئاشتی لە بارەی كورد و ئەرمەن لە گەڵ لایەنە پەیووەندارەكان و هەروا لە كۆنگرەی پاریس و كۆمەڵەی گەلان ، كە توانرا مادەكانی _ ٦٢ ، ٦٣ ، ٦٤ ، – تایبەت بە دامەزراندنی دەووڵەتی سەربەخۆی كوردی تیا مسۆگەر بكات لە پەیمانی سیڤەر لە ١٩٢٠/٨/١٠ دا . ئەویش بە ئامادە بوونی – بەریتانیا ، فەرەنسا ، یۆنان ، ئیتاڵیا ، رۆمانیا ، یۆگسلاڤیا ، چیكسلۆڤاكیا ، پۆڵندا ، بەلژیكا ، یابان – و لە گەڵ بەرپرسانی تورك ، كە لە سەر پەیماننامەی سیڤەر مۆریان كرد . لە گەڵ شەریف پاشای نووێنەری كورد بە مۆركردنی لە سەر لاپەرەی دیاریكراو لە پەیمانەكەدا . هەروا بە مۆركردنی نووێنەری ئەرمەنەكانیش بووگس نۆبار لە سەر پەیمانەكەدا .

پرۆژەی كوردستان لە پەیمانی سیڤەر

نەخشەی بڕیارلێدراو لە پەیمانی سیڤەر . بەڵام جێبە جێنەکرا

هۆکارەکانی مۆرکردنی پەیمانی سیڤەر ، ئەویش:-

١- لاوازی وبێ توانــایی و بــە بــەرەو هــەرەس هێنــانی ئیمپراتۆریــەتی عوسمــانی و شــەرمەزاری لــە ســەر نەکــەووتنی لـــــە جــەنگی یەکــەمی جیهانیدا .

٢- هەوڵــە بەردەوامــەکانی کــورد و ئەرمــەن ، لــە پێنــاو چارەســەرکردنی کێشەکانیان و بەرزکردنەوەی داواکاریان لە کۆنگرەی ئاشتی و کۆمەڵەی گەلاندا .

٣- بیروبۆچوونی رامیاریەتی نێوو دەووڵەتی و پشت بەستن بە ئاسایش و ئارامی و دامەزراندنی قەوارەی رامیاری ، کە ئەمەش بووە هۆکارێکی مسۆگەرو بەم هۆکارەش پەیوەندی کرا بە کورد لە پێناو پشتگیری کردنیان .

٤- بەپێی پەیمانی - سایکس ، بیکۆ - بەشێك لە باکووری کوردستان درا بە ڕووسیای قەیسەری دوای ئەوەی کە شۆرشی ئۆکتۆبەر سەرکەوتنی

بەدەست هێنا لە ساڵی ١٩١٧ بووە هۆکاری دروست بوونی پەرژینێك لە نێوان ڕووسیای نویٚ و وڵاتانی هاوپەیمان لە لایەك و ، لە لایەکی دیکەش هەوڵی لاوازکردنی تورکیان دەدا .

٥- بەریتانیا هەموو هەوڵەکانی لە پەیمانی سیڤەر ئەوە بوو کە کورد بکاتە ئامانجێك بەرامبەر بەو وڵاتانەی کە کوردیان پێوە لکێندراوە یاخوود لەژێر دەسەڵاتەکانیاندا بەردەوامن لە داگیرکردن لە ناوچەکە .

٦- بەریتانیا لەوە دەترسا کە ئەمەریکا لە کورد نزیك بێتەوە بەهۆی بوونی چاوگە نەوتیەکانی لە هەرێمی باشووری کوردستان ، بەم هۆکارە هەوڵی بەریتانیا دوورخستنەوەی ئەمەریکا بوو لە هەوڵەکانیدا .

هۆکارەکانی جیٚ بەجیٚ نەکردنی پەیمانی سیڤەر ئەویش :-

١- لاوازی و پەرت و بڵاوو دژایەتی ناوخۆیی و یەکتری کورد بوو ، بەجیاوازی لە بیروبۆچوون و بە پاراستنی بەرژەوەندی تایبەت لە دەسەڵات و سامان ، کە ئەمەش بووە هۆی بەرهاویشتنی هەوڵە دبلۆماسیەکان ، بە تایبەتی لەلایەن نوێنەری کورد - شەریف پاشای خەندان - ، چ لە کۆنگرەی ئاشتی و چ لە گەڵ کۆمەڵەی گەلان و چ لەگەڵ وڵاتانی پەیوەندار و چ لە گەڵ دۆستەکانی کورد لە کێشوەرەکەدا .

٢- سەرکەوتنی کەمالیە ئەتاتورکەکان بە شەرکردنیان لەگەڵ یۆنان و بووە هۆی داواکردنی وویلایەتی موسڵ ، بەم هۆکارەو بۆ ئەوەی بەریتانیا بەرژەوەندیەکانی خۆی لەدەست نەدا موسلی پڕ لە چاوگە نەوتیەکان ، بەتایبەتی لە هەرێمی باشووری کوردستان و بەکارهێنانی بیری دروستکردنی دەوڵەتی کورد ، وەك ئامانجێك دژ بە کەمالیە تورکەکان .

هەروا لەلایەکی دیکەش مەترسی کەمالیەکان لە دروست کردنی دەوڵەتی کوردی ، دەستیان لە بیری وویلایەتی موسڵ هێنا لە پەیمانی لۆزان لە ساڵی ١٩٢٣ بەمەرجێك کە دەوڵەتی کوردی لە وویلایەتی دانەمەزرێندرێت و بەندەکانی پەیمانی سیڤەر لە گۆر بندرێت ، ئەوەی بەندن بە ماف پێدانی سەربەخۆیی گەلانی ژێر دەستەی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی بەتایبەتی کورد و ئەرمەن لە ناوچەکەدا .

<u>جا لێردا من لە چەندین جێگەی دیکە باسی ئەوەم کردووە کە لەکاتی</u>

سـەرکەوتنی کـورد لــە هــەموو قۆناخێـك لــە قۆناخەکانـدا ، کـورد واتـە سـەرکردایەتی و بەرپرسانی کورد خۆیـان بەرپرسیارن لە نەگەیشتنی گـەلی کوردسـتان بـەو ئامانجانـەی کـە قووربانیـان بـۆ داوە ، ئـەویش بـە قووربـانی کردنی خوێنی گەلی کوردستان لـە پێناو بەرژەوەندی سـەرکردەکانی کـورد ، ئەویش لـە پاراستنی کورسـی و سامان و پـارەو بوارەکـانی دیکـەدا ، بـەر لـە پـەیمانی سـیڤەر و دوای پـەیمانی سـیڤەریش نـەك وولاتـانی هاوپـەیمان و هاوپەیمانەکانیان لە ناوچەکەدا .

کوردستان بين معاهدات سيفر - لوزان - موصل (حسب الوثائق الفرنسية)
HasanYildiz, Fransiz Belgeleriyle sevr- lozan- musul uçgeninde kurtdistan. (Istanbul: 2005) S, 302

---

١٩٢٠/٨/١٢ هێزە چەکدارەکانی ناوچەی ڕەواندزی سەر بە پارێزگای هـەولێر لـە هـەرێمی باشووری کوردستان هێرشیان کردە سەر هێزو کاربەدەستانی بەریتانیا ، لـە ئـەنجام کـابتن – هـای – بەرپرسـی بـەریتانی داگیر کـەری خـاکی کوردسـتان بریندار کرا .

١٩٢٠/٨/١٤ شۆڕشـگێڕەکانی شارۆچـکەی خانـەقین و دەووروبـەری لەهـەرێمی باشـوری کوردستان ، توانیان ناوچەکە ڕزگار بکەن لەژێر دەستی خاوەن کۆمپانیەکانی نـەوتی بـەریتانیا و فەرەنساو ئێران و پـەرەیان بەڕاپەڕینەکـەدا لـەبواری هێـزی چەکداری لە ناوچەکەدا .

١٩٢٠/٨/١٦ هێزە چەکدارە کوردەکان هێرشیان کردە سەر وێستگەی شەمەندەفەری خانەقین ، کە هێزەکانی کۆلۆنێل لاکیتی تیا بوو لە ئەنجام ١٥ چەکداری کورد شەهید بوون .
لەهەمان کات هێرشی هێزەکانی بەریتانیا بەسەرکردایەتی - ب ئەدوارد- ناردە ناوچەکەو لە ئەنجام ٢٠٠ چەکداری کورد توانیان ڕێگە لە هێزەکانی سووپای بەریتانیا بگرن و پاشەکشەیان پێبکەن لە ناوچەکەدا .

١٩٢٠/٨/٢٠ لەدوای بەسەرچوونی ماوەیەك لە مۆرکردنی پەیمانی یەکگرتن لە نێوان هەردوو وولاّتی مالی و سەنیگال ئەو یەکیەتیە بە هۆی بوونی کێە و ململانێ هەڵوەشێندرایەوە ، لە وولاّتەکانیاندا .

١٩٢٠/٨/٢٠ سەپاندنی پەیمانی سیڤەر بە سەر ڕژێمی تورکیا ، کە سێ بەندی مافی چارەی خۆنووسی بۆ گەلی کوردو کوردستان لەخۆ گرتبوو.
بەلاّم ڕژێمی نوێی تورکیا بەسەرکردایەتی کەمال ئەتاتورك ئەو کارەی جێبەجێ نەکرد بەئامۆژگاری بەریتانیاو هاوپەیمانان ، کە دەسەلاّتی بەریتانیا سەرکردایەتی بیروو بۆچوونەکانی دابەشکردنی کوردستانی گرتبووە دەست لە کێشووەرەکەدا.

١٩٢٠/٨/٢٢ ڕاپەڕینی جەماوەری شارۆچکەی کفری و دەوورووبەری لە باشووری کوردستان بەسەرکردایەتی - ئیبراهیم خانی دەلۆ- کاردانەوەی کاریگەری باشی هەبوو ، لە پشتگیری کردنی هەوڵەکانی شێخ مەحمودی حەفید لەناوچەکەدا .

١٩٢٠/٨/٢٤ لە دوای بەرپابوونی ڕاپەڕینی ناوچەی کفری ، کە ئەنجامی بووە هۆی ڕزگارکردنی شارۆچکەکەو دەوورووبەری ، کە سەر بەپارێزگای کەرکوك لە باشووری کوردستان بوو ، لەلایەن شۆرشگێرە چەکدارەکانی ناوچەکە بەسەرکردایەتی ئیبراهیم خانی دەلۆو وەیسی بەگ لە ناوچەکەدا.

١٩٢٠/٨/٢٤ کۆچی دوایی هونەرمەندی شێووەکاری ئیتال- ئەمادۆمۆدلیانی- لەشاری ئوسکانای ئیتالیادا.

١٩٢٠/٩/٨ دامەزراندنی – ئەنجوومەنی گەلانی ڕۆژهەڵات لە ، پێناو کارو ڕاگەیاندن – لە شـاری بـاکۆ ، لـە ئـەنجامی گـریێ دانـی کۆنگرەیـەك کـە ئـەو ئەنجوومەنـە بەسـتراوبۆوە بـە لێژنـەی جـێ بـەجێکردنی ئومەمیـەی شـیوعیەکان ، کـە ڕاگەیاندنەکانی هەمووی بانگەوازبوو بۆ گەلانی ڕۆژهەڵات و چینەکانی هـەژار لەم وولاتەو لە جیهاندا .

١٩٢٠/٩/٨ جێگـری دادوەری گـشتی بـەریتانیا لـە ئێـراق – ئارنۆلـد ویلـسن– لـە گـەڵ شـاندێك بـەرەو پارێزگـای هـەولێر لـە باشـووری کوردسـتان بەرێکـەووت ، بەهۆی ئاڵۆزی باری ناوچەکە و لەپێناو هێوور کردنەوەی بارودۆخەکەدا .

١٩٢٠/٩/١٠ دوای هـەرەس هێنـان و رووخـانی ئیمپراتۆریـەتی عوسمـانی و سـەرکەووتنی شۆڕشی بەلشەفی لە ڕووسیاو سەرکەووتنی هاوپـەیمانان و تـەوەری شـەڕکەر و گوونجـانی بـارودۆخێکی نـوێی دابەشـکردنی جیهـان لـە نێـوان وولاتـانی سەرکەوتوو لە هەموو بوارە جیاجیاکان، بەتایبـەتی لـەو وولاتانـەی کە بەرەو دامەزراندن هەنگاویان دەنا وەك وولاتانی عەرەبی لەوانەش – ئێراق و تورکیا و سووریاو ئێران – کە خاکی کوردستان بەرەو دابەشکردن هـەنگاوی دەنا لـە نێـوان ئـەو چـوار دەووڵەتـەو پێکهێنـانی ئـەم چـوار دەووڵەتـە لەسـەرخاکی کوردستان بەگەل و بە خاك لـە گـەڵ نەتـەوە دانیـشتوانە ڕەسـەنەکانی دیکـەی خاکی کوردستان.

لەوانەش دروسـت بوون و دەرکـەوتنی ڕێکخـراوی شۆڕشـگێری و جـەماوەری دژی ئیستیعمار. کە لە مانگی/٥/١٩٢٠ ڕێکخراوەیەکی رامیـاری سـەری هەڵدا کـە پەیوەنـدی بـەهێزی هـەبوو لەگـەڵ – سـووپای سـەوز – کـە دروشمـی تێکۆشان دژی ئیستعمار و دەرەبەگ .

ئەم رێکخراوەیەش لە برژوازی بچووك و کاسبکار و چینی کرێکـارو جووتیـار پێك هـاتبوو. سەرەرای بوونی بروای ئیسلام وگونجـانی لـەوکات بەداواکانی کۆمۆنیـستی و بـە چەسـپاندنی یەکـسانی و دادپـەروەری... سـووپای سـەوزیش– ئامـانجی دەرکردنـی ئیمپریـالیزم بـوو لـە ئاسیاو تێکۆشـان دژی هەموو جۆرە بیروبۆچوونێکی ئیمپریالیزمی بوو لەم کێشوورەدا.

هەروا سووپای سەوزیش – لە راگەیاندنەکانی چەسپاندنی هاوکاری لە نێوان خـۆیی و سـووپای سـووری سـۆڤیەتی دەرکـردو داوای پێکهێنـانی حکوومەتێکی جەماوەری لەتوریکا دەکرد...ئەم بیروبۆچونانەش لە تورکیا

جێگەی خۆی کردەوە بە تایبەتی لە باکووری کوردستان.
ئەوەبوو سوپای سەوز. لایەنگرەکانی لە پەرلەمانی نیشتیمانی تورکیا کە ٨٥ نووێنەری هەبوو بەناوی – خەلق زومرسی – کۆمەڵەی میللی – دوای ئەو هەموو رووداوو گۆرانکاریانە لەناو سووپای سەوز کۆمەڵەکە لەمانگی ١٩٢٠/٦/ دەرکەووتن بەسەرکردایەتی پزیشکێکی بەیتەری – سالح حاجی ئوگلو – کە داوای جێ بەجێکردنی تیئۆری سۆشیالیستی زانستی دەکرد... لایەنگرانی سووپای سەوز پەرەی سەند هەتا لەناو سووپای نوێ رژێمی تورکیا.
دوای ئەو هەموو رووداو گۆرانکاریانە و سەرهەڵدانی جووڵانەوەیەکی بەهێز لەتورکیا چ لە نەتەوەو چ لەبیرووبۆچوونەکان و چینەکانی دیکەی تورکیا بەگشتی و باکووری کوردستان بە تایبەتی، بەهۆی مەترسی دابەشبوونی خاکی کوردستان بەشێووەو شێوازێکی نوێێ پر لە مەرگەسات.
لەم کات و ساتەدا کۆنگرەی رێکخراوە کۆمۆنیستیەکان گرێدرا لە مانگی/ ٩/١٠ بە ئامادەبوونی /٣٤ راوێژکار کە نووێنەرایەتی ١٦ رێکخراویان دەکرد... دوای ئەو کۆنگرە پرۆگرام و پەیرەوی ناوخۆی پارتەکەی دارشت لە سەر رۆشنایی ئۆمەمیەتی سێیەم و رێکخراوی کۆمۆنترین لە وولاتەکەدا.
سەرچاوە :– تاريخ توركيا المعاصر...دانانی کۆمەڵە توێژەنەرێکی سۆڤیەت.

١٩٢٠/٩/١٤ کۆچی دوایی شۆرەسواری ناوداری نەتەوەیی و نیشتمانی و دژەبیایەتی ئیبراهیم بایز ئاغای مەخمووری... شایانی باسە ئەم کەسایەتیە بەرگری تەواوی لەناوچەی مەخموری سەر بەپارێزگای هەولێر لە باشووری کوردستان دەکرد ، لە بە عەرەبنەکردن و لە زێنەپەرینەوە بۆناوچەی مەخمور .
بەڵام بارودۆخ و کۆچی دوایی ئەو کەسایەتیە ، باری دیموگرافیای ناوچەی مەخموری گوری و بەعەرەب کردن دەستی پێکرد ، لە لایەن رژێمی نووێی شانشینی ئێراق بەپشتیووانی و یارمەتی بەریتانیا لە قەزاکەدا.

١٩٢٠/٩/١٥ دەست پێکردنی راپەرین لەناوچەی بادینان لە باشووری کوردستان دژی هێزەکانی سووپای بەریتانیا.

١٩٢٠/١٠/١ بنەماکانی یاسای نێوودەووڵەتی دان پێنراو ، کە دەستگیر دەبێ بە بەشێکی جیاواز نەکراو لەیاسای ئەڵمانی . کە هەمان ماددە لە دەستووری نەمسادا

هاتیه.

١٩٢٠/١٠/١ دامەزراندنی – های بەریتانی– بەدادوەری گشتی لـه سـەر پارێزگای هـەولێر بە نووێنەری بەریتانیا له باشووری کوردستان.

السير برسي كوكس لدى اختيار الملك فيصل الاول ملكا على العراق (١١–٧–١٩٢١)

١٩٢٠/١٠/١١ نووێنـەری رامیـاری بـەریتانیا لـە ئێـراق – سیربرسـی کـۆکس– بـۆ یەکەم جار گەیشته شاری بەغداو دامەزرانـدنی بە نووێنـەری سـامی بــەریتانیا لــە ســەر حکوومــەتی نوێی شانشینی له ئێراق .

الملك فيصل الاول

شایانی باسه له ١٠/٥ هەمان ساڵ هەمووکارێکی پێشوازی لێکردنی بۆ ئاماده کرابوو له شارەکەدا .

دوای ئـەوه لەلایـەن کەسـایەتی و ســەرەك عەشـیرەتەکان پێـشوازی لێکـراو هـەروا شـاعیرو فەیلەسـوف – جـەمیل سـدقی زەهـاوی – بەوتەیـەك پێشوازی لێکرد.

جێگەی ئاماژەیە کە نووێنەری بەریتانیا رۆڵی سەرەکی هەبوو لەهێنانی بەدەیا هەزار خێزانی عەرەب لەبیابانی دوورگەی عەرەبی بۆ ئێراق و بە تایبەتی باشووری کوردستان

لە گەڵ ئەوەشدا ئەنجوومەنی راوێژکاری مەندووبی سامی پێك هاتبوون لە . ١- ئەلسرکارتەر- داد . ٢- کۆلۆنێل هاول – دارایی. ٣- میجەر بۆلارد- کار. ٤- مستەر فلبی- ناوخۆیی . ٥- کۆلۆنێل سلیتر- یاردەردەری دارایی. ٦- ئەلمس بیل- سکرتێری رۆژهەلات لە دیووانی ناوبراو پێکراوی بەرینانیا ، کە ئەمانەیە سەرکردایەتی کۆکس رۆڵی گرنگیان هەبوو لە باری ئێراق ، هەروا لە ١٠/٢٥/هەمان ساڵ یەکەم کۆبوونەوەیان گرێدا لە شارەکەدا.

١٧ /١٠/١٩٢٠ نووسەرو رۆژنامەنووسی بەریتانی – لۆرد کیلبراکین جۆن رایمۆند – چاوی بە جیهان هەلهێناوە. لە ئارلەندەی باکوور ژیانی بەسەر بردووە، دوای ئەوە بروانامەی ماستری لە زانکۆی ئۆکسفۆرد بە دەست هێناوەو دوای ئەوەش لە هەمان زانکۆدا بروانامەی دکتۆرای فەخەری داوەتیێ.

جێگەی باسکردنە کە لۆرد کیلبراکین سەرەتا فرۆکەوان بوو لە نێوان ساڵەکانی ١٩٤٠--١٩٤٥ و گەیشتە پلەی نەقیب لە فرۆکەوانیدا، هەروا فرۆکەوانی دەریایی و فەرماندەی هەردوو تیپی ٧١٤ و ٨١١ ی ئەو هێزە.

دوای جەنگی دووەمی جیهان دەستی لە کاری سەربازی هەڵگرت و بووە پەیامنێری ژمارەیەك لە رۆژنامەو گۆڤارەکانی بەریتانیە بەناوبانگەکان، وەك رۆژنامەی – دەیلی میرەر لە نێوان ساڵەکانی ١٩٤٧- ١٩٤٩ داو رۆژنامەکەی

– سەندی تێکسپریس – لـــە نێـــوان ســـاڵەکانی ١٩٤٩– ١٩٥١دا.
دوای ئـــەوە لـــە نێـــوان ســــــاڵەکانی ١٩٥١ – ١٩٦٦دا وەك رۆژنامـــــــــەنووس و وێنـــەگرێکی ســـەربەخۆ کـــاری کـــردووەو زۆر بابـــەتی لـــە گۆڤـــارو تەلەفزیۆنـــــــــەکانی بـــەریتانیا و ووڵاتـــە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا و ووڵاتانی دیکە بەرهەمەکانی بڵاودەکردەوە. هەروا لـــە ســـاڵی ١٩٤٠ ژمارەیـــەك کتێبـــی بڵاوکردۆتـــەوە، وەك –تەنانـــەت بـــۆ سەعاتێکیش بێـت کـە بریتیـە لـە هونراوەکـانی – ئـەوەی دواتـرم پـێ بلـێ– نامەکانی بەرەبەیانی نیوزیلەندا– ژیان وەك لۆردێك – لەگـەڵ چەندین کتێبی دیکەدا.
دوای ئەوە کیابراکین لە ساڵی ١٩٥٣ بووە ئەنـدامی پـارتی لیبرالی و لە ساڵی ١٩٦٦ بووە ئەندامی پارتی کرێکارانی بەریتانیا و نووێنەر لە پەرلـەمان. لـۆرد کیلبرکین دۆست و عا شقی کوردو کوردستان بووە،
لە ساڵی ١٩٦٦ دووجار سەردانی ناوچە ئازادکراوەکانی کوردستانی کـردووە لە هەرێمی باشووری کوردستان و لە ساڵی ١٩٧٥ بۆ ماوەی ١٥ ساڵ ئەندامی کۆمەڵەی دۆستایەتی بەریتانا– کوردبووە.
بەداخـەوە ئـەم کەسـایەتیە رۆنـاکبیرو دۆسـتەی کـورد لـە ٢٠٠٦/٨/١٤ کۆچـی دوایی کرد.
تێبینی:– بروانە لاپەرە/٥١٠ لە کتێبی کوردوکوردستان لە بەلگەنامەکانی بە ریتانیا– کەمال مەزهەر.

١٩٢٠/١٠/١٩ لە دایك بوونی گەوورە شاعیری ناوداری نەمساو جیهان – ئارنست هێربیك

- لەشاری شتوکاروی سەر بەهەرێمی نزمایەکانی نەمسا... شایانی ئاماژە پێکردنە کە شاعیری ناوبراو لە ١٩٩١/٩/١١ ، کۆچی دوایی کردووە لە وولأتەکەیدا .

١٩٢٠/١٠/٢٠ ڕزگار کردنی هەردوو ناوچەی - قانگای و ، دیڤریگ - لە باشووری کوردستان ، لە لایەن هێزە چەکدارە کوردەکان لە ژێر دەستی هێزەکانی سووپای بەریتانیا لە ناوچەکەدا .

١٩٢٠/١٠/٢٠ مۆرکردنی ڕێکەووتننامەی کۆتایی هێنان بەکێشەی نێوان فەرەنساو دەسەلأتی تورکیا ، ئەویش بە بەجێ هێشتنی ناوچەی - کلکان - لەلایەن فەرنسا بۆ تورکیا لە ناوچەکەدا .

١٩٢٠/١٠/٢٥ مەندووبی سامی بەریتانیا لە ئێراق - پرسی کۆکس- یەکەم ئەنجوومەنی وەزیرانی بە سەرۆکایەتی - نەقیب عەبدولرحمان گەیلانی- لە ئێراق دامەزراند لە شاری بەغدادا .

١٩٢٠/١٠/٢٦ مەندووبی سامی بەریتانیا لە ئێراق- کۆکس- ڕاگەیاندنێکی بۆ هەموو مەزهەب ئایین و تیرەو نەتەوەکانی ئێراق بلأو کردەوە .

کە بریتانیا گەڕاوەتەوەو حکوومەتێکی نیشتمانی پێك هێناوە لە هەموو گەلانی ئێراقدا.

١٩٢٠/١٠/٢٧ جەماوەری ناوچەی گەرمیان دەستیان کرد بە ڕاپەڕین بەسەرکردایەتی - ئیبراهیم خانی دەلۆ- لەدژی هێزەکانی سووپای داگیرکەری بەریتانیا لە باشووری کوردستان.

١٩٢٠/١١/٢ گرێـــدانی یەكـــەم كۆبوونـــەوەی ئەنجوومـــەنی وەزیـــران لـە مـاڵی كەسایەتی ناوداری كورد و ئێقی بـەرەو دامەزرانـدن ، شـێخ نـەقیب گـــەیلانی، ئـــەویش بـــەهۆی نەخۆشی و دەرچوونی لەماڵەكەی بە دەگمەن نەبێت .
دوای ئەوە عەبدولرەحمان نەقیب گـەیلانی وتەیـەكی خووێندنـەوە ، بـە داوا كـردن لـە ئەنجوومـــەنی وەزیـران بەراپەڕانـدنی كاروبـاری ئێراقی نوێ ، بەسەرپەرشتی نووێنەری سامی بەریتانیا كۆكس لە ئێراقدا.

١٩٢٠/١١/٧ یەكـەم راگەیانـدنی منـدووبی سـامی بـەریتانیا – كـۆكس – بـوو لـەدوای دامەزراندن و دابین كردنی و ئاگادارییەكان ، ئەویش بە ئاگادار كردنـی هەموو گـەلانی ئێـراق ، لـەپێناو دامەزرانـدنی حكوومـەتێكی ئێراقـی بەسەرپەرشـتی بەریتانیا ، لەرێگای كۆنگرەیەكی گشتی گەلی ئێراق... بەڵام مافی كورد تەنیا لەسەر لاپەڕەكان تۆمار دەكرا.

١٩٢٠/١١/٩ بـاوكی پاپـای فاتیكـان پایـا بیندیكتی شـانزدەهەم ، لە رێگای بڵاوكردنـــەوەی ئاگـــاداری . لـــە رۆژنامەكانی ئەڵمانیا ، كە سەر بە كاســۆلیكەكان بـــوو ، ئـــەویش بەدووجار لـەپێناو بەدەستهێنانی ئافرەتێكی لێهاتوویۆ ئـەوەی ببێ بـە هاوســەری . بـەپێی هـەواڵی رۆژنامەكــە – بیلـــدام زونتـــاژ – دووپاتی كردۆتەوە كە جۆزێف رابسینگری باوكی پاپا .
كـە دوو راگەیانـدنی بڵاوكردۆتـەوە بەگـەڕان بـەدوای ژنێـك تـاكوو لـە سـاڵی

١٩٢٠ توانی – ماریا باینتز– بدۆزێتەوەو دوای ئەوە بووە خێزانی ، ئەویش لە راگەیاندنی دووەمی لەگەڵ ماریای دایکی پاپا یەکتریان ناسیی و لەم رۆژەدا بوونە هاوسەری یەکتری ، دوای ئەوەی بەردەوام بوون لە ژیانی هاوسەریەتی بوونە خاوەنی – ٣ – مندالْ یەك لەوانە پاپای ئێستای فاتیکانە .

کە تاکو ئێستا پاپا بینديکتی شانزدەهەم ئەو راگەیاندنانەی کە باوکی بلاّوی کرۆدتەوە بەبەردەوامی دەیخوێنێتەوە.

١٩٢٠/١١/٩ لە دوای سەرکەووتنی شۆڕشی بەلشەفیەکان لە ڕووسیای قەیسەری، بە لشەفیەکانی ئەرمەنستان دەسەلأتیان گرتە دەستو کەووتنە ڕاست کردنەوەی هەلەکانی ڕابردویان لە وولأتەکەدا ، هەر ئەو ساڵە ئەلفو بێی تایبەتیان بۆ زمانی کوردی داناو یەکەم کتێبی کوردی بۆ خووێندن لە قوتابخانەکەیان بەناوی – شەمس– بەچاپگەیاند.

١٩٢٠/١١/١٠ بلاّوکردنەوەی پرۆگرامی ڕێنماییەکانی دەستەی کارگێری ئێراق لەلایەن دووەم کۆبوونەوەی ئەنجوومەنی وەزیران بەسەرپەرشتی کۆکس ، کە پرۆگرامەکە لەلایەن – مستەر فلبی– ئامادە کرابوو ، کە لە ١٤ خالْ پێکهاتبوو ، لە دوای پەسەند کردنی پرۆگرامەکە لە گەڵ چەند دەستکاریەکی ورد وەك یاسایەکی بنەڕەتی رژێمی نوێێ ئێراق دەستگیر بوو پێی تاکوو کۆتایی هاتنی ئینتدابی بەریتانیا لە سەر ئێراق لە ١٩٣٢/١٠/٣ ، ئەویش بەراگەیاندنی سەربەخۆیی ئێراق بەدەرچوونی لەژێر ئینتدابی بەریتانیادا.

١٩٢٠/١١/١١ لە ئاهەنگی یادکردنەوە بە سەر تێپەر بوونی دوو ساڵ بەر کۆتایی هاتنی جەنگی یەکەمی . وەزیری بەرگری فەرەنسا – مسیۆ ماگینۆ – خاوەن هێلی بەرگری بەناوبانگ – هێلی ماگینۆ – لە نێوان فەرەنساو

ئەلمانیا، داوای لە یەکەی سووپا کرد بە هێنانی تەرمی هەشت سەربازی فەرەنسا کە نە ناسراوبن و لە جەنگ کووژرابن و بە بەکۆمەڵ بنێژرێن لە قەلای فەردان، بۆ رێزگرتن لەو کارە پیرۆزەدا چەندین سەربازیان لەوێ ئامادە کرد و بە رێزبوونیان بۆ ئەوەی سلاوی سەربازیان بۆ ئەنجام بدرێت.

لەوکاتەشدا ماگینۆ بە خۆی ئامادە بوو و بچووکترین سەربازی خۆبەخشی دەست نیشان کردوو تاجە گولینەیەکی جوانی دایە دەست بۆ ئەوەی بە ئارەزووی خۆی لە سەر لە تابووتەکانی سەربازە نەناسراوەکان دابنێت و پێووت :- ئەو تەرمەی تاجە گولینەکەی لەسەر دادەنێیت بۆ هەتهەتایە دەبێتە تەرمی - سەربازی وون - واتە دەبێتە هیمای پاڵەوانیەتی یەك ملیۆن وونبووی سەربازی فەرەنسا کە گیانی خۆیان لە پێناو نیشتیمانەکەیان بەخت کرد.

لە دوای ئەکارە نشتیمانپەروەرەیە و چاولێکردنی بەریتانیاو ئەمەریکا لە یادکردنەوەی رۆژی ۱۱/۱۱ی هەموو ساڵێك چاویان لە فەرەنساکرد، کە لە ئینکلتەرەوە شاژنی بەریتانیا لە کاتژمێر /۱۱ لە رۆژی ۱۱/۱۱ ی هە موو ساڵێك بە جل وبەرگی سەربازی لە گەڵ شازادەو وەزیرو سەرکردەکانی سەربازی وگەلەکەشتی بەریتانیاو پیاوانی کلێساو نووێنەرانی هەموو وولاتان و جەماوەرێکی زۆر لە شاری لەندەنی پایتەختی بەریتانیا لەبەردەم پەیکەری یادەوەری رێزدەبن.

لەو رێورەسمەدا شاژن بە خۆی تاجە گولێنە لە سەر گۆری - سەربازی وون- دادەنێت. دوای ئەو هەنگاوە پیرۆزەی فەرەنسا چەندین وولاتی دیکە لە جیهان روویان تێکرد، وەك یەکییەتی سۆڤیەت و ئەلمانیا وولاتانی دیکە، لەوانەش لە ئێراق، کە لە ساڵی ۱۹٦۰ لە لایەن دەسەلاتی کۆماری ئێراق پەیکەرێکی یادەوەری بۆ - سەربازی وون - ی ئێراقی لە ژێر کوانەیەکی گەوورە لە گۆرەپانی شەقامی سەعدوون - فردۆسی ئێتا - دروستکرد.

ئەویش بە مەشخەلێکی داگیرساوی بەردەوام لە ناوە راستی گۆرەپانەکەدا، بەلام ئەو پەیکەرە لە لایەن رژێمی بەعس لە ئێراق رووخێندرا و لە شووێنی ئەوپەیکەرە، پەیکەرێکی گەوورەی دیکەی لەسەر شێووەی گۆرێکی کراوە لە دوو لاوە دروستکرا بە ناوی پەیکەری شەهید لە شاری بەغدای پایتەختی

ئێراق.

سەرچاوە:- www.algeeran.net

١٩٢٠/١١/١٥ مەندووبی سامی بەریتانیا لە ئێراق - بیرسی کوکس- خۆی سەرپەرشتی کاررووباری کوردستانی گرتە دەست ، بە جیا لە گەڵ وویلایەتەکانی دیکەی بەغداو بەسەرە ، ئەویش بە هۆی بوونی جیاوازی لە بوارەکانی :-
مێژوو زمانو خاكو دابو نەریتو کەلتوور ، لەگەڵ نەتەوەی عەرەبی هاوردەو نیشتەجێ کردنیان لە ئێراق بە زۆری زۆردار بەرەو دورستکردنی دەووڵەتی ئێراق لە هەرێم و ناوچەکەدا .

١٩٢٠/١٢/٣ بەپێی رێکەووتنامەی - ئەلیکسەندەر پۆڵ - رژێمی تورکیا پارێزگای قارسو ئەردەهانی خستەوە ژێر دەسەلاتی خۆی ، بەڵام پارێزگای باتۆمی لە دەست داو ، ئاواتی ئەرمەنەکان لە پەیمانی سیڤەر دیاریکرا ، بە لە گۆڕنانی مافەکانی کورد لە باکووری کوردستان .

١٩٢٠/١٢/٩ لە دوای مۆرکردنی پەیمانی سیڤەرو پێدانی شێووەی یاسایی دیاری کرد ، لە رێکەووتنامەی - سان ریمۆ- لە ٤/٢١ ی هەمان ساڵ بە رژێمی ئینتداب ، جا بەپێی ئەو رێکەووتنە ناوچەی وولاتی نێوان دوو زێ - میزۆپۆتامیا - و دوایی ئێراقی دروست کراو لە ژێر ئینتدابی بەریتانیادا .
ئەویش بەپێی راپۆرتەکە لەم رۆژەدا بەدیاری کردنی ماددەی/٦ لە رێکەوتننامەکە ، کە بەندە بەمافی کورد لە هەرێمەکەدا... کە هیچ بڕگەو مادەکە ، کە رێگەگر نییە لە پێش دامەزراندنی دەووڵەتی سەربەخۆی کارگێری کوردی لە هەرێمەکانی کوردستان. ئەویش بەر لە دامەزراندنی وولاتە دامەزرازەکان .

١٩٢٠/١٢/٢٠ سەرکردەی پارێزگای دەرسیمو دەووروبەری - دێرسیمی- لەباکووری کوردستان لەلایەن هێزەکانی سووپای تورك دەستگیر کرا.

١٩٢٠/١٢/٢٢ بەریتانیاو فەرەنسا گەیشتنە رێکەووتن ، ئەویش بە داڕشتنی نەخشەی دیاریکردنی سنووری نێوان سووریاو ، لوبنانو ، فەلەستینو ، ئوردنو ، ئێراق .
ئەویش بەپێی ناوەرۆکی پەیمانی سایکس - بیکۆ ، بەجێ بەجێکردنی سەر لە نوێ لە سەر وێنەی ناوچەدا ، کە لە لایەن هەردوو وەزیری دەرەوەی بەریتانیا - هاودنگ- و فەرەنسی - بیج - ئەنجام درا لەسەر خاکی

رەسەنی گەلانی کێشوەرەکە ، بە تایبەتی لە سەر خاکی گەلی کوردستان .

١٩٢٠/١٢/٢٣ رابەرو دامەزرێنەری یەکیەتی سۆڤیەت– لینین – دەڵی:–

لەو کاتەی کە ڕووسیا تۆڕێکی چڕ لە مەڵبەندەکانی کارەبا لە وولات دابپۆشێ بە دامەزراوەکانی تەکنیکی بەهێز ، ئەو کاتە ژێرخانی ئابووری کۆمۆنیستی دەبێتە نموونەیەك لە ئەوروپا لە داهاتوودا ، نموونەیەك لە ئاسیای سۆشیالیستی لە داهاتوودا .

لە دوای راپەرینی بەهاری ١٩٩١ ، باری کوردستانی ئێمەش زۆر لەبارو گوونجاوە بۆ بەکارەباکردنی کوردستان ، نەك شارو شارۆچکەو گوندو دۆڵەکان ، بەڵکوو هەتا شاخە بەرزەکانی ولاتەکەمان.

١٩٢٠/١٢/٢٣ مۆرکردنی رێکەوتننامەی نێوان فەرەنساو بەریتانیا ، کە هەردوو وولات دامەزرێنەری وولاتەکانی سووریاو ئێراق و وولاتانی دیکە بوون لە سەر خاکی کوردستان .

ئەویش بە مەبەستی چۆنیەتی ڕێکخستنی ئاوی دیجلەو فورات و چۆنیەتی بەکارهێنانی ئاوەکەی لە پرۆژەکانی کشتووکالی ، ئەویش بە پێکهێنانی لێژنەی تایبەت بە بڕیاری بەریتانیاو فەرەنسا لەم بوارەدا .

جێگەی ئاماژە پێکردنە کە ئێراقی نوێی دروست کراو لە سەر خاکی گەلانی ئێراق بەتایبەتی گەلی کردستان و خاکی کوردستان ، هیچ رووباروو زێیەکی نێوودەووڵـەتی تیـا نـەبووە ، بـە هـۆی بـوونی دەسـەڵاتی ئیمپراتۆریـەتی عوسمـانی ، کـە هـەمووی لـە ژێـر دەسـەڵاتی سـنوورەکەی بـووە بـە کوردستانیشەوە .

بـەڵام لـەدوای دروسـتکردنی دەووڵـەتی ئێـراق ، بـە تایبـەتی هـەردوو زێـی دیجلەو فووراتی بوونە زێی نێوودەووڵەتی... جگە لە زێیەکانی زێی گەوورەو زێـی بچووك ودیالـە . کـە ئەمانـەش بـە نـاو خـاکی کوردسـتان و لـە خـاکی کوردستان هەڵدەقوڵێن.

بەڵام هـەردوو زێـی دیالـە و زێـی بچووك ، لـە خـاکی ئێـران هەڵـدەقوڵێن و بە خاکی کوردستاندا دێنە خوارێ بۆناو خاکی ئێراق .

واتە لە ناوەراست و باشووری ئێراق تـێ کردنـەوەی لە هـەردوو زێـی دیجلـەو فـورات ... کـە زێـی فـورات لـە شـاخەکانی ئارارات لـە باکووری کورسـتان لـە

ناوچەی – فوورات سوو – و – موراد سوو – لە ناو خاکی شاری – کیان – دێتــە خــوارێ و مــاوەی ٤٢٠ کیلۆمــەتر بــەناو خــاکی توورکیــادا دەروات و دەچـێتەوە نـاو خـاکی دەوڵـەتی سـووریای دروسـتکراو بـە هـەمان شـێووەی ئێراق لە نزیك شاری – جرابلس – لەماوەی ٤٨٠ کیلۆمەتردا .

هەروا لەم نێوانەش سێ لقی لێدەبێتەوە ئەویش – ساچور و بەلیخ و خابوور – و لە تەك شاری – حەسیبە – دەکەوێتە ناو خاکی ئێراق بە درێژی ١٢٠٠ کیلۆمەتر ، کە نزیکەی ١,٥٢ ی درێژی زێیکەیە . لە ناوچەکەدا ، هەروا ئەم زێیــەش بــە باشــی بــەکار نەدەهێنــدرا ، بــەڵام دوای هەڵوەشــاندنەوەی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی و دامەزراندنی هەرچوار دەووڵەتی تورکیاو ئێران و سووریاو ئێراق بە هۆی جەنگی یەکەمی جیهان .

ئەم زێیانەش لە نێوان سێ دەووڵەت دابەشکران ئەویش :– تورکیا سووریا و ئێراق بوون ... کە ئەمەش بووە هـۆی گـۆڕینی شـێووەی زێـی فوورات ، دوای ئـەوە لـە سـاڵی ١٩١٨ بـووە زێیـەکی نێوودەووڵـەتی و بـووە زێیـەکی گـرنگ ، ئـەویش بە سـەر هەڵـدانی کێشە لـە سـەر ئـاوی زێـی فوورات ، بە تایبـەتی لـە نێوان ئەو سێ دەووڵەتە لە ناوچەکەدا .

هەروا لە ماددەی /٣ ی ئەم رێکەووتنە ، کە فەرەنسا هەڵسا بە ئاودێر کردن و پرۆژەئـاو لـە سـەر ئـەو زێیـە ، دەبێتـە هـۆی کـەم کردنـەوەی ئـاوی فوورات لـە دوای چوونە ناو خـاکی ئێـراق . ئـەویش بە پێك هێنـانی لیژنـەی تایبـەت بـەم کــارە کــشتووکالیە و ئاودێریــە لــە نێــوان ئێــراق و تورکیــا و ســووریا بــە لێکۆڵینەوە لە سەر پرۆژەی فەرەنسادا .

هــەروا دوای دروســتکردنی ئــەم دەووڵەتانــە بــە تایبــت ئێــراق و ســووریا رەزامەنیان لە سەر بەندەکانی پـەیمانی لـۆزان ١٩٢٣/٧/٢٤ ، کـرد بـە تایبـەتی بەندی /١٠٩ لە رێکەوتننامەکەدا .

## ١٩٢١

١٩٢١/١/٦ لـە دوای دامەزرانـدنی دەووڵـەتی ئێـراق ، دامەزرانـدنی سـووپای ئێـراق لـە پێکهاتـەکانی گـەلانی ئێـراق ، بەڵام دوای ئـەوە ئـەو سـووپایە بـووە سـووپای دەســەڵاتە یــەك لــە دوای یەکــەکانی ئێــراق ، بــە تایبــەتی لــەدوای کودەتــای بەعسیەکان لە ١٩٦٣/٢/٨ ، کە بووە هێزێکی دژ بەگـەلانی ئێراق ، بەتایبەتی گەلی کوردو خاکی کوردستان ، تـا ڕووخـاندنی ڕژێمـی بەعس لـە ٢٠٠٣/٤/٩ ،

بە هەڵووەشاندنەوەی هێزی سووپاو هێزە ئاسایشەکانی دیکەی ڕژێمی بەعسی لە ئێراق ، لەلایەن دادوەری گشتی هاوپەیمانان - پۆڵ پریمەر - لە ئێراقدا .

١٩٢١/١/١٠ بڵاو بوونەوەی وتاری هەندێ لە وردبوونەوەو سەرنج ، لە سەر باری کورد لە کوردستان لەلایەن - ب -نیکتن- لە گۆڤاری Mercure De Erahce لە پێناو بەرەو چارە سەر کردندا .

١٩٢١/١/٢٤ ئەنجوومەنی ئاشتی وولاتانی هاوپەیمان لە پاریسی پایتەختی فەرەنسا ، کۆبوونەوەو بڕیاری داواکردنی نووێنەری تورکیای بڵاو کردەوە ، بۆ بەشداری کردن لە کۆبوونەوەی داهاتووی ئەنجوومەنەکەدا ، ئەویش لەپێناو یارمەتی دانی ڕژێمی نوێی تورك و چەسپاندنی و بە ئازاردانی کوردو دابەش کردنی نیشتمانەکەیان لە سەر خاکی کوردستاندا .

١٩٢١/٢/٦ هەرێمی ئێرلەندی باشوور سەربەخۆیی خۆی بە جیابوونەوە لە ئێرلەندەی باکوور ڕاگەیاندو ئیرلەندەی باکوور لە ژێر دەسەڵاتی شانشینی بەریتانیا مایەوە تاکۆتایی ساڵی ٢٠٠٩ دا لە کێشووەرەکەدا .

١٩٢١/٢/١٢ گرێدانی کۆنگرەی لەندەن ، بەڵام دوای دوو هەفتە کۆنگرەکە هەرەسی هێنا ، ئەویش بە هۆی هەلوویستی شۆڤێنی نووێنەری ڕژێمی تورکیا- بکر سامی- و گەڕانەوەی نووێنەری تورك بۆ تورکیا و ڕاگەیاندنی هەلوویستیان بەرامبەر بە کۆنگرەی لەندەن.

١٩٢١/٢/١٦ لە دوای دەست کێشانەوەی مشیر دەولە لە حکوومەتەکەی لە ئێران سەیاهدار حکوومەتێکی نوێی لە ئێران دامەزراند ، لە سەر ئەو وەزیرانەی پێشوو ، بەڵام ئەو حکوومەتە چەند ڕۆژێکی خایاندو رووخێندرا . بەهۆی کودەتا بەناوی -حووت- بەپێی ڕۆژنامەی فارسی لە٢/٢١ هەمان سالدا .

ئەو کودەتایەش زیاتر بووە هۆی بەهێز کردنی دەسەلاتی شارەزا بەهلەوی لە سەر گەلانی وولاتی فارسی لە ئێران .

بەتایبەتی کورد لە ڕۆژهەلاتی کوردستان و مامەلە کردن بە ئارەزووی خواستەکان لە دەسەلاتدا .

١٩٢١/٢/٢١ بەستنی کۆبوونەوە لە نێوان نووێنەری بەریتانیا- سەن جێمس-و نووێنەری ڕژێمی تورکیا لە لەندەنی پایتەختی بەریتانیا ، لە پێناو دژایەتی کردنی

کورد لـه باکووری کوردسـتان و داهاتوی ناوچـەکه بـەهۆی ترسـی دوا ڕۆژی ڕژێمی تورك له بەهێز بوونی بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی کورد له کوردستاندا .

١٩٢١/٢/٢٢ بـەپێی نووسـراوی سکرتێری مندووبی سـامی لـه ئێـراق کـوکس بـه ژمـاره/ ٣٣٣٠ بەنـد بـوو بـه کاروبـاری کـارگێری لـه شـاری سـلێمانی لـه باشووری کوردستان ، کـه ئەنجوومـەنی وەزیرانی ئێراق بەکۆی دەنگ بڕیاریدا بەژێر خستنه پارێزگای سلێمانی بۆ ژێر دەسەڵاتی ڕژێمی شایەتی له ئێراق .

شاری سلێمانی له سەردەمی بزووتنەوەی شێخ مەحمود

ئـەویش بـەهۆی گرنگـی جێگـەو هەڵکەوتـەی جـووگراف شـاری سـلێمانی و بەسـتنەوەی پەیوەنـدی ئـابووری و رامیـاری کـه بـه ئێـراق دەبەسـترێتەوە . ئـەویش بـەداوا کردنـی لەمنـدووبی سـامی بـەریتانیا ، بۆ ڕەزامەنـدی کـردن لەسەر ئەو بڕیاره بۆ پتـەوکردنی داهاتوویی ڕژێمـی ئێراق و بەستنەوەی بە وولاتانی دیکەی عەرەبی و بوونی به نیشتیمانی عەرەب له کێشووەرەکەدا .

١٩٢١/٢/٢٢ گرێـدانی کۆنگرەی ڕۆژهـەڵاتی ناوەڕاست ، لـه کاتـژمێر دوانـزەی شـەو کـه لـه قاهرەی پایتـەختی میسر ئەنجامدرا ، بەسـەرۆکایەتی نووێنـەری بـەریتانیا – کیرزن– لەنووسینگەی وەزارەتی دەرەوە ، که سێ پێشنیاری تیا دیاریکرابوو ، لەوانه خالی سێیەم :–

لە ناوەند – چرچل – و لە لای چەپ – برسی کۆکس – و لە دواوە جەعفەر پاشای عەسکەری ، و ساسۆن عەقیل .

بەڕازامەندی کردنی لە سەر کۆنفدرالی بۆ کورد لەکورستان بە تایبەتی لە باشووری کوردستان. کە ئەو پێشنیارەش لەلایەن وەزارەتی دەرەوەی هیندستان بەرز کرابووەوە . بۆ بڕیار لەسەردان و چارە سەرکردنی کێشەکان لە ناوچەکە بەتایبەتی لە کوردستاندا .

١٩٢١/٢/٢٣ بەردەوام بوونی کۆنگرەی لێژنەی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست لە قاهرەی پایتەختی میسر ، بە سەرکردایەتی – لورد کیرزن – لەسەرئەو سێ خالەی کە لە لایەن وەزارەتی دەرەوەی هندستان بەرزکرابووەوە بە دامەزراندنی کۆنفدرالی بۆ کوردو باری کوردستان بەگشتی لە کێشووەرەکەدا ، کە هەر چەندە تاووتۆی کێشەکانی کورد دەکرا ، کێشەی نوێی دیکە سەریهەڵدەدا ، بەهۆی هەلوویستی ، یەکەم :– وولاتانی هاوپەیمانو ، دووەم :– وولاتانی بەرەو دامەزراندن لە ناوچەکەدا لە سەر خاکی کوردستان.

١٩٢١/٢/٢٥ شارەزا پەهلەوی داوای لە زیائەدینی تەباتەبائی کرد ، بەپێك هێنانی حکوومەتی نوێ ، شا رەزاشاش سەرکردایەتی فرقەی فوزاتی گرتە دەستو بۆ یەکەم جار سەرەك وەزیرانی ئێران زیائەدین تەباتەبائی لە گەڵ بالوێزی

بەریتانیا کۆبۆوەو ، داوای لێکرد کە حکوومەتەکەی ناتوانێ کارەکانی ئەنجام بدات گەر رێکەووتننامەی ئەنگلۆ- ئێرانی هەڵنەوەشێندرێتەوە... لە هەمان رۆژ بالوێزی بەریتانیا ، وەزیری دەرەوەی بەریتانیای ئاگادار کرد ، لەو کۆبوونەوەیەو چی باسکراوەو لەهەمان کات حکوومەتی شانشینی بەریتانیا رەزامەندی لەسەر داواکاری ئێران کرد لە وولاتەکەدا .

١٩٢١/٢/٢٦ گرنگترین ئەو رێکەووتننانەی کە لە و پەیوەندیانەی نێوان ئێران و سۆڤیەتدا مۆرکرا، ئەویش بە هاتوو چۆی پاپۆرەکان و بازرگانی ساڵی ١٩٤٠. لە بەشی /١١ رێکەووتنی ١٩٢١دا، کە مافی وەك یەك بۆ هاتوو چۆی پاپۆرەکانی شەڕو پاپۆرەکانی بازرگانی لە بەر چاو دەگیرا.

هەروا مادەی /١٣ ی رێکەووتنی هاتووچۆی پاپۆرەکان وبازرگانی ساڵی/ ١٩٤٠ بە روونی باس لەوە دەکات کە – هەردوو لایەنی رێکەووتنەکە، واتە ئێران و سۆڤیەت بە پێی ئەو پرنسیپانەی کە لە رێکەووتنەکە رایانگەیاندوە کۆکن لە سەر ئەوەی کە تەنیا پاپۆرەکانی ئەو دوو وولاتەو ئەو پاپۆرانەی وولاتانی دەرەوە، کە کار بۆ بازرگانی دەکەن و لە ژێر ئالای ئەواندا هاتووچۆ دەکەن، بتوانن لە دەریای خەزەردا – قەزوین – هاتووچۆ بکەن.

جێگەی باسکردنە کە دوای هەڵووەشاندنەوەی یەکییەتی سۆڤیەت و سەربەخۆیی وولاتانی دەرەوەی دەریای خەزەر – قەزوین – کێشەی سوود وەرگرتن لە سەر چاوەکانی ئەو دەریایە، کە گرنگیەکی تایبەتی پەیدا کردوو ئەم دەریایە خاڵی بە یەك گەیشتنی پێنج وولاتی گرنگ.

واتـە ئێـران، رووسـیای یـەکگرتوو، کازاخستان، تورکمانـستان، ئازربایـنجـان، دوای ئـەوە ناوچـەی خـاوەن نـەوتی کەنـداوی فـارس و سـیبیریا، کـە بـە گـەورەترین سەرچـاوەی نـەوت و گـازی جیهـان ناسـراوە. هـەروا یـەکێك لـە کیشەکانی پەیوەندار بەدەریای خـەزەر، چۆنیەتی دیاریکردنی باری یاسایی ئەو دەریایەیە کە ئەم تووخـمانـە لەخـۆ دەگـرن :-

١- کێشەی هاتوو چۆی پاپۆرەکان.

٢- کێشەی کەڵك وەرگرتن لە سەرچاوە زیندوەکلنی ناو دەریا.

٣- کێشەی ژینگە، بۆ وێنە بەرز بوونەوەی ئاستی دەریا.

٤- کیشەی سوود وەرگرتن لە سەر چوە کانزاییەکان.

٥- دیـاری کردنـی سـنوورو ئاسـتی دەسـەلات و دەسـەلاتی دەوڵەتـەکانی لیواری دەریای خەزەر - قەزوین - بەسەر ئەو دەریایەدا.

هـەروا دەریـای قەزویـن باریـکی تایبەتـی یاسـایی تایبەتمەنـد بەخـۆی هەبـووە، ئەم دەریایە لەرێگای کەناڵە دەستکردەکانەوە لە رێگـەی رووبـاری - ڤۆڵگـا - ی رووسـیا - دەن - دەگاتـەوە ، دەریـای رەش و پالینێـك تـەنیا پاپۆرەکانی لیـواری ئـەم دەریایە مافیـان هەیە هات و چۆی تێدا بکـەن، رێـوو شـوێنەکانی ئێـستای یاسـای نێوودەوڵـەتی گـشتی سـەبارەت بـە دەریـای ئـازادو ناوچـە دەریایـەکانی دەووڵـەتانی جیهـانی ئـازاد ئـەم دەریایـە لـە خـۆ ناگرێ.

کـە سـەرەکیترین سەرچاوەی یاسـایی کـە دەکـرێ لـە ووتووێـژە رامیاریەکانـدا پشتی پێ ببەسترێ، تـەنیا ئـەو رێکەووتن نامانـەن، کـە ئێـستا لـە بەردەست دان. لـە بـەر ئـەوەی لـە پێناسـەی کۆنڤانـسیۆنەکانی ئێـستادا سـەبارەت بـە یاسای دەریاکان دەردەکەوێ ئەوەیە کە دەریـای خـەزەر بە هـۆی هەڵکەووتـەی جووگرافی ناچێتە خانەی دەریا داخراوو نێووە داخراوەکاندا.

لێـرەدا بەگـشتی سـێ سـیناریۆ سـەبارەت بـە رژێـمی یاسـایی دەریای خەزەر لە ئارادایە ئەویش:-

یەکەم :- کۆنڤانسیۆنی یاسای دەریای ریکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان کە لـە سـاڵی ١٩٨٢ - unlos - بۆ هـەر وولاتێکـی لیـواری دەریـای خـەزەر - قـەزوین - ئـاوی سـەر زەوی و چـوار چێووەی ناوچـەی تایبـەتی ئـابووری و

رۆخی دەریا لە بەر چاو گیراوە.
لە بەر ئەوەی مادەی/٣ كۆنڤانسیۆن ناوچەیەكی بە پانایی ١٢ میلی دەریایی لە هێلی سەرەكی baseline بۆ ئاوی ژێر زەوی لە بەر چاو گرت و، دەكرێ ١٢ میلی دیكە، وەك ناوچەی تەنیشت بخرێتە سەر ئەو ١٢ میلەی پێشوو – مادەی/٣٣. هەروا بە پێی مادەی/٧ ی كۆنڤانسیۆن دەكرێ ناوچەی تایبەتی ئابووری هەتا ٢٠٠ میلی دەریایی درێژەی هەبێ.
دووەم :– بە پێی ئەو سیناریۆیە، كە ئازربایجان لە هەموو لایەك زیاتر لایەنگیری لێی دەكا، دەریای خەزەر – قەزوین – سنووری ئاوی هەر وڵاتێك لە نێوو ئەو پێنج وڵاتەدا دابەش بكرێ. ئەم سیناریۆیە بە پێچەوانەی رواڵەتە دادپەروەرانەی كە رەنگە بە زیانی هێندێك لە وڵاتان لە پەیوەندی لە گەڵ سوود وەرگرتن لە سەرچاوە هیدرۆكەربۆنی تەواو بێ.
كە یەكێك لەو بابەتانەی كە گرنگی دیاریكردنی چوارچێووەی یاسایی دەریای خەزەر دوو هێندە دەكا، سوود وەرگرتن لە سەرچاوە و كانزاكانی هیرۆكەربۆنە لە دەریایەكەدا.
سێیەم :– بە پێی ئەم سیناریۆیە، چوار چێووەی یان بە شێكی دیاریكراو لە ئاوەكانی لێواری دەریا بۆ هەر وڵاتێك تەرخان دەكرێ و تایبەت بەو وڵاتە دەبێ و ئەویدیكەش بە شێووەی خاوەنداریەتی هاوبەش – res communis –سوودی لێوەر دەگرێ.
خاوەنداریەتی هاوبەش بە دەسەڵات و دەسەڵاتی هاوبەشی نێوان دوو یان چەند دەووڵەت بە سەر ناوچەكەدا دەگووترێ، دوای گرێدانی یەكەم رێكەووتننامەی دەستنیشانكردنی سنووورە ئاوییەكانی نێوان ڕووسیاو ئازربایجان بوو لە مانگی /١٠/٢٠٠٢دا.
هەروا سێ وڵاتی – كازاخستان، ئازربایجان، ڕووسیا لە ٢٠٠٣/٥/١٤ دا، رێكەووتنێكی سێ لایانەیان لە كۆبوونەوەی تایبەت بە نووێنەرانی وڵاتانی لێواری دەریای خەزەر لە شاری ئەلماتی كازاخستان مۆركرد.
بەم جۆرەو بە سەرنجدان بە درێژایی لێوارەكان و بە سوود وەرگرتن لە هێلی ناوەراست، بەشی كازاخستان ٢٧ ٪ و بەشی ڕووسیا ١٩ ٪ و بەشی ئازربایجان ١٨ ٪ دەست نیشان كرا، واتە بە گشتی چارە نووسی ٦٤ ٪ ی ئاوەكانی دەریای خەزەر – قەزوین – یەكلاكرایەوە لە ناوچەكەدا.

سەرچاوە:- فەرهەنگی رامیاری ئارشی :- ئامادەکردنی - زاهیر محەمەدی و یاسین حاجی زادە - چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە / هەولێر.

١٩٢١/٣/١ لە ناوەندەکانی کۆنگرەی لەندەن هەوڵدرا چاو بە پەیمانی سیڤەردا بخشێندرێتەوە ، لە بارەی بارو دۆخ و کێشەی کوردو ئەرمەن ، ئەویش لەپێناو دابین کردنی ئۆتۆنۆمی بۆ کورد لە کوردستان و دان نان بە مافە سەرەتاییەکانی ئەرمەن لە باکووری کوردستان .

١٩٢١/٣/٥ دامەزراندنی یەکەم کۆمەڵەی سەهیۆنیزم بۆ یەکەم جار لە مێژووی وولاتی نێوان دووزێ ، لە ئێراقی دورستکراو لەلایەن - ئەهروم ساسۆن ئەلیاهۆ- لە شاری بەغدای پایتەختی ئێراقی دروستکراوی نوێی شانشینی لەسەر خاکی کوردستان.

١٩٢١/٣/١١ کۆمیسەری باڵای بەریتانیا- سیر هورای رامبۆلد- لە شاری ئەستەمبۆڵ تورکیا ، کە- کیرزن- ی ئاگادار کردەوە بۆئەوەی زانیاری پێبدا لەمەر پەیووەندی کورد لەگەڵ یۆنانیەکاندا .

١٩٢١/٣/١٢ وەزیری مستەعمەراتی بەریتانیا - مستەر ونستۆن چرچل- کۆنگرەیەکی گشتی گرێدا لە بارەی کاروباری رۆژهەڵاتی ناوین لە قاهیرەی پایتەختی میسردا ، ئەوانەی کە بەشداریان لەگەڵ دا کرد - سیربیرسی کۆکس- نووێنەری مەکتەبی هندو سیرهربرت سمۆیل دادوەری گشتی دامەزراو لە فەلەستین .

هەروا زاناو شارەزاکان میجەر لۆرانس و میجەر کلایتۆن لە موخابەراتی سەربازی و رامیاری و مستەر کۆرنوالیس و خاتوو جرترووربل لەموخابەراتی وەزارەتی مستەعمەرات بەشداریان لە کۆنگرەکەدا کرد ، لەئاکام بڕیاریاندا

بەدامەزرانــدنی فەیــسەڵی دەرکــراو لەســەر دەووڵــەتی ســووریا ، دانــانی بــە شانشین لەسەر دەووڵەتی دروستکراو لە سەر ئێراق هەروا شەریف حوسێن بەشانشین لە سەر ئیمارەتی رۆژهەڵاتی ئوردن لە ناوچەکەدا .

١٩٢١/٣/١٢ گرێــدانی کــۆنگرەی قــاهرەی پایتــەختی میسر ، لــە پێنــاو دیــاریکردنی چارەنووســی هەرســێ وویلاّیــەتی بەســەرو بەغــداو موســل لــە ناوچــەکەدا – میزۆبۆتامیا – واتــە وویلایــەتی نێــوان دووزێ ، کــە ئــەو کــات دانیشتووانی کورد لەپارێزگای ئێستای موسل لە ٨٥٪ بوون و ، لە پارێزگای کەرکووك لە ٩٥٪ ی دانیــشتووانەکەی کــورد بــوون . لــەو مــشتوومڕەدا ، کــار بەدەســتانی بەریتانیا و هاوپەیمانانی بوون بە دووبەش ئەویش:–

یەکەم :– پێرس کۆکس و بیل گۆرنۆ کە دەیان گووت کوردستان بخرێتە سەر ئێراقــی دامــەزراوی نــوێ ، هــەروا بەســراو بەغــدا بــەناوی خــۆی بمێنێتــەوە ، ئەوەی کە کورد بەرهەلستکاری ناکات لە ناوچەکەدا .

دووەم :– بە سەرۆکایەتی ئەو سای موستەعمەرات – ونستۆن چرچل– بوو ، کــە داوای ئــەوەی دەکــرد . کــە کوردســتان بکرێتــە کیــانی ڕامیــاری ســەربەخۆو ببێتە ناوبرێك لەنێوان ئێراق و تورکیای ئەوکات لە ناوچەکەدا .

بەڵام بەختی کورد دوای تــەواو بــوونی کۆنگرەکە حکوومەتێکی نــوێی پارتی پارێزگــاران لەبــەریتانیا ســەرکەووتنی بەدەســت هێنــا لەهەڵبژاردنــەکانی ئەنجوومەنی گشتی و سەرۆکایەتی بەریتانیا... ئەمــەش بووە هــۆی ئــەوەی کە بڕیارەکانی کۆنگرەی قاهرە ئاوبەئاو بروات ... بەڵام ئەو پێشنیارو نەخشەی کــۆنگرەی قــاهرەو کــۆنگرەو لیژنــە تایبەتیــەکانی کۆمەلــەی گــەلاّن و ڕێکەووتنەکانی ڕژێمی شانشینی ئێراق و بەریتانیا لەسەر کوردو مافەکان ، دەتــوانرێ بخرێتــە ژێــر دەســتی ڕێکخــراوی نەتــەوە یــەکگرتووەکان ، ئــەویش لەپێناو داننان بەکوردو خاکی کوردستان...؟... !.

هــەروا لــەوکات بیرۆکــەی فیــدرالیزم بــۆ گــەلی کوردســتان زادەی بیرکردنــەوەی مــەلیك فەیــسەل و ئەفــسەرە شــەریفیەکان نــەبوو ، تــاکوو ئێــستاش و بــەڵکوو وەرگێرانی درێژ بوونەوەی بۆچوونەکانی هەریەك لەپێرسی کۆکس مەندووبی یەکــەمی ســامی بــەریتانیا لەبەغــدا بــوو ، کــە ئــەرکی پێــك هێنــانی دەووڵــەتی ئێراقــی پــێ ســپێردرابوو . لەگــەڵ بێل گرتــۆدی سکرتێری ڕۆژهــەڵاتی خانــەی

ماندێتی قوناخی پاش کۆنفراسەکە ، لەگەل ئەوەشدا پێش بەستنی ئەم کۆنفرانسە یەکەم ئەنجوومەنی وەزیرانی دامەزراند لە ئێراق بەسەرۆکایەتی عەبدولرحمان گەیلانی ، لەلانی خۆیەوەو بەبێ ڕاوێژکردن لە گەڵ حکوومەتی بە بەریتانیەکان ، ئەویش لە دژی خواستی دانیشتووانی ئەو هەرێمەو ناکۆکی لەگەڵ بەندەکانی پەیماننامەی سیڤەردا. لە ناوچەو کێشووەرەکەدا .

١٩٢١/٣/١٣ سەرکردەی ئوردوی ناوەندی ڕژێمی تورك – نورەدین پاشا– فەرمانی بۆهات ، بۆئەوەی ڕاپەرینی هۆزی قۆچەگیری لە باکووری کوردستان سەرکووت بکات... ئەمەش لە تەلگرافێکی نهێنیدا لەلایەن سەرکردەی گشتی هێزەکانی سووپای تورك لەگەڵ سەرکردەی ئوردوی ناوەندیدا هات ، کە ڕووداوەکانی ئۆمراینیٚ سەر لە نوێ سەریان هەڵداوەتەوەلە ناوچەکەدا .
ئەویش لە بەر گرنگی ئەم ڕاپەرینە دەبیٚ بەرێگای سەربازی چڕو سەختو لەرێگەی سەرکردەی سووپای ئەرزنجانەوە دابمرکێندرێتەوە.
ئەمەش بەچەند ڕێنماییەکی توندرەوی شۆڤینی نوورەدین پاشا ئەنجامدرا بەرامبەر بە کورد لە باکووری کوردستان.

١٩٢١/٣/١٣ مۆرکردنی ڕێکەووتننامە لە نێوان تورکیاو ئیتالیا ، کە ئیتالیا لە ناوچەی ئەنادۆل بکشێتەوە بەرامبەر وەرگرتنی چەند دەستکەووتێکی ئابووری لەلایەن ڕژێمی تورکیا.

١٩٢١/٣/١٤ ڕژێمەکانی فەرەنساو ئیتالیاو ڕووسیای بەلشەفی نویٚ ، هەلسان بە یارمەتی دانی دامەزرێنەری شۆڤێنی ڕژێمی تورکیای نویٚ – کەماڵ ئەتاتورك – بە پێدانی نوێترین چەكو تەقەمەنی و پێداوویستەکانی سەربازی سەردەمی جەنگی و بەرگریدا ، بە پشت گویٚ خستنی کێشەو مافەکانی کورد ، بەپێی بەندەکانی وتارەکەی سەرۆکی ئەمەریکا ویلسون ، لە بارەی کێشەی نەتەوەیی ونیشتیمانی ، بە لە گۆڕنانی پەیمانی سیڤەر ، لە ژێر دەسەڵاتی تورکیاو وولاٚتانی دیکەی ناوچەکەدا.

١٩٢١/٣/١٤ سەرکردایەتی رژێمی کەمال ئەتاتورك لە شاری ئەنکەرەی تورکیا بریاری شەڕی گشتیان لە دژی بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی کورد ڕاگەیاند لە باکووری کوردستانی ژێر دەسەلاٚتی رژێمی نوویٚی لە ناوچەکەدا تورکیا.

١٩٢١/٣/١٥ لـه كۆبوونـهوەی رامیـاری – سیر پیرسـی كـوكس– دژی نـاوەرۆكی پاراسـتنی ئیــدارەی ڕۆژهــهلاتی ناوەڕاســت وەســتاو گــووتی:– پارێزگــای كــهركوك و سلێمانی و ناوچـهكانی بـاكووری موسـل و موسـل بەشـێكی جیـا نەكـەرەوەی ئێراقی نوێن و كەچی زۆربەی دانیشتووانی كوردن و زیاتر لـه ٨٥٪ پێك دێنن .. بەلام ..؟ ..!.

١٩٢١/٣/١٦ مـۆركردنی ریكەووتننامـه لـه نێـوان ڕژێمـی نـوێی توركیـاو ڕووسـیای بەلـشەڤ نوێ ، كه ئەنجامەكەی بووە هۆی داگیر كردنی باكووری كوردستان و بە تـورك كردنی كـورد ، كـه بـووە پاداشـتی كردنـی توركیـا لـه لایـەن ڕووسـیای بەلـشەڤ ئەوكات .

ئەویش بە پێشكەش كردنی چەك و تەقەمەنی بۆ توركیا بە ٣٩ هەزار پارچە چەك و ٦٣ ملیۆن فیشەك و ٥٤ تۆپ و ٢٠ هەزار ماسكی دژ بە كیمیاوی بوون ، كە ڕووسای بەلشەڤ كۆمۆنیستی نوێ ، یەكەم وولاتی گەورەی جیهان بوو ، كـه دانبنـێ بـه ڕژێمـی تـوركی شـۆفێنی و بـه كۆمـەڵ كـوژی كـوردو ئەرمـەن لەباكووری كوردستان ...؟. ئەم پیمانەش تاكوو ئێستا كاری پێدەكرێت .

جێگەی ڕوونكردنەوەیە كە لە دوای ئارام بوونـەوەی بارو دۆخ و ڕێكـەووتن لـه سـەر ئامانجـه ستراتیژیەكان ، بـه تایبـەتی لـه نێـوان ڕژێمـی نـوێی توركیـا و یەكیەتی سۆڤیەتی نـوێ ... كۆنگرەی پەمانی هاوكاری و برایـەتی لـه نێـوان توركیـاو سـۆڤیت لـه ١٩٢١/٢/٢٦ لـه شـاری مۆسـكۆی پایتـەختی سـۆڤیەت گرێدرا .

ئەویش بە ئامادە بوونی نوێنەری توركیا بە سەرۆكایەتی وەزیـری ئابووری – یوسـف كـەمال بـەگ ... لـه هـەمان كـات كۆمارەكـانی ئـەرمینیا و ئازربایجـانی سـۆڤیەتی بەشـداریان لـەو كۆنگرەیـه كـرد ...كـه لـه ٣/١٦، ڕێكەووتنەكـەیان مۆركرد .

ئەو ڕێكەووتنـە كـە لـە پێشەكیەك و ١٦ مـاددەو ٣ پاشـكۆ پێـك هـاتبوو ،دوای ئەوەش ڕێكەووتنێكی دیكە لـە نێوانیـان لـه ١٩٢١/٣/٢٨ مـۆركرا . ئـەویش بـه گۆڕینەوەی دیلەكان لە نێوانیاندا .

ئــەم پــەیمان و ڕێكەووتنــەش بــووە هۆكــارێكی گــرنگ بــۆ توركیــا چ بــە بتەووكردنی دەسەلات و چ بە پاراستنی سنوورەكانی نێوان ڕووسیا و توركیا

و، لەوەش گرنگتر ، گەمارۆ دانی جوولانەوەی ڕزگاریخوازی کورد لە باکووری کوردستان و ناوچەکانی دیکەدا ، لە هەردوو لایەنی دەوڵەتی سۆڤیت و تورکیدا ... کە سۆڤیەتیش ئەم یارمەتیانەی پێشکەش بە ڕژێمی تورکیا کرد ...هەروا .

١٩٢١/٣/٢٣ دەسەڵاتی نوویێی ئەرمەنستان بڕیاریدا ، کە خووێندن لە هەردوو قۆناخی سەرەتایی و ناوەندی بەزمانی دایك بێت ، بەتایبەتی بۆ گەلی کوردو دانیشتووانەکان لە وولاتەکەدا ... شایانی باسە کۆماری ئەرمینیا زیاتر لە ١٧٠٠٠ هەزار کیلۆمەتر چوار گۆشەی لەخاکی کوردستان بە وولاتەکەی لکێنراوە ، بەتایبەتی پارێزگای یەریڤان و دەوورووبەری لە ناوچەککانی دیکە بەپێی پەیمانی لۆزانی ١٩٢٣/٧/٢٤دا لە لایەن هاوپەیمانانیدا .

الفريق جعفر العسكري

١٩٢١/٣/٢٥ لە ناوەندی کۆنگرەی قاهیرە ، وەزیری بەرگری ڕژێمی کاتی ئێراق جەعفەر عەسکەری داوایەکی ئاراستەی شانشین فەیسەڵ کرد، بەپێی ڕێکەووتنی لەگەڵ – چرچل ،و، کۆکس– بەپێکهێنانی سووپای نیشتمانی ئێراق بەم شێووەیە ، کە سووپاکە لە ٢٤ فەوجی پیادەو ٦ کەتیبەی ڕەشاش لەگەڵ پێداویستیەکانی دیکە وەك لاسکی و تەلەفۆن بۆ سووپای ڕژێمەی لە ئێراقدا .

١٩٢١/٣/٢٥ هەردوو سەر کردەو ڕووناکبیری کورد – ئەمین عالی بەگو ، کورەکەی جەلادەت بەگ – لە بالوێزخانەی بەریتانیا لە شاری ئەستەمبوڵ لەگەڵ لێپرسراوانی رامیاری بالوێزخانەی بەریتانیا کۆبوونەوەو پێیان گوتن:– کۆمەلەی تەعالی کورد– پەیووەندی و هاوکاری لەگەڵ یۆنانیەکان دا هەیەو دژی تورکەکان کار دەکەن ، ئەویش لەپێناو بەدەست هێنانی نیازەکان ، بەڵام ئەو بیروو بۆچوونە بەتووندی ڕەتکرایەوە لەلایەن ئەمین عالی بەگ ، کە لەلایەن

تورکەکان بڵاوکرابووەوە.

الأوضاع العامة للجبهة الوطنية

١٩٢١/٣/٢٨ لە بابەتێكی مێژوو نووسی ڕووسی – چەتۆیڤ – نووسیویەتیو دەڵێ –:– کاتێك سووپای سووری سۆڤیەتی ملەی سپیتاکی گرتو بە دوای هێزەکانی داشناکدا بەرەو گوندی کوردنشینی یاجب پێشڕەوی کرد . دانیشتووانی کوردو ئەرمەن بەهانای سووپای سوورەوە چوونلە ناوچەکەدا .

سەرەڕای بەفرو سەرما ، کە ڕێگەیان بۆسووپای سووری سۆڤیەت لەبەفر پاك دەکردەوە ... هەروا نووسەر دەڵێ :– پاشان نووسەر کۆمەڵە ناوێك دەنووسێ . کە پێشڕەوی چاوساخی سووپای سووربوون – هەروا گەلێك بەڵگەو سەرچاوە لە سەر بەشداری کردنی کوردەکان لەجێبەجێکردنی پلانەکەی ئابووری کە لە ناوچەکەدا بە تایبەت لە کەلخۆزو سۆفخۆزەکانداو لەجەنگی دووەمی جیهانیدا هەیە لە وڵاتەکەدا .

١٩٢١/٤/٣ سەرکردەی هێزەکانی سووپای ڕژێمی تورك – نورەدین پاشا– چەند فەرمانێکیدا بە یەکەکانی سووپا بەم شێوەی خوارەوە. ئەویش بەگوێرەی ئەنجامەکانی ئۆپیراسیۆنە داپلۆسێنەرەکان ، فەرمان دەدرێ ، یا ئەوەتا هۆزی قۆچگیری کەم بکرێتەوە بۆ ئەوەی ڕێگەیان پێنەدرێ چیدیکە ڕاپەڕن... یا

ئـەوەتا دابەشبکرێن و لـە سـەر ئـەو زەویـەی ئێستا لێیـدادەژین بگوێزرێنـەوە بۆناوچەکانی دیکە لە هەرێمەکەدا .

١٩٢١/٤/٢٠ لـە سـەر داوای سـکرتێری کۆمەڵـەی گـشتی گـەلان کـۆنگرەی بەرشـلۆنەی پایتەختی پورتوگـال گرێدرا ، ئـەویش لـەپێناو دارشـتنی یاسـای دەریـاوانی نێـوو دەووڵـەتی بەشـێووەیەکی گوونجـاو ، بـە کـار لێنـەکردنی لـە بـاری ئـەو وولاتەی کە لەسەر دەریاکانن ، بە سنوورێکی درێژ بەپاراستنی بەرژەووەندی یەکسانی بۆ هەموو لایەنێك لە وولاتانە جیا جیاکان لە جیهاندا.

١٩٢١/٥/١٦ مۆرکردنی رێیکەووتننامە لە نێوان ڕژێمی تورکیا و ڕووسیا بە بەجێ هێشتنی چەند ناوچەیەکی باکوری کوردستان ، لەناوچەی هەرێمی قەوقاز بۆ تورکیا ، ئەویش بـەپێی رێکەووتنـەکانی ڕابردووی نێونایان و گۆڕینـەوەی یاداشت بۆ یەکتری لە سەر خاکی باکووری کوردستان لە ناوچەکەدا .

١٩٢١/٥/٢٦ وەزیـری بـەرگری شانـشینی ئێـراق –جەعفـەر عەسـکەری – بەپاڵپـشتی نووێنـەری بـەریتانیا لـە ئێـراق ، یاسـای بەئارەزومەندانـەی – الاحتیـاط– بـۆ هاتنـە ڕێـز سـووپای ئێراقـی ڕاگەیانـد ... ئەمـەش یاداشـتێك بـوو لـەپێناو گەمارۆدانی بزووتنەوەی کوردو داگیر کردنـی کوردسـتان و گۆڕینی نەخشەی دیمووگرافی لـە باشـووری کوردسـتان ، بـە تایبـەتی لەپارێزگای کـەرکوك ، کە سەرچاوەی چاوگە نەوتیەکانە لە باشووری کوردستانی لکێندراو بە ئێراقدا.

١٩٢١/٦/٤ دامەزراندنی حکوومەتی نووێی ئێران بەسـەرکردایەی ئەحمـەد فواتح لـە سـەر ڕەزامەندی بەریتانیا ، هەرچەند شای ئێران بەو حکوومەتـە رازی نـەبووە . کە ئەو دەیوویست ڕەزاخان بانی موشیر دەولە یاخوود مستوفی مـەمالیك ، ببێتـە سەرەك وەزیرانی ئێران ، بەڵام بەریتانیا ڕەزامەندی لەسەر ئە دووکەسە نـەکرد ، تەنیا ئەحمەد فەواتح نەبێت کە زۆر لە وەزیرەکانی حکوومەتی نـووێی کـاتی خۆی کە لایەنگیری ئەڵمانیای فاشی بوون لەجەنگی یەکەمی جیهانیدا.

حکوومەتی ئەحمەد فەواتح ئامانجەکانی لە ناوبردنی جووڵانـەوەی خوراسـان و گـیلان بـوو لەگـەڵ نزیـك بوونـەوەی لـە ئەمـەریکا ، لـەپێناو مـاوەدان بـە کۆمپانیـای ئەمـەریکی لـە تووێژینـەوەی چـاوگە نەوتیـەکان و هـەڵێنجانی بـە تایبەتی لە ڕۆژهەڵاتی کوردستانی ژێر دەسەڵاتی فارسدا.

١٩٢١/٦/١٣ جـەماوەری وویلایـەتی شـارەزوور- مووسـڵ ، یاداشـتنامەکیان ئاراسـتەی دادوەری گشتی بـەریتانیا لـە ئێـراق کـرد ، ئـەویش بـەدەر بڕینـی نـاڕەزایی بەلکاندنی ئەو وویلایەتە بە حکوومەتی دورستکراوی ئێراقی نوێ ، لـە سـەر خاکی باشووری کوردستان ، بە داواکردنی فیدرالی نوێ بە تایبەتی بۆ کورد لـە هـەرێمی کوردسـتان ، بـەپێی نەخـشەی مێـژووی و ڕامیـاری و جـووگرافی لەلایەن وولاتانی پەیووەندار لە ناوچەکەدا.

نەورۆزی ١٩٤٦

١٩٢١/٦/١٩ لـــە جیهـــانی پـــڕ لـــە گۆڕانکـاری و کوردسـتانی گـــەمارۆدراو لـــە لایـــەن هاوپـــەیمانان نووســـەری خامە ڕەنگینەکان – عاسم حیـسدەری – لـــە شـــاری هـــەولێر لـــە باشـــووری کوردســـــتان لـــــە بنەماڵەیـــەکی نـــاوداری کورد و شۆڕشگێردا چاوی بە جیهان هەڵهێناوە.

دوای ئـەوە لـە تەمـەنی /٧ سـاڵیدا چـووەتە قوتابخانـە و قۆناخـەکانی سـەرەتایی و ناوەنـدی لـە شـاری هەولێر تەواوکردووە، دوای ئەوە چووەتە شاری بەغدای پایتـەختی ئێراق و لـە- خانـەی زانـستی- لـە گـەرەکی- ئەغزەمیـە - وەرگـیراوە، بـەلاّم لـە بـەر نەخۆشـی خوویـندنی پـیّ تـەواو نـەکراوە. دوای ئـەوە گەڕاوەتـەوە شـاری هەولێر و لە ساڵی ١٩٤٤ بە فەرمانبەر دامەزراوە لە فەرمانگـەی - تـەمووین - لە شارەکەدا.

جێگـەی باسـکردنە کـە ئـەم کەسـایەتە بـە هـۆی ڕۆشـنبیری و شۆڕشـگێری بنەماڵکەی لـە یەکـەم ئاهـەنگی ئاشـکرای جـەژنی نـەورۆز لـە شـاری هـەولێر لـە ساڵی ١٩٤٦ دا و وتاری ڕێکخراوی - پارتی شۆڕش – ی خوویندۆتـەوە ئـەم

کەسایەتیە تێکۆشەرە لەگەڵ هەڵوەشاندنەوەی ئەو پارتە مارکسیە لە سڵی ١٩٤٦دا، چووەتە ریزی پارتی کۆمۆنیستی ئێراق وەك ئەندامێکی دڵسۆزو چالاك کاری ژێر زەمینی لەو پارتە تێکۆشەرەدا کردووە.

هەروا ئەم کەسایەتیە لە راپەرینەکەی مانگی ١٩٤٨/١ بەژداری کردووە لە هەموو لایەنەکان. بەلأم لەو کاتەی کە رژێمی شانشینی لە ئێراق لە ١٩٤٨/٥/١٥ حووکمی عورفی راگەیاند دەستەیەك لە خەباتگێرە مارکسیەکانی هەولێر، وەك عاسم حەیدەری و جەمال حەیدەری و عادل سەلیم و هاشم عبدوللاّ و شێخە شەل و چەندین تیکۆشەری دیکەی هەولێرو کۆیەو رەواندوز دەستگیر دەکرێن.

دوای ئەوە درانە دادگای عورفی سەربازی لەشاری بەغدا. لە ئەنجام عاسم حەیدەری بۆ ماوەی ٧ ساڵ زیندانی و ٣ ساڵ دوور خستنەوە لە شاری هەولێر، تا هەلگیرسانی شۆرشی ١٩٥٨/٧/١٤ بە ماوەیەکی کەم ئازاد کراو گەرایەوە شاری هەولێر.

دوای ئەوە ئەم کەسایەتیە تێکۆشەرە لە دوای شۆرش لە گەڵ شاندێکی پارێزگای هەولێر لە ٧/٢٧ دیدار لەگەڵ سەرۆك کۆماری نوویێ ئێراق عەبدولکەریم قاسم ئەنجامدەدات لە گەڵ مامۆستا ئیبراهیم ئحمەد بە پیێکەشکردنی داواکانی گەلی کوردستان.

دوای ئەوە مامۆستا عاسم دەچیتە رێزی پارتی دیموکراتی کوردستان و دەبێتە ئەندام لە لیژنەی ناوخۆیی لە هەولێر تا لە کۆنگرەی چوارەمی پارتی و بە هۆی هندێ کێشەی سەر هەڵداو لە پارتی دوور دەکەوێتەوە و وەك مرۆڤێکی هە ڵگری بیری مارکسی درێژە ی بە خەباتدا.

ئەم کەسایەتیە لە بیروو بۆ چوون و هەستە بوێرانەکی بەردەوام بوو تا مەرگ رێگەی لێگرت و لە ١٩٧١/٧/٢٠ لە تەمەنی ٥٠ ساڵیدا ماڵئاوایی لە بنەماڵەو گەڵ و نشتمانکرد لە شاری هەولێر لە هەرێمی باشووری کوردستان.

١٩٢١/٦/٢٣ بە پێی پیلانی دارێژراو فەیسەلی لە دایك بوی سعوودی کرا بەشانشینی دەووڵەتی ئێراق ، لە دوای ئاگادار کردنی لە لایەن بەرپرسی بەریتانیا – لۆرانس– ئەویش بە یاداشتنامەیەك بۆ دەسەلأتدارانی بنەمالەی ئالسعوود لە

شاری حیجاز لە دوورگەی عەرەبیدا .

١٩٢١/٦/٢٩ ئــەمیر فەیــسەلی دامــەزراو بەشانــشین لەســەر ئێراقــی نــوێی بــەرەو دروســتکراو ، گەیــشتە شــاری بەغــدا ، ئەویش لە ڕێگای شارەکانی حیللــەو نەجــەف و کوفــەوە بەرەو شاری بەغدا دەهات ، بــەهۆی پێشوازی لێکردنــی لەلایــەن ســەرەك عەشــیرەت و کەســــــایەتی عـــــــەرەب لەناوچەکەدا...کە بە درێژایی ژیــانی نەیــدەزانی وولاتــی نێوان دووزێ و ئێــــراق چیە لـــــــە ناوچەکەدا .

١٩٢١/٧/١١ ئەنجوومەنی دامەزراوی ئێراق لەلایەن دەسەلاتی بەریتانیا بڕیاری پشتگیری کردنی فەیسەلی کرد وەك شانشین لەسەر دەوڵەتی ئێراق بلاو کردەوە ، هەروا کورد سەربەستی تەواوی هەبێت لە بەشداریکردنی دەسەلاتی ئێراق یاخوود بە جیابوونەوە لێی بەڕاپرسی گشتی گەلی کورد لە باشووری کوردستان .

بەلام پارێزگای کەرکوك دژی شانشین وەستان و پارێزگاری هەولێرو سلێمانی بەشداریان نەکردو پایزگای موسلیش بەهەمان شێووە دژی ئەو ڕاپرسیە وەستان .

کێ بەر پرسیار بوو لەسەرکردایەتی کردنی ئەوکاتی کورد لە باشووری کوردستان ، یاخوود دەسەلاتدارانی ئێراقی دورستکراو لە لایەن بەریتانیا ... کورد ... ؟ ....!.؟.

١٩٢١/٧/١١ لە دوای دەرکردنی دانیـــــــشتووانە چـــــــینیەکان لەهــــــــەرێمی مــەنگۆلیا لەلایــەن دانیــــــشتووانە ڕەســـــــەنەکانی مــەنگۆلیا ، تــوانی سەربەخۆیی خۆی ڕابگەیـــەنێ لـــە هـەموو لایەنێکـەوە ، بەتایبـەتی لەلایـەنی رامیاری لەووڵاتەکـەدا. بـە نـاوی — کۆمـاری مـەنگۆلیا — کـە پایتەختەکـەی نـاوی —ئـۆلان یـانور — ە و ژمـارەی دانیـشتووانەکەی ،٨٦٠,٠٠٠ هـەزار کەسـە . هـەروا ژمـارەی دانیـشتووانی ووڵاتەکـەی ، ٢,٨٧٠,٠٠٠ ملیـۆن کەســە . هــەروا ڕووبــەری ووڵاتەکــەی ،١,٥٦٦,٠٠٠ کیلـۆ مـەتر چـوار گۆشـەیە . هـەروا چڕی دانیـشتووانەکەی ، ٥ پێنج کەس لە یەك میل چوار گۆشـەدا . هـەروا نژادەکانی ، مەنگۆلیـەکان ٩٠٪ .کازاك٤٪ چینی و ڕووسی ٤٪ . لە ووڵاتەکەدا .

١٩٢١/٧/٢١ مۆرکردنی ڕێکەووتننامەی بەردەوام لە نێوان ڕژێمی تورکیاو ڕژێمـی بەلـشەفی نـوێی ڕووسـیا ، ئـەویش بەگەڕاندنـەوەی پارێزگاکـانی قـارس و ئـەردەهان لەباکووری کوردستان بۆ ژێر دەسەلاتی تورکیا .

١٩٢١/٧/٢٣ بەپێی برگەو مادەکانی پەیمانی فرسـای ، ئەویش بەچاو خشاندنەوە لەسـەر یاسـای پەیووەندییـەکانی دەریـاوانی نێوودەووڵـەتی، بەگرێـدانی کـۆنگرەی پاریس لە فەرەنسا ، لەسەر دەریاکانی دانووب و راین و چەندین دەریـای دیکـە لە جیهاندا .

ئەویش لە پێناو بەرەو پێشبردنی باری دەریاوانی نێوودەووڵەتی ، بەتایبەتی لـەنێوان ووڵاتـانی هاوپـەیمانان و زلهێـزی سـەربازی و ، بەتایبـەتی ئـابووری لەجیهانـدا ، کـە ئەوکاتـە ئەمـەریکاو بـەریتانیا و فەرەنـسا و ڕووسـیاو چـەند ووڵاتی دیکە بوونە لە هەرێم و ناوچەو جیهاندا .

١٩٢١/٨/١٤ ڕزگار کردنی هەردوو شارۆچکەی خانەقین و مەندەلی لە باشووری کوردستان ، لەلایەن هێزەکانی کورد بە سەرکردایەتی ئیبراهیم خانی دەلۆ لەژێر دەستی هێزەکانی سووپای بەریتانیا لە ناوچەکەدا .

١٩٢١/٨/١٥ کەسایەتی دیاری کورد – فەتاح پاشا –ی ڕووناکبیرو ناوداری کورد بووە یەکەم پارێزگاری پارێزگای کەرکوك لە هەرێمە باشووری کوردستان ، کە پارێزگایەکی کوردستانیە بەخاك و دانیشتووان و ، بەقەزاکانی حەویجەو دووبزو خوورماتوو ، هەروا چەندین ناحیەی دیکەی لەخۆ گرتبوو لەپارێزگاکەدا .

١٩٢١/٨/١٦ هێزەکانی ئاسمانی سووپای بەریتانیا شاری سلێمانی لە باشووری کوردستان بۆردومان کرد ، کە بۆ یەکەم جار بۆمبی /٢٢٠ پاوەندی لێبەکار هینا لەمێژووی جەنگ دا ، ئەویش بەتاقی کردنەوەی ئەو چەکە لەسەر کوردو خاکی کوردستاندا .... ؟....!

١٩٢١/٨/١٩ یاوەری کوونسلی بەریتانیا لە شاری هەمەدان لە ڕۆژهەلاتی کوردستان تەلەگرافێکی ئاراستە کرواوی بۆ وەزیری مفەوەزی بەریتانیا لەتاران کرد ، کە تێیدا دەڵێت:– تەلەگرافێك لەشاری سنەوە لەلایەن– وارن– ەوە هاتووە دەڵێت:–

کە سمکۆی شکاك نامەیەکی بۆسەرۆك تیرەو هۆزە کوردەکان ناردووەو داوای لێکردوون کە هەموویان هەوڵی ڕووخانی ڕژێمی شا لە ئێران بدەن و تیرە هۆزەکانی کورد خۆیان بۆئەم مەبەستە ئامادەکردووە لە هەرێمەکەدا .

١٩٢١/٨/٢٣ فەیسەلی یەکەم پالێورا بۆ سەرکوورسی شانشینی لە سەر دەووڵەتی نوێی ئێراق ، ئەویش بەمەرجێك شانشینیەکەی دەستووری نیابی و دیموکراتی بێت بەپێی یاسا . بەلام لە دوای ئەوە دەستی کرد بەپاشگەزبوونەوە لەو ڕێنمایە.... عەرەب....؟....!.

١٩٢١/٨/٢٥ مەندووبی سامی بەریتانیا لە ئێراق – پێرسی کوکس– توانی سەرەك وەزیرانی بەریتانیا ڕازی بکات بەپشتگیری کردنی لە گرتنەبەری ڕامیاریەتی بە تایبەتی لە هەرێمی باشووری کوردستان ، کە چرچل دووپاتی کردەوە ، کە کێشەی بنەرەتی دابین کردنی کەسایەتی شانشین فیسەڵ بوو لە سەر دەووڵەتەکەدا ... بەلام کێشەکانی دووەم ئاساییە لە ناوچەکەدا .

بەڵام لە هەمان کات چرچل داوای کرد ، کە عەرەب لەسەر کورد رۆڵی زیاتر نەکات لە باشووری کوردستان . هەروا وەزیری مستەعمەرات ئاگاداری مەندووبی سامی کرد ، ئەویش بەجێبەجێکردنی نەخشەکەی بەدانی ئۆتۆنۆمی بۆ کورد لەماوەی دووساڵ تا ئەو کاتەی دەسەڵاتی شانشین فەیسەڵ توووند دەبێت .
جیاوازی نێوان کۆکس و چرچل هەمان جیاوازی نێوان کیرزن و ولسن بوو لەسەر کێشەو مافەکانی کورد لەنێوان ساڵەکانی ١٩١٨– ١٩٢٠ ، کە ئەمەش وا دەردەکەوێت ، کە رامیاریەتی روون نەبوو لەسەر کێشەی کورد لە کوردستان بە گشتی و بەتایبەتی لە باشووری کوردستاندا .

١٩٢١/٩/١ گرێدانی کۆنگرەی دوانزەهەمی سەهیۆنیزم لەشاری کارلسیاری تشیکۆسلۆفاکیا ، کە یەکەم کۆنگرەی گشتی رێك پێك بوو لە دوای پچڕانی کۆنگرەی یانزەهەم لە ١٩١٣ ، کە ٥٤٠ نووێنەر ئامادەی کۆنگرەکە بوون ، کە نووێنەرایەتی ٧٧٥ هەزار جوولەکەی دەکرد لە جیهاندا .
بالوێزی بەریتانیا لە براگ – سێرجیۆ چەکلارك – بەشداری بە وتارێك کۆنگرەکە کرد ، هەروا – وایزمان سلۆلۆف– ڕاپۆرتێکی تێرو تەسەلی ئاراستەی کۆنگرەکە کرد ، ئەویش لەپێناو داهاتووی جوولەکە لە دامەزراندنی دەوڵەتی سەربەخۆیان لەفەلەستیندا .

١٩٢١/٩/١ کردنەوەی یەکەم قوتابخانەی حکوومی لە شارۆچکەی عەنکاوەی سەر بەپارێزگای هەولێر ، ئەویش بەهەول و تەقەلای مەتران ئیستفان جیری سەرۆکی ئەساقیفەی پارێزگای کەرکوك لە هەرێمە باشووری کوردستان.

١٩٢١/١٠/٣ لە دوای دامرکاندنەوەی ڕاپەڕینی هۆزی قۆچگیری و ڕاگوواستنەوە یان ، کە ئەمەش بووە هۆی قرتێکردنی کوردەکان وەك ئەرمەنەکان کە سەدایەکی زۆری لەسەر ئەنجوومەنی گەورەی نیشتیمانی تورك لە ئەنکەرە دایەوە... شایانی باسە شۆرشگێڕە کوردەکانی عەلەوی ئەو بیرەیان بڵاو کردەوە ، کە کوردەکانی عەلەوی لە باکووری کوردستان وەك ئەرمەنەکان ڕادەگوێزنەوە... ئەمە بەشداری لە پەرەسەندنی ڕاپەڕینەکە کرد لە باکووری کوردستان.

١٩٢١/١٠/٦ لە هێرشێكی هێزەكانی سمكۆی شكاك بۆ سەر شاری مەهابادو ڕزگار كردنی لەرۆژهەڵاتی كوردستان ، كە شاری مەهاباد ئەوكات ٥٥٠ جەندرمەی ڕژێمی فارسی ئێرانی تێدابوو . لەوانە ٢٢٠ كەسیان كوژران ئەوانی دیكەش هەڵاتن بۆ جێگاكانیتكەدا .

١٩٢١/١٠/٧ لـــە كاتـــەكانی بـــــەردەوامی سمكۆی شكاك لە راپەرینـەكانی لــە رۆژهـــــەڵاتی كوردســـــتان رۆژنامەیــــەك بــەناوی- نــەهار كـورد لیـل عەجـەم - لــەرۆژ هــەڵاتی كوردستانی ژێر دووسەڵاتی فارس لە ئێران - بڵاوكردەوە ، كە ئەمەش رۆڵی گرنگی هەبوو لە پشتگیری راپەرین و كارلێكردنی لە رۆشنبیری نەتەوەیی و نیشتمان گەلی كوردستان .

١٩٢١/١٠/٩ جێگری پارێزگای دەرسیم لە باكووری كوردستان لە كۆبوونەوەی نهێنی كورد هەلساو گووتی :-
چۆن دەبێ كۆمەڵەی كۆمەڵایەتی كورد كە لایەنێكی بزووتنەوەی كوردەو داوای جیابوونەوە بكات- دوای ئەوە دەستی كرد بە سزادانی ئەو كەسانەی كە بیری جیابوونەوەیان بڵاو كردبووەوە لە باكووری كوردستان.

١٩٢١/١٠/١٠ لە دوای سەركەووتنی دامەزرێنەری كۆماری توركیا مستەفا كەمال ئەتا توورك لە شەڕی - سقاریا - لە سەر زێی سەقاریا، كە ماوەی ٢٢ رۆژی خـــایاند دژی یۆنانیەكان، فەرەنسا یەكەم وڵات بوو كە دەستی كرد بە گفتووگۆ كردن لە گەڵ مستەفا كەمال، و لە هەمان كات بە مۆركردنی رێكەووتننامەی - فرانكین بوویون - كە بووە هۆی ئەوەی هێزەكانی سووپای

فەرەنسا لە خاکی دوای هەرەس هێنانی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی، واتە تورکیای نوێ بکێشێتەوە لە گەڵ کۆمەڵێك لە وولاَتانی هاوپەیمان لە ناوچەو هەرێمەکەدا.

لەو کاتەشدا فەرەنسا دانی بەوە نا کە پەیمانی شەرعی نییە، و لە هەمان کات ۸۰۰۰۰ هەشتا هەزار سەربازی توورکی ئازاد کرد، کە لە ناوچەی مەرعەش لە باکووری کوردستان گەمارۆیدابوون، هەروا بریاریدا بە پرچەککردنی هێزەکانی مستەفا کەمال کە ٤٠٠٠٠ چل هەزار سەرباز بوون لە هێزەکانی مستەفا کەمال ئەتاتوورك.

ئەمەش بووە هۆی بەهێزکردنی جێپێگەی دەسەلاَتی مستەفا کەمال ئەتاتوورك لە شاری ئنکەرە و بە هێزکردنی سووپاکەی بە سەر بازی نوێ و چەکی نوێ. لە گەڵ ئەوەشدا دەسەلاَتی سۆڤیەتیش بەردەوام بوو لە یارمەتیدانی دەسەلاَتی مستەفا کەمال بە هۆی بوونی جمووجۆڵی ئەرمەن و کورد لە لایەك و راکێشانی ئەرمەن و کورد بۆ لای خۆیان لە هەرێمەکەدا.

هەروا دوای ئەوەش لە ۱۹۲۲/۱۰/۳ گفتووگۆی نێوان بەریتانیاو مستەفا کەمال دەستی پێکرد لە گووندی — مۆدانیا — لە سەر کەناری مەرمەرە، دوای یەك هەفتە لە گفتووگۆ کردن ، بەریتانیا بەلێنی دا بە کشاندنەوەی هێزەکانی و داواشی لە یۆنانیکان کرد بە کشاندنەوەی هێزەکانی سووپایان لە تورکیای نوێ بە مەرجێك تورکیا بەرژەوەندیەکانی بەریتانیا لە تەنگەبەری — بووسفۆرو دەردەنیل بپارێزێت.

سەرچاوە:— موقف التيار الاسلامي والتيار العلماني في تركيا من القضية الكردية. دانانی دکتۆر وەلید رەزوان — چاپی یەکەم / ۲۰۰۸ .

۱۹۲۱/۱۰/۱۹سکرتێری مەندووبی سامی بەریتانیا لە شاری بەغدای پایتەختی ئێراقی بەرەو دورستکراو لەسەرخاکی باشوری کوردستان ، نامەیەکی ئاراستەی فەرماندەی پارێزگای سلێمانی کرد ، کە تیایدا هاتبوو:— سیاسەتی ئێمەی ئەمڕۆ بەرامبەر بەسمکۆی شکاك و ڕۆژهەلاتی کوردستان ، بریتیە لەوەی کە هیچ دەست تێوەردانێك لە باری ئێستای ناوچەکە نەکرێت— لە هەرێمەکەدا .

۱۹۲۱/۱۰/۲۰ لەوکاتەی کە فەرەنسا ئارەزومەند بوو بە یارمەتی دانی تورکە کەمالیەکان ، هەلسا بە مۆرکردنی رێکەووتننامە لەگەڵ تورکیا بەناوی رێکەووتننامەی —

فرنکلین یۆلیۆن- که مافی تورکیای لەسەر هەرێمی سیسلیا مسۆگەر دەکردو ڕێرەوی بۆ ئاسیای بچووك ئارامدەکرد لەگەڵ داگیر کردنی سووریا و بەشێك لە خاکی ڕۆژئاوای کوردستان لەلایەن فەرەنسا ، کە لەسەرخاکی ڕۆژئاوای کوردستان بوو لە کێشووەرەکەدا .

لەهەمان کات حکوومەتی بەریتانیا نارەزایی بەرامبەر بەو ڕێکەوتنە دەربری ، کە فەرەنسا لەگەڵ تورکیا ئەنجامی داوەو دەبێتە هۆی بەهێز بوونی هەڵوویستی تورکیاو فەرەنساو ، کە پرسی بە بەریتانیا لەم بارەوە ئاگادار نەکردووە .

کەچی فەرەنسا ئەندام بووە لە کۆمەڵەی وولاتانی کە دژی تورکیا بوون لە جەنگی یەکەمی جیهاندا.

١٩٢١/١٠/٢٠ دیاریکردنی سنووری نێوان سووریاو تورکیا لە سەر ڕۆژهەلاتی خاکی کوردستان ... شایانی باسە کە سنووری نێوان تورکیاو سووریا تاکوو کۆتایی سەر دەریای سپی ناوەڕاستی ئەسکەندەرۆنە ، کە خاکی ڕۆژ ئاوای کوردستانە بەسنووری تەواوی ئەسکەندەرۆنەوەو کە دابەشکراوە نەك بە پێچەوانە لە ناوچەکەدا .هەروا نەك وەك ئەوەی کە عەرەب و تورك ئاماژەی بۆ دەکەن لە ڕابردوو لە داهاتوودا.

تقسيم سورية والعراق وكردستان

۱۹۲۱/۱۰/۲۰ مۆرکردنی ڕێکەوتننامەی – فرنکلین یۆلیۆن– لە نێوان فەرەنساو تورکیا ، کە کاردانەوەیەکی زۆر خراپی نواند لەسەر کێشەی داهاتووی کورد لەمافی چارەنووسیدا لەباکوورولە باشووری کوردستاندا .

۱۹۲۱/۱۰/۲۱ لە سەرچاوەیەکی بەریتانیادا لە تەلگرافێك لە ئەنکەرە هاتووە ، کە لەو تەلگرافەدا هاتبوو – سراتیژی حکوومەتی تورکیا دیاری دەکات – کە لەکاتی ئێستادا نابێ لەشکرکێشی بکرێتە سەرهۆزە یاخیبووەکان... واتە بزووتنەوەی رزگاریخوازی کورد... بەڵکوو دەبێ هەموو هەوڵ و کۆششێك بخرێتە گەڕ بۆ ڕاکێشانی سەرەك هۆزەکان... لەچاوەڕوانی هەلێکی لەباردابن... لە بەر ئەوەی لەشکرکێشی واپێوویست دەکات کە هێزێکی تەواو بنێردرێ بۆ ڕووبەڕوو بوونەوەی ٤٠,٠٠٠ هەزارسوار لەناوچەیەکی

یەکجار سەختدا ، کە ئەویش باکووری کوردستانە لە کێشووەرەکەدا .

**لە ڕۆبەرت ئۆلسن هەمان سەرچاوە لە ل٣٨,٣٩ .**

السر برسي كوكس

١٩٢١/١٠/٢٥ نووێنــەری بــاڵای بــەریتانیا لــە ئێــراق – سـێر پرسـی کـۆکس- بروسـکەیەکی نهێنـی لـەژێر ژمـارە ٦١٦/ ئاراســـتەی وەزارەتـــی کاروبـــاری موســـتەعمەراتی بەریتانیا لەلەندەن کرد ، لـەبارەی باری ئێراق و ناوچەکە ، بەتایبەتی بەنــد بــوو بەکێــشەی کــورد لــە باشــووری کوردســتان ، کــە ئــەم بروســـکەیە لـــەڕۆژی ١٠/٢٦ گەیـــشتە وەزارەت و باســـی گفتووگـۆی خـۆیی و یـونگ دەکـات بە ئامـادەبوونی کۆرنـوالیس کـە دبلۆماتکاری بـەریتانیا بـوو ، لەگـەڵ فەیـسەڵی ســعوودی و چــەندین لایــەنی دیکــەی گفتووگـۆکــە ، ئــەویش لــە ســەر دورســتکردنی دەووڵــەتی عــەرەبی بــوو لەســەر خــاکی هــەرێمی باشــووری کوردستان .

١٩٢١/١١/١٩ لــە دایــک بــوونی هونەرمەنــدو گـۆرانی بێـژی ڕەسـەنی نـاوداری کورد لە کوردستان حەسەن زیرەك لــە شــاری بۆکــانی ڕۆژهــەڵاتی کوردسـتانی داگیر ســکراوی ژێـر دەســەڵاتی فارسـی لـە ئێران . لـە بنە ماڵەیەکی هـەژاری کاسبکاری کورد پەروەر لە هەرێمەکەدا .

ئــەم هونەرمەنــدە دەنــگ خـۆش و بــەهرەدارە تــا کــوردو کوردســتان وگـــەلی کـــورد مـــابێ دەنگـــە

زولالەیەكەی لـــــە گوێی هەموو منداڵ و گەنج و پیرو كچ و كورو ئافەت دەنگەداتەوە لە شاخ و دۆڵ و دەشت و ئاسمانی كوردستان .

١٩٢١/١٢/٢٢ بەر لـە داگیركردنـی وولاتـی نێـوان دووزێ – میزۆبۆتامیـا – كـە لـە ژێـر دەسـەلاّتی ئیمپراتۆریـەتی عوسمـانی دابـوو ، دوای ئـەویش كەوتـە ژێـر دەسەلاّتی بەریتانیای مەزن ، بە كردنی زمانی توركی بە یەكەم زمانی فەرمی وولاّتەكـە ، ئـەویش بـۆ یەكـەمجار بـوو لـە مێـژووی بـوونی تـورك لـە مـاوەی دەسـەلاّتەكانی عوسمـانی و توركیـادا . دووەم زەمـان بـە فـەرمی زمـانی ئینگلیزی بوولە وولاّتەكەدا .

هـەروا لەهـەموو كـارە هەمەلایەنـەكانی بـەڕێووەبردنی دامو دەزگـا حكوومیـەكان... هـەر بـەم بۆنـە دوو نووسـراو لـە دیـوانی شاهانـشینی بـە ژمـارە/٢٣٢/٢٢٨ لـە ٢٢ – ١٩٢١/١٢/٢٧ پێـشنیار دەكـات بـەكردنی زمـانی عـەرەبی بـەزمانی رەسمـی لـەئێراقی نـوێ ، لەسـەرەتای سـاڵی نـوێی دارایـی، واتە لە مـانگی/ ١٩٢٢/٤ . ئەویش بەسەرپەرشتی نووێنـەری سـامی بـەریتانیا لەئێراق و بە رازامەندی حكوومەتی بەریتانیای مەزن لەو كاتدا.

## ١٩٢٢

١٩٢٢/١/١٣ لە دوای ئازاد كردنی شێخ مـەحمودی حەفیدو هـەڤاڵانی لـە دەستبەسـەری لـە هندسـتان ، بـە پـاپۆڕی – بـەنگورە بۆمبـێ– شـێخ و حەمـە غـەریبی زاوای هــەڵگرت لــە هندســتان بــەرەو وولاتــی كوویــت بەرێكــەووتن لــە پێنــاو گەیـشتنەوەیان بـۆ باشـووری كوردسـتان ، لـە دوای دەسـتگیر كـردن و دوور خـستنەوەی لەلایـەن دەسـەلاّتدارانی بـەریتانیا لـە باشـووری كوردسـتان بـۆ وولاّتی هندستان.

١٩٢٢/١/٢٣ هێزەكـانی سـووپای ڕژێمـی شـای فارسـی لـە ئێـران هێرشـیان كـردە سـەر چـەكدارانی سمكـۆی شـكاك ، لەناوچـەكانی دەووروبـەری شـاری مـەهاباد لەرۆژئاوای كوردستان.

١٩٢٢/١/٢٤ ڕاگەیانـدنێكی هاوبـەش لـە نێـوان ڕژێمـی شانـشینی ئێـراق و بـەریتانیا بلاّوكرایـەوە ، بـەدانانان بە مـافی كـورد لـەو ناوچـانەی كـە زۆربـەیان كـوردن ، ئەویش بەپێك هێنانی حكوومـەتی كـوردی لـە چوارچێوەی سـنووری ئێراقـی دروسـتكراو لەسـەرخاكی باشـووری كوردسـتان . لـەو كاتـە كـە لـە ٩٠٪

دانیشتووانی پاێزگای کەرکوك کورد بوونو لە ٨٥٪دانیشتووانی پارێزگای مووسڵ کورد بوون لە ناوچەکەدا .

١٩٢٢/٢/٦ مۆرکردنی پەیمانی واشنتۆن لە ئەمەریکا لە لایەن وولاتانی هاوپەیمان بە قەدەخەکردن لە بەکارهێنانی مادەی گازی ژەهراوی لەجەنگەکاندا.

١٩٢٢/٢/١٠ لە بارو دۆخی ئەوکاتی تورکیا ئەنجوومەنی نیشتیمانی گەووەرەی تورکیا ، گفتووگۆی لە سەر پرۆژەی خوود موختاری کوردستان کرد لە باکووری کوردستان ... دەقی ئەو یاسایە لە گۆڤاری پارێزەران لە ژمارە /١٠بلاو کراوەتەوە- وەزارەتی دەرەوە/ ٧٧٨١/ ٣٧١ رۆژهەلاتی تورکیا /٦٥/٦٩- ٣٥٥٣ ئەی ژمارە /٠٣٠٨٥ سیر ئیبج وەرگرتن /١٣نیسان.

١٩٢٢/٢/٢٣ شێخ ئەحمەد جابر ئەلسەباح بە ئەمیری کووێت دانرا ، کە دەسەلاتەکانی ئەمیرو شانشینەکانی وولاتانی عەرەبی هەر هەموویان سەرەك عەشیرەتو هۆزی عەرەبن ، بە رژێمی بنەماڵە دەسەلات دەگۆڕدرێتەوە بۆ ئەوی دیکە . ئەمیری کووێت رۆڵی گرنگی هەبووە لە پەرەپێدانی وولاتەکەیو خزمەت کردنی نەتەوەکەیو گەلانی دیکە ، کە رویان لە کووێت کردووە بۆ کارکردنی هەمەلایەنەی بازرگانیو کاری دیکە ، لەپێناو دابینکردنی بژێووی ژیان لە وانەش کورد لە وولاتەکەدا .

١٩٢٢/٢/٢٧ بەرپابوونی شۆڕشی میسر لەلایەن پێك هاتەی گەلانی میسر لە ئیسلامو مەسیحی ، کە بووە هۆی راگەیاندنی سەربەخۆیی وولاتەکەیان بەدەرچوونی لەژێر دەسەلاتی پارێزگاری بەریتانیا بەشێوەیەکی فەرمی لە کێشوورەکەدا .

بە ناوی – شانشینی میسر – کە پایتەختەکەی ناوی – قاهیر– ەیە وژمارەی دانیشتووانەکەی، ٨,٣٠٠,٠٠٠ ملیۆن کەسە . هەروا ژمارەی دانیشتووانی وولاتەکەی ،٦٨,٦٠٠,٠٠٠ ملیۆن کەسە . هەروا ڕووبەری خاکی وولاتەکەی ، ١,٠٠١,٤٥٠ ملیۆن کیلۆ مەتر چوار گۆشەیە . هەروا چڕی دانیشتوانەکەی ، ١٧٨ کەس لە یەك میل چوار گۆشەدا . هەروا نژادەکانی ، رەچەلەکی حامیەی رۆژهەلات ٩٩٪ . لە وولاتەکەدا .

تێبینی :- بۆ زانیاری زیاتر دەتوانی بگەرێیتەوە سەر کتابی ئینسکلۆیدیای کوردستان و جیهان .

١٩٢٢/٣/١٥ لە دوای بەدەست هێنانی سەربەخۆیی وولاتی میسر ڕژێمی شانشینی ڕاگەیەندرا ، بەبوونی شانشین فوئاد بەشانشینی میسرو دەسەلاتی گرتەدەست بەدامەزراندنی حکوومەت ، کە سەعد زەغلول بەسەرەك وەزیرانی حکوومەتی میسری هەلبژێردرا ، هەروا لیژنەی دەستووری داناو لە مانگی/ ١٩٢٣/٤ دەستووری میسریشی ڕاگەیاند لە وولاتەکەدا .
ئەویش بۆ یەکەم جاربوو لە مێژووی میسر... شایانی باسە کە دەسەلاتە یەك لە دوای یەکەکانی میسر لە لایەن بنەمالەی محەمەد عەلی پاشا بوونە تاکوو شۆڕشی/ ١٩٥٢ ، کە ناوداربوون بەبنەکالەی خدێووی لە میسرو جیهان کە لە نژادا کورد بوونەو خەلکی پارێزگای دیاربەکری باکووری کوردستان بوونە لە هەرێمەکەدا .

١٩٢٢/٣/٢٣ کەسایەتی ناوداری کورد بە یاوەری ٤٠ کەسایەتی کورد لەشاری سلێمانی لە باشووری کوردستان – شێخ عەلی سلێمان – بەرەو شاری بەغدا بەرێکەووتن ، ئەویش بۆ چاوپێکەووتنان بە نووێنەری بەریتانیا کۆکس لە ئێراق ، لە پێناو دۆزینەوەی رێگا ی گونجاو بە چارەسەر کردنی کێشەی کورد لە ئێراقی نوێی دامەزراو لەسەر خاکی باشووری کوردستان لەلایەن بەریتانیادا .

١٩٢٢/٣/٢٦ کۆنگرەی پاریسی پایتەختی فەرەنسا لە نێوان هاوپەیمانان جیاوازی نەبوو لەگەل کۆنگرەی لەندەنی پایتەختی بەریتانیا ، لەبارەی بیروو بۆچوون لەسەر نەخشەی باری کێشەی کوردو چارەکردنی مافی کورد لە کوردستان ، چونکە لە دوای وەشاندنی تیری ژەهراوی لەگەلو نیشتمانو لەت لەت کردنی ئاسان نیە وەك دەلێن – تاسە بشکێ نەك بزرینگێ– بەلام تاسەکە شکێنداو لە هەمان کاتدا زرینگایەوەش ..؟.سەرکردایەتی ئەو کاتی کورد بەر پرسیارە لە

هەموو بوارە جیا جیاکان لە داهاتووی کوردستان .

١٩٢٢/٤/١ بوونی شاری دهۆك بە قەزای قائمقامیەتی دهۆك ڕاگەیەندراو یەکەم قائمقامی قەزای دهۆك فەتاح بەگ بوو لە هەرێمەکەدا ، چونکە ئەوشارە کوردنشینە لە باشووری کوردستان لەکاتی دەسەڵاتی ئینگلیزەکان – معاونیە- بوو، لەهەمان کات یەکەم دادوەری ڕامیاری بەریتانیا – مسترلاین- بوو لە ناوچەکەدا .

١٩٢٢/٥/١ بەپێی بنەماکانی ڕێکەوتنی ئیماراتی لاکسمبۆرگ و بەلژیکا دەست کرا بەکار کردن لەیەکیەتی گومرگی لەگەڵ بەلژیکاو وولاتانی دیکەی هاوبەش لەهەرێمە جیاجیاکان لە جیهان .

١٩٢٢/٥/٣١ سەرکردەی کورد سمکۆی شکاك نامەیەکی ئاراستەی – زەفەر دەولە- کرد لە پارێزگای تەورێز ، کە تیایدا داوای مافەکانی کوردی ڕۆژهەڵاتی کوردستانی ژێر دەسەڵاتی ڕژێمی فارس لە ئێران کرد ، بە هۆی چەوساندنەوەی گەلی کوردستان بە تایبەتی لە هەردوو بواری نەتەوەیی ونیشتیمانیدا .

١٩٢٢/٦/٢١ لە دوای نووێژی هەینی لە شاری سلێمانی لە باشووری کوردستان مستەفا پاشا لە پێناو وشیار کردنەوەی هەستو هۆشی نەتەوەیی وتارێکی خووێندەوە ، لە هەمان کات کۆمەڵەیەکی دامەزراند بە هەڵبژاردنی نهێنی بە ناوی- کۆمەڵەی کوردستان -.

١٩٢٢/٦/٢٢ وەزیرەکانی دەرەوەی بەریتانیاو فەرەنساو ئیتالیا لەپاریسی پایتەختی فەرەنسا ، کۆبوونەوەیەکیان ئەنجام دا سەبارەت بەکێشەو مافەکانی کوردو ڕژێمی تورکیا ، کە کاردانەوەی باشی کردە سەر بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی کورد بەتایبەتی لە باکوورو باشووری کوردستان.

١٩٢٢/٦/٢٦ عەلی شەفیق ناسراو بە- ئۆزدەمیر- بەخۆیی و کۆمەلێك سەرباز گەیشتنە شارۆچکەی ڕەواندوزی سەر بە پارێزگای هەولێر لە باشووری کوردستان ، ئەویش بەمەبەستی ئاژاوەنانەوە بە ئامۆژگاری ڕژێمی تورکیا . کە لە ڕەچەلەکدا ئەم مرۆڤە عەرەبو خەلکی وولاتی میسر بووە لە ناو دەسەڵاتی تورکدا .

١٩٢٢/٦/٢٦ هێزە چەکدارە کوردەکان بەسەرکردایەتی سمکۆی شکاك هێرشیان کردە سەر

گوندی – رەهزال– لە رۆژهەلاتی کوردستان دژی هێزەکانی ئێران و شەرێکی گەوورە دەستی پێکرد ، لە ئەنجام کوردەکان پاشەکشەیان کرد لەناوچەکەدا .

١٩٢٢/٧/٢ بۆیەکەم جار لە مێژووی دامەزراندنی دەوڵەتی ئێراق یاسای کۆمەلەکان بلاوکراوە ، کە بووە هۆی پێك هێنانی چەندین پارت و رێکخراوی نەتەوەیی و نیشتمانی و چینایەتی ، بەتایبەتی لەلایەن دانیشتووانە کوردەکانی شاری بەغدای پایتەختی ئێراق.

١٩٢٢/٧/١١ سەرەك وەزیرانی بەریتانیا – چەرچل– لە کۆبوونەوەی ئەنجوومەنی گشتی بەریتانیا وەستاو لە ووتەکەیدا دووپاتی کردەوەو بەڵێنی بەکورد دا .
ئەویش کە بەخواستی خۆیان داواکاریەکانیان جێ بەجێ بکرێت لە باشووری کوردستان.

١٩٢٢/٧/٢١ بۆ یەکەم جار لە دوای دامەزراندنی کۆمەڵەی کوردستان ، لە باشووری کوردستان کە دامەزراندنی راگەیەندرا ، کە ئامانجی ئەو کۆمەڵەیە لایەنگریی کردنی دەسەلاتی شێخ مەحمودی حەفید بوو لە شاری سلێمانی لە مزگەووتی سید حسن مفتی ئەنجامدرابوو بەسەرۆکایەتی مستەفا پاشاو لە هەمان کاتدا

مـۆری هەڵکەنـدراوی بـۆ دورسـت کرابـوو بـە وێنەیـەکی ڕۆژ لـە ناوەڕاسـتی مۆرەکەدا.

١٩٢٢/٧/٤ لـە کۆبوونـەوەی کۆمەڵـەی گـەلان بریـار درا ، کـە فەلەسـتین بکەوێتـە ژێـر ئینتیدابی بەریتانیا لە دوای دابەشکردنی وولاتی شامو وولاتی نێوان دووزێ لە نێوان فەرەنساو بەریتانیاو ڕووسیادا.

١٩٢٢/٧/١٨ لـە دایـك بـوونی فەیلەسـوفی زانـستی ئەمـەریکا – تۆمـاس سـامۆئیل کـۆن – لەخێزانێکی ڕەسەن جوولەکەی شاری سنسناتی لە وویلایـەتی ئۆهـایۆ چاوی بـەجیهان هـەڵهێناوە. ئـەم فەیلەسـوفە هـەر لەمنداڵیـەوە توانـای فێربـوون و گەشـەکردنی پێـووە دیـاربووە، لـە سـاڵی ١٩٤٣ بەشـی مێـژووی لـەزانکری هارڤارد تەواودەکات.
دوای ئەوە لە ساڵی ١٩٤٦ بروانامەی ماجستەر لەمێژوو بەدەست دێنێ و لـە هەمان زانکۆ بە پلەی مامۆستا وانەی مێژوو دەڵێتەوە تا سـاڵی ١٩٤٩... دوای ئەوە بروانامەی دکتۆرای پێ دەبەخشرێت لەهەمان زانکۆدا... لە سـاڵی ١٩٥٦ دەچێتە زانکۆی کالیفۆرنیاو لەبەشەکانی فەلسەفەو مێژوو وانە دەڵێتەوە... لە ساڵی ١٩٥٧ پەرتووکە بەناوبانگەکەی شۆرشی کۆپـەر نیکۆس بڵاودەکاتـەوە.
لە ساڵی ١٩٦١ نازناوی مامۆستای مێژووی زانستی پێدەبەخشرێ.
لەساڵی ١٩٦٢ پەرتوکی – پێکهاتـەی شۆرشـە زانستیەکان – بڵاودەکاتـەوە...
ئـەم فەیلەسوفە لـەکارە زانستیەکانی بـەردەوام دەبێـت تـاکوو لـە ١٩٩٦/٦/١٧ بەهۆی نەخۆشی شێرپەنجە کۆچی دوایـی دەکات... دوا پـەرتووکیش بـەناوی – وتارە فەلسەفیەکان – لە ساڵی ٢٠٠٠ بڵاودەکرێتەوە.

١٩٢٢/٧/٢٥ هەڵگیرسـانی شـەڕی لـە شـکربازی لـە ڕۆژهـەلاتی کوردسـتانی ژێـر دەسـەلاتی فـارس لـە ئێران ، لـە نێـوان هێزەکـانی کـوردو سـووپای شـایەتی فارسـی . لـە ئەنجام هێزی کورد توانی سەرکەووتن بەدەست بێنێ لە ناوچەکەدا .

١٩٢٢/٧/٢٧ بەچـاپگەیاندنی دوا ژمـارەی پێـشکەووتن لـە شـاری سـلێمانی لـە باشـووری کوردستان.

١٩٢٢/٧/٢٧ سەرەك وەزیرانی بەریتانیا– ونستون چرچل– نامەیەکی ئاراستەی دەسـەلاتی شانشینی نوێی ئێراقی دورستکراو کردو تیایدا هـاتبوو:– نابێ کـورد ناچـار

بکرێت لەهەلبژاردن بەلکوو دەبێت مافی ئۆتۆنۆمی پێ بدرێت - لەچوار چێووەی سنووری ئێراق بە چاودێری بەریتانیای مەزن لە باشووری کوردستان.

١٩٢٢/٨/٢ بلاو کردنەوەی یەکەم ژمارەی هەفتەنامەی - بانگی حەق- لەباشووری کوردستان لەشاری سلێمانی لەلایەن مستەفا پاشای یاملکی لە شارەکەدا .

١٩٢٢/٨/١٤ گەڕانەوەی شێخ مەحمودی حەفید بۆ شاری سلێمانی و بەستنی کۆنگرەی گشتی بە هەلبژاردنی شێخ بە مەلیکی کوردستان لە هەرێمی باشووری کوردستان .

١٩٢٢/٨/١٨ لەدایك بوونی - ئالان رۆب گریت - نووسەرە فلیمسازو ڕۆمان نووسی ناوداری فەرەنسا ، لە شاری بریست فنستیزی وولاتی فەرەنسا لەخانەوادەیەکی ئەندازیارو زاناو زانست پەروەر لە دایك بووە.

١٩٢٢/٨/٢٦ بە هۆی کێشە لە نێوان تورکیا و یۆنان هێزەکانی سووپای دەسەلاتی تورکیا پەلاماری هێزەکانی سووپای یۆنانیاندا لەناوچەی - سکاریا- ی باکووری کوردستانیژێر دەسەلاتی تورکیا.

١٩٢٢/٩/٥ بە هۆی جمووجۆلی و خۆڕاگری جەماوەری شاری سلێمانی و شارۆچکەی کۆیە لە باشووری کوردستان ، ئەویش بە بەرگری کردن لەگەل و نیشتمان ، کە بووە هۆی ناچارکردنی هێزەکانی سووپای هێرش بەری بەریتانیا بە کشانەوەیان لەپارێزگای سلێمانی وشارۆچکەی کۆیە لە باشووری کوردستان و لە ئەنجامدا کابتن - بوند- کوژرا لە شەڕەکەدا .

١٩٢٢/٩/٩ هێزەکانی سووپای تورك و جەندرمەکانی هەلسان بەوێران کردنی گەڕەکی ئەرمەنەکان لە شاری ئەزمیری ڕۆژئاوای ئەنازۆل لە باکووری کوردستان ، بە هۆی داگیرکردنی یۆنانیەکان بەهاوکاری ئەرمەنەکان ، کە هەموو دانیشتووانی گەڕەکەکەیان لەناوبرد بەکووشتنی بەکۆمەل و زیندەبەچالکردنیان و دەر بەدەر کردنیان ، بۆ وولاتانی دیکەی وەك :- ڕووسیا سووریا و لوبنان .

١٩٢٢/٩/٩ لە ئەنجامی پەلاماردانی هێزەکانی سووپای یۆنان لەلایەن هێزەکانی سووپای تورك و ئاکامی بووە هۆی داگیر کردنی پارێزگای ئەزمیر... کە کەووتنە پەلاماردانی کوردو ئەرمەن و داگیر کردنی ناوچەکانی باکووری کوردستان ، بە بەتورککردن و گۆڕنی دیموگرافیای جووگرافیای هەرێمی باکووری

کوردستان.

١٩٢٢/٩/١٠ مۆرکردنی ریکەووتننامەی هاوکاری لە نێوان بەریتانیاو ڕژێمی شانشینی دورستکراوی ئێراق ، لە پێناو بەهێز کردنی جێپێگەی خواستەکانی بەریتانیاو گەمارۆدانی بزووتنەوەی ڕزگاری کورد لە کوردستان بەتایبەتی لە باشووری کوردستان.

١٩٢٢/٩/١٢ شێخ مەحمودی حەفید بەفەرمی کرا بە مەلیکی کوردستان لە باشووری کوردستان بەپێی ڕێکەووتنەکانی نێوان ڕژێمی ئێراق و بەریتانیاو کۆمەڵەی گەلان .

١٩٢٢/٩/١٤ گرێدانی یەکەم کۆنگرەی گشتی نەتەوەیی کورد لە باشووری کوردستان ، لە شاری سلێمانی کە شێخ مەحمود وەك مەلیکی کوردستان بەشداری تێدا کرد لە شارەکەدا .

١٩٢٢/٩/١٨ دامەزرێنەری دەووڵەتی تورك مستەفا کەماڵ ئەتاتورك – باوکی تورکمان – سەرکەووتنی هێزەکانی سووپای تورکی بەسەر هێزەکانی سووپای یۆنان لە باکووری کوردستان و ناوچەی ئەنادۆڵ ڕاگەیاند، کە لەو کاتەی کورد هاوکاری تەواوی سووپای داگیرکەری تورکی دەکرد، بەڵام پارمەتی کورد لە لایەن تورکە کەمالیەکان بە تورککردن و ڕاگواستن و داگیر کردن دەداوە لە باکووری کوردستان .

١٩٢٢/٩/٢٠ هێزەکانی سووپای تورك پارێزگاو ناوچەکانی ئەنادۆڵی داگیر کردو بەویستی خۆی مامەڵەی لەگەڵ کورد دەست پێکرد ، لە بەتورککردنی باکووری کوردستان و گوواستنەوەی خێزانە کوردەکان و هێنانی خێزانی تورکی هاوردە بۆ باکووری کوردستان.

١٩٢٢/٩/٣٠ دروست بوونی بارو دۆخێکی دڵخۆش ، کە بە گەیشتنەوەی سەرکردەو ڕابەری کورد لە هەرێمی باشووری کوردستان شێخ مەحمودی حەفید بۆ شاری سلێمانی لە باشووری کوردستان ، لە کاتێکدا کە بەریتانیەکان سزای دوورخراوەیی هندستانیان لە سەر هەڵووەشاندەوە.

١٩٢٢/١٠/١٠ یەکەم ڕێککەووتن لە نێوان ڕژێمی شانشینی ئێراق و بەریتانیا مۆر کرا بە پاراستنی ڕژێمی شانشینی لە هەموو بوارە جیاجیاکانی دەووڵەت و دەسەڵات لە سەر ئێراقدا .

شاری سلێمانی لە سەردەمی بزووتنەوەی شێخ مەحمود

١٩٢٢/١٠/١٠ دامەزراندنی یەکەم ئەنجوومەنی شارەوانی لە مێژووی کورد لە پارێزگای سلێمانی لە باشووری کوردستان ، لەلایەن شێخ مەحمودی حەفید لە مێژووی کورد ، لە دوای پێك هێنانی یەکەم کابینەی حکوومەتی کوردستان .

که ئەو حکوومەتە لە ٨ ئەندام پێك هاتبوو ، کە وەزیرەکان ئەمانە بوون . ١- ژەنەراڵ مستەفا پاشای یامولکی وەزیری مەعاریف . ٢- سەرهەنگ سالح زەکی وەزیری بەرگری . ٣- عەبدولکەریم عەلەکە وەزیری دارایی. ٤- شێخ محەمەد غەریب وەزیری ناوخۆ. ٥- ئەحمەد بەگ فەتاح وەزیری ئابوری . ٦-حەمەی ئاورەحمان ئاغا وەزیری نافیعە . ٧- حاجی مەلا سەعید وەزیری دادپەروەری . ٨- ژەنەرال سەدیق قادری پشکێنەری گشتی هێزەکانی کوردستان و ، سەید ئەحمەد بەرزنجی بەڕێووەبەری گشتی ئاسایش و پۆلیسی کوردستان.

لەهەمان کاتدا ئالآی کوردستان بەرز کرایەوەو بڕیار درا سلێمانی ببێتە پایتەختی کوردستان . کە لە هەمان ڕۆژ حکوومەتی کوردی لەپارێزگای سلێمانی ڕاگەیەندرا لە لایەن شێخ مەحمود لە هەرێمەکەدا .

١٩٢٢/١٠/١١ مۆرکردنی ڕێکەووتننامەی – مۆداتیا– لە نێوان ڕژێمی تورکیا و حکوومەتی یۆنان ، کە هێزەکانی سووپای یۆنان بە تەواوی خاکی تورکیا بەجێ بهێڵن ، بەڵام لەڕاستیدا ئەو خاکەی هێزەکانی سووپای یونانی لێ بوو خاکی باکووری کوردستان بوولە ژێر دەسەلآتی کەمالیەکان لە هەرێمەکەدا .

١٩٢٢/١٠/٢٣ هەڵبژاردنی پەرلەمانی ڕژێمی شانشینی ئێراق ، کە بەرەی کورد لە باشووری کوردستان بە سەرۆکایەتی شێخ مەحمودی حەفید دژی ئەو پەرلەمانە

وەستان.

١٩٢٢/١٠/٢٥ مۆرکردنی رێکەووتننامەی هاوکاریو دۆستایەتی لە نێوان ڕژێمی تورکیاو فارسی لە ئێران ، دژی کوردو تیرۆر کردنی سمکۆی شکاك لە ڕۆژهەڵاتو باکووری کوردستانی ژێر دەسەڵاتەکانی هەردوو ڕژێمی شۆڤینی ئێرانو تورکیا لە کێشووەرەکەدا .

١٩٢٢/١٠/٢٥ دەست پێکردنی گفتووگۆ لە نێوان ڕژێمی ئێرانو ڕژێمی تورکیا لەسەر راپەرینەکانی سمکۆی شکاك ، لە رۆژهەڵاتی کوردستان کە مەبەستیش ئەوەبوو . کە تورکەکان هەولیان دا یارمەتی سمکۆ بدەن دژی ڕژێمی ئێران نەك کوردو کوردستان.

١٩٢٢/١٠/٢٧ بەچاپکەیاندنی دوا ژمارەی ڕۆژنامەی بانگی کوردستان لەشاری سلێمانی لە باشووری کوردستان.

١٩٢٢/١٠/٢٨ شانشینی ئیتالیا لە بڕیارێکیدا – بنینۆ مۆسۆلینی– بە سەرەك وەزیرانی ئیتالیا دامەزراند ، لەدوای ئەوە مۆسۆلینی پارتی فاشی دامەزراند ، کە ئەم مرۆڤە لە مرۆڤێکی دیموکراتی سۆشیالیستی هەلگەڕایەوە بەرەو مرۆڤێکی فاشیو هەنگاوینا دژی جووڵانەوەی دیموکراتی لە هەموو بوارە جیاجیاکان شان بەشانی ئەلمانیا.

١٩٢٢/١١/١ تورکە کەمالیەکان ڕایان گەیاند ، کە ئەوان دەسەڵاتداری رەوان لەسەر تورکیاو دەسەڵاتی سەلتەنەتیان هەڵووەشاندەوە. واتە دوا دەزگای ئیمپراتۆریەتی عوسمانیەکان .

١٩٢٢/١١/٤ دۆزینەوەی گۆڕی - تووت جنخ ئاموون- لە دۆڵی شانشینەکان لە دەشتایەکانی ڕۆژئاوای کۆشکەکە لە وولاتی میسر... کە ئەمەش بە یەکەم دۆزینەوە دادەنرێت لە مێژوودا ، کە بە تەواوی کنوزەکانی - خەزنە ، کۆگا - بنەماڵەی هەژدەمی فرعەونەکان لەگەڵ کوورسی عەرشی و پەیکەری پاسەوانەکان ، لەگەڵ سندوقێکی شانشینی و پەیکەری فرعەونەکان - ئەخناتوون و خێزانەکەی- لە میسر .

شایانی باسە کە شووێنەوارو شارستانیەتی فرعەونەکانی میسر دەگەڕێتەوە بۆ زیاتر لە ٧٠٠٠هەزار ساڵ بەر لە مێژووی زاین لە ناوچەکەدا .

١٩٢٢/١١/١٠ لە دوای تەواو کردنی پۆستەکان شێخ مەحمودی حەفید کابینەی حکوومەتی کوردی لە نۆ وەزیر پێك هێناو سەربەخۆی کوردستانی لە باشووری کوردستان ڕاگەیاند.

١٩٢٢/١١/١٢ دامەزراندنی هەرێمی ئۆتۆنۆمی قەرەچایڤ - چەرکەس - لە ژێردەسەلاتی یەکێتی سۆڤیەتی نوێ ، بە سەرکردایەتی ڕابەری شۆڕشی ئۆکتۆبەر ، لینین... شایانی باسە کە قەرەچایڤەکان بەپێی سەرژمێری ١٩٨٩ لە یەکێتی سۆڤیەت ژمارەیان ١٥٥،٩٠٠ کەس بووە، زمانەکەیان لە دەستەی زمانەکانی کیمچایڤە ، یا زمانی قەرەچایڤ . یا بالکار ، یا بنەماڵەی زمانەکانی باکوورو ڕۆژئاوای ئالتایەو پەیووەندیەکی زۆرو نزیکی لەگەڵ زمانی ئەسەنتیندا هەیە ولە ئایین موسلمانی مەزهەب سونەن.

هەروا بەپێی بڕیاری پەرلەمانی یەکێتی سۆڤیەت لە ١٩٤٣/١٠/١٢ ئەم ئۆتۆنۆمیە پشت بە سنوور بە تاوانە هەڵبستراوەکانی ڕژێمی ستالینی

هەڵووەشـاوەیە ، تـەواوی دانیـشتووانەکەی بـەزۆر بـۆ شـووێنەکانی دیکـەی سـۆڤیەت دوورخرانـەوە ، دوای ئەوە ئـەم کۆمارە سـەرلە نـویٚ لـە ۱۹۵۷/۱۱/۹ دامەزرایەوەلە ناوچەکەدا.

دوای دەرچوونی بریارو دەستوورەکانی دەوولـەت و پارت و پەرلـەمان و دام و دەزگـا یاسـادانانەکان پێـشنیارکرا ، کـە گـەلانی ژمـارە کـەم پێوویـست بـە قەوارەی ئۆتۆنـۆمی ناکات ، کە ژمارەیـان لـە ۲۰۰ هەزارکـەس کـەمتر بێـت لـە ناوچەکەیدا .

بـەڵام کـورد ئـەو کـات ژمـارەی دانیـشتووانەکەی لـە ۷۵۰,۰۰۰ هـەزار کـەس زیاتر بـوون ، هـەر وەك ئـەم کەمـە نەتەوایەتیانـە مامەلەی لەگـەڵ کراو هەرێمـە ئۆتۆنۆمیەکەی هەڵوەشێندراوەودانیشتووانە رەسـەنە کوردەکان لـە پارێزگـای یـەریڤان و دەورووبـەری دابەشـی سـەر کۆمارەکـانی یـەکێتی سـۆڤیەت کـرا لەلایەن ستالین.

۱۹۲۲/۱۱/۱۲ سـەرکردەو قارەمـانی تێکۆشـەری کـورد سمکـۆی شـکاك لەگـەڵ نووێنـەری بەریتانیا- وای- لـە رۆژهـەڵاتی کوردسـتان کۆبـۆوە ، بەڵام ئـەو کۆبوونەوەیـە هـیچ ئاکـامێکی لـیٚ نەکەووتـەوە لەچارەسـەری مافـەکانی کـورد لـە رۆژهـەڵاتی کوردستاندا .

۱۹۲۲/۱۱/۱۵ بڵاو کردنـەوەی یەکـەم ژمـارەی رۆژنامـەی کوردسـتان لـە شـاری سلێمانی لـە باشووری کوردستان به سەرپەرشتی نوری عەلیو کەمال بوو لە شارەکەدا .

۱۹۲۲/۱۱/۱۶دامەزرێنـەری دەوولـەتی تـورك مستەفا کـەمال ئـەتاتورك بـە فـەرمی دەسـەڵاتی رژێمـی تورکیـای گرتـە دەست لەسـەر تورکیـای دورسـتکراوی دوای رووخـانی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی لەسەر خاکی باکووری کوردستان لە هەرێمەکەدا .

۱۹۲۲/۱۱/۱٦ نووسەرو رووناکبیرو رۆمان نووسی بەناوبانگی پورتووگالی و جیهان -خۆزیٚ ساراماگۆ- لـە گونـدی ئەزبنیاکـەی هـەرێمی ریبـانیگۆی بـاکووری شـاری لـشبۆنە لەچـاوی بـە جیهـان هـەلهێناوە و لەسـالی ۱۹۸۸ خـەڵاتی نـۆبلی پـی بەخشراوە لە وولاتەکەدا .

۱۹۲۲/۱۱/۲۰ مۆرکردنی رێکەووتننامەی ئاشتبوونەوە لە نێوان رژێمـی تورکیـاو فەرەنسا ، ئـەویش بـە دەرچـوونی هێزەکـانی سـووپای ئیتالیـا لـە باشـوورو رۆژ ئـاوی کوردستانی داگیرکراوو ، لەهەمان کات ئەوانەی کە دووژمنـی رژێمـی تورکیا و

تورك بوون ، لە شاری لۆزان لـە گـەلیان کۆبوونـەوە . ئـەویش لـەپێناو دژایـەتی کردنی مافی کوردو خاکی کوردستان لە کێشووەرەکەدا .

هـەروا ئـەویش بـە بـەکارهێنانی ڕامیاریـەتی جینۆسـاید بەرامبـەر بـە گـەلی کوردستان ، ئەمەش لە سەر داوای وولاتانی سـەرکەووتووی جـەنگی یەکـەمی جیهـان.– لـۆرد کیـزن – نووێنـەری بـەریتانیاو – عـسمەت ئینوونـوو– نووێنـەری تورکیـا بـوو ، ئـەویش بـەکۆتایی پـێ هێنـانی خەونـەکانی کـورد لەپـەیمانی سـیڤەر لـە ١٩٢٠/٨/١٠ ، بەچارەسـەرکردنی کێـشەی کـورد لـە کوردستاندا .

١٩٢٢/١١/٢٥ لـە سـەرەتای دورسـتکردنی ڕژێمـی شانـشینی ئێـراق ، هـەردوو حکوومـەتی ئێراق‌و بەریتانیا ڕاگەیاندنێکی هاوبەشیان بڵاو کـردەوە – بڕیـار– لـەو بڕیـارە هاتووە:–

که هـەردوو حکوومـەتی بـەریتانیاو ئێـراق هیـوادارن کـە کوردەکـان سـەرەڕای جیاوازیـان بـەزووترین کـات لەسـەر شـێووەی ئـەو حکوومەتـەی کـە دەیانـەوێ دورستی بکەن‌و سنوورەکەش تاکوو کوێ بێت – لـە باشـووری کودرسـتان لـە سـەری ڕێککـەوون ،عـەروا لـە ئەنجامەکـەی ئاگادارمـان بکەنـەوە بۆ بـە ئـەنجام گەیاندن.

١٩٢٢/١٢/٢ ڕژێمی شانشینی لە ئێراق‌و حکوومەتی بەریتانیا دانیـان نـا بـە مـافی کـورد لـە باشـووری کوردسـتانی لکێنـراو بـە ئێـراق ، لـەناو چـوار چـێووەی سـنووری ئێراقی دورستکراو .

ئەویش بەدامەزراندنی حکوومەتێکی کوردی لە تـەواوی سنووری کوردسـتان ، کە پارێزگاکانی کەرکوك‌و هەولێرو سلێمانی دەگرتە خۆی لە هەرێمەکەدا .

١٩٢٢/١٢/٢٢ ڕژێمـی نـوویێ شانـشینی لـە ئێـراق‌و بـەریتانیا دانیـان بـەوە نـا ، کـە کـورد لـە باشووری کوردستان مـافی دامەزرانـدنی حکوومـەتی ناوخۆییـان هەیـە لەچـوار چـێووەی سـنووری ئێـراق لەسـەر خـاکی هـەرێمی باشـووری کوردسـتان لـە وولاتەکەدا .

١٩٢٢/١٢/٢٤ ڕاگەیاندنی هاوبەشی ڕژێمی شاهانشینی لە ئێراق‌و حکوومەتی بەریتانیا کـە دان مـافی کـورد دادەنـێن لـە پێکهێنـانی حکوومـەتی کـوردی ، ئـەویش بـەم شـێوەیە ، مـافی کـوردە دانیـشتونەکانی نـاو سـنوری ئێـراق بـەپێکهێنانی

حكومەتی كوردی لەناو ئەو سنورەدا.

١٩٢٢/١٢/٢٥ بڵاوكردنـەوەی بەیاننامـەی نێـوان ڕژێمـی شانـشینی لـە ئێـراق و حكوومـەتی بەریتانیا ، لە دوای ئـەوەی كـە بـەگرنگترین بەڵگـەنامـەی مێژوویی دادەنرێت ، كە تێیدا دان بـەمافی تـەواوی ڕەوای گـەلی كورد لەسـەر خـاكی خۆی دادەنـێ ، ئـەویش بەدامەزرانـدنی حكوومـەتی كـوردی لـەناو چـوار چێـوەی سـنووری دورستكراوی ئێراق لە هەرێمەكەدا .

١٩٢٢/١٢/٣٠ یەكیەتی كۆمارەكانی سوشیالیستی سۆڤیەت بەرابەرایەتی دامەزرێنەرەكەیـد – فلادیمێـر ئیلـیچ ، لیـنین– دامـەزراوو گەلانی ئـەو یەكیەتیە فیدرالیـە تایبەتیـە ، كە لـە ژێر دەسـەڵاتی سەنتەری پارتی كۆمۆنیـستی سـۆڤیەت بـوو ، وەك وولاتێـكی دەرگـا لـە سـەر داخراو لە پەیووەندی دراوسێیی و نێوودەووڵەتی لە جیهاندا.

١٩٢٢/١٢/٣٠ كۆنگرەی سێیەمی ئەنجوومەنەكانی سۆڤیەت ڕەزامەندی كرد لـە سـەر یەكێتی كۆمارەكانی سۆشیالیستی سۆڤیەتی و لەسـەر پـەیمانی دامەزرانـدنی یـەكێتی كۆمارەكـانی سۆشیالیـستی سـۆڤیەت ، دوای ئـەوە وردە وردە كۆمارەكـانی دیكـە لـەناو ئـەو یەكیەتیـە فیدرالیـە خۆیـان بەسـتەوەو بـەرەو هـەنگاونان بۆپێشەوە هەنگاویننا تاكوو هەڵووەشاندنەوەی یەكیەتی سـۆڤیەت بـەردەوام بوو لە كێشووەرەكەدا و جیهاندا .

١٩٢٢/١٢/٣١ ئایدۆلۆژی مارکسی سـەردەمی بـڕوای بـە ڕووبەڕووبوونـــەوەی نەتـەوەیی هەیـە ، لـە ســـــەر مێــــژووی دیاریـــــــــــدەی و دیاریکراوو جیاوازی کردن . لە نێوان مافە

نەتەوەییەکان وەك لینین ئاماژەی بەوە کردووە کە دەڵێ:-
لە نێوان نەتەوەی گەل کە نەتەوەیەکی دیکە دەچەوسێنێتەوەو نەتـەوەیی گـەڵ چەوسـاوەیەو لـە نێـوان نەتەوەیـەك وەك نەتـەوەی گـەوورە لەگـەڵ نەتـەوەی بچووکە ، هەروا ، مارکس – لینین ، جیاوازی لە نێوان نەتەوەی ژێر دەسەڵاتی وولاتـانی سـەرمایەداری پێشکەوتوو لەگـەڵ نەتـەوەی وولاتـانی ژێـر دەسـتەو چەوسـاوە دەکـات لـە بـواری نیـشتمانی جـووگرافی و نەتـەوەیی لـە سـەر نیشتمانەکەیدا.

## ١٩٢٣

١٩٢٣/١/٧ سەرکردەی کورد لە ڕۆژهەلاتی کوردستان ژێر دەسەڵاتی ڕژێمی شای ئێران ، سمکۆی شـکاك گەیـشتە شـاری سـلێمانی و لەلایـەن پێـشەوای بزووتنـەوەی ڕزگاری کورد لە باشووری کوردستان شێخ مەحمودی حەفید پێشوازی لێکرا .

ئـەویش سـەردانەکەی لـە پێنـاو هاوکـاری و یارمەتیـدانی یـەکتری لـە بـواری نەتەوەیی و نیـشتمانیدا ، بـەو بۆنـەوە بازارەکـانی شـاری سـلێمانی داخـران لـە هەرێمەکەدا .

١٩٢٣/١/١٤ شـێخ مـەحمودی حەفیـد کۆبوونـەوەی لەگـەڵ ٤٣ لـە سـەرۆك عەشـیرەتە کوردەکـان لـە شـاری سـلێمانی ئەنجامـدا ، لـە پێنـاو دیـاریکردنی کـاری ڕێکخستن لە هەرێمی باشووری کوردستان .

ئەویش بە دیاریکردنی – ١٠- سەرۆك عەشیرەت لەرۆژهەلاتی کوردستان و –

١٣- سەرۆك عەشیرەت لە سلێمانی و هەلەبجەو - ٤- سەرۆك عەشیرەت لە هەولێرو کۆیەو-١٦ - سەرۆك عەشیرەت لەپارێزگای کەرکوك.

١٩٢٣/١/٢١ بەهۆی ئاڵۆزی و نالەباری بارودۆخی باشووری کوردستان شێخ مەحمودی حەفید نامەی یەکەمی ئاراستەی رابەری شۆڕشی ئۆکتۆبەری سۆڤیەت - لینین - کرد .

ئەویش لە پێناو بەهانا هاتن و یارمەتی دان ، کە لەو کاتە کوردو خاکی کوردستان بەر شالاوە یەك لە دوای یەکەکانی هێزەکانی سووپای رژێمی شانشینی ئێراق و بەریتانیا و بەتایبەتی بەرەو دابەشکردنی کوردستان و داگیر کردن هەنگاوی پێدەنرا لە هەموو لایەنە جیاجیاکان لە کوردستاندا.

١٩٢٣/١/٢٣ نووێنەری بەریتانیا-کیرزن- لە لێدوانێکیدا بیانووەکانی لە مەڕ هەڵوێست و رامیاریەتی بەریتانیای خستە ڕوو ، کە ئەویش بە دەرخستنی پەیمانی فرسای و سانڕیمۆ .

ئەویش بەر گری کردن بوو لە هەڵبژاردنی- شاڤیل- بوو لەگەڵ لکاندنی مووسڵ و باشووری کوردستان بەشانشینی ئێراقی دورستکراو لەسەرخاکی کوردستاندا.

لیژنەی ویلایەتی موسڵ لە نێوانیاندا ئەدمۆندس لەلای چەپ دووەمین کەسە

١٩٢٣/٢/٢١ هێزەکانی سووپای بەریتانیاو بەرپرسانی بەریتانیا لە ئێراق کەووتنە دژایەتی کردنی مەلیکی کوردستان شێخ مەحمودو داوایان لێکرد سەردانی شاری بەغدا بکات .

ئەویش بۆ وتوویژ کردن لەگەڵ بەرپرسانی میریو هەرەشە لێکردنیو لەجەماوەری پارێزگای سلێمانی کە دژایەتی بەریتانیاو دەسەڵاتی شانشینی ئێراقی دورستکراو لەسەر خاکی باشووری کوردستان نەکەن ، گەرنا ناوچەکە بەر هێرشی بۆردومان کردنی هێزی سەربازی دەبێتەوە لە داهاتوودا .

١٩٢٣/٢/٢٣ سەرکردەی کورد ئیسماعیل خان -سمۆکی شکاك- دوای گەیشتنی سەردانی شێخ مەحمودی کرد لە شاری سلێمانیو پشتگیری تەواوی خۆی بۆ شێخ دووپات کردەوە ، لە پێناو وەدی هێنانی مافەکانی کوردو خاکی کوردستان.

١٩٢٣/٢/٢٨ سەرکردەی کورد سمکۆی شکاك شاری سلێمانی جێ هێشت لە ئەنجامی هەرەشەی هێزەکانی سووپای بەریتانیا بەبڵاوکردنەوەی بەیاننامەی هەرەشەکردن بە فرۆکە بەسەر شاری سلیمانی لە هەرێمی باشووری کوردستان.

١٩٢٣/٣/١ دامەزراندنی پارێزگاری پارێزگای هەولێر کە بەڕێز ئەحمەد عوسمان بوو لە شاری هەولێر لە لایەن رژێمی شانشینی و بەرپرسانی بەریتانیا لەسەر پارێزگاکەدا لە باشووری کوردستان .

١٩٢٣/٣/٤ فرۆکــه جەنگیــەکانی هێزەکـانی سـووپای بـەریتانیا شـاری سـلێمانی لـه باشووری کوردستان بۆردومان کرد، کە لـه ئـەنجام داگیری کردو دەسـەلاتی شـێخ مـەحمودی هەلووەشـاندەوە بـەهێزی هێزەکـانی سـووپای بـەریتانیا ، بەهاوکاری هێزەکانی ڕژێمی شانشینی له ئێراق بەیارمەتی کوردە خۆفرۆش وجاشەکانی دژ بـه گـەل و نیشتیمانەکەیان بە لایەنگیری کردنـی لایـەنگیری ڕژێمی شانشینی له ئێراق هەرێمەکەدا.

١٩٢٣/٣/٨ بەڵگەنامــەکانی دەسـەلاتی یەکیـەتی سـۆڤیەتی تایبەتمەنـد نـەبوون بەبلاوکردنـەوە، کـه هەلوویـستێکی خراپیـان گرتبـووه بـەر بەرامبـەر کـوردو جوولانـەوەی رزگـاری کـورد لـه باکووری کوردستـانی ژێـر دەسـەلاتی رژێمـی تورکیا و وولاتی دیکه.

که کوردو خاکی کوردستانیان بەسەردابەشکرا وەك :-

ئێـران و ئێـراق و سـووریا. لـەم رۆژەدا دەسـتەی لێژنـەی مللـی بـۆ کاروبـاری دەرەوە – واتــه دەسـتەی وەزارەتــی دەرەوە – بریـاردرا بـه ئـەویش :- کـه پێوویست ناکات یارمەتی کورد بە جیاکەرەوەکانی تورکیا بدرێت.

له هەمان پشتگیری ئیمپریالیەتی تورکیا نەدرێت له هەلوویستەکانی بەرامبەر بەکورد. بـەڵکوو هەلوویـستی نـەرم بگیرێتـه بـەر بەرامبـەر بەتێکۆشـانی کـورد دژی بەریتانیا.

هەلوویـــستی ســـۆڤیەت زۆر روون و ئاشـــکرا بـــوو لەبەڵگەنامـــەکان، وەك رێنماییەکی دەرچـوو لـه لایـەن دەسـەلاتی بالای سۆڤیەت بەرامبـەر بەکێشەی کـورد، ئـەویش دژی بـیری سـەربەخۆیی کوردسـتان بـوو، لـه هـەمان کـات ناوزەندکرا بە بیرێکی کۆنە پەرستانه و بەڵکوو بارودۆخی ئێستا وا دەخوازێ هاوسەنگیەك بۆ کێشەکان جێگیربکرێت... هەروا بەهێزکردنی پارچەکانی کە دەوولەتی تورکی پێیٚ بەهێزدەکرێت نەك بەپێچەوانەوە.

هەروا کـارگێر بەدەسـەلاتدارەکان لـه وولاتـی رۆژهـەلاتی دیکـه پـشتگیری بیری کوردستـان سەربەخۆیان نەدەکرد. کە دەبووە گورزێك بۆ وولاتـانی سـەربەخۆو یەکیەتی نیشتیمانیەکان لەناوچەکەدا.

بەهۆی ئـەوەی کـه دانیشتووانی کورد دوا کەوتوون و ژێـر دەسـتەو ملکەچـی ســەرەك عەشـیرەت و ئاینیەکانیـشن و، لــه هــەمان کـات نۆکــەری وولاتـانی

ئیمپریالیەکان... ئەمەش وا پێویست دەکات داوای پێشکەش کراوی لێژنەی کورد بۆ دامەزراندنی دەوڵەتی کوردی ڕەتبکرێتەوە، لەژێر پارێزگاریکردنی ڕووسیای سۆڤیەتی، کە ئەم داوایەشی داوایەکی ناکاویە و لەگەڵ ئەوەشدا بڕیاری تایبەتی مەکتەبی ڕامیاری لێژنەی ناوەندی پارتی کۆمۆنیستی سۆڤیەتی بەلشەڤ لە ساڵی ١٩٢٥ و هەڵوێستی خراپی سۆڤیەت بەرامبەر بەجووڵانەوەی ڕزگاری کورد لە باکووری کوردستانی داگیر کراوی ژێر دەسەڵاتی تورکیالە هەرێمەکەدا .

هەر لە بەر ئەوەش هەڵوێستی وولاتانی ڕۆژئاواو یەکیەتی سۆڤیەت خراپ بوو بەرامبەر بەشۆڕشی شێخ سەعید، کە تورکیای هەژاند لەناوچەکەدا. هەر لە بەر ئەوەش سۆڤیەت هەوڵیدا کێشەی نێوان ڕژێمی ئێران و تورکیا بەرەو ئارامی و سەقامگیری ببات نەك بەپێچەوانە دژی کورد لە کوردستان.

سەرچاوە :- لازاریف. المسألة الكردية ١٩٢٣ - ١٩٤٥.

١٩٢٣/٣/٢٤ بەهۆی هێرشەکانی سووپای بەریتانیا بۆ سەر شاری سلێمانی و دەوروبەری شێخ مەحمودی حەفیدو شۆڕشگێڕەکان ناچار بوون ڕوو بکەنە ناوچەی سوورداش و شاخە بەرزەکان لە دەوروبەری شاری سلێمانی و درێژە بەخەبات بدەن لە هەرێمەکەدا.

١٩٢٣/٣/٢٩ ڕووناکبیری جیهانی و ڕۆمان نووسی بەناوبانگ- ئەرنست هەمنگوای- دووپاتی کردۆتەوەو دەڵێ:- مستەفا کەمال ئەتاتورك لەدوای نەمانی ترس لەئەرمەن و کورد لەباکووری کوردستان و یۆنان دەسەڵاتی زانستیانەی - علمانی- ڕاگەیاندو بەو پەڕی شۆڤێنیانە کرداری لەگەڵ کورد ئەنجام دەدا لە هەرێمەکەدا.

١٩٢٣/٤/٢١ لە نێووەندەکانی گفتووگۆی پەیمانی لۆزان ، تورکیا لە هەموو داواکاریەکانی خاوەنداریەتی سامانەکانی خۆی ،

كـه بـەداگیر كـردن خستبوویە ژێردەسـتی لێـی خـۆش بـوو ، كـه لـه وولاتـانی عــەرەبی هــەیبوو . بەتایبــەتی لەباشــووری كوردســتانی لكێنــراو بــەئێراق لەسەرووی هەموویان وویلایەتی موسلدا لە ناوچەكەدا .

١٩٢٣/٤/٢٢ هێزەكـانی سـووپای توركیـا شارۆچـكەی روانــــــــــدزو دەوورووبـەری سـەر بە پارێزگای هـەولێر لـــــە باشـــووری كوردســــتان ، جــێ هێــشت بــە هــۆی هەرەشەی هێزەكانی سووپای بـەریتانیا و كەوتـەوە ژێـر دەسـەلاتی هێزەكـانی بـەریتانیاو ڕژێمـی شانشینی لە ئێراق.

١٩٢٣/٤/٢٣ لە كۆنگرەی دووەمی لۆزان لە سـەر كێشەی وویلایـەتی مووسڵ ، كـە لـە سـەر خـاكی باشـووری كوردسـتان بـوو... ئـەویش لـەپێناو خستنە ژێـر دەسـەلاتی كۆمەڵـەی گـەلان بـۆ بریـار دان لەسـەر ئەوكێـشەیەی كـە لـە نێـوان توركیـاو كۆمەلەكەدا هەبوو ، لەو كاتە دانیشتووانی پارێزگای موسل لـە ٨٥٪ ی كـورد بــوون بــەپێی بەلگەنامــەی كۆمەڵــەو ڕژێمــی عوسمــانی تــورك ، بــەر لــە هەڵووەشانەوەی ئیمپراتۆریەتەكەیان ,لە هەرێم و ناوچەو جیهاندا .

١٩٢٣/٤/٣٠ شـاری سلێمانی لـە هـەرێمی باشـووری كوردسـتان كـرا بـەپارێزگا بەهاوكاری شانـشینی لـە ئێـراق و دەسـەلاتی بـەریتانیا لەسـەر عئێـراق و بـووە یـەكێك لـە پارێزگاكـانی ئێـراق لــە ژێــر ئینتیــدابی ســەر بــە بــەریتانیاو حكوومــەت و هێزەكانی سووپای بەریتانیا لەوكاتدا.

١٩٢٣/٥/١٦ داگـیر كردنـەوەی پارێزگـای سـلێمانی لەلایـەن هێزەكـانی ڕژێمـی ئێـراق و هێزەكانی سووپای بەریتانیا .

شێخ مەحمود لەگەڵ شۆڕشگێران بەرەو شاخە بەرزەكانی كوردستان و ناوچە سەنگەربازیەكان هەلكشان و بەردەوام بوون لەشۆڕش و بەرگری كـردن لەگـەڵ و

نیشتمان لە باشووری کوردستاندا .

١٩٢٣/٥/٢٠ هێزەکانی سووپای بەریتانیا ئەشکەووتی– جاسەنە – یان داگیر کرد ، کە لەو کات بارەگای سەرەکی شێخ مەحمودی تیابوو، کە ئەشکەووتەکە کەووتۆتە شاخەکانی سووورداش لەپارێزگای سلێمانی لە باشووری کوردستان .

١٩٢٣/٥/٢٤ لە دوای پەلاماردانی شاری سلێمانی لە باشووری کوردستان لەلایەن هێزەکانی سووپای ئێراق و بەریتانیا ، شێخ مەحمود دووبارە دەر بەدەر کرایەوەو لە هەمان کات چاپ و چاپەمەنیەکانی لەگەڵ خۆی بردو بەردەوام بوو لە دەرکردن و بلاوکردنەوەی رۆژنامەو بلاوکراوەکانی تایبەت بەراپەرینەکە لە باشووری کوردستاندا.

١٩٢٣/٥/٢٨ هێزەکانی سووپای رژێمی شانشینی لە ئێراق بەهۆی بەرگری جەماوەری شاری سلێمانی لەشارەکە نەیانتوانی بچنە ناو شارەکە لە ناوچەکەدا.

١٩٢٣/٥/٢٩ سەرەك وەزیرانی رژێمی شانشینی لە ئێراق – عەبدولمحسن سەعدوون – و راوێژکاری بەریتانیا لە ئێراق گەیشتنە شاری سلێمانی لە هەرێمی باشووری کوردستان ، بەلاٌم باری شارەکەیان پێ هێوور نەکرایەوە بە هۆی بەردەوامی بەرگری کردنی جەماوەر لەشارەکەو دەووروووبەری لە هەرێمەکەدا .

١٩٢٣/٦/٧ رابەرو سەرکردەی کورد شێخ مەحمود نامەی دووەمی ئاراستەی رابەری شۆرشی ئۆکتۆبەر– لینین – کرد بۆ هەمان مەبەستی ناوەرۆکی نامەی یەکەم ، بە هۆی بارو دۆخی نالەباری کوردو هەرێمی باشووری کوردستان.

١٩٢٣/٦/١٧ بە هۆی بەرگری بەرزی شۆرشگێرە چەکدارەکانی شێخ مەحمود لە هەرێمی باشووری کوردستان هێزەکانی سووپای بەریتانیا لەشاری سلێمانی و

دەووروووبەری پاشەکشەیان کرد لە هەرێمەکەدا.

١٩٢٣/٧/٧ بە دەستپێشخەری ڕابەری شۆڕشی ئۆکتۆبەری بە لشەفیەکان – لینین– دامەزراندنی کۆماری کوردستانی سوور لەو بەشە کوردستانەی کە کەوتبووە ژێر دەسەڵاتی شۆڕشی نوێی ڕووسیا بە ناوی – کوردستانسکی ئویەزد– ڕاگەیەندرا .

جێگەی باسکردنە کە کوردستانسکی ئویەزید – ناوچەی کوردستان – کە لە نێوان ساڵانی ١٩٢٣-١٩٢٩ ناوەندەکەی لاچین بوو ، لە ساڵی ١٩٢٩-١٩٣٠ بووە کوردستانسکی ئورکروگ – ناوچەی کوردستان – و لە جێی کوردستانسکی ئۆیەزید ، لەناوچەکانی کەلباجار –قوبالکی –قووتورلی –زەنگیلان– و بەشێکی ناوچەی جەبرەئیل پێك هێنرا . بەم چەشنە لەبارەی مێژوویەوە کوردی سۆڤیەت دووجار ناسنامەی قەوارەی نەتەوەیی یان بۆ پێك هێنراو دانی پێدانرا.

لەو کاتەی کە وولاتانی هاوپەیمان بە سەرکردایەتی بەریتانیا لەو کات چاویان بڕیبووە خاکی کوردستان و تیری ژەهراویان گرتبووە دەست و ئامادەیی خۆیان خستبووە گەر بۆ ئەوەی کورد و خاکی کوردستان پارچە پارچە بکەن.

بەڵام دامەزرینەری ڕژێمی سوشیالیستی دانی بە مافی کورد ناو ئەو کۆمارەی بۆ کورد ڕاگەیان لە کێشووەرەکەو جیهان . دوای ئەوە ئەم وولاتانە کوردو

خاکی کوردستانیان بە تیرە ژەهراویەکەیان وەك گورگ کردە چوار پارچەو نیوو لە نێوان خۆیان و لە هەمان کاتدا چوار دەووڵەتیان لە سەر دامەزران لە ناوچەو کێشووەرەکەدا .

ئەم وولاتانە لەوکاتەوە تاکوو ئێستاش دژی کوردن لە ئازاردان بە لە ناوبردنی کورد لە هەموو بوارە جیا جیاکاندا ....!...؟ .

١٩٢٣/٧/٧ دەووڵەتە کوردیەکەی شێخ مەحمود لە باشووری کوردستان لەلایەن دەسەلاتی شانشینی لە ئێراق و بەریتانیا هەلووەشێندرایەوە بەهۆی بەهێزبوونی هێزی چەکداری وجمووجۆڵی راپەرینەکانی جەماوەری باشووری کوردستان ، بەتایبەتی لەپارێزگای سلێمانی و کەرکوك و دەووروبەری لە باشووری کوردستاندا .

١٩٢٣/٧/٧ لەگەڵ سەرکەووتنی شۆرشی بەلشەفیەکان لە مانگی ١٩١٧/١٠/ بەسەرکردایەتی – لینین – ئەمەش وەکوو موژدەیەکی دڵخۆشکەر بوو بۆ گەلانی رووسیاو قەفقاس و رۆژهەلاتی ناوەراست و هیوایەکی نوێ بوو لە پێناو زیاتر لە بەدیهێنانی ئازادی و سەربەخۆیی ئەو گەلانە.

جێگەی ئامارەپێکردنە کە بەدەیا نەتەوەی جیاجیا لەو هەرێم و ناوچانە ژیانیان بەسەردەبردو خەونی ئازادی و سەربەخۆیان لەهەست و هۆشدا دەخوولایەوە... هەر وەك لە ئینسکلۆپیدیادا ناویان هاتووە و جگە لەگەلانی رەسەنی ئەو هەرێمانە کە ١٠٢ نەتەوەی لێك جیای دیکەش لەو وولاتە نوێیەدا دەژیان و کاتی خۆی لە وولاتانی خۆیانەوە بە هەر هۆیەك بووبێت کۆچیان بۆ کردبوو... لەوانەش گەلی کوردی – سۆڤیەت – بوون. کە بەسێ قۆناخ کۆچیان بۆ کردبوو.

یەکەمیان :– لەکاتی حکوومرانی تزارییەکاندا بووە هۆی کۆچکردنیان بۆ شەری ئەوکاتی نێوان ئیمپراتۆریەتی عوسمانی و رووسیای قەیسەری دەگەرێتەوە.

دووەمیان :– کۆچی کورد بۆ سۆڤیەت بۆ دوای سەرکەووتنی شۆرشی ئۆکتۆبەر دەگەرێتەوە.

سێیەمیان :– کۆچکردنیان بۆ سۆڤیەت دەگەرێتەوە بۆ سەرهەڵدانی – ئاگری ئارارات لە باکووری کوردستان – دوای سەرکەووتنی شۆرشی ئۆکتۆبەر کوردە کۆچەرەکان داوای مافەکانی خۆیان دەکرد... هەر وەك گەلانی دیکەی رووسیای نوێ... لەچوارچێووەی یەکیەتی سۆڤیەت... ئەمەش بووە هۆکاری

دروست بوونی بارێكی لەباری گوونجاو كە ناوچەیەكی ئۆتۆمیدا دروستكرا لە ئازربایجان و ناویان نا – كوردستانی سوور – كە پایتەختی – شاری لاچین – بوو لە هەرێمەكەدا .

ئەم كۆمارەش بۆماوەی شەش ساڵ بەردەوام بوو. بەڵام بەهۆی باری رامیاری و نەمانی ئەو هەرێمە سەربەخۆیە كوردە لە یەكیەتی سۆڤیەت. هەر وەك سكرتێری گشتی پارتی كۆمۆنیستی ئازربایجان – نەریمان باگیرۆڤ – دەڵێت:–

هۆكاری سەرەكی نەمانی ئەم كۆمارە دەگەرێتەوە بۆ رێكەووتنامە سێ قۆڵیەكەی كە لە نێوان ئازربایجان و ئەرمینیاو ستالین مۆركرابوو ... هەروا هۆكارێكی دیكەی هەڵووەشاندنەوەی ئەم كۆمارە ئەوە بوو، كە لینین لە دوای بریاری سەربەخۆیی كۆماری سوور ٤٠,٠٠٠,٠٠٠ ملیۆن رۆبلی بۆ تەرخانكرد لە پێناو بووژاندنەوەی ژێرخانی ئابووری.

بەڵام ستالین مردنی لینینی بەهەل زانی و ئەو چل ملیۆن رۆبلەی خستە خەزنەی كۆماری ئەرمینیا...زۆر مخابن ئەم كۆمارە لە ١٩٢٣/٥/٢٣ بە شێووەیەكی فەرمی سەربەخۆیی خۆی لە هەرێمێكی ئۆتۆنۆمی سەر بەكۆماری ئازربایجان راگەیاند.

كە زامانی رەسمی ئەو هەرێمە زمانی كوردی بوو بەزاراوەی كرمانجی. هۆكاری دیكەی رووخاندنی كۆماری كوردستانی سوور لە دوای ساڵەكانی ١٩٣٧ – ١٩٣٨، كە یەكێك لە سەكردەكانی پارتی كۆمۆنیستی ئازربایجان كەناوی – میر جەعفەر باگیرۆڤ – بووە هەڵوویستێكی شۆڤینیانەی گرتە بەر بەرامبەر كوردی كوردستانی سوور، هەرچی گۆڤارو رۆژنامەو كتێبی هەبوون بەزامانی كوردی هەمووی قەدەخەكردو بووە رێگە لە بەردەوام بوونی ئەم كۆمارە بە هاوكاری پیاوەكانی ستالین لە هەرێمەكەدا.

١٩٢٣/٧/١١ حكوومەتی بەریتانیا پێشنیاری دا بەرژێمی شاهانشینی لە ئێراقی دروستكراو ، ئەویش بە دڵنیا كردنی كورد لە دەسەڵاتی نوێی شاهانشینی بەرامبەر بەكورد ، ئەویش بە چەند خاڵێك:–

١– حكوومەتی ئێراق نیازی نییە هیچ فەرمانبەرێكی عەرەبی لەهەرێمی باشووری كوردستان دابمەزرێنێت ، كە تەنیا فەرمابنەری هونەری نەبێت.

٢– حكوومەتی ئێراقی نیازی نییە زمانی عەرەبی بە زاڵتر بزانێ لەسەر زمانی

کوردی لە هەرێمەکەدا .

٣- هەموو مافێکی ئایینی و مەدەنی پارێزراوە بۆ دانیشتووانی هەرێمەکەدا .

١٩٢٣/٧/٢٣ دامەزرێنەری دەوڵەتی تورکیا مستەفا کەمال ئەتاتورك بیری پێکهێنانی دەوڵەتی کوردی هەلووەشاندەوە بەهاوکاری بەریتانیاو ئەمەریکا بەهۆی مۆرکردنی پەیمانی لۆزان ، کە کوردستان لەنێوان ئێراق و ، ئێران و ، سووریاو، تورکیا و ، کۆماری ئەرمینیای سۆڤیەت دابەشکرا لە کێشوەرەکەدا.

١٩٢٣/٧/٢٤ لە ئەنجامی کۆنگرە یەك لە دوای یەکەکانی وولاتانی - بەریتانیا و ، فەرەنساو ، ئەڵمانیا و ، ڕووسیاو ئەمەریکا و ، مەلۆتکەکانیان لە ناوچەکەدا - کە هاوپەیمان بە سەرکردایەتی بەریتانیای مەزنی ئەو کات ، پەیمانی لۆزان . لە شاری لۆزان لە وولاتی سویسرا مۆر کراو حکوومەتی بەریتانیا کێشەی کوردی بە مافە سەرەتاییەکان رازی کرد ، بەلام بێ سوود بوو بە هۆی بەرژەووەندی تایبەتی رامیاری و ئابووری و بازرگانی و سەربازیدا .

بە تایبەتی لە سەر خاکی کوردستان ، ئەویش بە هۆی لە بارەی باری هەلکەووتەی شووێنی جووگرافی خاکی کوردستان و دەروازەی سێ لایەنەو ، کەش و هەواو بەپیتی خاکەکەی لە هەرێمەکان وناوچەکە لە کێشوەری ئاسیادا.

پەیمانی لۆزان لە ١٩٢٣/٧/٢٤
هێڵێکی سوور بوو کە جەرگی کوردستانی کردە چوار پێنج لەت
"LOZAN AGREEMENT" of July 24th, 1923
ed Line Dispersed Kurdistan Liver Into Four-Five Morse

جێگـەی ئامـاژە پێکردنـە کـە لـە رێکەوتننامـەی لــۆزان نـــاوی کـــــورد و کوردســـــتان و چـــارە ســـەر کردنـــــــی کێـشەکانی بـە هـیچ شـێووەیەك تیـــا دیـــاری نـــــەکرابوو ، هــــەروا دڵنیـــا بـــــــوونێکی رامیـــــــاری و یاســــــایی و رۆشنبیریـــــشی تیـــا دیـــار نـــەکرابوو . هـــەروا لــــە برگـــەکانی مـــافی پاراســـتنی کەمەنەتەوایەتیەکانیش باسی کوردی نەکردبوو، کە ماددەی /٣ لە پەیمانی لۆزان باشترین تییری ژەهراوی بوو کە لە کوردو خاکی کوردستان درا لەلایەن دووژمنانی کوردستان.

کە راستەو خۆۆش سنووری نێوان سووریای ئێستاو تورکیای ئێستاش دیاریکرا . و بریاردرا کە دوای ٩ نۆ مانگ سنووری نێوان ئێراق و تورکیا دیاری بکرێت. کە ئەمە بووە هۆی دووبارە دابەشکردنی خاکی کوردستان لە کێشووەرەکەدا .

هەروا لە بارەی مافی نەتەوەی غەیرە تورك و لە سەرەوەی هەموویان کورد ، کە لە ماددەی /٣٧ تا ماددەی /٤٥ لە بەشی/٣ ی پەیمانەکە کە مافی کە مەنەتەوەییەکانی دیاری کردبوو ، باری کوردی تیا نەبوو و ناوی کوردیشی تیا دیاری نەکرابوو . کە تەنیا بۆ ئەو نەتەوانە بوون کە ئیسلام نەبوون ، کە کـوردیش هـەڵگری بـڕوای ئـاینی ئیـسلام بـوو ... کـە ئەمـەش بـووە هـۆی

سەرکەووتنی داواکانی رژێمی تورکیا و بە لە گۆڕنانی پەیمانی سیڤەر ، کە چەندین بڕگەو ماددەی باشی لە خۆوە گرتبوو لە بارەی مافەکانی گەلی کوردستاندا .

هەرێمی ڕۆژئاوای کوردستانی لکێنراو بە سوریا
ا- پارێزگای قامیشلی
1- قەزای بەلۆنە
2- قەزای حەسەکە
3- قەزای تەلەلبیر
4- قەزای چەسایە
5- قەزای تەل تەمر
6- قەزای عەبلەری
شاری قامیشلی
Qamishli

۱۹۲۳/۷/۲۵ مۆرکردنی پەیمانی سیڤەر دلخۆشکەری کوردو کوردستان بوو بەپێی مادەو برگەو خالەکانی بەتایبەتی ماددەی ٦٢-٦٣-٦٤، بەڵام مۆرکردنی پەیمانی لۆزان لێدانی تیری ژەهراوی بوو لەخاکی کوردو کوردستان ، لەلایەن هاوپەیمانانی رابردوو ئێستای تایبەتی لەلایەن کۆمەلەی گەلان بەئامۆژگاری بەریتانیا.

۱۹۲۳/۷/۲۷ سەرکردەی کورد شێخ مەحمود نامەی سێیەمی ئاراستەی رابەری شۆرشی ئۆکتۆبەری بەلشەفی – لینین- کرد بۆهەمان مەبەستەکانی نامەی یەکەمو دووەم .

ئەویش لە بارەی باری کورد لە کوردستان و بەتایبەتی لە باشووری کوردستان ، ئەونامانەش هەر وەك بەڵگەیەکی مێژوویی خۆی پاراستیەو یارمەتی دەسەلاتی نوێی کۆمۆنیست بێ سوود بوو بۆ گەلی کوردستان.

۱۹۲۳/۸/۱٤ لە هەولە بەردەوامەکانی بە دەست هێنانی دروستکردنی تەلەفزیۆن دەگەرێتەوە بۆ – دکتۆر ڤلادیمیر – کە ئیکۆسکۆبی – داهێنا کە ئامێری وێنە گرتنی تەلەفزیۆن – بوو – هەروا – فیلۆ فرانسۆرت – کامیرای ئەلکترۆنی پێشخست .

دوای ئەوەش – ئەلین ب دۆمۆنت – سەماعەکانی وەرگرتن – ی پێشخست و یەکەمین ئامێری وەرگرتنی تەلەفزیۆنی ناو ماڵی – دروستکرد.

لە دوای ئە هەموو هەولە زانستیانەدا لە ساڵی ۱۹۲۸ کومپانیای – ژەنەراڵ ئەلکتریك – بەرنامەی تەلەفزیۆنی تاقیکردەوە. کە سەرۆکی ئەمەریکا – رۆزفیلت – یەکەمین سەرۆك بوو بە شاشەی تەلەفزیۆن وێنەی بلاوکرایەوە.

دوای ئـەوە لـە بـەریتانیا لـە سـاڵی ١٩٢٤ لـە لایـەن – گۆنـل بێـر– تەلـەفزیۆن تاقیکراوەتەوە، دوای ئەو هەوڵانـە لـە سـاڵی ١٩٢٧ تاقیکردنـەوە لەسـەر رەنـگ کـرا لـە سـەر شاشـەی رەشـوو سـپی، واتـە وێنـەی رەشـوو سـپی، بـۆ وێنـە و شاشەی رەنگاو رەنگ.

دوای ئەوە یەکەمین پرۆگرامەکانی کە بە رێك و پێکی بلاو کرابێتـەوە ئـەویش لە ساڵی ١٩٣٦ بووە.

جێگـەی باسـکردنە کـە ئـامێری تەلـەفزیۆن، یـاخوود شاشـەی تەلـەفزیۆن کاریگەری زۆری هەبووە و هەیە لـە بواری راگەیاندن لـە بەر ئـەوەی بە وێنـەو جوولەو ووتە کردن دەگاتە بینەرانی لە هەرێم و ناوچەو جیهان.

ئـەمرۆش لـە پـاڵ ئـەم ئـامێرە کەناڵـە ئاسمانیـەکان و ئەنتـەرنێت پـەرەیان لـە هەموو بوارەکانی راگەیاندن سەندووەو بوونەتە سەرچاوەی گرنگ لـە پێدانی زانیاری بۆ بینەران لە جیهاندا.

١٩٢٣/٩/٢٨ لە دایك بوونی نووسەرو رووناکبیرو فەیلەسوف نەتـەوەی کورد رەسول هـەمزا تۆف لە گوندی تسادا... کوری شاعری بەناوبانگی مللی داغستانی – هـەمزە تسادایە –، لە ساڵی ١٩٥٠ پلەی ئەدەبیاتی دوای شێخ بە پلـەی زۆرباشـە لـە ئەدەبیاتی گۆرکی بەدەست هێناوە.

لە ساڵی ١٩٣٧ بەرهەم و شعرەکانی بلاودەکاتـەوەو یەکـەم دیـوانی بەنـاوی – ئەوینێکی بەهێز رقێکی بەتین –. لە سـاڵی ١٩٥١ کراوەتـە سـەرۆکی یەکیـەتی نووسەرانی داغستان، لە کۆنگرەی هەشتەمی یەکیـەتی نووسـەرانی سـۆڤیەت هەڵبژێردراوە بە سکرتێری یەکیەتیەکە. ئەندامی کـارای یەکیـەتی نووسـەرانی ئاسیاو ئەفریکیا بووە.

لە ساڵی ١٩٤٣ بۆتە ئەندامی یەکیـەتی نووسـەرانی یەکیـەتی سـۆڤیەت... ئـەم مرۆڤـــە بـــەتواناو خـــەباتگێرە بـــەکارە هەمەلایەنـــەکانی بـــەردەوام بـــوو بەسـەرکەوتوویی تـاکوو لـە رۆژی ٢٠٠٣/١١/١٣ لـە تەمـەنی ٨٠ سـاڵی کۆچـی دوایی دەکات، و گۆرەکەی لەتـەك خێزانەکەیـەتی فاتێمیـان – لـە سـەر چیـای – تارکیٚ ئاو– لە ناو جەرگەی – مافاچکالا – نێژراوە.

١٩٢٣/٩/١٨ بلاوکردنـەوەی یەکـەم ژمـارەی رۆژنامـەی – ئومێـدی ئیـستیقلال– لەشـاری سلێمانی لەباشووری کوردستاندا .

١٩٢٣/٩/٢٨ لە دایك بوونی نووسەرو رووناکبیرو فەیلەسوفی نەتەوەی کورد رەسول هەمزا تۆف لە گوندی تسادا ... کوری شاعری بەناوبانگی مللی داغستانی – هەمزە تسادایە – ، لە سالی ١٩٥٠ پلەی ئەدەبیاتی دوای شێخ بە پلەی زۆرباشە لە ئەدەبیاتی گۆرکی بەدەست هێناوە
لە سالی ١٩٣٧ بەرهەم و شعرەکانی بلاودەکاتەوەو یەکەم دیوانی بەناوی – ئەوینێکی بەهێز رقێکی بەتین – . لە سالی ١٩٥١ کراوەتە سەرۆکی یەکیەتی نووسەرانی داغستان ، لە کۆنگرەی هەشتەمی یەکیەتی نووسەرانی سۆڤیەت هەلبژێردراوە بە سکرتێری یەکیەتیەکە . ئەندامی کارای یەکیەتی نووسەرانی ئاسیاو ئەفریکیا بووە
لە سالی ١٩٤٣ بۆتە ئەندامی یەکیەتی نووسەرانی یەکیەتی سۆڤیەت ... ئەم مرۆڤە بەتواناو خەباتگێرە بەکارە هەمەلایەنەکانی بەردەوام بوو بەسەرکەوتوویی تاکوو لە رۆژی ٢٠٠٣/١١/١٣ لە تەمەنی ٨٠ سالی کۆچی دوایی دەکات ، و گۆرەکەی لەتەك خێزانەکەیەتی فاتێمیان – لە سەر چیای – تارکیْ ئاو– لە ناو جەرگەی – مافاچکالا – نێژراوە.

١٩٢٣/١٠/٥ دوا سەربازی هاوپەیمانان لە خاکی تورکیای دورستکراو لە سەر خاکی کوردستان چوونە دەرێو – نفل هندرسن– کە نوێنەری بەریتانیای دەسەلات پێدراو بوو ، وەك دادوەری گشتی رامیاری ، دەستکرا بە گفتووگۆ کردن بەپێی برگەی/ ٣ لە پەیمانی لۆزان لەبارەی باری ناوچەکەو کێشەی کورد لە کورستان لەگەل نوێنەری رژێمی نوێی تورك – عەدنان بەگ– لە وولاتەکەدا .

١٩٢٣/١٠/٢٩ لە دوای هەرەس هێنانی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی ، کە زیاتر لە ٤٥٠ سال لە دەسەلاتی داگیر کردنو داپلۆسینی گەلانی ژێر دەسەلاتی کۆماری تورکیا ، لەلایەن مستەفا کەمال ئەتاتورك راگەیەندرا .
کە زیاتر لە ٢١٢ هەزار کیلۆمەتر چوار گۆشەی لە خاکی باکووری کوردستانی پێووە لکێنرا بەبێ ئارەزوو رەزامەندی کوردو بەزۆری زۆرداری حکوومەتی بەریتانیاو هاوپەیمانان .

١٩٢٣/١٢/٦ بۆ یەکەم جار لە مێژوو ، وتاری سەرۆکی ئەمەریکا لە ڕێگەی ڕادیۆ پەخش بکرێت ، بۆ دانیشتووانی پایتەختی ئەمەریکاو بۆجیهان، ئەویش لەکاتی وتارخوێندنەوەی بوو لەکۆنگرێسی ئەمەریکا لەلایەن سەرۆکی ئەمەریکا — کالڤین کۆلیدگ — لە شاری واشنتۆنی وویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا .

١٩٢٣/١٢/٢١شاندێکی ڕژێمی تورکیا داوای لە کۆنگرەی لۆزان کرد ، کە هەرچی داوا هەیە لە سەر کێشەی کورد لە کوردستان لەو کۆنگرەیەدا باس نەکرێ ، لە ئەنجام داواکاریەکەی شاندی تورك جێ بەجێکراو مافەکانی کورد پشتگوێ خران ، لەهەموو لایەنە جۆراو جۆرەکان بەتایبەتی لەلایەنی گەل‌و نیشتماندا .

١٩٢٣/١٢/٢٣ کۆچی دوایی کەسایەتی کورد پەروەردەو ڕووناکبیری نەتەوەیی جەمال عیرفان لە باشووری کوردستان.

١٩٢٣/١٢/٢٧کۆچی دوایی ئەندازیاری بەناوبانگی جیهانی گۆستاڤ ئیڤل لە فەڕەنسا...
شایانی باسە ئیڤل بەنەخشەسازی‌و داهێنانی دامەزراو پێکهاتە کانزاییەکان بەناوبانگە ، وەك پردو هێلی ئاسنی شەمەندەفەر.
بەڵام پەیکەری سەربەستی لە نیویۆرك‌و تاوەری ئیڤل لەپاریس ، کە لەو کاتە لە ساڵی١٨٨٩ وە ناوی ئەوەی هەڵگرتووە لە بە ناوبانگترین داهێنانی ئەم ئەندازیارەیەو هەر بەناوی ئەویشەوەیە لە وولاتەکەو جیهاندا .

١٩٢٣/١٢/٣١ لە دایك بوونی نووسەرو رۆژنامەنووسی ئەمەریکی – نۆرمان میللەر – لە شاری – لونگ برانشی – لە وویلایەتی نیوجرسی ئەمەریکی چاوی بەجیهان هەڵهێناوە.

جێگەی ئاماژەپێکردنە کە ئەم نووسەرە سەرەتای کاروانی ئەدەبی بە نووسینی کورتە رۆمان بۆ رۆژنامەکانی ئەمەرکا دەستی پێکرد. بەتایبەت رۆمانی – سەربازانی شەو – کە بەو رۆمانە ناوبانگی دەرکرد... هەروا میللەر رویەکی ورووژێنەری لە گۆرەپانی ئەدەبی ئەمەریکادا هەبووە. بەهۆی نووسین و بەرگری کردن لەمارکسیەت و دژایەتیکردنی جووڵانەوەکانی ئافرەتان و بەرهەمی زۆری ئەدەبی و ناوبانگێکی باڵای لەژیانی کۆمەڵایەتی بەدەست هێنابوو... یەکێك بوو لە رۆژنامەنووسە بەناوبانگەکانی جیهان.

میللەرلە ژیانیدا توانی رێکخراوێکی بۆ چاودێری کردنی ئاژانسی هەوالگەری مەلبەندی دابمەزرێنیٚ لە بەرهەمەکانیدا بایەخی بەکێشە جۆراوجۆرەکان دەدا. هەر لە سووپاوە تاکوو رامیاری و کێشە هەمەلایەنەکانی ئافرەتان و شاڵاو بردنە سەر فەلەك.

هەروا لەسەر چەندین کەسایەتی بەناوبانگ وەك – مارلین مۆنرۆ و نزوالدو محەمەد عەلی کلای و هەنری میللەر و بیکاسۆ و مەسیح... ی نووسیووە. هەروا لەکارە بەناوبانگەکانیشی – ئینجیلی کور – و – سەربازانی شەو – گۆرانی ئەفسەری لە سێدارەدان – پاری – و کەناری بەربەت – و – خەونی ئەمەریکی – لە پاڵ ئەم کارانەش چەندین جار بەسەر کراوەتەوەو خەڵاتی پێبەخشراوە... لەوانە خەڵاتی – پۆلێستزەی بەناوبانگ.

ئـەم نووســەرە لـەماوەی ژیـانی لـەكارەكانی بـەردەوام بـووە تـاكوو بـەهۆی نەخۆشـــی گورچـــیلە لـــەرۆژی ٢٠٠٧/١١/١٠ماڵئـــاوایی لـــە نووســـەرو رۆژنامەنووسان و وولاتەكەو جیهان دەكات لە ئەمەریكادا.

## ١٩٢٤

١٩٢٤/١/٣ لە دوای گەڕانی بەردەوام لە ئەنجام دۆزینـەوەی گۆڕی شانشین -تووت گنخ ئـاموون- لـە شـوێنەوارەكانی ئـەهرامات لـە وولاتـی میـسر ڕگەیانـدرا ، كـە بەگـەوورەترین دۆزینـەوە دادەنرێـت لەسـەردەمی نوێـدا، كەكفنەكـەی لـەژێر دروست كرابوو بۆیارمەتیدانی جەستەكەی مۆمیا كرابوو .
كە لەجەسنەی فیرعەون و بنەماڵەكەیان لە مۆمیا دەگیران ، كە ماوەی ٣٠٠٠ ساڵ مایتەوەو تا ئێستاش لە وولاتەكەدا .

١٩٢٤/٢/٩ دامەزراندنی كۆماری ئازربایجان ، كە پایتـەختی نەخچەوان بوو . كە خاكی كوردستانەو كەووتۆتە ژێر دەسەلاتی كۆماری ئەرمینیا كە زیاتر لە ١٧٠٠٠ هـەزار كیلۆمـەتری چوارگۆشـە لـە خـاكی كوردسـتان بـە كۆمـاری ئـەرمینیا لكێندراوە ، كە پارێزگای یەریڤان و دەووروبەریەتی .
كۆمـاری نەخـچەوان دەكەوێتـە سـەر سـنووری نێـوان ئێـران و توركیـا و سـەر بـەكۆماری ئازربایجـان بـوو ، كـە ڕووبـەری ٥٢,٠٠٠ هــەزار كیلۆمــەتری چوارگۆشەیەو ژمارەی دانیشتووانی ١٣٩,٠٠٠ هەزار كەس بوون لـەوكات كە خاكی كوردستانە لە ناوچەو كێشووەرەكەدا .

نەخشەی ئازەربایجانی باکوور (سۆڤیەتی پێشوو)و ئازەربایجانی باشوور (ئێران) کە شارەکانی ورمێ و خۆی و سەلماس و نەغەدەو ماکۆو مەهابادو پیرانشارو سەردەشت و بۆکان و چەند شارێکی تری ڕۆژهەڵاتی کوردستانی تێدا خراونەتە ناو ئازەربایجان. نەخشەکەی پیشەوەری و سەرکردایەتیی فیرقەی دیموکراتی ئازەربایجانیش تەواوی ڕۆژهەڵاتی کوردستانی تێدا کراوەتە بەشێکی ئازەربایجانی ئێران

١٩٢٤/١/٢٥ دەست پێکردنی یەکەم یاری ئۆلەمپی زستانە لە چیاکانی ئەلەبی فەرەنسا ، کە١٦ جۆر لەیاریەکان ئەنجادرا .

ئەویش بە بەشداری ٣٠٠ یاریزان و کە سەرکەوتووەکان لە وولاتانی ئەسکەندنافیەو ئەمەریکابوون، ئەویش لەسەر بەستەلەکی بەفر لە شاخەکاندا

١٩٢٤/٢/٢٧ هەڵووەشـاندنەوەی ڕژێمـی خەلافـەتی ئیـسلامی لـە تورکیـا لەلایـەن کۆمەڵـەی نیـشتمانی تورکیـا ، لـەدوای ئـەو هـەنگاوە کـوردی کـردە دووژمنـی ئـاین و کەمالیەکانی کردە کافرو لەو کاتەش شێخ سـەعیدی پـیران دژی ئـەو کردەوانـە وەسـتاو هـەوڵی ڕێکخـستنی باری کـورد بـوو لـە پێنـاو بەرپاکردنی شـۆڕش لـە باکووری کوردستان.

١٩٢٤/٣/٣ ڕژێمـی خەلافـەتی ئیسلامی لـە ئێـــــران هەڵووەشـــــایەوەو دەسـەڵات کەووتـە بـەر دەسـتی ئەحمـــەد قـــەداح ، بـــەڵام ڕەزا بەهلـەوی سـەرکردەی هـەموو دام و دەزگا باڵاکانی ئێران بوو ، وەك حکوومـــەت و ســـووپاو رامیاریـەتی نـاوەوەو دەرەوەی وولاتەکە .
کـــە ئەمـــەش بـــووە هـــۆی دروســـت بـــوونی کێـــشەو ململانـێ لـە هەرێمـەکانی کـە ئێرانی فارسی لێ پێکهاتبوو لە نەتـەوەو هـۆزو تـیرەی جۆراوجـۆر، کـە شـەڕی نێـوان ئـەو هۆزانـە خـۆی لەجێگایەکـدا گواسـتەوە بـۆ جیگایـەکی دیکـە... جگـە لـە کێـشە هەڵوواسـراوەکانی کـورد لـە ڕۆژهـەڵاتی کوردسـتانی ژێـر دەسـەڵاتی فـارس لـە ئێران .
شایانی باسە کە لەو کاتەش حکوومەتی ئێران بە دەست قاجاریەکان بوو ، کە ئەحمەد شا هەردادوەرێکی ڕەمزی بوو لەسـەر ئێران کە ئەحمـەد لـە بنەماڵـەی قاجاری بوو ، لەو کاتەی خەلافـەت هەلووەشـێندرایەوەو بـەرەو نیمچە ڕژێمـی علمانی هەنگاوینا لە کێشووەرەکەدا .

١٩٢٤/٣/٣ زمانی کوردی خۆراگرو ڕەگ و ریشەی لـە نـاخی کوردسـتان چۆتە قوڵایی لـە بووندا، بۆیە لەنێوو زمانەکانی جیهان بە چلەمین زمان لە سەر تاسەری جیهان

دادەنرێ...گەرچی لە تورکیا لەم مێژووەدا بەمەرسوومێکی کۆماری تورکیا زمانی کوردی قەدەخەکرا و لە ساڵی ١٩٣٠ ئاخاوتن و نووسین و خوێندنەوەش قەدەخەکراو هیچ کوردێك نەی دەتوانی پێنووسەکەی جووڵە بکات تا ئەوکاتەی کە لە ساڵی ١٩٦٧ بەیاسای ژمارە/٧٦٣٥/٦ کە بەرهەمێکی بینراو یاخوود بیستراو و خوێندراو نابێ بەزمانی کوردی بێتە ناو خاکی تورکیا.

ئەمەش بەردەوام بوو تاکوو ساڵی ١٩٩١، ئەویش لە ژێر گوشاری یەکیەتی ئەورووپا بەناچاری بۆرۆکەیەکیدا، ئەمەش برواومتمانەی بەماف نەتەوەیەکی زیاتر لە ٢٠ ملیۆن ملیۆن نەبوو، بەڵکوو بۆ چوونە ناو یەکیەتی ئەورووپا بوو... هەروا لە ئێرانیش لە ساڵی ١٩٣٤ جگە لەزمانی فارسی زمانەکانی دیکە قەدەخەکرا بوون و هەر لە دوای لەناوبردنی کۆماری کوردستان دیسان زمانی کوردی قەدەخەکرایەوە. بەلام لە ساڵی ١٩٧٩ بواردراو لە دەستووری کۆماری ئیسلامی ئێراندا زمانە خۆجێییەکان و نەتەوەکانی دیکە لە بواری بەکارهێنانی زمانەکانیان لە رۆژنامەگەری و میدیاو ئەدەبیاتیان هەیە.

گەر باسی زمانی کوردی بکەین لە سووریاش ئەوا لەدەستوورەکە تاکە زمانێك رەسمیە ئەویش زمانی عەرەبیە... بەڵام لە ئێراق لەگەڵ دامەزراندنی دەوڵەتی ئێراق لە ساڵی ١٩٢١ دان بەزمانی کوردی نرا... بەڵام دوای دەرچوونی زمانەکانی خۆجێیی ئێراق بە ژمارە /٧٤ /١٩٣١ جێ بەجێ نەکرا بەڵکوو هەر زمانی نەتەوەیی باڵا دەست بوو، کە پلەیەك بوو بەرامبەر زمانەکانی دیکە و بەنزم و کەم و خوارتر دادەنرێت.

شایانی باسە کە زمان بوونی نەتەوە دەسەلمێنێ بۆیە نەتەوەکان گرنگی و بایەخ بەزمانەکانیان دەدەن و ژمارەی ئەو زمانانەی لەجیهاندا هەیە نزیکەی ٨٠٠٠ هەزار زمانە... بەڵام ژمارەیەکی زۆریان تەنیا ئاخاوتنیان پێ دەکرێ و پیتی نووسینیان نیە.

لە بەر ئەوە ئەو زمانانە هەردوو هەفتە زمانێك بەرەو لەناوچوون دەچێ، واتە ساڵانە نزیکەی ٢٥ زمان رەش دەبێتەوە... لەگەل ئەوەشدا ئەو زمانەی کە لە بیست هەزار تا سەد هەزار ئاخاوتنی پێ دەکەن و دەنووسن ئەوانە زیاتر مەترسی لەناوچوونیان هەیە...

سەرچاوە :- زبانها مردم جهان – میشیل مالرب – وەرگێر – عفت مەلانەزەر /٢٠٠٣. الاثینیة و الدولة – الاکراد في العراق وایران وترکیا... وەرگێران عەبدوالالە

النعمیی /۲۰۰٦.

۱۹۲٤/۳/٤ لـــه هەوڵــەکانی دامەزرێنـــــەری مــــستەفا کــەمال ئــــــــەتاتورك راگەیانــــــدنی کۆمــاری تورکیــا بـــوو لــــە دوای هەڵووشـــاندنەوەی ئیمپراتۆریـــــەتی عوسمــــــــانی و بـەردەام بوونی لـە

سـەر بتـەوکردنی دەسـەڵاتەکەیدا ، ئـەویش بـە هەڵووەشاندنەوەی دەسـەڵاتی خەلافەتی ئەسلامی لە ۱۹۲٤/۳/۲٤ ڕاگەیاندنی کۆماری تورکیا بە کۆمارێکی زانستی... واتە – عەلمانی– لەپێناو خۆ بەستانەوەی بە وولاتانی ڕۆژئاواو پشتگیری لێکردن و پشتگۆی خستنی مافەکانی کورد لە باکووری کوردستان بە تایبەتی لە هەردوو بواری نەتەویی و نیشتیمانیدا.

هەروا لە دوای راگەیاندنی کۆماری تورکیا پایتەختی وولاتەکەی لە شاری ئەستەمبڵ گوواستەوە بۆ شاری ئەنکرە کە ژمارەی دانیشتووانەکەی زیاتر لە ۳,۳۰۰,۰۰۰ ملیۆن کەسە . و ڕێژەیەکی زۆر لە کورد دانیشتوانیەتی ، بەڵام شاری ئەستەمبوڵ لە دوای ساڵی ۲۰۰۷ زیاتر لە ۳,۷٥۰۰,۰۰۰ملیۆن کەس لە کوردی تیا نیشتە جێیەو بە شارێکی کوردی دەژمێردرێت ....؟...!.

هەوا ژمارەی دانیشتووانی تورکیا ٦٦,۱٥۰,۰۰۰ ملیۆن کەسە... لەو ژمارە دانشتووانەدا ، دانیشتووانی ڕەسەنی کورد زیاتر لە ۲۲,۰۰۰,۰۰۰ملیۆن کەسە لەو وولاتەدا .

کە لە گەڵ سەرەتای دامەزراندی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی تاکوو کۆتایی ئەم مێژوونامەیە کورد و خاکی کوردستان بە پێی پەیمانە جۆراو جۆرەکان لە نێوان هەردوو دەسەڵاتی فارسی و عوسمانی داگیر کراوە لە هەموو بوارە جیا جیاکان لە کێشووەرەکەدا .

رووبـەری خـاکی تورکیـا ٩١٢١ کیلـۆ مـەتر چـوار گۆشـەیە ، لـەو رووبـەر ٢١٢,٠٠٠هـەزار کیلـۆ مـەتر چـوار گۆشـە خکـی بـاکووری کوردسـتانی ژێـر دەسـتەو داگـیر کـراو بـەر لـە ٤٠٠ سـاڵ زیـاتر تـاکوو ئێـستا . هـەروا چـڕی دانیشتووانەکەی ، ٢٢٠ کەس لە یەك میل چوار گۆشـەدا ، هەروا نـژادەکانی ، تورك ٤٥٪ . کورد ٣٢٪ . نژادو ڕەگەزەکانی دیکەش ٢٠٪ . واتـە بە پێی ئەم ڕێژەیەدا تورك لەو وولاّتەدا کەمایەتیە . لەم وولاّتەدا .

تێبینی:- بۆ زانیاری زیاتر دەتوانی بگەڕێیتەوە سەر کتێبی ئینسکلۆپیدیای کوردستان و جیهان . لە دانانی عەلی کەندی ، لە بارەی مێژووی تورکیا.

١٩٢٤/٣/١٢ هەلبژاردنی پەرلەمانی ڕژێمی شانشینی ئێراق ، کە لەو پەرلەمانە ١٧ کورد نوونەرایەتی تێدا دەکرد . لەوانە – شێخ قادر، ئەحمەد تۆفیق بەگ ، سالح بـەگی نەختـەجی– بـەلاّم ڕۆلێکـی ئـەوتۆیان نـەبوو، بـۆ ئـەوەی بتـوانن بـە شێوەیەکی سەردەمیان مامەڵە بکەن لەپێناو بەرگری کردن و بەدەست هێنانی مافەکانی کورد لە باشووری کوردستان .

١٩٢٤/٣/١٨ بەیاننامـەی شانـشینی ئێـراق لـە بـارەی یاسـای دامەزرانـدنی – المجلـس التاسیسی العراقی– بلاو کرایەوە ، کە سێ دەسەلاّتی لەخۆ گرتبوو

١- پەسەند کردنی پەیمانی نێوان ئێراق و بەریتانیا.
٢- دانانی دەستووری شانشینی لە ئێراق .
٣- دانانی یاسای هەلبژاردن لە ئێراق .

١٩٢٤/٣/٢٤ ڕژێمی نوێی تورکیا بە سەرکردایەتی کەمال ئەتاتورك لەدوای دەستگیرکردنی شێخ عبدالقادر شێخ عوبێدوڵلای نەهری و هەڤالەکانی لە پارێزگـای دیاربەکر لە باکووری کوردستانی ژێردەسەلاّتی تورکیا .

الشيخ عبدالقادر النهري والدكتور كوچران – أورميه ۱۸۸۰

دوای ئـــەوەی کـــە بریـــاری دادگـــایی دەرکـــرا لـــە لایـــەن پیاوانی رژێمی تورك لـــە ســـێدارە دران ، ئـــەویش بـــە هـــۆی هەلوویـــــــستی بوێرانـــــــــەی کوردایـــەتیان لـــە هەرێمەکەدا.

١٩٢٤/٤/٢٠ فرۆکەیـــەکی جـــەنگی هێزەکـــانی ســـووپای بـــەریتانیا لـــە ئێـــراق لـــەکاتی هاتنەخوارەوەی لە سەر شارۆچکەی هەلەبجە لە باشووری کوردستان لە لایەن شۆڕشگێڕەکانی شارەکە تەقێندرایەوە لە ناوژەکەدا .

١٩٢٤/٤/٢٢ زاناو پێشەوای چینی کرێکارو جووتیارو هەژاران – لینین- کۆچی دوایی کرد ، ئەویش لە ئەنجامی بریندار بوونی بەگووللەیەکی ژەهراوی بەر لەچوار ساڵ پێش مردنی .
شایانی باسە لینین لە بنەماڵەیەکی ڕۆشنبیری شۆڕشگێڕ بووەو هەلگری بڕوانامەی یاسای هەبووە .
ڕابەرو دامەزرێنەری یەکەم دەوڵەتی سۆشیالیستی بووە لە جیهاندا .

لـــە دوای ســـاڵەکانی ١٩٢٠ یەکیـەتی سـۆڤیەت دامـەزرا ، ئەویش لە دوای سەرکەوتنی لەجـەنگی یەکـەمی جیهـان‌و لـــەدوای کۆچـــی لیـــنین... ســتالین جێگـەی گرتـەوە لـە ســـەر دەســـەڵاتی ســـۆڤیەت لەســـەر هـــەموو کاروبـــاری یەکیەتی سۆڤیەتدا .

١٩٢٤/٥/٤ بەرپابوونی شەڕلە نێوان تورکە دانیشتووانەکانی شاری کەرکوك لە باشووری کوردسـتان و ئاشـووریەکان لـەناو بـازاردا ، دوای ئـەوە شـەقامەکان‌و دوایـی پـەرەی سـەند بـۆ نـاو گەڕەکـەکان ، ئـەویش بـەفیتی سـیخوورەکانی رژێمـی تورکیـا ، دوای بـووە هـۆی شـەڕی نێـوان مەسـیحی‌و ئیسلام‌و بـە نانـەوەی ئاژاوەو ناکۆکی لە ناوەندەکانی پێك هاتەی نەتەوایەتی لـە شـاری کـەرکوك لـە هەرێمەکەدا.

١٩٢٤/٥/٤ دەرچوونی یەکـەم دراوی میسر بە نـاوی – ژونـەی میسـر – ی لـە دەوڵـەتی میسر بە سەر بەخۆیی شێوازی، کە ئـەم دراوە وێنـەی ئیدریس بـەگی لەسـەر بـوو تـاکوو رووخانـدنی رژێمـی شانـشین لـە میسر لـە سـاڵی ١٩٥٢. کـە دوا شـاش شـا فـاروق بـوو، کـە لـە نـەوەی محەمـەد عـەلی پاشـا بـوو بـەناوی بنەماڵەی خدێوی، کە لـە بنـەرەتا کـوورد بـوون و لـە باکووری کوردسـتان و لـە پارێزگای دیاربەکر لە باکووری کوردستان کۆچیان بەرەو میسر کردووە.

١٩٢٤/٥/٤ پێـشبڕکێی یاریـەکانی جـامی جیهـانی – ئۆلـەمپیات– لەپاریـسی پایتـەختی فەرەنسا ، ئەنجامدراو بەردەوام بوو تاکوو ٧/٢٧ ی هەمان ساڵ لە نێوان یاری زانانی وولاّتانی بەشدار بوو لە جیهاندا .

١٩٢٤/٥/١٩ گرێـدانی کـۆنگرەی شـاری قووسـتەنتینیەی تـورکی و، ئەسـتەمبۆڵی ئێـستا ، لەپێناو چارەسەرکردنی کێشەی وویلایەتی موسڵ ، لە باشووری کوردسـتان ، لە کاتی دەسەڵاتی عوسمـانی و ئێستا لـە ناوچکەدا ، پارێزگای موسـل کـە بـە خاوەنداریەتی خۆی دەزانی و تـاکوو ئێـستاش هەر بەو خەونە سەرشێتەیەدا دەناڵێنێ...!.

١٩٢٤/٥/٢٠ هێزەکانی سووپای بەریتانیا لە ئێراق بەشێووەیەکی دڕندانە بەیاننامەیـەکیان بـە سـەر ناوچـەکانی کوردسـتان ، بـە تایبـەتی لـە پارێزگـای سـلێمانی بـڵاو کردەوەو بڕیاری بۆردومان کردنی ناوچەکانی ژێردەسەڵاتی شێخ مـەحمودیان ڕاگەیاند لە باشووری کوردستاندا .

١٩٢٤/٥/٢٥ لـە ئـەنجامی بۆردومـان کردنـی شـاری سـلێمانی و هەڵەبجە لەلایـەن هێزەکـانی سـووپای ئاسمـانی بـەریتانیا ، کـە - ٧٠٠- هـاووڵاتی تیـا مـابوو لـە کـۆی ٢٠,٠٠٠ هەزار هاووڵاتی بە هۆی دەربەدەری و خۆڕاگری جەماوەری ناوچـەکە لە باشووری کوردستان.

١٩٢٤/٥/٣١ لـە ئاکـامی بـەردەوام بـوونی هێزەکـانی سـووپای بـەریتانیا لـە ئێـراق فڕۆکـە جەنگیـــەکان دوبـــارە شـــاری ســـلێمانی و دەووروبـــەری بۆردومـــان کـــرد لەباشووری کوردستان.

١٩٢٤/٦/٢ کۆچـــی دوایـــی نووســـەرو ڕۆمـــاننووس و چـــیرۆك نـــووس چـــیکۆ ســـلۆڤاکیای جـــاران و کۆمـاری چیکی ئێـستاو نـاوداری جیهـان - کۆلـۆنبی سـزا - ناسـراو بــە -فرانــز کافکــا -، بــەهۆی نەخۆشـیـەکی کووشـندەو لەســەر داوای خـــۆی لـــە گۆرســـتانی جوولەکەکان لە براگی پایتەخت

بەخاك سپێردراوە... شایانی باسکردنە کە فرانز کافکا لەساڵی ۱۸۸۳ لە شاری براگی پایتەختی کۆماری چیك لە بنەماڵەیەکی جوولەکە چاو بە جیهان هەڵدێنیّ لە وڵاتەکەیدا .

لە دوای مردنی هەردوو براکەی لەگەڵ سیّ خوشك ژیانی بەسەر دەبرد. دوای تەواوکردنی قۆناخەکانی خوێندن چووە کۆلێژی یاسا و لەو کۆلێژە بووە برادەری ماکسی برودی، کە بڵاوکاری چاپەمەنی بوو و لەگەڵ ئەودا فلۆبێرۆی گۆتەی خوێندووە... فرانز کافکا بروانامەی دکتۆرای لە یاسا دانان هێناوەو لە کۆمپانیای کارپێکردن دەستی بەکارکردن کرد، لە پێناو بەرەو باشبردنی باری ژیانی خێزانەکەی و خۆی... لە ساڵی ۱۹۱۲ لەپاڵ رۆمانی – ئەمەریکا – کە برۆدی برادەری بۆی تەواوکردبوو... لەهەمان کات چیرۆکی – بەدگۆران –ی بەناوبانگی بڵاوکردەوە.

بەڵام جەنگی یەکەمی جیهان خەونەکانی فرانزی لەگۆرنا بۆ کارکردن لە بواری رۆژنامەوانی لە وڵاتەکەیدا. لە ساڵی ۱۹۱۳ لە خزمەتی سەربازی بەخشرا نیشانکردنی فلیمی بۆ بەری هاورێی لەهەفتەیەك زیاتری نەخایاندو دوای ئەوە – دادگاییکردن– ی نووسی، دوای ئەوە لە ساڵی ۱۹۱۷ گەرایەوە بۆ نیشانکردنی بۆ بەرو نیشانەکانی کۆکەی خوێناوی لێدەرکەوت لە بەر ئەوە وازی لیّ هێناو بەمەبەستی شووکردن بوو بەیەکێکی دیکە... دوای ئەوە – قەلای – نووسی و لەکاتی هەڵچنینی بوو و نەیتوانی کارەکانی تەواو بکات تا ماڵئاوایی لە نووسەرو رۆمانووس و چیرۆکنووسان کرد لە چیك و جیهان.

۱۹۲٤/٦/۱۱ لە کۆبوونەوەی کۆمەڵەی گەلان گفتوگۆی هەمەلایەنە لەسەر کێشەی کوردو ویلایەتی موسڵ ئەنجامدرا.

۱۹۲٤/٦/۱٤ یەکەم دەستووری ئێراقی دامەزراوی شانشینی لەلایەن ئەنجوومەنی پێك هاتوو ئامادە کرا بۆ پەسەندکردن لە وڵاتەکەدا .

۱۹۲٤/۷/۱۰ بە هۆی نیازی شۆڤێنی عەرەب و دەسەڵاتی نوێی ئێراقی دورستکراو لەسەر خاکی باشووری کوردستان ، نوێنەرانی پەرلەمانی یەکەمی ئێراق بەزۆرینەی دەنگ بریاری دا ، بۆ ئەوەی کە باشووری کوردستان بەتەواوی بخرێتە سەر دەسەلاتی نوێی ئێراق.

١٩٢٤/٧/١٩ هێزەکانی سووپای بەریتانیا لەئێراق دووبارە پارێزگای سلێمانی بە تایبەتی شاری سلێمانی داگیر کردەوە ، بەهێزی لیفی و هێزی سووپای ئێراق ، کە یەکەم جار بوو فەوجێك بەناوی –موسا کازم– توانی بگاتە شاری سلێمانی و، بەر پرسی رامیاری بەریتانیا ی مەزن – لیچمەن– کرا بە لێپرسراوی کارگێڕی پارێزگای سلێمانی لەباشووری کوردستان.

١٩٢٤/٧/٢٥ سیاسەتمەداری نەمسا – ئەنگیلبرت دۆلفۆس– کووژرا ، کە لە ساڵی ١٨٩٢ لەدایك بووە لە وولآتەکەیدا .

١٩٢٤/٧/٣١ دەستگیرکردنی – خالید بەگ– لە گوندی شێروان لەگەڵ دوو هاوڕێی دیکەی ، کەدەکەوونە بۆسەی جەندرمەکانی تورکان ، ئەمەش لەکاتی گەڕانەوەیان بوو بۆ باکووری کوردستان ، لەپێناو دەست پێکردنەوەی شۆڕش ، دوای ئەوەی دەستگیر دەکرێن دەیان بەن بۆ پارێزگای دیاربەکرو لەوێ لە سێدارە دەدرێن لە شارەکەدا.

١٩٢٤/٨/١ جێ بەجێنەکردنی رێکەووتننامەی کۆنگرەی هاوبەش لە نێوان کوردو تورك لە لایەن تورك ، کە ئەمەش بووە هۆی خێرا بوونی جمووجۆڵی بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی کوردو بەرەو ڕەتکردنەوەی خواستەکانی تورك و وەستان دژی رژێمی کەمالیەکان لە باکووری کوردستانی ژێر دەسەلآتی رژێمی تورکیا.

١٩٢٤/٨/٦ حکوومەتی بەریتانیا داوای لە کۆمەڵەی گەلآن کرد . بەدانانی کێشەی سنووری لە نێوان ڕژێمی ئێراق و تورکیا ، لەکارەکانی خوولی /٣٠ی ئەنجوومەنی کۆمەلەی گەلآن و داوای لە لێژنەی دامەزراو کرد . کە ئەو کێشەیە چارەبکرێت ، کە لە نووێنەری سووید– برانتیگ– ونووێنەری ئەسپانیا– دیلیۆن – و نووێنەری ئۆرگوای – گوانی– کە خاکی باکووری کوردستانی ژێر دەسەلآتی تورکیاو باشووری کوردستانی لکێنراوبە دەسەلآتی ئێراقی شانشینی، زیاتر لە٢٩٦ هەزار کیلۆ مەتر چوار گۆشەی لەخۆگرتیە لە کێشووەرەکەدا .

١٩٢٤/٨/١٦ ئەندازیاری ڕامیاری و سەربازی و خاوەن کتابی – کورد ، تورك ، عەرەب– و ئەفسەری بەریتانی – س.ج–ئەدمۆنس– دانی بەوەنا .

کە لە کتێبەکەیداو کە لەم ڕۆژە بۆ یەکەم جار لەمێژوو هێزەکانی سووپای بەریتانیا قوومبەڵەی بەکێشی ٢٢٠ پاوەندی لە بۆردمان کردنی شاری سلێمان بەکارهێناوە لە هەرێمی باشووری کوردستان.

١٩٢٤/٨/١٨ بڵاوکردنەوەی یەکەم ژمارەی ڕۆژنامەی – ژینەوە– لەدوای هەڕەشەو گورەشەیەکی زۆری دەسەڵاتی شانشینی ئێراقو بەریتانیا لە باشووری کوردستان .

١٩٢٤/٨/٢٠ لە دوای وەرگرتنی هەر دوو پۆستی سەرەك وەزیرانو وەزیری بەرگری ، یاسین هاشمی ، پاشگەزی لەجێبەجێکردنی بەڵێنەکان کرد لە باشووری کوردستان .

دەستی کرد بەشاڵاو بردنە سەر هێزەکانی کورد ، لەرێگەی کاری سەربازیو فرۆکە جەنگیەکان ، بەپالپشتی هێزی سووپای بەریتانیا لە ئێراق.

١٩٢٤/٨/٣٠ کۆمەڵەی گەلان دەستی کرد بە لێکۆڵینەوە لەسەر کێشەی وویلایەتی مووسڵو باری کورد لە کوردستانو ژێر وویلایەتی مووسڵ لە هەرێمەکەدا .

١٩٢٤/٩/٣ لە پیناو یارمەتیدانی ڕژێمی شانشینی ئێراق ، دژی شۆڕشی شێخ مەحمود لە باشووری کوردستان ، ڕژێمی شای فارسی بە ٣٠٠ سەربازو ٧٠٠سووار

هێرشیان کردە سەر ناوچەی پشدەر ، لە ئەنجامی شەڕێکی توندو تیژ بووە هۆی کووژرانی دەیان سەربازو بەدیل گرتنی ١٥ سەربازو تۆپێك‌و لە ئاکام بە کشانەوەی هێزەکانی سووپای شای فارسی ، ئەویش لە رۆژهەڵاتی پارێزگای سلێمانی بۆ ناو سنووری وولاتەکەیدا.

١٩٢٤/٩/٣ سەرەتای دەست پێکردنی راپەرینی کورد بە سەر کردایەتی شێخ سەعیدی پیران دژی رژێمی تورکیا لە باکووری کوردستانی داگیر کراوی ژێر دەسەڵاتی رژێمی تورکیا.

١٩٢٤/٩/٣ ئەنجوومەنی کۆمەلەی گەلان لێژنەی سێ لایەنەی دامەزراند بۆ لێکۆلینەوە ، لە بارەی کێشەی کورد لە سەر خاکی کوردستان ، ئەویش لە دوا رۆژی چارەسەری مافە رەواکانی بە تایبەتی لەباشووری کوردستانی لکێنراو بە رژێمی شانشینی ئێراق لە هەرێمەکەدا .

١٩٢٤/٩/٢٨ کۆچی دوایی کەسایەتی ناودارو ئافرەتی لێهاتووی کورد خاتوو- عادیلە خانم - خانمی وەسمان پاشای عەشیرەتی جاف لەشاری سلێمانی لەهەرێمی باشووری کوردستان.

١٩٢٤/٩/٣٠ ئەنجوومەنی کۆمەڵەی گەلان لە تەك لێژنە سێ لایەنەکەیدا لێژنەیەکی تایبەت بە کێشەی کورد لە سەر وویلایەتی موسل پێك هێنا لە پێناو یەکلاکردنەوەی

کێشە هەڵوواسراوەکان لە هەرێمەکەدا .

١٩٢٤/١٠/١ بەهۆی نالە باری‌و ئاڵۆزی‌و بێ ئومێدی کورد لە باشووری کوردستان ڕێکخراوی- جەمعیەتی کوردستان - داوایەکی ئاراستەی کۆمەڵەی گەلان کرد ، ئەویش لە بارەی مافی چارەی کێشەی کورد لە هەرێمە داگیرکراوەکاندا.

١٩٢٤/١٠/٩ سەرکردەی کورد شێخ مەحمود لەگەڵ بەرپرسانی بەریتانیا لە ئێراق کەوتە گفتووگۆ کردن لە شارۆچکەی خورمال لەگەڵ - کۆرال والیس- بەڵام ئەو گفتووگۆیە سەرکەوتوو نەبوو ، ئەویش بە هۆی چەوتی رامیاریەتی بەریتانیا بەرامبەر بەکێشەی ڕەوای کورد لە باشووری کوردستانی لکێندراو بە ئێراقدا .

١٩٢٤/١٠/٢٧ لە شاری برۆکسلی پایتەختی شانشینی بەلژیکا ، ئەنجوومەنی کۆمەڵەی گەلان کۆبوونەوەی نا ئاسایی خۆی دەست پێکرد ، کە یەکەم کۆبوونەوە بوو لەبارەی سنوور ، بە تایبەتی لە سەر سنووری نێوان ڕژێمی شانشینی دامەزراو لە ئێراق‌و تورکیا لەسەر خاکی لەتکراوی کوردستان لەنێوان چوار دەووڵەت ونیوودا ، لە سەر خاکی کوردستان و لە کێشووەرەکەدا .

١٩٢٤/١٠/٢٩ لەسەر کێشەی دیاریکردنی سنوور لە نێوان ئێراق‌و تورکیا ئەنجوومەنی کۆمەڵەی گەلان دەستی بە لێکۆڵینەوە کرد لەگەڵ چاودێری کردنی باری بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی کورد لە کوردستان بەتایبەتی لەباشووری کوردستان.

١٩٢٤/١١/١٣ ئەنجوومـەنی کۆمەڵـەی گـەلان دووبـارە لیژنـەی پێداچـوونەوەی پێکهێنـا لـە پێناو چارەکردنی مافو کێشەی کورد ، کە نووێنـەری بەریتانیاو تورکیاو ، هـەروا بەغداش بەشـداری تێداکرد بـەهۆی بـوونی لیژنەکـە لـە شـاری بەغـدای پایتەختی ئێراق لەوکاتدا .

١٩٢٤/١١/١٦ وەزیری فرۆکەوانی هێزەکانی سووپای بـەریتانیا- لۆرد تۆمسۆن- سـەردانی شاری سلێمانی لە باشووری کوردستان کرد ، ئەویش بـە مەبەسـتی سـەردانی دامو دەزگاکـانی سـەربەخۆیانو ئاگـادار کردنـەوەیان لەبەرامبـەر بزووتنـەوەی شێخ مەحمودی حەفید لەناوچەکەدا .

١٩٢٤/١١/١٨ گرێدانی کۆبوونەوە لـە شـاری لەنـدەنی پایتـەختی بـەریتانیا بـە سـەرۆکایەتی سەرەك وەزیرانی بەریتانیا- رەمزی مەکدۆناڵد- بە ئامـادە بـوونی مەنـدووبی سامی بـەریتانیا لـە میسر ژەنـەراڵ- اللینی- و دادوەری گـشتی بـەریتانیا لـە سـوودان - سـتاك - ئـەویش بـە رێکـەووتن لەسـەر ئـەوەی ، کـە هێزەاکنـی هەمـەجۆرەی میـسر لـە سـوودان دەرچێتو بـە پێکهێنـانی هێزێکـی بـەرگری لەسوودان ، بەتایبەتی نەك بەبەشداری لایەنومیسریەکان .
هەروا لـە دوای گەرانـەوەی دادوەری گشتی بەریتانییا لە سوودان بۆ شـاری قاهرەی پایتـەختی میسر ، لـە رێگـا لەلایـەن چەکدارانی توونـدرەوی میـسری تـیرۆر کـراو حکوومـەتی بـەریتانیا ئاگـاداری دەسـەڵاتی میـسری کـرد ، بـە کێشانەوەی هێزەکانی لە سوودانو دانی ٧٥٠ هەزار جوونـەی ، وەك خـەرجی بۆ هێزی بەرگری لەسووادن ، ئەویش بەهۆی ئەو کارە سـەعد زەغلـول دەسـتی لـە پۆسـتەکەی هـەلگرتو ئەحمـەد زەیـد پۆستی وەزارەتەکـەی گرتـە دەسـتو مەرجەکانی حکوومەتی بەریتانیای جێبەجێکرد ، لە جێگەی دادوەری گشتی - ستاك - و -جفری ئارچەر- بە دادوەری گشتی بەریتانیا لە سوودان دانرا.

١٩٢٤/١٢/١٦ ئەنجوومـــەنی کۆمەڵـــەی گـــەلان رەزامەنـــدی خـــۆی راگەیانـــد بـــە بریـــاری دیاریکردنی سنوور لە نێوان ئێراقو تورکیا لەسەر باکوورو باشـووری خـاکی کوردستان بەپێی هێلی برۆکسل.,

١٩٢٤/١٢/٢٠لــە دوای دامەزرانــدنی دەووڵەتی ئێراق و دیاری کردنـــی ســـنووری دەووڵەتەکــە ، دوور لــە خواستو ویستی گەلانی ئێـراقو لـە سـەر خـاکی گـەلان ، بـە تایبـەتی لـە باشووری کوردستان ، کە ئالاّی رژێمی شانشینی ئێراق لـە شاری کـەرکوك بـەرز نـەکرابووەوە تـا تـا ئـەو کاتـەی کـە شانشینی ئێـراق سـەردانی شـاری کـەرکوکی کـرد و لـەم ڕۆژەدا ئالاّی ئێـراق لـە سـەر دام و دەزگاکـانی میری لـە شاری کەرکوك بەرز کرایەوە لە هەرێمەکەدا .

١٩٢٤/١٢/٢٠خـاتوو فریـدریکاما برۆێکێـر لـە شـاری ڤیـەنای پایتـەختی نەمسا چـاوی بـە جیهـان هەڵـدێنیٚ... ئـەم شـاعیرو نووسـەرو کەسـایەتیە لەگـەڵ ئـەوەی نـەیتوانیووە لـە وادەی خـۆی بـەبیٚ پـچران قۆناخـەکانی خوێنـدنی تـەواو بکـات... بـەلاّم هـەر زوو بـەهرەی ئـەدەبی لـیٚ بـەدیار دەکـەویٚ، بـە توانایـەکی سـەرنج راکێش و هـەر لـە تەمـەنی ١٥ ساڵیدا نۆبـەرەی یەکـەم نووسـینەکانی خۆی لە گۆڤارە بەناوبانگەکەی نەمسا Der plan ی ئەدەبی بلاّودەکاتەوە.

کە لـەو کاتـەدا نەمـسا گـەورە نووسـەرەکانی لەخۆگرتبوو وەك فرانزکافکاو برتۆلـدو بریخـت و ئاریـك فریـد و سـارتەرو کـامۆو ئـەراگۆنی، و بـەدەیا کەسایەتی دیکەی بەناوبانگ.

دوای وەسـتانی جـەنگی دووەمـی جیهـان کۆمەڵـە بابـەتێکی لـەنێوو شـعرو پەخـشان لـەم دەزگایـەدا بـۆ دەکرێـت.بـە پـەرتووکێك لـە سـاڵی١٩٥٠ تاقیکردنـەوەی دەرەکـی پـۆلی شەشـەم و دواناوەنـدی ئـەنجام دەداو دوای سەرکەووتنی لە زانکۆ وەردەگیرێت و لەتەك مێـژووی هونەرو زمـان و ئـەدەبی ئـەلمانی تێـر دەخـوێنیٚ... خـاتوو مایرۆیکلێرلـە سـاڵی١٩٤٥ بەشـداری لـە دامەزرانـدنی بازنـەی – کۆمەڵـەی ڤیـەننا – دەکـات. کـە بـە هـەوڵی ئارتمـانی شاعیر ئەم کۆمەڵەیە لەیانەی هونەر جیا دەبێتەوەو چەندان شاعیری بەتواناش دێنە ناوی لەوانە : فریدریك ئافلاینتەر – کۆتراویابەر – گیرهارد – رۆبم.

خاتوو مایرۆیکلێر تاکوو ئێستا زیاتر لـه ٥٠ بەرهـەمی هەیـه لـه نێوان شیعرو پەخشانەو ڕۆمان و دەقی شانۆیی و پەرتووکی تایبەت بەجیهانی منداڵان. بە هـۆی کـارە سـەرکەوتووەکانی خـاتوو مـایرۆیکلێر چـەندین خـەڵاتی بەدەست هێنـاوە لەوانـە خـەڵاتی وولاتـی نەمـسا لـه سـاڵی ١٩٨٢ و خـەڵاتی فریـدریك هولـدرالین لـه سـاڵی ١٩٩٣ و بـەردەوام بـوونی لـه نووسـینه هەمەلایەنـەکانی بەسەرکەوتووانەدا.

## ١٩٢٥

١٩٢٥/١/١٦ ئەنجوومەنی کۆمەڵەی گەلان لە دوای تـەواو کردنـی لێکۆلینـەوەی بەرژەوەنـدار بڕیاریدا ، کە وویلایەتی موسل بە فەرمی و بە تـەواوی بخرێتـە ژێـر دەسـەڵاتی شانشینی نوێی ئێراقی دورستکراو لەسەر خاکی کوردو خـاکی کوردسـتان لـە باشووری کوردستان.

١٩٢٥ /٢/٨ هونەرمەنـدو دەرهێنـەری سـینەمای ئەمـەریکی –جـاك لیمـۆن– لـە شـاری بۆسـتنی وویلایەتـە یـەکگرتووەکانی ئەمـەریکا چـاوی بـە جیهـان هـەلهێناوەو ئەسـتێرەیەکی کۆمیـدی سـینەمایی نـاوداری جیهـانی بـووە. لـە بـواری دەر هێنەری سینەماییدا

١٩٢٥/٢/٨ دەسـت پێکردنـی شۆڕشـی کورد لە باکووری کوردستانی داگیر کـراوی ژێـر دەسـەڵاتی ڕژێمی تورکیا . لەلایـەن سـەرکردەو رابـەری کورد شێخ سەعیدو هەڤاڵانی لـە پێنـاو بـەرگری کـردن لـە مافە ڕەواکانی گەلی کوردستان لە هەرێمەکەدا.

١٩٢٥/٢/١٠ ڕزگـار کردنـی شـاری لیـچە لـە بـاکووری کوردسـتان لەلایـەن شۆڕشـگێڕە چەکدارەکانی کـورد ، بـە سـەرکردایەتی شـێخ سـەعیدی پیران و هـەروا ڕزگـار کردنی شاری گەنج لە هەرێمەکەدا .

١٩٢٥/٢/١٣ یەکەم شەڕی چەکداری لە نێوان لایەنگرانی شێخ سەعیدی پیران و هێزەکـانی

سووپای رژێمی تورك دەستی پێکرد لە باکووری کوردستانی داگیر کراوی ژێر دەسەلاتی تورکیا، کە ئەمەش بووە هۆی بەهێزبوون و بەرزبوونەوەی جووڵانەوەی رزگاری گەلی کوردستان لە بواری نەتەوەیی و نیشتیمانی، هەر چەند کەسایەتیەکی ئاینی لایەنی بالا دەستر بوو لە ناو جووڵانەوەی رزگاری کورد، کە ئەمەش هۆکاری زوویی بوو بە لە ناوبردنی ئەم شۆرشەدا لە باکووری کوردستان و شێووەو شێوازی دیکەش لە باشووری کوردستان.

١٩٢٥/٢/١٤ دەرکەووتنی کەسایەتی ناوداری ئێراق و کورد – میرزا تۆفیق قەزار– کە مامی سەعید ئەدیب قەزازە.
بۆ یەکەم جار لە هەڵبژاردەی کۆمەڵەی بەرگری نیشتمانی ئەم مرۆڤە لە سلێمانی دەرکەووت، کە ئەو کۆمەڵەیە شان بەشانی کۆمەڵەی بەرگری نیشتمانی بوو لەموسڵ لە پێناو بەرگری کردن لە داواکانی کۆماری تورکیا لە ویلایەتی موسڵی عوسماندا.
هەروا ناوی بۆ دووەم جار بەرزبووەوە لەمانگی/٨/١٩٣٠ لەگەڵ کۆمەڵێك لەپیاوە ناودارەکانی شاری سلێمانی بەداواکردنیان بە ماف نەتەوەیی کورد، بەپێی بریاری کۆمەڵەی گەلان. ئەویش لە کاتی گفتووگۆی گەرمی لەگەڵ سەرەك وەزیرانی ئێراق جەعفەر عەسکەری لەشاری سلێمانی لە باشووری کوردستاندا.

١٩٢٥/٢/١٤ لە ئاکامی راپەرینەکانی کورد لە باکووری کوردستان بە فراوان بوونی بە سەرکردایەتی شێخ سەعیدی پیران و لەو ناوەندە راپەرێنە، شێخ شاری – دارهینی– کردە پایتەختی باکووری کوردستان.

١٩٢٥/٢/١٤ دامەزرانـدنی ئەنجوومــەنی کۆمەڵــەی بــەرگری نیـشتمانی کـورد لەشــاری سلێمانی لە باشووری کوردستان لەلایەن ئەحمەد بەگ تۆفیق لە هەرێمەکەدا .

١٩٢٥/٢/١٦ ئەفسەری پایەبەرزو کەسایەتی ناوداری کورد مامۆستا – ئەمین فەیزی بەگ – کۆچی دوایـی کردووە ، کە ساڵی ١٨٦٠ لە شاری سلێمانی لە باشووری کوردستان لە دایك بووە لە شارەکەدا .

١٩٢٥/٢/٢١ لە دایك بوونی دەرهێنـەری سینەمایی ناوداری جیهانی– سام بەکینا– لە ویلایـەتی کالیفۆرنیـا لـە ئەمـەریکا ، لـە بنەماڵەیـەکی رۆشـنبیری تێکـەڵاو لەهندی سوورو مەکسیکی ، کە لەخوێندندا دەگاتە کۆلێژی یاسا.

١٩٢٥/٢/٢٤ بـە هـۆی هەڵگیرسـانی شـەڕ لـە نێـوان شۆڕشـگێڕانی شـێخ سـەعیدی پـیران و هێزەکـانی سـووپای تورکیـا – جـەمیل پاشـا زادەو، دکتـۆر فوئـاد– دەسـتگیر کران ، هەر لەو شەڕەدا لـە شـاری – ئـەلازاخ – رزگـار کـراو دەسـەڵاتی تورکیا بڕیاری یاسای عوورفی لە سەر باکووری کوردستان ڕاگەیاند لە ناوچەکەدا .

لـە ١٩٢٥/٢/٢٥ ئەنجوومـەنی نیـشتیمانی گـەورەی تورکیـاو لـە ڕۆژی ٢/٢٦ شۆڕشگێرە کوردەکان بەسەرکردایەتی شێخ سـەعید دەسـتیان بە سـەر شـاری خەربووت داگرت. ئەویش بەراگەیاندنی باری ناکاوی لـەو پارێزگایانـەی کە شۆڕشـی تیـا بـەر پاکرابوو لـە پارێزگاکـانی – مـۆش – دیرسـیم – مـاردین – ئۆرفە – سبوورك – بەدلیس – سیرت – وان –هەکاری – ئەرگانی – ئـەرزەرۆم – دیاربـەکر – مەلاتیـە – بـۆ مـاوەی یـەك مـانگ و دەکـرێ درێـژ بکرێتـەوە، لەهەمان کات پارتی گەلی کۆماری هەڵووەشێندرایەوە.
لـە هـەمان کـات یاسـای ژمـارە /٥٥٦ ی پەسـندکرد بەقەدەخـەکردنی هـەموو کۆمەڵــەکان و ســەربەخۆیی ئــایین بــەنیازی رامیــاری لـــە تورکیــادا.
سەرچاوە :– لازاریف المسأله الکردیه ١٩٢٣ – ١٩٤٥ چاپی یەکەم هەولێر /٢٠٠٧.

١٩٢٥/٢/٢٥ لە کۆبوونـەوەی ئەنجوومـەنی گـشتی پەرلـەمانی تورکیـاو ، بـە یـەك دەنـگ بـە بڕیــاری ژمــارە /٥٥٦ بــۆ ســزادانی شــێخ ســەعیدی پــیران و شۆڕشــگێرە چەکدارەکانی کورد لەباکووری کوردستان ڕاگەیاند.

١٩٢٥/٢/٢٥ سەرەك وەزیرانی بەریتانیا – لوید جۆرج– لە دانیشتنی ئەنجوومەنی گشتی بەریتانیا رایگەیاندو ووتی:–
کورد مافی چارەنووسی خۆی هەیە لەسەر خاکی دێرینی خۆی وەك گەلانی دیکە لە هەرێم و ناوچەوجیهاندا.

١٩٢٥/٣/٣ نووێنەری تورکیا لە بەردەوامی گفتووگۆیەکانی ئەنجوومەنی کۆمەڵەی گەلان– عسمەت پاشا ئەنوونوو– پۆستی سەرەك وەزیرانی ڕژێمی تورکیای گرتە دەست ، کە دووژمنی سەرەکی بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی کوردو کوردستان بوو ، بەتایبەتی لە باکووری کوردستاندا.

١٩٢٥/٣/٤ حکوومەتی تورکیا بەسەرکردایەتی – عسمەت پاشا – ئەنینوو – بە دامەزراندنی دوو دادگای سەربەخۆ لە شاری ئەنگرە کە دەسەڵاتەکانی سنووردار بوو، بەڵام لە دیاربەکر بێ سنووردار بوو.
ئەمەش لەدوای دەست لەکارکێشانەوەی عەلی فەتحی بەگ بوو لە پۆستی سەرەك وەزیرانی تورکیا... کە ئەمەش یەکەم کاری بوو لەدەسەڵاتەکەیدا کە دۆستی نزیکی دامەزرێنەری تورکیا مستەفا کەمال ئەتاتورك بوو. ئەم دادگایانە بەدادگای ناکاوی دانرابوو، کە هەموو دەسەڵاتێکی هەبوو هەتا لەسێدارەدانی بەرامبەر بە سەرپێچکەرانی دژ بەرژێمی تورکیا... ئەم دادگایانەش لە

١٩٢٧/٣/٢ هەڵووەشێندرایەوەو دادگای – یاسای پاراستنی رژێم – جێگەی گرتەوە بەهەمان دەسەڵاتی زیاتر و بۆماوەی دوو ساڵ لەو پارێزگا کوردیانەی باکووری کوردستان.

سەرچاوە :–لازاریف – المسالة الكردية ١٩٢٣ – ١٩٤٥ چاپی یەکەم /٢٠٠٧ هەولێر.

١٩٢٥/٣/٧ بە هۆی ئاڵۆزیو نا لە باری باری باکووری کوردستان ، شێخ سەعیدی پیران بەردەوامی شۆرشی گەلی کوردستانی لە هەرێمەکەدا راگەیاند ، ئەویش لەپێناو بەدی هێنانی مافەکانی کوردو رزگار بوونی لەژێر دەسەڵاتی رژێمی تورکیا.

١٩٢٥/٣/١٠ بڵاوکردنەوەی یەکەم ژمارەی گۆڤاری کوردستان لە شاری سلێمانی لە هەرێمی باشووری کوردستان.

١٩٢٥/٣/١٠ رزگارکردنی ناوچەکانی سلێڤانو هازرو ئارگاوەو جوڵەمێرگ ، لە لایەن هێزەکانی شێخ سەعیدی پیران لەباکووری کوردستان لە ژێر دەسەڵاتی هێزەکانی سووپای رژێمی تورکیا.

١٩٢٥/٣/١١ بڵاوکردنەوەی یەکەم ژمارەی گۆڤاری –دیاری کوردستان– لەشاری بەغدای پایتەختی ئێراق.

١٩٢٥/٣/١١ تیمێکی چەکداری سەر بە رژێمی تورکیا چوونە ناو ریزەکانی هێزی چەکدارانی شێخ سەعیدی پیران لە باکووری کوردستان.

١٩٢٥/٣/١٤ کومپانیای–I.P.C– توانی بگاتە رێکەوتن بە بەکار هێنانی مافی خۆی بە پێی گرێبەستی ئیمتیازەکانی تایبەت بە گەران بە دوای چاوگە نەوتیەکان لە ناوچەی پارێزگای کەرکوك لە باشووری کوردستان – بابە گورگور – و لە دوای

کۆتایی ماوەی ئەو گرێبەستە کە کومپانیاکانی – i. p.c – توانی ٢٤ جێگەی بەرهـەم هێنـانی دیـاریکراو ئـەنجام بـدات بـە پێـی ئـەو گرێبەسـتە لـە رووبـەری نزیکەی ٢٤ کیلۆمەتر چوارگۆشە.

واتە کێلگە نەوتیەکانی پارێزگای کەرکوك و خانەقین و کەندیناوەو رۆژهەڵاتی شـاری موسـل وایـان کـرد کـە کـورد بـە ئامـانجی خـۆی نـەگات بـە دامەزرانـدنی دەووڵـتێکـی کـوردی لـە باشـووری کوردسـتان، بـە پێـی بریارەکـانی کۆمەڵـەی گەلاّن و پەیمانی سیڤەر لـە سـاڵی ١٩٢٠ و رێکەووتنـە هەمەلایەنـەکانی نێـوان رژێمی شانشینی نوێی ئێراق و بەریتانیا.

ئـا لێـرەدا کـوردو سـەرکردایەتی کـورد لـەو کـات درکیـان بـەو زانیاریانـە نـــەدەکرد بـــە هـــۆی زۆری کێـــشەی نێـــوان دەســـەڵاتدارانی بـــەریتانیاو ســـەرکردایەتی کـــورد لـــە لـــەو کـــات و پاراســـتنی بەرژەوەنـــدی تایبـــەتی سەرکردایەتی کورد لە دەسەڵات و ســـــاماندا.

گـەرنا بـار لـە باربوو بـۆ دامەزرانـدنی دەسـەڵاتێکی کـورد لـە سـەر داواکـانی حکوومـەتی بـەریتانیاو کۆمەڵـەی گـەلاّن، بـە پێـی رێکەووتنـەکانی نێـوان حکوومـــەتی ئێـــراق و بـــەریتانیا، بـــە دامەزرانـــدنی دەووڵـــەتی کـــوردی لـــە چوارچێووەی سنووری دیاریکراوی ئێراقی بە زۆر دروستکراو لـە سـەر خـاکی کوردسـتان.

سەرچاوە:– دراسات جغرافية الملنية حول الشرق الاوسط– چاپی یەکەم /١٩٨٣ .

١٩٢٥/٣/٢٠ سـەرکردەی کـورد شـێخ مـەحمود بروسـکەیەکی داواکـاری مـافی گـەلی کـوردی لەباشـــووری کوردســـتان ، ئاراســـتەی ســـەرەك وەزیرانـــی ئێـــران و بـــاڵوێزی ئەمەریکاو باڵوێزی تورکیا و باڵوێزی رووسیاو باڵوێزی فەرنسا کـرد لـەتارانی پایتەختی ئێران.

١٩٢٥/٣/٢١ راگەیانـدنی یەکـەم دەسـتووری شانـشینی و رژێمـی شانـشینی لـە ئێراقـی دورستکراو لەسەر خاکی باشووری کوردستان.

١٩٢٥/٣/٢١ راپەرینـەکانی کـورد لـە باکووری کوردسـتان بەردەوام بـوو بـە بەرزبوونـەوەو هـەنگاو نـانی بـەرەو پێـشەوە ، هـەر بـەو هۆکـارە شـێخ سـەعیدی پـیران سەربەخۆیی کوردستـانی راگەیاند ، بە کردنـی شـاری دیاربـەکر بەپایتـەختی دەسەڵاتی کورد لە باکووری کوردستان .

سەرهلدانا شێخ سەعید، مەحکومێن پێشین ل بەر سێپێیان، جێ: دیاربەکر، سال: ە
سێ وێنەیەی پێشووی شێخ سەعید و هاوەڵانی سەعید ئایدۆکموش لەمزایەدەیەکی تو
ەتەوەو "مالمیسانژ" لەوی خواستۆتەوە.

۱۹۲٥/٤/۳ کـار بـەکاری کاتـژمێری هاوینـە کـرا لـە تـەواوی بـەریتانیا ، کـە ئـەو ڕۆژە ڕێکەووتی ڕۆژی جەژنی فەسیحی مەسیحیەکان بوو لەجیهاندا.

۱۹۲٥/٤/۱٥ کۆچی دوایی هونەرمەندی شێووەکاری ئەمـەریکی –جۆن سینگەر سارجنت –، لەشاری لەندەنی پایتـەختی بەریتانیا ، بەبێ ئەوەی ژن و منـداڵ لـە دوای خۆیدا بەجێ بهێلێ ، جگە لەخۆشەویستی و ڕێز گرتنـی دەووروبـەری نەبێلـە وولاّتەکەدا .

شایانی باسـە کـە سـارجنت لە۱۸٥٦/۱/۱۲ لـە شـاری فرورەنسای ئیتاڵیا لـە

دایك بووه ، ئەویش لە دایك وباوکێکی رەسەنی وویلایەتەکانی ئەمەریکی .. سینگەر سارجنت دیارترین هونەرمەندی شێووەکاری ئەمەریکی سەدەی نۆزدەم بووه ، کە لە سەردەمی خۆیدا پرۆترێت کیشێکی بێ هاوتا بووه لەجیهاندا.

١٩٢٥/٤/١٥ بە هۆی کاردانەوەی کاریگەری شۆرشی کورد لە سەر باری دەسەلاتی تورك لە باکووری کوردستان ، رژێمی تورکیا لە شاری بەتلیس چوار سەرکردەی کوردی لەسێدارەدا ، کە دوویان – یوسف زەیاو سەرهەنگ – بوون ، لەهەمان کات هەولی دەستگیر کردنی شێخ سەعیدی پیران بەردەوام بوو. لەلایەن رژێمی تورکیا.

١٩٢٥/٤/١٨ لە ئەنجامی بەردەوامی شەرلە نێوان چەکدارانی کورد و هێزەکانی سووپای ئێراق ، شۆرشگێرە چەکدارەکانی ئێزیدی لەناوچەی سنجار لە باشووری کوردستان ، توانیان فرۆکەیەکی جەنگی سووپای رژێمی شانشینی لە ئێراق بخەنە خوارەوە لەناوچەکەدا .

١٩٢٥/٤/٢٤ شۆرشە مەزنەکەی شاری ئامەد – دیاربەکر– کۆتایی هات لەباکووری کوردستانی داگیر کراوی ژێر دەسەلاتی رژێمی تورکیا ، لە ئەنجامی خیانەت کردن ناپاکی – قاسم جیرۆ– و جاشە کوردە خۆ فرۆشەکان شۆرشەکە بەرەو توانەوە هەنگاوینا لە هەرێمەکەدا.

١٩٢٥/٤/٢٧ لە دوای کۆتایی هاتنی شۆرش و خیانەتی قاسم جیرۆدا لە گەل لایەنگرەکانیدا ، شێخ سەعیدی پیران دەستگیرکرا لەگەل ٥٦ لە هەڤالەکان و کەسایەتی ناوداری دیکە لە شۆرشگێری نەتەوەیی کورد لە باکووری کوردستان.

١٩٢٥/٥/٢ هێزەکانی سووپای ئێراق و بەریتانیا بەسەرکردایەتی – دبسی و یاسین هاشمی– لە کۆنگرەیەکی هاوبەشدا لەشاری کەرکوك ، ئەویش لە پێناو دارشتنی پیلان بۆ لەناو بردنی شێخ مەحمودی حەفید ئەنجامدرا ، لە باشووری کوردستان .

١٩٢٥/٥/٤ سەرکردەی کورد شیخ سەعیدی پیران بەیاننامەیەکی بلاو کردەوە ، کە ئەو کات فەرەنسا سووپای لەژێر دەست دابوولە ناوچەکە ، لە دوای شکاندنی شۆرشگێران و گەرانەوەیان بۆ وارتوو، لە باشووری کوردستان ژەندرمەکانی تورك هەر دێیەکیان بکەوتایە بەر دەست دەیان سووتاند لە هەرێمەکەدا .

١٩٢٥/٥/١٣ كۆماری توركمەنستان وەك دەووڵەت لەناو سنووری نوێی یەكیەتی سۆڤیەت پێك هێنرا ، كە بەر لەو مێژوو وولاتێك نەبوو بەناوی توركمەنستان ، تەنیا هەرێمێكی زۆرینەی دانیشتووانی تورك نەبێ لە ناوچەو كێشووەرەكەدا ...؟..!.

١٩٢٥/٥/٢٠ زاناو كیمیاناسی بەناوبانگی جیهانی – دكتۆر داڤید وارن– لە باكووری ئۆستراليا چاوی بەجیهان هەڵهێناوە... لە شارەكانی – سیدنی ولاوكۆستن قۆناخەكانی خوێندنی تەواوكردووە... هەروا لە زانكۆی سیدنی كۆلێژی زانستی تەواوكردوە بەپلەی شەرەف.

دوای تەواوكردنی قۆناخەكانی خوێندن وەك پرۆفیسۆرێك وانەی كیمیای ووتۆتەوە... لە ساڵی ١٩٥٠ وەك كیمیازانێك لەبواری سووتەمەنی رۆكێتدا لە – وۆمیرا – لە باشووری ئوستراليا كاری كردووە... لە ساڵی ١٩٥٣ لە تاقیگەی تووێژینەوەی فرۆكەوانی كاری كردووە... ئەم مرۆڤە بوو لە ساڵی ١٩٥٨ بۆ یەكەم جار... سندوقی رەشی پراكتیزی جیهانی دروستكرد.

لە ساڵی ٢٠٠٢ دا پاداشتی – Ao – ی فرۆكەوانی ئوسترالیای پێ بەخشرا. جێگەی باسكردنە كە سندووقە رەشەكە بریتیە لە دوو سندووقی – سوور– یا – پرتەقاڵی – لە رووخساری دەرەوەیان هاوشێوەن و لە پێك هاتەی ناوەوەیان جیاوازن... درێژەی هەر یەكێكیان ٥٠ سم و پانیان ١٢،٥ سم و بەرزیشیان ١٧،٥ سم... كە دەكەونە كۆتایی كلكی فرۆكەكەدا .

١– سندووقی یەكەم كارەكەی بریتیە لە تۆماركردنی زانیاری ژمارەیی و بەها فیزیاییەكانی وەك – كات , خێرایی , ئاراستەی فرین.

٢– سندوقی دەنگەكانی وەك – گفتووگۆی نێوان دەستەی فرۆكەوانی و مشتوومرەكان و هاواری فریاكەووتن... لە سندووقەكەش زیاتر لە ٣٠٠ جۆرە زانیاری لە سەر گشتی فرۆكەكە تۆماردەكات، كە بریتین لە خێرایی باو بەرزی و پێوانەی خێرایی ستوونی و ئاسۆیی و پلەكانی لادانی فرۆكەكەو پلەی گەرمی دەرەوەی فرۆكەكەو بارودۆخی ناووخۆو دەرەوەی فرۆكەكە لە ئاسماندا.

ئەم سندووقانەش بۆ ماوەی ٣٠ خوولەك بەرگری گەرمی دەگرن گەر پلەی گەرمی ١١٠٠ پلەی سەدی بێ.

هەروا بۆ ماوەی ۳۰ رۆژ بەردەوام نیشانەی – سیگنالی – سەروبیستن و لەرە لەری رووناکی بەرزی – ٣٧,٤ کیلۆ هێرتزی دەنێرێت، کە لە ناو بەفرو لە دووری دەیان کیلۆمەترو لە قووڵایی ۲۰۰۰۰ پێی ژێر ئاوەوە هەستیان پێدەکرێت و دەناسرێنەوە. هەروا تۆمارێکی تۆمارکردنی زانیاری تیایە کە پانیەکەی ۷ سم و توانای ۲۵ کاتژمێر تۆمارکردنی هەموو گفتووگۆو کێشەو گرفت و رووداوێکی هەیە. لە کاتی کارکردنی فرۆکە لە هەلسان و تا نیشتنەوەی لە سە زەوییدا.

١٩٢٥/٥/٢٤ رژێمی تورکیا دووبارە بەردەوام بوو لە هێرش کردنە سەر شۆرشگێرانی کورد لە باکووری کوردستانی داگیر کراوی لە ژێر دەسەلاتەکیدا ، سەرەرای بەرەو توانەوەی شۆرشەکە بەهۆی دەستگیرکردنی شێخ سەعیدو هەڤالانی لە هەرێمەکەودا ، بەهۆی خیانەتکردنی کوردە خۆفرۆشەکان لە پێناو بەرژەوەندی تایبەتیان لە گەڵ رژێمی تورکیا .

١٩٢٥/٦/٢٣ دامەزراندنی کۆمەلەی کورد لەشاری ئەستانە لە باکووری کوردستان بە ناوی – کوردستان تەعالی جەمعیەتی– لە هەرێمەکەدا .

١٩٢٥/٦/٢٩ دادگای رژێمی تورك لە پارێزگای دیاربەکر، لە باکووری کوردستان بریاری دادگاییکردنی شێخ سەعیدو هەڤاڵەکانی راگەیاند بە لە سێدارەدانی سەرکردە شۆرشگێرە کوردەکان ، کە سەرۆکی دادگا چەند خاڵێکی لە بریارەکە خوێندەوە بۆ شۆرشگێران .

لە کاتی خوێندنەوەی بریارەکە گووتی:–

هەندێکتان هانی کۆمەلانی خەلکی دەدەن لە پێناو بەرژەوەندی کەسی و ، هەندێکیشتان دژایەتی کردنی رژێمتان کردووە لەرێگەی کاری رامیاری بە پالپشتی بێگانەو هەمووتان لەسەر یەك خاڵ کۆکن ، کە ئەویش دامەزراندنی کوردستانی سەربەخۆیەو ئێستاش سزای خوێنرشتنەکانی خۆتان وەردەگرن لە لایەن دادگای تورکیادا .

١٩٢٥/٦/٣٠ پێشەواو رابەری کورد لە باکووری کوردستان شێخ سەعیدی پیران لە سێدارە درا لەلایەن رژێمی تورکیا لەگەڵ ٤٦ هەڤالی لە ماوەی دوو کاتژمێر... کە بووە هۆی پەلاماردانی تەواوی باکووری کوردستان بە نانەوەی ترس و تۆقاندنی جەماوەری شۆرشگێری کورد. بە تایبەتی لە هەردوو بواری نەتەوەیی و نیشتمانیدا .

جێگەی ئاماژە پێکردنە کە شێخ سەعیدی پیران ناوی تەواوی – شێخ سەعید شێخ مەحمودی شێخ عەلی – یەو لە ساڵی ١٨٦٥ لە قەزای بالۆ لە وویلایەتی – ئەلازخ – لە باکووری کوردستان چاوی بە جیهان هەڵهێناوە لە هەرێمەکەدا.

هەروا شێخ سەعید خوێندنی لە سەر دەستی باوکی و لە لایەی هەندێ لە مۆریدەکانی باوکی تەواو کردووە ، دوای ئەوە بنەماکانی شەریعەت و مێژووی ئیسلامی خوێندووە... دوای مردنی باوکی رابەری تەریقەتی بۆ گۆزراوەتەوە ... هەروا لە باوکیەوە بووە رابەری تەریقەتی نەقشەبەندی لە – بالۆ – و ژمارەی مۆریدەکانی گەیشتۆتە دەیان هەزار کەس لە هەرێمەکەو کوردستاندا .

کە لە نێوانیاندا چەند تورکێکی تیا بووە ... بەڵام ئەوانی دیکە هەر هەموویان کورد بوونە . شێخ سەعید سەرەڕای شێخایەتی زانایەکی مەزن و لێهاتوو بووەو باوەری بە خوورافیات نەبووە و هەرگیز خۆی بە پیرۆز نەزانیووە لە بەردەم جەماوەردا ، شێخ سەعید هەر لە سەرەتای دامەزراندنی رێکخراوو کۆمەڵی رامیاری لە باکووری کوردستان لە نێوان ساڵەکانی ١٩٠٨– ١٩٢٣ بەشداریەکی چالاکانەی کردووە لە چالاکیە رامیاریەکان و پەیووەندیەکی بە هێزی هەبووە لە گەڵ خێزان و بنەماڵە کوردەکان وەك – بەدر خانیەکان ، شێخ عوبێدولا ، و سەر کردە رامیاریەکاندا

هەروا شێخ سەعید نازناوی شێخ سەعیدی پیرانی وەرگرتووە ، کە نەسەبی دەگەرێتەوە بۆ گوندی – پیران – کە گوندێکی کوردیەو لە نزیك شارۆچکەی بالۆیە ... لەم گوندەدا یەکەم رووبەروو بوونەوە لە نێوان کوردو هێزەکانی

سووپای تورك روویداوه ... شۆڕشی شێخ سەعید لە ١٩٢٥/٢/٨ دەستی پێکرد و بەردەوام بوو تاکوو لە لایەن هێزەکانی سووپای تورك بە ڕێ نیشاندەرانی کوردی خۆفرۆش لە ١٩٢٥/٤/١٠ دەستگیر دەکرێت لە گەڵ هاوریکانیدا .

ئەوانیش – شێخ عەلی ، شێخ غالب ، رەشید ئاغا ، محەمەد ئاغا ، تەیموور ئاغا – و تا لە ١٩٢٥/٦/٣٠ بریاری لە سێدارە دانیان بۆ دەر دەچێ و شێخ و هاورێکانی لە گۆرەپانی مزگەووتی گەووره لە شاری دیاربەکر لە باکووری کوردستان بریارەکەیان جێ بە جێکرد لە شاری دیاربەکری کوردستاندا .

١٩٢٥/٧/١١ کۆمیتەی نێوودەووڵەتی سەر بە کۆمەڵەی گەلان ئاکامی لێکۆلینەوەی خۆی بلاو کردەوە ، کە وویلایەتی موسل بکەوێتە ژێر کۆنترۆڵی کۆمەڵەی گەلان بۆ ماوەی ٢٥ ساڵ و لە هەمان کات زمانی کوردی زمانی فەرمی بێت و وویلایەتەکەش ئیدارەی کورد بیگێرێت لە هەرێمەکەدا .

١٩٢٥/٧/١٦ مێژوونووس و نووسەرو رووناکبیرو کەسایەتی ناوداری کورد و ئێراق – محەمەد ئەمین زەکی– بە جێگری سەرۆکی ئەنجوومەنی نووێنەران و سەرۆکی لێژنەی سەربازی هەلبژێردرا لە ئێراق ، کە بە گرنگترین لیژنەی پەرلەمانیەکان دادەنرێت لە دەسەلاتی ئێراق.

١٩٢٥/٧/١٦ ئەنجوومەنی گشتی کۆمەڵەی گەلان کۆبوونەوەی خۆی گرێداو دوا راپۆرتی هەلسەنگاند ، لە بارەی وویلایەتی موسل ، لەو کۆبوونەوەیە رەشید بەگی نووێنەری تورکیا ووتی:–

تەنیا لە ئێران و تورکیا کورد هەن و لە ئێراق کورد نیەو نژادیان جیاوازە

لەگەڵ نژادی تورك‌و عەرەب‌و فارس لەهەرێمە جیاجیاكان -...!. كەچی كورد لەو كاتە لەپارێزگای موسل ٨٥٪ دانیشتووانی بوون ، سەرەرای ماوەنەدان بەجێنشین بوونی كورد لەسەر خاكی دێرینی لە كوردستان بەر لە تورك‌و عەرەب بەسەدا ساڵ لە كێشووەرەكەدا .

١٩٢٥/٧/١٦ لە مێژووی دامەزراندنی دەوڵەتی ئێراق بۆ یەكەم جار ئەنجوومەنی نووێنەرانی ئێراق - المجلس النیابی- كۆبۆوە لە وولاتەكەدا .

١٩٢٥/٧/١٧ مۆركردنی رێكەووتننامەی قەدەخە كردنی بەكارهێنانی چەكی ژەهراوی دژی مرۆڤ ، كە/ ١١٣ وولات بروایان پێدراو لەلایەن دەوڵەتە هاوبەشە رێكەووتووەكاندا ، كە دەوڵەتە زلهێزەكانیشی تیا بوو مۆركرا ، ئەمەش دوای ئەوەی كە ترسناكی ئەم چەشنە چەكانە لە كاتی بەكارهێنانیدا لە شەری یەكەم دەركەووت ، كە كاتێك ئەڵمانەكان لەدژی فەرەنسیەكان ئەو جۆرە چەكەیان بەكارهێنابوو لەئاكامدا قوربانییەكانی گەیشتە -١٠٠- هەزار كوژراو -١- ملیۆن زامدار لە بەرەكانی شەردا .

١٩٢٥/٨/٢٣ بە هۆی بارودۆخی كوردستان كوونسلی بەریتانیا لە شاری- تەبریز- كە شارێكی ئەزەریە لە باكووری رۆژئاوای ئێران- نامەیەكی ئاراستەی بالوێزی بەریتانیا كرد لە تاران ، ئەویش بەدیاریكردنی داوای عەلی رەزا ، لە پێناو سەردانی بۆ بەریتانیا لە بارەی هەڵوویستی كورد بەرامبەر بە شۆرشی شێخ سەعیدی پیران لە باكووری كوردستان‌و كاردانەوەی لەسەر رۆژهەلاتی كوردستاندا .

١٩٢٥/٨/٢٧ دەست پێكردنی شالاوی دبلۆماسی لە لایەن حكوومەتی بەریتانیا دژ بە كارە نامرۆڤایەتیەكەی رژێمی تورك... كە ئەنجامی دابوو دژی ئاشووری‌و كلدان‌و كورد لە شاری موسل‌و دەووروبەری ئەویش بە دەركردنیان‌و هێنانی نەتەوەی عەرەب بۆ جیگاكانیان.

شایانی باسە لە دوای داگیر كردن‌و بەعەرەبكردنی خاكی باشوورو رۆژئاوای كوردستان بە هۆی فتووحاتی ئیسلامی‌و دوای ئەویش ئیمپراتۆریەتی عوسمانی رۆڵی سەرەكی‌و بنەرەتیان هەبووە لەداگیركردن‌و بەعەرەبكردن

لەباشووری کوردستان لەهەموو بوارەکاندا .

١٩٢٥/٩/٣ وەزیری موستەعمەراتی بەریتانیا لەوتارێکیدا بەرامبەر بەپەرلەمانی بەریتانیا ئاماژەی بەو بابەتە داوە ، کە سیستەمی کارگێری ئیستا یاریدەی پیادە کردنی راسپاردەکانی ئەو لیژنەیەی سنوور دەدات و حکوومەتی ئێرائیش بەلێن دەدات ، کە ئەو کارانە جێبەجێ بکات کە لە راپۆرتەکە داهاتبوون . بەتایبەتی لەو شووێنانەی کە زۆربەیان کوردن لە هەرێمەکەدا .

١٩٢٥/٩/٥ رژێمی تورکیا لە شاری دیاربەکر ٥٢ شۆرشگێری کوردی لەسێدارە دا بە هۆی بەشداریکردنیان لە شۆرشەکانی شێخ سەعیدی پیران دژی رژێمی تورك لە باکووری کوردستان.

١٩٢٥/٩/٢٣ سکرتێری گشتی ئەنجوومەنی کۆمەڵەی گەلان نامەیەکی ئاراستەی دادگای نێودەووڵەتی کرد ، ئەویش بە مەبەستی چارە سەری کێشەی کورد لە وویلایەتی مووسڵ ، لەناو دەسەڵاتی نوێی ئێراق ، کە تەواوی باشووری کوردستانی پێ لکێنراوە .

١٩٢٥/٩/٢٤ دەسەڵاتی ناوەندی شانشینی ئێراق ، هێزێکی لە ٢٥٠ چەکدار پێك هێنا لە ژێر سەرپەرشتی بەرێووەبەری گشتی پۆلیس ، لە پێناو دامرکاندنەوەی جمووجۆلی شۆرشگێرانی بزووتنەوەی رزگاریخوازی کورد لە باشووری کوردستاندا .

١٩٢٥/٩/٢٦ رژێمی تورکیا لە دوای دەستگیر کردنی هاورێ و هاوکاری رابەری کورد شێخ سەعیدی پیران ، کەسایەتی ناوداری ئەرمەنی- یۆگۆس ماکار ئەسکەندەر-یان لە سێدارەدا.

١٩٢٥/٩/٢٧ لـــه ســـێدارەدانی كەســـــــایەتی و سەركردەی كورد شێخ عوبێدولای نەهری شێخ عەبدولقادر شەمدینای لـه گـەڵ یـەكێك لـە كورەكانی و كۆمەڵێك لە سەركردە كوردەكان بە بیـانووی ئـەوەی كـە پەیوەنـدی لـە گـەڵ بزووتنـــــەوەی رزگـاریخوازی كـورد هـــەبووە جێگـــەی باسكردنە كە شێخ عەبدولقادر شەمزینی لە ساڵی ١٨٥١ چاوی بە جیهان هلهێناوه لە باكووری كوردستان. ئەم كەسایەتیە لە بنەماڵەی عوبێدولای نەهریە، بەشداری لە جەنگی نێوان هەردوو ئیمپراتۆریەتی عوسمانی و ڕووسیای قەیسەری كردووە.

هەروا یەكێك بووە لە پاڵ باوكی بەشداری لە شۆرشی ساڵی ١٨٨٠ كردووە، دوای ئەوە ی كە وولات بەدەركرا لە لایەن دەسەلاتی عوسمانی و نیشتەجێ بوو لە وولاتی ئێستای سعوودیەی عەرەبی لە سەر داوای سولتلنی عوسمانی سولتان عەبدولحەمید لە شاری مەككەی سعوودی گەراوە ئەستمبوڵ، دوای گەرانەوە ی چووە رێزی كۆمەلەی ئیتحادو تەرەقی بەشێووەیەكی نهێنی كە ئەمەش دوا كارەكانی بوو لە ژیانیدا.

دوای ئەوەی كە ئاشكرابوو لە كۆمەلەیە كار دەكات دووبارە سولتانی عوسمانی سولتان عەبدولحەمید لە ئەستەمۆڵ دەری كردوو چووەوە وولاتی سعوودیە و لە شاری حیجاز نیشتەجێ بوو. دوای كودەتاكەی ساڵی ١٩٠٨ دووبارە گەرایەوە شاری ئەستەمۆل و چەند پلەو پۆستی وەرگرت لە دەووڵەتی عوسمانی. لە كارەكانی بەردەوام بوو تا لە لایەن دەسەلاتی

عوسمانی لە سێدارە دراو چووە ریزی نەمرانی کوردوکوردستان.
سەرچاوە:- گۆڤاری ژین /١٩٩٩ ل/٣٥ - ٦٥ .

١٩٢٥/٩/٢٩ ئەنجوومەنی کۆمەڵەی گەلان داخوازیەکی ئاراستەی دادگای نێوودەوڵەتی کرد لە بارەی وویلایەتی موسل و کێشەی کورد ناوچەکەدا .

١٩٢٥/٩/٣٠ ئەنجوومەنی کۆمەڵەی گەلان لێژنەیەکی لێکۆلینەوەی دامەزراند لەبارەی باری وویلایەتی موسڵ ، کە بەریتانیاو تورکیا کێشەیان لەسەری هەبوو، کە چی ناوچەیەکی باشووری کوردستان بوو لە کێشووەرەکەدا .

١٩٢٥/١٠/٦ کۆمەڵەی گەلان لە خوولی /٢٧ی ئاسایی خۆیو لە ئاکامی راپۆرتە هەمەلایەنی لێژنەکان بریاریدا ، کە وویلایەتی موسل بە دەووڵەتی ئێراقی دورستکراوی نوێ بلکێنرێ.... شایانی باسە دووژمنانی کورد لە هیچ کاتو ساتێك دۆستی کورد نەبوونەو نابن گەر بەرژەوەندی خۆیانی تیا نەبێ لە هەموو بوارەکاندا .

١٩٢٥/١٠/١٦ ئەنجوومەنی کۆمەڵەی گەلان بریاریدا ، بەلکاندنی باشووری کوردستان بە ڕژێمی شانشینی ئێراق... لەهەمان کات کۆمەلەی گەلان بەپێی ئەو بڕیارەیدا ، کە حکوومەتێکی کوردی ناوخۆیی لە چوارچێووەی سنووری دورستکراوی ئێراق دابمەزرێت لە باشووری کوردستاندا .

١٩٢٥/١٠/١٧ ئەنجوومەنی کۆمەڵەی گەلان لە بریارێکیدا ، کە بەوەندە وازی هێنا کە داوا لە حکوومەتی بەریتانیا بکات بە دامەزراندنی ئیدارەی کوردی لە ناوچە کوردیەکان ، لەناو سنووری دورستکراوی ئێراق ، بەلاّم ئەوانەی لەناو بەڵگە نامەکانیان هەبوو هەر هەمووی لەسەر لاپەڕەکانی بەوشکی مانەتەوە لە کۆگاکاندا .

١٩٢٥/١٠/٢٥ رژێمی تورکیا یاسای جلوبەرگی راگەیاند ، ئەویش بە قەدەخەکردنی پۆشینی جلوبەرگی نەتەوەییو کۆمەلاّیەتی .
بە لە بەرکردنی جلوبەرگی ئەورووپی ، ئەم یاسایەش تایبەت بوو بە گەلی کوورد لە باکووری کوردستان .

١٩٢٥/١٠/٢٦ بلاّوکردنەوەی یەکەم ژمارەی گۆڤاری - رۆژە ئەلیوسف - لە شاری قاهیرەی پایتەختی میسر، کە بەرگەکەی بە وێنەی دەستی هونەرمەندی ئیتالی لیسیان کێشرابوو... هەروا وێنە کێشی ئەرمەنی - ساروخان - رۆڵی گرنگی هەبوو

لەوێنە جۆراوجۆرەکانی ناوەرۆکی گۆڤ رۆزا ئەلیوسف، کە تاکوو ئێستاش ئەو گۆڤارە لە بڵاوکردنەوەی بەردەوامە لە شارەکەدا.

١٩٢٥/١٢/١٣ رژێمی نوێی کۆماری تورکیا بەسەرکردایەتی مستەفا کەمال ئەتاتورك بریاری ژمارە /٦٧٧ ی دەرکرد لە مادەی /١ ی بریارەکەدا هاتووە بەداخستنی هەموو تەکیەی ئایینی لەسەر خاکی دیاریکراوی نوێی رژێمی تورکیا.
ئەو باڵەخانەو خانوو زەویانەی کە خاوەنداریەتی تایبەت و گشتی بوون گرتیەوە، لە گەڵ جێگەی پیاوانی ئایینی و دەروێشەکانیان.
کە ببووە جێگەی پەیوەندی پیاوانی ئایینی و ئایین پەرستی لەو وولاتە دروستکراوەدا بەپێی پەیمانی لۆزانی ١٩٢٣/٧/٢٤ کە زیاترلە٢١٢ هەزار کیلۆمەتر چوارگۆشەی لە خاکی کوردستان پێووە لکێنراوە لە هەرێمەکەدا.

١٩٢٥/١١/١٥ لە دوای گفتووگۆی چڕی نێوان ئەندامانی کۆمەڵەی گەلان، هێڵێکیان دەستنیشان کرد، کە بە هێڵی برۆکسل ناوزەند کرا لەلایەن هەردوو حکوومەتی تورکیاو بەریتانیاو هێڵەکەیان پەسەند کرد بەدانانی سنوور لە نێوان ئێراق و تورکیا لەسەر خاکی باشوورو باکووری کوردستان لە ناوچەکەدا.

١٩٢٥/١١/٢١ ئەنجامدانی کۆبوونەوەی دادگای نێوودەووڵەتی، کە یەکێك لە خاڵەکانی نامەی سکرتێری گشتی کۆمەڵەی گەلان بوو، لەبارەی سیستەمی نوێی دەسەڵاتی تایبەت بە کورد لەباشووری کوردستان لە وویلایەتی موسل لە هەرێمەکەدا.

١٩٢٥/١١/٣٠ رژێمی تورکیای نوێ بە سەرکردایەتی مستەفا کەمال یاسایەکی راگەیاند بە قەدەخەکردنی رێنماییەکانی رێگەی سۆفیە، کە بووە هۆی داخستنی دەرگای تەکیەکان و لە سێدارەدانی دەیان کەسایەتیئایینی لە شێخ و زانای ئایینی ئیسلام لە باکووری کوردستان.

١٩٢٥/١٢/٦ لیژنەی یەکلاکردنەوەی وویلایەتی مووسڵ، ئاکامی لێکۆلینەوەکەی بە بڕیارێك بۆ کۆمەڵەی گەلان بەرز کردەوە، ئەویش سەبارەت بە کێشەی وویلایەتی مووسڵ بوو، کە زۆربەی دانیشتووانی ئەو پارێزگایە کوردبوون لە هەرێمەکەدا. بە پێچەوانەی دانیشتووانە عەرەبەکان لە شارەکەدا.

١٩٢٥/١٢/١٢ سەرەك وەزیرانی ڕژێمی فارسی لە ئێران رەزا شا هەلبژێردرا بە شای ئێران لەلایەن ئەنجوومەنی وەزیران لە وولاتەکەدا .

١٩٢٥/١٢/١٢ بە گەیشتنی بنەماڵەی بەهلەوی بەگرتنە دەستی دەسەلاتیان لە سەر ئێران و بە دامەزراندنی رەزا شا خان لەسەر ئێران ، ... کە هیچ سوودێکی نەبوو بۆ دانیشتووانە مەسیحیەکان بە کوردو ئەرمەن و ئاشووری ، بە تایبەتی لە ڕۆژهەلاتی کوردستانی داگیر کروای ژێر دەسەلاتی رژێمی فارس لە ئێراندا .

١٩٢٥/٢/١٣ یەکەم شەڕی چەکداری لە نێوان لایەنگرانی شێخ سەعیدی پیران و هێزەکانی سووپای رژێمی تورك دەستی پێکرد لە باکووری کوردستانی داگیر کراوی ژێر دەسەلاتی تورکیا ، کە ئەمەش بووە هۆی بەهێزبوون و بەرزبوونەوەی جوولانەوەی رزگاری گەلی کوردستان لە بواری نەتەوەیی و نیشتیمانی ، هەر چەند کەسایەتیەکی ئاینی لایەنی بالا دەستر بوو لە ناو جوولانەوەی رزگاری کورد ، کە ئەمەش هۆکاری زوویی بوو بە لە ناوبردنی ئەم شۆرشەدا لە باکووری کوردستان و شێووەو شێوازی دیکەش لە باشووری کوردستان .

١٩٢٥/١٢/١٦ لە دوای چەندین کۆبوونەوە دادگای کۆمەلەی گەلان لە شاری لاهای پایتەختی هۆلەندی ، بڕیاریدا بە لکاندنی وویلایەتی موسڵ بەحکوومەتی ئێراقی شانشینی نوێ ... سەرەڕای ئەوەی کە کۆماری نوێی تورکیا ، بە سەرکردایەتی کەمال ئەتاتورك نارەزایی خۆی بەرامبەر بەو بڕیارە دەربڕی و بە دەستگیر نەبوون پێی ،... بەلام ئەوبڕیارە ئاوات و ئامانجەکانی بەریتانیای چەسپاند لەناوچەو هەرێم لەگەڵ گەورەترین دەستکەووت بۆ عەرەب لەسەرخاکی کوردستان بەتایبەتی لەرۆژئاواو باشووری کوردستان.

١٩٢٥/١٢/١٩ نووسەرو رووناکبیرو پرۆفیسۆری بە ناوبانگی بەریتانی- ئەرنولد فوینی- دەڵێ:- هەرچەندە مشت و مڕو وتوو وێژ قووڵ دەبوونەوە لە ناو کۆبوونەوەی کۆمەڵەی گەلان لەگەڵ دۆستە تورکەکان ، کێشەی کورد زیاتر قووڵ دەبووەوە لە سەر گفتووگۆیەکان لەم بوارەدا .ئەویش لە داهاتووی کورد لە کوردستاندا .

١٩٢٥/١٢/٢٦ لـه ئاكـامی شـەڕی یەكـەمی جیهـانی ئیمپراتۆریـەتی عوسمـانی لەبـەر یـەك هەڵووەشـانەوە . لـە سـەر وویلایـەتی موسـل لـە نێـوان دەوڵـەتی توركیـاو بەریتانیاو ئێراق – كە ئەو كات ئێراق لە ژێر ئینتدابی بەریتانیا بوو – كێشە پەیـدابوو، كـە ئەنجوومـەنی كۆمەڵـەی گـەلان بـەبریارێك ئـەو كێشەیەی بـە قازانجی ئێراق یەكلا كردەووە.

خارطة قديمة لولاية الموصل موضحا فيها السناجق الثلاث

كە رژێمی نوێی توركیا سەری نەهێنایە بەر ئەو بریـارە... تـا لـە ١٩٢٦/٦/٥ دا پەیماننامەیەك لە نێوان بەریتانیاو ئێراق و توركیا لـە ئەنكەرە مۆركرا... كە بـەپێی ئـەم پەیماننامەیە توركیا لـە بەرامبـەر هەندێ بەرژەوەنـدی ئـابووری و رێـوو شـووێنی ئـەمنی دژ بـەكورد و خـاكی كوردسـتان دەسـتی لـە وویلایـەتی موسل هەلگرت كرد بۆ ئێراق.

هەروا مادەی/١٤ ی رێكەووتنامەكە تایبـەت بە رێژەی لـە ١٠٪ی مـاڤ ئیمتیـاز بـوو كـە بـە پێـی مـاددەی/١٠ ی ئیمتیازنامـەی ١٩٢٥/٣/١٤، كـە دەبووایـە كۆمپانیای نەوت بە دەووڵەتی توركیای بدایە بۆ مـاوەی /٢٥ سـاڵ... كە ئەو

کات ئـەو بەشـە نەوتـە بـە نیـوو ملیـۆن پاوەنـدی ئیسترلینی مەزەنـدە دەکـرا. هەروا مادەی /١٠ی ڕێکەووتنامەکەش ماف بەهـەردوو لایـەنی ڕێکەووتنامەکە دەدا بۆ بەر پەرچدانەوەی هێرش و پەلاماری خێڵەکی کە ٧٥ کیلۆمەتر بێنە ناو خاکی یەکترەوە.

بەڵگەش بۆ ئەم راستیە کە پرۆفیسۆر – رۆبرت ئۆلسن – ی شارەزا لـەبواری رامیاری ومێژووی رۆژهەلاتی ناوەراست،پێیوایە کە تورکیا بۆ دامرکاندنەوەی شۆرشی شێخ سەعیدی پیران لـە سـاڵی ١٩٢٥ ئـەو دەسـت هەلگرتنـەی بۆ بەریتانیا کردو ئەو ڕێکەووتنامەیە سنووریەی مۆرکرد لـە پێنـاو گـەمارۆدان و دامرکاندنەوەی شۆرشی کورد لە باکووری کوردستان.

سەرچاوە:– لازاریف – کێشەی کورد – ١٩٢٣– ١٩٢٥ – چاپی یەکەم –هولێر / ٢٠٠٧

## ١٩٢٦

١٩٢٦/١/٥ مـۆرکردنی پـەیمان لـە نێـوان هـەر چـوار دەڵەتـەکانی ، بـەریتانیاو فەرەنـسا و ئێـراق و تورکیـا ، لـە ئـەنجام رژێمـی تورکیـا ، دانـی بـەوەنا کـە وویلایـەتی مووسڵ بەشێك بێت لە سنووری دیاریکراوی ئێراق.

کە لەو کات ٨٠٪ دانیشتووانی پارێزگای موسل و دەووروبەری کورد بوون ، بە تایبەتی لە پۆژئاواو باکوورو رۆژهەلاتی پارێزگاو ناو شاری مووسڵیشدا .

١٩٢٦/١/٧ دامەزراندنی کۆمەڵەی زەردەشـتی ، کـە مەلبەنـدی سـەرەکی لەشـاری بەغدای پایتـەختی ئێـراق بـوو ، لـە هـەمان کات لقی لـە پارێزگـای هـەولێرو سـلێمانی هەبوو لەباشووری کوردستان .

کە ئەم کۆمەڵەیە ڕۆڵی گرنگی هەبوو لـە بەڕۆشـنبیرکردنی بیری نەتەوایـەتی لەهەرێمەکەو کوردستان.

١٩٢٦/١/٩ رۆژنامـەی– بـانگی کوردسـتان – مۆڵـەتی لـە لایـەن وەزارەتـی نـاوخۆی ئێـراق پێدرا ، بەخاوەن ئیمتیاز بۆ مامۆستا مستەفا پاشای یامولکی کە تـەنیا دوو ژمارەی لیّ بلاوکراوە.

١٩٢٦/١/١٣ باشـووری کوردسـتانی لکێنـراو بەشانـشینی ئێراقـی دورسـتکراو ئـەویش بـەپێی ڕێکەووتننامـەی مـۆرکراو لـە نێـوان بـەریتانیاو ئێـراق، دوای ئـەوە بـە پەسـەند کردنـی لەلایـەن ئەنجوومـەنی کۆمەڵـەی گـەلان لـە شـاری پاریـسی

پایتەختی فەرەنسادا .

١٩٢٦/١/١٨ لە دوای پەسەند کردنی هێلی برۆکسل لە لایەن کۆمەڵەی گەلان بە دیار کردنی سنوور ، لەلایەن رژێمی تورکیا و مۆرکردنی پەیمانی نێوان تورکیاو بەریتانیا ، ئەویش بە سوودمەندی لەو ئالُوو گۆڕە گونجاوەدا ، بە دامرکاندنەوەی شۆرش لە باکووری کوردستان.

١٩٢٦/١/٢١ لەوکاتەی کە سەرەك وەزیرانی ئێراق بەرامبەر بە ئەنجوومەنی نووێنەرانی ئێراقی وەستاو گووتی:-
ئەو وولاّتە زیندوو ئارام نابێت گەر هەرتاکێك کۆمەڵانی گەلی ئێراق نەگاتە ماف خۆی- ئەویش بەدانی ماف کورد بەگێڕانی ئیدارەی خۆی لەهەرێمی کوردستان و زمانی کوردی ببێتە زمانیفەرمی ئاخاوتن پێکردن و خووێندن- لە هەرێمەکەدا .

١٩٢٦/١/٢١ ئەنجوومەنی نووێنەرانی حکوومەتی شانشینی ئێراق ، بلاّوی کردەوە ، ئەویش بەڕەزامەندی کردنی لە سەر بوونی زمانی کوردی بەزمانی فەرمی لەپال زمانی عەرەبی لە ئێراقدا .
شایانی باسە زمانی کوردی لەناوچەکانی کوردستانی ژێر دەسەلاّتی عوسمانی لە هەموو دام و دەزگاکانیدا بە زمانی کوردی دەنووسرا بەشێووە زاراوەکانی ئەوکات لە دەسەلاّتەکەیاندا.

١٩٢٦/١/٢١ بلاّوکردنەوەی یەکەم ژمارەی رۆژنامەی - ژین- لەلایەن شاعرو نووسەری بەناوبانگی کورد پیرەمێرد لەشاری سلێمانی لە هەرێمی باشووری کوردستاندا.

١٩٢٦/٢/٢ داواکارییەکانی پەرلەمانتارانی کورد لە ناو ئەنجوومەنی نووێنەرانی شانشینی لە ئێراق ، کە داواکەیان بەمۆری/ ٦ لە پەرلەمانتارانی کورد بوو . ئاڕاسەی سەرەك وەزیرانی ئێراق عەبدولمحسن کرد ئەویش بە سێ داوای مافی کورد لەهەرێمی باشووری کوردستان .
١- دەبێ زمانی کوردی زمانی فەرمی بێت لەپاڵ زمانی عەرەبی لە ناو ئەنجوومەنی نووێنەرانی ئێراقدا .
٢- بەرپرسان لەپارێزگاکان کورد بن پێش هەموو شتێك .

٣- دەبێ یەکێك لە سێ جێگرەکەی سەرەك وەزیرانی ئێراق کورد بێ و لەهەمان کات دەبێ بەرپرسانی کورد لەدەسەڵاتی ناوەندی رژێمی شانشینی هەبێت ... لەدوای ئاراستە کردنی داواکە سەرەك وەزیرانی ئێراق بەڵێنی دا بە هەڵسگاندنی داواکەو جێ بەجێکردنی... بەڵام ...!.

١٩٢٦/٢/٢ کۆمەڵەی زانین لەلایەن شاعرو نووسەری ناوداری کورد پیرەمێرد لەشاری سلێمانی دامەزرا ، بەپێی بڕیاری وەزارەتی ناوخۆی ئێراق بەژمارە /٢٥٧١ لەو رۆژەدا.

١٩٢٦/٢/١٦ هەڵگیرسانی راپەرینەکانی جەماوەری باکووری کوردستانی داگیر کراوی ژێر دەسەلآتی رژێمی تورکیا ، بەهۆی باری نالەباری دانیشتووانی گەلی کورد لە ژێر هەڵوویستە شۆڤینیەکانی رژێمی تورکیا .

ئەویش بەئازارو ئەشکەنجەدان و بەردەوامی لە بەرتورککردنی خاك و گەل لە هەرێمەکەدا .

١٩٢٦/٢/١٦ کۆچی دوایی ئەفسەری پایە بەرزو زاناو ئەدیبی لێهاتووی کورد مامۆستا - ئەمین فەیزی بەگ - لە تەمەنی ٦٦ ساڵیدا.

شایانی باسە ئەم رووناکبیرە لە ساڵی ١٨٦٠ لە شاری سلێمانی لەهەرێمی باشووری کوردستان چاوی بەجیهانی خەبات هەڵهێناوە، سەرەتای خوێندنی لە حووجرە بوو لەلایەن مەلا ئایینیەکان.

دوای ئەوە خوێندنی سەرەتایی لەشاری سلێمانی تەواوکردووە و خوێندنی ناوەندیشی لە بەغدا تەواوکردووە... دوای ئەوە چۆتە شاری ئەستەمبوڵی تورکیا لە قوتابخانەی سەربازی وەرگیراوە، دوای ئەوە دەرچوونی پلەی ملازمی پێ بەخشراوە.

دوای ئەوە کراوە بە بەرێوەبەری خوێندنگای سەربازی لە شاری بەغدا لە زانستەکانی فیزیاو بیرکاری... چەند کتێبێکی لەم دوو بوارەدا داناوە.

دوای ئەوە چەندین پلەو پایەی وەرگرتووە لە بەغداو لەشاری سلێمانی، لە ساڵی ١٩١٤ مامۆستا ئەمین فەیزی بەگ خانەنشین کراوە... دوای ئەوە لە شارەکانی ئەستەمبوڵ و حەلەبی سووریا ژیاوەو بەردەوام بووە لەنووسین و رۆشنبیرکردنی گەلەکەی تاکوو کۆچی دوایی کردووە بە ماڵئاوایی کردن

لەگەل و نیشتیمان.

١٩٢٦/٢/٢٤ دامەزرانــدنی– كۆمەڵــەی زانــستی كــوردان – راگەیەنــدرا لــە دوای پێــدانی مۆڵــەتی كاركردنیــان لەباشــووری كوردســتان لەشــاری ســلێمانی كــە– فــائق مــەعروف، رەفیــق حلمــی، رەمــزی فــەتاح – ســەرپەرشــتیان دەكــرد لــە شــاری سلیمانی لە هەرێمەكەدا.

١٩٢٦/٢/٢٤ بە پێی فەرمانی وەزارەتــی نــاوخۆی رژێمــی شانشینی ئێراق بە نووسراوی ژمــارە ٢٥٧١ چــاپخانەی وەزارەتــی پــەروەردە دامــەزرا ، كــە دەســتەی دامەزرێنــەری بریتیبــوون لــە – جــەمال بابــان ، ئەحمــەد بــەگ توفیــق، شــێخ مــستەفا پاشــا، غــەفور ئاغــا، رەمــزی قــەزاز، پیرەمێــرد لــە شــاری ســلێمانی لەباشووری كوردستان.

١٩٢٦/٣/٢ راپۆرتی حكوومەتی بەریتانیا لە كۆمەڵەی گەندا هاتووە كە كورد ١٧٪. لە دانیــشتووان پێــك دێــنن... هــەروا ٤٢٪. لە پــۆلیس ١٤٪. لــە ســووپا , ٢٣٪ لە كرێكارانی كاركەر لەهێڵی ئاسنین.
هــەروا كــورد لــە ئەنجوومــەن ١٤ نووێنــەر لــە كــۆی ٨٨ نووێنــەر... هــەروا لەراپۆرتەكەیــدا هــاتبوو، كــە كــورد زۆربــەن لــە ئیــدارەی نــاوخۆیی لــە ناوچــە كوردیــەكان وەك پارێزگاكــانی موســل و كــەركوك و دیالــە ، ئەمــەش لــەدوای لكاندنی هەرێمی باشووری كوردستان.

سەرچاوە :لازاریف – المسأله الكردیه ١٩٢٣ – ١٩٤٥ چاپی یەكەم /هەولێر.

۱۹۲٦/۳/۲۲ بەریتانیا دەسەڵاتی ئینتیدابی خۆی لەسەر شانشینی ئوردن هەلگرت بەهۆی لایەنگیری کردنی ئەمیر عەبدوللا ، حکوومەتی بەریتانیا مەزن و بووە هۆی راگەیاندنی سەربەخۆیی وولاتی ئوردن بە ناوی رژێمی شانشینی و ئەمیر ەبدوللا بووە شانشینی ئوردون ، کە لە بنەماڵەی هاشمی و لەدایکبووی وولاتی سعوودیە بووە لە ناوچەی دوورگەی عەرەبیدا .

کە ناوی پایەختەکەی – عەمان – ە و ژمارەی دانیشتووانەکەی ،۵۰۰,۰۰۰ هەزار کەسە . هەروا ڕووبەری خاکی وولاتەکەی ۸۹,۲۱۰ هەزار کیلۆ مەتر چوار گۆشەبە . هەروا ژمارەی دانیشتووانی وولاتەکەی ،۵,۸۵۰,۰۰۰ ملیۆن کەسە . هەروا چڕی دانیشتووانەکەی ،۲۱۵ کەس لە مبل چوار گۆشەدا . هەروا نژادەکانی ، عەرەب ۹۰٪ . هەروا ئاشووری و کلدانی و دروزی و کورد ۱۰٪ . لە وولاتەکەدا .

۱۹۲٦/٤/۲ وەزارەتی ناوخۆی رژێمی ئێراق ، مۆڵەتی دامەزراندنی کۆمەڵەی زانستی دا ، ئەندامانی دامەزرێنەر کە لە – رەفیق ئەفەندی/ پارێزەر– رەمزی ئەفەندی/ بازرگان– فائق بەگ /مەلاك– مەعروف بەگ/ لەسلێمانی– ئەویش بە هەڵبژاردنی دەستەی کارگێری لەنێوان فەرانبەران ، کە لە ئەحمەد بەگ پارێزگای سلێمانی بەسەرۆك/ جەمال بابان / دادوەر بەجێگری سەرۆك– رەفیف بەگ / پارێز بەسکرتێر– فائق بەگ/ مەلاك بەژمێریار– پێکهاتبوو لەگەڵ سێ ئەندامانی دیکە کە ئەوانیش شێخ مستەفا قەرەداغی و عزەت بەگ و عوسمان پاشاو حمە عەبدولرحمان ئاغا بوون .

ئەویش لە پێناو بڵاوکردنەوەی زاستیو زانیین لە باشووری کوردستان لەرێگای رۆژنامەکان بەوەرگێرانو دانانی کتێبو ئامادەکراوەکان... دوای ئەوە لە ١٩٣٠/٧/٢٨ لقی کۆمەڵەی زانستی لەپارێزگای سلێمانی بەسەرپەرشتی حەپسە خانی نەقیب کرایەوە کە دەکاتە خێزانی شێخ قادرحەفید.لە هەرێمەکەدا .

١٩٢٦/٤/٤ رژێمی تورکیا کۆمەڵێك یاسای دژ بە ئیسلام بڵاوکردەوە بە قەدەخەکردنی چەندین کاری ئاینی... ئەویش کۆپی کردن بوو لە سەرشێوەی یاسای فەرەنسیوسویسریو جێگە گرتنەوەی لە یاساکانی ئاینی لە تورکیا.

١٩٢٦/٤/٢١ شانشینی بەریتانیا – ئەلیزابێتی دووەم – لە شاری لەندەنی پایتەختی بەریتانیا ، کە کچی شانشین جۆرجی شەشەم بووە ، لە بنەماڵەیەکی ناوداری جیهانی چاوی بە جیهان هەڵهێناوە لە وولاتەکەدا و ناوی – ئەلسەندەر ماریابووە ، لە بنەماڵەیەکی پاشایەتیو بەناوی – لیلیین– ناوزەند بووە.

شایانی باسە لە تەمەنی ٢١ساڵیدا لەساڵی ١٩٤٧ مێردی بە فلیپی میری یۆنانیو دانیمارك کرد– لەساڵی ١٩٥٣ لەئاهەنگێکی ڕەسمیدا تاجی پاشایەتی لەسەرکرا.هەروا لە ١٩٤٧/١/٢٠پلەی دۆقئەندێرەی پێدراوە ، هەروا ئەمیر فلیپ لە دوای کۆچی دوایی باوکی جیگەی گرتەوە لە سەر دەسەڵاتی شانشینی لە ١٩٥٢/٢/٦ لە سەر بەریتانیادا .

١٩٢٦/٤/٢١ بۆ یەکەم جار لە مێژی پارێزگای سلێمانی کچانی کورد روویان لە قوتابخانە کرد ، شان بەشانی کورانی کورد لە خووێندن لە باشووری کوردستاندا .

١٩٢٦/٤/٢٢ مۆرکردنی رێکەووتنامە بە گۆرینەوەی زانیاریو هاوکاری و هەماهەنگی لەنێوان رژێمەکانی ئێرانو تورکیاوئەفگانستان ، ئەویش لە پێناو گەمارۆ دانی بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی کورد بەتایبەتی لەڕۆژهەلاتو باکووری کوردستان.

١٩٢٦/٤/٢٢ مۆرکردنی رێکەووتننامەی دۆستایەتیو هاوکاری لە نێوان رژێمی شای ئێرانو تورکیا بە یارمەتی باڵوێزی بەریتانیا – سیرپرێس لوزن– لە ئێران بەرامبەر بە دژایەتی کردنی جمووجۆڵی لایەنگرانی سەرکردەی کورد سمکۆی

شکاك لە ڕۆژهەڵاتی کوردستان.

١٩٢٦/٤/٢٥ کۆمەڵەی دامەزرێنەر لە کۆبوونەوەی خۆیدا رەزا بەهلەوی کردە شاهەنشای ئێران بەلابردنی ئەحمەد شاقاجاری ، بەم جۆرە رۆلی ئەو بنەماڵەیە لە دەسەڵاتی ئێران کۆتایی پێ هات و هەموو دەسەلاتی ئێران کەتە ژێردەستی رەزا بەهلەوی بەهاتنی بنەماڵەی بەهلەوی بۆسەر وولاتانی فارس لە ئێران.

١٩٢٦/٥/٢٥ بلاوکردنەوەی یەکەم ژمارەی گۆڤاری – زاری کرمانجی – لە شارۆچکەی رواندزی سەر بە پارێزگای هەولێر لە باشووری کوردستان ، لە لایەن مێژوونووس و نووسەرو رووناکبیری ناوداری کورد – حوسێن حوزنی موکریانی – بە خاوەنی ئیمتیازو سەر نووسەری گۆڤارەکە – عەبدولەحمان گیۆموکریانی – لە شاری رواندز لە هەرێمەکەدا .

جێگەی باسکردنە کە گۆڤاری زاری کرمانجی ٢٤بیست و چوار ژمارەی لێدەرکرا بە دەستی خوێنەران گەیاندراوە .

کە خۆی خاوەنی چاپخانەکەو بە چاپگەیاندنی ئەنجام دەدا لە پێناو خزمەتکردنی گەل و نیشتیمانەکەیدا.

١٩٢٦/٥/٣٠ رژێمی تورکیا بەرامبەردیاریکردنی سنووری وولاتەکەی لە سەر خاکی باکووری کوردستان خستنیە ناو دەوڵەتەکەی هەلسا بە راگەیاندنی رژێمی زانستی – علمانی– دژ بە ئیسلام لەپێناو رازی کردنی وولاتانی رۆژئاوای یارمەتی دەری لە جیهاندا .

١٩٢٦/٦/١ لە دایك بوونی هونەرمەندی سینەمایی ناوداری ڕووسی و جیهانی خاتوو- مارلین مۆرنۆ- لەپارێزگای مۆسکۆی پایتەختی یەکیەتی سۆڤیەتی پێشوو ، شایانی باسە کە مارلین لەژیانیدا دووجار مێردی کردووەو هەردوو جار لەمێردەکانی جیا بۆتەوە بە هۆی بوونی کێشە لە نێوانیندا .

١٩٢٦/٦/٥ مۆرکردنی ڕێکەووتننامە لە نێوان ڕژێمی شانشینی ئێراق و حکوومەتی بەریتانیا ، دژی کوردو بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی کورد لەهەرێمی باشووری کوردستان کە لە ١٦ برگەی لەمەر سنوورو کۆنترۆڵکردنی کوردەکان پێك هاتبووله وولاّتەکەدا.

١٩٢٦/٦/٦ بە پێی ڕێکەووتننامەی نێوان ڕژێمی شانشینی ئێراق و حکەمەتی بەریتانیا هێلی بە ناوبانگی برۆکسل بووە سنووری نێوان ئێراق و ڕژێمی تورکیا و بە سنووری فەرمی دانی پێدانرا لەلایەن ئەنجوومەنی کۆمەلەی گەلان لە شاری پاریسی پایتەختی فەرەنسا .

١٩٢٦/٦/٧ گرێدانی یەکەم کۆنگرەی ئیسلامی لە شاری مەککەی وولاّتی سعوودیە ، ئەویش بە ئامادەبوونی نووێنەری هەموو وولاّتانی عەرەب ، جگە لە ئێران و ئێراق ، کەنووێنەری ئیسلامەکانی سۆڤیەتی بەشداریان تێدا کرد... کۆنگرەکە لەلایەن حافز وهبە بەوتارێك کرایەوە بەنووێنەرایەتی کردنی بنەماڵەی ئال سعوود لە وولاّتەکەدا.

١٩٢٦/٧/٨ بەپێێ ڕێکەووتننامەی مۆرکراوی نێوان ڕژێمی ئێراق و ڕژێمی تورکیا بەرازی بوونی تورکیا ، کە بەریتانیا لەسەر وویلایەتی موسل دەبێ لە١٠٪ لە بەشی کۆمپانیای نەوتی تورکیا وەرگرێت بۆ ماوەی ٢٥ ساڵ ، ئەو چاوگە نەوتیانە لە خاکی باشووری کوردستان .

١٩٢٦/٧/١٨ لە دوای بە ئەنجام گەیاندنی ئاواتەکان بە ڕاگەیاندنی هێلی برۆکسل بە دیاریکردنی سنوور لە نێوان هەردوو دەوڵەتی ئێراق و تورکیای دورستکراو لەسەر خاکی گەلی کوردستان... کە بووە هۆی لە گۆڕنانی پەیمانی سیڤەرو هەروا کۆنگرەی قاهرەی پایتەختی میسردا.
ئەویش بە پێکهێنانی هەردوو دەوڵەت بەپشتگیری بەریتانیاو ئەمەریکا و فەرەنساو ڕووسیا بە بەداگیرکردنی خاکی کوردستانله ناوچەکەدا ... کە بووە هۆکارێکی گەوورە لە بەهێز بوونی جێ پێگەی وولاّتانی هاوپەیمان لە

کیشووەری ئاسیای ناوەراست و بچووک لە هەموو بوارە جیاجیاکاندا .

١٩٢٦/٩/٤ لـە دوای هـەوڵ و کۆششیکی زۆر ئـەویش بـە دەسـت پێکردنـی گفتووگـۆ لـە نێوان شێخ مەحمودی حەفیدو بەرپرسانی بەریتانیا لە ئێراق لەشارۆچکەی خورمال لە باشووری کوردستان ، کە زیاتر لـە سێ کاتژمێری خایاندو بووە هۆی نیمچە ئارامی لە ناوچەکەدا.

١٩٢٦/١٠/١٢ بڵاو کردنـەوەی یەکـەم ژمارەی رۆژنامـەی کـەرکوك لـە پارێزگـای کـەرکوك لـە باشووری کوردستـان ، ئەویش بە زمانی کوردی و عـەرەبی و تـورکی لەلایـەن شارەوانی کەرکوك لە هەرێمەکەدا .

١٩٢٦/١٠/١٥ نووسـەرو رووناکبیری نـاوداری جیهانـی- میشیل فۆکـۆ- لـە شارۆچکەی - یوانیە- ی فەرەنسا لەدایك بووە.

١٩٢٦/١٠/١٨ مەندووبی سامی بەریتانیا لە ئێراق پێشنیارێکی ئاراستەی شانشین فەیسەل کرد ، ئەویش بە داەزراندنی کۆمەڵەی جۆراو جۆر لەشاری بەغدا ، لەپێناو بووژانەوەی یەکیەتی لە نێوان کوردو عـەرەب و نەتـەوەکانی دیکەی ئێراقی نوێ...؟...

السر هنري دوبس المندوب السامي

١٩٢٦/١٠/١٨ نووێنـەری بـاڵای بـەریتانیا- سـێر هنـری دۆبـس- نامەیـەکی نهێنـی ئاراسـتەی شانشینی ئێراق کـرد.. . کە لە هەر لاپەرەیەك لە نامەکەید بە زمانی عەرەبی و ئینگلیزی نووسـرابوو، چـەندین پێشنیاری تیا دیاریکرد بوو لە پێناو پتەوکردنی برایەتی کـوردو عـەرەب ، چـونکە شانشین دەیتوانێ ئەو کارە ئەنجام بدات و کێشەو گرفتەکان چارە بکات هـەر وەك چۆن شانشین فکتۆریا ئەنجامیدا ... کە بووە فاکتەری سەرەکی پتەو کردنی بناخەی یەکیەتی نێوان گەلی ئینگلیزو سکۆچی لە بەریتانیای مەزندا .

١٩٢٦/١٠/٢٢ مــۆرکردنی رێکەووتننامــەی هاوکــاری ئــابووری و بازرگــانی و ســەربازی و یارمــەتی دۆســتایەتی لــە نێــوان رژێمــی ئێــران و رژێمــی تورکیــا لــە تــارانی پایتەختی فارس .

لە پێناو سەرکووت کردنی جموو جۆلەکانی بزووتنەوەی رزگاریخوازی کورد بەتایبەتی لە ڕۆژهەلات و باکووری کوردستان...؟؟؟.

١٩٢٦/١٠/٣٠ هەولـدان لـە پێنـاو ڕاکێشانی زاناکـانی مەزهـەب شیعەی ئیسلام و هاوکـاری کردنــی وولاتــانی ئیــسلامی و ڕووســیای ســۆڤیەتی، بــەم بۆنــە لــە تــارانی پایتەختی وولاتی فارس ، کۆمەڵەیەك پێك هێنرا بەناوی - یەکێتی زاناکان - لە سـەر داوای شێخ عەبدولکـەریم ئەلیەزیدی لـە شاری قووم لـە ئێران ، ئـەو کۆمەڵەئــەش لقــی هــەبووە لــە شــارەکانی تــەبرێزو خوراســان و قــووم و پەیووەنـدی لەگـەڵ زاناکـانی شـاری نەجـەف و کەربـەلا و گەرەکـە کازمیـە لەشاری بەغدا لە ئێراق بەست و هەروا پەیووەندی هەبووە لەگەڵ کۆمەڵەی - بیت النهرین .

شایانی باسە پرۆگرامی ئەم کۆمەڵەیە لە ڕۆژی ١١/٧ی هـەمان سـاڵ گـەیشتە گـەڕەکی کازمیـە لـە شـاری بەغـدا و درا بـە دەسـت شـێخ جـەواد جـەواهری ، هــەروا لــە ڕۆژی ١٩٢١/١١/١٣ گـەیشتە دەســت محەمــەد باقرئەلحـەکیم لــە شارەکەدا .

ئەویش لـەپێناو پەیووەنـدی کردنـی بەهێز لـەنێوو زاناکـانی ئێـراق و ئێـران ، بەدامەزراندنی کۆمەڵەی ئاینی بە بووژاندنـەوەی ئـاینی ئیـسلام و باشـکردنی پەیووەندی لەگـەڵ تورکیا و ڕووسیای بەلشەفی ...شایانی ئامـاژە پێکردنـە کـە بەلاشـیفەکان ڕۆڵـی سـەرەکیان هـەبووە لـە دامەزرانـدنی ئـەم کۆمەڵەیـە لـە وولاتەکەدا .

هــەروا لــەو کاتــدا ســەرۆکی پــارتی نیــشتیمانی ئێــراق جەعفــەر ئــەبوو تمــەن پــشتگیری خــۆی بــۆ کۆمەڵەکــە دەربــڕی ... هــەروا لــەو کاتــەی کــە - ج.س.ئاگــابیکۆف - لــە نێــوان ســاڵەکانی ١٩١٨ - ١٩٢٩ ســەرۆکی بەشــی ڕۆژهەلات بوو لە کارگێڕی ڕامیاری دەوولـەتی یـەکێتی سـۆڤیەت لـە وەزارەتـی دەرەوە ، کــە لــە ســاڵی ١٩٣٠ بابـەتێکی بلاوکـردەوە بـە دڵخۆشـکەری ئـەو یەکێتی زانانیانەی کە لە وولاتانی دراوسـێ و گـرنگ پێك هـاتووە لـە ناوچەو کێشووەرەکەدا ._

**دیاریکردنی جێنزرگەی شۆڕش و سەرهەڵدانەکانی کوردستان**

**لە ١٩٢٥-١٩٣٧**

## ١٩٢٧

١٩٢٧/١/١٥ بەرپابوونی راپەرینی ئاگری داخ لە باکووری کوردستانی داگیر کراوی ژێر دەســەڵاتی ڕژێمــی تورکیــا ، لەلایــەن چــەکدارە شۆرشــگێرەکانی کــورد لەناوچەکەدا .

١٩٢٧/١/١٩ بە هۆی بارینی باران و بەفرێکی زۆر لە یەکیەتی سۆڤیەت بە تایبەتی لە شاری مۆسکۆو دەوروبەری ، کە بووە هۆی وەستانی کارکردن لەدامو دەزگاکـانی دەوڵـەت بەگـشتیو پـچرانی پەیووەنـدی لـە نێـوان شـارو شارۆچکەو بە کوشتنی بەدیان هاوولاتی کە پلەی ساردی گەیشتە زیاتر لە ٢٠پلەی ژێر سفری لە ساردیدا.

١٩٢٧/٢/١١ گرێـدانی یەکـەم کـۆنگرەی دامەزرانـدنی - ڕایەڵـەی دژ بـە ئیمپریالیـەت و داپلۆسینی ئیستیعمار ، لە پێناو سەربەخۆیی نیشتیمانی لە شاری بەرلینی پایتەختی ئەڵمانیا .

کە ئەم ڕایەڵە بووە هۆی گرێدانی پەیووەندی لە نێوان هندستان و چین و وولاتانی ئیسلام ، لە و وولاتانەو پاڵپشتی کردن لە جوولانەوەی نیشتیمانی لە جیهاندا.

١٩٢٧/٣/١٠ گرێدانی کۆنگرەی ڕایەڵەی وولاتانی جیهان لە شاری برۆکسل ، کە ١٧٥ نووێنــەر و ١٣٤ ڕێکخــراو ٣٧ وولات لــە ئاســیاو ئـەفریکیا و ئــەورو‌پا و ئەمەریکا بەشداریان تێدا کرد .

بەلاّم لە وولاتانی عەرەبی تەنیا میسرو سووریا و فەلەستین بەشداریان تێدا نـەکرد ... لـەو کۆنگرەیـە هـەوڵی دامەزرانـدنی - سـکرتاریەتی وولاتــانی عـەرەبی - لـەو ڕایەڵەیـە درا و لەلایەکی دیکە ئەنجوومـەنی کۆمـۆنترێن ، کە ئەنجوومەنێکی پارتە کۆمەنیستەکانی جیهان بوو.

هەوڵی پەیووەندی کردنی بوو لەگەڵ جوولانەوەی نیشتیمانی عـەرەبی لە کێشووەری ئاسیادا .

١٩٢٧/٣/٣١ بەرپابوونی شەڕلە نێوان کوردو تورك لە باکووری کوردستان لە ناوچەی دەربەندی بەتلیس ، لە ئەنجام چەکدارە کوردەکان سەرکەووتنیان بەدەست

هێنا بەسەر هێزەكانی سووپای تورك لە هەرێمەكەدا .

١٩٢٧/٤/١٨ لە دایك بوونی نووسەرو رووناكبیرو پرۆفیسۆری ناوداری ئەمەریكی و جیهانی – ساموئیل فیلیپ هانتینگتۆن – لە شاری نیورۆك لە ئەمەریكا.

ناسراو بە ساموئیل هانتكتۆن، ئەم كەسایەتیە خووێندنی لە زانكۆی بەناوبانگی بەیڵ yale uni- versity uni- بە پلەی نایاب تەواو كردووە.دوای ئەوە لە ریزەكانی سووپای ئەمەریكا خزمەتی سەربازی كردووە. دوای ئەوە بروانامەی ماستەری لە زانكۆی شیكاگۆ بە دەست هێناوە و هەروا بروا نامەی دكتۆرای لە زانكۆی هارڤارد بە دەست هێناوە لە وولاتەكەیدا.

ئەم رووناكبیرە لە تەمەنی ٢٣ساڵیدا دەستی بە وانە ووتنەوە كردووە لە زانكۆی هارڤارد، بە گوێرەی ئەم بەیاننامەیەی كە زانكۆی هارڤارد، ساموئێل لە ٢٤/ ٢٠٠٨/١٢ ماڵئاوایی لە وولاتەكەو جیهان دەكات.

جێگەی باسكردنە كە ئەم كەسایەتیە لە ماوەی ژیانیدا زیاتر لە ١٧ كتێبی بە تەنیا و بە هاوبەش نووسیووە. هەروا زیاتر لە ٩٠ ووتاری زانستی دەربارەی رامیاریەتی ئەمەریكا بلاوكردۆتەوە لە گەڵ بابەتی هەمە جۆر لە سەر دیموكراسی و رامیاری و سەربازی و ستراتیژی و گەشە پێدان لە جیهاندا بلاو كردۆتەوە. دوای ئەوە ٥٨ ساڵ لە زانكۆی هارڤارد خزمەتی زانستی كردووە لە هەموو بوارەكانیدا.

هەروا پێکدادانی شارستانیەکان، دیارترین بەرهەمی ساموئیل هانتینگتۆن بووە و درەوشاوەترین زانای زانستی رامیاری بووە. پرۆفیسۆر هانتینگتۆن لــە نێــوان ســاڵەکانی ١٩٢٧ - ٢٠٠٨ دا، زۆر لــە بیرۆکــە وتێــزو پێشبینیەکانیشی بوونەتە راستی، ئەم رووناکبیرە ئاماژەی بەوە داوە کە مرۆڤ خاوەنی کەلتوورو دیدگەی جیاوازن لە بارەی مرۆڤ و کۆمەڵگەدا، هاوولاتی و دەوولەت، هەروا تێگەیشتنە رێژەییەکان بۆ مان و ئەرك، ئازادی و دەسەلات، یەکسانی و نایەکسانیدا.

ئەم کەسایەتیە توانیوویەتی ئەم بەرهەمانە بێنێتە دی ئەویش:-

دەوولەت و سەربازان، تیئۆرو رامیاریەت و پەیوەندی مەدەنی سەربازی... ٢- سیستەمی رامیاری لە کۆمەڵگای گۆراودا - لە ساڵی ١٩٦٨... ٣- قەیرانی دیموکراتیەت، دەربارەی توانای حووکم بۆ دیموکراسیەتەکان. لە ساڵی ١٩٧٦... ٤- شەپۆلی سێیەم :- بۆ دیموکراسی کردن لە کۆتایی سەدەی بیستەم. لە ساڵی ١٩٩١... ٥-پێکدادانی شارستانیتەکان لە ساڵی ١٩٩٦... ٦- ئێمە کێین. ٢٠٠٤.

١٩٢٧/٤/١٩ بە هۆی بوونی سلێمانی بە پارێزگاو ئەحمەد عوسمان کە لەدایك بووی شاری هەولێر بوو بووە پارێزگاری پارێزگای سلێمانی لەهەرێمی باشووری کوردستان.

١٩٢٧/٤/٢٠ داگیر کردنی شارۆچکەی پێنجوین و دەوروو بەری لەلایەن هێزەکانی سووپای بەریتانیا بە هۆی راپەرینی جەماوەری شارەکەو کاردانەوەی لەسەر ناوچەکانی دیکەی باشووری کوردستان.

١٩٢٧/٤/٢٨ سەرەك وەزیرانی رژێمی شانشینی لە ئێراق ، سەردانی پاریزگای سلێمانی لە باشووری کوردستان کردو لەگەڵ شێخ مەحمودی حەفید بیروو بۆچونیان لەبارەی کێشەی کورد ئالۆگۆر کرد ، داوای لەشێخ کرد کە سەردانی شاری بەغدا بکات لەپێناو گفتووگۆ کردن لەگەڵ حکوومەتی ناوەندی شانشینی لە ئێراق.

١٩٢٧/٧/٤ لە پێناو دۆزینەوەی رێگە چارە سەر کردنی مافەکانی کورد لە باشووری کوردستــان و لــە سـەر داوای حکوومــەتی ئێــراق شـێخ مــەحمودی حەفیــد

بەیاوەری بابا عەلی کوری سەردانی شاری بەغدایان کردو بووە هۆی دلخۆشی جەماوەری ناوچەکە.

١٩٢٧/٧/١٠ دامەزراندنی کۆمەڵەی پشتیووان لەلایەن مستەفا شەوقی لەشاری سلێمانی لە باشووری کوردستان.

١٩٢٧/٧/١٠ ئەحمەد خواجە لە بەشی سێیەمی یاداشتەکەیدا دەڵێ :- بریاردرا کە لە شاری بەغدای پایتەختی ئێراق کۆمەڵەیەکی رامیاری بە نهێنیٚ دابمەزرێت... بۆ ئەو مەبەستەش کۆبوونەوەیەك لەماڵەکەی گرێدراو کۆمەڵەکە بەناوی – کۆمەڵەی پشتیووانی کوردان – دامەزراو سەرۆکی ئەو کۆمەڵەش مامۆستا – مستەفا شەوقی – بوو... بەڵام مامۆستا عەبدولرەزاق حەسەن لە – مێژووی پارتە رامیاریە عەرەبیەکانیدا ناوی ئەو کۆمەڵەیەی هێناوەو دەڵێ :-

ئەو کۆمەڵەیە لە ١٩٢٧/٧/١٥ دامەزراوە.

ئەو کۆمەڵەیەش لە پێناو پشتگیری جووڵانەوەی رزگاری گەلی کوردستان بوو... دوای ئەوەش ئەم کۆمەڵەیە لە ١٩٣٠/٧/٩ بەیاننامەیەکی بڵاوکردەوە کە تیایدا داوا لە ئەندامانی دەکات بەشداری لە هەڵبژاردنەکانی ئەنجوومەنی نوێی پەرلەمان نەکەن، کە دیارترین ئەندامەکانیشی بریتیبوون لە – مولازم کامل حەسەن – مولازم رەئوف ئەفەندی – رەئیسی یەکەم محەمەد عەلی عەبدوللا – رەئیس ئەحمەد فەخری – رەئووف – بەشیر موشیر. واتە هەردوو بۆ چووەنەکانی راست و دروستن.

چونکە بەڵگە بەریتانیەکان لە برگەیەکدا ئاماژە بە پێکهێنانەوەی کۆمەڵی پشتیووانی کوردان دەکات... کەواتە ئەو کۆمەڵەیە لە ساڵی ١٩٢٧ دامەزرا بۆ جاری دووەمی بووە لەلایەن کەسایەتیەکانی کورد لە کوردستان.

سەرچاوە:- لازاریڤ – کێشەی کورد – ١٩٢٣ – ١٩٤٥. چاپی یەکەم – هەولێر/ ٢٠٠٧

١٩٢٧/٧/١٤ ســەرەك وەزیرانــی رژێمــی شانشینی لـە ئێراق جەعفەر عەسکەری .
لــە پێنــاو گــەمارۆ دانــی بزووتنــەوەی ڕزگــاریخوازی کـورد بڕیاریـدا بـە دامـالینی دیـاردەی چـەك هـەلگرتن لـە هـەموو ئێراق بـە تایبـەتی لـە هــــەرێمی باشــــووری کوردستانی لکێنراو بە ئێراق ئـەویش لــە پێنــاو بــەهێز کردنــی جێپێگــەی هێــزی ســـەربازی لـــە هـــەرێمی باشووری کوردستان.

١٩٢٧/٧/١٩ بریـاردانی یاسـایەکی شـۆڤێنیانەی رژێمـی تورکیـا بـەناوی یاسـای ژمـارە /١٠٩٧ کـە ئـەو یاسـایە ڕێگـە بەداگیرکـەری تورکیـا دەدا بەگوواسـتنەوەی ١٤٠٠ خێزانی کورد لـە باکووری کوردسـتان بۆ باکووری تورکیا ئـەویش بـە مەبەستی بەتورککردن کـردن و گـۆڕینی دیمۆگرافیـای هەرێمەکـە لـە باکووری کوردستان.

١٩٢٧/٨/١٣ لەدایك بوونی سەرۆکی کووبا دکتۆر- فیدل کاسترۆ- کە لە رەچەلەکدا ئەسپانیەو لە بنەماڵەیەکی دەوڵەمەندی کشتووکاڵی چەوەندەری شەکر بووە،.
شایانی باسە کاسترۆ دەرچووی کۆلێژی یاسایەو دوای ئەوە دەستی کرد بە خوێندنی ئابووری زانستی رامیاری .
لە ساڵی ١٩٥٠ بەلگەنامەی دکتۆرای وەرگرتووەو هاورێی خەباتگیرو تێکۆشەری ناوداری جیهان دکتۆر گیڤارا بووە لە کێشووەرەکەدا.

١٩٢٧/١٠/١ لە دوای هەڵ و ماندوبوونێکی زۆر کۆمەلەی خۆیبوون بووە رێکخراوەیەکی راستەقینەی نووێنەرانی کوردو ئەرمەن لە کوردستان بە تایبەتی لە باکووری کوردستان.

١٩٢٧/١٠/٥ یەکەم دانیشتنی کۆنگرەی نەتەوەیی لە نێوان کوردو ئەرمەن ئەنجامدرا لە ماڵی کەسایەتی ئەرمەنی لە هەرێمی باکووری کوردستان - رۆهان پاپا زیان- کە پێنج رۆژی خایاند بە ئاشت بوونەوە لە پێناو وەدی هێنانو بەرگری کردن لە

دروشمی خۆیبوون

گەل و نیشتمانەکەیاندا .

هەر لە هەمان کات لە هاوینە هەواری – بحمدوون– ی کۆماری لوبنان کۆمەڵێك رۆشنبیرو رووناکبیری ناودارو چەند رێکخراوەیەکی کوردی ئەوانیش – کۆمەڵەی پێشکەوتنی کوردستان ، کۆمەڵەی کوردستان، کۆمەڵەی نەتەوەیی کورد ، کۆمەڵەی سەربەخۆیی– کۆنگرەیان گرێدا بە مەبەستی دامەزراندنی کۆمەڵەی –خۆییبوون–و راگەیاندنی، کە کاردانەوەی کاریگەرو گرنگی هەبوو لەشەقامی کوردی لە لە هەموو هەرێمەکانی کوردستان.

١٩٢٧/١٠/١٢ دامەزراندنی پارتی گەلی کۆماری کە پارتێکی چەپی ناوەندەو لەلایەن دامەزرێنەری کۆماری تورکیاو رژێمی علمانیەت مستەفا کەمال ئەتاتورك راگەیەندرا... لەکۆنگرەی یەکەمی ئەو پارتە شەش پرەنسیپە بەناوبانگەکەی – نەتەوایەتی، کۆمارخوازی، گەل پەرستی، عەلمانیەت، دەست پێشخەری دەوڵەت، شۆرشگێری – خرایە نێوو پەیرەوی ناوخۆو پرۆگرامی پارتەکەو رەوتی ژیانی رامیاری تورکیا لە سەر ئاراستەکراوی ئەو شەش پرەنسیپە کەلە ساڵی ١٩٣٧ خرانە ناو [illegible] جێگەی ئاماژەپێکردنە کە تورکیا [illegible] ئەمەنێك لە ئەزموونی [illegible] و

دەستاودەستەکردنی دەسەڵات تاکوو مانگی /٣/١٩٥٠... کە ئەم دەستوورەش تاکوو ئێستا کاری پێ دەکرێ و دامەزراوەی سەربازی و پۆستی سەرەك كۆمار خۆیان بە پارێزەری ئەو پرەنسیپانە دەزانن کە فەرمانداریەتی تورکیای کردوو دەرفەتی بە دامەزراندنی هیچ پارتێکی دیکەی رامیاری نەدا.

دوای مردنی کەمال ئەتاتورك و هاتنە سەرکاری عیسمەت ئینونوو وەکوو دووەم سەرۆك کۆماری تورکیا لە ساڵی ١٩٤٣ بە مەرسوومێکی فەرمی دەرفەتی دامەزراندنی پارتی رامیاری والأکردو سەرەتای ژیانی فرەیی رامیاری دەستی پێکردوو لەمانگی/١/١٩٤٦ دوای دەست لەکارکێشانەوەی لە پۆستی سەرۆك وەزیران جەلال بایارو عەدنان مەندریسی پارتی دیموکراتی یان دامەزراند کە بە دووەم پارتی دیموکراتی یان دامەزراند، کە بە دووەم پارتی رامیاری لە کۆماری تورکیا دەژمێردرێت و یەکەم پارتیش کە جلەوی فەرمانرەوایی بەدەنگدان لە پارتی گەلی کۆماری وەربگرێتەوەو یەك لایەنە ماوەی ٢٣ ساڵ فەرمانرەوایی تورکیای کرد.

لەگەل ئەو هەموو گۆرانکاریە یەك لەدوای یەکانە بەپێی قۆناخە یەك لە دوای یەکەکان کێشەی کورد رۆژ لە دوای رۆژ بەرەو ئاڵۆزتر لە ژێر دەسەڵاتی ئەو رژێمە نەژاد پەرستانە هەنگاوی دەنا لەهەموو بوارە جیاجیاکان. ئەمەو چەندین رووداوی دیکە لە ناوەرۆکی مێژوونامەکە بخوێننەوە...

سەرچاوە:- لازاریڤ - کێشەی کورد - ١٩٢٣ - ١٩٤٥. چاپی یەکەم -هەولێر/٢٠٠٧.

١٩٢٧/١٠/١٤ دۆزینەوەی یەکەم بیری نەوت لە بابە گورگوری پارێزگای کەرکوکی کوردستان لە باشووری کوردستان لەلایەن

ئینگلیزەکـان،... لـه هـەمان کـات لـه گونـدی سەربەشـاخی کەنـدیناوەی مەلبەندی عەشیرەتی سیان بیری نەوت دۆزرایەوە ، کە هەردوو بیرە نەوتی بابە گورگورو سەربەشاخ بەناوی بیری- نەمبەر وەن- بوو ، کە بووە هۆی زیـاتر چەوسـاندنەوەی کـوردو خـاکی کوردسـتان، بـەرەو زیـاتر لـە بەعەرەبکردن و داگیر کردنی باشووری کوردستان.

١٩٢٧/١٠/٢١ دووبـارە لـە هاوینـە هـەواری - بحمـدوون- لـە کۆمـاری ئێـستای لوبنـان کـۆنگرەی رێکخـراوە کوردیـەکان دەسـتی پێکـرد ، کـە ئـەوانیش کۆمەڵـەی تەشـکیلاتی ئیجتمـاعی کـوردو ، کۆمیتـەی ئیـستیقلال و کۆمەڵـەی کـوردو، کوردستان بەشداریان تێدا کرد ، بە پێك هێنانی کۆمەڵەی خۆیبوون و بەهێز کردنـی کـە کۆمەڵـەی هـەموو کوردسـتان بـوو لـە هـەردوو بـواری نەتـەوەیی و نیشتیمانی لە کێشووەرەکەدا .

١٩٢٧/١٠/٢٨ هەڵگیرسـانی راپـەرینی ئـاگری داخ لـــە هـــەرێمی بـــاکووری کوردســتان بــە ســەرکردایەتی ژەنــەراڵی نــاوداری نەتــەوەیی کورد - ئیحسان نوری پاشا - کــــە ســــەرۆکی کۆمەڵــــەی خۆیبوون بوو لە کوردستان . لـە هـەمان کـات سـەربەخۆیی کوردسـتانی راگەیانـد بـەپێی برگـەکانی پـەیمانی سـیڤەر لـە باکووری کوردستان.

١٩٢٧/١١/٢٥ کۆمەڵـەی گـەنجانی موسـڵمان لـە قـاهرەی پایتـەختی میـسر لەلایـەن عەبدولحەمیـد سـەعید پێکهـات ، ئـەویش لـەپێناو پـەروەردەکردن و بەرگریکردن لە باری کۆمەلایەتی و رۆشنبیری بەداب و نەریتی ئیسلامی... ئەو کۆمەلەیە لەماوەی تەمەنی توانی ٤٧ لقی هەبێ لە میسرو ، هەروا ١٨

لقی هەبێ لەووڵاتانی ئەفریکیاو ئاسیاو ، هەروا ٣ لقی لە هەموو ئەورووپاو یەك لقیش لە ئەمەریکا.

## ١٩٢٨

١٩٢٨/٢/٤ خستنە خوارەوەی دوو فرۆکەی جەنگی هێزەکانی سووپای تورك لە باکووری کوردستانی داگیر کراوی ژێر دەسەڵاتی تورکیا لەلایەن شۆرشگێرانی راپەریووی کورد لە ناوچەی ئاگری لە هەرێمەکەدا .

١٩٢٨/٢/٢٨ مۆرکردنی رێکەووتننامەی – هافانا– لە پایتەختی کۆماری کووبا کە بەڵگەنامەیەکی ناوزەندە لە کۆنگرەی شەشەمی ئەندامانی رێکخراوی ووڵاتانی ئەمەریکا ، کە لەشاری هافانا گرێدرا ، کە هەموو ووڵاتانی ئەندام کەپێك هاتبوون لە ٢١ ووڵات مۆریان لە سەر بەلگەنامەی هافانای پایتەختی ووڵاتی کووبا کرد لە جیهاندا.

١٩٢٨/٣/٤ لە شاری نووسەرو شاعرو رووناکبیرانی نەتەوەیی و ئەدەب و هونەر شاری کۆیەی سەر بە پارێزگای هەولێر لە باشووری کوردستان ماموستا – کەریم شارەزا – لە گەرەکی هاواران لە شارەکەدا چاوی بە جیهان هەلهێناوە ، کە برای شاعری گەوورەی چینایەتی و نەتەوەیی ئەحمەد دلزارە لە باشووری کوردستان.

جێگەی ئاماژە پێکردنە کە ماموستا کەریم شارەزا ناوی تەواوی –کەریم مستەفا محەمەد حەوێز– یە و ناسراو بووە بە کەریم شارەزا ، لە ساڵی

١٩٣٥ چووەتە بەر خوێندن لە قوتابخانەی سەرەتایی لە شاری کۆیە ، هەروا لە ساڵی ١٩٤٣ چووەتە قوتابخانەی ناوەندی . دوای ئەوە لە ساڵی ١٩٤٦ روولە شاری بەغدای پایتەختی ئێراق دەکات و لە خانەی مامۆستایانی سەرەتایی لە گەرەکی ئەعزەمیە وەردەگیرێ و تا ساڵی ١٩٥٠ خوێندن تەواو دەکات .

لە دوای تەواو کردنی خوێندن لە ١٩٥٠/١٠/٩ بە مامۆستای قوتابخانەی یەکەمی سەرەتایی لە شارۆچکەی کۆیە دادەمەزرێت و وانەکانی کوردی و عەرەبی گووتۆتەوە ، لەو کاتەدا بە هۆی هەڵوێستی بوێرانەیدا لە ساڵی ١٩٦١ لە شارەکەی دوور خراوەتەوە بۆ پارێزگای ناسریە لە باشووری ئێراق ، دوای ئەوە لە ساڵی ١٩٦٦ گەراوەتەوە شاری هەولێر لە هەرێمەکەدا.

ئەویش بە رێگە پێدانی و لە قەتابخانەی سەرەتایی قەزای مەخمور دانراوە ، لە ساڵی ١٩٦٨ گەراوەتەوە شاری هەولێر لە قوتابخانەی سەرەتایی نموونەیی دانراوە . لە دوای مۆرکردنی رێكەووتننامەی ١٩٧٠/٣/١١ دا ، كراوە بە بەرێوەبەری قوتابخانەی – كۆرەك – ی سەرەتایی كوران لە شاری هەولێر و بەردەوام بووە لە كاری مامۆستایەتی تا راپەرینی بەهاری/ ١٩٩١ ، دوای ئەوە كراوەتە وەرگێڕ لە ئەنجوومەنی وەزیران لە ساڵی ١٩٩٢ ، تا تەواو بوونی ئەم مێژوونامەیە لە كارەكەی بەردەوام بووە .

هەروا مامۆستا كەریم سارزا لە كارە رامیاریەكانی لە دوای ساڵی ١٩٤٦ پەیووندی بە پارتی دیموكراتی كورد كردووە تا ساڵی ١٩٤٨ . دوای ئەوە چووەتە رێزی پارتی رزگاری نیشتیمانی ئێراق ، كە ئەوكاتە باڵێكی نیمچە ئاشكرای پارتی كۆمۆنیست بوو ، دوای ئەوە لە ساڵی ١٩٤٩ چووەتە رێزی پارتی كۆمۆنیستی ئێراق ، دوای ئەوە مامۆستا كەریم شارزا لە ساڵی ١٩٥١ وەك كەسایەتیەكی كورد پەروەر و نووسەر و شاعیر و رووناكبیر ، ئەویش بە راگرتنی هەڵوێستی بوێرانەی بەردەوام بووە لە كارو لە ژیاندا .

١٩٢٨/٣/٢٩ بەرپابوونی شەڕێكی توونـد لە نێوان چەكدارە كوردەكان و هێزەكانی سووپای تورك ، لەناوچەی بایەزید لە باكووری كوردستان ، لە ئەنجام هێزەكانی سووپای تورك پاشەكشەیان پێكرا.

١٩٢٨/٣/٣١ پشکێنەری ئیدارەی پارێزگای موسڵ – میجەر ویلسن– چاوی کەووت بەشێخ ئەحمەد بارزانی لە گوندی بلێ لە ناوچەی بارزان لە باشووری کوردستان.

١٩٢٨/٥/١٧ پێشبرکێی پاڵەوانی جامی جیهانی– ئۆلەمپیات– لە نێوان یانە وەرزشیەکانی وولاّتانی بەشدار بوو لە شاری ئیستردام – هۆلەندا ئەنجامدراو بەردەوام بوو تاکوو ٨/١٢ هەمان ساڵ.

١٩٢٨/٦/٢٠ کۆمەڵەی خۆیبوون راگەیاندنی ژمارە /٧١ی بلاو کردەوە ، ئەویش بەداواکردن لە کوردەکانی دانیشتووی ئەمەریکا . لە پێناو خەبات کردن و هێنانەدی مافەکانی کوردو چارەسەری کێشە رەواکانی لەکورستان . بەتایبەتی لە باکووری کوردستان دژی داگیرکەری رژێمەکانی تورکیا و ، ئێران و ، ئێراق و ، سووریا ، کوردو کوردستان.

PUBLICATION OF THE KURD'S NATIONAL LEAGUE HOYBOUN

THE MASSACRES OF KURDS IN TURKEY

١٩٢٨/٦/٢٠ دۆزینەوەی ئەشکەووتی هەزار مێر لەلایەن خانمە شووێنەوارناسی ئەمەریکا – دورروسی گارود. ئەشکەووتی هەزار مێرد یەکێکە لەشووێنەوارە

هــەرە گرنگــە دێرینــەکانی کوردســتان و کەوتۆتــە نــاو ســنووری پارێزگــای سلێمانی لە باشووری کوردستان ,. هەروا ئەشکەوتی هەزار مێرد کەوتۆتە سەر زنجیرە شاخی گلەزەردە. نزیکەی ١٨ کیلۆمەتر لە باشووری رۆژئاوای شاری سلێمانیەوە دوورە... مێژووی دروستکردنی ئەشکەوتی هەزار مێرد دەگەڕێتەوە بۆ ٥٠٠٠٠ پەنجا هەزار ساڵ بۆ قۆناخی بەردینی کۆن.

لــەم ئەشــکەوتەدا چــەندەها کــەل و پــەل و ئــا مێــری لەبــەردو ئێــسك دروســتکراوی تێــدا دۆزراوەتــەوە. هەنــدێکیان لەلایــەن شــووێنەوار ناســە بیانیەکانــەوە براونەتــە دەرەوەی کوردســتان و هەندێکیــشیان ئێــستا لــە مۆزەخانەی شاری سلێمانی پارێزراوە. هەروا پەیکەری مرۆڤی – نیانرتالی – تیادا دۆزراوەتەوە... کە یەکەم جۆری مرۆڤە لەسەر گۆی زەویدا.

سەرچاوە:– سوود لە ئینسایکلۆپیدیای گشتی , یاسین سابیر – دەزگای چاپ و سەردەم – سلێمانی /٢٠٠٥ ل/١١٢٠ وەرگیراوە.

١٩٢٨/٦/٢٣ کۆمــەڵی" لــە رۆشــنبیران و ســەرەك تیرەکــانی کــورد لــەرۆژئاوای کوردســتانی لکێدراو بەدەووڵەتی سووریا سکالایەکیان ئاراستەی کۆمەڵەی دامەزرێنەری ئینتیــدابی فەرنــسی کــرد ، لــەبارەی کێشەی چارەســەری مافــەکانی کــوردو خاکی رۆژئاوای کوردستان.

١٩٢٨/٧/٢٨ گرێــدانی یەکــەم کــۆنگرەی جوولانــەوەی ســەهیۆنیزمی جیهــانی لــە شــاری زیورخی سویسرا، ئەویش بە ئامادە بوونی نووێنــەرانی جوولەکە لە هەموو وولاتە جیا جیلکانی جیهان کە گرنگترین بریاریان بوونی دەسەلاتیان لەسەر دیواری پرشنگدرای قوودس بوو لە فەلەستین.

١٩٢٨/٨/٢٦ لە کۆبوونەوەی ئەنجوومەنی نووێنەرانی رژێمی شانشینی لە ئێراق– عەتا خەتیب– نووێنەری پارێزگای کووت باسی موچەی مانگانەی سەید تەهای نــەهری قائمقــامی روانــدزی کــرد لــە باشــووری کوردســتان ، لەهــەمان کــات مــەحمود رامــزی نووێنــەری پارێزگــای بەغــداش پــشتگیری لێکــرا لــە نــاو کۆبوونەوەکەدا .

سيد طه النهري

هەروا لە گەرمەی مشتوومڕی کێشەی موسڵدا ، کە ئینگلیزەکان سەید تەهایان کردە قائمقامی رواندوز ، چونکە دژی کەمالیەکانی تورکیا دەوەستاو سەر بە بنەماڵەی شێخ سەعیدی پیران بوولە باکووری کوردستان ، کە کەسایەتیەکی لێهاتوو بووە ، لەگەڵ ئەوەشدا دژی رژێمی کەمالیەکان دەوەستاو کێشەی موسلی کردبووە مەهانەی دژایەتی کردنی تورکە کەمالیەکان.

١٩٢٨/٨/٢٧ مۆرکردنی بەڵگەنامەی پاریس لە فەرەنسا ، ئەویش بە قەدەخەکردنی جەنگ لە نێوان وولاتانی مۆرکردو لە سەر ئەو بەڵگەنامەیەدا ، کە ببێتە ئامرازێکی کۆتایی هێنان بە ململانێ‌لە نێوان وولاتانی ئەندام ، هەر وولاتێك گوێ رایەڵی و دەسگیر نەبێت بەو بەلگەنامەیە ، ئەوا بێ بەش دەکرێت لە مافەکانی جەنگ بەپێی ماددەو برگەکان لەدەستکەووت و یارمەتیەکان لە جیهاندا .

١٩٢٨/٩/٣ لە هێرشێکی چەکدارە شۆرشگێرەکانی کورد لە باکووری کوردستان لەناوچەی جوولەمێرگدا ، کە تیپێکی ژەندرمەی سەر بە هێزی سووپای تورکیان لەناو بردو بەرپرسی یەکەمی بایەزیدیان لەگەڵ چەندین ژەندرمە بەدیل گرت.

١٩٢٨/٩/١٠ لە هێرشێکی هێزەکانی سووپای تورك بۆ سەر ئارارات لە باکووری کوردستان ، لە ئەنجام داگیریان کردو بەویستی رامیاریەتی رژێمی تورك مامەلەیان لەگەڵ دانیشتووانی ناوچەکە دەکرد ، بەتایبەتی لەبواری راگواستن و بەتورککردن لە هەرێمەکەدا .

١٩٢٨/٩/١٦ کۆمەڵەی زەردەشتی نامەیەکی ئاراستەی شێخ مەحمود کردو لەنامەکەیدا هاتبوو... لە بەر ئەوەی بەرێزتان لەنێوو کوردا کەسایەتیەکی دیارو بەرچاون

بۆیە ئێمە بەناوی کوردایەتی حەزدەکەین هەندێ ترس بخەینە بەر دەستان کە هیوادارین بەچاوی بایەخەوە سەیریان بکەن. چونکە ئەوەی دەخرێتە بەر دەستتان تەنیا کێشەیەك نیە تایبەت بێ بەتاکە کەسێك بەڵکوو بەتەواوی گەلی کورد.

جێگەی بایەخە. ئەم داوایەش لە پێناو رێکەووتن لەگەڵ حکوومەت ئەنجام نەدرێن. چونکە نیازەکانی حکوومەت بەرامبەربە کورد باش نیە... هەروا لە ١٩٢٨/٩/٢٦ بەهەمان شێووە نامەیەکی ئاراستەی کەسایەتی کورد مەحمود خانی کانی سانان کردو لە ١٩٢٨/١٠/٢٥ وەڵامی نامەی شێخ مەحمودی حەفید بە کۆمەڵەی زەردەشت گەیشتەوە.

١٩٢٨/١١/١ رژێمی تورکیا یاسای بەکار نەهێنانی پیتی عەرەبی لە زمانی تورکی راگەیاند ، لە نووسینەکانی رۆژانە بە هەڵسووراندنی کاروباری دەووڵەت و خووێندن ، بۆ ئەم مەبەستەش مستەفا کەمال چەند رۆژهەڵاتناسێکی جوولەکەی ئامادەکرد ، بۆ نووسینەوەی پیتەکانی زمانی تورکی لەسەر شێووەی پیتەکانی زمانی ئینگلیزی ، چونکە تاکو ئێستاش تورکیا نەخاوەنی پیت و وشەو نەخاوەنی جل وبەرگ و نەخاوەنی شارستانیەتی خۆیەتی... ئەمەش بەلگەیەکی زیندووە بۆ ئەو بیروو بۆ چوونانەی تورکەکان لە هەموو بوارەکاندا.

١٩٢٨/١١/٢٨ کۆمەڵەی خۆییبوون لقەکانی لە هەرێمی باشووری کوردستان کرایەوە، وەك شاری موسڵ ، کە بەرپرسی لقی کۆمەڵەی خۆییبوون بەرێز عەبدولرەحمان گارسی بوو . هەروا لەپارێزگای سلێمانی. وەك لە راپۆرتی حکوومەتی بەریتانیا دا هاتوو دەڵێ:-

ئەندامانی کۆمەڵەی خۆییبون لە/١٨ ئەندام پێکهاتووەو سەرۆکەکەیان مستەفا سائیب و ئەندامەکانی - عەلی عرفان ، عوسمان فائق ئەفندی ، کەریم سەعید بەگ ، مستەفا شەوقی .

ئەوانی دیکەو هەروا لقەکانی هەولێریش کرایەوە ، کە سکرتێرەکەی مامەند رەمزی بوو کە مامۆستا بوو . لە یەکێك لەقوتابخانەکانی ناحیەی شەقلاوەی سەر پارێزگای هەولێر.

لەو کاتەشدا کۆمەڵە پەیووەندی بەشێخ مەحمود حەفیدو شێخ ئەحمەد

بارزانی و ئیسماعیل بەگی ئێزدی کرد ناوچە جیا جیاکانی کوردستاندا .

١٩٢٨/١٢/١٧ لە دایك بوونی نووسەری ناوداری کورد خاتوو سەبری نوری خەفاف ناسراو بە دایکی سۆلاڤ. لە شاری سلێمانی لە باشووری کوردستان .

## ١٩٢٩

١٩٢٩/٢/١٠ دامەزراندنی کۆمەڵەی لاوانی موسلمان لە شاری بەغدای پایتەختی ئێراقی دروستکراو، کە بارەگاکەی لەگەڕەکی مەنسوو ر لە کەرتی کەرخ بوو.
دوای ئەوە لقی لە شارەکانی بەسرە – موسل – دهۆك کردەوە. یەکەم رۆژنامەی لە ١٩٢٩/١١/٧ بە ناوی سەدای ئیسلام بڵاوکردەوە هەروا لە ١٩٣٤/٤/٩ گۆڤارێکی بەناوی لاوانی موسلمان بڵاوکردەوە لە شارەکەدا.

١٩٢٩/٢/١١ مۆرکردنی رێکەووتننامە لە نێوان پاپاو دەسەڵاتی شانشینی ئیتالیا بەناوی – پەیمانی – لاتران – و بەناوی – کۆنکۆردات – کە بە کێشەی دۆمانیا ناو برا ، کە سێ رێکەوتن بوو ، ئەویش لە بواری دارایی و ئایین و پەیووەند لە نێوان ئیتالیاو دەسەڵاتی پاپا ... پاپاو وولاتانی بیانی تاکوو ئێستاش ئەو رێکەووتنە لە ماددەی /٧ی دەستووری ئیتالی دا جێگیر کراوەو کاری پێدەکرێ ، کەخۆی لە ٢٧ ماددە دەگرێت بەناوی پەیمانی – لاتران – لەجیهاندا.

١٩٢٩/٤/٤ شەش نووێنەری کورد لە ئەنجوومەنی نووێنەران لە پەرلەمانتارانی کورد ، بە نووێنەرایەتی کردنی پلریزگاکانی هەولێرو، سلیمانی و ، کەکوك و ، مووسڵ ، یاداشتێکی گرنگیان ئاراستەی سەرەك وەزیرانی رژێمی شانشینی لە ئێراق کرد ، لەبارەی مافە ڕەواکانی کورد کە کاربەدەستانی ئینگلیزو رژێمی ئێراق .

بەر لەوە زۆر جار بە ووتە گفتی جێ بەجێکردنی مافی کوردیان دابوو- ئیسماعیل بەگ رواندوزی نووێنەری پارێزگای هەولێر- حەمە سالح بەگی نووێنەری پارێزگای سلێمانی- جەمال بابان نووێنەری هەولێر- حازم بەگی شەمدین ئاغا نووێنەری پارێزگای مووسڵ- سەیفوڵلا خەندانی نووێنەری سلێمانی- محەمەد فائق نووێنەری پارێزگای کەرکوك. لە باشووری کوردستاندا .

١٩٢٩/٤/٢٠ لە میانەی بەهێز کردنی پەیووەندیەکان و بەرگری کردن لە رژێمەکانیان ، رژێمی شاهەنشاهی فارسی لە ئێران بە فەرمی دانینا دەووڵەتی دورستکراوی نوێی شانشینی ئێراق.

١٩٢٩/٥/٦ کۆچی دوایی ئەمین فەیزی بەگ کە کوڕی دەروێش عەبدولقادر ئاغای شاری سلێمانیە لە باشووری کوردستان لە – دارالعجزە- لە شاری ئەستەمبۆڵی تورکیا.

١٩٢٩/٦/٢٠ لە دایك بوونی فەیلەسوف و کۆمەڵزانی بەناوبانگی فەرەنسی و جیهان – ژاندبۆدریلا – لە شاری ریمزی وولاتی فەرەنسا چاوی بەجیهان هەڵهێناوە.

شایانی باسە ژاندیە بە دیارترین فەیلەسوف و کۆمەڵزانی نیوەی دووەمی سەدەی رابردوو لەفەرنسا دادەنرێت، کە لە سەنتەرە فەلسەفیەکان بەشێووەیەکی چر گفتووگۆ لەسەر تیئۆریەکانی دەکرا... ئەم فەیلسوفە لە ژیانیا تەنیا بایەخی بەهزرو فەلسەفە نەدەدا... بەڵکوو وەك شێکەرەوەیەکی رامیاری و رێکخەرێکی دیاری رەوتەکانی – پۆست مۆدێرینزم – و قۆناخی دوای بونیادگەری – ناسراوبوو... کە ناویشی بەجەمکی – سەرووەری حەقیقەت – لکابوو. لە هەمان کات ئەندامی کۆمەڵەیەکی بچووکی هزری فەرەنسی بەناوبانگ و کاریگەربوو.

لەدوای تەواوکردنی پلەکانی خووێندن لە ساڵی ١٩٦٦ بروانامەی دکتۆرا بەدەست دێنێ. لە ساڵی ١٩٦٨ دکتۆراکەی دەکات بە بە

پـەرتووکێکی چـاپکراو , لـە سـاڵی ١٩٧٢ پـەرتووکێکی گرنگـی کاریگـەر بـەناوی – کۆتـایی – بڵاودەکاتـەوە. لـە سـاڵی ١٩٨٦ پـەرتووکێك بـەناوی ئەمـەریکا بـلاو دەکاتـەوە. ئەمـەو جگـە لـە دەیـا پـەرتووکی دیکـە بەتایبـەتی لەدوای رووداوەکەی ٢٠٠١/٩/١١ کە دوو پەرتوو ك بڵاودەکاتـەوە یەکـەمیان –:

بەناوی – گیانی تیرۆر – و دووەمیان:– بەناوی – فانتازیا – بڵاودەکاتـەوە. کـە ژمـارەی بڵاوکراوەکـانی ژانـدبۆدریلا نزیکـەی ٥٠ بەرهـەم دەبێـت کـە بەشێووەیەکی گوونجاو لەگەڵ قۆناخەکانی پەرەسەندن و پێشکەووتن تـاکوو لە ٢٠٠٧/٣/٦ بە هۆی نەخۆشیە کووشندەکەی کۆچی دوایی دەکات لە گەڵ و نیشتمان و جیهاندا.

١٩٢٩/٦/٢٢ مـۆرکردنی رێکەووتننامـەی ژنێـف لـەبارەی هـەڵس و کـەووتکردن بەرامبـەر بەدیلەکانی شەڕە هەمە جۆرەکان لە نێوان ووڵاتە جیا جیاکان لە جیهاندا .

١٩٢٩/٦/٢٧ دووبـارە پاڵپـشتی لـە رێکەووتننامـەی ژنێـف کرایـەوە لەلایـەن ووڵاتـانی پەیووەندار لـە بارەی خۆ بـە دەسـتەوەدانی سـەرباز لـە ناوەنـدەکانی شـەڕی نێوان وولاتانی جیهان و ناوخۆییەکان ، لەلایەن پەیووەندارەکانی جەنگدا .

١٩٢٩/٨/٢٤ سـەرۆکی بزووتنـەوەی رزگـای فەلەسـتین – یاسـر عـەرەفات – لە میسر لـە دایـك بـووەو بـاوکی دانیـشتووی قـوودس بـووە لـە شاری جنین .

بـەڵام بـە هـۆی بـارو دۆخـی ئەوکاتی فەلەستین بەرەو میسر کۆچیان کـردووە ، ئـەویش لـە پێنـاو دابینکردنـی بـژێووی ژیاندا .

١٩٢٩/١٠/٢٤ سەرەتای دەستپێکرنی قەیرانی قاڵ ستریت بوو کە بازارەکانی وویلایەتـە یـەکگرتووەکانی ئەمـەریکا بـە توونـدی شـلەژاند. ئـەو هەوڵانـەی کـە بـۆ بووژاندنەوە و گەرانەوەی متمانە هاتنـە ئاراوە، هیچ بەرهـەمێکی نـەبوو و -

vaiue stocke – کـه لـه ڕۆژی سـێ شـەممەی ١٠/٢٩ دا گەیـشتە پلـەی سـتفر.

ئەم قەیرانـەش لـە ئاکامدا بـوو بە هـۆی دابەزینی بەناوبانگی دەیەی سـاڵی ١٩٣٠ لە ئەمەریکادا.

١٩٢٩/١١/١٣ سـەرەك وەزیرانـی ڕژێمـی شانـشینی لـە ئێـراق عەبدولمحـسن سـەعدون بـە دەستی خۆی کووشت بەهۆی باری دەسەلاّت و کاردانەوەی لە سەر دەروونی لەشاری بەغدای پایتەختی ئێراقدا .

١٩٢٩/١١/٢٠ هێزەکانی سووپای سووری سۆڤیەت پەلاماری وولاّتی فیلەندەی دا، بەلاّم بە پێی پـەیمانی مۆسـکۆ هێزەکـانی سـووپای سـوور بۆ وولاّتەکـەیان کشانەوە بەرامبـەر بە پێدانی ١٤٤٠ کیلۆمـەتر چوارگۆشـە لـە خـاکی فیلەنـدە ، کە بۆ یەکیەتی سۆڤیەت بێت لەخاکی فیلەندە ... ئەمەیە قازانج بەهێزی چەکداری لەسەردەمی نوێی جیهان.

١٩٢٩/١١/٢٦ لـە دانیـشتنی خـوولی/١٦ی ئەنـدامانی ئەنجوومـەنی کۆمەڵـەی گـەلان کـە جێگری مندووبی سامی بەریتانیا لە ئێراق – بۆردیلۆن– باس لە باری کورد لە ئێراق کرا .

لـــەو کاتـــەش یـــەکێك لـــە ئەنـــدامانی ئەنجوومـــەن بـــەناوی – مـــستەر مارکۆتیودولی– بوو ، چەند پرسارێکی کرد لەبارەی چۆنیەتی پەیووەندی لە نێوان کوردو عەرەب لە ئێراق ، لەچەند لایەنی بەیەکەوە ژیانیاندا .

لەگەڵ چـەند لایـەنی دیکـە لـە بـارەی ڕاگەیانـدنی سـەربەخۆیی و ئەنـدامانی پەلـەمانی ئێـراق و بـەرەو بـاش چـوونی بارودۆخەکـەو چـۆنیەتی پەیووەنـدی ناوخۆی کورد لەلایەك و ، پەیووەندی لە نێوان نووێنەرانی کورد لە پەرلـەمان ، هەروا لە بارەی جووڵانەوەی ڕزگاری کورد لەهـەرێمی باشـووری کورسـتان . هەر یەکەو بەپێی خواست و ویست و داهاتوو گفتووگۆکانیان بـەڕێووە دەبرد لەناو کۆبوونەوەکانی ئەنجوومەن لە فەرەنسادا .

١٩٢٩/١٢/١٨ کۆچی دوایی زانای هەمە جۆری زانستەکان – لامارك– ، کە مرۆڤێکـی زانـای هەمەجۆری زانست بووە لە بواری نەبات و ئاژەڵ و ماوەی سی ساڵ کـاری لـەم بـوارەدا کـردووە ، هـەروا زانایـەکی بـەناوبانگ و لێهـاتوو بـووە، چـەندین دانراوەی هەیە ، یەك لەوانە – نظام الحیوانات اللافقریة – وفەلسەفەی ژیـان

١٩٢٩/١٢/٢٤ ئاوارەبوونی عوسمان سەبری ناسراو بە - ئاپۆ عوسمان- بەهۆی فشارو هەرەشەی سیخوورو دەسەڵاتی تورك لە باکووری کوردستانی داگیر کراوی ژێر دەسەڵاتی تورکیا، بەو هۆکارە بەرەو وولاتی سووریا بەرێکەووت... کە ئەویش رۆژئاوای کوردستانی پێ لکێنراوە بەدەووڵەتی سووریا.

## ١٩٣٠

١٩٣٠/١/٣٠ سەرکردەو شۆرشگێری هندستان - مەهاتماگاندی- لەلایەن بەرهەڵستکارانی لەشاری نیوودەلهی پاریتەخت تیرۆر کرا.

١٩٣٠/٣/١٢ سەرکردەی شۆرشگێری هیندستانی سەرکردایەتی بە دەیا هەزار رێپێوانکەرانی وولاتەکەی کرد بەرەو دەریا ، ئەویش بە دەربرینی ناڕەزایی دژی بەریتانیا ، کەناوچە خێدارەکانی داگیرکردبوو، کە ئەمەش یەکەم رێپێوانی ئاشتیانە بوو لەمێژوو دژی داگرکەران و بەدەستهێنانی داواکەیان لەناوچەکەدا.

١٩٣٠/٣/٢٠ لە چاوپێکەووتنێك لە نێوان مندووبی سامی بەریتانیا - فرنسیس همفریز- لەگەڵ شاهانشین فەیسەڵ گفتووگۆیان ئەنجامدا لە بارەی کێشەی کورد و هەروا لەسەر یاسای زمانەکان بەپێی یاسا زمانی کوردی دەبێ زمانی فەرمی بێ لەهەرێمی باشووری کوردستان .

بەڵام هەردوو لایان ئەوەی لا باش بوو ، کە ئەو لایەنە دوا بخرێت تاکوو یاساکە جێ بەجێ کردنی ئەنجام دەدرێت لە وولاتەکەدا .

١٩٣٠/٣/٢٥ لە دوای هەوڵ و ماندوو بوونێکی زۆر ئەویش بە بڵاو کردنەوەی یەکەم ژمارەی رۆژنامەی - ریاتازە - لە پارێزگای یەریڤانی کوردستانی لکێندراو بەکۆماری ئەرمینیای سۆڤیەتی ، کە لەو کات رۆڵی کاریگەری هەبوو لە سەر باری نەتەویی لە هەرێمەکەدا .

١٩٣٠/٣/٢٨ هەردوو شارەکانی قووستەنتینیەو ئەنگۆرای نوری ، ناویان گۆڕا بۆ ئەستەمبۆڵ و ئەنکەرەی تورکیا.

السيد نوري السعيد رئيس وزراء العراق الاسبق

١٩٣٠/٣/٣٠ کەسایەتی ناو داری ئێراقی و عــەرەبی و جیهــان نــووری سەعید یەکەم پۆستی سەرەك وەزیرانی رژێمی شانشینی لە ئێراق گرتە دەست لە دوای چــەندین پۆســتی وەزاری لــە رژێمی شانشینی لە ئێراقدا.

١٩٣٠/٤/٥ بەبۆنــەی گفتووگــۆی بــەردەوام لــە نێــوان رژێمــی شاهانــشینی لــە ئێــراق و بەریتانیا... نووێنەری شاری کەرکووك محەمەد جاف بە هاوبەشی لە گەڵ مەعروف چاووك یاداشتێکیان ئاڕاستەی مندووبی سامی بەریتانیا لە ئێراق کرد ، ئەویش لەبارەی پەیمانی نێوان ئێراق و بەریتانیاو ، هەڵوویستی کورد لە باشووری کوردستان بەرامبەر بە پەیمانەکە . کە بڕیارە لە ١٩٣٠/٦/٣٠ مۆر بکرێت ، لە نێوان هەر دوو وولآتدا .

١٩٣٠/٤/٢٢ مۆرکردنی پەیمانی لە ندەنی دەریایی... ئەو کۆنگرەیە لە ئاکامی کــــــــۆنگرەی نێوودەوولــەتی بــوو ، کــە هــەر پێــنج وولآت بەشداریان تێدا کرد ، تـــەنیا رووســــیاو ئەڵمانیا نەبێت... کە بەریتانیاو ئەمەریکاو یابان و فەرەنساو ئیتالیا بەشداریان تێدا کرد ، ئەنجامدانی ئەو کۆنگرەیەش بە هەولەکانی گفتووگۆی نێوان سەرەك وەزیرانی بەریتانیا رامزی ماکدۆنالدو سەرۆکی ئەمەریکی هۆڤۆ بوو ، ئەویش بەمۆرکردنی لە سەر چەندین خالی گرنگ لە بارەی دامەزراندنی بنکە کەشتیەکانی دەریایی جەنگی و، بە دورستکردنی کەشتی جەنگی کە کێشی هەلگرتنیان زیاتر بێت لە ٣٥ هەزار تەن لە جیهاندا .

١٩٣٠/٥/١١ کەسایەتی ناوداری کورد تۆفیق وەهبی کرا بە پارێزگاری پارێزگای سلێمانی تاکوو ٢٥/٨/ هەمان ساڵ لە باشووری کوردستان .

١٩٣٠/٥/٢٥ بڕیاردانی تەواو سەبارەت بە کێشەی دروستکردنی ئۆکروگی لە –ناوچە–ی نەتەوەیی کوردستان ،. کۆمیتەی ناوەندی بەڕێوەبەرایەتی ئازەربایجان لەبارەی راکاتاڵ و نۆخین و کوردستانەوەی دەرکرد لە ناوچەو هەرێمەکەدا .

١٩٣٠/٥/٣٠ دامەزراندنی یانەی – سەرکەووتنی کوردایەتی– لە لایەن شاعری ناودار جەمیل سدقی زەهاوی و توفیق وەهبی و مارف جاووك لە هەرێمی باشووری کوردستان.

١٩٣٠/٦/١٣ بەرپابوونی راپەرین لەناوچە شاخەویەکانی ئارارات لە باکووری کوردستان ، بە سەرکردایەتی ئیحسان نوری پاشا دژی رژێمی تورکیا کە کاردانەوەی باشی کردە سەر ناوچەکە و تاکوو سنووری سووریای گرتەوە ، کە ئەم راپەرینە بەردەوام بوو لە پەرەسەندن و پێشکەووتن و گەشەکردن لە لایەن گەلی کوردستاندا .

١٩٣٠/٦/١٥ هەڵگیرسانی راپەرینەکانی ئاگری داخ لە باکووری کوردستانی داگیر کراوی ژێر دەسەلاتی رژێمی شۆڤێنی تورکیا.

١٩٣٠/٦/٢٠ مۆرکردنی پەیمانی نێوان ئێراق و بەریتانیا ، کە نوری سەعیدو وەزیری دەرەوەی ئێراق و مەندووبی سامی بەریتانیا ، پەیمانەکەیان مۆرکرد بۆماوەی ٢٥ساڵ لە نیوانیاندا .

١٩٣٠/٦/٢١ تیرۆرکردنی سەرکردەی شۆڕشگێرو چاونەترس و ناوداری کوردی ڕۆژهەلاتی کوردستانی لکێنراو بە ئێران – سمکۆی شکاك – لەلایەن تیرۆریستەکانی سەر بە رژێمی شایەتی لە ئێران ، کە سەرکردایەتی بەدەیا داستانی سەرکەووتن و رێکەووتن و بەرگری کردن بوولە بزووتنەوەی رزگاریخوازی کورد لە کوردستان.

١٩٣٠/٦/٢٨ دامەزرانـــدنی کۆمەڵـــەی ئافرەتـــانی کوردســـتان لەشـــاری ســـلێمانی لـــە باشـــووری کوردســـتان ، لـــە لایەن حەبسەخانی نەقیب – کە بارەگای خۆی هەبوو ،... ئـــەویش بەمەبەســـتی یەکخستنی ئافرەتی کوردو رۆشنبیر کردنـی بەجیاوازی نـەکردنی رەگـەزی هاوبـەش لـەنێوان ئـافرەت و پیـاو لـە هەموو بوارە جیاجیاکانی کارکردن.

١٩٣٠/٦/٣٠ مۆرکردنی رێکەووتننامە لە نێوان رژێمی شانشینی لە ئێراق و بەریتانیا ، لە پێناو بە ئەندام بوونی ئێراق لە کۆمەلەی گەلان و فراوانتر بوونی دەسـەلاتی بەسـەری گەلانی ئێـراق ، بـە تایبـەتی گـەلی کـورد لـە باشـووری کوردسـتانی لکێنراو بە ئێراق.

١٩٣٠/٧/١١ پێکهێنانی – لیژنەی رزگارکردنی کەمـە نەتەوایەتیەکانی غـەیرە ئیسلام لـە ئێـرق– بەسـەرۆکایەتی نـەقیب هرمـز رسـام ، کـە خـۆی دانـا بەنووێنـەری راسـتەقینەو جێگـەی بـڕوا بـوو لەلایـەن کەمـە نەتەوایەتیـەکان ، ئـەویش لـەپێناو دەسـت پێکردنـی گفتووگـۆ بەنووێنەرایـەتی کەمـە نەتەوایەتیـەکان لەگەڵ ئەنجوومەنی کۆمەڵەی گەلان و ئەو حکوومەتانەی پەیوەندارن.

شایانی باسە هرمز رسام ئەفسەرێکی خانەنشین بوو لـە سووپای بەرینانیا ، لـەمانگی/١/ ١٩٣٠ سـەردانی ئێراقـی کـرد ، دوای ئـەوە پەیووەنـدی بـە ئەفسـەرێکی سـووپای بـەریتانیا بـەناوی کـاپتن – مـاتیۆ کـۆپ– لـە ئێـراق وداوای لێکـرد ... کـە دوای ئـەوەی هـەردووکیان بەیەکـەوە پەیووەنـدیان بەسەرۆک کەسایەتیەکانی مەزهەب ئایینیەکان کرد ، واتە – مەسـیحیەکان – دوای ئەوە هرمز رسام لە ١٩٣٠/٦/١٢ گەڕاوە شاری لەندەن .

بەڵام دوای ئەوە ماتیۆ کۆپ لە ١٩٣١/٤/١٩ لە ئێراق دەرچوو... ئەو لیژنەی کە کاپتن هرمز پێکی هێنابوو لە شاری لەندەن . هەڵسا بەپروپاگەندە کردن لە پێناو ئەم مەبەستەدا ، دژی ئێراق و دووپانی ئەوەی کردەوە کە بەریتانیا دەوڵـەتێکی مەسـیحیە وپێویـستە یارمـەتی ئاشـووریەکانی ئێـراق بـدات ، دوای ئـەو بـیروو بـۆ چـوونە رووی لـە فەڕەنـسا کـرد ، بەیارمـەتی دانـی ئاشووریەکانی ئێراق.

١٩٣٠/٧/١٥ دەستپێکردنی هێرشێکی بەرفراوانی چەکدراە کوردە شۆرشگێرەکان بۆسـەر ناوچـەکانی ئـارارات و پارێزگـای دەرسـیم و پارێزگـای دیاربـەکرو پارێزگـای وان و شارۆچـکەکانی دیکـە لـە بـاکووری کوردسـتانی داگـیر کـراو لـە ژێـر دەسەلاٌتی تورکیا .

ئەویش بۆ سەر هێزەکانی سووپای تورك و دام و دەزگا میریەکان .

لـە ئـەنجام ٩٠٠ چـەکداری کـورد شـەهید بـوون و ٢٤٠٠ چـەکداریش زامـدار بـوون ، هـەروا لـەو شـەڕەدا ٢٨٠٠ سـەربازی سـووپای تـورك کـوژران و ١٧٠٠ سەربازیش زامدارو بەدیل گیران لەگەڵ دەسـت بەسـەرا گرتنـی ٢٤ تـۆپ و ٦٠ مـەترەلۆزو ٦٠ هـەزار فیـشەك لەگـەڵ خـستنە خـوارەوەی ١٢فرۆکـەی جـەنگی هێزەکانی سووپای ئاسمانی تورك لە باکووری کوردستان .

شـایانی باسـە گـەر شۆرشـەکانی کـورد بـەو شـێووەو شـێوازو ناوەرۆکـە بەردەوام بوونایە بوونی کوردو رۆڵی کوردو کاردانـەوەی لـەقۆناخێکی دیکـەدا خۆی دەنواند لە سەر خاکی کوردستاندا .

١٩٣٠/٧/١٦ دەستەی نیشتمانی لـە پارێزگـای سلێمانی لـە باشـووری کوردسـتان هەڵسا بەراگەیاندنێك بە بەشداری نەکردنی لە هەڵبژاردنەکانی پەرلـەمانی لـە ئێـراق ، هەروا لە پارێزگای هەولێریش بەهەمان هەڵوویێست بڕیاری بۆ درا... لەگـەڵ چـەندین هەڵوویـست و داواکـاری دیکـە لـەبارەی مـافی کـوردو چـارەی کێـشە هەمەلایەنەکان بەتایبەتی لەبواری گەل و نیشتمان.

١٩٣٠/٧/٢١ شـێخ ئەحمـەد بـارزانی لـە باشـووری کوردسـتانی لکێنراو بەرژێمی شانـشینی لـە ئێـراق ٢٠٠ چەکداری رەوانـە کـرد بـۆ

یارمەتیدانی راپەرینەکانی ئاگری لە ناوچەی ئۆرمار لە باکووری کوردستانی داگیر کراوی ژێر دەسەڵاتی رژێمی تورکیا ، کە ئەو کات سەرکردەی کورد ئیحسان نوری پاشا رابەرایەتی راپەرینەکانی دەکرد لە باکووری کوردستان دژی داگیرکـەری رژێمـی تـورك ، کـە زیـاتر لـە ٢١٢٠٠٠ هـەزار کیلۆمـەتر چوارگۆشـەی لـە خـاکی کوردسـتان و زیـاتر لـە ٢٠٠٠٠٠٠٠ بیـست ملیـۆن کوردی کەوتۆتە ژێر دەسەڵاتی ، کە بەخواست و ویستی بیری شۆڤێنی پێك هێنانی نەتەوەی تورك مامەڵە لەگەڵ کورد دەکات.

١٩٣٠/٧/٢٦ رژێمی تورکیا بە فەرمی بالوێزی بەریتانیای لە تورکیا ئاگادار کرد لە شاری ئەنکەرەی پایتەختی تورکیا ، کە رژێمی تورکیا نارەزایی خۆی بەرامبەر بەو یارمەتیەی بارزانیەکان دەربری ، کە بۆ شۆرشی ئاگری رەوانەی کردبوو بۆ باکووری کوردستانی ژێر دەسەڵاتی تورکیا لە هەرێمەکەدا .

١٩٣٠/٨/١ سـەرکردەی کـورد شـێخ مـەحمودی حەفیـد بـەیاوەری ٣١ نیـشتمانپەروەرو کەسـایەتی کـورد لەباشـووری کوردسـتان ، لـە ریفراندۆمێکـدا داوای دامەزرانـدنی حکوومـەتی کوردیـان کـرد ، کـە بـەریتانیا خـۆی و هاوپـەیمان دابەشکەری کوردو خاکی کوردستان بوون ... بەڵام هەولەکانیان جێ بەجێ نـەکرا سـەرەرای بـروا پـێ بـوون بەکێـشەی کـوردو خـاکی کوردسـتان و مەرگەساتەکان.

١٩٣٠/٨/٥ بـەرپابوونی راپـەرینو شـۆرش لـە بـاکووری کوردسـتان بەسـەرکردایەتی سەرکردەی کورد -حاجۆ ئاغا- کە لەو کات کۆمەلەی خۆییبوون یارمەتی دەدا دژی رژێمـی تـورکو شـەرەکەش لەناوچـەی نوسـەیبین بـوو لـە بـاکووری کوردستان.

١٩٣٠/٨/٧ حـاجی ئاغـای هـەڤێرگیو سـێ کەسـایەتی کـورد لـە ناوچـەی پارێزگـاری یـەریڤانی کوردستان ، لەگـەڵ پـەنجا سـووارو دووسـەد پیـادەی هـەڤێرگیو سەد چەکداری هۆزی گیلان بە سـەرۆکایەتی رەسول ئاغاو عەگید ئاغا ، لە ئاستی ئەزنێردای سنووری نێوان سووریاو تورکیا دەبرنو لەوێ چەندین چاوپێکەووتن لەگەڵ کەسایەتی ناوچەکە ئەنجام دەدەن ، بەتایبەتی لەگەڵ سرحان- سۆران ئاغاو سۆران بەگ- کە دەبێتـە هـۆی نـارەزایی تـورکو داوا لـەهێزەکانی فەرەنـسا دەکـات گـەمارۆ بـدرێن ، لەئـەنجام بـەرەو بـەیروتی پایتـەختی لوبنـان هـەنگاو دەنـێنو دوای ئـەوە دەسـتگیر دەکـرێنو رەوانـەی دادگای دیاربەکر دەکرێنو دوای دادگایکردنیان لەسێدارە دەدرێن.

١٩٣٠/٨/١١ نووێنەری بالای بەریتانیا لە پارێزگای سلێمانی لە باشووری کوردستان ، وتـارێکی بۆ کەسـایەتیو پیـاوانی ئـایینیو ئاغاکـان خووێنـدەوەو تیایـدا ووتی:- حکومەتی بەریتانیا بە هیچ جۆرێك هانی نەتەوەی کورد نادات لـەپێناو سـەربەخۆیی لەپارچـەیەك لـە پارچـەکانی دیکـەی خـاکی کوردستان بەهۆی بەرژەوەندی تایبـەتی بەریتانیاو هاوپـەیمانان لـەو بارو دۆخانـەی کە نەگونجاو بێت لە کێشووەرەکەدا .

١٩٣٠/٨/١٣ لە بابەتێکی دیار رۆژنامەی باری بەیروتی بلاوکردۆتەوەو دەڵێت :- تۆرانیـە تورکــەکان تــاوانی کووشــتنیان بــەکۆ ئــەنجام داوەو ســەدان گونــدیان سووتاندووە لە ناوچەیەکی نزیك لە شارۆچکەی، ئاکرێ، ئارارات، کە ٢٢٠ گونـدی کـورد خـاپوور کـراوەو پـاش مـاوەی دانیـشتووانی ئـەو گوندانـە کـە نزیکــەی ١٠٠٠٠٠ کــەس دەبــوون لــە نێــوان راگوواســتنی کوردەکــان بــۆ ناوچـەکانی دیکـەی تورکیـا. شـایانی باسـە رژێمـی تورکیـا لـە سـاڵی ١٩٤٦ رایگەیانـد کـە تورکیـا کەمینـەی کــــــوردی تێدانیـە و بـەم راگەیاندنـە هێڵێکی راست و چەپی بەسەربوونی گەلێك بەتەواوی داهێنا.

١٩٣٠/٨/١٧ لە دایك بوونی شاعیرو رووناكبیری بەناوبانگی سەدەی رابردوو ئینگلترا – ئێدوار رجیمس تیدهیوز– لە رۆژ ئاوا هەرێمی بۆركشایەر لە ئینگلتەر.
شایانی باسە تیدهیوز بەناوبانگترین شاعیری سەردەمی بیستەم بووە لە بەریتانیا ،هەروا لەهەموو شاعیرێكی دیكەی ئەم وولاتە زیاتر هەواڵی لەسەر لاپەڕەكانی رۆژنامەو گۆڤارەكان دەبینرا... تەنیا لەبەر ئەوە نا كەشاعیر بوو هەر چەندە لەلای رەخنەگرانەوە لەهەموو شاعیرە هاوچەرخەكانی وولاتەكە بەتواناتر بوو... شایانی باسە شاعیری ناو دار لە ١٩٩٨/١٠/٢٨ كۆچی دوایی كردووە لە وولاتەكەیدا .

١٩٣٠/٨/٣٠ گرێدانی كۆبوونەوەی ئەنجوومەنی كۆمەڵەی گەلان لە شاری زیورخ لە سەرداوای نووێنەرانی ئەرمەن لە باكووری كوردستان ، لە سەر بەردەوام بوون لە ئیش و ئازاردانی نەتەوەی كوردو دەربەدەركردنی لەخاكی خۆی كە لەلایەن رژێمی تورك ئەنجام دەدرێت لە هەموو بوارەكان ، بە تایبەتی لە بواری بە توركردن و راگواستن و هێنانی خێزانە توركەكان بۆ باكووری كوردستان و نیشتەجێ كردنیان لە پێناو گۆرینی دیمۆگرافیای باكووری كوردستان.

١٩٣٠/٨/٣١ دەستەی نیشتمانی ناوەندی لە باشووری كوردستان یاداشتێكی ئاراستەی كۆمەڵەی گەلان كرد ، لەبارەی چەند داوایەكی دیاری كراو لەبارەی مافی كورد لە ئێراق و رامیاریەتی رژێمی شاهانشینی لە ئێراق . بەرامبەر بە كورد لەگەڵ دامەزراندنی حكوومەتی كوردی لەژێر پارێزراوی راستەوخۆی كۆمەڵەی گەلان ، ئەویش بۆ سكرتێری لیژنەی ئینتدابی هەمیشەیی لە كۆمەڵەی گەلان لەشاری ژنێف لەسویسرادا بەرز كرایەوە .

السيد نوري السعيد رئيس وزراء العراق الاسبق

١٩٣٠/٩/٢ لەو کاتەی کە سەرەك وەزیرانی ئێراق نوری سەعید بە سەر دانێکی فەرمی لە شاری ئەنکەرەی پایتەختی تورکیا بوو ، سەرەك وەزیرانی تورکیا عیسمەت ئەنوونوو داوایەکی ئاڕاستەی نوری سەعید کرد، بە پەڕینەوەی هێزەکانی سووپای تورك لە سنووری ئێراق ، ئەم داوایەش لە پێناو گەمارۆدان و دامرکاندنەوەی شۆڕشگێڕە کوردەکان لەچیای ئاراراتدا لە باکووری کوردستان ، نوری سەعیدیش ڕەزامەندی لە سەر داواکەی سەرەك وەزیرانی تورکیا کرد .

بەڵام سەرەك وەزیرانی تورکیا داواکەی بەدەستنووس بوو نەك بەوتەی سەر زاری ، بەڵام نوری سەعید لە هەمان کات ئاگاداری بەریتانیەکانی کردو ئەوانیش لە وەڵامدا وتیان... تورکیا تووشی گێژاو بووە بەهۆی لە ناوبردنی کوردو ئەرمەن ، ئەمەش دوا ڕۆژی بەپێچەوانە هەڵدەگەڕێتەوە لە وولاتەکەیان و لە ناوچە و لە جیهاندا .

شاری سلێمانی لە سەردەمی بزووتنەوەی شێخ مەحمود

١٩٣٠/٩/٦ راپـەڕینی جـەماوەری کـورد لــە پارێزگــای سـلێمانی لـە هـەرێمی باشووری کوردستان ، دژی داگیرکــــــەری رژێمـی شانـشینی لـە ئێـراق بـە پـشتگیری بەریتانیا بەرپابوو. لـە ئـەنجام ٤٥ هـاوولاتی کورد بە گوللـەی دوژمن شەهید کران ، کە ئەو رۆژە ناوزەند کرا بە رۆژی رەشی /٦/ئەیلول ، کە لە بەر دەرگای سەرای سلێملنی بوو، ئەمەش بووە هۆی ئەوەی کە شێخ مەحمودی حەفید هاتەوە گۆرەپانی تێکۆشان و دەستی لەو رێکەووتننامەیە هەلگرت ، کە بەناچاری مۆری کردبوو لە گەڵ رژێمی شانشینی لە ئێراق و نووێنەری بەریتانیا.

١٩٣٠/٩/٦ نووێنەری ئافرەتانی کورد حەبسەخانی نەقیب لە راپەرینەکەی دژی پەیمانی بەریتانیاو بە گەیاندنی دەنگی ئافرەتی کورد بەکۆمەڵەی گەلان ، ئەویش بە پێـشکەشکردنی داخوازیـەکانی لـە پێنـاو چارەسـەرکردنی بـاری سـەختی خەڵکی کوردستان.

١٩٣٠/٩/١٠ هێزەکانی سووپای تورک لە ئەنجامی هێرشێکی بەرفراوان توانی چیای – رینـویَ–ی نێـوان هـەردوو ئـاراراتی کـەلی سـەردار بلاخـی لـە بـاکووری کوردستان داگیر بکات لە باکووری کوردستان .

١٩٣٠/١٠/١٠ لە دایك بوونی نووسەری شانووی ئینگلیزی– هارۆلد پیتەر– لەرۆژئاوای شـاری لەنـدەنی پایتـەختی بـەریتانیا ، لـە گـەڕەکێکی جوولەکـە نـشین لـە وولاتەکەدا .

شایانی باسە کە لە دوو مانگی/ ١٩٩٩دا ٦٠ نووسەرو رۆشنبیری کوردو جیهانی– یەشارکەمال ، محەمەد نوزون ، ئەحمەد تاڵتان ، ئۆرهان یاموك ، گۆتنەر گراس ، کۆستا گاڤرای ، هارۆلد پیتەر، ئینگمار بێرگمان ، ئاسەر

میللەر- سەردانی تورکیایان کرد، لەشاری ئەستەمبۆڵ و لەکۆنگرەیەکی ڕۆژنامەنووسیدا بانگەوازێکی تەباییان ئاراستەی تورکیا کرد... ئەو ٦٠ نووسەرو ڕۆشنبیرەی کە ویژدانی جیهان گووتیان لەدەستپێکی سەدەی نوێدا بەشێوەیەکی دیموکراسیانە پرسی کورد چارەسەر بکات بەتایبەتی لە باکووری کوردستان لە تورکیادا .

١٩٣٠/١٠/١٦ ئەنجوومەنی وەزیرانی ڕژێمی شانشینی لە ئێراق لە بریارێکیدا رایگەیاند ، کە بەهێزی سووپا شۆرشی شێخ مەحمود سەرکووت دەکات لە هەرێمەکەدا .

١٩٣٠/١١/١ لە دایك بوونی نووسەرو ڕووناکبیری نەتەوەی کورد، پرۆفیسۆر - مەعروف عەبدولقادر مەعروف عەزیز ئاغا خەزنەدار - ناسراو بە - مارف خەزنەدار - لە شاری هەولێر لە هەرێمی باشووری کوردستان، مامۆستا مارف خەزنەدار لە ساڵی ١٩٥١ قۆناخەکانی سەرەتایی و ناوەندی لە شاری هەولێر تەواو کردووە و پۆلی چوارەمی وێژەیی لە ئامادەیی

کەرکوك و هەولێر تەواو کردووە.دوای ئەوە لە ساڵی ١٩٥٢ بە مامۆستای سەرەتایی لە هەولێر دامەزراوەو دوای ئەوە بۆتە فەرمانبەر لە بەرێوەبەرایەتی - معارف - لە پەروەردەی هەولێر. و بەردەوام بووە لەو کارەی لە شارەکانی کووت و بەغدا تا ساڵی ١٩٥٧، دوای ئەوە چۆتە کۆلێژی ئاداب و زانست لە زانکۆی بەغدا لە ساڵی ١٩٥٧، بە بەدەست هێنانی بروانامەی - BA - لەزمانی عەرەبی، لە هەمان کاتیش کاری فەرمانبەری کردووە، واتە خووێندن و کاری فەرمانبەریەتی بەیەکەوە کردووە.

دوای ئەوە لە سەر داوای خۆی بۆتە مامۆستای زمانی عەرەبی لە

قوتابخانــەی ناوەنــدی ڕۆژهــەلاّت و لــە هــەمان کــات وانــەی ووتۆتــەوە لــە قوتابخانەی ناوەندی کەرکوکی ئێواران لە نێوان ساڵەکانی ١٩٥٧ – ١٩٥٩، دوای ئەوە لە مانگی/٥/١٩٦٠ پەیووەندی کردووە بە تووێژینەوەی زانستی ئێراق، بۆ ماوەی نۆ مانگ لە مۆسکۆی پایتەختی سۆڤیەت بووە لە پەیمانگای فێربوونی زمانی رووسی بیانیەکان.

دوای ئەوە لە شاری پترۆسبۆرگ جێگیر بووە وەك قوتابییەکی خوێندنی بالاّ لە بەشی لێکۆڵینەوەی زمانی کوردی لە پەیمانگای خوێندنی ڕۆژهەلاّتی سەر بە ئەکادیمیای زانستەکانی ڕووسیا، دوای تەواوکردنی خوێندن بڕوانامەی دکتۆرای بە دەست هێناوە لە زمان و ئەدەب لە مانگی /١٢/١٩٦٣.

لە نامەی دکتۆراکەشی جێگەی گرنگی پێدان بووە کە لە سەر – مێژووی ئەدەبی کوردی نویٚ – بووە لە نێوان ساڵەکانی ١٨٩٠ – ١٩٦٠. و لیژنەی گفتووگۆکە بڕیاریدا بە چاپ کردنی لە کتابێك و لە لایەن خانەی بلاّوکردنەوەی ئەکادیمیای مۆسکۆ لە ساڵی ١٩٦٧ بلاّوکراوەتەوە، کە ئەمە یەکەم کتاب بووە ، کە چاپ بکرێت لە سەر ئەدەبی کوردی بە زمانی ئەوروپی. هەروا لە ماوەی خوێندنی لەو دەزگایەدا دکتۆر مارف خەزنەدار توانیوویەتی فەرهەنگی کوردی – رووسی دابنێ و ئەو فەرهەنگە لە ساڵی ١٩٨٣، بە چاپگەیەندرا.

هەروا لە ماوەی بوونی لەو کارانەدا بەشداری لە چەندین کۆڕو کۆبوونەوەو کۆنگرە کردووە، و بەشداری لە کۆنگرەی جیهان بۆ لێکۆڵینەوە لە سەر ئەدەبی ڕۆژهەلاّت، کە لە وەرزی پایزی ساڵی ١٩٦٧ گرێدرا.

دوای ئەوە گەڕاوەتەوە ئێراق و لە کۆلێژی ئاداب لە زانکۆی بەغدا لە ساڵی ١٩٦٨ دامەزراوەو بۆتە بەرپرسیاری بەش، بەردەوام بووە تا ساڵی ١٩٨١، لە دوای ئەوە خانەنشین کراوە.

هەروا بەر لەوەش لە ١٩٦٩/١٢/١، پلەی مامۆستای پێدراوە – المدرس – و دوای ئەوە لە ١٩٧٣/١٢/١، پلەی مامۆستای پیٚ بەخشراوە، هەروا دوای ئەوە پلەی مامۆستا – پرۆفیسۆر – لە ١٩٧٩/١٢/١٨، پیٚ بە خشراوە، هەر لەو کاتەشدا مامۆستا مارف خەزنەدار بەشی زمانی کوردی لە کۆلێژی

پەروەردە لە زانکۆی بەغدا لە ساڵی ١٩٧٣،کردۆتەوەو دوای ئەوە بۆتە سەرۆکی بەشی زمانی کوردی لەم کۆلێژەدا.
هەروا مامۆستا مارف خەزنەدار وەك توویژەرو سەر نووسەر لە رۆژنامەو ئەو گۆڤارانەی خوارە کاری کردووە. وەك :-
١- رۆژنامەی هەولێر، کە بە زمانی کوردی و عەرەبی دەردەچوواندرا. لە نێوان ساڵەکانی ١٩٥٠ - ١٩٥٣.
٢- گۆڤاری - ڕۆژنامە - کە هەفتانە بوو بە زمانی عەرەبی لە شاری بەغدا لە نێوان ساڵەکانی ١٩٥٣ - ١٩٥٤.
٣- ڕۆژنامەی ڕای گشتی ڕۆژانە کە بە زمانی عەربی دەردەچووانرا لە ساڵی ١٩٥٥ لە شاری بەغدا.
٤- گۆڤاری - شەفەق - کە ماگانە بوو بە زمانی عەرەبی و کوردی لە شاری کەرکوك دەردەچووانرا لە نێوان ساڵەکانی ١٩٥٨ - ١٩٥٩.
٥- هەروا بەشداری لە دەرچوواندنی گۆڤاری- پرشەنگ - کردووە کە لە لایەن کۆمەڵێك ڕۆشنبیری کورد لە ئەوروپا بە زمانی کوردی لە ساڵی ١٩٦٦ - ١٩٦٧ دەردەچووانرا.
٦- گۆڤاری - دەفتەری کوردەواری - بە هاوکاری براکەی جەمال خەزنەدار دەری کرد لە شاری بەغدا لە ساڵی ١٩٧٠.
٧- دامەزراندنی گۆڤاری - نووسەری کورد - کە گۆڤاری یەکیەتی نووسەرانی کورد بووە بە زمانی کوردی لە شاری بەغدا لە ساڵی ١٩٧١ - ١٩٧٢ دەرچووانرا.
٨- بەشداری کردووە لە دامەزراندنی گۆڤاری - ڕۆژی کوردستان - کە گۆڤاری کۆری ڕۆشنبیری کورد بوو کە بە زمانی عەرەبی و کوردی دەرچووانرا.
لە گەڵ ئەوەشدا مامۆستا مارف خەزنەدار بەشداری کردووە لە دامەزراندنی یەکیەتی ئەدەبیاتی کورد و کۆری ڕشنبیری کورد لە شاری بەغدا.
هەروا مامۆستا مارف خەزنەدار ئەندامی سەندیکای ڕۆژنامە نووسانی ئێراق بووە لە ڕۆژی دامەزراندنیەوە لە ساڵی ١٩٥٩، دوای ئەوە لە ساڵی ١٩٧٨ لێی کشاوەتەوە . هەروا ئەندامی یەکیەتی ڕۆژنامە نووسانی جیهانیە لە

ساڵی ١٩٦٠ تاکوو تەواو بوونی ئەم مێژوونامەیە. هەروا ئەندامی کۆڕی ئارەزومەندانی بوو لە کاتی ئێراق بووە لە ساڵی ١٩٧٠ وە. هەروا بەشداری لە پێنج کۆنگرەی زانستی کردووە چ لە ناوخۆو چ لە دەرەوە، کە لەوکاتەی لە وولاتی جەزائر کاری کردووە.

هەروا مامۆستا مارف خەزنەدار ئەندامی بە دەیان لیژنە پێدانی ماستەرو دکتۆرای کردووە. دوای ئەو هەموو کارە گرانانە مامۆشتا مارف خەزنەدار دووبارە گەڕاوەتەوە زانکۆی سەلاحەدین لە ساڵی ١٩٨٨ لە شاری هەولێر بە ووتنەوەی وانە بۆ هەر سێ قۆناخی بەکالیۆڕۆس و ماستەرو دکتۆرا. و هەروا ئەندامی ئەنجوومەنی زانکۆ بووە. دوای ئەوە لە ساڵی ١٩٩٢ لە ڕێگای هەڵبژاردن سەرکەووتنی بە دەست هێناوە بە پلەی مامۆستای یەکەم لە زانکۆی سلاحەدین لە لایەن وەزارەتی خوویندنی باڵای ئێراق.

هەروا مامۆستا مارف خەزنەدار ئەندامی کارای کۆڕی زانستی کوردستانە لەو کاتەی کە دامەزراندراوە لە ساڵی ٢٠٠٠، لە گەڵ چەندین کاری دیکەی وێژەیی و زانستی و زمانەوان.

هەروا مامۆستا مارف خەزنەدار لە ماوەی ژیانی زیاتر لە ٣٢ بەرهەمی خستۆتە بەردەستی خووێنەری کورد لە خووێنەرو ڕۆشنبیرو ڕووناکبیری گەلەکەمان و کتیبخانەی کوردی لە کوردستان و ئێراق و وولاتانی دیکەی جیهان.

دوای ئەو هەموو کارانە ئاواتە خوازین کە مامۆستا مارف خەزنەدار، تەمەن درێژ بێ و لە ژیان ماوەو بەردەوامە لە کارە پیرۆزەکانی لە پێناو خزمەتکردنی گەل و نیشتیمانەکەیدا، هیوای تەمەن درێژی و لەش ساغی بۆ دەخوازین لە هەموو بوارەکانی ژیانیدا.

١٩٣٠/١١/١ نووێنەری پارێزگاکانی هەولێرو مووسڵو کەرکوكو سلێمانی بەشداریان لە ئاهەنگی کردنەوەی پەرلەمانی ئێراق کرد لە شاری بەغدای پایتەختی ئێراق.

١٩٣٠/١١/٣ هێزە چەکدارەکانی شێخ مەحمودی حەفید کە ژمارەیان زیاتر لە ٣٠٠ چەکدار دەبوو ، توانیان شارۆچکەی پێنجووین لە هەرێمی باشووری کوردستان رزگار بکاتلە ژێر دەستی هێزەکانی سووپای هاوبشی ئێراق و

بەریتانیا لە هەرێمەکەدا .

١٩٣٠/١١/٨ یەکێك لە رووداوە دڵخۆش و گرنگەکان گەیشتنی رووناکی وزەی کارەبا بوو بۆ ئێراق... کە لە کۆتایی بیستەکانی هەمان سەدە وەزی کارەبا گەیشتە شارەکانی ئێراق... سەبارەت بەگەیشتنی وزەی کارەبا بۆ هەولێر بە هەوڵ و تواناو کۆششی – ئەحمەد چەلەبی – بوو... ئەویش دوای ئەوەی کە داوایەکی بەپشتگیری ئەنجوومەنی شارەوانی هەولێرو موتەسەرفی هەولێرو وەزیری کاروباری ناوەخۆ پێشکەش بەحکوومەت کرد، بەمەبەستی دامەزراندنی مۆلیدەیەکی کارەبا لە پێناو رووناککردنەوەی ماڵ و شەقام و دام و دەزگاکانی شاری هەولێر لەوکاتدا.

دوای وەرگرتنی رەزامەندی حکوومەت بەدانانی مۆلیدەی کارەبا لەناو شارەکە لەم رۆژەدا پرۆژەی دامەزراندنی کارەبای ناو شاری هەولێر تەواوبوو و لەگەڵ تەواوبوونی گەیشتە چوار ماڵ لەدانیشتووانی شاری هەولێر.ئەوانیش ماڵی عەبدولحەمید بەگ – ماڵی موتەسەرف... واتە پارێزگار – بەرێوەبەری پۆلیس زیا ئەدهەم... دوای ئەوانەش بۆ چەند ماڵێکی دیکە وزەی کارەبا فراوان بوو... واتە لە ساڵی ١٩٣٠ وزەی کارەبا گەیشتە ناو شاری هەولێرو رووناکی گلۆپەکانی ماڵ و کۆڵانەکانی رووناککردەوە لە هەرێمی باشووری کوردستان.

١٩٣٠/١١/١٤ زۆربەی کالمیکەکان لە سەرەتای سەدەی نۆزدەهەم ، لەناوچەکانی گۆبیرنی – پارێزگای – ئاستراخان نیشتەجێ بوون ، کالمیکەکان کاربەدەستی زۆرباش بوون ، و کاربەدەستی زۆرباشیان لە ناو دەسەڵاتداریەتی دەوڵەتی رووسیا دا هەبوو ، کە پرسیاری پێك هێنانی هەرێمی ئۆتۆنۆمی کالمیك دەرچوو، لە ١٩٣٥/١٠/٣٠ ئەم هەرێمە ئۆتۆنۆمیە بووە کۆمارێکی ئۆتۆنۆمی.

دوای ئەوە بڕیاری هەڵووەشاندنەوەی کۆمارەکە لە ١٩٤٣/١٢/٢٧ درا، بە تاوانی هاوکاری کردنیان لەگەڵ ئەڵمانیای نازی و ڕاپەڕین دژی دەسەڵاتی سۆڤیەتدا ، تەواوی دانیشتووانی بە زۆر بۆ ناوچەکانی دیکەی سۆڤیەت ڕاگوێزران ...لەسەرەتای ساڵی ١٩٥٧ دەستووری گەڕانەوەی کالمیکەکان و پێك هینانەوەی کۆمارەکەیان درا ، دوای شەش مانگ واتە لە ١٩٥٨/٧/٢٩

دا ئـەم کۆمـارە لـە ۱۹۹۰/۱۰/۱۸ دامەزرایـەوە و لـە ۱۹۹۰/۱۰/۱۸ پەرلـەمانی کامیلـك بڕیـاری گـۆڕینی کۆمـاری ئۆتۆنۆمیـد ، بـە کۆمـارێکی سـەربەخۆ لـە چوارچێوەی سنووری ڕووسیای فیدرال .

شـایەنی باسـە کـە کامیلکـەکان بـە پێـی سـەرژمێری سـاڵی ۱۹۸۹ ی یـەکێتی سۆڤیەت ژمارەیان ۱۷۳،٥۰۰ هەزار کەس بووە و زمانیان لـە بنەماڵـەی زمانـە مەگۆلیەکان و لەچەند زاراوەیەك پێك هاتبوو، کالمیکەکان لەسـەدەی ١٦ دا کەووتنـە بـەر پـەلاماری خـانی، مەگۆلیـەکان و چینیەکان و کازاخـەکان ، کـە ئەمەش بووە هـۆی هـەلاتن و ئاوارەبوونیـان ، لـە سـاڵی ١٦٠٨-١٦٠٩ بەپێی بەیاننامـــەو بەڵگەنامـــەکان ، بەشـــێوەیەکی ئارەزوومەندانـــە هاتنـــە نـــاو ئیمپراتۆریەتی ڕووسیا .

کامیلکەکان لە تـەواوی شـارەکانی ڕووسـیا داو لـە بزووتنـەوەی جووتیاریدا بەشداریان کردبوو، لەکاتی لەشکرکێشی پیتر – قەیسەر – ی یەکەم بۆ سـەر ئێـران و چـالاکانە بەشـداریان کـردووە ، لـە سـاڵی ۱۸۱۲ لـە ڕیـزی لەشـکری ڕووسـیادا گەیشتنە پـاریس ... بـەلام بـۆ کـورد دەسـەلاتی سـۆڤیەت لـەدوای کۆچی لینین بە ناشرینترین شێوە پەلاماری کوردیان دا لەسـەر خـاکی خـۆی لە کوردستان.

۱۹۳۰/۱۲/۱۲ بۆ یەکەم جار لە مێژووی جیهـانی سینەما فلیمی سینەمای بێ دەنـگ بـەناوی – ئابی و رابی – لەتارانی پایتەختی ئێران پەخشکرا.

۱۹۳۰/۱۲/۲۲ بڕیاری لیژنـەی ئینتدابی هەمیشـەیی لـە ئەنجوومـەنی گشـتی کۆمەڵـەی گـەلان لەسەر یاداشتەکەی دەسـتەی نیشـتمانی ناوەنـدی لـە باشـووری کوردسـتان ، بـەم جـۆرە وەلامـی یاداشـتەکەی داوەتـەوە:– هـیچ بڕیارێـك نییـە لەکۆمەڵـەی گـــەلان دەرچـــوو بێـــت ، بەپاکانـــەکردن لـــە داوای پێـــشکەش کـــراو ، بـــە دامەزرانـدنی حکوومـەتی کـوردی لـەژێر چـاودێری کۆمەڵـەی گـەلان ، کـە ئـەو داوایەش هیچ بنەمایەکی نییە لەبەندەکانی یاسای کۆمەڵەی گەلاندا .

## ۱۹۳۱

۱۹۳۱/۳/۱۷ بـە هـۆی بـاری ناوچـەی بـارزان لـە باشـووری کوردسـتان و جمووجـوڵی جەماوەرەکە ... لەکۆشکی شانشینی لە ئێراق فەیسەڵی یەکەم کۆبوونەوەی

لە گەڵ مەندووبی سامی بەریتانیا و سەرکردەی گشتی هێزەکانی سووپای بەریتانیا لە ئێراق و سەرەك وەزیران نوری سەعیدو وەزیری بەرگری تەها هاشمی و سەرۆکی ئەرکانی سووپای ئێراق و راوێژکاری وەزارەتی ناوخۆو چاودێری گشتی بەریتانیا لە سەر سووپای ئێراق – کۆرنوالیس– ئەنجامدا،... بۆ تاوتۆ کردنی باری ناوچەی بارزان لە هەرێمی باشووری کوردستان و چارەسەر کردنی ... بەڵام کۆبوونەوەکە هیچ ئاکامێکی لێ رانەگەیەندرا. لە لایەن ئەنجامدەرانی کۆبوونەوەکە لە ئێراق .

١٩٣١/٣/٢١ سەر کردەی کورد شێخ مەحمودی حەفید نامەیەکی ئاراستەی سەرۆکی ئەنجوومەنی کۆمەڵەی گەلان لە پاریسی پایتەختی فەرەنسا کرد ،... لەبارەی باری کوردو لکاندنی باشووری کوردستان بەرژێمی شانشینی ئێراقی دورستکراو، لەنامەکەیدا داوای دامەزراندنی حکوومەتی کوردی لە باشووری کوردستان کرد ، لە ژێر ئینتیدابی کۆمەلەی گەلان لە هەرێمەکەدا

١٩٣١/٣/٢٨ ئەندامی ئەنجوومەنی نووێنەران سەعد سالحی ناوبراو لەناو هۆڵی پەرلەمانی ئێراق هاواری کردو گوتی:– یادەبێ شێخ مەحمود لەناوبەرین . یاخوود دەبێ ئەو مافانەی داوای دەکات لە باکووری ئێراق بۆی جێبەجێ بکرێت لە هەرێمەکەدا .

١٩٣١/٤/١ بۆ یەکەم جار لەمێژووی ئێراقی دورستکراو ، دراوی ئێراقی بە ناوی– دینار– بلاوکرایەوەو بووە هۆکارێکی گرنگ لە پەیووەندی

ئابووری‌و بازرگانی لە کۆمەڵگای بەیەکەوە نووساندنی بە زۆری گەلانی ئێراق ، بە تایبەتی گەلی کوردستان بە ئێراق بەپێی پەیمانە بەدناوەکەی لۆزانی ١٩٢٣/٧/٢٤ی هاوپەیمانان بەسەرکردایەتی بەریتانیادا .

١٩٣١/٤/٥ بەرپابوونی شەڕی ئاوباریك لە نێوان هێزەکانی سووپای رژێمی شانشینی لە ئێراق و چەکدارانی کورد لە باشووری کوردستان.

١٩٣١/٤/١٢ بۆ یەکەم جار لە مێژووی ئەسپانیا کۆمارییەکان سەرکەووتنیان بەدەست هێنا ، بەرامبەر شانشینیەکان لە هەڵبژاردنەکانی ئەنجوومەنی شارەوانیدا ، کە زۆربەی دەنگدەران لە شاری مەدریدی پایتەختو شارە گەورەکانی ئەسپانیاو بەرشلۆنە بوو، بەو هۆکارە شانشین دەستی لە کاری رامیاری کشاندەوەو لەووڵات دەرچووە دەرەوە .

بەڵام وەزیرەکانی شانشین – ئەلفونس– سیازدەهەمی هەڵاتوو دەستیان لە بۆستەکانیان هەلگرت ، بێ ئەوەی چاوەروانی پێك هێنانی حکوومەتی نوێ بکەن لە ئەسپانیادا .

١٩٣١/٤/١٤ لە دوای هەڵاتنی شانشینی ئەسپانیا ئەلفۆنسی سیانزەهەم بەهۆی هۆکاری سەرنەکەووتنیان لە هەڵبژاردنەکان ، بۆ یەکەم جار لەمێژووی ئەسپانیا رژێمی کۆماری راگەیەندرا ، بەهەڵووەشانەوەی رژێمی شانشینی لە هەموو بوارە جیاجیاکان..

١٩٣١/٤/٢٤ سەرکردەی کورد لە باشووری کوردستان شێخ مەحمودی حەفید نامەیەکی لە بارەی کێشەو مافی کورد لەباشووری کوردستانی لکێدراو بە ئێراق ، ئاراستەی کۆمیسەری بەریتانیا کرد ، لە خۆرهەڵات لەپێناو دەست پێکردنی گفتووگۆ لە نێوان کوردو بەریتانیاو ئێراق لە ووڵاتەکەدا .

١٩٣١/٥/٥ کتێبەکەی محمد ئەمین زەکی بەناوبانگی – کوردو کوردستان– لە یەك بەرگی قەشەنگ بەچاپگەیەندرا ، کە مێژووی کوردو کوردستان بەشێوەیەکی لەبار هەلدەسەنگێنێ لە هەموو بوارەکان بەتایبەتی لە بوارەکانی نەتەوەیی و نیشتمانیو دابو نەریتو زمانو مێژوو کەلتوورو شووێنەوارو پەیووەندیەکان ، لەگەڵ گەلانی دیکەی ناو کوردستانو دەرەوەی کوردستانو شۆرشو

راپەرینەکاندا

١٩٣١/٥/١٣ ڕژێمی شاهانشینی لە ئێراق راپۆرتێکی ئارەزوومەندانەی نوێی ئاڕاستەی سکرتێری گشتی کۆمەڵەی گەلان کرد . لە پێناو بوونی بە ئەندامی کۆمەڵە ، کە راپۆرتەکە بەسەر ئەندامانی ئەنجوومەنی کۆمەڵە دابەش کرا ، ئەویش لەپێناو گفتۆو گۆکردن لەسەر بەجێبەجێ کردنی داواکەی ڕژێمی ئێراق.

شایانی باسە کە ناوەڕۆکی ئەو راپۆرتە بوارەکانی رامیاری و کارگێڕی و ئابووری و بازرگانی و کۆمەلایەتی و سەربازی لە خۆ دەگرت، و لەلایەکی دیکە بەدەرخستنی هەندێ زانیاری لەبارەی کورد لەباشووری کوردستان ، بەپێی زنجیرەیی مێژوویی .

هەروا لەبارەی راپەرین و خۆپیشاندانەکانی کوردو باری کورد لەهەموو بوارەکان لەژێر دەسەلاتی ڕژێمی شاهانشینی لە ئێراق ، هەروا لەبارەی نەتەوەکانی دیکەی وەك تورکمان و ئاشوورو سابیئەو خواست و ویست و بەرژەوەندی داهاتووی ڕژێمی شاهانشین لە ئێراقدا .

١٩٣١/٥/١٣ لە ئەنجامی ڕووبەڕووبوونەوەی هێزە چەکدارەکانی شێخ مەحمودو هێزەکانی سووپای ڕژێمی شانشینی لە ئێراق و بەریتانیا ، ئەویش بە بۆردومان کردنی شاری سلێمانی و دەووروبەری و شاری کەرکوك بە فرۆکە جەنگیەکان لە باشووری کوردستان ... کە بووە هۆی شکانی هێزەکانی چەکداری کورد ، لە ئاکام بووە هۆی خۆ بەدەستەوەدانی - شێخ مەحمودی حەفید - بە هێزەکانی سووپای ئێراق و بەریتانیا و بە دروست بوونی بارو دۆخێکی نا لەباری ناوچەکانی پارێزگای سلێمانی و کەرکوك لەباشووری کوردستانی لکێدراو بە ئێراق.

فرۆکەکەی A.T. Wilson

١٩٣١/٥/١٩ هێزێکی چەکداری کورد لە باکووری کوردستان هێرشیان کردە سەر سەربازگەیەکی سوپای فارسی لە ئێران لە رۆژهەلاّتی کوردستان لە ئەنجامدا ١٢٤ سەرباز کوژران و زیاتر لە ٢٥٠ سەربازیش بریندار کران لە ناوچەکەدا .

١٩٣١/٥/٢١ هێزەکانی ئاسمانی سووپای جەنگی بەریتانیا بۆردومانی ناوچەی رواندزی سەر بەپارێزگای هەولێر کرد لە باشووری کوردستان... کە بووە هۆی وێرانکردنی ١٣٦ مال و ٧٩ گوند، کە ئەم کارەش لە رۆژنامەی – تایمزی–ی لەندەنی بلاوکرایەوە.

١٩٣١/٦/٣ بالوێزی رژێمی شاهەنشاهی ئێران ، لە شاری ئەستەمبوڵی تورکیا بیرخەرەوەیەکی ئاراستەی بالوێزی بەریتانیا – سێرکلێرک– لە تورکیا کرد ، کەتیایدا نووسرابوو :– دەبێ کێشەی شێخ مەحمود بەکێشەیەکی گرنگ وەربگیرێ لەپێناو چارەسەری بارو دۆخەکە بە هۆی مەترسیداریەتی دوا رۆژی ناوچەکەو بزووتنەوەی کورد لە کوردستان بەتایبەتی لە باشووری کوردستاندا .

١٩٣١/٦/٤ کۆچی دوایی شاحوسێن عەلی بە هۆی نەخۆشی لە عەمانی پایتەختی ئوردن.. شایانی باسە شاحوسێن عەلی محەمەد عەبدولمعین لە شاری ئەستەمبوڵی تورکی لەدایك بووە ، لە سالّی ١٨٥٣ ، کە دایکی شەرکەس بووەو لە دایك بووی باکووری کوردستان بووەو ناوی وەسیلە خانم بووە... بەم هۆکارەوە ئەو بنەماڵەیە لە ئەستەمبوڵ دەژیان .

١٩٣١/٦/١٧ لێپرسراوی کاروباری پەروەردەو فێرکردنی هەرێمی کارگێری کوردستان – ئەلباسۆڤیتش–ی لە ئازربایجان ، لە بەردەم بەشدار بووانی کۆبوونەوەی تایبەت بە کەمەنەتەوایەتیەکانی کۆماری ئازربایجان.
باسی ئەوەی کردووە ، کە ئەو ئەلف و بێیەی کتێبی خووێندنی کوردی سالّی ١٩٢٢ی کە پێشنیار کراون بۆ خووێندنی زمانی کوردی چۆن خراوەتە پشت گوێ لە وولاّتەکەدا .

١٩٣١/٦/٢٨ لە دوای راگەیاندنی رژێمی کۆماری لە ئەسپانیاو هەلّووەشاندنەوەی رژێمی شانشینی لە ١٩٣١/٤/١٤ هەلّبژاردنی گشتی کۆمەلّەی دامەزرێنەر ئەنجامدراو – ئۆرتیجا – خۆی پالاّوت و لە ئاکام بووە ئەندامی هەلّبژێردراوی ئەو کۆمەلّەیە لەکەرتی لیۆن.

هەروا پارتەکەی ١٢ کورسی بەدەست هێناو لە هەمان پارتی سۆشیالستی ١١٧ کورسی بە دەست هێناو رادیکالیەکان ٩٣ کورسی، کە ژمارەی کورسیەکانی کۆمەڵەکە ٤٧٠ کورسی بوون لە ئەسپانیا.

بەڵام بەهۆی لەبارچوونی بارودۆخی ئیسپانیا و بەرپابوونی شەڕی ناوەخۆی ئەسپانیا لە ١٩٣٦/٧/١٧، ئورتیجا ئەسپانیای جێهێشت و بەرەو وولاتەکانی فەرەنساو هۆلەنداو پورتووگال و ئەرژەنتین دەسووڕایەوەو ژیانی پەنابەری بردەسەر تاکوو کۆتایی جەنگی دووەمی جیهان لە ساڵی ١٩٤٥ و ئەویش گەراوە ئەسپانیاو وازی لە هەموو بوارەکانی رامیاری هێنا لە وولاتەکەیدا.

١٩٣١/٧/١٤ لە هێرشێکی شۆرشگێرانی کورد لە باکووری کوردستان بۆ سەر ناوچەی- قەرەئین- لە رۆژهەلاتی کوردستانی لکێدراو بە ئێران، لە ئەنجام بووە هۆی کوژرانی ٥٠ سەربازی سووپای فارس ، لەئاکام بووە هۆی دورست بوونی کێشە لە نێوان رژێمی فارس و تورك لە سەر خاکی کوردستان ، بەناوی ئەوەی کە رژێمی تورك یارمەتی چەکدارە کوردەکان دەدات دژی رژێمی ئێران.

١٩٣١/٨/٢ لە نووسینەکانی- بۆکشپان ، ئایاکۆ- نامیلکەیەکی ٩٢ لاپەڕەیی و یاداشتەکانی لە ٣٦ ڕۆژی سەردانەکانی بۆناوچەکانی - ئۆیەزدی- کوردستانی ئازربایجان و- لاچین و کەلباجار- و ناوچەی نەخجەوان کە لەلایەن بەشی زانیاری سەر بەوەزارەتی پەروەردەی ئازربایجان و هەروا پەیمانگای زانستی- توویژینەوەی دەوولەتی ئازربایجان لە - بەشی ڕۆژهەلاتدا .

ئەویش بە مەبەستی لێکۆڵینەوەی ئەو کێشە کەلپووریانەی کە پەیووەندیان بەناوچەی کوردنشینەکانی ئازربایجانەوە هەیە ، سەردانێکی کورتی ناوچەکەی کرد ، کێشەکانی زمان و جیاوازی زاراوەکانی کوردی ئازەربایجان و ئەرمەنستان و کێشەی ئاستی پەروەردەو بارهێنانی کە مەبەستی سەرەکی گەشتەکەی بووە بۆناوچەکاندا .

١٩٣١/٨/١٤ لـه دایـك بـوونی رووناكبیرو نووســـەرو رۆژنامەنووســـی نـــاوداری كـــورد مامۆســـتا – محەمـــەد مـــەلا عەبدولكـــەریم مـوودەرس – لـە گوندی بیرە، ئـەم گونـدە كەوتۆتـە نێـوان سنووری ئێراق و ئێران، كە لە ســـەر خـــاكی كوردســـتانی دابەشـكراو داگـیر كـراوە، لـە ســەر شـاخەكانی هـەورامانی سـەر بـە ناحیـەی خوورمـاڵ و قەزای هەڵەبجەیە.

جێگەی باسكردنە كە مامۆستا محەمەد سەرەتای خوێندنی بە خوێندنی ئـاینی بـووە لـە لایـەن بـاوكی تـەنیا دوو سـاڵ نـەبێت كـە خـەریك بـووە بـە خوێنـدنی قورئـان و چـەندین كتێـب بـە زمـانی كـوردی و فارســی و مەبدەئـەكانی هێـل لـە لایـەن مەلایـەكی گوندەكـەدا. دوای ئـەوە خێزانـەكی چوونەتە شاری سلێمانی و باوكی بۆتە مامۆستا لە قوتابخانە حاجی حانی ئاینی و بە خوێندنی لە لایەن باوكیەوە بەردەوام بووە تاكوو گەیشتۆتە پلـەی زانـای ئـاینی لـە شـارەكەدا. دوای ئـەوە بـەهۆی بـیری نەتـەوەیی و نیـشتمانی كەوتۆتـە بـواری رامیـاری بـەم هۆكـارەش تووشـی زینـدان و خـۆ حەشـاردان بـووە لە ژێـر دەسـتی پیـاوانی لـە دەسـەڵاتدار لـە ئێـراق و بەتایبەتی لە باشووری كوردستان.

هەروا لە سەرەتادا دەستی بە خوێندنەوەی رۆژنامەو گۆڤارەكانی ئە و كـات كـردووە لـە هـەردوو بـواری ئـاینی و رامیاریـدا. ئـەم كەسـایەتیە رووناكبیرە نیـشتمانپەروەرە رۆژێـك لـە رۆژان لـە هـیچ قوتابخانەیـەك نـەی خوێنـدووە و خـاوەنی بروانامـە نیـە ، تـەنا بروانامـەی ئـاینی نـەبێت بـە هـۆی بـوونی بنەماڵەكەی بە بنە ماڵەیەكی ئاینی و زانای ئاینی و نەتەوەیی و نیشتمانی كـە باوكـە بـەرێزو ناودارەكـەی زیـاتر لـە ٥٠ دانـراوی ئـاینی هەمـەجۆری

بەرهــەم هێنــاوە، بـە زمـانی کــوردی و عــەرەبی و کۆتایـەکانی ژیـانی لــە مەزارگەی شێخ عەبدولقادر گەیلانی لە شاری بەغدا لە گەرەکی شـێخ عومـەر بردۆتـە سـەر تـاکوو کۆچـی دوایـی کـردووە بـە مالئـاوایی کردنـی لـە گـەڵ و نیشتمان لە شاری بەغدای پایتەختی ئێراق.

هـەروا بروانامەکـەی بەرامبـەر بروانامـەی ئامادەیـە ، لـە بەر ئـەوەی تـا پۆلی ١٢ ئـاینی خووێنـدووە، دوای ئـەوە بـە هـۆی هەلوێـست و بـروای چـەپرەوی چۆتە ناو ریزەکـانی جوولانـەوەی نیشتمانی پێشکەوتوو و یـەکێك بـووە لـە تێکۆشەرەکانی جوولانەوەی ئاشتی لـە نێوان سـالەکانی ١٩٥٣—١٩٥٤ لـە ئێراق بە تایبەتی لە هەرێمی باشووری کوردستان.

هەروا یەکێك بووە لە دامەزرێنەری یەکیەتی قوتابانی زانستی ئاینی – فـەقێ – و هـەروا دامەزرانـدنی گۆڤاری – دەنگـی فـەقێ – بـە دەسـت نووسـی کـە مانگانە دەردەچوواندرا و لە زۆر جێگە لـە شاری سـلێمانی بلاو دەکرایـەوەو هـەروا رەوانـەی پارێزگاکـانی کـەرکوك و دیالـەو هـەولێر دەکـراو رۆلی گرنگـی هەبوو لە لایەن خووێنەرانی ئەوکات لە هەرێمەکەدا.

مامۆستا محەمەد لە سالی ١٩٥٤ لە لایەن رژێمـی شانشینی ئێـراق دەسـتگیر کراوە بە تایبەتی لە کاتی سـەرەك وەزیرانـی ئـەو کـاتی ئێـراق نـوورە سـەعید کـە دژ بـە چـەپرەوەکان و پـارتی کۆمۆنیـستی ئێـراق بـوو لـە گـەڵ پـارتی دیموکراتی کوردستان و جوولانەوەی ئاشتی لە ئێراق.

هەروا مامۆستا مجەمەد لە سالی ١٩٤٩ دەستی کردووە بە نووسـینی بابـەت و بلاوکردنـەوەی لـە رۆژنامـەی – النـدا – لـە شـاری بەغـدا و ئیـیتر بـەردەوام بـووە لـە نووسـین و بلاوکردنـەوەی لـە رۆژنامـەو گۆڤارەکـان قۆنـاخ لـە دوای قۆنـاخ بـە پێـی گۆرانکـاری بـاری رامیـاری و نەتـەوەیی و نیـشتیمانی و کۆمەلایەتی، هەروا لە سالی ١٩٥٢ بابەتی لـە رۆژنامـەی ژیـن بلاوکردۆتـەوە و لە سالی ١٩٥١ توا نی یەکەم کتاب دابنێ بە شێووەی رەخنەگرتن.

ئەم کەسایەتیە لە ماوەی نووسینەکانیدا بە دەیا بابەت و دانـراو وەرگێـران و لێکۆلینەوە و توویژینـەوەی هەبووە لە هـەموو بوارەکـانی ئـاینی و رامیـاری و نەتەوەیی و نیشتیمانی و شیعرو ئەدەب و چەندین بواری دیکە.

سەرچاوە:– گۆڤاری سەردەمی عەرەبی – ژمارە / ٢١

١٩٣١/٩/٨ لـــــــــــــه دوای هەڵووەشـــــاندنەوەی کۆمـــاری کوردستانــسکی ئۆیەزید لەلایـەن سەرۆکی یەکیـــــەتی ســـــۆڤیەت جۆزیـــــف ســـــتالین... لیژنەیـــەکی تایبــەت بـــۆ لێکۆڵینــەوەی بـارودۆخی نەتـــەوەیی لـــە ناوچـــە کوردەواریــەکانی کۆمـاری ئازربایجان بەسەرۆکایەتی – یۆکـــــشپان– پێـــــك هێنـرا... کـە ئەنـدامانی ئـەو لیژنەیـە لـە کوردناسـی – ی . مـارەگۆلف– و مامۆسـتای فێرگـەی سـەرەتایی گونـدی مینکەنـد ، کـە دانیـشتووانەکەی کوردن، سـەمەد شاسـووارو پـسپۆری زمـانی تـورکی ئیـدریس حەسـەنۆف و پسپۆری ئەتنۆگرافی عـەلی ئەکبەرۆف پێك هـاتبوو .. کـە کـاری لیژنەکـە ٣٦ رۆژی خایانـدو لـە ئاکـام راپـۆرتێکی تێـرو تەسـەلی لەسـەر کێـشەی کـوردی ئازربایجان بلاو کردەوە ، لە کتێبێکی سەربەخۆی ٩٢ لاپەرە بەناوی کوردی ئازربایجان بەچاپگەیاند.

١٩٣١/٩/١١ هێزەکانی سـووپای ئیتاڵیا سـەرکردەی شـۆڕشـی وولاتـی لیبیاو تێکۆشـەرو کەسـایەتی نـاوداری عـەرەبیان– عومـەر موختـار– بەزامـداری دەسـتگیر کـرد لەبەرەکانی شەڕدا.

جێگەی باسکردنە لە دوای دەستگیر کردنی عومەر موختار بە زامداری لە گۆڕەپانی جەنگی دژی هێزەکانی سوویای ئیتاڵیا لە سێدارەدانی ئەو رابەرو پێـشەوا قارەمانـەی گـەلی لیبیـا لەلایـەن دەسـەڵاتی شانـشینی ئیتاڵیـای داگیرکەری ئەوکات لە ١٩٣١/ ٩/١٥ ئەنجامدرا

١٩٣١/١١/٢٦ سـەرۆك عەشـیرەتی برادۆسـتەکان بەسـەرکردایەتی شـێخ رەشـیدی لـۆلان هێرشیان کردە سـەر عەشیرەتی بارزانیەکان ، لـە ناوچـەی بـارزانی سـەر بـە پارێزگای هەولێر لە باشووری کوردستان ... کە ئەم هێرشەی برادۆستیەکان

بەپشتیووانی هێزەکانی سووپای رژێمی شانشینی لە ئێراق بوو لە هەرێمەکەدا .

١٩٣١/١٢/٨ لە ئەنجامی بەردەوام بوونی پیاوە بەکرێ گیراوەکانی رژێمی شانشینی لە ئێراق دژی کوردو کوردستان ، هێرشی بارزانیەکان بۆ سەر قەزای ئاکرێ دەستی پێکردو لەئەنجام قائمقام و چەند پۆلیس دەستگیر کران لە هەرێمەکەدا .

١٩٣١/١٢/٩ لە راپەرینی یەکەمی بارزاندا لە هەرێمی باشووری کوردستانی لکێندراو بەرژێمی شانشینی لە ئێراق .

ئەویش بە سەرکردایەتی مستەفا بارزانی لە شەڕی – بەفری بەگ – بە هەشت چەکدارەوە سووپای رژێمی شانشینی پاشەکشەی پێکراو لە ئەنجامی ئەو شەڕەدا ١٢٦ کوژراو لە هێزەکانی سووپای ئێراق بەجێ ماو راپەرینەکە پەرەی سەندو لە ئەنجام بەرێووەبەری ناوچەی بلە بەدیل گیرا.

## ١٩٣٢

١٩٣٢/١/١٢ هێزەکانی سووپای رژێمی شانشینی لە ئێراق بریاری پەلاماردانی ناوچەی بارزانی دا ، لە دوای ئەوە ئیدارەی ناحیەی شێروان و مزوری بالاو بارزانی دامەزراند لەباشووری کوردستانی لکێنراو بە ئێراق... لەپێناو گەمارۆدانی جموجۆڵی چەکدارانی کورد لە ناوچەکەو لەچەندین لایەنی جۆراو جۆردا.

١٩٣٢/١/٢٣ مۆرکردنی رێکەووتننامە لە نێوان رژێمی شای ئێران و رژێمی شۆڤێنی تورکیا ، لە پێناو گەمارۆدان و لێدانی راپەرینەکانی ئارارات... هەر لە هەمان کات رژێمی شای ئێران چیای ئاراراتی بچووکی پێشکەش بە تورکیا

کرد ، بۆ ئەوەی هێرشکردنە سەر چیای ئاراراتی گەوورە ئاسانتر بێت لە ناوچەکەدا .

کە ئەویش بووە هۆی کۆتایی هێنان بە کێشەی سنووری لە نێوانیاندا ...شایانی باسە کە درێژایی سنووری نێوان هەردوو رژێمی ئێران و تورکیا لەسەر خاکی کوردستانی دابەشکراو داگیراوە لەلایەن هەردوو دەسەڵاتی دژ بە یەکتری لە هەموو لایەنێك تەنیا لەسەر کێشەی کورد نەبێت لە باکوورو رۆژهەڵاتی کوردستان ، بە پێی پەیمانی لۆزانی ١٩٢٣/٧/٢٤ لە نێوان وولاٌتانی هاوپەیمان بە سەرکردایەتی بەریتانیا .

٢٣ /١/١٩٣٢ مۆرکردنی رێکەووتننامەی نێوان هەردوو دەووڵەتی دروستکراو لە سەر خاکی کوردستان لە دوای جەنگی یەکەمی جیهان کە ئێران ١٩٤٠٠٠هەزار کیاۆمەتر چوارگۆشەی لە خاکی رۆژهەڵاتی کوردستان پێووە لکێندراوەوو تورکیاش زیاتر لە ٢١٢٠٠٠ هەزار کیلۆمەتر چوارگۆشەی بە دەووڵەتەکە ی لە خاکی باکووری کوردستان پێووە لکێندراوە.

جێگەی باسکردنە کە ئەم رێکەووتننامەیە لە نێوان تورکیاو ئێران بە پێدانی هەندێك زەوی بوو لە ناوچە سنوورییەکانی نێوانیان کە خاکی کوردستانە، دەسەڵاتی شای ئێران دای بە دەسەڵاتی

توركیا بە بەدەستهێنانی ئێرانیش بە بەشێك لە ناوچەكانی دەوڵەتی توركیا ، ئەم ئاڵووگۆڕە بە زەوی لە نێوان هەردوو وولاتی دژ بە یەكتری و كۆك بوونیان لە سەر نەدانی مافی كورد بە پێی بەرژەوەندیەكانی نێوانیان بووە، كە بە پێی هەلكەووتەی جووگرافی لە پێناو پاراستنی سنوورەكانیان و كۆنترۆڵكردنی سنوورەكان دژ بە بزووتنەوەی رزگاریخوازی گەلی كوردستان.

١٩٣٢/١/٢٧ لە دوای وەرگرتنی رژێمی شانشینی لە ئێراق بە ئەندامی كۆمەڵەی گەلان ، دانینا بە مەرجەكانی رێكەووتنەكەو دەرنەچوونی لێی بەبێ رەزامەندی ئەنجوومەنی كۆمەلەی گەلان ، لەبارەی چارەسەری كێشەی كورد لە چوار چێووەی سنووری ئێراقی دورستكراو لەسەرخاكی باشووری كوردستان.

١٩٣٢/٢/١ لە دوای گفتووگۆ لە نێوان ئەحمەد بارزانی و شێخ رەشیدی لۆلان ئەویش بەناوبژیووانی هەردوو پارێزگاری موسڵ و هەولێرو قائمقامی رواندوزو زێبار ، شێخ ئەحمەد بارزانی ٦٠٠ چەكداری ئامادەكرد ، لەپێناو پەلاماردانی ئەو گوندو ناوچانەی كە دەكەووتنە ژێر دەستی عەشیرەتی شێخ رەشیدی لۆلان .

ئەویش بە هۆی پەیووەندی بوونی پەیووەندی لەگەڵ رژێمی شانشینی لە ئێراق و وەستانی دژی راپەرینەكانی كورد ، لە هەرێمی باشووری كوردستانی لكێنراو بە ئێراق لە ناوچەكەدا .

١٩٣٢/٢/٩ هێزەكانی سووپای رژێمی شانشینی لە ئێراق هێرشیان كردە سەر ناوچەی بارزان لە باشووری كوردستان... لەئەنجامدا هێرشەكە شكاو بەدەیان چەكدار لە هەردوو لا گیانیان لەدەست داو بریندار بوون لە هەرێمەكەدا .

١٩٣٢/٢/٢٥ بە هۆی بارینی باران و بەفرێكی زۆری بێ وێنە لەهەرێمی باشووری كوردستان... كە بووە هۆی وەستانی هەموو جۆرە كارو هاتووچۆیەك لەشاری سلێمانی و دەووروبەریدا.

١٩٣٢/٣/١١ گرێـــدانی یەکـــەم کـۆنگرەی مۆزیکـای عـەرەبی لـە شـاری قـاهیرەی پایتـەختی میـسر، بـە ئامـادە بــوونی مۆزیکــا ژەنـەکانی عـەرەب بـە

هـەموو ئامێرەکـانی مۆزیکـای ئـەو سـەردەمە لـە پێنـاو بەرەوپێـشبردنی لـە بووارەکانی هونـەری مۆزیکاو گۆرانیە هەمـەجۆرەکان لە حـەیران و بەسـتە و مەقامی ئێراقی و وولاتانی دیکەی عەرەبی لە رۆژهەلاتی ناوەراست.

دوای ئـەوە بارگاکـەی لـە شـاری قـاهیرەی پایتـەختی میـسر گوواسـتراوە بـۆ شاری بەغدا لە سالی ١٩٧١، بەلام لـە دوای داگیرکردنـی وولاتـی کوویـت لـە سـالی ١٩٩١ بارەگـای کـۆنگرەی مۆزیکـای عـەرەبی گوواسـترایەوە بـۆ شـاری عــەممانی پایتــەختی ئــووردن و تــاکوو ئێــستاش بارەگاکــەی لــە شــاری عەممانــە. کــە هــەر وولاتێـك بەشــداربوونی بــە ئەنــدامێك کــردووە لــەو کۆمەلگایەدا.

سەرچاوە رۆژنامەی – حەیات – ٢٠٠٧/٣/١.

١٩٣٢/٣/١٢ رژێمی شانشینی لە ئێراق بیرخەرەوەیەکی ئاراستەی شێخ ئەحمـەد بارزانی کرد کە تێیدا مۆلەتی ٤٨ کاتژمێری پێدا ، بۆ ئەوەی ماوە بەدەسـەلاتی میری بدات و بتوانێ لەناوچەی بلێ دەسەلاتی خۆی دابمەزرێنێ .

بـەلام شـێخ ئەحمـەد بارزانی ئـەو داوایـەی رژێمـی شانـشینی رەتکـردەوە ، ئـەویش بـە هـۆی لـەناو بـردن و گـەمارۆدانی کـوردو مـافی نەتـەوەیی نـەك یارمەتی دان و چارەی کێشەکان.

١٩٣٢/٣/١٥ بلاو کردنەوەی یەکەم ژمارەی گۆڤاری هـەتاو لـە وولاتـی سـووریا لـە هـەمان رۆژوکات گۆڤاری هاوار لەشام بلاو کرایەوە لەلایەن بنەمالەی بەدرخانیەکان.

١٩٣٢/٣/١٥ هێزەکــانی ســووپای رژێمــی شانــشینی لــە ئێــراق لــە دوای نەگەیــشتن بەرێکـەووتن لەگـەل ئەحمـەد بـارزانی هێرشـی کـردە سەرناوچـەی بـارزان و

ناوچە جیاجیاکانی دیکەی باشووری کوردستان.

١٩٣٢/٤/٤ بە هۆی بەردەوام بوون لە شەڕی نێوان هێزە چەکدارەکانی مستەفا بارزانی و هێزەکانی سووپای ڕژێمی شانشینی لە ئێراق لە دۆڵی – ڤاژی– لە ئەنجام سووپای ئێراق پاشەکشەیان پێکراو ٢٥٣ کوژراویان لێ بەجێ ما لە گەڵ ١٢ شەهیدی هێزە چەکدارەکانی مستەفا بارزانی لەباشووری کوردستان.

١٩٣٢/٤/٤ لە دایك بوونی تاراکۆفسکی ئارینی تازاکۆفسکی لەشاری مۆسکۆی پایتەختی رووسیای یەکگرتوو – شایانی باسە ئەم دەرهێنەرە لە ١٩٨٦/١٢/٢٩ بەهۆی نەخۆشی شێر پەنجە کۆچی دوایی دەکات. ئەم دەرهێنەرە لەماوەی ژیانی زیاتر لە ١٠ بەرهەمی سینەمایی بە فلیم بەرهەم هێناوەو رۆڵی گرنگی لە بواری سینەما هەبوو لە وولاتەکەیدا.

١٩٣٢/٤/٦ بە هۆی هێرشی بەرفراوانی هێزەکانی سووپای ڕژێمی ئێراق بەپالپشتی هێزەکانی سووپای بەریتانیا بۆ سەر ناوچەی بارزان و دەوروبەری لە هەرێمی باشووری کوردستان ، بووە هۆی شکانی هێزی بارزانیەکان ، کە بووە هۆی ئەوەی هێزەکانی سووپای ئێراق ناوچەی ئاکرێی مەلبەندی بارزان بگرێتە دەست لە هەرێمەکەدا.

١٩٣٢/٤/٢٣ بە مەبەستی ڕێکخستنی کاروباری ئەدەب و هونەر، پارتی کۆمۆنیستی سۆڤیەت بە بریارێکی فەرمی یەکیەتی نووسەرانی سۆڤیەتی دامەزراند. لەو سەردەمدا کە جۆزێف ستالین سکرتێری گشتی پارتی کۆمۆنیست و سەرۆکی حکوومەتی سۆڤیەت بوو، کە سەر قاڵی کووشتن و لە ناو بردنی هەموو ئەو نەیارانە بوو، کە سمێلیان دەلستەوە بۆ داگیر کردنی جێگەی ئەو، لە سەر دەسەلاتی سۆڤیەتدا.

بێگومان ستالین له هەموو کاروبارەکانیدا لەم رووەوە سەرکەوتوو بوو، وەك دکتاتۆرێك مایەوە لە سەر دەسەلاَت تا ساڵی ۱۹۵۳. ئەویش بە مردنی سرووشتی خۆی له شاری مۆسکۆی پایتەختی یەکیەتی سۆڤیەتدا.

یەکیەتی نووسەران وەك دەزگایەکی دەووڵەت بەر پرسیاری هەموو کارو بارێکی ئەدەب و داهێنانی ئەدەبی بوو له وولاَتدا.

لە رۆژی دامەزراندنیەوە لە کاردا بوو تا کۆتایی هاتنی دەسەلاَتی کۆمۆنیستەکان و رووخاندنی دەسەلاَتی سۆڤیەت له لایەن سەرۆکی سۆڤیەت میخائیل گۆرباتشۆڤ. مەبەستی سەرۆکی یەکیەتی نووسەران، وەك پارتی کۆمۆنیست بۆی دیاری دەکرد بۆ دروستکردنی رۆشنبیری و خوێندەواریەکی سۆشیالیستی و پشتگیری کردنی بەرنامەی دەسەلاَت ئامادە بوو، دەست بە سنگەوە بووەستیَ بۆ هێنانەدی هەموو فەرمانێکی پارتی کۆمۆنیست کە دەری دەکرد له ناو وولاَتەکەدا.

لە بەر ئەوەی یەکیەتی نووسەرانی سۆڤیەت وەك دەزگایەکی دەووری تەواوی – کاگیَ بیَ – و – گلاڤلیت – ی k,g,b، دەبینی لە بەر ئەوەی چاوی بریبووە کردەوەو هەست و نەستی شاعیر و نووسەران، هەروا بە رەزامەندی بوونی ئەویش نەبووایە بەرهەمیان بلاَو نەدەکرایەوە، بەم جۆرە یەکیەتی بنکەی پروپاگەندە بوو بۆ دەووڵەتی سۆڤیەت.

هەروا له پاش جەنگی دووەمی جیهان فرمانڕەوایی ستالین بە هۆی یەکیەتی نووسەرانەوە دەستی لە قورقووراگەی شاعیرو نووسەرانی گیر کرد بوو، رامیاریەتێکی سەیری بە کار دەهێنا، بە پێی بەرنامەیەکی ژیرانە بەربەرەکانی شاعیرو نووسەرانی دەکرد.

هەروا بەوەی گووزەرانی نەمری و نە ژیانی بۆیان دەرەخساند. هەندیَ جار برسیشیان دەکردن، وایان بەسەر دەهێنان کە هیچ ئومێدێکیان نەبیَ لە بابەت بلاَو کردنەوەی بەرهەمەکانیان. بۆیە زۆربەیان بیَ دەنگ دەبوون وەك بلێی لە بیر دەچوونەوە، هەندێکیشیان لە رەسەنەکان لە نووسین نەدەچوونەوە و چاوەروانی دەرفەت دەبوون بۆ بلاَو کردنەوەی بەرهەمەکانیان، مێژووی ئەدەبی رووسی ئەم سەردەمە نارێکی زۆرمان بۆ دەوور دەکاتەوە له شاعیرو نووسەرە سەربەستەکان.

١٩٣٢/٤/٢٩ چەکدارە بارزانیەکان لەناوچەی بارزانی سەر بە پارێزگای هەولێر لە باشووری کوردستان توانیان فرۆکەیەکی جەنگی هێزی ئاسمانی سووپای رژێمی ئێراق بخەنە خوارەوەو فرۆکەوان و یاریدەدەرەکەی بەدیل بگرن لە ناوچەکەدا .

١٩٣٢/٥/٥ رژێمی شۆڤینی تورکیا بڵاویکردەوە ، بەوەی کە پەرلەمانی تورکیا یاسای ماوەدان بەتورك دەرچووە... ئەویش کە رێگە بە تورکەکان دەدات خێزانەکانی کورد لە باکووردا بگوازێنێتەوەو هەرچی دیاردەی کوردەواری هەیە تیایدا بسرێتەوەو جێگەیان بە خێزانە تورکەکان پر بکاتەوە لەباکووری کوردستان... ئەمەش کە دوو مەبەستی سەرەکی تیا جێ بەجێ دەکات ، ئەویش یەکەم بە تورککردن و دووەم بە گۆرینی دیمۆگرافیای جووگرافیای باکووری کوردستان.

١٩٣٢/٥/٥ کۆچی دوایی نووسەرو رۆژنامەنووسی ناوداری کورد حوسێن نازم لە شاری سلێمانی لە باشووری کوردستان لە تەمەنی ٦٠ سالیداو گۆرەکەی لە گورستانی گردی سەیوانە لە شارەکەدا .

١٩٣٢/٥/١٥ بڵاو کردنەوەی یەکەم ژمارەی گۆڤاری –هاوار– لەلایەن جەلادەت عالی بەدرخان لە دیمەشقی پایتەختی سووریاو نزیکەی ١٥ سال بەردەوام بوو لە بڵاو کردنەوەیدا .

١٩٣٢/٥/٣٠ وەرگرتنی رژێمی شانشینی لە ئێراق لە ئەنجوومەنی کۆمەڵەی گەلان، هەروا بەند بوونی بەو مەرجانەی کە راگەیاندراو بوون بە دەستگیر بوون بە بریارەکانی کۆمەڵە ، بە دابین کردنی مافی کورد لە هەرێمی باشووری کورستان... کە رژێمی شانشینی دامەزراو لە ئێراق ناتوانێت هەڵی بووەشێنێتەوە گەر بە رەزامەندی کۆمەلەی گەلاّن نەبێت بەپێی برگەی /١٠ لە بریارەکەدا .

١٩٣٢/٦/١ لە دوای بێ ئومێدی هێزەکانی چەکرداری ئاشووریەکان... بە وەڵام نەدانەوەیان لەلایەن بەرپرسانی بەریتانیا ، بریاری هەڵووەشانەوەی هێزی چەکداری ئاشووریەکان راگەیەندرا ، ئەویش بە هۆی رێکەووتننامە لە نێوان بەریتانیاو ئێراق و بالوێزی بەریتانیا– فرنسیس هیمفریز– کە داوای لە ئاشووریەکان کرد ، کە ئەفسەرەکان بگەرێنێتەوە جێگەی پێشووی خۆیان.

١٩٣٢/٦/٢١ لەئاکامی هێرشی هێزەکانی سووپای رژێمی شانشینی لە ئێراق و بەریتانیا ، بۆ سەر ناوچەی بارزان و دەوورووبەری لە باشووری کوردستان ، شێخ ئەحمەد بارزانی بەخۆیی و ٤٠٠ چەکدار پەنایان بردە بەر تورکیا کە ١٠/ چەکدار لەوانە بەشداری شەڕی ئاگریان لە باکووری کوردستانی داگیر کراو لە لایەن رژێمی تورکیا کرد بوو... لەئەنجامدا لەلایەن هێزەکانی سووپای تورکیا دەستگیر کران و لە سێدارە دران لە هەرێمەکەدا .

١٩٣٢/٦/٢٢ دادگای سەربازی هێزەکانی سووپای رژێمی تورکیا لەشاری دیاربەکر لە باکووری کوردستانی داگیر کراوی ژێر دەسەڵاتی رژێمی تورکیا بریاری لە سێدارەدانی بۆ ٣٠ شۆرشگێر لە بەشداربووانی شۆرشی ئاگری دەرکرد لە هەرێمەکەدا.

١٩٣٢/٦/٢٢ ئیمپراتۆر سریا خەلیل ئەسفندیاری سەردار ئەسعەد بەختیاری لە نێوان شاری ئەسفەهان و باشووری رۆژئاوای ئەهواز چاوی بە جیهان هەڵهێناوە . لە باوکێکی ئیسلامی مەزهەب شیعە ، کە لە سەرکردەکانی کوردی بەختیاری بووە ... باوکی سریا لە ساڵی ١٩٢٤ بەرەو ئەڵمانیا کۆچ دەکات و لەوێ نیشتەجێ دەبێ .

سریا لەگەڵ ئافرەتێکی ئەلمانی بەناوی – ئیفاکارل – شارەزای رۆژهەلات و رۆژئاوا دەبێت ... کە قوتابیەکی گەنج دەبێت و لە سویسراو ئینگلتەرا دەخووێنێ ، کە چوار زمان بەباشی دەزانێ ، ئەویش :– زمانەکانی فارسی و فەرەنسی و ئینگلیزی و ئەلمانی .

هەروا شای ئێرانیش ئەشقی جوانی و شۆخ و شەنگی ئەو کچە کوردە جوانە دەبێت و هیوای ئەوە دەخوازێت کە چاوی بەو کچە بکەوویت ئەویش بەرەزامەندی دایکی ... سریا کچە کورد رەزامەندی لە سەر داوەتەی شا کرد کە سەردانی تاران بکات و بەگەیشتنی سریا و چاوپێکەووتن لە ماوەی سێ رۆژ رێکەووتن لەسەر بوونی بەهاوسەری محەمەد رەزا شا .

شای ئێران بەو هۆکارە خاتوو سریا لە سەر گۆرەپانی رامیاری جیهانی دەرکەوت بە بوونی هاوسەری محەمەد رەزا شا لە مانگی/١٩٥١/٢ . بەو هۆیە بووە ئیمپاتۆری ئێران کە تەمەنی لە ١٨ ساڵ زیاتر نەبوو .

واتە شاژنی ئێران – لەو ڕێگە هەوڵی بەرەو باشبردنی باری گوزەرانی گەلانی ئێرانیدا بۆ ئەوەی بیگوازێتەوە بۆ قۆناخێکی دیکە ... بەڵام دوای ماوەیەك کێشەی نێوانیان سەری هەڵداو تا گەیشتە ئەو ئاستەی کە لە مانگی /١٩٥٨/٣ لێك جیابوونەوەو سریا بەرەو ئەورووپا گەڕایەوە لە ژیانێکی پڕ لەخۆشی ژیانی بردە سەرو لەهەمان کات یاداشتەکەی بە زنجیرە لە ڕۆژنامەی – الرای – ئوردنی لە ساڵی ٢٠٠٠ بڵاودەکردەوە .

جێگەی باسکردنە کە محەمەد ڕەزا شا خوشکی شانشین فاڕووق شانشینی میسر کە کوردەو لە بنەماڵەی خدێویە بەناوی – فەوزیە – بووە هاوسەری محەمەد ڕەزا شا و دوایی ئەویش تەلاق درا.

١٩٣٢/٧/٦ بە هۆی هێرشە یەك لەدوای یەکەکانی هێزی سوپای ئێراق بۆ سەر بزووتنەوەی ڕزگاری کورد لە ناوچەی بارزان و دەووروبەری لە باشووری کوردستان ، بەرەو لاوازی هەنگاوینا سەرەرای بەهێز بوونی ڕەگەکانی تاکوو دوای سالەکانی ١٩٤٠ لە هەرێمەکەدا.

١٩٣٢/٨/١٨ بۆ یەکەم جار وورووژاندنی بیرۆکەی پرۆژەی بەنداوی بێخمە لەلایەن ڕۆژنامەنووسێکی ئەمریکیەوە بوو کە لە ڕۆژنامەی – ئەوقاتی بەغدا – ی بە زمانی ئینگلیزی بڵاوکردەوە. ئەویش بەهۆی شیاوی ناوچەی بێخمە لە پێناو دروستکردنی بەنداوێك.

ئەویش وای لە هۆبەی پرۆژەکانی ئاودێری دەزگای – کودویلسونی بەریتانی – کرد کە لە ساڵی ١٩٣٧ بەسەرپەرشتی ئەندازیار ڕیشارد ڕاپۆرتێك ئامادەبکات سەبارەت بەگوونجاوی و لە باری دروستکردنی بەنداوێك لەسەر زێی گەوورە. بەتایبەتی لەسەر دەربەندی بێخمە.

بەڵام بە هۆی سەختی گەیشتنی بەناوچەکە کە بەتاکە ڕێگر دەزانـیٚ... دوای ئەوە لە ساڵی ١٩٣٨ یەکێك لـە جیۆلۆجیەکانی حکوومەت مستر – کوبنز – دووجـار سـەدانی ناوچـەی بێخمـەی کـردوو دوو ڕاپـۆرتی ئامـادە کـردوو لـە هەردوو ڕاپۆرتەکەیدا پێی لەسەر ئەوە داگرت، کە دروستکردنی بەنداوێك لـە سەر زێی گەوورە لەو دەربەندە گوونجاو ترین شووێنە بۆ ئەو پرۆژەیـە. بەڵام دوای لافاوی ١٩٤١ دووبـارە ڕاپۆرتەکەو تووێژینـەوە سـەبارەت بـەم پرۆژەیـە سەری هەڵدایەوە – مستەر وورد – ئەندازیاری پـرۆژە گەوورەکان لـە ساڵی ١٩٤٢ ڕاپـۆرتێکی سـەبارەت بەشـیاوی بێخمـەی بـۆ گلدانـەوەی ئـاو دووپـات کردەوە.

هـەروا دکتـۆر – هـەیگن –ی جیۆلـۆجی نـاس لـە نێـوان سـاڵەکانی ١٩٤٥ – ١٩٤٩ دوو ڕاپـۆرتی خستە ڕوو بەشیاوی ناوچـەی بێخمـە بـۆ دروسـتکردنی بەنداوێك کە بە باشترین شـووێنی دانـا لـە هەرێمەکەدا. شایانی باسـە دوای ئـەوەی کـە لـە سـاڵی ١٩٥٠ ئەنجومـەنی ئاوەدانکردنـەوەی ئێـراق دامـەزراو لەمانگی /٥/١٩٥٢ کۆمپانیای – هارزا – ی ئەمەریکی ڕاسپارد کە پشکنین و لێکۆڵینــەوەی وورد لەســەر ئـەو پرۆژەیــە بکـات بـۆ دەسـت نیـشانکردنی باشترین شوێن بۆ بەنداوەکە

، هــەروا دەیزانــی کــە کۆتـایی بەنداوەکـە لەگـەل مەرجـەکان و مواسـەفاتی تەندەری پرۆژەکە ئامادەبکات.

ئەوەبوو کۆمپانیای ناوبراو لەمانگی /٨/١٩٥٣ ڕاپۆرتی کۆتایی خۆی خستە ڕوو... کـە تیایـدا بـەرزی بەنداوەکـەی بـە ١٨٦ مـەتر خەمڵانـد , کـە دەتـوانیٚ نزیکـەی ٩ ملیـار مـەتر سـیٚ جـا ئـاوبگریٚ... هـەروا گوژمـەی خەرجیـەکانی پرۆژەکە بە ٦٧ ملیۆن دیناری ئەوکاتەی ئێراقی تێدەچیٚ.

هەروا جیٚ بەجیٚ کردنی پرۆژەی بێخمە بە ٤ ساڵ تەواودەبیٚ... بەڵام بەهۆی سـەرقاڵی دەووڵـەتی ئێـراق لەوکاتـدا بـە دروسـتکردنی بەنداوەکانی دوکـان و دەربەنـدیخان و دوایـی بەنـداوەکانی حـەمرین و پـرۆژەی سەرسـار بـووە هـۆی دوواخـستنی پـرۆژەی بەنـداوی بێخمـە لـە هـەرێمی باشـووری کوردسـتان کـە سەر بەپارێزگای هەولێری پایتەختی هەرێمەکە.

لەسـاڵی ١٩٧٠، دووبارە پـرۆژەی بەنداوی بێخمـە خرایە نێـوو پرۆژەکـانی پلانـی گەشـەپێدانی نەتـەوەیی ڕژێمـی ئێـراق لەسـالانی ١٩٧٠ – ١٩٧٤ کـە

دووبارە کۆمپانیای – هارزا – ی ئەمەریکی بانگهێشت کرایەوەو دیسان پشت گوێ خرایەوە... بەڵام لەساڵی ١٩٧٩ پرۆژەی بەنداوی بێخمە بەتەوایی خرایە بەرنامەی کاری حکوومەتی بەگداو سەرەتایەك بوو کە قالبی بیرۆکەکەو خەون جێبهێڵێ و بکەوێتە بواری جێ بەجێ کردن... ئەویش دوای راسپاردنی دێت بەکۆمپانیای – EPDC– یابانی کە بە هەمان شێوەی کۆمپانیای – هارزا – دەستی پێکردو بەردەوام بوو لە پێناو بەئەنجام گەیاندنی پرۆژەکە... کاتی دەست پێکردنی پرۆژەکە لە ساڵی ١٩٨٦ بوو لە هەرێمی باشووری کوردستان.

١٩٣٢/٩/٢٣ دوای جێگیر بوونی دەسەڵاتی شانشینی وولاتی نوێی سعوودیە لە بیابانی دوورگەی عەرەبی دووبارە ناوی حیجازو نەژدی گۆری بۆ ناوی شانشینی عەرەبی سعوودی... ئەمەش لە دوای کۆتایی هاتنی دژایەتی کردنی یەکتر بوو لە نێوان بنەماڵەی ئالسعوودو شەریف حوسێن تاکوو دەرکردنی شەریف حوسێن لە حیجاز لە وولاتەکەدا .

١٩٣٢/١٠/٣ لە دوای هەوڵێکی بەردەوام رژێمی شانشینی ئێراق لە کۆمەڵەی گەلان بە ئەندامی کۆمەڵە وەرگیرا ، کە بووە هۆی راگەیاندنی سەربەخۆیی ئێراق ، بە ناوی شانشینی ئێراق لە ناوچەو کێشووەرەکەدا ، بە مەرجێ مافەکانی کورد جێ بەجێ بکات لە باشووری کوردستان بەپێی رێکەووتننامەو مافە مرۆییەکان و کەمە نەتەوایەتیەکانی دیکە لە ئێراق .

دوای ئەوە لە ١٩٥٨/٧/١٤ رژێمی شانشینی رووخێندراو رژێمی کۆماری لە

ئێـراق راگەیانـدرا لـە شـاری بەغـدای پایتـەختی ئێـراق . كـە ژمـارەی دانیـشتووانی شـاری بەغـدا ،٥,٧٠٠,٠٠٠ ملیـۆن كەسـە . لـەو ژمـارە دانیشتووانەی كە لە شاری بەغدا هەن زیاتر لە ١,٣٥٠,٠٠٠ ملیۆن كەس كـوردن ، هـەروا ژمارەی دانیـشتووانی ئێـراق ٢٦,٩٥٠,٠٠٠ ملیـۆن كەسـە ، لـەو ژمـارە دانیـشتووانەی كـە لـە ئێراقـدا هەیـە ٦,٨٧٥,٠٠٠ملیـۆن كەسـە كـوردە . هـەروا رووبـەری خـاكی ئێـراق ٤٣٨,٣٢٠ هـەزار كیلـۆ مـەتر چـوار گۆشەیە ، كە لەو رووبەرەش ٨٤٠٠٠ هەشتاو چوار هەزار كیلۆ مەتر چوار گۆشـە خـاكی هـەرێمی باشـووری كوردسـتانی بـە پێـی پـەیمانی لـۆزانی ١٩٢٣/٧/٢٤ ی پێیٚ لكێندراوە . هـەروا چڕی دانشتووانەكەی ١٥٩ كـەس لـە یـەك میـل چـوار گۆشـەدا . هـەروا نـژادەكانی ، عـەرەب ٦٥٪ . كـورد ٢٨٪ . توركمان و ئاشووری و كلدان و ئارامی ٧٪ . لە وولاَتەكەدا .

١٩٣٢/١٠/٥ لە كۆبوونـەوەی /١١ لـە خـوولی ٦٩ی ئەنجوومـەنی كۆمەڵـەی گـەلان لـە سـەر خاڵی بنـەرەتی كێـشەی ئاشـووریەكان لـە ئێـراق كـە شـتێكی بەرچـاو لەسـەر چارەی كێشەی ئاشووریەكان لە ئێراق دیاری نەكرا.

١٩٣٢/١٠/١٢ كورسـی پاپـاوی ، واتـە دەسـەڵاتی ڤاتیكـان چـەندین رێكەووتننامـەی جـۆراو جۆری لەگـەڵ وولاَتـانی بیـانی مـۆر كـرد ، ئـەویش لـە دوای پـەیمانی لاتـران ، بـەناوی پـەیمانی كونكـۆردات و ، یەكـەم رێكـەووتنی لەگـەل وولاتـی هۆڵەنـدا مۆر كرد لە كێشووەرەكەدا .

١٩٣٢/١٠/١٩ كەسـایەتی ئاشـووریەكان بـەتریرك مارشـەمعون لـە ژنێـف بـەرەو بـەیروتی پایتەختی لوبنان بەرێكەووت ، دوای ئەوە بەرەو شاری دیمەشقی پایتـەختی سـووریاو لەگـــەڵ نووێنـــەری ئاشـــووریەكان كۆبـــۆوەو دوا رامیاریـــەتی حكوومەتی بەریتانیا سەبارەت بە ئاشووریەكانی پیٚ راگەیانـدن ، ئـەویش بـە هەرەس هێنانی گفتوو گۆی نێوانیان لە سەر باری ئاشووریەكان.

١٩٣٢/١٠/٢٣ رێكەووتننامـەی سـنووری لـە نێـوان رژێمـی شـایەتی ئێـران و رژێمـی توركیـا مـۆركرا ، لـە چـیای ئـارارات , ئـەویش لـە سـەر حیـسابی كـوردو خـاكی رۆژهـەلات و باكووری كوردسـتان بـوو ، بەپـشتیووان و ئاموژگـاری بـەریتانیا لەهەرێمەكەدا.

١٩٣٢/١٠/٣٠ وەرگرتنی رژێمی شانشینی ئێراق لەکۆمەڵەی گەلان بەمەرجی دەستگیر بوونی خۆی بە هەموو بەندەکانی چوونە ناو کۆمەڵەی گەلان و رێز گرتن لە مافی مرۆڤ و رۆشنبیری و کارگێری بۆ کوردو کەمەنەتەوایەتیەکانی دیکە ، لە هەرێمی باشووری کوردستان .

لە دوای چەندین جار دووپات کردنەوەی لەسەر رژێمی شانشینی لە ئێراق ، کە هەر هەرهەمووی تەنیا لەسەرپەر مانەوەو لە ئەرشیفەکان تا مێژوو خۆی دووبارە دەکاتەوە لە کێشووەرەکەدا .

١٩٣٢/١١/٢٩ کۆچی دوایی تێکۆشەرو نووسەرو رووناکبیری کورد دکتۆر عەبدوللا جەودەت لە باکووری کوردستانی داگیر کراوی ژێر دەسەڵاتی رژێمی تورکیا... کە ناوبراو خاوەنی دانراوی ٢٤ کتێب و ٣٠ وەرگێری کتێبی دیکە بوو بۆ زمانی تورکی و زمانەکانی دیکە لە تورکیاو ناوچەکەدا .

١٩٣١/١٢/٩ تورکمانە شۆڤینیەکانی تورکیا بارودۆخی ناوخۆو ناوچەو هەرێمەکەیان کرد بوو لە باری بیروبۆچوونەکانیان بەکەم کردنەوەی رۆڵ و ژمارەی کوردو، وایان بلاودەکردەوە کە کورد لە تورکیای دروستکراوی دوای جەنگی یەکەمی جیهان بەسەرکردایەتی مستەفا کەمال ئەتاتورك، کە کورد لە تورکیا بوونی نیە هەر وەك لە راپۆرتێکی بلاوکراوە لە رۆژنامەی – میللیەت – ی تورکی لەم رۆژەدا، کە نووێنەری ئەنجوومەن مەحمود کە لەوکاتەی یاوەری وەزیری ناوەخۆی تورکیا – شوکری کایا – بوو بیروبۆچوونی بەم شێووەیە بوو :– کە گوتی :–

دانیشتووانی هەرێمی باکووری کوردستان بە تایبەتی لە پارێزگای دیاربەکر تورکمانن و، هەروا گوتی :– دانیشتووانەکە خۆیان وا دەڵێن و بەچەندین زمان ئاخاوتن دەکەن وەك عەرەبی و کوردی و تورکی.

هەروا لەناوچەی شاری ئۆرفە ژیانێکی هۆزەوانی بەسەردەبەن... بەلام ئەو بیروبۆچوونە لەلایەن ئەندامێکی پەرلەمانی تورکیا و پەرلەمانی تورکیا بە هەڵە چوونە، لە بەر ئەوەی لە هیچ بەڵگەنامەیەکی سۆڤیەتی، یاخوود تورکی بەم شێووەیە بیرناکرێتەوە لە بەر ئەوەی شارەکانی دیاربەکرو وان و ئەرزەرۆم و بەتلیس و ئۆرفەو ماردین و سیرت و هەکاری ٣\٤ دانیشتووانەکەی کوردن.

لە دوای بەتورککردنی هەرێم و ئەوانی دیکەشی ئەرمەنن و ژمارەیەکی کەم

تورکن کە لە ڕێگەی بەتورککردن گەیشتوونەتە ئەو هەرێمە بەپێی مێژوو و دەسەڵاتی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی لە هەرێمەکەدا.
سەرچاوە :- المساله الکردیه ١٩٢٣ - ١٩٤٥ - لازاریف -چاپی یەکەم دەزگای ئاراس /هەولێر

١٩٣٢/١٢/١٣ یەکەم بەیاننامەی کۆمۆنیستی لە ئێراق بڵاوکرایەوە بەدەست نووسی یوسف سلمان یوسف - فهد - بوو ، کە بەدەستی خۆی نووسیبووی و لە شاری ناسریە توانی لە ١٨ جێگا هەڵی بواسێ بەناوی - کرێکارانی شیوعی- کە دروشمی چەکوچ و داسی لەسەر بوو لە شارەکەو لە ئێراقدا .

١٩٣٢/١٢/١٤ جووڵانەوەی ئاشووری لە ئێراق داوایەکیان ئاراستەی کۆمەڵەی گەلان کرد ، بە ناوی - بەڵگەنامەی نیشتمانی ئاشووری- بەڵام ئەنجوومەنی کۆمەڵەی گەلان لە بڕیارێکیدا ڕەزامەندی لەسەر داوای ئاشووریەکان نەکرد ، ئەویش بە پێدانی مافی ئۆتۆنۆمی لەچوار چێوەی سنووری ئێراق.
هەروا ڕژێمی شاهانشینی لە ئێراق داواکەیانی ڕەتکردەوە ، بەو هۆکارە کە ئاشووریەکان بوون بەدوو بەش:- یەکەمیان لەگەڵ ڕژێمی شاهانشینی لە ئێراق مانەوە . دووەمیان لایەنگیری مارشمعون بوون... سەرەڕای چەندین کێشەو گرفتی دیکە ، دوای ئەوە بووە هۆی پەلاماردانی ئاشووریەکان لەگوندو شارۆچکەکانی ئێراق بەتایبەتی لەباشووری کوردستان.

## ١٩٣٣

١٩٣٣/١/٣ لەدوای گەرانەوەی ئیشا مارشەمعون بۆ ئێراق گەیشتە شاری بەغداو لەگەڵ بالوێزی بەریتانیا - ف هیمفریز - و سەرەك وەزیرانی ڕژێمی شانشینی لە ئێراق نجیب شەوکتو شانشین فەیسەلی یەکەم کۆبۆوەو باری ئاشووریەکانی ئێراقی لەو کۆبوونەوە دیاریکرد بەچارەسەرکردنی کێشە هەڵوواسراوەکان.

١٩٣٣/١/١٦ لە دایك بوونی خانمە ئەسمەری ئەمەریکی سۆزان سونتاك لە شاری نیورۆکی ئەمەریکا.
کە دوای ئەوە بووە ئافرەتێکی بەهرەدار لە نووسینە جۆراو جۆرەکانیدا لە بوارەکانی ژیانو ڕۆشنبیرکردنی گەلانی ئەمەریکا.

١٩٣٣/١/٣٠ سەرۆکی ئەلمانیا- هندنیورگ - ئەدلف هتلەری کردە ڕاوێژکاری ئەلمانیاو

سەرەتا هتلەر دەستی كرد بە نەهێشتنی بیكاریو ئاوەدان كردنەوەو بەرەو پێشبردنی ئەڵمانیا لەهەموو بوارەكان .

لەپێناو بەهێزكردنی جێ پێگەی خۆی لە پێناو جێبەجێكردنی بیروو بۆچوونە نهێنیەكان بەتایبەتی لە باری فراوانكردنی سنووری ئەڵمانیا و خۆزالكردنی بە سەر جیهاندا .

١٩٣٣/٢/٢٤ پچرانی پەیووەندی چینی مللی لە گەڵ یابانو چەندین وولاتانی دیكەی عەرەبی، ئەویش بە هۆی پشتگیری كردنیان لە كۆمەڵەی گەلان بۆ فەرەنسا و داگیر كردنی جەزائر لەلایەن فەرەنسا... كە بووە هۆی لێك ترازانی پەیووەندی چەندین وولاتو دورست بوونی بارو دۆخێكی نوێی ناوچەكەو مەرگەساتی شەڕی نێوان هێزە چەكدارەكانی گەلانی جەزائیرو هێزەكانی سووپای داگیر كەری فەرەنسا.

١٩٣٣/٣/٥ لە هەڵبژاردنەكانی نێوان پارتە رامیاریو نەتەوەییو كۆمەلایەتیەكانی ئەڵمانیا ، كە پارتی نازی بەسەركردایەتی راوێژكاری ئەڵمانیا هتلەر سەركەووتنی بەدەست هێناو ئەلمانیای بەرەو دژایەتی كردنی وولاتانی جیهان برد ، بە دورستكردنی بیانووی هەلگیرسانی جەنگ بەتایبەتی دژی یەكیەتی سۆڤیەتو وولاتانی دیكەی هاوپەیمانی سۆڤیەت لە ئەورووپای رۆژهەلاتدا .

١٩٣٣/٣/٢١ لە دوای سەركەووتنی پارتی نازی لە هەڵبژاردنەكان بە سەركردایەتی هتلەر ، رایخی سێیەمی لە شاری بۆتسدام لە باشووری رۆژئاوای بەرلین راگەیاند ، بە تایبەتی لە دوای مردنی - هند نیورك- لەمانگی/٨ /١٩٣٤ ، كە هتلەر پەیمانی فرسای هەلووەشاندەوە لە پێناو بەدی هێنانی بەرژەووەندیەكانی خۆی لەداهاتووی ئەلمانیا لەسەر هەموو وولاتانی دیكەی جیهاندا ... لە بەر ئەوەی هتلەر نژادی ئەلمانی لەسەر هەموو نژادەكانی دیكەی جیهان دادەنا.

جواهر لال نهرو

١٩٣٣/٥/٨ رابـەرو دامەزرێنـەرو پێـشەوای هندستان جەواهر لال نەهرۆ لـە وتەیەکیـدا گـوتی تۆرانیـەکان شـەڕی کوردانیـان بـە کـوردان دەکـرد، کـە سـەرکەووتنیان بەدەسـت دەهێنا ، کە ئـەویش بـووە هـۆی رەشـکردنەوەی پێناسـەی نەتـەوەیی کـوردو ئەرمـەن ... شـایانی باسـە لال نەهرۆ راستی کردیە لـە هـەموو لایەنە جۆراو جۆرەکان ، لـە بەر ئـەوەی کـورد بـەهۆی لاوازی هەڵوویـست لـە نێـوان سـەرکردەکانی کـوردو بـەهۆی پاراسـتنی بەرژەوەنـدی تایبـەتی و بنەماڵـەو عەشـیرەتەکەو مزگەوتـەکان و تەکیـەکانیان ، ئاسـانکاری زۆریـان کـردووە بـۆ سـەرکەووتنی دووژمنـانی کـورد بەسـەر کـوردو خـاکی کوردسـتان لەلایـەنی ئـاینی و نەتەوەیی و دەسەلات...؟...!

١٩٣٣/٦/٥ کورسـی پاپـاوی ، واتـە دەسـەڵاتی فاتیکـان چـەندین پـەیمانی جـۆراو جـۆری لەدوای پەیمانی لاتران مۆر کرد ، کە دووەم پەیمانی لەگەڵ شانشینی نەمسا مـۆر کـرد ، ئـەویش لـەپێناو بـەهێزکردنی پەیووەنـدی ئـاینی و کۆمەلایـەتی و ژیان و ئاوەدان کردنـەوە ، بەتایبـەتی کەنیسەکانی هەمەلایـەنی مەسـیحیەکان لەجیهاندا.

١٩٣٣/٧/٢٠ کورسی پاپاوی ، واتە دەسەڵاتی فاتیکان چەندین پەیمانی جۆراو جۆری لـە دوای پـەیمانی لاتـران مـۆر کـرد ، لـە گـەڵ وولاتـانی جیهـان کـە پـەیمانی سـێیەمی لەگـەڵ وولاتـی ئـەڵمانیای نـازی مۆر کـرد. لـە پێنـاو بـەهێز کردنـی پەیووەندیەکاندا .

١٩٣٣/٨/٧ رۆژی شـەهیدی ئاشـووریەکانە ، کـە لـەم رۆژەدا شارۆچـکەی سمـێڵ و دەووروبـەری سـەربەپارێزگای دهـۆك لـە باشـووری کوردسـتان کەوتـە بـەر پەلاماردانی هێزەکانی سووپای شانشینی لە ئێراق و بەریتانیا بەیارمـەتی فرۆکە جەنگیەکان ، کە نزیکەی ٥٠٠٠ هـەزار هـاوولاتی لـە منداڵ و ئافرەت و

گەنجی ئاشووریەکان ، واتە مەسیحیەکان بە شێوەیەکی گشتی شەهید کرد. لەشارەکەدا.

١٩٣٣/٨/٩ لە دوای پەلاماردانی شارۆچکەی سمێلّو دەووروبەری بە هەمان شێوە هێزەکانی سووپای رژێمی شانشینی لە ئێراق بە پشتگیری هێزەکانی ئاسمانی بەریتانیا ، پەلاماری شارۆچکەی بێجیو دەووروبەری دا ، بەسەدا کوردو مەسیحی شەهید کردو لەم رۆژەدا لە هەموو ئێراق دەست کرا بە پەلاماردانو کووشتنو گرتنو وێرانکردنو دەربەدەرکردن لە ئێراقدا .

١٩٣٣/٨/١٧ نووسەری ئەرمەنی بەناوبانگی لوبنانی- م-یوسف- بلاوی کردەوە کە بروسکەی نارەزایی لەلایەن- ئیشا مارشەمعون- ئاراستەی کۆمەلەی گەلانو شانشینی بەریتانیاو سەرۆکی فەرەنساو شانشینی بەلژیکاو شانشینی هۆلەنداو حکوومەتی ئیتالیا کراوە، کە لە بروسکە کەدا هاتووە:-
داوا لە کۆمەڵەی گەلانو ئەو حکوومەتانە دەکات بە ماوە نەدانی رژێمی شانشینی لە ئێراق ، ئەویش بە پەلاماردانو کووشتنی منداڵو ئافرەتو گەنجو پیری ئەرمەنیو ئاشووریەکان لە ئێراق ، بەتایبەتی مەسیحیەکان بەگشتی سەرەرای بیری جیاوازی مەزهەبیو کنیسەیی لە ئێراقدا.

١٩٣٣/٩/٨ کۆچی دواییشانشین فەیسەڵ ، شانشینی ئێراق شانشین فەیسەڵی یەکەمو لە دوای ئەو ئەمیرغازی بەشانشین لە سەر ئێراق دامەزرا.

١٩٣٣/١٠/٩ زۆر لەدانیشتووانی ئەلمانیاو بەلژیکا بەچاودیتیان کە ژمارەیەکی زۆر لە - شهب - لە ئاسمانی وولاتەکانیان کە کەوتۆتە سەر زەوی بەرێژەی ٦٠٠٠

هەزار – شهب – لە کاتژمێرێکدا.

جێگـەی روونکردنەوەیـە کـە – شـهب – کۆمەڵـە ئەسـتێرەیەکی بـچووکە لەگـەردوون و دەسـووتێ و لـەناو دەچێت , لـە دوای سـووتان و ووردبـوونی بـەرەو سـەر رووی زەوی دێتـە خـوارێ بـەخێرایی ٢٥٠ کیلۆمـەتر لـە یـەك چرکەدا. ئەمەش دەتوانرێ ببینرێت لـەماوەی بەرزی ١٥٠ کیلۆمـەتر لـە سـەر رووی زەوی , لە دوای سووتانی دەگۆرێ بۆ خۆڵەمێشێکی لمی لـە کەشێکی تۆزوبایی دەچێت و زۆر نابا دەکەوێتە سـەر زەوی لەشێوەی تۆزو بایـەکی چرێ خۆڵاوی... بەتوانای کامێرای تلسکۆب دەتوانرێ کە لەپـەردە، یاخوود لە بەرگی زەوی چەندەتیەکی زۆر لەو خۆڵە نەرمە هەیە... هـەروا دەزانـرێ کە – شـهب – بەشـێوەیەکی زۆر لـە شـەوی دیـاریکراو دەکەوێتـە خـوارەوە کـەزیاتر دەبـێ لـە ٨/١٠ – و ١١/٢٧ و کـەم دەبێتـەوە لـە ٤/٢٠ – ١١/٢٨ و ١٠/١٢.

هـەروا لـەم دوایینانـەدا دۆزراوەتـەوە کـە – شـهب – پێکهـاتووە لەهـەمان شمەکەکانی کە لە سەر زەوی هەن. بەڵام رێژەی تێکەڵاوی سەرسوورهێنەرە و وەك پارچەیەك لەئاسن و وەك لاستیك دەکەوێتە سەر زەوی و خۆی پێووە دەنووسـێ، ئەمـەش شـێووازێکی مووگناتیسیە لـە – شـهب – کـە دەکەوێتـە سەر گۆی زەوی لەگەردووندا.

سەرچاوە:– الموسوعة العلمية في الاعجاز العلمي – سمير عبدالسلام / ٢٤ – ٢٥.

١٩٣٣/١٠/٢٩ بەبۆنـەی دەیـەمین سـاڵرۆژی دامەزرانـدنی رژێمـی کۆمـاری تورکیـا لـە سـەر خاکی گەلانی ناوچەکە ، تورکە کەمالیەکان بریاری لێخۆشبوونیان راگەیاند، کـە کـوردی بـاکووری کوردسـتانی داگـیر کـراوی ژێـر دەسـەڵاتی تورکیـای نەدەگرتەوە لەم ڕاگەیاندنەدا .

١٩٣٣/١٢/١ لـە دایـك بـوونی روونـاکبیرو زانـای نـاوداری کـورد دکتـۆر جـەمال نەبـەز لـە باشووری کوردستان لە شاری سلێمانی لە هەرێمەکەدا .

۱۹۳۳/۱۲/۳ جمووجوڵی كرێكاران بەرەو دژایەتی كردنی سەرمایەداری دەرەكی هەنگاوی دەنا لە ئێراق ، بەتایبەتی لەكۆمپانیای كارەبا لەشاری بەغدا كەخاوەنداریەتی بۆ سەرمایەدارەكانی بەریتانیا دەگەراوە ، لەوكاتەی كە یەكیەتی كرێكارانی ئێراق .
داوای پچڕانی پەیووەندیان لەگەڵ كۆمپانیاكە دەكرد، لەدوای هەرەسهێنانی گفتووگۆكانیان ، ئەویش بە كەم كردنەوەی نرخی یەكەی كارەبا، لەگەڵ ئەوەشدا پچڕانی پەیووەندی لەرۆژی ۱۲/۵ هەمان ساڵ دەستی پێكرد ، كە لەوكاتە رژێمی شانشینی هەندێ جار بەكرداری دژایەتی كردن و هەندێ جاریش بەپێچوو پەناكارەكانی ئەنجام دەدا لە وولاتەكەدا .

## ۱۹۳٤

۱۹۳٤/۱/۲۲ ڕاگەیاندنی - خەتیب - بەسەرەتای بیری كۆمۆنیستی دادەنرێت ، كە مامۆستای قوتابخانەی فارسی بوو لە شاری موحەمەرەی ئێران و هەروا محەمەد گلووم لە قوتابخانەی ئێراق ، كە پەیووەندیان لە ڕێگای كوونسلی سۆڤیەتی هەبوو لە ئەهواز- بپالۆتكین - لەوڕاگەیاندنە ناوی سێ كەسی هێنا ئەویش -

یوسف سەلمان یوسف - واتە - فهد - و داود سلمان و گالی زوید بوون ، كە زانیاریان لەسەر كۆمۆنیستی پەیداكردبوو لە ڕێگای - پیتر ڤاسیلی - كە هەرسێ كیان دانیشتووی ناسریە بوون لە باشووری ئێراقدا.
بەلام لەبەسرە كاریان دەكردو ، دوای ئەوە كۆمەڵێك لە ڕێكخراو لە بەسرە دامەزرا ، لەلایەن چەند كەسانێكی ناسراو ، ئەویش یوسف سەلمان و هەڤالەكانی بوون . كە سەرەتای دەركەووتنیان دەگەڕاوە بۆ ساڵی ۱۹۲۸ ، و

بەردەوام بوون لەو کارە ، کە لە ئێراق دەگمەن بوو، بەڵام لەلایەکی دیکە تۆی پەیدابوونی کۆمۆنیست لە ئێراق دەگەڕێتەوە بۆ ڤاسیلی و لە ڕێگای یوسف سلمان یوسف بوو ، کە لە دوای ئەوە بووە دامەزرێنەری ڕاستەقینەی پارتی کۆمۆنیستی ئێراق و سکرتێری گشتی لە ساڵی ١٩٤١ تاکوو لە سێدارەدانی لە مانگی ١٩٤٩/٢ لە لایەن رژێمی شانشینی لە ئێراقدا .

تێبینی :- بۆ زانیاری زیاتر دەتوانی بگەڕێیتەوە سەر کتێب- ئێراق – لە نووسینی حەنا بەتا توو.

١٩٣٤/٣/٣١ دامەزراندنی پارتی کۆمۆنیستی ئێراق لەلایەن یوسف سەلمان یوسف – فەهد- لە شاری بەغدای پایتەختی ئێراق لەدوای رێکەووتنی گروپە مارکسیە –لینینیەکان لە باشوورو ناوەندو باکووری ئێراق.

١٩٣٤/٤/١٦ نووسەرو رووناکبیرو زانای پۆڵندی و کێشووەرەکەو جیهان خاتوو – مەدام مۆری – بە هۆی تووشبوونی بە نەخۆشی – لۆکیمیا – ماڵئاوایی لە گەل و نیشتیمان و بواری زانست و جیهان کرد. جێگەی روونکردنەوەیە کە مەدام کۆری ناوی تەواوی – ماریا سکلۆدۆڤسکی – یەو لە شاری وارشۆی پایتەختی پۆڵەندا لە ١٨٦٧/١١/٧ چاوی بە جیهان هەلهێناوە لە وولاتەکەیدا. خاتوو ماریا دایك و باوکی مامۆستا بوون، ماریاو خوشك و براکانی لە خوویندندا هەموو ساڵێك بە یەکەمی پۆڵەکانیان دەردەچوون لە قوتابخانە، ماریا هەر لە تەمەنی منداڵیەوە بەهرەو تواناکەی دەورووبەری سەرسام کردبوو.

هەروا خێزانی سکلۆدۆڤسکی بنەماڵەیەکی رۆشنبیر بوون، سەرەرای ئەوەش باری ئابووریان باش نەبوو. لە بەر ئەو هۆکارە ی کە پۆڵەندا لە

لایەن هێزەکانی سووپای سووری سۆڤیەت و دەسەلاتی سۆڤیەت داگیرکرا بوو و زۆربەی هەلی کارکردن و بازرگانی بۆ توانادارە بیانییەکان بوو، هەر چەندە باوکی ماریا مامۆستای فیزیا بوو.

بەلام بە هۆی هەلوێستی نیشتیمانپەروەری بێ کاربوو. بەم هۆکارە باوکی ماریا خانووەکەی خۆی کردبووە بەشی ناوخۆی قوتابیان بەرامبەر کرێەکی کەمدا.

هەر لەوکاتەشدا خاتوو ماریا لە تەمەنی ٩ سالیدا دەبێ کە دایکی بە نەخۆشی - سیل - کۆچی دوایی دەکات و ماریا بێ دایك دەمێنێتەوە، دوای ئەوە ماریا لە تەمەنی ١٨ سالیدا وەك مامۆستا دەست بەکار بوو لەو کاتەش لە پاریسی پایتەختی فەرەنسا لە خوێندن بەردەوام بوو.

سەرەرای باش بەبوونی باری دارایی خاتوو ماریا کە ئامۆزاکەی - جۆزێف بۆگسکی - کە بەرێوەبەری مۆزەخانەی پیشەسازی وارشۆ بوو هانی خاتوو ماریای دەدا، کە لە بەشی فیزیا بخوێنێت. ماریا لە تەمەنی ٢٤ سالیدا لە سالی ١٨٩١ لە زانکۆی - سۆربۆنی پاریس - وەرگیرا، کە یەکێك بوو لەو ٢٣ ئافرەتەی کە لە قوتابخانەی زانست وەرگیرا لە کۆی ١٨٢٥ قوتابی و هەر لەوێش - بێر کۆری - فیزیاوانی ناسی و لە سالی ١٨٩٥ بوونە هاوسەری یەکتری. لە سالی ١٩٠٣ خاتوو ماریا و هێنری بێکوێرلدا خەلاتی نۆبلی فیزیایان پێ بەخشرا.

دوای ئەوە هاوسەری خاتوو ماریا لە سالی ١٩٠٦ کەوتە ژێر گالیسکەو کۆچی دوایی کرد و کاری کردە سەر هەست و نەستی خاتوو ماریاو سەرەرای بەردەوام بوونی لە کارەکانیدا.

دوای ئەوە خاتوو - مەدام کۆری - یەکەم ئافرەت بووە کە خەلاتی نۆبلی پێ ببەخشرێ لە بواری فیزیا، هەروا یەکەم ئافرەت و کەسیش بووە کە بۆ جاری دووەم خەلاتی نۆبلی لە بواری کیمیا پێ ببەخشرێ. ئەم ئافرەتە توانی - تووخمی تیشکاوەری رادیمی- بدۆزێتەوە. هەروا خاتوو کۆری یاخوود ماریا خان لە دوای خۆی چەندین کاری زانستی و لە هەمان کاتدا دوو کچەکەی بە ناوی - ئێرینا و ئیڤا - و بەردەوام بووە لە کارەکانی تاکوو مالئاوایی کرد لە جیهان.

١٩٣٤/٥/٢٢ بۆ یەکەم جار لە ئێراق کۆمپانیای نەوت ڕەوانەکردن بۆ دەرەوەی ئێراق دامەزرا لە شاری کەرکوکی باشووری کوردستانی لکێنراو بە ئێراق، واتە نەوتی کوردی داگیر کراو لەپارێزگای کەرکوك و کەندێناوەو خانەقین لە هەرێمی باشووری کوردستان.

١٩٣٤/٦/٢٩ کۆچی دوایی زارۆ ئاغای رابەری سیمرئامێزیان لەیەکێ لە نە خۆشخانەکانی تورکیا... جێگەی ئاماژەپێکردنە کە ئەم مرۆڤە کورد بووەو تەمەنی زیاتر لە ١٦٠ سالْ بووە... شاری ئەستەمبوڵ وەك مەڵبەندێکی رامیاری. جفاکی , رۆشنبیری و کەلتووری کە پایتەختی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی بووەو بە درێژایی مێژوو پێگەی مەکانەتێکی گرنگی هەبووە.
هەروا ئەو هزرە نەتەوە خوازیە مۆدێرنەی لە بەرایی سەدەی نۆزدەمدا رووناکبیرە کوردانەتەکانیان پێداوە وەك دروستکردنی کەناڵەکانی راگەیاندن و رێکخستن و ئۆگاتیزاسیوونە سڤیل ودیموکراتەکان.
هەروا ئەو کوردانەی لە زووەوە بۆ بازرگانی هاوشانی عەرەب و رۆم و گریك و ئەرمەن و ئێرانیەکان لەوێدا جێنشین بوونە، کە کوردیش وەك زارۆغای کەسانی دیکە رۆڵی بالآیان هەبوو لە شاری ئەستەمبوڵ کە شارێکی گەورەی کوردانەو زیاتر لە ٣,٥٠٠ ملیۆن کورد لەو شارەدا دەژین.

١٩٣٤/٧/١ لەم رۆژەدا کەسایەتی ناوداری کورد و شاعیری شۆرشگێران و چینە چەوساوەکان – مەدحەت خدر عەبدوڵلآ – ناسراو بە مەدحەت بێخەو.
لە گوندی – جاستان – لە ناوچەی کەندیناوەی سەر بە ناحیەی دیبەگەی سەر بە قەزای مەخمور لە پارێزگای هەولێر لە هەرێمی باشووری

کوردستان چاوی بە جیهان هەڵهێناوە لە دەڤەرەکەدا.
جێگەی ڕوونکردنەوەیە کە مامۆستا بێخەو لە دوای لە دایك بوونی بە شەش مانگ خێزانەکەی ماڵیان دەگوازێتەوە شاری هەولێر، هەر دوای ئەوە لە ساڵی ١٩٤١ لە قوتابخانەی – ئەمەل – خوێندنی سەرەتایی تەواو دەکات و لە ساڵی ١٩٤٩ قۆناخی ناوەندیش تەواو دەکات.
هەروا بە هۆی بیری ڕامیاری چەپڕەوی و شیعرەکانی سێ جار تووشی زیندانی کردن دێت لەلایەن دارو دەستەکانی ڕژێمی شایەتی لە ئێراق. لە دوای شۆڕشی ١٤ تەموزی ١٩٥٨ بە فەرمانبەری تەندروستی دادەمەزرێ.
لە نێوان ساڵەکانی ١٩٦٣ تا ١٩٨٠ دیسان سێ جار دەستگیر دەکرێت، هەروا لە ساڵی ١٩٨٧ خانەنشین دەکرێت و دوای ڕاپەرینەکەی بەهاری ١٩٩١/ دووبارە لە ساڵی ١٩٩٣ گەڕاوەتەوە سەر کاری فەرمانبەریەتی لە بەڕێوەبەرایەتی ڕاگەیاندن لە وەزارەتی گوواستنەوەو گەیاندن.
لە ساڵی ١٩٩٦ کراوەتە ڕاوێژکار لە سەرۆکایەتی ئەنجوومەنی وەزیران لە حکوومەتی هەرێمی باشووری کوردستان، و دوای ئەوە بۆتە ڕاوێژکار لە وەزارەتی ڕۆشنبیری.
سەرەتای دەست پێکردنی شیعر لەلایەن مامۆستا بێخەو دەگەرێتەوە بۆ ساڵی پەنجاکان و یەکەم شیعری لە ساڵی ١٩٥٣ بۆ ڕاپەرینی جووڵانەوەی جووتیارانی دەشتی هەولێر بووە.
دوای ئەوە دەستی کردووە بە نووسینی شیعرو بڵاوکردنەوەی لە گۆڤارەکانی هەتاو – شەفەق – هیوا – ژین – پەیام. لەگەڵ ئەوەشدا بەردەوام بووە لە بڵاوکردنەوەی شیعرو نووسین و بڵاوکردنەوەی لە گۆڤارو ڕۆژنامەکان لە ئێراق و لە کوردستان. هەروا مەدحەت بێخەو یەکێك بووە لە دامەزرێنەری – بزووتنەوەی ڕۆشنبیرانی ئاشتیخواز – لە هەرێمی باشووری کوردستان لە پێناو وەستاندنی شەڕی خۆکوژی و براکوژی لە ساڵی ١٩٩٤ لە نێوان پارتی دیموکراتی کوردستان و یەکیەتی نیشتیمانی کوردستان کە خۆی سەرۆکی ئەم بزووتنەوەیە بووە.
مامۆستا بێخەو لەگەڵ دانانی شیعرو نووسینەکانی دیکەی ئەندامی چەندین ڕێکخراو سەندیکای کردووەو ڕۆڵی باڵای لەم ڕێکخراوانەدا هەبووە

ئەوانیش:-

١- ئەندامی یەکیەتی نووسەرانی کورد لە یەکەم رۆژی دامەزراندنیەوە.
٢- ئەندامی فەخری کۆمەڵەی هونەری هەولێرە.
٣- ئەندامی کۆمەڵەی رۆشنبیرانی کوردە.
٤- ئەنـــدامی دەســـتەی بەرێوەبـــەری کۆمەڵـــەی بـــەرگری لـــەماف نـــەوەی ئەنفالکراوەکان.

مامۆسـتا مەدحـەت بێخـەو بەشـداری بـە دەیـا کۆبوونـەوەی شـێکردنەوەی شـیعری کـردووە لـە دەزگـا راگەیاندنـەکان و لـە رۆژنامـەو گۆڤـارو رادیـۆو تەلەفزیۆنـەکان لـە شـارە جیـا جیاکـانی ئێـراق، بـە تایبـەتی لـە شـارەکانی هەرێمی باشووری کوردستان.

هەروا بێخەو لەماوەی ژیانیدا بە دەیا بەرهەمی شیعری بە دەست خوێنەرو شیعر دۆست و ئەدەب دۆست گەیشتووە لەوانەش :

١- کۆمەڵە شیعری – زەنگی کاروان – لە ساڵی ١٠٥٩ بڵاوکردۆتەوە.
٢- کۆمەڵە شیعری – رابەری ژیان – لە ساڵی ١٩٦٨ بڵاوکردۆتەوە.
٣- کۆمەڵە شیعری – ورتەی ئاوات – لە ساڵی ١٩٧٣ بڵاوکردۆتەوە.
٤- کۆمەڵە شیعری – داربەڕوو – لە ساڵی ١٩٧٨ بڵاوکردۆتەوە.
٥- کۆمەڵە شیعری – رەگەکان – لە ساڵی ١٩٨٧ بڵاوکردۆتەوە.
٦- کۆمەڵـە شـیعری – دیـاری بـۆ منـداڵانی کوردسـتان – لـە سـاڵی ٢٠٠٣ بڵاوکردۆتەوە.
٧- کۆمەڵە شیعری – کە خاك ئەدوێ – ئامادەیە بۆ چاپ کردن.
٨- کۆمەڵـە شـیعرێکی دیکـەی گـرنگ کـە بـەناوی – داسـتانە شـیعری هەولێری دێرین – کە باس لـە مـاوەی ٥٠٠٠ هـەزار سـاڵ بـەر لە ئێستا دەکات کە ئامادەیە بۆ چاپ کردن.
٩- نووسـینی – مێژووی عەشـیرەتی سـیان – کـە ئـەویش دەسـت نووسـەو ئامادەیە بۆ بە چاپگەیاندنی.

هـەروا جگـە لـەو بەرهەمـە بـەپێزو گرنگانـە مامۆسـتا بێخـەو شـیعرەکانی کراونەتـە گـۆرانی لەلایـەن گـۆرانی بێـژانی رەسـەنی کوردی، وەك مامۆسـتا عـەلی مـەردان و فوئـاد ئەحمـەد و تـاهیر تۆفیـق و چـەندین گـۆرانی بێـژی

ڕەسەنی دیکەی کورد، لەوانەش :- سرودی پێشمەرگە، کە لەمانگی ١٩٦١/١٠/ لەلایەن هونەرمەند فوئاد ئەحمەد گووتراوەو بۆتە مارشی دەزگا راگەیاندنەکان، بەتایبەتی لەگەڵ کردنەوەی رادیۆی دەنگی کوردستان لە ١٩٦٣/٩/٢٨ و تاکوو ئێستاش لە لێدانی بەردەوامە.

هەروا زیاتر لە ٤٠ شیعرو سرروودی ئافرەتان و وەرزش و چەندین شیعرو سرروودی دیکەی کە بۆتە هێمای گۆرانی و سرروودی رەسەنی کوردی لە کوردستان.

مامۆستا بێخەو لە ژیان ماوەو هیوای بەردەوامی ژیان و تەمەن درێژی و سەرکەوتووی بۆ دەخوازین لە هەموو بوارەکانی ژیان و کارو تەمەندا.

١٩٣٤/٧/٩ یەکەم کۆنفرانسی سەرتاسەری کوردناسی لە مالی کەسایەتی کورد فەرهەنگ- معارف- لە شاری یەریڤانی کوردستان بەسترا لە سەرئاستی یەکیەتی سۆڤیەت ،. لە سەر داخوازی پەیمانگای مێژووی کەلتووریەکانی ئەرمینیا و کۆمیتەی ئەلف وبێی نوێی سەر بە دەوولەتی ئەرمینیا دەستی پێکرد.

شایانی باسە لەم کۆنفرانسەدا ٣٠ نووێنەری زەحمەتکێشانی کوردی ئەرمینیاو ئازەربایجان و جۆرجیاو هەرێمی نەخجەوان و ئامارستان و کوردناسی شارە ناوەندیەکانی یەکیەتی سۆڤیەت بەشداریان تێداکرد... کۆنفرانسەکە بۆ تاوتۆکردنی کێشەکانی دروستکردنەوەو دارشتنی پیت و وشەکانی زمانی نەتەوەیی کوردی و رێنووس و گراماتیک و... زمانی کوردی پێك هاتبوو... کۆنفرانسەکەش تاکوو ٨/١٤ ی هەمان سالٚ بەردەوام بوو کەچوارخالی لەخۆگرتبوو ئەویش.

١- رێکخستنی زمانێکی ئەدەبی یەکگرتووی کوردی لە کوردستان .

٢- رێك وپێك نووسینی زمانی کوردی و ئەلفوبیٚ بۆ ئەم زمانە.

٣- رێزمان.

٤- چۆنیەتی زاراوەسازی و رێنووس بەرێك وپێکیلە زمانی کوردیدا.

١٩٣٤/٩/١٤ گرێدانی کۆنگرەی چەك داماڵین ، کە لە سالی ١٩٣٣ لە ژنیڤ مۆرکرابوو .

کـه کۆمەڵـەی گـەلان لـەم ڕۆژەدا بڕیـاری بـۆ دا بـه دووپاتکردنـەوه بەرەنگـه هێستریای سرینەوەو ئیبادەکردنی کورد لەباشووری کوردستانی لکێندراو به ئێراق ، که وای له ڕژێمی شاهانشینی له ئێراق کرد .

کـه ئـەویش سەرپێـچی هـەموو بەڵگەنامـەکان بکـاتو هـەموو پابەنـدبوونێکی یاسایی نێوو دەوڵـەتیو ئـەخلاقی بـەلاوه بنێـتو ئابڕوی مرۆڤایـەتی ببـات بەزیندووکردنەوەی وێنەی لەناوبردن و قڕکردنی چاخه تاریکەکانی بەدەیان سەدەی لەمەوبەر لەمێژوودا لەجیهان.

١٩٣٤/١١/١٥ دامەزرانـدنی کۆمـاری ئۆتۆنـۆمی لـه هـەرێمی چیـچانی ئینگۆشـی و لـه ١٩٣٤/١٢/٥ بووه کۆماری ئۆتۆنۆمی ، له چوارچێوەی ڕووسیای فیدرالی ، له ١٩٤٤/٣/٧ ئەم کۆماره هەڵووێشندرایەوه و تەواوی دانیشتووانی هـەرێمی چیچانی و دەوورووبەری کۆمارەکه به زۆرەملێ دوورخرانەوه له ناوچەکەدا .

دوای ئەوه پەرلەمانی چیچاندا – ئەنگۆشی بڕیاری لەسـەر سـەربەخۆیی دا و لـه ١٩٩٢/٣/٣١ بـه پێـی پـەیمانێك لـه نێـوان دەوڵـەتی ناوەنـدی ڕووسـیاو کۆماری چیچیندا سنوورو دەسەڵاتی نێوانیان دیاری کرا ، بەڵام نووێنـەرانی چیـچان ئـەم پەیمانـەیان مۆرنـەکرد، گەرچـی ڕووسـیا ئـەم کۆمـارەی بـه کۆمـارێکی سـەربەخۆ لـه چوارچـێوەی ڕووسـیای فیدرالیـدا ناسـاند و، بـه پێچەوانەی کۆمارەکانی دیکه دەسەڵاتی زیاتری پێدا .

لەگـەڵ ئەوەشـدا زۆربـەی زۆری چیـچانیەکان گووازرانـەوه بـۆ کۆمـاری کازاخـستان و قرقیزسـتان ، پـاش مردنـی سـتالین بڕیـاری ئـازادکردن و گەڕانـەوەو ماوەیـان پێدرا ، بـه درووسـت کردنـەوەی قەوارەکـەیان بۆئـەوەی نەگەڕێنـەوه لای کاربەدەسـتانی نـوێ و ناشـەرعی و نـا چیـچانی ، هـەروا چـەندین کێشەو گرفتیـان بـۆ درووسـت کـرا ، لـه نێـوان هـەردوو کۆمـاری قرقیزستان و کازاخستان له گەل ڕووسیاو ناوچەی چیچانیەکان و چەندین کـاری دیکـه ، کـه تـاکوو ئێـستا کێـشەی چیـچانیەکان بەتـەواوی چارەسـەر نەکراون له ناوچەکەدا.

١٩٣٤/١٢/٧ کۆچی دوایی کەسایەتی گەورەی ناوداری کورد مـەلا ئـەحمـەدی گـەووره – ڕۆژبیانی فروقاتی–.

## ١٩٣٥

١٩٣٥/٢/٦ شاعیرو نووسەری ناوداری کورد- ئەحمەد موختار جاف- لە سەر زێی سیروان لە پارێزگای سلێمانی لە باشووری کوردستان تیرۆر کرا لە ناوچەکەدا.

١٩٣٥/٣/١٦ راوێژکاری ئەلمانیا هتلەرو دەسەڵاتەکەی رازی نەبوونی خۆیان لە سەر پەیمانی فرسای راگەیاند ، داوای بەچەککردنی وولاتەکەی کرد بە گەڕاندنەوەی ئەو زەویانەی کە بەپێی ئەو پەیمانەی کە لە دەستی دابوو لەدوای جەنگی یەکەمی جیهان بۆی بگەڕێندرێتەوە سەر خاکی وولاتەکەیدا .

١٩٣٥/٣/١٦ شانشینی سعوودی شانشین ئیبن سعوود لەلایەن پیاوێکی یەمەنی بەخەنجەر کوژرا... شایانی باسە ئەو بنەماڵەیە حووکمڕانی حیجازو نەژدو دوای سعوودیەیان کردووەو هەموو کات ئەو بنماڵەیە باڵادەست بوونە لەهەموو بوارە جیاجیاکان ، کە بەئارەزوو خواستو ویستی خۆیان کاریان کردووەلە سەر ئەم وولاتەدا.

بۆنموونە ئیبن سعوود تاکوو ساڵی ١٩٣٠ ، -١٠٠- ژنی هێناوەو تەلاقی داوە بە ئارەزووی خۆی ، تا لە ساڵی ١٩٣٠ بڕیاریدا کە ساڵی دوو ژن بێنێ ، ئەویش بەئارەزووی خۆی...؟..! .

لەوەش سەیرتر ٤٥ کوڕی هەبووە . جگە لەکچەکان کەنازانرێ ژمارەین چەندن ، بەڵام بەهەر حاڵ نەوەی دوای خۆی گەیشتۆتە ٣٠٠ کەس لەکوڕو کچو چەندین خێزان لە وولاتەدا...ئای لەو ئیسلامەتیە...!؟.

١٩٣٥/٥/١ رووناکبیرو کەسایەتی کوردو پارێزگای سلێمانی سالح زەکی ساحێبکران پۆستی پارێزگاری پارێزگای سلێمانی گرتە دەست لەباشووری کوردستاندا.

١٩٣٥/٥/٢ لــه دایــك بــوونی فەیــسەڵ دووەم بــه دوو ســاڵ بــەر لــه مردنـــی بـــاوكی كورســـی دەســـەڵاتی شانـشینی گرتــه دەسـت ، لـه ژێـر ئامۆژگـاری خاڵەكـەی عەبـدول ئـیلا ، كـه ئـەویش دایانـەكی ئینگلیـزی بۆ دانرا به پـەروەردەكردنی ، واتـه بـەخێووكردنی فەیـسەڵ دووەم لەلایـــەن ئینگلیـــزو بەشـــیری ئینگلیـــز گـــەوورە بـــووه... لــه ١٩٤٣/٥/٢ بــۆ یەكەم جار وتارێكی به زمانی ئینگلیزی خووێندەوە به پشتگیری كردنی لـه بـەریتانیا لـه كۆتاییـەكانی جـەنگی دووەمـی جیهـان... لـەپێناو یارمـەتی و بەهێزكردنی دەسەڵاتەكەیدا له سەر ئێراقدا.

١٩٣٥/٥/٢٨ كۆنفرانسی كوردناسی له شاری ئیریڤان بووه مایەی بێزاری ڕژێمـی توركیا، گەرچی كۆنفرانسەكه هیچ مەراموو مەبەستێكی ڕامیاری تیانەبوو... بەڵكوو تـــەنیا بۆدروســـت كردنـــی ئـــەلفوبێی زمـــانی كـــوردیو نەهێـــشتنی نەخووێندەواری بوو له ناو دانیشتووانی كورد له یەكیەتی سۆڤیەتدا.

كەتوركەكان ئەم كۆنفرانسەیان بەمەترسیەكی گەوورە دانا بۆ بـەڕێووەبردنی ڕامیاریـــەتی ناونەتـــەوەو – ســـڕینەوەی ناســـنامەی كـــورد– ی كوردەكـــانی باكووری كوردستان له توركیا ، تەماشایان كرد كه توركەكان لـەوە دەترسـان ، كه ئایا هەنگاوێكی سیاسی له ژێر پەردەی ئەم چالاكیه زماننناسیەدا هەیە بۆ یەكگرتنی كوردەكانی دانیشتووی توركیا بەدواوە نابێ...؟.

لەبـەر ئـەوە دەســەڵاتی سـۆڤیەت بڕیاریـدا لـە كاروباری پـەروەردە كردنـی كوردەكـــانی ســـۆڤیەتی بـــە زمـــانی خۆیـــان بـــێ لەچوارچـــێووەی تـــەنگ و سنووورداردا بەڕێووە بچێ له وولاتەكەیدا.

١٩٣٥/٥/٣١ ڕوودانـــی گومـــە لـــەرزەی زەوی بـــەهێزی ٧/٥ پلــه لەســـەر پێـــووەری ڕێختـــەر لەناوچەی كووێتـه لـه بەشـی ڕۆژئاوای پاكستان ، كه زۆربـەی دانیشتووانی

کوردن و بووە هۆی گیان لە دەست دانی ٥٥٠٠٠ هەزار تا ٦٥٠٠٠هەزار هاووڵاتی ناوچەکە و وێران بوونی بە دەیا خانوو و باڵەخانەو کێڵگەی کشتووکاڵی لە ناوچەکەدا .

١٩٣٥/٦/٢١ خانمە نووسەری هاوچەرخی فەرەنسی – فرانسواز ساگان– لە پاریسی پایتەختی فەرەنسا لە دایك بووە لە شارەکەدا.

١٩٣٥/٧/٢٥ کورسی پاپاوی ، واتە دەسەلاتی دەووڵەتی فاتیکان چەندین پەیمانی جۆراو جۆری لەدوای پەیمانی لاتران مۆر کرد ، لەگەڵ وولاتانی جیهان... کەچوارەم پەیمانی لەگەڵ کۆماری یۆگسلافیا مۆر کرد.لە پێناو بەهێزکردنی پەیووەندیەکان .

١٩٣٥/٨/٨ لە هەڵبژاردنەکانی خوولی شەشەمی ئەنجوومەنی– الام – ناوی نووێنەرانی هەموو پارێزگاکانی ئێراقی تیابوو ، تەنیا ناوی نووێنەری پارێزگای کەرکوك لە باشووری کوردستان نەبێت ، کە پارێزگای کەرکوك کێشەی سەرکی بووە لە نێوان دەسەلاتی ئێراق و سەرکردایەتی کورد تاکوو تەواو کردنی ئەو مێژوو نامەیە.

١٩٣٥/٨/٢٠ روودانی گومە لەرزەی زەوی بەهێزی ٦/٦ پلە لەسەر پێووەری رێختەر لە رۆژهەلاتی هند ، کە بووە هۆی گیان لەدەست دانی ١٤٥٠ هاووڵاتی و وێران بوونی بەدەیان خانووباڵەخانەو کێڵگەی کشتووکالی لە ناوچەکەدا .

١٩٣٥/٩/١٩ لە دوای سەرهەڵدانی بزووتنەوەی کوردی ئێزیدی لەناوچەی سنجار، پارێزگای موسڵ عومەر نەزمی سەردانی چیای سنجاری کردو لەگەڵ کەسایەتی و پیاوانی ناوداری کوردە ئیزیدیەکان کۆبۆوە، لە دوای گەڕانەوەی بۆ پارێزگای موسڵ ، لە شاری موسڵ بروسکەیەکی ئاڕاستەی

وەزارەتــی نــاوخۆی رژێمــی شاهانــشینی لــە ئێــراق كــرد لــە بــارەی جــێ بەجێكردنی یاسای بەرگری نیشتمانی لە سەر ناوچەی سنجار لە باشووری كوردستان .

لەلایـەنی داودی داود سـەرەك عەشیرەتی مهركـان لەگونـدی زیـرولن و رەشـۆ قوولـوو سـەرەك عەشـیرەتی مالاخـالتی لەگونـدی عالـدلینا . كـە نـاوەرۆكی بروسـكە دووپـانی ئـەوە دەكاتـەوە كـە ئـەو دووسـەرەك عەشـیرەتە یاخینـەو یاسـای بـەرگری نیـشتمانی جـێ بـەجێ ناكـەن دژی مـیری لەچـەندین لایـەن وەستاون لە ناوچەكەدا .

١٩٣٥/١٠/١ دەست پێكردنی هێرشی هێزەكانی سووپای رژێمی شاهانشینی لە ئێراق بـۆ سـەر بزووتنـەوەی كـوردە ئیزیدیـەكان لـە ناوچـەی سـنجار لـە باشـووری كوردسـتان ، بەسـەركردایەتی لیـوا ركـن حوسـێن فـەوزیو هێرشـەكە تـاكوو ١٠/١٧ هەمان ساڵ بەردەوام بوولە ناوچەكەدا لە باشووری كوردستان .

شـایانی باسـە هێـزە شۆرشـگێرە كـوردە ئێزیدیـەكان لـە –٧٠٠– چـەكدار پێكهاتبوو، لەئەنجامی ئەو هێرەشە سەربازییە –٢٠٠– چەكدار شەهید كران و زیـاتر لـە ١٠٠ چـەكدار زامـدار كـران ، هـەروا ٣٩٥ چـەكداریش خـۆی دا بەدەست هێزكانی سووپای رژێمی شاهانشینی لە ئێراق .

بەڵام زیانی هێزەكانی سووپا زیاتر لە ٢٠٠ كووژارو زامداریان لـێ كەوتـەوە . دوای ئـەوە رژێمــی شاهانــشینی یاســای عــورفی لەقــەزای ســنجارو دەووروبەری راگەیاند لەرۆژی ١٢/١٠/ هەمان ساڵ لە ناوچەكەدا .

١٩٣٥/١٠/٧ هێزەكانی سووپای ڕژێمی شانشینی لە ئێراق لە هێرشێكی ناكاوی بۆسـەر شــەنگالوودەووروبەری ئەنجامــدا لــە هــەرێمی باشــووری كوردســتان... كـەداودی دوادو هـەزاران ئێـزدی لـە ڕووی ئـەو هێرشـە وەسـتانو زیـانێكی زۆریان لێدان... شایانی باسە قەڵای شەنگال لەهەرێمی كوردستان .

جێگەی باس كردنە كە لەكاتی خۆی بۆ بەرگریكردن لەهێرشـەكانی دوژمـن دروستكراوە ، لە بەر ئەوەی بە درێژایی مێژووی كۆنی ئەم شارە تووشـی بـە دەیا هێرشـی هێزەكـانی سـووپای دووژمـن بووتـەوە. لەسـاڵی ١٣٠٩ی زایـنی بـەرەو ڕووی هێرشـی داگـیر كـەری تەیمورلـەنگ بـووە ، لەسـاڵی ١٧٥١یـشدا بـەرەنگاری هێرشـی داگـیر كـەری شـای ئێـران بـووە ، لەسـاڵی ١٧٥٢یـشدا سووپای سلێمان پاشای والی بەغدا هێرشی كردۆتە سەر ناوچەكەدا.

دوای ئەویش لەساڵانی ١٧٩٢–١٧٩٤ تووشی هێرشـی عومـەر وەهـبی پاشـا

بۆسەر ئێزیدیەکان لەچیای شەنگال و قەڵاکەی بووە ، لەساڵی ١٨٣١دا سووپای داود پاشای والی بەغدا هێرشی کردەسەر، لەساڵی ١٨٤٦ والی موسڵ هێرشی کردەسەر و لەساڵی ١٩١٨ بەریتانیا داگیری کردووە ، لەدوای ئەوانیش رژێمی بەعس لە ئێراق درێخی نەکردوە بەرامبەر دانیشتووانە ئێزیدیەکان لە ناوچەکەدا .

١٩٣٥/١٠/٣ شانشینی ئەسیووبیا هیلاسیلاسی لەلایەن رژێمی شانشینی ئیتالیا ناچار کرا بەرەو هەندەران کۆچ بکات ، لەدوای داگیر کردنی وولاتی ئەسیوبیا لەلایەن هێزەکانی سووپای ئیتالیا.

١٩٣٥/١٠/٢٤ بڵاو کردنەوەی یەکەم ژمارەی گۆڤاری رۆناکی لەشاری هەولێر لە هەرێمی باشووری کوردستا ، لە لایەن مێژوونووس و رووناکبیر ناوداری کورد مامۆستا حسێن حوزنی موکریانی و بەردەوام بوو تاکوو ژمارە /١١ی گۆڤارەکە لە شارەکەدا .

١٩٣٥/١١/٢٢ گۆرانی بێژی ناوداری بەناو عەرەبی و جیهانی خاتوو – فەیرۆز– لە شاری بەیروتی پایتەختی لوبنان لە خێزانێکی هەژار لەچاوی بە جیهان هەڵهێناوە .

شایانی باسە خاتوو فەیروز ناوی رتەواوی خۆی خۆی– نهاد حەداد– ە و بنە ماڵەی باپیری ناوی – ودیع – بووەو لە سریانیەکانی پارێزگای ماردین لە باکووری کوردستان بووونە ، بەڵام بە هۆی ئەو کۆمەل کووژیە بێ وێنەکەی رژێمی عوسمانی ، کە بەرامبەر ئەرمەن و کورد لە ساڵی ١٩١٥ ئەنجامی دابوو کەووتنە وولاتی شامی ئەوکات.

ئێستاش تەمەنی ٧٠ساڵەو کچێکی بە ناوی ریمای هەیەو بەیەکەوە ژیان دەبەنە سەر لە شاری لوبنان .

جانازانم خاتوو فەیروز کوردە یاخوود ئەرمەنە گرنگ ئەوەیە عەرەب و تورک

نیه له خوا بەزیاد بێ.

١٩٣٥/١٢/٢٥ ڕوودانـی گومەلـەرزەی زەوی بـەهێزی ٦/٢ پلـه لەسـەر پێـوەری ڕێختـەر کـه بووه هۆی گیان لەدەست دانی زیاتر له ٥٣٠٠ هەزار هاوولاتی و وێرانکردن و لـه نـاوبردنی بـەدیا خـانوو کێلگـه کـشتوکاڵیاکان لەناوچـه شـاخاوییەکانی باکووری پاکستاندا .

## ١٩٣٦

١٩٣٦/١/٢٥ کۆچـی دوایـی سـەرکردەی سـووپای عوسمـــانی و کەســایەتی نــاوداری ڕۆژنامـەنووس و وەزیـری کـورد – مـیر لیوا روکن مستەفا پاشای یامولکی– کـوری مـەلا عـەزیز – لـه تەمـەنی ٧٠ ساڵیدا و گۆرەکەی لەگۆرستانی گـردی سـەیوانه لــه شــاری ســلێمانیه لــه باشووری کوردستان.

١٩٣٦/٣/٧ هێـزه هاوبەشـەکانی سـووپای ڕژێمـی شانشینی لـه ئێـراق و ڕژێمـی تورکیـا هەوڵیانـدا جێگـەو شـوێنی خـەلیل خۆشـەوی لـه دەرگاکـانی چیـای کاونـد دیاری بکەن ، له ئەنجام هێرشی هاوبەشی هەردوو ڕژێمی دژ بەکورد لـەدوای چەندین شەهیدو زمدارکردنی چەکدارەکانی خۆشـەوی ، خێزانـی خۆشـەوی داستگیر بکەن ، دوای ئەوەی له ٣/١٣/ هەمان ساڵ خەلیل خۆشـەوی شـەهید کـراو بـەو هۆکارانـه توانیـان بزووتنـەوەی خـەلیل خۆشـەوی و لایـەنگرانی کۆتایی پێ بێنن لەهەرێمی باشووری کوردستانی لێکدراو به ئێراقدا.

١٩٣٦/٤/٢٦ دانیشتووانی شارۆچکەی – ژرینکای – سـەر بـه هـەرێمی باسك لـه باکووری ئیسپانیای سەر له بەرەبەیان فرۆکەکانی ئەلمانیای هتلـەری بۆردومـانی ئـەو شارۆچکەی کـردو دانیـشتووانەکەی لـه زرینگـەی دەنگـی مووشـەکەکانی بۆردومـان کردنـی شارۆچـکەکە بـه ئاگاهـاتن... جەماوەرەکـه لـه هـیچ شـتێك حـاڵی نـەدەبوون تـەنها ئـەوەیان دەزانـی کـه شارۆچـکەکەیان لـەماوەی سـێ کاتـژمێرو نیـوودا تووشـی رووخـان و وێرانکـردن هـات. لـه ئـەنجامی ئـەو

بۆردومانەدا، کە دوو هەزار کەس لەدانیشتووانی ئەو شارۆچکە گیانیان لەدەستدا و بەهەزاراش زامداربوون و لە ئاکامدا خووێن و ئێسکان و خۆڵ و ئاو تێکەڵ بەیەك بوون و ڕووداوێکی سەرسوورهێنەربوو وەك ڕووداوەکانی دیکە خۆی خستە ناو لاپەرەکانی مێژوو لەتاوانەکانی هیتلەری فاشی و هاوبەشەکانی لەجیهاندا.

سەرچاوە :- گۆڤاری هلال – ٢٠٠٧/١١/١١.

١٩٣٦/٥/١٣ کۆچی دوایی کەسایەتی کوردی پارێزگای سلێمانی شێخ عومەر شێخ ئەمینی قەراخی لەشاری سلێمانیدا.

١٩٣٦/٦/١٠ کۆچی دوایی نووسەرو ئەدیب ورۆمان نووس و ڕووناکیری ناوداری ڕووسیجیهانی – مەکسیم گۆرکی– لە شاری مۆسکۆی پایتەختی یەکیەتی سۆڤیەتی پێشوو کە ناوی تەواوی – ئەلیکسی ماکسماریتشی– یەو کە گەوورە نووسەرو دارێژەری ڕێبازی ریالیزمی سوشیالیستی بووە لە لە وولاتەکەیی و کێشووەری ئەورووپادا .

١٩٣٦/٧/١ بۆ یەکەم جار لە مێژووی وولاتی نێوان دووزێو ئێراقی دورستکراو لەسەر خاکی گەلانی ئێراق ، بە تایبەتی خاکی کوردستان وێستگەی ڕادیۆی شانشینی لە ئێراق لەشاری بەغدای پایتەختی ئێراق پەخشی خۆی بەجیهان بلاو کردەوە لە شارەکەدا .

١٩٣٦/٧/١٨ لە دوای کۆتایی هاتنی شەڕی ناوەخۆی ئیسپانیا شۆرشی ئیسپانیا دەستی پێکرد بە سەرکردایەتی ژەنەڕاڵ فرانکۆ لە شاری مەراکشی ئیسپانی دژی حکوومەتی کۆماری میللی ، کە دەسەلات وەرگیرا لە دوای هەڵووەشاندنەوەی ڕژێمی شانشینو ئەو کۆمارە چەندین یاسای سۆشیالیستی ڕاگەیاندن.

که ئەویش بووە هۆی بەرزبوونەوەی ناڕەزایی لە لایەن پیاوانی ئاینی لە کەنیسەکان و دەرەبەگەکان ، فرانکۆ لە دەریا بەڕێووە بەرەو ئیسپانیا دەستی بەسەر باشوور داگرت ، دوای ئەوە بەرەو باکووری ڕۆژئاوا ، بەڵام دەسەڵاتی میللی کرێکاری توانی بەسەر شۆڕشی فرانکۆ سەرکەوێت لە شاری مەدریدو بەرشلونەو بلباو ناوچەکانی دیکە لەووڵاتەکەدا .

جێگەی باسکردنە کە فرنسیسکۆ فرانکۆ پارێزەر لە سووپا سەرکردایەتی ڕاپەرینی دژ بە دەسەڵاتی ئەسپانیای کرد ، لە ئاکامی هەڵبژاردنی حکوومەت وشەڕی ناوخۆی ئەسپانیا ، کە سەرەتای دەستپێکردنی بوو لە نێوان نەتەوەییەکان بەسەرکردایەتی فرانکۆ بەپشتیووانی گەوورە پیاوانی ریتالیەت و ئەلمانیەکان لەگەڵ کۆماریە چەپڕەوەکان کە شەڕەکە ماوەی سێ ساڵی خایاند لە ووڵاتەکەدا.

١٩٣٦/٨/١ پێشبڕکێی یارییەکانی جامی جیهانی – ئۆلەمپیات- لەبەرلینی پایتەختی ئەڵمانیا ئەنجامدراو بەردەوام بوو تاکوو ٨/١٦ ی هەمان ساڵ لە نێوان یاری زانەکانی ووڵاتانی بەشدار بوو لە جیهاندا .

١٩٣٦/٨/١٨ کـــووژرانی ڕوونـــاکبیرو ئەدەبی ناوداری ئیسپانیا – فـــدریکۆ لۆرکـــا –کـــە لەوکاتـــەی لـــە غەرناتـــەوە ڕاپێـــچیانکرد و هـــەر لـــەو شـــەوە لەســـێدارەیاندا. جێگـــەی باســـکردنە کـــە ئەمـــەش لەوکاتـــە بـــوو کـــە شـــەڕی ناوەخۆی ئیسپانیا بەرەو کۆتایی هەنگاوینا. بـــە پێـــی ڕاپـــۆرتی فـــەرمی کـــووژرانی لۆرکـــا. کـــە تووێژینەری بەرەگەز ئیرلەندی – ئایان جیبسۆن – لە ساڵی ١٩٣٩ تاکوو ئەم ساڵانەی دواییش هەر بەردەوام بوو لە پێناو دەستکەووتنی زانیاری لەسەر

چۆنیەتی کووشتنی لۆرکا... بۆیە لە هەموو لایەنەکانی ژیان و رۆشنبیری کۆلیوەتەوە و چەندین کتێب و بلاوکراوەی دەربارەی ژیاننامەی شیعرو بەرهەمەکانی خۆی و هاورێکانی وەك ئەنتۆنیۆ ماچادۆو سلڤادۆردالی بلاوکردۆتەوە.

دوای ئەوە بەماوەیەکی زۆر گەیشتە ئەو دەرئەنجامەی کە نووسیویەتی :- ئەوەی روونکردەوە کە بکووژی ئەدەبی ناوداری ئیسپانی پیاوێکە کە ناوی - رامۆن رویس ئەلۆنسۆ - یە کە لە ساڵی ۱۹٦۷ چاوپێکەوتووەکە لەوکاتە سەرقاڵی نووسینەوەی کتێبێك بووە سەبارەت بەچۆنیەتی کووژرانی لۆرکا. دوای ئەوە کە گەیشتە ئەو بروایە کە - رۆیت ئەلۆنسۆ - دەستی لە کووشتنی لۆرکا هەبووە.

دوای ئەوە کاربەدەستانی هانداوە بۆ ئەوەی لۆرکا بکووژرێ... کە رویس کالۆنسۆ پیاوێکی رامیاری بووە لەبواری وێنەکێشانی نەخشە لە شاری غەرناتە کاری کردووە... کە شارەکەی لۆرکا بووە... دواتر بە ئەندامی ئەنجوومەنی نووێنەران هەلبژێردراوە... بەلام لە ساڵی ۱۹۳٦ لەو شووێنە لادراوە لە وولاتەکەدا.

سەرچاوە :- رۆژنامەی - شرق الاوسط -.

۱۹۳٦/۱۰/۲۹ لە کودەتایەکی سەربازی ناوداری کورد بەکر سدقی دەسەلاتی ئێراقی گرتە دەست. هەوڵی دا کورد بەرەو قەزای حەویجە کۆچ بکەن و نیشتەجێ بن.

لە بەر ئەوەی ئەم سەرکردە کوردە هەوڵی دامەزراندنی دەوولەتێکی کوردی لە هەست و هۆشدا بوو، چ لە ئێراق و چ لە کوردستان .

بۆ نموونە سەعید قەزاز کە لە کاتی شۆرشی ۱٤/تەمووزی/۱۹۵۸ وەزیری ناوخۆی ئێراقی کۆماری بوو، هەوڵی زۆری دا بە دامەزراندنی کورد لەکۆمپانیای نەوتی کەرکوك و نیشتەجێکردنی کورد لە قەزای حەویجە. لە بەر ئەوەی خاکی کوردستان بوو. بەلام ئەو سەرکردە کوردانە لە سێدارەدران بەتایبەتی بەکر سدقی لە ۱۹۳۷/۸/۱۱ بە پلانی ئینگلیز و عەرەبە شۆڤینیەکان لە شاری مووسلّ.

۱۹۳٦/۱۰/۲۹ بەرپابوونی کودەتای سەربازی لە لایەن بەکر سدقی لە شاری بەغدا دژی رژێمی شانشینی لە ئێراق.

جێگەی ئاماژە پێکردنە کە بەکر سدقی شەوقی عەسکەری لە بنە ماڵەیەکی

کـورد لــه ناحیــەی ئاخجەلــەر چـاوی بــە جیهــان هــەڵهێناوە لــە باشــووری کوردســتان ، لــە دوای تــەواو کردنــی قۆناخــەکانی خوێنــدنی ئامــادەیی – روشدیە – لە ساڵی ١٩٠٨ چۆتە قوتابخانەی سەربازی لە شاری ئەستەمۆڵی تورکیـا ، دوای تـەواو کردنـی خوێنـدن چـۆتە کۆلیـژی ئـەرکانی سـووپای عوسمـانی . دوای ئـەوە لــە بــەرەکانی جــەنگی یەکــەمی جیهـانی بەشـداری جەنگی کردووە .

دوای تــەواو بــوونی جــەنگ چــۆتە نــاو ســووپای ســووریا ، دوای ئــەوە گەراوەتەوە شاری بەغدای پایتەختی ئێراق ، لە سووپای ئێراق بە پایـەی – رەئیس – وەرگیراوە ، لـە سـاڵی ١٩٢٨ بووتـە – عەقیـد – و لـە سـاڵی ١٩٣١ پایەی – زەعیمی – وەر گرتووە و کراوەتە سـەرکردەی سووپای باکوور ، لە ساڵی ١٩٣٢دا بووەتە–ئامر لیوا – دوای ئەوە کراوەتە فەرماندەی باشوور .

جێگەی باسکردنە کە هەوڵەکان بەردەوام بوون بۆ لە ناوبردنی بەکر سدقی ، تا لە ١٩٣٧/٨/١١ دا لە کاتێکدا کە سـەرۆکایەتی شاندێکی سـەربازی دەکرد بۆ تورکیا لە بنکەی ئاسمانی مووسڵ .

بە یاوەری محەمـەد عەلی جەواد ، کە سـەرۆکی هێزی ئاسمـانی بوو پیلانـی کووشتنەکەیان جێ بە جێکرد ، دوای ئـەوە حکمـەت سلێمان دەسـت لـە کار کێـشانەوەی خـۆی لـە ١٩٢٧/٨/١٧ دا پێـشکەشی کـردو بـەم شـێووەیە حکوومەتی کودەتا کۆتایی پێهات لە ئێراقدا .

١٩٣٦/١١/١٢ کۆچی دوایی کەسایەتی ناوداری کورد هۆزانەوان – حەمد– ی لـە تەمەنی ٦٠ سـاڵیدا لەباشـووری کوردسـتان لـە شـاری سـلێمانی و گۆرەکـەی لـە گۆرستانی گردی سەیوانە لە شارەکەدا .

١٩٣٦/١١/١٦ مۆرکردنی پەیمان لە نێوان سووریاو فەرەنسا ، کە مەندووبی سامی فەرەنسا – مسیۆ دی مارتل– و نووێنەری سووریا ئەو پەیمانەیان مۆر کرد.

شـایانی باسـە کـە سـووریا زیـاتر لـە ١٧٠٠٠هـەزار کیلۆمـەتر چوارگۆشـەی لــەخاکی رۆژئــاوای کوردســتانی کەوتۆتــە ژێــر ســنووری دروســتکراوی دەووڵەتەکـەی بـەپێی پـەیمانی لـۆزانی مـۆرکراو لـە ١٩٢٣/٧/٢٤ لـە لایـەن وولاّتانی هاوپەیمانەکاندا.

١٩٣٦/١١/٢٥ لە راگەیانێکی سەرۆکی یەکیەتی سۆڤیەتی- ستالین – ئەویش بەسەرکەووتنی سۆشیالیستی لە یەکیەتی سۆڤیەت ، دوای ١٩سالٚ لە سەرکەوتنی شۆڕشی ئۆکتۆبەر. دوای ئەوە لەمانگی/ ١٩٦٠/٤ تشیکۆ سلۆڤاکیا لەدەستوورەکەی ڕایگەیاند ، کە ناوی دەوولەتی نویٚ سەرهەلدا ، ئەویش بە- کۆماری تیشکی سۆشیالیستی- ئەم هۆکارە بووە هۆی ڕاگەیاندنی سەرکەووتنی سۆشیالیستی، لە دوای قۆناخی گواستنەوە ، کە ماوەی ١٥ سالٚی خایاند.

بەلام بەڕایەکانی کە توانای بۆ دەرەخسا لە ڕاپۆرتەکانی گەیشتنی کۆمەلٚگا بەقۆناخی سۆشیالیستی... شایانی باسە ئەمەیە پەلەکردن لەڕاگەیاندنی بنەمای سۆشیالیستی لە بەرامبەر ناوەندەکانی ڕژێمی بە هێزی سەرمایەداری ، کە هۆکاری پەرەسەندنو پێشکەووتنی نەبوو بە تایبەتی لەبواری پێشبڕکێیرامیاری و سەربازی و ئابووری و ژێرخانی ئابووریو بازرگانیو پیشەسازیو کشتووکالٚ لە کێشوورەکەدا .

١٩٣٦/١٢/٥ دەوولەتی عەلەویەکان بە پێی بڕیاری ژمارە/٤٠٣/٢٤٧. لکێندرا بە دەوولەتی سووریا ، کە لەلایەن دادوەری سامی فەرەنسا –د.دی.مرتل- مۆرکرابوو. ئەمەش بەپێی ئەم دوو مەرسوومەی کە لە٢-١٢/٥ی هەمان سالٚ دەرچوو بوون بەگەڕاندنەوەی هەردوو هەرێمی دروزو عەلەویەکان بۆ ژێر دەسەلاتی ڕژێمی شانشینی لە سووریادا.

١٠/ ١٩٣٦/١٢ شانشینی بەریتانیا ئەدواردی هەشتەم دەستی لەکاری شانشینی کێشاوەو بۆ دایکی جێهێشت کە ئەلیزابێتە... تاکوو ئێستاش پۆستی شانشینی بەریتانیای بە دەستە.

شایانی باسە ئەدوارد بەشداری لە شەڕی یەکەمی جیهانی کردووەو رۆلٚی بنەرەتی و سەرەکی هەبووە لە پەیمانەکانی سایکس- بیکۆو سیڤەرو لۆزان بە دابەشکردنی کوردستانو بەدەیا کێشەی دیکەی جیهانی ، لە پێناو بەرژەوەندی تایبەتی وولاتەکەی ، بەهاوکاری ئەمەریکاو هاوپەیمانان لە جیهاندا .

## ۱۹۳۷

۱۹۳۷/۲/۲۰ كۆچـی دوایـی دبلۆماتكـارو سیاسـەتمەداری بـەریتانی — سـێر پـرێس كـۆكس — لـە شـاری لەنـدەنی پایتـەختی بەریتانیا.
جێگـەی باسـكردنە كـە ئـەم كەسـایەتیە نێـوو دەوڵەتیە لـــە ۱۸٦٤/۱۰/۲۰ چـــاوی بــەجیهان هـــەڵهێناوە... لــە دوای تـــەواوكردنی قۆناخـــە یـــەك لـــەدوای یەكـــەكانی خووێنـدنی و لـە تەمـەنی ٤۰ سـاڵیدا واتـە لـە سـاڵی ۱۹۰٤ بووەتـە كونسڵی گشتی لە شاری بووشەهری ئێستای ئێران.
هەروا لە ساڵی ۱۹۰۹ بووەتە موقیمی رامیاری لەكەنداوی فارس... لـە سـاڵی ۱۹۱٤ بووەتـە سـكرتێری هەنـدەرانی حكوومـەتی هندسـتان... دوای ئـەوە بووەتە سەرۆكی ئەفسەری رامیـاری لـە هێزی لەشكركێشی كوردسـتان... لـە نێوان ساڵەكانی ۱۹۱۸ –۱۹۲۰ بووەتە وەزیری بەریتانیا لە ئێران.
لە دوای ئەوە لە ساڵی ۱۹۲۰ وەكوو كۆمێسری بەریتانی لەبەغدا جێگەی سێر ئارنۆڵـد وویـسلنی گرتـەوە... تـا سـاڵی ۱۹۲۳ هـەر لـەو پۆسـتەدا مایـەوە. بـە دامەزرێنـــەری ســـووپاو دەســـتووری ئێراقـــی شانـــشینی دادەنرێـــت...ئـــەم كەسـایەتیە رۆڵـی بـاڵاو كاریگـەری هـەبوو لـە دروسـتكردن و چارەسـەركردنی هەمەلایەنـەی جۆراوجـۆر لـە كێـشە هەڵوواسـراوەكان، بـە تایبـەتی لەهـەرێمی باشووری كوردستان لـەكاتی راپـەرین و شـۆرش و دەسـەلاتی شـێخ مـەحمودی حەفید لە هەرێمەكەدا.

۱۹۳۷/۳/۱۰ دامەزرانـدنی كۆمەڵـەی برایـەتی لەلایـەن شـێخ لـەتیفی كـوری شـێخ مـەحمودی حەفید لەشاری سلێمانی لە باشووری كوردستان.

۱۹۳۷/۳/۱۹ ڕاگەیاندنی مەرسوومی فاتیکان لەلایەن پاپا بیوسمی یانزەهەم بڵاوکرایەوە دژی کۆمۆنیستیەت... کە کۆمۆنیستی دژی هەموو ئاینەکانی جیهانەو بڕوای بە خالق نیەو هەلگری تێئووری مادیەو بڕوای بەهەبوون و بینینی بەرچاو هەیە....!...؟.

۱۹۳۷/٤/۲٤ بە پێی ماددەی /۱ی یاسای ڕێکەوتننامەی مۆرکراوی دراوسێیەتی لە نێوان وولاتان .

بە تایبەتی لە نێوان ڕژێمی شانشینی لە ئێراق و سووریاو ئوردن و سعوودیەو کووێت... ئەویش کە ماوە بە بەدووە عەرەبەکان و مەڕ لەوەڕێنەکان و دانیشتووانەکانی دیکەی بیابانی عەرەبی سعوودی و ئوردن و کووێت دەدا... کە بە ئارەزووی خۆیان دەتووانن لە نێوان خاکی ئەو وولاتانەو سنوورەکانیاندا بسوورێنەوە بە ئارەزووی خۆیان .

لە بەر ئەوەی کە عەرەبن لەسەر خاکی گەلانی دیکە ، بەتایبەتی خاکی کوردستان و نیشتەجێ بن ، کەئەمەش هۆکارێکی سەرەکی بوو لەپێناو بەعەرەبکردن و داگیر کردنی ڕۆژئاواو باشووری کوردستانی لکێنراو بە ڕژێمە بۆگەنە داپلۆسێنەرەکانی سووریا و ئێراق لە ناوچەکەدا .

۱۹۳۷/٥/۲۳ ڕژێمی تورکیا ڕۆژنامەی – سۆن تەلەگرافی– لە شاری ئەستەمبوڵ داخست ، ئەویش بەهۆی نارەزایی بابەتە بڵاو کراوەکان تیایدا لە سەر هەڵسوو کەووتی دەسەلاتەکەیاندا .

۱۹۳۷/٦/۷ شاعیرو ڕووناکبیری بەناوبانگی ئێراق و عەرەب و جیهان – مەعروف ڕەسافی – دووبارەی دەنگەکانی عەبدولرەحمان کەواکبی دەکردەوە کە لەئەنجوومەنی نووێنەرانی ئێراق ، بە ئاشکرا ڕایگەیاند و ووتی:– من شیوعیم و بەلام

شـیوعیەتەکەم ئیـسلامیە ، لەبـەر ئـەوەی لـە قورئـانی پـیرۆزدا هـاتووە :– وفي امـوالهم حـق للـسائل والمرحـوم – الـذاريات/١٩ ، هـەروا محەمـەد – د.خ – گویەتی:– تؤخذ من اغنيائهم فترد علـى فقرائهم – البخـاري ١٤٢٥، ئایـه ئـەوە شـیوعیەت نییـه کـێ دەتـوانێ بـەرگری ئـەوە بکـات ، تـەنیا هـەژاری دواکـەوتوو نەبێت لە ئێراق و جیهاندا .

١٩٣٧/٦/١٤ ســەرکردەی ئەرمەنیــەکان – ئارســین کیــدۆرم– لەســەرکردەکانی هنــشاق– نامەیـەکی ئاراستەی کۆمـەڵێ قوتـابی ئەرمـەنی کـرد لـە زانکـۆی ئەمـەریکی لـە بـەیروتی پایتــەختی لوبنــان ، کــە نامەکــە بلــوڵکراوە لــە دۆســیەی وەزارەتــی پۆلیس لە ئێراق لە ژێر ژمارە /١١٥٨ پارێزراوە لە وولاتەکەدا .

شایانی باسە جوولانەوەی – الهنشاق– بەدەست پێشخەری چەند قوتابیـەکی ئەرمەنی دامەزرا ، لەپێناو بلأوکردنەوەی ڕۆژنامەیەك لەشاری ژنێف لـە ساڵی ١٨٨٧ ، ئامـانجیش یـەك گرتنـی هـەموو خـاکی ئەرمـەنی بـوو لـە وولاتێکـی سۆسیالستیدا.

هـەروا لـە سـەدەی بیـستەم ئـەم جوولانەوەیـە ناسـرا بـەناوی ڕێکخـراوی – سۆسیالیـستی دیمـوکراتی – کـە لەهـەرێمی قـەوقاز هاوکاریـەکی گـەرمیان درووست کرد لەگەڵ بەلشەفیەکان دژی – فیدرالیـەتی شۆڕشگێڕی ئەرمـەنی– ئەوانەی کە بیری نەتەوەییان هەبوو بەناوی – تاشناکنزونیان– کە قوتابیـەکان ئەنـدامانی زۆرینـە بـوون لـە ڕێکخراوەکـەدا ، ئـەم ڕێکخـراوەش لـەدوای سـاڵی ١٩١٠ بەهێزبوون و دژی دەسەڵاتی عوسمانی وەستان.

١٩٣٧/٦/٢٣ دەووڵەمەنـدی نـاوداری ئەمـەریکی و لایـەنگیری دەووڵـەتی ئیـسرائیل ئـەدوارد ئۆرمـان بـە هاوکـاریو ڕێگـە خۆشـکەری موحـسن هەلـسان بـەگفتووگۆ کـردن لەگـەڵ ڕژێمـی شانـشینی لـە ئێـراق ، لـە پێنـاو گەیـشتن بەرێکەووتننامـەی گوواسـتنەوەی عەرەبـە فەلەسـتینیەکان بـۆ ئێـراقو نیـشتەجێکردنیان لـە و وولاتەدا .

بــەڵام ئــەو کــارە بــە تــەواوی جێبــەجێ نــەکرا ، ئــەویش بەهەوڵــدانیان بـۆ نیـشتەجێکردنیان لـە باشووری کوردستانی لکێنـراو بـە ئێراق بەتایبـەتی لـە پارێزگـای کـەرکوكو دوای ئـەوە لـە پارێزگاکـانی دیالـەو موسـل لـە باشـووری کوردســـتان ، لـــەپێناو چارەســـەرکردنی دوو کێـــشەی دژ بـــەکوردو خـــاکی

کوردستان.
یەکـەمیان :- دوورخـستنەوەی دانیـشتووانی عـەرەب لەفەلەسـتین و کـەم کردنەوەی دانیشتووان عەرەب لە فەستین .
دووەم :- ئاسـانکاری کـردن لـە جێبـەجێکردنی بڕیارەکـانی دەوڵـەتی ئیـسرائیل و بەعـەرەبکردنی ناوچـە کوردیـەکان لـەپێناو گـۆڕینی سـنووری جووگرافیای کوردستان .

١٩٣٧/٧/٧ هێزەکانی سووپای ڕژێمی شانشینی لە یابان لە هێرشێکیدا چینی مللی بە تـەواوی داگـیر کـرد ، بـەڵام دوای ئـەوە بـەهۆی سـەرنەکەووتنی لەجـەنگی دووەمـی جیهـان ، لـەخاکی چـین بـە تـەواوی کشانەوەو بـووە هـۆی دورسـت بوونی کێشەو ململانێ لە نێوان ماوتسی تۆنگ و شیانگ کای شك ، کە شـینگ سـەرکردایەتی پـارتی نیـشتمانی چـینی دەکـردو ، ماوتـسی تـۆنگیش سـەرکردایەتی کۆمۆنیـستەکان دەکـرد ، ئەمـە لەلایـەك و لایـەکی دیکـەش دورست بوونی بە دەیا کێشە دیکە لە نێوان چین و یابان ، بەهۆی دەستکاری کـردن لـە بەلگەنامـە کۆنـە بەنرخـەکانی ، لـە زمـان و مێـژووی چـین و کۆریـای باکوور لەکاتی داگیرکردنەکاندا.

١٩٣٧/٧/٨ مۆرکردنی پەیمانی سەعد ئاباد لە نێوان ڕژێمی شانشینی لـە ئێراق و ڕژێمی شـایەتی لـە ئێـران و ڕژێمـی تورکیـا و ڕژێمـی شانـشینی لـە ئەفگانـستان ، کـە ئامانجی ئـەو پەیمانـە بۆ گـەمارۆدان و پەلاماردانی بزووتنـەوەی ڕزگـاریخوازی کورد بوو لە کوردستان .

بەتایبەتی لەو کاتەی بەدورست بوونی هـەر دەووڵـەتێکی کوردی لەسـەر هـەر پارچەیەك لەپارچە دابەشکراوەکانی لکێنراووداگیر کراو بە دەووڵـەتکانیان ، ئـەویش لەسـەر ڕۆشـنایی و ڕێنمایـەکانی پـەیمانی لـۆزانی ١٩٢٣/٧/٢٤ لـە لایەن وولأتانی هاوپەیمانانـدا .

جێگەی ئاماژە پێکرنە کە مۆرکردنی پەیمانی سـەعد ئاباد لـە کۆشـکی سـەعد ئابـاد- لـە شـاری تـارانی پایتـەختی ئێـران لـە نێـوان ئـەو دووڵەتانـە مـۆرکرا , ئەویش بە پـشیووانی بەریتانیا ، بە نـاوی پـەیمانی - بەگـژ یەکدا نەچوون - یان مۆرکرد ، لە دوای ئەوە ناوەکەی گۆڕدرا بە سەعد ئاباد .

هـەروا ئـەو کەسانەی کـە وەزیرەکـانی دەرەوە بوون کـە پەیمانەکـەیان مـۆرکرد بریتـی بـوون لـە ، وەزیـری دەرەوەی تورکیـا تۆفیـق ڕەشـید ئـاراس . وەزیـری

دەرەوەی ئێـران عینایەتوولاسـەمیعی . وەزیـری دەرەوەی ئەفگانـستان فـەیز محەمەدخان . وەزیری دەرەوەی ئێراق ناجی ئەسیل .
هـەروا بـە پێـی ئـەم پەیمانـە کێشەکانی نێوانیـان چارەسـەر کـردوو چـوونە سـەنگەری بەرگریـەوە دژ بـە شۆڕشـی کـورد ، لـە هـەمان کاتـدا ئەنجوومـەنێکی راوێژکاریان پێك هێنا لە وەزیرەکانی دەرەوەو بریاریاندا ، کە گفتووگۆ بکـەن دەربارەی ئـەو بابەتانـەی کـە پەیووەنـدیان بـە بەرژەوەنـدی هاوبەشـەوە هەیـە ، هـەروا ئـەو ئەنجوومەنـە هـەموو سـالێك کۆبوونـەوە ئـەنجام بـدەن ، کـە ئـەو ئەنجوومەنە بریارەکان دەدا لە چۆنیەتی باری پیووەندی لە نێوانیاندا
سەرچاوە:- زموونەرخین-مێژووی سەردەمی ئێران - تاران-١٣٦٨-ھ ل /١٥٣ .

١٩٣٧/٧/١٧ کۆمیتـەی ناوەنـدی بەڕێوەبەرایـەتی و شـوورای وەزیرانـی یەکیـەتی سـۆڤیەت بڕیـاری ژمـارە/١٠٣/١٢٧/٢٦٧ یـان سـەبارەت بەدروسـتکردنی پـشتێنەی ئاسایش- پاراستن - دەرکرد، کە بووە هـۆی گوواستنەوەی زیاتر لـە ١٣٢٥ هـاوولاتی کـورد لـە ناوچـە سـەر سـنوورەکانی ئەرمەنـستان و ئازربایجانـەوە ، ئەویش بۆ قوولایی وولاتی سۆڤیەت ، کە٨١٢ یان بۆ کرکیزستان و ٥١٣ یان بۆ کازاخستان بوو، ئەمە بەپێی بڕیاری بەڕێوەبەرایـەتی چوارەمی وەزارەتـی پارێزگـاری یەکیـەتی سـۆڤیەت و بـەئیمزاری - کوروچـکین- ی سـەرۆکی ئـەم بەڕێوەبەرایەتیە بوو لە ناوچەکەدا .

١٩٣٧/٧/١٨ دوای مـۆرکردنی پـەیمانی سـەعدئاباد ، مـۆرکردنی رێکەووتننامـەی دووقـۆڵیٚ دۆستایەتی و هاوکاری لە نێوان رژێمـی شانـشینی لـە ئێراق و شاهەنشاهی لـە ئێران ، ئـەویش بـەپێی پـەیمانی سـەعد ئاباد مۆرکرد ، بەلێدان و گـەمارۆدانی بزووتنەوەی رزگاریخوازی کورد لە رۆژهەلات و باشووری کوردستانی لکێنـراو بە وولاتەکانیان.

١٩٣٧/٧/٢٠ کۆچی دوایی داهێنانی رادیۆو زانای ئیتالی مارکۆنی سالیۆ لـە شـاری رۆمـایٚ پایتەختی ئیتالی لەخانەوادەیەکی دەوولەمەند. شایانی باسـە ئـەم زانایـە لـە سـالی ١٨٧٤ لـە شـاری پۆلۆنیـای ئیتالیـا لـەدایك بـووە... مـارکۆنی تـوانی ئامێرێکی تایبـەت دابهێنێ و دوایـی چـووە ئینگلتـەراو ئامێرەکـەی پێـشانداو لەویٚ تۆماری کردوو کۆمپانیایەکی دامەزراند.
مارکۆنی یەکـەم کـەس بـوو ئیشارەتەکانی تیشکی لـە سـەر مـادە جیاوازەکـان

بەسـەرکەوتوویی هـەناردو وەرگـرت... سـاڵی ۱۹۰۱ لـە میـانی ئەتلەسـیەوە ئیـشارەتەکانی هـەنارد... کـە رۆژێکـی مـەزن بـوو لـە مێـژووی پەیوەندیـە بێتەلەکان و ئەو کەشتیە جەنگیانەی کە بە دەست گرفت و تەنگ و چەلەمەوە دەیانالاند. توانیایان بەخێرای داوای یارمەتی بکەن لەدوا ساڵەکانی ژیانیدا بە بەکارهێنانی شەپۆلە کورت و یەك جار کورتەکان پەرە پێبدات و ئەمرۆش رادیۆ بۆتە یەکێك لە دەزگا راگەیاندنکان لە هەموو بوارە جیاکان لە جیهاندا.

١٩٣٧/٨/٦ کۆچی دوایی گۆرانی بێژو هونەرمەندی ناوداری کورد سەید عەلی ئەسغەری کوردستانی لە رۆژهەڵاتی کوردستان.

١٩٣٧/٨/٢٦ مۆرکردنی پەیمانی عەرەبی بەناوی- برایەتی عەرەب- لە نێوان شانشینی سعوودیەو شانشینی ئێراق و شانشینی یەمەن .
کە لە سێ خال پێك هاتبوو، لە پێناو بەهێز کردنی پەیووەندنی رامیاری و بەرگری و ئابووری و بازرگانی و نەتەوەیی و نیشتمانی و چەندین لایەنی دیکە لە نێوانیاندا .

١٩٣٧/٩/٥ لە سەرداوای رژێمی تورك رابەری شۆرشی دەرسیم لە باکووری کوردستان سەید رەزا بۆ گفتووگۆ کردن دچێتە شاری ئەرزەرۆم و لەوێ بەرپرسانی سەربازی بە فەرمانی بەر پرسانی رژێمی تورك بەفێڵ دەستبەسەری دەکەن شارەکەدا .

١٩٣٧/٩/١١ بڵاوکردنەوەی یەکەم ژمارەی رۆژنامەی - ژیان- لە شاری سلێمانی لە باشووری کوردستان ، لەلایەن مامۆستا سالح قەفتان کە سەرۆك نووسەری رۆژنامەکە بوو لە شارەکەدا .

١٩٣٧/٩/١٢ بڵاو کردنەوەی یەکەم ژمارەی رۆژنامەی - زبان- لەلایەن شارەوانی شاری سلێمانی لە باشووری کوردستاندا.

١٩٣٧/٩/٢٩ مۆرکردنی پەیمانی میونخ ، لە نێوان ئەڵمانیای نازی و شانشینی بەریتانیا و فەرەنسا و ئیتالیا ، ئەمەش بەهۆی بەرەو لێك ترازانی بارودۆخی پەیووەندی نێوودەووڵەتی بوو ، بە تایبەتی بە دەست پێشخەری هتلەری نازی .
لە پێناو گەیاندن بەئامانجەکانی خۆی لە فراوانکردنی دەسەڵات و سنووری ئەڵمانیا لەسەر جیهان.

١٩٣٧/١١/٩ لە ئەنجامی خۆپیشاندانی رێکخراوی نازیەکانی ئەلمانیا لە دژی جوولەکەکان

بوو بە هۆی کووژرانی زیاتر لە ٧٤ جوولەکە و دەستگیرکردنی زیاتر لە ٢٠٠٠٠ هەزار جوولەکە و رووخاندنی زیاتر لە ٨٥٠ دووکان و ١٧١ خانووو سووتاندنی ١٩١ کەنیسەی جوولەکەکان لە ئەلمانیا. ڕێژەی زیانەکانی ئەم کارە بە ٥٢ ملیۆن مارکی ئەلمانی مەزەندە کرا. کە تەنیا زیانی شیشە شکاوەکان بە ٥ ملیۆن مارك مەزەندە کرا.

هەروا شەوی شوشەیی رایخ بە بیانووی کووژرانی – ئەرنێست فۆم راس – ی سکرتێری سێیەمی بالوێزی ئەلمانیا بوو لە شاری پاریسی پایتەختی فەرەنسا لە لایەن ئاوارە جوولەکەکان، کە لە راستیدا بە تەمای کووشتنی بالوێزی ئەلمانیا لە فەرەنسا بوو، کە ئەم کارە روویدا.

١٩٣٧/١١/١٢ کۆچی دوایی شاعیری ناوداری کورد– ئەحمەد حەمدی ساحێبکەران– لە شاری سلێمانی لە باشووری کوردستان ، گۆڕەکەی لە گۆڕستانی گردی سەیوانە ... شایانی باسە ئەو شاعیرە لە ساڵی ١٨٧٦ لە بنەماڵەی ناوداری ساحێبکەران لە شاری سلێمانی لەچاوی بە جیهان هەڵهێناوە ...خووێندنی ئایینی تەواوکردوەو دوای ئەوە چووەتە قوتابخانە ، دوای ئەوە پەیووەندی بە بزووتنەوەی ڕزگاریخوازەکەی شێخ مەحمود حەفید دەکات . لەخەبات و شیعر بەیەکەوە بەردەوام دەبێت و ڕۆڵی کاریگەری دەبێت لە ڕۆشنبیر کردنی گەلی کوردستان تا کۆچی دوایی دەکات لە هەرێمەکەدا .

١٩٣٧/١١/١٩ لە دوای لە سێدارەدانی سەید رەزاو هەڤاڵەکانی لەلایەن رژێمی تورکیا پرسەیان لە مزگەووتی کوردەکانی دانیشتووانی شاری دیمەشقی پایتەختی سووریا دانا ، سەرەرای نارەزایی رژێمی سووریا... لە بەر ئەوەی جیاوازی لە نێوان وولاتانی داگیر کەری کوردستان بەردەوامە تەنیا لە سەر کێشەی کورد نەبێت کە هیچ لایەنێك جیاوازیان لە نێواندا نیە بەرامبەر بەکوردو خاکی کوردستان ، بە تایبەتی لەلایەنی نەتەوەیی و نیشتمانیدا.

١٩٣٧/١٢/٣ بەپێی فەرمانی بەڕێوەبەرایەتی پاراستن– kgb – سەر بە وەزارەتی ناوەخۆی یەکیەتی سۆڤیەت کە ١٤١ خێزانی کورد لە دانیشتووی ناوچەکانی سەرسنووری ئازەربایجان بەقافڵەی واگۆی شەمەندەفەر بۆ کازاخستان گوازرانەوە... شایانی باسە ئەم بنەماڵانە لە کورد وەك کەسانی دژ بەشۆڕش تاوانبارکرابوون.

## ١٩٣٨

١٩٣٨/٢/٢٥ بڵاو کردنەوەی یەکەم ژمارەی گۆڤاری- زانستی- لە باشووری کوردستان لەلایەن مامۆستا سالح قەفتان لەشاری سلێمانی لە شارەکەدا .

١٩٣٨/٣/٧ دەرچوونی چەند یاسایەك لەلایەن سەرۆکی دەسەڵاتی باڵای یەکیەتی سۆڤیەت و پارتی کۆمۆنیستی سۆڤیەت ستالین ، بەگۆڕینی بنەماکانی بنەڕەتی لە باری سوویا ، ئەویش بەدانانی سنووری ڕزگاری نەتەوەیی لەناو سوویا ، کە لەکاتی خۆی لەساڵی ١٩٢٤ ڕێکخرا بوو ، کە هەموو هاوڵاتیەك لەنێر لە یەکیەتی سۆڤیەت بەبێ جیاوازیو دووبەرەکی نەتەوەیی یاخوود ڕۆشنبیری دەبێ ملکەچ بێ بەرامبەر بە ئەرکی سەربازی بەیەکخستنی سوویا، بەهەڵووەشاندنەوەی یەکەی نەتەوەیی لە بەرژەوەندی یەکەکانی جۆراو جۆری ڕەگەزیدا ، لە ناو سنووری دەسەڵاتی یەکیەتی سۆڤیەتدا .

١٩٣٨/٣/٨ لە دایك بوونی نووسەر و ڕۆژنامە نووسی نیشتمانپەروەری کورد — ممتاز حەیدەر عاسم حەیدەری—ناسراو بە ممتاز حەیدەری، لە بنەماڵەیەکی شۆڕشگێری ناسراو لە هەرێمی باشووری کوردستان.

جێگــەی باســکردنە کــە مامۆستا ممتاز حەیدەری لە تەمەنی دیاربووی خۆی رووی لـــە قووتابخانـــە کردووە و تا پۆلی سێیەمی ناوەنــدی لــە خوێنــدن بــەردەوام بــووە، ئــەویش بەهۆی چالاکی رامیاری لە ١٩٦١/٥/١ بەنـــدکراوە و وازی لە خوێندن هێناوە، هــەروا لــە پــۆلی دووەمــی ناوەندی لــە ســالّی ١٩٦٠ پـــەیامنێری رۆژنامـــەی ئازادی بووە، دوای ئەوە لـە نێوان ساڵەکانی ١٩٦٢ تـا ١٩٦٤ بە نهێنی لـە شاری کەرکوك و لە شاخ لە دەزگاکانی راگەیاندنی پارتی کۆمەنیست لقی / هەرێمی کوردستان لە رۆژنامەی رێگای کوردستان کاری کردووە.

دوای ئـەوە لـە سـالّی ١٩٦٤ لـە شـاخـەوە بـەرەو شـاری بـەغـدا گـەراوەتـەوەو تـا سـالّی ١٩٦٦ لـە شـاری بـەغـدا بـە نـهێنی لـە دەزگـای چـاپـەمـەنی پارتـەکـە – رۆژنامـەی، طریـق الـشعب – کـاری کـردووە... هـەروا لـە سـەرەتای مـانگی ١٩٦٦/١٠/ چـۆتە مۆسـکۆی پایتـەختی سـۆڤیـەت و بـۆ مـاوەی دوو سـاڵ ماوەتـەوە، ئـەویش بـە خوێـنـدنی لـە پـەیمانگای زانستی کۆمەلاّیـەتی و بـە پلەی زۆرباشە لە خوێندن سەرکەووتنی بەدەست هێناوە.

دوای گـەرانـەوەی لـە یەکیـەتی سـۆڤیـەت یـەکـەم بابـەتی ئـەدەبی – کورتـە لێکۆڵینـەوە – لـە بارەی دلّداری شـاعیر لـە گۆڤـاری دەفتـەری کـوردەواری لـە مـانگی /١٩٧٠/٤ بلاّوکردۆتـەوە... هـەر دوای بلاّوکردنـەوەی ئـەم بابەتـە لـە وەرزی هاوینی ساڵی ١٩٧٠ بۆتە ئەندامی یەکیەتی نووسەرانی کورد.

هەروا دوای ئەوە لە ١٩٧٠/٦/١ تا مانگی /١٩٧٦/١٠ لە رۆژنامـەی هاوکاری کـاری کـردووە و بـە دەیـا بابـەتی هەمـەجۆری بلاّوکردۆتـەوە، بـە هـۆی ئـەم

بابەتانەو هەڵوویستی بوێرانەی کوردایەتی لەکاری رۆژنامەکە دوورخراوەتەوە.
دوای ئەوە لە ١٩٧٦/١١/١ لە رۆژنامەی ئێراق و پاشکۆ کوردیەکەی بە نووسەر کاری کردووەو تا ساڵی ١٩٧٩، دووبارە بەهۆی هەڵوویستی دوورخراوەتەوە، دوای ئەوە لە کۆتایی ساڵی ١٩٧٩ دەزگایەکی فۆتۆکۆپی وکتێبخانەیەك دەکاتەوە بەناوی کتێبخانەی حەیدەری لە شاری هەولێر لە باشووری کوردستان.
هەروا لە کۆنگرەی پێنجەمی یەکیەتی نووسەرانی کورد، وەکوو نووسەرێکی سەربەخۆ بە ئەندامی مەڵبەندی یەکیەتی نووسەرانی کورد هەڵدەبژێردرێ، و هەر دوای ئەوە بە سەرنووسەری گۆڤاری نووسەر کاردەکات تاکوو گۆڤارەکە لە دەرچوواندنی دادەخرێت... هەروا دوای راپەرینی بەهاری ١٩٩١ لە چەندین رۆژنامەو گۆڤار کاری کردووە، وەك کوردستانی نوێ و هەروا ئەندامی دەستەی دامەزرێنەری سەندیکای رۆژنامەنووسان بووە.
هەروا ئەم کەسایەتیە کورد پەروەرە خاوەن هەڵوویستە لە ماوەی ژیانی لە سەرەتای دەستکردنی بە کاری نووسین تا تەواوبوونی ئەم مێژوونامەیە بە دەیا بابەتی هەمەلایەنی لە هەموو بوارە جیاجیاکان لە رۆژنامەو گۆڤارەکان بڵاوکردۆتەوە، دوای ئەم کارانە چوار کتێبی بە چاپ گەیاندووە ئەویش :-
١- مەلای گەورە لە ساڵی ١٩٧٥... ٢- مستەفا شەوقی و گۆڤاری پایزە.
٣- داری ماوەران... ٤- کورد و حکوومەتی قاسم و شۆرشی ئەیلول.
٥- لە بارەی ژیانی سی و دوو گەورە پیاوانی کورد پاش کۆچ کردنیان لە کوردستان.
هەروا مامۆستا مومتاز حەیدەری لە هەولێکی بێ وێنەو لە بارودۆخێکی ناسك و بە توانایەکی دیاری کراوی دارایی و لە ماڵەکەی خۆی، توانی گۆڤاری k21 ژمارە یەکی لە بەهاری ٢٠٠٨ بە چاپ دەگەیەنێ و بڵاوی دەکاتەوە و تا ئێستا چوار ژمارەی لێ بڵاوکراوەتەوە ، کە گۆڤارێکی - کەلتووری، زانستی، مێژوویی، بەڵگەنامەیی، نەتەوەیی - وەرزی ئازادە...
مامۆستا مومتاز حەیدەری لە ژیانەو لەکارە پیرۆزەکانی بەردەوامە لە پێناو خزمەتکردنی کوردو کتێبخانەی کورد لە کوردستان، بە هیوای تەمەنێکی

درێژ بۆ ئەم مامۆستایە ماندوو نەناسەدا.

١٩٣٨/٥/٢٨ سەرەك وەزیرانی رژێمی تورك –جەلال بەیار – لە وتارێكیدا هەرەشەی كووشتنی جەماوەری گەلی كوردستان لە باكووری كوردستانی داگیر كراوی ژێر دەسەلاتی توركیا لەناوچەی دەرسیم دەكات لە هەرێمەكەدا .

١٩٣٨/٦/٣ پشكنێەری بەشی هەشتەمی دەزگای پاراستنی یەكیەتی سۆڤیەت– سیرگفت بایكۆف– بۆسەرۆكی بەشی ڕاگوێزراوەكانی كازاخستان –ئابیشێف– دەنووسێ و دەڵێ:–

قافلەی واگۆنی شەمەندەفەری ڕاگوێزراوەكان گەیشتە وێستگەی شەمەندەفەری –سیر، دارین–و دابەزێندران ، كە هەموویان كوردن و لە ١١٥ خێزان پێك هاتوون و بەسەر چوار كەلخۆزی پاختا ئارالدا دابەش كراون و دامەزراون و دادەمەزرێن... تادروست كردنی خانووبەرەی نوێ بەشێووەیەكی كاتی لەخانووبەرەی كەلخۆزەكان دامەزرێندراون ، ئەو ١١٥ بنەماڵەیە كە لەساڵی ١٩٣٧ بۆكازاخستان راگوێزرابوون لە سەر جێگەو شووێنی رەسەنی خۆیاندا .

١٩٣٨/٦/١٥ بڵاوكردنەوەی یەكەم ژمارەی – ئەسرا ، نیشتمان– لەلایەن یوسف مەلەكی لە شاری بەغدا بەزمانی عەرەبی و سریانی و ئینگلیزی و فەرەنسی ، كە لە دەرچوون بەردەوام بوو لە شاری بەغدا تاكوو رۆژی دەست بەسەرا گرتنی لە ١٩٤١/٩/١١ لە لایەن پیاوەكانی رژێمی شانشینی لە ئێراق.

١٩٣٨/٩/٢٠ مۆركردنی ڕێكەووتننامەی میونیخ لە نێوان – هتلەر و مۆسۆلینی، چەمبرلین و دالادیەدا – گرێدرا ، ئەم ڕێكەووتننامەیە هەموو ناوچەی ئەلمانە نیشینەكانی سوودێنی بە ئەلمانیا دەسپارد. دەووڵەتەكانی ئەورووپای رۆژئاوا بە گرێدانی ئەم ڕێكەووتننامەیەدا، لە راستیدا ملیان بۆ داواكاریە نا بەجێكانی ئەلمانیای هتلەری دانەواندو بە شێكی زۆر لە دانیشتووانی ئەم ناوچانە ئەلمانیەكانی چیكسلۆڤاكیا بوون، كە لە لایەن ئەلمانیا داگیركرابوون.

هەروا لە كۆنفرانسی میونیخ، كە بوو بە هۆی گرێدانی ئەم ڕێكەووتننامە،

نووێنـەری سـۆڤیەت و چیکسلۆڤاکیا بانگهێـشت نـەکرابوون. سـەرۆکی سۆڤیەت ستالین پێی وابوو کۆنفرانسی میونیخ و ڕێکەووتنی بەریتانیاو فەرەنسا لە گەڵ ئەلمانیادا دەبێتە هۆی ئەوەی کە هتلەر هێرش بکاتە سەر ئەورووپای ڕۆژهەڵات و لە داگیرکردنی ئەورووپای ڕۆژئاوا خۆلابدا.

١٩٣٨/١٠/١٤ وەزارەتی دەرەوەی ئەمەریکا لە ڕاگەیاندنێکیدا بڵاویکردەوە ئەویش بەناوی ئـەوەی کـە هـەموو سـەرکردەکانی ئەمـەریکا بەسـەرۆکی ئەمەریکاشـەوە – ویلـسن– ، گرنگـی بـە هێـزی دامەزرانـدنی دەووڵـەتی یـەهوودی دەدات ، لەفەلەسـتین دژی بـیروو چـوونی بەرپرسـانی بـەریتانیا ، لـە ڕۆژهـەڵاتی ناوەڕاست بەتایبەتی لەو هەرێمەدا.

١٩٣٨/١١/١٠ دامەزرێنەری ڕژێمی کۆماری تورکو پێك هێنانی زمانوداب و نەریتی تورك مستەفا کەمال ئەتاتورك کۆچی دوایی کرد ، کە دووژمنی گەلانی تورکیای دورستکراو بەپێی پەیمانی لۆزانی ١٩٢٣/٧/٢٤ بەتایبەتی گەلی کوردو کوردستانو ئەرمەن بووە... کە زیاتر لە ملیۆنو نیوێکی لە ئەرمەن لەناو برد لەساڵی ١٩١٥ لەباکووری کوردستانله هەرێمەکەدا .

شایانی باسە کە پێکهاتەی نەتەوەی تورك لەگەڵانی هەژاری دەربەدەری جەنگەکانی ئیمپراتۆریەتە یەك لەدوای یەکەکانی ڕۆمانیو مەگۆلیو عوسمانی و فارسو ڕووسی بووە،... لە بەر ئەوەی لە دوای دامەزراندنی دەووڵەتی تورك مستەفا کەمال هەوڵ دیاریکرنی زمانی تورکی داوە ، کە لە ٧٥٪ زمانەکانی دیکەی نەتەوە جیاجیاکانە لە وڵاتەکەیدا.،

بەتایبەتی زمانی کوردیو هەتا دابو نەریتو مێژووی گەلانی دیکەی دزیـووەو نەتـەوەی تـورکی لێ پێـك هێنـاوە... کـە ئەمـەش مێـژوو و شارستانیەتو شووێنەوارەکانو ئاینەکان لەکوردستان و هەرێمە دراوسێکان شایەتن لەسەر ئەو ڕاستیانەدا ، لە کێشووەرەکەدا .

١٩٣٨/١١/١٠ کۆچی دوایی دامەزرێنەری کۆماری تورکیا – مستەفا کەمال – ناسراو بە مستەفا کەمال ئەتاتورك – واتە باوکی تۆرانیکان. لە شاری ئەستمبۆڵی تورکیا. بۆ ڕۆژی دوایی کۆمەڵەی نیشتیمانی تورکیا – پەرلەمان –

کۆبونــەوەی نائاســایی خــۆی گرێدا و بریاریدا بە هەلبـژاردنی – عــسمەت ئــەینوونوو– بــە سەرەك کۆماری تورکیاو هـەروا بــە ســەرۆکی پـــــارتی گــەلی کۆماری تورکیا.
جێگــەی باســکردنە کــە ئــەم پارتـــەش مـــستەفا کـــەمال ئەتاتورك دایمەزراندبوو،، کە بە تاکە پـارت ناوزەنـد کرابـوو، لـە تورکیا کە ئەو پارتە کاروبـاری دەوڵەت و گەلی دەبرد بەرێووە لە تورکیا.

سەرچاوە:– موقف التار الاسلامی والتیار العلمانی فی ترکیا من القضیة الکردیة. د/وەلید رەمەزان، چاپی یەکەم /٢٠٠٨.

## ١٩٣٩

١٩٣٩/١/٩ هێزەکـانی سـووپای ئیتالیـا رژێمـی شـانشینی لیبیـای داگـیر کـردو وولاتـی لیبیـای بەتـەواوەتی خـستە ژێـر دەسـەلاتی خـۆی ، لـە دوای لـە نـاو بردنـی جوولانەوەی شۆرشگێری لیبیا بەسەرکردایەتی کەسایەتی ناوداری عـەرەب و جیهان عومەر موختار لەوولاتەکەدا.

١٩٣٩/١/٢٦ بڵاوکردنـەوەی یەکـەم ژمـارەی رۆژنامـەی ژیـن لەلایـەن نووسـەروشـاعیری گەورەی کورد – پیرەمێرد لە شاری سلێمانی لە باشووری کوردستان .

١٩٣٩/١/٢٨ بۆیەکەم جار لە مێژووی وولاتی نێوان دووزێو ئێراقی دورستکراوو لـە سـەر خـاکی کـورد بەشـی وێـستگەی رادیـۆی کـوردی لـە بەغـدا پەخـشی خـۆی بەگەلانی ئێراق بەتایبەتی گەلی کورد بڵاوکردەوە بە سەر گەلانی ناوچەکەدا .

١٩٣٩/٤/٣ كووشتنی شانشینی ئێراق شانشین غازی ، ئەمیر فەیسەڵی دووەم جێگەی گرتەوە بەشانشینی ئێراق... شایانی باسە شانشین غازیو بنەماڵەكەی لە دایك بووی وولاتی سعوودیەن نەك ئێراق ، بەڵكوو بەزۆركرا بەشانشین لە سەر ئێراق بەپێی خواستەكانی بەریتانیاو ئەمەریكاو عەرەبو دور لە خواستەكانی گەلی كوردستان.

جێگەی روونكردنەوەیە كە شا غازی لە ١٩١٢/١٢/٢١ لە شاری مەككەی وولاتی سعوودیە لە دایك بووە ، لە سەردەمی منداڵیدا لە ژێر سەرپەرشتی باپیری – شەرف حوسێن عەلی –ژیانی بەسەر بردووە ، هەروا لە ١٩٢٤/١٠/٥ شا غازی هاتۆتە ئێراق و دوای دەرچوونی دەستووری بنەرەتی ئێراق غازی بووە بەجێنشینی شا فەیسەڵی باوكی و گرنگی پێدراوە بۆ گرتنە دەستی دەسەڵات ، شا غازی بە پەروەردەیەكی عەرەبی شۆڤینی پەروەردە كراوەو ماmۆستای تایبەتی بۆ هەلبژێردراوە.

دوای ئەوە شا غازی لە ساڵی ١٩٢٦ نێردراوە بۆ تەواو كردنی خووێندن لە خووێندنگەی – هارو – لە بەریتانیا و لە ١٩٢٨/١٠/١٠ دا گەراوەتەوە ئێراق ، دوای ئەوە چۆتە كۆلیژی سەربازی و ئەو خووێندنەی كاریگەریەكی زۆری هەبووە لە سەر پێگەیشتنی كەسایەتی و دامەزراندنی پەیووەندی كۆمەڵایەتی لە گەڵ هاورێكانیدا ، لە مانگی ١٩٣٢/٧دا پلەی مولازمی پێدراوە ، باوكی لە كاتی سەردانی بۆ ناوچە جیاجیاكانی ئێراق لە گەڵ خۆیدا دەیبرد لە پێناو شارەزابووندا.

شـا غـازی دوو جـار دەسـەڵاتی لـە ئێـراق گرتۆتـە دەسـت لـە کـاتی ئامـادە نـەبوونی باوکیـدا ، جـاری یەکـەم :- لـە ٦/٥ ت ١٩٣٣/٨/٣٠ و جـاری دووەم :- لـە ١٩٣٣/٩/١١ دا ، هـەروا ئـەو بنەماڵەیـە بەر لـە بوونیان بـە شـا لـە سـەر ئێراقی بە زۆر دروستکراو لە ١٩٢١/٨/٢٣ خاکی ئێستای ئێراقیان نـە دیبـوو ، کـە هـەر هـەموویان لـە دایـك بـووی شـاری مککـەو حیجـازی سـعوودین لـە دوورگەی بیابانی عەرەبیدا ...!.

تێبینی:- تاریخ العراق المعاصر-ئیبراهیم خەلیل ئەحمەد -جەعفەر عەباس حمێدی.

١٩٣٩/٥/١٩ نووسـەری بـەناوبانگی ئینگلیـزی - تۆمـاس ئیـدوارد لۆرانـسا - کـاتێ کـە سواری مۆتۆسیکل دەبێ لە گەڵ دوو هـاورێی دیکـەی دا بەریکـەك دەکـەون و بەم هۆکارە زامدار دەبێ و ماوەی شەش رۆژ لە هۆش خۆی دەچـێ تـا کۆچـی دوایی دەکات... لەکاتی رێوو رەسمی بەخاك سپاردنی تەرمەکـەی نووسـەری گـەورە - تۆمـاس هـاردی - ئامـادە بـووە هـەروا رامیـاری کـاری مـەزنی بـەریتانیا - وینـستۆن چـەرجل - کـە نـەیتوانی لـە ناشـتنی تەرمەکـەی ئامادەبێت زۆر بۆ تۆماس گریاوە.

جێگەی باسکردنە کە سەرکێش و نووسەری بەریتانی لۆرانسا ناوزەنـد بـوو بەناوی - تی ئی لۆرانس - یاخوود - تۆماسـی عـەرەب - دانـەری کتێبـی - حەوت ئەستوندەی دانایی - واتە - أعمدة الحکم السبعة - لە جەنگ کردنـی دژی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی و لایەنگیری عەرەب بووە.

لەوکاتەشـدا زێـدە رۆیـی کـردووە سـەرەرای ئـەمـەش عەرەبـەکان تۆمـەتباریان کرد، هەروا تورك و ئینگلیزەکان هەمان هەڵوویستیان بەرامبەر هەبووە، بـەڵام خوودی لۆرانس لەباری تەنگەژەو کێشمەکێشی دەروونیدا بـوو، کـە تووشـی پـشێوویەکی دەرونـی سـەخت بـوو، لـەو کاتەشـدا نـاوازەیی سێکـسی و حـەز کردن لە پاڵەوانیەتی و خۆ کووشتن.

لە هەمان کات فرۆکەوان بوو، بەڵام ناچار بوو ناونیشان و نیشتەجێی بوون و شـێووازی ژیـانی چـەندان جـار بگۆرێـت، ئـەم رەفتارانـە هـیچ هۆکـارێکی دیاری نەبوو، لە پەنجاکانی سەدەی بیستەمدا - گەنجە تورکەکان - کردیانـە نموونەیەکی بەرزی مرۆڤایـەتی، کـە پابەنـد نـەبێ و لایـەنگیری هـیچ نـەکات و

کردنیانە وێنەیەکی بونگەرایی نوێ – الوجودیە الحدیپە – واتە نموونەی کەسێکی سەرکێش و خودان رایەکی یاخی بوو کە دەیەوێ خوودی خۆی بسەلمێنێ لە هەموو جیهان.

دەسەڵاتی عوسمانی لە ساڵی ١٩١٧ لۆرانسیان دەستگیرکردو بەسەختی – شاژنگ – جەلدەیان کرد، بەڵام خۆی رسوا کرد کاتێ دانی بەوە دانا کە لە کاتی ئەم ئەشکەنجەدانە مەزنترین جێژی سێکسی بینیوە... دوای ئەوە پرسیار ئەوەیە چۆن مردووە.

١٩٣٩/٥/٢٨ لە ئەنجامی شەڕی دژواری ناوخۆی پێکهاتەو پارتە رامیاری و نەتەوەیی و راسترەو چەپرەوەکانی ئەسپانیا ، فرانکۆ دەسەڵاتی گرتە دەست کە بووە هۆی گیان لە دەست دانی زیاتر لەیەك ملیۆن مرۆڤ لە وولاتەکەدا ، ئەویش بە کۆتایی هاتنی شەڕی ناوخۆ بە بەزاندنی کۆماریەکان لە ئەسپانیادا.

١٩٣٩/٦/٣ شانشینی رژێمی ئێراق شانشین غازی لەلایەن بەرهەڵستکارانی کوژرا ... شایانی باسە بنەماڵەی شانشین فەیسەلی یەکەم و ئەوانی دیکە بەرەسەن خەلکی شاری نەجدی سعوودیەن و لەدایك بووی سعوودیەن و نەوەی شەریف حوسێنن... کە لەلایەن بنەماڵەی ئالسعوود دەرکرابوون ، ئەویش لە ئەنجامی دەبەنگی ئەو بنەماڵە خۆپەرستە ، دوای ئەوە بەهۆی پەیوەندی لە نێوان بەریتانیاو هاوپەیمانان لەگەڵ کاربەدەستە بنەماڵە عەشائرەکانی سعوودیە، ئەم کارەش وەك پاداشتێك هێنانیانە سەر ئێراق و دەسەڵاتی ئێراقیان گرتە دەست تاکوو شۆرشی چواردەی تەموزی ساڵی ١٩٥٨ لە ئێراق و ناوچەکەدا .

١٩٣٩/٦/٢٣ هەرێمی پارێزگای ئەسکەندەرۆنەی باکووری کوردستان لەو مێژووەوە کەووتە ژێر دەسەڵاتی تورکیا .

کە پێشتر لەژێر دەسەڵاتی سووریادا بوو ، کە ناوزەند بوو بەسنجەقی ئەسکەندەرۆنە یاخوود– هاتای– کە کێشەی زۆری لە نێوان هەردوو رژێمی سووریاو تورکیا دورست کردیە تاکوو ئێستا .

کە پێشتر لە نێوان فەرەنساو تورکیاو دوای ئەویش لەنێوان سووریاو تورکیا، بەڵام لە راستیدا ئەوە هەرێمی باکووری رۆژئاوای هەرێمێکی

کوردستـانیەو وەك کوردسـتان داگیر کـراوەو بۆتـە وەرەقـەی ململانێی نێوان ڕژێمی سووریاو تورکیا لە ناوچەکەدا .

١٩٣٩/٦/١٧ نوێنـەری شانشینی سعوودیە چاوپێکەووتنی لەگـەڵ ڕاوێـژکاری ئـەڵمانیا هتلـەر ئەنجامـدا ... ئـەویش بـە گۆڕێنـەوەی بیروو بۆچـوون کـە ئـەڵمانیاو عـەرەب دووژمنـی هاوبەشیان هەیـە و حکوومـەتی هتلـەر قـەرزی بـە شـانینی سـعوودیە دا ، ئـەویش بـەبری ٦ ملیـار مـارك و کرینـی چـەك لەئـەڵمانیا ، ئـەلمانیاش ٤٠٠٠ هـەزار پارچـە چـەکی وەك پاداشـت دا بـە بنەماڵـەی ئالسعوود لەسعوودیەدا.

١٩٣٩/٨/٣ کـەلوو پەلـەکانی مۆزەخانـەی بـرادۆ لـە شـاری مەدریـدی پایتـەختی ئەسـپانیا ، بەهۆی بارودۆخی ئەسپانیاو جیهانو شەڕی دووەمی جیهانی گواستراوە شاری ڤالینـسین ، دوای ئـەوە گواسـترایەوە بـۆ شـاری کـەتالۆنیا ، دوای ئـەویش گواســترایەوە بــۆ شــاری ژنێــف و کەوتــە ژێــر چــاودێری نەتــەوە یـەکگرتووەکان...بـەڵام دوای کۆتـایی هـاتنی جـەنگ و ئاسـایی بوونـەوەی بـارودۆخی جیهـان ، کەلوپەلـەکان گەڕادرایـەوە شـاری مەدریـدی پایتـەختی ئەسپانیا.

١٩٣٩/٨/٧ نووێنــەری ئــەڵمانیای نــازی – گــرونگ- لەگــەل نووێنــەری بــەریتانیا هـەردووکیان ئـەوەیان ئاشـکرا کـرد ، کـە دوو ڕۆژهـەلاتی ناوەنـدی ناوچـەی ئـابووری سروشـتی ئەڵمانیـەو،... لەهـەمان کـات ترسـی دوا ڕۆژی فـراوان بـوونی دەسـەڵاتی کۆمۆنیـستەکانی خـستە بـەر ڕامیاریـەتیو گـەمارۆدانو ماوەنـەدان بـە پەرەسـەندنو گەشـەکردنی بـەبیری مارکـسی – لینینـی لـە ئەورووپای ڕۆژئاوا دا.

٢٣ آب ١٩٣٩: مولوتوف (MOLOTOV) يوقّع في الكرملين معاهدة عدم الاعتداء بين الاتحاد السوفياتي والمانيا وبدا وراءه فون ريبنتروب (VON RIBBENTROP) وستالين (STALINE) وموسلوف (MOLSLOV) وما لم يعلن عنه هو وجود بروتوكول سرّي حول تقسيم بولونيا.

الأول من أيلول: البارجة وسفينة التدريب الألمانية شلزفيك هولشتاين (SCHLESWIG-HOLSTEIN) في مرفأ دانتزيغ (DANTZIG) تفتح النار على تحصينات (WESTERPLATTE) حيث توجد الترسانة البحرية البولونية الضعيفة.

١٩٣٩/٩/١

هەڵگیرسانی جەنگی دووەمی جیهان ، کە هێزەکانی سووپای هتلەری نازی لە هێرشێکی بەرفراوانی گەورەدا وولاتی پۆلەندای داگیر کرد بەشێوەیەکی درندانە ، بە چاندنی تۆوی تۆقاندنی گەلانی وولاتانی شەڕکەری داگیر کردنی بەنۆبە بۆ ئەوەی ببێتە بەرەیەکی بەرگری کردن لەرژێمی هتلەرو

وەستانی دژی سۆڤیەت لەلایەك‌و بووە هۆی خێراكردن لەبەرپابوونی جەنگی دووەمی جیهان لە نێوان ئەڵمانیا .
ئەویش لەگەڵ ئیتالیاو یابان‌وولآتانی تەوەر، ئەمە لەلایەك‌و لەلایەكی دیكە لەنێوان بەریتانیاو وولآتانی كۆمەنوولس... و فەرەنساو ئەمەریكاو یەكیەتی سۆڤیەت‌و چین‌و، هاوپەیمانان لەلایەكی دیكە . لەهەمان كات بەریتانیاو فەرەنسا شەڕیان دژی ئەلمانیا راگەیاند لە دوای داگیر كردنی پۆڵەندا لەلایەن ئەلمانیادا.

هتلر يعلن في الرايخستاغ (REICHSTAG) (الأول من أيلول ١٩٣٩) دخول قواته إلى بولونيا .

١٩٣٩/٩/٢ دوای هەڵگیرسانی جەنگی دووەمی جیهان ، لە نێوان ئەڵمانیای نازی بەسەركردایەتی هتلەرو هاوپەیمانان‌و... دوای ئەوە یەكیەتی سۆڤیەت بەسەركردایەتی ستالین‌و ئەنجامەكەی بووە هۆی تێك شكانی سوپاو دەسەلآتی ئەڵمانیاو دابەش بوونی بە دوو دەوڵەتی دژ بە یەكتری بە ئەڵمانیای كۆمۆنیستی رۆژهەلآت‌و ئەڵمانیای سەرمایەداری رۆژئاوا لە كێشوەرەكەدا.

١٩٣٩/٩/٣ بەرپابوونی جەنگی دووەمی جیهان ، یەکەم لەلایەن ئەلمانیاو ئیتالیاو یابان لەگەڵ بەریتانیاو وولاتانی کۆمەنوولس ، فرەنساو هاوپەیمانانو، لە دوای ئەوانیش ئەمەریکاو یەکیەتی سۆڤیەت چوونە ناو ریزەکانی شەڕکەران بەپێی خواستو بارودۆخەکە لەناوچەو هەرێمو بە وێرانکردنی ژێرخانی ئابووری لە جیهاندا.

١٩٣٩/٩/١٣ هێزەکانی سوپای سووری سۆڤیەت بەسەرکردایەتی ستالین توانی پەلاماری هێزەکانی ئەلمانیای نازی بدات بەسەرکردایەتی هتلەرو بە رزگار کردنی پۆلەندا ، دوای ئەوە یەکیەتی سۆڤیەتو ئەلمانیا رێکەووتن ، لە سەر ئەوەی کە پۆلەندا لە نێوان خۆیان دابەش بکەن .

بەڵام دوای ماوەیەك ئەلمانیا توانی پۆلەندا بەتەواوی داگیر بکاتەوەو دوای ئەوە هێزکاکنی سوپای سۆڤیەت توانی لەساڵی ١٩٤٥ پۆلەندا رزگار بکات بەپێی رێنماییەکانی کۆنگرەی پۆتسدامی مانگی /٧ ی هەمان ساڵ لە کێشووەرەکەدا .

١٩٣٩/١٠/١٧ لەو کاتە وەزیری جەنگی بەریتانیا چرچل بوو، چاوپێکەووتنی نهێنی لەگەڵ حایم وایزمان کرد ، بەپشتگیری لیدوانی وایزمانو ووتی:- لە فەلەستین دەوولەتێکی یەهوودی دادەمەزرێنین بە نیشتەجێکردنی ٣ تا ٤ ملیۆن یەهوودی دوای تەواو بوونی جەنگی دووەمی جیهان لە ناوچەکەدا.

١٩٣٩/١١/١٨ سەید رەزاو هەڤاڵەکانی لە دوای دادگایی کردنیان بە پێی خواستو ویستی تورکەکان لەپارێزگای دەرسیمی باکووری کوردستان لەسێدارە دران لەلایەن رژێمی تورك لە هەرێمەکەدا.

١٩٣٩/١١/١٩ کردنەوەی ڕادیۆی لاسلکی ئێراقی کوردی لە شاری بەغدا ، کە لە ژێر پرۆگرامی وێستگەکانی عەرەب بڵاو دەکراوە لەسەر هەمان شەپۆلی کارکردن کە بڵاو کراوەی دەنگوباس بڵاو دەکردەوە یەك جار لەڕۆژێکدا لەگەڵ دوو گۆرانی کوردی . کەچەند سالێك بەم جۆرە بەردەوام بوو لە وولاتەکەدا .

١٩٣٩/١١/٣٠ شەڕ لە نێوان فیلەنداو یەکیەتی سۆڤیەت بەرپا بوو، کە فرۆکەکانی جەنگی سوپای سۆڤیەت شارەکانی هلسنکیو هانکۆو وولاتی بۆردومان کرد، ئەمەش لە ئەنجامی دەست درێژی سەرکردایەتی سۆڤیەت لەسەر سنووری نێوانیان ، کە سۆڤیەتی لە فیلەندە دەکردو سنووری دەریاکانی بەکرێ بدات بۆ بەرگری لەخۆ کردن تا کاتی هەڵگیرسانی جەنگ لەگەل ئەلمانیا.

۱۹۳۹/۱۲/۱ بڵاو کردنەوەی یەکەم ژمارەی گۆڤاری – گەلاوێژ – لە شاری سلێمانی لە باشووری کورستان.

۱۹۳۹/۱۲/۲۹ مامۆستای گۆرانی بێژی نەتەوەیی ونیشتیمانی و کەلتووری کوردی لە هەرێمی باشووری کورستان ، مامۆستا – عەلی مەردان – کە یەکەم مەقامی بەشێووە زمانی باجەلانی لە وێستگەی رادیۆی بەشی کوردی لە شاری بەغدا تۆمار کرد . کە کاردانەوەی باشی کردە سەر هونەری کوردی لە کوردستان .

## ١٩٤٠

١٩٤٠/٢/١٥ راوێژکاری بەریتانیا لە وەزارەتی دەرەوەی ڕژێمی شانشینی لە ئێراق- ئەدمۆندس- نووسراوەیەکی بەناونیشانی - ڕووسیاو کورد- بلاوکردەوەو مەترسی دوا ڕۆژی پەیووەندی لە نێوان کوردو ڕووسیای تیا دەرخست، ئەویش بەگەڕانەوەیان بۆ رامیاریەتیەکانی سالانی ١٩٢٠ی دوای جەنگی یەکەمی جیهان.

١٩٤٠/٣/١٦ کۆچی دوایی نووسەرو ئەدیبی سوویدی خاتوو - سلما ئۆتیلیا لۆڤیسیا لاگێرلۆڤ - کە یەکەم ئافرەتی سوویدی بووە کە خەلاتی نۆبلی لە ئاداب پێ ببەخشرێت لە وولاتەکەیدا.
جێگەی ئامارە پێکردنە کە خاتوو سلما لاگێرلۆڤ لە ١٨٥٨/١١/٢٠ لە وولاتەکەیدا چاوی بە جیهان هەلهێناوە. هەروا خاتوو لاگێرلۆڤ کۆمەلێك لە چیرۆك و نەزیلە، واتە کورتە چیرۆك و گەشتنامە و ژیاننامەو شانۆنامەو بابەتی هەمە جۆری نووسیووە، هەروا لە نووسینەکانی بە بەردەوامی دەیگووت هەر مرۆڤێك بەرامبەر بەو کارانەی کە دەیکات خۆی لێی بەرپرسیارە. لە ئاینی توندو بێبە زەیی دەکرد و بانگەشەی بۆ نەرم و نیانی و ئاینی دەکرد لە هەموو هەلوویستەکانیدا.
هەروا لە سەردەمی سلما لاگیلۆڤدا شێوازی نووسین - ناتورالیستی - واتە سرووشتیخوازانە، هەروا سلما بە نووسینەوەی زنجیرە چیرۆکی خەیالاوی - ئەفسانەی گۆتاڤ - و وردە وردەی ناوبانگی دەرکرد. کە باسی لە قەشەیەکی لادراو - گۆستاڤ برلینگ - ناو دەکرد، کە بالاپۆشی قەشە گەر

بیانی لێووەدەر گرتبوو. ئەم کتێبەش لە ساڵی ١٨٩١ بە چاپگەیەندرا.
هــەروا یــەکێك لــە نـاودارترین کتێبــەکانی سـلما چـیرۆکی – بەســەرهاتی هەژنــدەی نـێلس – بـوو کـە لـە ریـزی ویـژەی کلاسـیکی منداڵانـدا هـەژمار دەکرێـت. هـەروا سـلما لـە تەمـەنی ٢٦ سـالیدا بـوو. لـەو کاتەشـدا بـاوکی تووشـی نەخۆشـیەکی کووشـندەهات و هەرچـەند زەوی هـەبوو فرۆشـتنی لـە پێناو خەرجکردنی لە نەخۆشیەکەیدا.
کە ئەمەش بووە هۆی ئەوەی کە سلما زۆربەی زۆری چیرۆکەکانی باسـی لـەو کارەی باوکی و لە دەست دانی زەویـەکانی بوو. دوای ئـەوە سـلما لـە سـاڵی ١٩٠٩ خەڵاتی نۆبلی پێ بەخشرا، بە پارەی ئەو خەڵاتە توانی ئەوەی باوکی لە دەستی دابوو بیگیرێتـەوە و تاکوو کۆتایی ژیانی هـەر لـەو ماڵـەدا ژیـانی بەسەر دەبرد لە وولاتەکەیدا.
بەرهەمەکانی ئەم خاتوونە رووناکبیرە زۆرن.. بەڵام لەو بەرهەمانەش کـە. ١– ئەفسانەی گۆستاڤ برلینگ لە ساڵی ١٨٩١... ٢– پەرچۆکانی ئەنتی گریست لە ساڵی ١٨٩٧... ٣– پەیوەندیەکانی نهێنی لە ساڵی ١٨٩٩ ... ٤– خانـەی پیرۆز لە ساڵی ١٩٠١ – ١٩٠٢ ... ٥– ئەفسانە گەلی مەسیح لە ساڵی ١٩٠٤. لە گەڵ چەندین دانراوی دیکەی ئەم خاتوونە لە ماوەی ژیانیدا.

١٩٤٠/٤/٩ هێزەکـانی سـووپای ئـەڵمانیای نـازی پـەلاماری شانـشینی دانیمـارکی داو داگیری کرد ... لە هەمان رۆژیش پەلاماری وولاتی نەرویژی داو داگیری کـرد لە کێشووەرەکەدا .

١٩٤٠/٥/١٣ کەسایەتی ناوداری بەریتانیاو جیهان – چرچل – بە سەرەك وەزیرانی بەریتانیا هەلبژێردراو پۆستی سەرەك وەزیرانی گرتە دەست ، بەو بۆنە چرچل رایگەیاند . کە تا لەژیاندا بێت بەرگری لە خاكو دەسەلاَت دەکات .

شایانی باسە کە بەریتانیا رۆڵی سەرەکی و بنەرەتی هەبووە لە داگیرکردن و بە تایبەتی لە دابەشکردنی گەلی کوردو کوردستان بەسەر چوار دەوولەت و نیووی دورستکراو بەپێی پەیمانی لۆزان ١٩٢٣/٧/٢٤ ، کە لە پەیمانەکانی سایکس – بیکۆو سیڤەر بەتایبەتی پەیمانی لۆزان ، کە رۆڵی سەرەکی لە دارشتنی نەخشەکانی دابەشکردنی ناوچەو هەرێم و جیهان هەبووە لە هەموو بوارەکاندا.

١٩٤٠/٦/٣ بلاَوکردنەوەی یەکەم ژمارەی رۆژنامەی – خورمال– لەلایەن مامۆستا شاکر فەتاح لە باشووری کوردستان .

١٩٤٠/٦/١٤ هێزەکانی سووپای ئەلمانیای فاشی فەرەنسای داگیر کردو حکوومەتی– بیتان–ی لایەنگیری خۆی لیّ دامەزراند.

١٩٤٠/٨/٢٠ لە مێژووی کۆمەلگا مرۆییەکان و بە تایبەتی لە دوای پێك هێنانی دەوولەت چەندین کردەوەو کاری تیرۆری رامیاری زۆری بەخۆوە دیووە ، کە ژمارەیەکی زۆر لە مرۆڤی لە گەلّ خۆیدا رەشکردۆتەوە ، لە سەر کردەو دەسەلاَتداری رامیاری و ئۆپۆزسیۆنەکان و بیرمەندان و توویژەرو تەنانەت زاناکانیش لە پیاوو ئافرەت و تیرۆرکردنی رامیاری دەچێتە چوارچێووەی ململانیّ و ناکۆکی رامیاریەوە و رەنگە رووی دیکەی – قوولکردن و تووندکردنەوەی – ناکۆکیەکە و گوواستنەوەی بۆ قۆناخی کووشتنی مرۆڤەکە ببێت، ئەوەی بە تیرۆرکردنی رامیاری هلّدەستیّ و ئەنجامی دەدات

و تووێژو دیالۆگ نازانیَ و له ئاستێکی رۆشنبیرو بروانەبوون به چارەسەر ی کێشەی ئاشتیانه نیه و نایەویَ هاوکاری و له یەکگەیشتن له گەلَ بەرامبەر ئەنجامبدات.

هەروا تیرۆر کردن چەمنکێکه بۆ ناوزەند کردنی کردەی کووشتنی رێکخراوی تۆڵەسەندنەوه به کاردێت. که ترۆرستانی ئایینی و رامیاری و نەتەوەیی و نیشتیمانی و کۆمەلأیەتی و ئابووری و بازرگانی و سامان و دەسەلأت و بوارەکانی دیکەش، له نێوان دوو لایەنی دژ به یەکتر ئەویش – چەوسێنەر و چەوساوە – له هەرێم و ناوچەو جیهان

ئا لەم رۆژەدا و له سەرەتای جەنگی دووەمی جیهان و له لایەن دەسەلأتدارانی یەکییەتی سۆڤیەت به سەرکردایەتی – جۆزێف ستالین – له ٨/٢٠ دا، لییوون ترۆتسکی، له دوای ململانێیەکی زۆر له سەر دەسەلأت له گەلَ ستالین له شاری مەکسیکۆ تیرۆرکرا.

جێگەی باسکردنه که له گەلَ داهێنانی چەك، چوارچێوەی ئاسایشی مرۆیی به تەنها بەس نەبوو، له پێناو رێگه نەدان و رۆێگه گرتن به تیرۆر کردنی کەسایەتیه مەزنەکان و وای لێهات که له توانای ئەنجامدەری پرسەکه بێت و بتوانێت له دووری ئامانجەکان.

جا تیرۆر کردن له رێگەی چەك بێت، یاخوود له رێگەی سووتاندن بێت یاخوود له رێگەی چەکی ئاسایی وەك خەنجەرو شیرو چەقۆ بێت، ئەمەش به پێی پەرەسەندنی قۆناخه یەك له دوای یەکەکان بووه له تواناو چۆنییەتی به کارهێنانی له ئەنجامدانی له هەر شووێنێك بگوونجابایه له وولأته جیا جیاکان له جـــیهاندا.

هەروا نموونەی هەولـه کۆنەکانی تیرۆر کردن له رێگەی بەکارهێنانی تەقەمەنی هەولی شکستخواردووی هاوسۆزانی کاسۆلیکەکان بوو بۆ تیرۆر کردنی – شا جیمسی یەکەم – و خێزانەکەی و زۆرینەی ئەرستۆکراتەکانی پرۆتستانت بەیەك جار له بەریتانیا و له رێگەی تەقاندنەوەی پەرلەمانی بەریتانیا له ١٦٠٥/١١/٥، ئەو رۆژەی که زۆرینه له بەریتانیا و نیوزیلەنداو باشووری ئەفەریکیاو کەنەدادا ئاهەنگی تێدا دەگێرن.

هەروا تیرۆر کردنی ئیمپراتۆری چین – ژین هۆی تی – ی له ٣٠٧/١/٨، جا تـــیرۆر بـــووه پیـــشەیەکی گوونجـــاو چ لەلایـــەن دەســـەلأتدارانی دژی

بەرھەلستکارەکانیان و چ لە لایەن بەرھەلستکارانی دژ بە دەسەلأتداران، کە ئەویش بە چەندین ڕێگەی گوونجاو و سەرکوتووانە ئەنجامدەدرا لە جیهان. هەروا داگیر کردنی خاك و گەل، جۆرێکی درندانەیە لە جۆرەکانی تیرۆر وەك دابەشکردن و داگیرکردنی گەل و نیشتیمانی کورد لە کوردستان، هەروا تیرۆر کردنی منداڵ و ئافرەت و گەنج لە ڕێگەی بازرگانی پێکردن و کاری سێکسی و کرین و فرۆشتن، بە هۆی ناچار بوونی چینی هەژار و لە پێناو مانەوەی لە ژیاندا... لە گەڵ چەندین لایەنی دیکە لە جۆرەکانی تیرۆر، کە لە ناوەرۆکی مێژوونامەکەدا نووسراوە بە پێی مێژووی ڕووداوەکان.

١٩٤٠/٨/٢١ تیرۆرکردنی زاناو ڕووناکبیرو هاوڕێی دامەزرێنەری یەکیەتی سۆڤیەتی لینین –ترۆتسکی لە لایەن پیاوەکانی سکرتێری گشتی پارتی کۆمۆنیستو حکوومەتی سۆڤیەت ستالین لە شاری مەکسیکۆسیتی تیرۆرکرد ، دوای ئەو مرۆڤە ریکۆڤ بووە سەرەك وەزیرانی یەکیەتی سۆڤیەت، ئەمەش لە دوای دوورخستنەوەی سەرکردەو هاوخەباتی لینین- ترۆتسکی بوو لە وولأتەکەیدا.

١٩٤٠/١٠/١٧ بلأو کردنەوەی بەڵگەنامەی نهێنی کە لەلایەن – بن گۆردیۆن– نەخشەی بۆ کێشرابوو بەناوی – هێلەکانی هەرەمی سەهیۆنیزم– و ڕێگای گەیاندنی بۆ بنیادنانی دەوڵەتی یەهوودی ، کە ئەمەش سەرەتای دامەزراندنی دەوڵەتی ئیسرائیل بوو ، کە لە ساڵی ١٩٤٨ هاتە دیو بووە هۆی دورستکردنی کێشەو ململانێی نێوان عەرەبوئیسرائیل ، کە بە گەوورەترین کێشەی جیهانی دادەنرێت لەدوای کێشەی گەلو خاکی کوردی دابەشکراو لە نێوان چوار وولأتی دژ بە یەکتر لە هەموو لایەنە جۆراو جۆرەکان تەنیا لەسەر کێشەی کورد کۆکن لە کێشوورەکەدا...؟؟...

## ١٩٤١

١٩٤١/١/١١ دەست پێکردنی بە لەناو بردنی یەهوودی بەکاری درندانەی بەکۆمەڵ کووشتن لەلایەن هێزەاکنی ئاسایشو سەربازیو پۆلیسی ڕژێمی فاشی ئەلمانیا ، کە لەو کاتە گفتووگۆی نێوان نووێنەرانی ئەڵمانیاو تورکیا لە ئەستەمبوڵ دەستی پێکرد.

١٩٤١/١/٣١ بەکرێ گیراوەکانی بەریتانیا زانیاریان لە سەر پەیووەندی نێوان سەرەك

وەزیرانی ئێراق رەشید عالی گەیلانی و ئەڵمانیای نازی هەبوو، لەبەر ئەوە توانیان دەسەڵاتی ڕەشید عالی گەیلانی لەناو ببەن... دوای ئەوە سەرەك وەزیرانی ئێراقی نوێ چووە قاهرەی پایتەختی میسر، لەهەمان كات وەزیری دەرەوەی بەریتانیا – ئایدن- گەیشتە قاهرەو بەناوی چرچل داوای لەسەرك وەزیرانی ئێراق كرد كە پێویستە ئێراق لە هەموو بوارەكان بەتەواوی بكەوێتە ژێر دەسەڵاتی سەربازی بەریتانیادا .

١٩٤١/٢/٦ لە دوای رووخاندنی دەسەڵاتی رەشیدعالی گەیلانی بەشەش رۆژ، لەبارەگای موخابەراتی ئەڵمانیا كۆبوونەوەی نهێنی لە نێوان سەركردەكانی موخابەراتی سەربازی و گەورە پیاونی وەزارەتی دەرەوە ئەنجام درا لە شاری بەرلینی پایتەختی ئەڵمانیا ، بەگفتووگۆ كردن لە سەرباری ئێراق و رۆژهەڵاتی ناوەڕاست ، كە- هۆربا-ی نووێنەری ئەڵمانیاو پیاوی یەكەمی پەیووەندی نهێنی لە نێوان رەشید عالی و حكوومەتی ئەڵمانیا بوو، لەو كاتەی كە لە ئێراق بەرەو سعوودیە رۆیشت... بەڵام نەیتوانی بچێتە سعوودیە بە هۆی پاڵەپەستۆی بەریتانیا لە سەر دەسەڵاتی شانشینی سعوودیە.

رشيد عالي الكيلاني

١٩٤١/٣/٥ دوای گەڕانەوەی – هۆربا – نووێنەری ئەڵمانیا بۆ شاری بەرلین راپۆرتێكی گرنگی ئاراستەی راوێژكاری ئەلمانیا هتلەر كرد ، بە ناونیشانی- گرنگی نەوت بۆ كارەكانی جەنگی بۆ وولاتانی تەوەری شەڕ- ئەویش بەپەلاماردانی وولاتانی تەوەر بەهێزی پیادەی دەشتایی بۆسەر كەناڵی سوێس- ئەستەمبۆڵ – سوێس ، كە ٢٥٠٠ كم دوورە ، كە ئەمەش جێ

بـەجێ ناکرێـت تـەنیا بەیارمەتیـەکی میکـانیکی لەگـەڵ پرکردنـی چـەکی ئاسمانی دەبێ

١

١٩٤١/٣/١٣

لــە دایــك بــوونی شــاعیرو نووسەرو رووناکبیری عەرەب و جیهـان – مـەحمود دەرویـش – لــە گونــدی – بــروە – لــە فەلەستین، کە دەکەوێتە شاری جـەلیل لـە کـەناری – عــەکا – دووەم منداڵـە لـە چوار برا، لـە تەمەنی حەوت سالان بووە کە لــە ســاڵی ١٩٤٨ دەووڵــەتی ئیــــســرائیل دامــــەزراوە، گوندەکــــــەی مـــــەحمود دەرویـشیش یـەکێك بـووە لـە و

گوندانه که بەر سنووری ئیسرائیل کەوتووه لە هەرێمەکەدا، دایکی ناوی – حۆراه – بووه و باوکی ناوی – سەلیم – بووه.
جێگەی باسکردنه که ئەم شاعیره مەزنه سەرەتای خوێندنی لە گوندەکەی خۆیی و گوندەکانی ناوچەی جەلیل تەواو کردووه، دوای ئەوه بۆ خوێندن تەواوکردن چۆته شاری – حەیفا – لە دوای ئەوه دەستی کردووه بە نووسینەوەی شیعرو بابەت بە بلاو کردنەوەی وەك :– ئیتحاد – جدید –و دوای ئەوه بۆ چاودێر لە سەر ئەو رۆژنامەو گۆڤارانه، هەروا بەشداری لە دەرچوواندنی رۆژنامەی – فەجر – کردووه.
لە سەرەتای بەهێز بوونی هەست و هۆشی مەحمود دەرویش خواستیاری بیری مارکسی – لینینی – بووه و هەر لە ریزی پارتی کۆمۆنیستی ئیسرائیل و پارت و رێکخراوه مارکسیەکان کاری کردووه، لە پێناو هێنانەدی ئەو ئاوات و ئامانجەی که بۆته پرۆگرامی ژیانی ئەم رووناکبیره.
لە ماوەی ژیانی دەرویش بۆ یەکەمجار رووبەرووی شاعیرانی ناوچەکەو ئیسرائیلیەکان بۆتەوه لەو کاتەی کە سەرەك وەزیرانی ئیسرائیل – گۆلدەمائیر– بووەو دژایەتی بیری کۆمەنیستی و بەرهەلستکارانی دەوولەت و حکوومەتەکەی دەکرد لەو کاتەدا. مەحمود دەرویش لە گەڵ خێزانەکەی روو لە لوبنان دەکەن، دوای گەرانەوەی لە ساڵی ١٩٤٩ دەبینی گوندەکەی وێرانکراوەو لە گوندێکی جوولەکەنشین بەناوی – ئاحی هود – نیشتەجێ دەبێ بۆ ماوەیەکی کەم. دوای ئەوه چەندین جار لە لایەن دەسەلأتدارانی ئیسرائیل لە ساڵەکانی ١٩٦١ دەستگیر دەکرێ تا ١٩٧٢.
دوای ئازادکردنی مەحمود دەرویش روو لە شاری مۆسکۆی پایتەختی یەکیەتی سۆڤیەت دەکات بۆ خووێندن. دوای ئەوه دەگەرێتەوه شاری قاهیرەی پایتەختی میسر و دوایش دەگەرێتەوه شاری بەیروتی پایتەختی لوبنان. دوای ئەوه سەرۆکایەتی – مەلبەندی تووێژینەوەی فەلەستینی – دەکات، هەروا دەبێتە سەر نووسەری گۆڤاری – کاروباری فەلەستین – و هەروا سەرۆکی رایەڵەی نووسەرانی فەلەستین – دەکات لە گەڵ گۆڤاری – کرمل – ی رۆشنبیری.
لە دوای ئەم هەموو کارومانـدوو بوونەش لە ساڵی ١٩٩٣ دەست کێشانەوەی خۆی لە لیژنەی جێ بە جێکردن لە ریکخراوی فەلەستین

دەکێشێتەوە بە هۆی ڕێکەووتننامەی ئۆسلۆ لە گەڵ ئیسرائیل. دوای ئەوە ڕێگە بە مەحمود دەرێش درا کە بگەرێتەوە فەلەستین و لە ساڵی ۱۹۹٦ گەراوەو لە شاری - رامەڵا - جیٚ نشین بوو لە شارەکەدا.

لە ماوەی ژیانی ئەم نووسەرو شاعیرە چەندین پاداشتی پیٚ بەخشراوە ، وەك خەلاّتی لۆتس لە ساڵی ۱۹٦۹، هەروا خەلاّتی دەریای ناوەراست لە ساڵی ۱۹۸۰، هەروا خەلاّتی لینین لە لایەن حکوومەتی سۆڤیەت لە ساڵی ۱۹۸۳، لە گەڵ چەندین خەلاّتی دیکەدا.

لە دوای ئەوەشدا دانراوەکانی بۆ زیاتر لە ۲۰ زمان وەرگێردراون وەك :- عاشق من فلستين لە ساڵی ۱۹٦٦ - اخراليل لە ساڵی ۱۹٦۷، حبيبى تنهج من نومها لە ساڵی ۱۹۷۰ - اعراس لە ساڵی ۱۹۷۷ - ورداقل لە ساڵی ۱۹۸۸ احد عشر كوكبا لە ساڵی ۱۹۹۲ - سرير الغريبە لە ساڵی ۱۹۹۹ -، لە گەڵ دەیا پارچە هوندراوەو پەخشانەو بابەتی دیکە کە لە رۆژنامەو گۆڤارەکان بلاّویکردۆتەوە.

مەحمود دەرویش کەسایەتیەکی تەنیا عەرەبی نەبووە بەلکوو کەسایەتیەکی جیهانی بووە، بە هۆی هەلوویٚستە بویٚرانەکی لە هەموو بوارەکانی ژیان و لە پیٚناو خزمەتکردنی مرۆڤایەتی بووە بیٚ جیاوازی کردن لە نژادو رەگەز و زمان و کەلتوورو ئارەزوو مەندبووە، کە هەموو نەتەوەیەکی ژێر دەستە بگاتە ئامانجەکانی لە بوونی دەووڵەتێکی سنووورداری دان پیٚندراو لە ریٚزی وولاّتانی جیهان،

ئەم شاعیرە لە ژیان لە کارەکانی بەردەوام بووە تا لە ۲۰۰۸/۸/۹ ماڵئاوایی لە گەل و نیشتیمان و جیهان دەکات، لە ئاکامی نەشتەر گەری دڵ لە شاری -هیوستن - لە وویلایەتی تکساسی ئەمەریکا، دوای ئەوە تەرمەکەی دەگەرێندرێتەوە فەلەستین و بە خاك دەسپیٚردریٚت لە لایەن گەلانی فەلەستین حکوومەت و نووسرو شاعیران.

سەرچاوە:- دووبەی رۆشنبیری - ژمارە/ ۲۰۰۸/٤۰.

۱۹٤۱/۳/۲٥ لە دوای داگیرکردنی یۆگسلافیا لەلایەن هێزەکانی سووپای ئەڵمانیا لە سەرەتای جەنگی دووەمی جیهان و بە دامەزراندنی حکوومەتی لایەنگری خۆی لە دەسەلاّتدا ، کە بووە هۆی لیٚك ترازانی پەیووەندی و نارەزایی گەلاّنی وولاّتەکەو بە بەردەوامی تێکۆشان و خەباتی گەلانی یۆگسلافیا ،

ئەویش بە دروست بوونی چەندین لایەنی رامیاریو ئابووریو كۆمەڵایەتی یەكگرتوو ، بە بەردەوام بوونی راپەرینو دورستكردنی هێزی چەكداریو رووبەرووبوونەوەی دەسەڵاتی لایەنگیری ئەڵمانیا ، لەئەنجام ئەو رژێمە روخێندراو رژێمی نوێی دژ بەئەڵمانیایان دامەزرا لە وولاتەكەدا .

١٩٤١/٤/٦ لە دوای رووخاندنی رژێمی دژ بە ئەڵمانیا دووبارە هێزەكانی سووپای ئەڵمانیای نازی یوگسلافیایان داگیر كردەوە ، لە پێناو فراوانكردنی تەوەری شەڕو بە هێزكردنی جێپێگەی ئەڵمانیا دژی یەكیەتی سۆڤیەتو هاوپەیمانانی لە ئەمەریكاوبەریتانیا لەناوچەو هەرێمەكانی شەڕی بەردەوام لە كێشووەرەكەدا .

١٩٤١/٤/١٨ هێزەكانی سووپای بەریتانیا بەهاوبەشی هێزەكانی سووپای شانشینی لە ئێراق هەوڵی زیادكردنی هێزەكانیان بەسەربازو چەكو تەقەمەنیدا ، بەهۆی بەرز بوونەوەی راپەرینەكانی گەلی كوردستان لە باشووری كوردستانی لكێدراو بە ئێراق، لە ناوچەی بارزانو دەووروبەری لەهەرێمی باشووری كوردستان.

١٩٤١/٤/٢٧ كووشتنی زیاتر لە ٦٠,٠٠٠ هەزار هاووڵاتی سربی لە شاری جازینووخاك لە ماوەی ٤/٢٧ تا ٧/٣٠ ی هەمان ساڵ ، جگە لە كووشتنو سەربرینی زیاتر لە ٢٦٠٠ هەزار هاووڵاتی دیكە كە گیانیان لەدەست دا... بەهۆی كێشەی نژادی ، بەتایبەتی كێشەی ئاینی لە نیوان مەسیحیو ئیسلام لەهەرێمەكەدا.

١٩٤١/٥/٢ بەرپابوونی جووڵانەوەی مایس لە ئێراق دژی دەسەڵاتی شانشینی بە سەرۆكایەتی رەشید عالی گەیلانی لە وولاتەكەدا .

١٩٤١/٥/٢ نووێنەری ئیتالیا لە شاری بەغدا ناوەرۆكی ئەو گفتووگۆیەی كە لەگەڵ رەشید عالی گەیلانی ئەنجامیدابوو بلاوی كردەوە ، كە بەنامە ئاراستەی شاری رۆمای پایتەختی ئیتالیای كردو تیایا نووسیوویەتی:– كە سەرەك وەزیرانی ئێراق رەشید عالی رایگەیاندەوە ، كە هەوڵەكانی دژی دەسەڵاتی بەریتانیا بووە ، بۆیە بەو كارە هەڵسایە بەپیی بەڵێنەكانی دەسەڵاتی ئەڵمانیا بۆ ئەو كارەی ، كە ئەنجامی داوەو هیچ لایەنێك سوودمەندی

تایبەتی تێدا نەبووە لە وولاتەکەدا .

١٩٤١/٦/١١ ڕاوێژکاری ئەڵمانیای فاشی هتلەر ، لە ئامۆژگاری ژمارە/ ٣٢ دەڵێ:- خەبات دژی پێگەکانی بەریتانیا لەدەریای سپی ناوەڕاستو لە ڕۆژئاوای ئاسیا بەردەوام دەبێ ، ئەویش لەڕێگەی شالاوبردنی جەنجاڵی لە لیبیا بۆسەر میسرو لە بوولگاریا بۆسەر تورکیاو لە دواوەی قەفقاز بۆسەر ئێران ، ئەمەش ئەنجام دەدرێت.

١٩٤١/٦/٢٢ خاوەن کتابی- اسطورة القرن العشرين- فەرید ڕۆزنبرگ هەڵسا بەداڕشتنی پرۆژەیەکی سەرسووڕهێنەر لە شاری بەرلینی پایتەختی ئەڵمانیا ، ئەویش بە پارچە پارچە کردنی یەکیەتی سۆڤیەت... ڕۆزنبرگ دەیزانی کە مەحاڵە وولاتێکی فرەنەتەوە بتوانی تاسەر بەردەوام بێ لە بەر ئەوەی ئەم جۆرە دەووڵەتە تاقانەیە لەجۆرە دەووڵەتەکانە لە ئەوروپادا.

١٩٤١/٥/٦ لە سەرتای جەنگی دووەمی جیهان ، سکرتێری گشتی پارتی کۆمۆنیستی یەکیەتی سۆڤیەتو سەرکردەی سووپای سووری سۆڤیەت - جۆزیف ستالین - پۆستی سەرەك وەزیرانی یەکیەتی سۆڤیەتیشی گرتە دەست ... کە دوا هەنگاوی بوو بۆ وەرگرتنی تەواوی دەسەلات لەسەر کاروباری هەموو دەسەلاتە بالاکانی یەکیەتی سۆڤیەت ، بەتایبەتی لەکاتی جەنگودوای جەنگیش لە پێناو بەهێزکردنی هیمای سۆڤیەت لە جیهاندا .

...م الألماني على الاتحاد السوفياتي (عملية «بربروسا»).

١٩٤١/٦/٢٢ هەڵگیرسانی جەنگی دووەمی جیهان لە نێوان یەکیەتی سۆڤیەت و ئەلمانیای نازی لەهێرشێکی ناکاو لەلایەن هێزەکانی سووپای نازی ئەلمانیای هتلەری ، بۆ سەر خاکی یەکیەتی سۆڤیەت و لەلایەکی دیکەش لەنێوان ئەلمانیاو وولاتانی هاوپەیمان و تەوەری شەڕکەر لەهەردوو کیشوەری ئاسیاو ئەوروپادا .

١٩٤١/٧/١١ ئەلسیر ليناهان كرنواس لە نامەیەکیدا شالاوی بردۆتە سەر شێخ مەحمودی حەفید بە هۆی راگەیاندنەکانی سەربەخۆیی کوردستان دژی دەسەڵاتی شانشینی لە ئێراق و بەریتانیا لەسەر خاکی باشووری کوردستان.

١٩٤١/٧/٢٦ بە هۆی ئالۆزی پەیوەندی وولاتانی شەڕکەرو ڕووسیا ئەلمانیا و هاوپەیمانی لە نێوان یەکێتی سۆڤیەت وبەریتانیا، لە پێناو ڕێگە گرتنی هێزەکانی سووپای ئەلمانیا بۆ چوونە ناو خاکی ئێران، کە هێزەکانی سووپای سۆڤیەت لە باکووری ئێران هاتنە ناو خاکی ئێران. بەریتانیا لە ڕۆژئاوای ئێران هاتنە ناو خاکی ئێران... ئەویش بە پێی برگەی ٦ی ڕێکەووتنامەی نێوان ئێران و سۆڤیەت لەسالی ١٩٢١.

دوای ئەوەش بالوێزخانەی سۆڤیەت لەتارانی پایتەختی ئێران بووە بارەگای لوتکەی بالاّی نێوان سەرۆکی سۆڤیەت ستالین و ڕۆزلفت و چرچل لەمانگەکانی/١١-١٢/١٩٤٣... هەروا سەرۆکی ئەمەریکا لە باڵیۆزخانەی سۆڤیەت لە تاران و حەوانەوەی خۆی بەسەربرد.

هەروا لەوکاتەدا بوو یەکەم پرۆژەی یارمەتی دانی ئێران بریاردرا بە پێدانی چەك و تەقەمەنی بە ئێران... ئەمەش بووە هۆی ئەوەی کە ئێران پەیوەندیەکانی بەشێوەیەکی هاوسەنگ بەرەو پێش ببات، لە پێناو بە دەست هێنانی بنکەیەکی تەکنەلۆژیای ئەتۆمی و چەندین بواری دیکەی هاوکاری ئابووری و سەربازی و ڕۆشنبیری بازرگانی لە نێوانیاندا.

١٩٤١/٨/٧ کۆچی دوایی شاعیرو ڕووناکبیرو فەیلەسوف هندستان و جیهان –رابندرانات تاگور– لە شاری نیودەلهی پایتەختی هیندستان.

١٩٤١/٨/١٤ بۆ یەکەم جار کۆمەڵی نێوو دەووڵەتی لە پەیماننامەی – ویستڤالیاوە – دروست بوو... کە ئەویش لە دەر ئەنجامی لێك هەڵووەشانی ئیمپراتۆریەتی – گرمانی – و بۆ چەندین دەووڵەتی نەتەوەیی هاتە کایەوە... کە دەووڵەت لە سەر بنەمای بنەما نەتەوەیی هاتە کایەوە... کە دەووڵەت لەسەر بنەمای بنەما نەتەوەییەکان هاتە ئاراوە.

لە دواییدا ماف گەلان لە بەدەست هێنانی ماف چارەنووس لەکۆمەڵەی گەلان و لە سەر دەستی – ودرۆولسۆن – باشتر رەگی داکوتا. لەمیانەی جەنگی دووەمی جیهانی لە ١٩٣٩ – ١٩٤٥، ئەم مافە بەهێورترو بەگورتر خۆی چەسپاند... بەتایبەت لەراگەیاندنی – ئەتلەنتی – کە لەکۆبوونەوەی نێوان

– چرچل و رۆزفلت – لەناو کەشتی – ئەلبرنز ئۆف ویڵز – کە لەناو دەریای ئەتلەنتی بەرێووە چووو هاتە ئاراوە.

دوای ئـەوەش لـە راگەیانـدنی نەتـەوە یـەکگرتووەکان لـە سـاڵی ١٩٤٢ دا تۆمارکراو لەماددەی/١ ی بروانامەی نەتەوە یەکگرتووەکان وەك کۆسێپت و پرنسیپیکی بنەرەتی لەم بەڵێنامەیەدا رەگی داکوتا لە جیهان.

١٩٤١/٨/٢٥ هێزەکـانی سـووپای بـەریتانیاو سـووپای سـووری سـۆڤیەت وەك داگیرکـەر چوونە ناو خاکی رۆژهەلاتی کوردستانی داگیر کراوی ژێـر دەسـەڵاتی فارس لە ئێران و مانەوە لەناوچەکەدا .

١٩٤١/٨/٢٥ داگیرکردنـی ئێـران لەلایـەن هێـزە هاوپەیمانـەکان بـەخالێکی وەرچـەرخان و قۆناخێکی نوێ و چارەنووس ساز لە مێژووی ئێرانی هاوچەرخ دادەنرا ، کە گـــرنگترین دەرهاوێـــشتەکانی هەڵووەشـــاندنەوەی کتـــوپڕی لەشـــکری شاهەنـشاهی لـە ئێـران و رووخانـدنی دیکتـاتۆری بیـست سـاڵەی رەزاشـا پەهلەوی بوولە ئێراندا .

لــە بەرامبەریــشدا ئـازاد کردنـــی زیندانــە سیاســیەکان و گەڕاندنــەوەی دورخراوەکـان لـەدەرەوەی ئێـران ... بـەڵام دوای ئـەوە دووبـارە بـە هـەمان شێووەی جاران بەلکوو دژوارتر ، بە هۆی دورستکردنی دەسەلات لە ئێران بـەپێی بەرژەوەنـدی تایبـەتی هەمـە لایەنـەی هاوپـەیمانان بـوو لەسـەر ئێـران بەتایبەتی لەرۆژهەلاتی کوردستاندا .

لانكليز والروس يرغمون الحكومة الايرانية على القبول «بحماية الحلفاء»,وفي الصورة قافلة من الآليات البريطانية تجتاز خيبر أثناء تقدمها في ايران

١٩٤١/٨/٢٥ دامەزراندنی پارتێكی كوردی بچووك لەلایەن عەزیز زەندی بەناوی -پارتی رزگاری كورد- لە ناوچەی مەهاباد لەرۆژهەلاّتی كوردستان لەسەرەتای جەنگی دووەمی جیهان ، كە لەو كاتە هێزەكانی سووپای سووری سۆڤیەت لە باكووری هاتنە ناو ئێران و هێزەكانی بەریتانیاش لە باشوورو رۆژئاوا ، كە بووە هۆی دەست لەكار كێشانەوەی حكوومەتی عەلی مەنسووری لایەنگیری سەرەكی بوو لەشەڕ هاتنە خوارەوەی رەزا بەهلەوی لەسەر كورسی شاهەنشاهی لە ٩/١٦ی هەمان ساڵ لەسەردەسەلاّتی ئێراندا .

١٩٤١/٩/١٤ ڕووسیاو بەریتانیا داوایان لە شای ئێران رەزا بەهلەوی كرد ، كە دەست لە دەسەلاّت هەڵگری و كورەكەی محمد رەزا لە جێگەی خۆی دابنێ و شەڕی دژ بەئەلْمانیاو ولاّتانی تەوەری شەرش راگەیەنێ، بەلاّم رەزا بەهلەوی ئەوەی رەتكردەوە ، بەلاّم دوای ئەوە بەناچاری لە ٩/١٧ ی هەمان ساڵ دەستی لە دەسەلاّتی شاهەنشاهی لەسەر ئێران هەڵگرت و بەرەو دوورگەی مۆریشیۆس رەوانە كراو دەست بەسەر بوو تاكوو مردنی لە١٩٤٤/٦/٢٥ لەو وولاّتەدا.

١٩٤١/٩/٢٥ بۆ یەكەمجار پێشەوا قازی محەمەد لە شاری مەهاباد چاوی كەوت بە نووێنەرانی ئەمەریكاو بەریتانیاو كۆبوونەوەی لەگەڵ ئەنجام دان ئەویش

بەهۆی بارودۆخی نوێی جیهان و ناوچەو وڵاتەکە بوو... لەو کاتەشدا خەبات دژی رژێمی شایەتی بە پشتگری سۆڤیەت بەردەوام بوو، لە هەمان کاتیش شۆرش و خەباتی کورد لەو کاتدا بۆ دەسەڵاتی سۆڤیەت گرنگ بوو لەگەڵ سەرجەم وڵاتانی داگیرکەری ئێرانیش لاواز راگرتنی دەسەڵاتی ناوەندی... وەك مەبەستێك لە ئارادابوو.

بۆ ئەم مەبەستەش گەلی کورد بەهۆی هەندێك تایبەتمەندی توانی رۆڵی بەرچاوی هەبێ... لەم پێناوەدا پێکهێنانی ئاڵ و گۆر لە بەرنامەو رامیاریەتی رێکخراوی کوردیدا بەشتێکی پێویست دەژمێردرا لەکوردستان.

سەرچاوە:- پەنجا ساڵ خەبات - جەلیلگادان - ل/٢٣ بەرگی یەکەم.

١٩٤١/٩/٢٥ دووکارمەندی بەرپرسی ئەمەریکاو بەریتانیا لە رێگەی ئافرەتێکی رۆشنبیرو کاربەدەستی نەرویژی چاویان بە پێشەوا قازی محەمەد کەووت، لەشاری مەهابادی رۆژهەلاتی کوردستان. کە پێشەوا قازی محەمەد باسی نەخشەی یەکگرتووی کوردستانی بۆ کردن، لە پێناو چارە سەری کێشەی گەلی کوردستان.

١٩٤١/٩/٢٩ لە ماوەی دوو رۆژ، واتە لە ٢٩-٣٠ ئەویش بە کووتشنی زیاتر لە ٣٣٧٧١ هاوڵاتی مەدەنی جوولەکە لە کەندی بابی چیایی - لە دەرەوەی شاری کیفی پایتەختی

ئۆکرانیا، لە لایەن هێزەکانی بەر پرسانی ئەلمانیای نازی لە ناوەراستی جەنگی دووەمی جیهانی لە ناوچەکەدا.

جێگەی باسکردنە کە ئەم کۆمەڵکوژیەش لەلایەن فاشیەکانی ئەلمانیا لە ئەنجامی دەستگیرکردنی جوولەکەکان بوو لە ئۆگرانیا لە نزیك گوندی -

گڤوزد فکارا لە مانگی /٦- ٧- ٨/١٩٤١. ئەم کۆمەڵکوژییە بە یەکجار ئەنجام درا لە ماوەی – هۆل و کۆست – ol , sf. ئەم کارەی ئەلمانیای نازی کە ئەنجامی دابوو، تاکوو کۆتایی ساڵی /٢٠٠٧ یش گۆری بەکۆمەڵ دەدۆزرایەوە بە تایبەتی لە هەردوو مانگی/ ٥- ٢٠٠٧/٦ لە هەمان ناوچەدا لە ئۆکرانیادا.

١٩٤١/١٠/٢٠ دامەزراندنی پارتی توودە ، واتە پارتی کۆمۆنیستی ئێران لەلایەن خەلیل ملکی و ئیحسان تیری و تەقی تارانی...لەوکاتەی کە شای ئێران رەزا بەهلەوی ئێرانی جێ هێشت و هاوپەیمانان گەیشتنە ناو خاکی ئێران ، پارتی توودە بوونی هێزەکانی سووپای سووری سۆڤیەتی قۆستەوە لە باکووری ئێران ، لە پێناو پارێزگاری لێکردن... دوای ئەوە هەڵسا بەپێکهێنانی لێژنەیەکی کاتی لە ١٥ ئەندام بەسەرۆکایەتی سلێمان میرزا ئەسکەندەر لە وولاتەکەدا .

١٩٤١/١١/٢٥ گەیشتنی شاندێکی کوردی رۆژهەڵاتی کوردستان بۆشاری باکۆی پایتەختی کۆماری ئازربایجانی یەکیەتی سۆڤیەت... مانەوەیان بۆ ماوەی ١٠ رۆژ ، لەگەڵ بەرپرسانی شوورەوی دەستیان کرد بەگفتووگۆکردن لەسەر باری کێشەی کورد ، لەوانە پێشەوا قازی محەمەد لە مەهابادو ، ئەمیر ئەسعەد بابە شێخ لەشاری بۆتانو چەندین کەسایەتی دیکەی کورد لە کوردستان بەگشتیو بە تایبەتی لەرۆژهەڵاتی کوردستانی داگیر کراوی ژێر دەسەڵاتی ئێران.

١٩٤١/١٢/٥ گەرانەوەی شاندی کوردی لە باکۆی پایتەختی ئازربایجان بە سەرکردایەتی پێشەوا قازی محەمەد بۆ رۆژهەلاتی کوردستان لە دوای تەواو بوونی گفتووگۆکانیان ، کە لە ١١/٢٥ ی هەمان ساڵ سەردانی وولاتی ئازربایجانیان کرد بوو.

١٩٤١/١٢/٧ بەرپابوونی کارە فراوانەکانی سەربازی ، کە سووپای ئیمپراتۆری یابانی ئەنجامی دا ، دژی دەریاوانەکانی ئەمەریکا – ئەلراسیە – لە بنکەی بەندەری سەربازی لە دوورگەی هاوای... کە بووە هۆی زیان لێکەوتنێکی زۆری هێزەکانی سووپای ئەمریکاو بووە هۆی ئەوەی کە ئەمەریکا بچێتە پاڵ هاوپەیمانانی بەریتانیاو فەرەنسا دژی یابان جەنگی راگەیاند لە کێشووەرەکەدا .

طائرات تضرّرت بفعل القصف الياباني على جزيرة فورد في بيرل هاربور.

١٩٤١/١٢/٢٩ سەرکردایەتی یەکیەتی سۆڤیەت ، رژێمی شاهەنشاهی ئێرانی ناچار کرد ، کـە رێکەووتننامەیـەکی لـە گـەڵ مـۆر بکـات ، کـە ئێـران لـە بەرژەوەنـدی هاوپەیماناندا بچێتە جەنگەوە دژی ئەڵمانیای نازیو هاوپەیمانان ... بەڵام ئەو داوایـەی سۆڤیەت جێ بـەجێ نـەکرا بەهۆی داواکاریـەکانی دەسـەڵاتی ئێـران بەرامبـەر بـە بزووتنـەوەی رزگـاریخوازی کـورد لـە رۆژهـەڵاتی کوردستاندا.

## ١٩٤٢

١٩٤٢/١/١ سـەرۆکی ئەمـەریکا– رۆزفلـت– و سـەرەك وەزیرانـی بـەریتانیا–ونـستون چرچل– لـە ئـەنجامی گفتووگـۆی چرو پـڕ بـە هەڵـسەنگاندنی بـاری نێـوو دەوولـەتی و جـەنگی دووەمو دوای جـەنگ ، هەڵـسان بەراگەیانـدنی بـەرەو دامەزرانـدنی رێکخـراوی نەتـەوە یـەکگرتووەکان بـە بەشـداری ٢٦ وولات لـە هاوپەیمان و دۆستەکانیان لە جیهاندا.

ستالین، ڕۆزڤێلت، چەرچڵ

١٩٤٢/١/٦ یەکەم کاروانی فرۆکەی بازرگانی بال٧ هەڵگر بە دەووری جیهان دەستی بەکارەکانی کرد ، کە ئەنجامدەری لەلایەن کۆمپانیای بانی ئەمەریکی بوو وولاتەکەدا .

١٩٤٢/١/٢٦ هونەرمەندی ناوداری عەرەب و کوردی و جیهان خاتوو – سوعاد حوسنی – لە قاهیرەی پایتەختی میسر لەدایك بووە.
جێگەی باسکردنە کەخاتوو – سوعاد حوسنی – ناوی تەواوی سوعاد محەمەد حوسنی بابا – یەو لە نژاد کوردە... زۆر لەهونەرمەندان و

کەسایەتیە ناودارەکان نەیان زانیووە کە ئەم خاتوونە کوردە و کچی گۆرانی

بێژی بە ناوبانگی سووریا محەمەد حوسنی بابایەو لە خێزانێکی کورد بووە بــەناوی حوســنی بابــا... کۆچــی دوایــی خــاتوو ســوعاد حوســنی لــە ٢٠٠١/٦/٢٢ لە شاری لەندەنی پایتەختی بەریتانیا لـە رووداوێکـی نادیاری دڵتـەزێن کۆچـی دوایـی کـرد ... زۆر گومـان لـەوە دەکرێـت کـە ئـەم خاتوونـە لـەرێگای چـەند نادیارێـك تیرۆرکرابێـت... کـە نـەجات سـەغیرەی خوشـکی سوعاد حوسنیە و هەروا براکەی عزەدین حوسنی، کە موزیکا ژەنـی خـاتوو ئووم کەلسووم بووە لە وولاّتی میسر و وولاّتانی عەرەبیدا.

١٩٤٢/٢/٥ بەفەرمانو رێنماییـە دارێـژراوەکانی هتلـەری فاشـی ئـەلمانیا خۆئامـادەکردن دەسـتی پێکـرد... لـەپێناو داگیرکردنـی ناوچـەو وولاّتـە بەرهـەم هێنـەرە نەوتیـەکان ، ئـەویش وەك ئێـراقو کووێـتو بـەحرێنو ئێـران ، ئـەویش لـە دوای سـەرکەووتنیان لەجـەنگی دووەمـی جیهـان بەتایبـەتی لـە هـەرێمی باشـووری کوردسـتانو رۆژهـەلاتی کوردسـتان ، کـە ئـەوکات سەرچـاوەی نەوتی بوون لە کێشووەری ئاسیا.

١٩٤٢/٢/١٢ شـاعرو نووسـەری کـورد - کاکـە عەبـدوللای سـافی - ناسـراو بـە سـەلفی کۆچی دوایی کردووە لە باکووری کوردستان.

١٩٤٢/٤/٢٨ جەماوەری شـاری ورمـێ لـە رۆژهـەلاتی کوردسـتان راپـەرینێکیان ئەنجامـداو هێڵـەکانی تەلـەفۆنو هـاتوو هـاتوو چـۆ دەبـرنو قەدەخـە دەکـەنو گـەمارۆی شـارەکە دەدەن ، لـە ئاکام بەرپرسـی شـارەکە هەڵـدێ بەرەو شـاری تـەورێزو هێزەکانی ئاسایشی رژێمی شا لە ئێران لەشارەکە دەردەکەن.

١٩٤٢/٤/٣٠ کوونسلی سۆڤیەت لە پارێزگای تـەورێز بە فرۆکە دەگاتـە شاری ورمـێ لـە رۆژهـەلاّتی کوردسـتان ، لـە پێنـاو چاو پێکـەووتن بەسـەرکردەو کەسـایەتیە کوردەکان ، لەو چاوپێکەووتنەشدا لە گەڵ کوونسلی سۆڤیت ، لـەو کـاتیش چەند داواکاریـەکیان پێشکەش بەبەرپرسـی سـۆڤیەت کـرد ، لەوانـە مـاوەدان بە ئازادی هـەلگرتنی چەكو خووێنـدن بە زمـانی کـوردی لـە فێرگـەو بەچـۆڵ کـردن و چـوونە دەرەوەی پیـاوانی رژێـم ئێـران لـە شـارەکەو هـەروا لەشـاری خوییو مەهاباد لە رۆژهەلاّتی کوردستان.

١٩٤٢/٥/٧ دەست پێکردنی گفتووگۆی سەرۆکە کوردەکانی شاری ورمێ لە رۆژهەڵاتی کوردستان لەگەڵ فەرماندەی سووپای سۆڤیەت و وەزیری بەرگری رژێمی شا لە ئێران و فەرماندەی ئازربایجانی رۆژئاوا لە شاری ورمێ... لەئاکامی گفتووگۆیەکە لەسەر ئەوە رێکەووتن بە گەرانەوەی هێزەکانی ئاسایشی رژێمی ئێران بۆشاری ورمێ و مامەڵە کردنیان لەگەڵ دانیشتووانی شارەکەو یارمەتی دانیان نەك ئازاردانیان لە هەرێمەکەدا .

١٩٤٢/٦/٢٥ یەکەم ژمارەی رۆژنامەی – باسەرە– بلاوکرایەوە کە بەدەست دەنووسرایەوەو بلاو دەکراوە بەناو جەماوەری شارەکانی پارێزگای کەرکوك و پارێزگای سلێمانی لە باشووری کوردستان.

١٩٤٢/٧/٢٢ بەستنی کۆبوونەوە لە نێوان بەرپرسی کوونسلی یەکیەتی سۆڤیەت لە پارێزگای تەورێز لە گەڵ رەشید بەگی هەرکی لە دەووروبەری دەریاچەی رەزایێ و ورمێ ، کە ئەنجامەکەی کاردانەوەی خۆی نوواند ، بەلام بەپێی بەرژەوندی سۆڤیەتی داهاتوو لەرۆژهەلاتی کورستانی داگیر کراوی ژێر دەسەلاتی ئێران.

١٩٤٢/٨/١٦ لاوەکانی شاری مەهاباد لە رۆژهەلاتی کوردستان توانیان رێکخراوەکەیان زیندو بکەنەوە ، بەناوی کۆمەڵەی ژیانەوەی کوردستان ، کە دەستیان کرد بەچالاکیەکان بەخەبات و تێکۆشان لەپێناو بەدی هێنانی مافە رەواکانی کوردو کوردستان.

١٩٤٢/٨/١٧ کۆچــی دوایــی وەزیــری دادی رژێمــی شانــشینی لــە ئێــراق ، نــاجی ســوویدی لــە بالــسبۆری باشووری ئەفریکیا ، کە یەکێك بــوو لــە کەســایەتیە زانــاو روونـــاکبیرو یاساناســـەکانی ئێراق.. . شایانی باسە ناوبراو بــە هـــۆی هەڵوێـــستەکانی بەرامبەر بەرژێمی شانشینی لە ئێراق دوور خرا بووەوەو دوای گەرانەوەی کۆچی دوایی کرد لە وولاتەکەیدا .

١٩٤٢/٩/١٢ ئەفسەرە بالادەستە رووسەکان لە رۆژهەلاتی کوردستان لە شاری شنۆی رۆژهــەلاتی کوردســتان ، کۆنگرەیــەکیان گرێــدا بەناونیــشانی – هاوکاری‌و دۆستایەتی لەگەڵ کورد – بەلام رووسەکان ئەوەیان باش دەزانی کە ووشەی کورد یەك نیەو دووژمنان دەتوانن بۆ لای خۆیان راکێشیان بکەن ، بە هۆی بەرژەوەندی تایبەتی بیروو بۆچوونی جیاواز ، وەك پەیووەند لە نێوان قەرەنی ئاغای مامش‌و ئەمیر ئەسعەد دیبۆکری ، لەگەڵ بنەماڵەی پێشەوا قازی محەمەد لە شاری مەهاباد لە رۆژهەلاتی کوردستان.

١٩٤٢/٩/١٦ هەستی نەتەوەیی کوردی رۆژهــەلاتی کوردســتانی داگیر کــراوی ژێــر دەســەلاتی ئێران، دوای سالێك لە گفتوو گۆی کوردو سۆڤیت لە شاری باکۆی پایتەختی ئازربایجان، شەقلێکی تەواوی رامیاری وەرگرت، ئەم کارە لە سەرەتادا وەها دەهاتە بەرچاو کە هەولێکی رۆمانسیانەیەو چ بایەخێکی رامیاری نابێت.

ئا لەم رۆژەدا ١٥ پیاو لە سەر خوانێکی چا خاردنەوەو شیرینیی خاوردندا لــە ژێرسێبەری دارو درەختــی بــاخێکی رۆخــی رووبــاری – سابلاخ – ی بــاکووری شــاردا کۆبوونــەوە. کــە بچووکترین کەســی نــاو ئــەو کۆبوونــەوە گــەنجێك بوو کە هێشتا نۆزدە ساڵی تەواو نەکردبوو، تازە خووێندنی

ئامـاری لـە شـاری رەزاییـە تـەواو کردبـوو، گـەورەترین کـسی نێـوو کۆبوونەوەکەش تەمەنی ٥٠ساڵ دەبوو، و بەڕێوەبەری فەرمانگەی تـووتنی حکوومەتی رواڵەتی ئەم ١٥ کەسەی لە خەلکانی دیکەدا جیا نەکردەوە.

بـەڵام بـۆ مەبەسـتێك کۆببوونـەوە کـە ئامـادە نـەبوون دەسـتبەرداری بـبن. ئەویش پەلەکردن بوو لـە دامەزرانـدنی پـارتێکی کوردی ئـەوتۆ، کە بتوانێت سـەرکردایەتی ئـەو باسس و گفتووگۆیانـە بکـات کـە سـالێك بـوو دەربـارەی سەربەخۆیی کوردستان دەکران.

هـەروا دەبوایـە ئـەم پارتـە بکـرێ بـە دەزگایـەك کـە لـە پێنـاو وەدی هێنـانی ویستەکانی گەل و کەلکەلەی سـەربەخۆییان بە دەسـت بێنـێ - میرحاج - کـە کـوردێکی دانیـشتووی باشـووری کوردسـتانی لکێنـدراو بـە ئێـراق بـوو، ئامادەی ئەم کۆبوونەوەیە بوو، ئەم کەسایەتیە لە سووپای رژێمـی ئێـراق - نەقیب - بوو ئامادەبوان لە سەر ئەمە رێکەووتبوون کە وەکـوو راوێـژکارێك داوەتی بکەن.

ئەویش سلاوو رێزی - کۆمەڵەی هیوا -ی پێ راگەیاندن، کە ئەم کۆمەڵەیە، کۆمەڵەیـەکی نهێنـی کـوردی بـوو، و لـە ئێـراق و لـە سـەردەمی ئینتیـدابی بەریتانیادا دامـەزرابوو. چالاکی ئـەم کۆمەڵەیـە لـە نێـوو رۆشـنبیرانی شـارو نووسـەران رۆژنامـەوانان و ئەفـسەرانی سـوپادا بـوو، مـیر حـاج بـە خـۆی ئەزموونی دەیان ساڵ چەوساندنەوەی کوردی ئێراقی لـە لایـەن بـەریتانیکان و ئێراقیەکانەوە هەبوو، ئەمە جگە لـە ئـەزموونی کـارکردن کـە ئامـادە بـوو لـە شـێوەی ئامۆژگـاری و زانیاریـدا ، بـە خۆشـحاڵی پێـشکش بـە بـرا کـوردە ئێرانیەکان بکات.

لێـرەدا میرحـاج ئامۆژگـاری کـردن کـە دەبـێ زۆر وریـابن و بـەو پـەری نهێنـی پارتەکیان رێك بخەن، هەرچەندە دەکرێت دامەزراندنی پارتەکـە راگەیەنـدرێ، بـەڵام دەبـێ بزووتنەوەکـە لـە چـوار چێـووەی زنجیرەیـەك شـانەی پێکـەوە بەسـتراو و رێـك بخـرێ بـە مـەرجێك ئەنـدامانی هـەر شـانەیەك جگـە لـە ئەندامانی شـانەکەی خۆیان ئەندامانی چ شـانەیەکی دیکـە نەناسـن، و نـابێ هیچ پەیوەندیەك لـە نێـوان شـانەیەك و شـانەکەی دیکـە دا هـەبێ، لـە کۆتـایی ئەم کۆبوونەوەرێکەووتن لە سەر ئـەوەی کـە نـاوی پارتەکـە بنێن - کۆمەڵـەی ژیانەوەی کورد - و بەو جۆرە کۆبوونەوەکە کۆتایی هات.

دوای ئەوە لە مانگی /١٩٤٣/٤ کۆمیتەیەکی ناوەندی لە ئەندامانی رێکخستن هاتـە هەڵبـژاردن، ئـەم بزووتنەوەیـە زۆر زوو پـەلوو پـۆپی بـۆ نێـوو خێڵـە کوردەکانی دەووروووبەری شاری مەهابادیش هاوێشت و بەرەو ناوچەکانی دیکەی رۆژهەڵاتی کوردستان.
ئا بەم جۆرە ئـەم رووداوە ناوچـەییە کـە لـە سـەرەتادا بیَ بایـەخ و بچووك دەهاتـە بەرچـاو، بـوو بـە هـەوێنی سـەرهەڵدانی بیرۆکـەی دامەزرانـدنی دەووڵەتێکی یەکگرتووی ئە تۆ، کە هەموو کورد لە ئێران و ئێراق و سووریا و تورکیا بگرێتە خۆ لە کوردستان.
ئا لێرەدا بـوو بـە هـەوێنی بیرۆکـەی کوردسـتانی گــەورە. دوای ئـەوە لـە مانگی /١٩٤٤/٨ ئەو رووداوە بە نێوو بانگە روویدا کە دەکرێت لە گەڵ – سووێندی رووتیلی – ی بە نێوو بانگدا بەراورد بکریَ :–
ئـەو شـووێنەی کـە سویسریە کۆنـەکان – سووێندی رووتیلـی – ی بـەنێوو بانگیان تێدا خوارد، وەکوو باسی دەکەن کە کەوتبووە رۆخـی دەریاچەی – ئۆریز –، ئـەم شـووێنە بە دیـواری تـاوێری بەردان و گـژووگیا تنرابـوو، لـە رۆژی چوارشەمەی بەر لە رۆژی جەژنی – القدیس ماتین – لە ساڵی ١٢٩١. ئامـادە بووان لەوێدا سووێندیان خـوارد، کـە – فوکت – ەکان وەدەرنێن و سیَ ناوچەکەی خۆیـان – شـڤیتر –، ئوری، ئـونتر ڤالـدن – یەکبخەنـەوە و لـە دەسەلاّتی بنەماڵەی – هامیسبۆرگ – رزگاری بکەن .
بـەلاّم بـە داخــەوە بەشـدارانی سـووێندە کوردیـە مێژووییەکـە، دەبوایـە سەفەرێکی زۆر گرانتر لـە هینەکەی باپیرانی سویسریەکان بکەن. تا بگەنە ئـەو شـووێنەی کـە لێبرابـوون سووێندی تێدا بخۆن، لـە بـەر ئـەوەی کـوردە بەژدار بووەکانی کۆبوونەوەکە خاڵی یەکانگیری سنووری ئێراق و تورکیـا و ئێرانیـان بـۆ ئـەم مەبەسـتە هەڵبـژارد، کـە وەکـوو سێکوچـکەی سـنوور دەکەوێتـە سـەر چیـای – دەلانپـەر – وە ، کـە ٣٦٠٠ مـەتر لـە سـەر رووی دەریاوە بەرزە و لە سەر خاکی کوردو کوردستانە لە کیشووەری ئاسیادا.
نووێنەری کورد لە رۆژهەلاّتی کوردستانی لکێندراو بە ئێران – قاسم قادری – ئەنـدامی کۆمیتـەی ناوەنـدی کۆمەڵـەبوو، نووینـەری کـورد لـە باشـووری کوردستانی لکێندراو بە ئێراق – شێخ عوبێدولا – بوو، نووێنـەری کورد لـە باکووری کوردستانی داگیر کراو لە لایەن تورکیا – قازی مـلا وەهـاب – بوو،

بەڵام بە داخەوە نووێنەری رۆژئاوای کوردستانی لکێندراو بە سووریا بەشداری نەکردبوو بە هۆی ئاکادار نەکردنیان.

١٩٤٢/٩/١٦ بڵاو کردنەوەی یەکەم ژمارەی گۆڤاری ژیانەوەی کورد لەلایەن میرحاج لە رۆژهەلاتی کوردستانی داگیر کراوی ژێر دەسەڵاتی رژێمی شا لە ئێران.

١٩٤٢/٩/١٦ دامەزراندنی رێکخراوی شۆرشگێری لە رۆژهەلاتی کوردستان راگەیاندرا ، بە ناوی کۆمەڵەی ژیانەوەی کورد- کاژیك - لەشاری مەهاباد لە رۆژهەلاتی کوردستان ، ئەویش لەئەنجمی چەند کۆبونەوەیەکدا هاتەدی ، کە کۆبوونەوەکان لە باخی-حاجی داود- لە نزیك چەمی سابلاخ بەستراو دەستەی دامەزرێنەری ئەمانە بوون- حەسەن زەرکردی ، عەبدولرەحمان ، عەبدول قادر مودەرسی ، نەجمەدین تەوحیدی ، محەمەدی نانەوازادە ، عەلی مەحمودی ، محەمەد ئەسحابی و ، چەندین کەسایەتی دیکە لەرووناکبیرانی کورد لە رۆژهەلات و لەباشووری کوردستانی لکێندراو بە رژێمی شانشینی ئێراق و داگیر کراو لە لایەن رژێمی شا لە ئێراندا .

١٩٤٢/١١/١٨ هێزەکانی سووپای سووری سۆڤیەت هێرشێکی بەرفراوانیان کردە سەر هێزەکانی سووپای ئەڵمانیا ، کە لە ئەنجام زیاتر لە ٣٠٠,٠٠٠ هەزار سەربازی ئەڵمانی گەمارۆدران لەلایەن هێزەکانی سووپای سۆڤیەت بەسەرکردایەتی مارشاڵ فۆن باولۆ ، و خۆبەدەستەوە دانی بە سووپای سۆڤیەت . لە هەمان کات بەردەوام بوونی هێزەکانی سووپای سۆڤیەت تاکوو رزگار کردنی کۆماری ئۆکرانیا.

ستالينغراد، تشرين الثاني ١٩٤٢: تحت نيران العدوّ المستعرة تقوم الوحدات السوفياتية بمهاجمة المواقع الألمانية. انها أولى الهزائم الكبرى التي مُنيا الجيش الألماني.

١٩٤٢/١١/٢٢ وولاتـــی لوبنـــان ســەربەخۆیی خــۆی راگەیانــــــد بەدەرچــوونی لــەژێر ئینتیدابی فەرەنسا ، وەك وولاتێکــــی ســـــەربەخۆی نێوودەوولـــەتی... بـــەناوی کۆمـــاری لوبنـــان ، نـــاوی پایتەختەکەی –بەیروت – ەو ژمارەی دانیشتووانی پایتختەکە ١,٩٥٠,٠٠٠ ملیۆن کەسە . هەروا ژمارەی دانیشتووانی وولاتەکە ،٣,٦٥٨,٠٠٠ملیۆن کەسە و لەو ژمارەی دانیشتووانە زیاتر لە ٥٠,٠٠٠ هەزار کەس کوردنبە پێی ئاماری سالی ٢٠٠٠ . لە وولاتەکەدا .

هەروا رووبەری خاکی لوبنان ١٠,٤٠٠ دە هەزار کیلۆ مەتر چوار گۆشەیە . هەروا چڕی دانیشتووانەکەی ، ٩١٨ کەس لە یەك میل چوار گۆشەدا . هەروا

نژادەکانی .عەرەب ٨٥٪ . ئەرمەن ١٥٪ . لە وولاّتەکەدا .

١٩٤٢/١٢/٢٩ پەیمانی نێوان هەرسێ بەر پرسانی ئێران و بەریتانیا و سۆڤیەت مۆرکرا ، کە لەلایەن ئێران وەزیری کاروباری ئێران عەلی سوهەیلی و لەلایەن باڵۆیزی بەریتانیا سێر ریدربولاردو لەلایەن باڵیۆزی سۆڤیەت سەمیرنۆف واژووکرا.
ئـەم پەیمانـەش بـەناوی – الاتجـاد – بـوو. بەلێنـەدان و بـە پاراسـتنی یەکیەتی خاك و سەروەری و سەربەخۆیی رژێمی شایەتی لـە ئێران، ئەویش بە گەمارۆدانی بزووتنەوەی رزگاری خوازی گەلانی ئێران، بە تایبـەتی گـەلی کورد لە رۆژهەلاّتی کوردستان.

١٩٤٢/١٢/٣١ کۆچـی دوایـی کەسـایەتی نـاوداری پارێزگـای هـەولێر مـەلا ئەبوبـەکر مـەلا عومەر ناسراو بە – مەلافەندی – لە شاری هەولێر.
شایانی باسە ئەم مرۆڤە لە ساڵی ١٨٦٣ لـەدایك بووە لەشـاری هـەولێر... لـە تەمەنی ٧ ساڵیدا لە مزگەووتی قەلاّی هەولێر دەستی بەخووێندنی قورئان و کتێبی ئایینی کردووەو لە ساڵی ١٨٨٣ خووێندنی مەلایـەتی تـەواوکردووە.
بـاوکی مـەلا عومـەر لـە سـاڵی ١٨٩٢ کۆچـی دوایـی دەکـات و جێگـەی بـاوکی دەگرێتـەوەو هـەموو کاتـەکانی بـۆ وانـە ووتنـەوە تـەرخان کـردووە. زیـاتر لـە ٣٠٠ فەقێی دەرس داوەو ئیجازەی علمانی بەزیاتر لە ١٠٠ کەس داوە.
ئـەم کەسـایەتیە تـاکوو لـە ژیـان مـابوو هـەولی خزمـەتکردنی خـەڵکانی کوردسـتانی داوە، بـە تایبـەتی لـە شـاری هـەولێرو دەووروبـەری بـەهۆی بوونی سامان و پارە لە ئاکامی بوونی دەسەلاّتەکەی لە شارەکەدا.

١٩٤٢/١٢/٣١ نووێنـــــەری ٢٦ وولاتـی جیهـان لـه ســـەر جـــاری گـــــەردوونی کۆمەڵـەی گـەلان لـه ســەر مـافی مــرۆڤ مۆریـــان کـــرد... لەســـەر کۆمـــەڵێك رێکەووتننامـــــە کەتیایـدا دان بـەوە نرا کە خەلك – تاك ، گەل ، نەتەوە – مافی چارەی خۆنووسی لەسەر خاکی لەدایك بووی و پێك هاتـەی خـۆی بنـێ و هەیـە... لـە بوارەکـانی سـنووری مێـژووی جـووگرافی خـــاك و رامیـــاری و نەتـــەوەیی وداب و نـــەریت و کـــەلتوورو زمـــان و مێـــژوو شارســـتانیەت و شـــووێنەواری لـــە ســـە پارچـــەخاکەی کـــە بـــوونی خـــۆی سەلملندووە لە هەموو بوارە جیا جیاکاندا .

## ١٩٤٣

١٩٤٣/١/٢١ شاری تەرابلسی پایتەختی کۆماری لیبیا ، کەووتـە ژێـر دەسـەڵاتی وولاتـانی هاوپـەیمانی بـەریتانیاو فەرەنساو ئەمـەریکا ، ئـەویش لـە ئـەنجامی هێرشـی هێزەکـانی سـووپای هەرسـێ وولات بـوو لـە ناوەراسـتی جـەنگی دووەمـی جیهانیدا .

رجال من زمارى القربة، تابعون للفوج الاسكوتلندي الحادي والخمسين، يقدمون عرض النصر في طرابلس، ويشاهد خلفهم عامود مرتفع، تعلوه ذئبة روما وهي رمز الفاشية.

| | |
|---|---|
| ١٩٤٣/١/٢٣ | لە دوای کشانەوەی هێزەکانی سووپای فەرەنساو ئەمەریکا لە شاری تەرابلسی پایتەختی لیبیا لەژێر دەسەڵاتی هێزەکانی سووپای بەریتانیا مایەوە تا کۆتایی جەنگ لە جیهاندا . |
| ١٩٤٣/٢/٢٧ | بڵاوبوونەوەی نەخۆشی تیفۆئید لەشاری کرماشانی ئێران ، لە ئاکام هەموو نەخۆشخانەکان داخران ، لە پێناو نەگرتنەوەی نەخۆشیەکە لەلایەن دکتۆرو کارمەندانی نەخۆشخانەکان ... ئەمەیە خزمەتی میللەت..!. |
| ١٩٤٣/٣/٣ | بڵاوکردنەوەی یەکەم ژمارەی گۆڤاری – رۆژا نوو– لە شاری بەیروتی پایتەختی لوبنان ، لەلایەن کوردە پەناهەندەکانی تورکیاو سووریا بەهۆی توونـدو تیژی دەسەڵاتی شۆڤینیان ، بەرامبەر بە کوردولە سەر خاکی کوردستان لە کێشووەرەکەدا . |
| ١٩٤٣/٣/٩ | لە دایك بوونی زانای گەردووناسی – یووری گاگارین – ی رووسی لە یەکیەتی سۆڤیەت ، کە یەکەم مرۆڤ بوو بەرەو بۆشایی گەردوون هەلکشا بەکەشتی ئاسمانی سەیۆز ئەپۆڵۆ لە بنکەی سەربازی لە کۆماری جۆرجیای سۆڤیەت لە وڵاتەکەیدا. |
| ١٩٤٣/٤/٣ | تابوورێکی هێزەکانی سووپای رژێمی شانشینی لە ئێراق پەلاماری ناوچەی |

بارزانیـدا لەباشـووری کوردسـتان و لـە گونـدەکان و بەتوونـدی بەرپەرچـی هێرشەکەیان درایەوە لەلایەن چەکدارە شۆرشگێرەکانی کورد لە ناوچەکەدا .

١٩٤٣/٥/٣ بڵاوکردنـەوەی یەکـەم ژمـارەی گۆڤـاری- رۆژی نـوێ- لەلایـەن کامـەران بـەدرخان لـە شـاری بـەیروتی پایتـەختی لوبنـان ، بـە پیتـی لاتینـی و گۆڤارەکەش هەفتانە بوو لە بڵاوکردنەوەیدا .

١٩٤٣/٥/١٣ سەرکردایەتی کۆمەڵەی ژیانەوەی کوردستان ، بە بەشدار بوونی ٢٥ ئەندام لـە چیای- قەلاسارمێ- لە رۆژهـەڵاتی شاری مەهاباد لـە رۆژهـەڵاتی کوردسـتان پێك هێنرا ، و هەر لەو کات بریاریدا پەیووەندی بەکار بەدەستانی سۆڤیەت بکـات ، کـە کۆمەلـە یاسـای هەمیـشەیی و پرۆگرامـی رامیـاری و ئـابووری و کۆمەڵایـەتی سـۆڤیەتی لا پەسـەندە ، ئـەویش لـە پێنـاو یارمـەتی دان و پشتگیری کردن لە مافە رەواکانی کوردو کوردستان.

١٩٤٣/٥/١٦ لەناوەنـدەکانی جـەنگی دووەمـی جیهـان ، دەسـەڵاتی یـەکێتی سـۆڤیەت بەسـەرکردایەتی – سـتالین – مەرسـوومی حکوومـەتی سـۆڤیەت دەرکـرا بەهەڵووەشـاندنەوەی ئومەمیـەتی کۆمۆنیـستی ، کـە لەلایـەن پارتـە کۆمۆنیـستەکانی جیهـان دامەزرابوو ، بەسـەرکردایەتی کەسـایەتی نـاودارو دامەزرێنەری کۆماری بوولگاریا دیمیترۆف .

شایانی باسە دیمیترۆف کرێکارێکی چاپ بوو ، ئەویش بەهۆی ئازایەتی و لێهـاتوویی بـووە کەسـایەتیەکی جیهـانی و تێکۆشـەرێکی سـەردەمی و دامەزرێنـەری دەووڵـەتێکی سۆسیالیستی لـە بوولگاریـا لـە کێشووەرەکەدا ، ئەم مەرسوومەش لەلایەن لیژنەی جێ بەجێکردنی ئومەمیەتی شیوعی بوولە جیهاندا.

١٩٤٣/٧/١٢ دەست پێکردنـی شـەڕی زرێپۆشـی هێزەکانی سووپای سووری سۆڤیەت و هێـرش کردنـە سـەر سـووپای ئـەڵمانیا لـە بـاکووری شـاری کورسـك... بەشـکاندنی گەمارۆدانەکـەی کـە لەلایـەن هێزەکـانی سـووپای ئـەلمانیا بەشـکاندنی هێزەکـانی سـووپای ئـەڵمانیا ، بـە رزگـار کردنـی شـارەکانی کـاراکۆف لـە ٨/٢٣ و سمۆلنـسك لـە ٩/٢٥و کیـف لـە ١١/٦ رزگـار کـران لـە ناوچـەکەدا ... ئیتر بووە هـۆی بـەزینی هێزەکانی سوپای ئـەلمانیا بەرامبـەر

هێزەکانی سوپای سۆڤیەت تا سەرکەوتنی بەسەر ئەڵمانیا لەبەری ئەورووپای ڕۆژهەڵاتدا .

سلاح سوفياتي مضاد للدبابات يستهدف أحد مدافع الميدان الالمانية خلال المعركة الطاحنة التي تدور رحاها في قطاع اورلوف (ORLOV) ـ كورسك (KOURSK).

١٩٤٣/٧/١٢ سەرکردەی بزووتنەوەی ڕزگاری کورد مستەفا بارزانی ، دوای ماوەیەك لە دەست بە سەری . بەیارمەتی ئەندامانی سەرکردایەتی پارتی هیوا لەشاری سلێمانی ڕزگار کراو چووە شاری شنۆی ڕۆژهەڵاتی کوردستانی داگیر کراو و ژێر دەسەڵاتی ڕژێمی شا لە ئێران لە هەرێمەکەدا .

١٩٤٣/٧/٢٨ سەرکردەی کورد مستەفا بارزانی لە ناوچەی شنۆی ڕۆژهەلاتی کوردستان گەراوە ناوچەی بارزان ، دوای ئەوە هەولیدا بە دروستکردنی هێزێکی چەکداری و دەستی کردن بەشۆرش دژی ڕژێمی شانشینی لە ئێراق وبەریتانیا ، بەهۆی پاشگەزبوونەوەیان لە بەڵێنەکانیان بەرامبەر بەمافەکانی کورد لە باشووری کوردستان.

١٩٤٣/٨/١٥ بلاو کردنەوەی گۆڤاری هاوار ، کە کۆرپەیەکی نازداری بەدرخانیەکانە، کەجەلادەت بەدرخان سەرپەرشتی دەرکردو لەماوەی یانزە ساڵ ٥٧ ژمارەی لە شام لێ بەچاپگەیاند ، کە بەنهێنی دەگەیشتە باشووری کوردستان و ڕۆژهەلاتی کوردستان و باکووری کوردستان... کە ٢٣ ژمارەی بەپیتی هیجاو

لاتینی بووەو ٣٤ ژمارەی بەپیتی لاتینی بووە ، کە لە چاپخانەی تەرەقی بەچاپیگەیاندووە ، کە هەمووی لەسەر یەك ٨٠٨ لاپەرە بووەو رۆڵی گرنگی هەبوو لە بەهێز کردن و بەرز کردنەوەی هەستی نەتەوایەتی و نیشتمانی و خەبات لە پێناو کوردو کوردستاندا.

١٩٤٣/٩/٣ شانشینی ئیتالیا راگرتنی شەڕی لەگەڵ هاوپەیمانان راگەیاندو لە هەمان کات شەڕی دژ بە ئەلمانیاو یابان راگەیاند ، کە بووە هۆی سەرکەووتنی هاوپەیمان لەجەنگی دووەمی جیهانیدا .

١٩٤٣/٩/٨ هێزەکانی سووپای ئەلمانیای فاشی رۆمای پایتەختی ئیتالیای داگیر کرد لە ناوەراستی جەنگی دووەمی جیهان ، تاکوو رۆژی ٦/٤ ی هەمان ساڵ و دوایی لێی کشاوە رووەو وولاّتەکەیدا.

١٩٤٣/٩/١١ کۆمەڵێك لەسەرکردە کوردەکان لە رۆژهەلاّتی کوردستان ، جگە لە عومەر خان و سەرتیپ ئاغاو تاهر ئاغا – لە باخی ئووستانداری لە پارێزگای ورمێ کۆبوونەوەو ئووستاندار پێی ڕاگەیاندن ، کە لەمەودوا نووێنەرانیان لەگوندەکان لایەن و داوای مولّکانەی زەوی لەجووتیاران نەکەن و نابێ چەکدار بێنە ناوشارو مەڕوماڵات و قاچاخی پێووەنەکرێت بۆدەرەوەی شارەکە لە هەرێمەکەدا.

١٩٤٣/١٠/٢ راپەرینە مەزنەکەی شانەدەر بەسەرکردایەتی مستەفا بارزانی هەڵگیرسا دژی رژێمی شانشینی لە ئێراق و بەریتانیای داگیرکەری کوردو کوردستان.

١٩٤٣/١٠/٩ دەست پێکردنی گفتووگۆ لە نێوان سەرکردەی کورد مستەفا بارزانی و سەرکردایەتی رژێمی شانشینی لە ئێراق ، لە بارەی چارەسەر کردنی کێشەی کوردو مافە رەواکانی لە باشووری کوردستانی لکێدراو بە ئێراق.

١٩٤٣/١٠/١٢ کۆچی دوایی مەلاّی گەوورە لە قەزای کۆیسنجق کە ناوی تەواوی مەلا محەمەدی کۆیە و لە ساڵی ١٨٧٦ لەشاری رۆناکبیرانی کۆیەی سەر بەپارێزگای هەولێر لە دایك بووە لە باشووری کوردستاندا.

١٩٤٣/١١/٢٨ گرێدانی کۆنگرەی سێ رۆژە لە تارانی پایتەختی ئێران ، بە ئامادەبوونی سەرۆکی ئەمەریکا – رۆزفلت– و سەرەك وەزیرانی بەریتانیا –چرچل– و سەرۆکی سۆڤیەتی – ستالین– لەو کۆبوونەوە پشتگیری خۆیان بۆ ئێران

راگەیاندو ، ئێرانیش دووپاتی داواکاری سەربەخۆیی ئێرانی لە سەرۆکی ئەمەریکا کردەوەو ستالینیش بەلێنی دا یارمەتی دەسەلاتی شا بدات لەرووی سەربازیو ئابووری ، لەو کات لەپێناو گەمارۆ دانی بزووتنەوەی رزگاری کورد بوو لە رۆژهەلاتی کوردستان.

ستالین، رۆزڤێلت، چەرچەل

١٩٤٣/١٢/٦ بلاوکردنەوەی یەکەم ژمارەی گۆڤاری – ئەستێره – لە لایەن جەلادەت عالی بەدرخان لە سووریا.

١٩٤٣/١٢/٢٣ مستەفا بارزانی نامەیەکی ئاراستەی بالوێزی بەریتانیا کرد ، کەتێیدا روونیکردەوه ، کە ئەو لێبووردنە گشتیەی کە لەلایەن رژێمی شانشینی لە ئێراق بۆ بارزانیەکان دەرکراوه ، هەمووی فرتووفێلە لە رامیاریەتی داگیرکەری شانشینی لە ئێراق ، لە سەرخاکی کوردستان بەپشتیووانو هەماهەنگی حکوومەتی بەریتانیا.

١٩٤٣/١٢/٢٥ گۆرینی کابینەی سەرەك وەزیرانی شانشینی لە ئێراق ، لەلایەن نوری سەعید . کە لەم کابینەیە وەزیرێکی کورد تیا بەشداریکرد بەناوی– ماجد مستەفا – کە رۆلی سەرەکی هەبوو لەچارەی کێشەی کورد لە باشووری کوردستان .

## ١٩٤٤

١٩٤٤/١/١ وەزیری کاروباری دەوڵەتی شانشینی لە ئێراق ، کەسایەتی ناوداری کورد ماجد مستەفا سەردانی سەرکردەی بزووتنەوەی رزگاری کورد مستەفا بارزانی کرد ، لە پێناو سەرکەوتنی گفتووگۆیەکانی لەسەر کێشەی کورد...شایانی باسکردنە کە ماجد مستەفا بەشداری لە شۆرشی شێخ مەحمودی حەفیدی کردووە... چەندین هەوڵ و تەقەلای دیکەی داوە ، لەپێناو ئاسانکاریکردنی چارەی کێشەی کورد لە باشووری کوردستانی لکێنراو بەئێراق.

١٩٤٤/١/١٥ لەرێنماییەکانی ئەنجوومەنی وەزیرانی رژێمی شانشینی لە ئێراق بریاری دامەزراندنی ئیدارەی تایبەتی ، بەسەر بەخۆی کوردی دا لەچوار چێوەی سنووری ئێراق ، لە هەرێمی باشووری کوردستانی لکێنراو بەئێراق.

١٩٤٤/١/٢٥ رژێمی شانشینی لە ئێراق بریارێکی راگەیاند ، بەبێ ئەوەی نوری سەعید لەو کاتە بوونی هەبێت ، بەهۆی گەشتەکەی بۆ دەرەوەی ئێراق . کە لە حەوت خال پێك هاتبوون.

١٩٤٤/٢/١٣ کۆچی دوایی نیگارکێشی ئازارەکان– ئێدوارد مۆنگ – لە شاری ئۆسلۆی پایتەختی نەرویژ ، پاش ئەوەی بەرهەمێکی زۆری هونەری لەتابلۆی رۆنی و ئاوی و هێلکاری و هەلکۆلدراو بەجێدەهێلێ... شایانی باسە ئێدوارد کریستیان مۆنگ لەباوکێکی پزیشکی سەربازی لە سالی ١٨٣٦ لەیەکێك لەکێلگەکانی شاری لۆتۆن لەدایك دەبێ و دوای سالێك لەدایك بوونی خێزانەکەی دەگوازنەوە شاری ئۆسلۆ لەوێ جێنشین دەبن لە ولاتەدا .

١٩٤٤/٢/٢٢ سەرکردایەتی رژێمی شانشینی لە ئێراق ، میوانداری مستەفا بارزانی کرد لەگەڵ شاندە یاوەرەکەی ، کە لە ١٢ کەسایەتی کورد پێك هاتبوون . کە یەك لەوانە سەرەك هۆزی هەرکی فەتاح ئاغا بوو، لەو میوانداریە مستەفا بارزانی چاویکەووت بە بالوێزی بەریتانیا ، کە بووە هۆی دەربرینی نارەزایی عەرەبە ناسیۆنالستەکان لە ئێراق و چەندین ولاتانی دیکەی عەرەبیدا.

١٩٤٤/٢/٢٦ لە دوای سەردانەکەی مستەفا بارزانی بۆ شاری بەغدای پایتەختی ئێراق ، بە فەرمی لەگەڵ بالوێزی بەریتانیا کۆبۆوەو باس لەکێشەو مافەکانی کورد

کـرا ، کەســەدا ســاڵە دەچەوســێنرێتەوە لــە هــەردوو لایــەنی نەتــەوەیی و نیشتمانی و جگە لە پشتگوێ خستنی باری ئابووری و ئاوەدان کردنەوە لـە باشووری کوردستانی لکێنراو بەئێراق ، هەروا لـە گەڵ چەندین کاری دیکە وەك راگواستن و بەعەرەبکردن و هێنانی خێزانی عەرەبە بیانیەکان بۆ ناوچەی هەرێمی کوردستان...؟...!

١٩٤٤/٣/٢٥ وەزارەتـی نـاوخۆی یـەکێتی سۆڤیەت ٦٠٨ خێزانـی کـوردی گوواستەوە بـۆ ناوچەکانی – تسالکین – کە ژمارەیان زیاتر لە ٣٢٤٥ کەس دەبوو هـەروا بـۆ بۆرچانلین – قـەرەیازی – کۆمـاری جۆرجیا، تـەنیا بنەماڵـەکانی بەشـداری و کەم ئەندامی و زیان لێکەووتووی شەڕی گەوورەی نیشتیمان و فەرمانبەرانی پــەروەردە و قوتابیــانی پــەیمانگاکان نــەبێت ، کــە بەهەموویانــەوە ٣١ بنەماڵەبوون.

١٩٤٤/٤/١٢ کۆمیسیاری ناوخۆی – وەزیری ناوخۆ– ی کۆماری سۆسیالیستی جۆرجیا کاراناڵزە – فەرەنادزە – نامەیەك ئاراستەی بیریا . ل . دەنوسیٚ :– لـەماوەی ئەم چەند ساڵەی دوواییدا .

هەنـدێ لـە دانیشتووانی کـوردو ئازەری کۆمـاری جۆرجیـا ، کـە لـە کـاری کــەلخۆز دووره پــەرێز کــەوتوون و ســەربەخۆ کاروبــاری خۆیــان بــەجێ هێشتووەو هاتونەتـە شـاری تەبلیسـی – پایتـەختی جۆرجیـا – و بەمـەیلی خۆیـان لەدەوورووبـەری شـار لـە گەڕەکـەکانی سـابوورتالوو–گـەرما–گـالی – بەرزاییـەکانی لـوتکین –مناتۆپـسکی – تۆپیـك و دەوورووبـەری قەبرسـتانی کوتـائیس دایـان کووتـاوەو نیـشتەجێن و بەشـێکی زۆریـان خـەریکی کـاری گشتی و کۆمەلایەتی بوون .

لـە ترسـا چـوونەتە تەبلیـسی، بۆئــەوەی ڕایـان نـەگووێزن بـۆ سـیبیریا و کازاخستان و ئاسیای ناوەڕاست و شووێنی دیکە لە ناو وولاتەکەدا .

مۆلەتۆڤ، بێریا، مالینکۆڤ، ستالین

١٩٤٤/٤/١٤ سەرکردەی کورد مستەفا بارزانی لە نامەیەکیدا ، کە ئاراستەی بالویێزخانەی بەریتانیا لە شاری بەغدای کرد ، لە نامەکەدا لۆمەی دەسەڵاتدارانی ئێراق و بەریتانیای کرد ، لەبارەی جێ بەجێ نەکردنی بەڵێنەکانیان و پرکردنی سەربازگەکان لە باشووری کوردستان بەسەربازو چەك و تەقەمەنی هەمە جۆری ئەوکات لە هەرێمەکەدا.

١٩٤٤/٤/١٥ لە کۆتاییەکانی جەنگی دووەمی جیهان ، تێکۆشەرو خەباتگێری فەرەنسی – شارل دیگۆل – حکوومەتی کاتی فەرەنسای راگەیاندو لە هەمان کات بەریتانیاو ئەمەریکاو یەکیەتی سۆڤیەت دان پێنانی خۆیان بۆ حکوومەتی فەرەنسا راگەیاند... ئەمەش لەدوای رزگار بوونی فەرەنسا بوو لە ژێر داگیرکەری هێزەکانی سووپای ئەڵمانیای هتلەری لەلایەن هێزەکانی سووپای هاوپەیمانانندا.

١٩٤٤/٥/١٨ لە دوای کشانەوەی هێزەکانی سووپای ئەڵمانیا لە ناوچەکانی قرم کە دانیشتووانەکەی نزیکەی ٣٠٠,٠٠٠ هەزار کەس دەبوون ، کە زمان و رۆشنبیری خۆیان هەبوو ، چوونە ناو نەتەوەکانی دیکەی کە هاوکاری

ئەلمان بوون . سەرۆکی باڵای دەسەڵاتی یەکیەتی سۆڤیەت ستالین لە بڕیارێکیدا ئەو نەتەوانەی هەڵووەشاندەوەو لە٦/٢٥ی هەمان ساڵ ، لە مەرسومێکیدا کۆماری قرمی بە فەرمی هەڵووەشاندەوەو دانیشتووانەکەی بە سەرکۆمارەکانی دیکە دابەش کرد بەتایبەتی تەتەرەکان.

١٩٤٤/٦/٣ سەرەك وەزیرانی رژێمی شانشینی لە ئێراق لە سەر خاکی گەلانی ئێراق بە تایبەتی گەلی کورد – نوری سەعید – دەستی لە حکوومەتەکەی کێشاوەو لەهەمان کات حەمدی پاچەچی کابینەی نوێی وەزارەتەکەی دامەزراند ، کە پۆستی هیچ وەزارەتێك نەدرا بەکەسایەتی کورد ماجد مستەفا ، بە هۆی هەلوویستەکانی نەتەوەیی لەبەرگری کردن لە کێشە رەواکانی گەلی کورستان.

١٩٤٤/٦/٣ دامەزراندنی ئەنجوومەنی وەزیران لە ئێراق بەسەرکردایەتی سەرك وەزیرانی ئێراق حەمدی پاچەچی لە دوای کەووتنی حکوومەتی نوری سەعید لە ئێراقدا.

١٩٤٤/٦/٦ سەرکردایەتی وولاتانی هاوپەیمان بڕیاری جێبەجێکردنی کاری هێرش کردنە سەر کەناری هەرێمی نۆرمەندی فەرەنسیاندا ، لە پێناو دەرکردنی هێزەکانی سووپای نازیٚ ئەڵمانیا لە فەڕەنسا ، کە ئەم ڕۆژەش ناوزەند بوو بەمێژووی – D-day– لە جیهاندا.

١٩٤٤/٦/٦ سەرەك وەزیرانی رژێمی شانشینی لە ئێراق نوری سەعید بەفەرمی دەست لەکار کێشانەوەی خۆی لەکابینەی حکومەتەکەی راگەیاند بەهۆی بارودۆخی ئێراق و ناوچەو داواکانی کوردیش پشتگویٚ خران لە وولاتەکەدا .

١٩٤٤/٦/٦ هێزەکانی سووپای هاوپەیمانان بەسەرکردایەتی ئەمەریکا پەلاماری ناوچەی نۆرمەندیان دا لە باکووری رۆژئاوای فەرەنسا ، کە بنکەی هێزەکانی فریاکەووتنی سەربازی ئەڵمانیا بوو.
کە ئەمەش بووە خاڵی سەرەکی لە پەلاماردانی ئەورووپا لە لایەن هاوپەیمانان لە دوای داگیر کردنی نۆرمەندی لەلاین هێزەاکانی داگیرکەری ئەلمانیا ، کە ٥٠٠٠ کەشتی جەنگی لیٚ بەکار دەهات بۆ کاری جەنگی و

ڕێگە خۆشکەر بوو لەپێناوفروانکردنی سنووری داگیر کردن.

١٩٤٤/٦/١٧ لــــه ڕێگـــــەی ڕاپرســـی گـــەلی ئیـــسلەندە بـــە دامەزرانـــــدنی ئەنجوومـــــەنی پینــــــــک و ڕاگەیانـــــدنی ســـەربەخۆیی بـــە ناوی کۆماری ئیسلەندە لە کێشوەرەکەدا.

کە ناوی پایتەختەکەی –رکیافیل– ەو ژمارەی دانیشتووانەکەی،١٣٠,٠٠٠ هەزار کەسە .

هـەروا ژمـارەی دانیـشتووانی وولاتـەکـەی ،٣٩٠,٠٠٠ هـەزار کەسـە . هـەروا ڕووبـەری خـاکی وولاتـەکـەی ، ١٠٣,٠٠٠هـەزار کیلـۆ مـەتر چوار گۆشـەیە . هەروا چڕی دانیشتووانەکەی ، ٩ نۆ کەس لە یەك میل چوار گۆشەدا . هـەروا

نژادەکانی ، لە رەچەڵەکی نەرویژیە ، لە گەڵ سەڵتیەکان . لە وولأتەکەدا .

١٩٤٤/٧/٣١ بەپێ ی بڕیاری ژمارە/ ٦٢٧٩ کە ژمارەی ئەو کوردانەی کە دەبوو بە زۆر لە کۆماری جۆجیا ڕابگوێزرێن، ٨٦٩٤ کورد بوون ، هەروا بڕیاریش درا ، کە کوردی کۆمارەکانی دراوسێ لەگەڵ جۆرجیا بگوازرێنەوە لە ناوچەکەدا .
شایانی باسە وەزیری ناوخۆی یەکێتی سۆڤیەت – بێریا– لە ٧/٢٤ ی هەمان ساڵ ، داوای پەسەندکردنی بڕیاری گوواستنەوەی دانیشتووانی ناوچە سنوورنشینەکانی جۆرجیای لەگەڵ تورکیادا کرد ، کە ١٦٧٠٠ بنەماڵەی کوردو تورك و خیمشین بوون ... بیانووش بۆ ئەم کارە باشترکردنی بارودۆخی پاراستنی سنوورەکانی بووە لە نێوانیاندا .
شایانی باسە ستالین ئەم بڕیارە تاوانبارانەی مۆرکرد بە ڕێکەووتن لەگەڵ ڕژێمی تورکیا و ئێران ... هەروەك چۆن ڕژێمی بەعسی لە ئێراق و ڕژێمی تورکیا بڕیاری گوواستنەوەی ٢٠ کم بەدرێژایی سنووری نێوانیان ، خێزانە کوردەکانیان لەسەر سامان و ماڵ و حاڵی خۆیان گوواستەوە بۆ کۆمەڵگا زۆرە ملێیەکانی بە زۆر درووست کراو لە پارێزگای هەولێرو سلێمانی لە هەرێمی باشووری کوردستان.

١٩٤٤/٧/٣١ لە کەوتنە خوارەوەی فرۆکەی فرۆکەوانی فەرەنسی – ئەنتوان دۆستانت ئیکزوبری – لە سەر شاری – مرسیلیا – ی فەرەنسا و کەوتنە ناو دەریاو بووە هۆی گیان لە دەست دانی لە سەر ناوچەکەدا.
جێگەی روونکردنەوەیە کە ئەم فرۆکەوانە لە هەمانکات نووسەر بووە و دانەری کتێبی – ئەمیرە بچووکەکە – بووە، کە ئەم کتێبە زیاتر لە ٨٠ ملیۆن دانەی لێفرۆشاوە لە وولأتە جیا جیاکانی جیهان. لەو کاتەی کە ئیازبری لە ٧/٣١ لە سەر پشتی فرۆکەکەی بوو، لە پێناو پشکنینی ناوچەکە دەسوورایەوە بەسەر ناوچەی – میرسیلیا – بە دۆزینەوەی رێگەی باش بۆ ئاسان کاری کردنی هێزەکانی سووپای فەرەنسا و هاوپەیمانان دژی هێزەکانی سووپای هیتلەری فاشی لە کۆتاییەکانی جەنگی دووەمی جیهان.
لەو کاتە بوو کە لە سەر ئاسمانی باشووری فەرەنسا لە کاتژمێر ٤٥/٨ ئیکزوبری خۆی و فرۆکەکەی بزربوون و هەتا لە شاشەی رادارەکانی

فرۆکــەوانی بــوونی نــەما و ئــیتر تــاکوو ســاڵی /١٩٩٨، ئــەویش لــە لایــەن ڕاوچــیەکی شــاری میرســیلیا لــە ســەر کــەنارەکانی، ئــەویش بــە دۆزینــەوەی خەناوکەکەی کە لە زێر دروستکرابوو بە هەلکەنین ناوی خۆیی و خێزانەکەی کۆنــسۆبلۆی لــە ســەر بــوو لــە گــەڵ پاشمــاوەی جـل و بــەرگی ئیکزوبــری سەربازی، هەروا دوای ئەوە پاشماوەی فرۆکەکە لە دەریا دۆزرایەوە. ئینجا زانرا کە ئیکزوبری کەوتۆتە ناو دەریا و گیانی لە دەست داوە لە ناوچەکەدا.
لە گەڵ ئەوەشدا هـۆی کەوتنـە خـوارەوەی فرۆکەکـەی ئیکزوبری لـە ئـەنجامی پێکەووتنی مووشەك بووە لە لایەن فرۆکەوانی ئەلمانیا - هۆرست ریبرت - کە لە ساڵی /٢٠٠٨ دانی بە لێدانی فرۆکەکەی ئیکزوبری نـاوە، ئـەویش لـە ئـەنجامی نووسـینی کتێبێك لـە سـەر ژیـانی خـۆی و ئـەو دان پێنانـەی بـووە هـۆی هەڵووەشـاندنەوەی ئـەو هـەموو بیروو بـۆ چوون و پرسـیارانەی کـە لـە دوای وونبــوونی ئیکزوبــری هــاتبووە کایــەوەو جێگــەی ســەر ســورمانی دەسەڵاتداران و ڕووناکبیران و نووسەران بوو ن لە فەرەنساو جیهان.
هەروا ئـەم کەسایەتیە نووسـەرو دانـەری چەندین کتێب بـووە بەر لـە کۆچی دوایی بە هۆی ئەم کارەساتە ئەویش :-
زەوی مـرۆڤ /١٩٣٩ - ئـەمیرە بچووکەکە/١٩٤٢- فرۆکـوانی جـەنگ/١٩٤٢ - پۆستەی باشوور/١٩٢٨ - لە گەڵ چەندین نامیلکە و بابەتی دیکەدا
سەرچاوە:- دووبەی ڕۆشنبیری - ژمارە/٤٠ /٢٠٠٨

١٩٤٤/٩/٣٠ ئاژانسی دەنگ‌وباسی فەرەنسا بارەگای سەرەکی لە پاریسی پایتەخت بوو ، کــە ئــەو دەزگایــە لەســاڵی١٨٣٥ دامــەزرا بــە نــاوی ئاژانــسی دەنگوباســی فەرەنسای نێوو دەووڵەتی و ڕۆڵی گرنگی لەبەهێزکردنی ڕاگەیاندن نواند لە هەموو بوارەکانی ڕاگەیاندن لە وولاتەکەو لە جیهاندا .

١٩٤٤/١١/٤ لەســەر نــەژادی نەتــەوەیی تــورکی میــسخیتی، بــیرووڕای جیــاواز هەیــە، لەســەدەی پانزەهەمــدا ، کــە خــاکی میــسخیتی بــە شانــشینی ئاخالتــسیخ ناســراوە، بــەپێی کۆمیتــەی پارێزگــای دەووڵــەتی یــەکێتی ســۆڤیەت زیــاتر لــە ١٠٠ هەزار کەسیان لە ٢٠٩ گوندی میسخیتیەوە گواستراوەتەوە بۆ ئاسیای

ناوەڕاست ، بەبیانووی پاراستنی سنوورەکانی جۆرجیا لەگەڵ تورکیا ، شایانی باسە میسخیتیەکان بەشێکن لە نژادی تورک و حکوومەتی جۆرجیاش ماوەی پێ نەدان بگەڕێنەوە و هەربە ئاوارەیی لە کۆماری ئۆزباکستان مانەوە.

١٩٤٤/١١/١٥ لە بروسکەی رایاڤ وەزیری پاراستنی کۆماری جۆرجیای سۆسیالیستی بۆ وەزیری پاراستنی یەکێتی سۆڤیەت – بێریا – دەنووسێ سەبارەت بە جێ بەجێکردنی دەستوورەکەی ، کە تیایدا هاتووە :– ئۆپراسیۆنەکە لە بەرەبەیان دەستی پێکردووە بۆ کاتژمێر ١٨ ی ئێوارەی هەمان ڕۆژ ٢٥٥٩ کەس لەکورد سوواری سێ قافلەی شەمەندەفەر کراون و ئەوانی دیکەش کە ماون خەریکی کۆکردنەوەو ناردنیانین.

١٩٤٤/١١/١٧ لە بەرەبەیان تاکوو کاتژمێر ١٦ ی ئێوارە / ٨١٣٢٤٥ کەس لە کوردو تورک و خیمشین بە ٢٥ قافلەی شەمەندەفەر بەڕێ دەکرێن لەگەڵ قافلەی شەمەندەفەری /١٠٥١ دا ، کە دوو فالگۆن قەرەجیشمان ناردووەو بارودۆخیان سامناک بوو ، کە بێ پێڵاو بێ تفاق و خواردەمەنی و بێ هیچ شتێك بۆ مانەوەو بژێوییان .

شایانی باسە ئەم کارە ئەنجامدراوانە بە ئاگاداری و بەتایبەت ستالین بووە ، بەمۆری ئەو ، ئەو کارانە ئەنجام دراون . هەروا ئەم کاری گوواستنەوە لە ٩ ناوچەی کۆماری جۆرجیا کۆکراونەتەوە و بەپێی ڕاپۆرتی کۆزینتسۆن سەرۆکی بەشی ڕاگوێزراوە تایبەتەکانی وەزارەتی ناوخۆی یەکێتی سۆڤیەت ، کە ٦٠٠٠٧ ئاژەڵی شاخدارو ٢٣٧٧٧ گای مێ و ١٨٢٠٥ گای نێر و ئاژەڵی شاخداری بچووك ٣٧٤٠٤ ، ٣٠٠٤٩ پەز ، لەناوچەکانی تاجارو ١٧٦٦٣ پەزو باڵدارو مریشك و قاز و ٢٨١٧٠٠٠ وەرگیراو تۆمارکرا ، هەروا لەوانە ٨٢٥٢ هەزار تەنی گەنم و ٣٢٢٦ هەزار تەنی گەنمە شامی یان لێ وەرگیراوە، کە ئەمە هەمووی سامان و خاوەنداریەتی کورد بوونە لە هەرێمەکەدا ...بەڵام کورد ....! ...!

ئەم کارەش لە ١١/٢٨ ی هەمان ساڵ ئاراستەی ستالین و مالینکۆف و مۆلەتۆف کراوە ، ئەنجامەکەی ڕەزامەندی لەسەرکردن ، بەپێی ڕاپۆرتەکە . کە لەلایەن وەزیری ناوخۆی سۆڤیەت – بێریا– بەرز کرایەوە ...لەگەڵ

ئەوەشدا ئەوانەی نێردراونە بۆ کۆماری ئۆزباکستان

ئـەویش لـە ٧ هـەرێم و ٤٣ ناوچـە جێگیرکـراون ، کـە ١٠٨١٣ پیـاو ١٦١٢٧ ئـافرەت ، کـە کـۆی دەکاتـە ٥٣١٦٣ هـەزار کـەس ...هـەروا تـاکوو ١١/٣٠ ی هەمان ساڵ ژمارەی گوواستراوەکان لـە نتورك و خیمشین بەتایبەتی کورد ، دەگاتـە ٩٤٩٥٥ هـەزار کـەس ، ئەمـە لەلایـەك و لەلایـەکی دیکـە بـەپێی سـەرژمێری وەزارەتـی نـاوخۆی یـەکێتی سـۆڤیەت ژمـارەی مـردووی ڕاگوواسـتراوەکان تـا مـانگی ١٩٤٨/٧ دەگاتـە ١٤٩٨٥ کـەس ، کـە ١١/٨ ڕادەکات.

١٩٤٤/١٢/٧ بەدەسـت پێشخەری ئەمـەریکا کـۆنگرەی شـیکاگۆ گرێـدرا ، لـە پێنـاو مـۆرکردنی ڕێکەووتننامـەی گوواسـتنەوەی فرۆکـەی مـەدەنی نێوودەوڵـەتی ، ئـەو ڕێکەووتنـە دانـی تـەواوی بەسـەربەخۆیی وولاتـانی جیهـان نـا ، لـە بـەکارهێنانی ڕێگـای ئاسمـانی وولاتـانی دیکـە ، ئـەویش لـەپێناو بـەرەو پێشبردنی فرۆکەوانی نێوودەوڵەتی مەدەنی و بازرگانی لەجیهاندا .

## ١٩٤٥

١٩٤٥/٢/١٥ کۆمەڵـەی ژیانـەوەی کوردسـتان لـە کارەکـانی هەمەلایـەنی ڕاگەیانـدن و ڕۆشـنبیری و پـەروەردەکردن چـالاکی هـەبوو، بـەڵام دەزگـای دامـەزراوی رامیاری و سەربازی بۆ بەڕێووە بردنی وولات و پاراستنی دەستکەووتەکانی نـەبوو ، جگـە لـە چـەککردنی چـەکدارەکانی شـارەوانی مـەهاباددا ، کـە بەهانـدانی دوو سـەرکردەی کۆمەڵـە لەلایـەن خـەڵکی مـەهابادەوە ئـەنجامی دا... پێـداگرتنی کۆمەڵـە لەسـەر دامەزرانـدنی دەووڵـەتی کوردسـتان لـە ڕۆژ

هەڵاتی کوردستان ، جێگەی ڕەزامەندی سۆڤیەت و هاوپەیمانان نەبوو ... چاوەڕوانی کۆتایی شەڕی دووەمی جیهانی دەکرا.

١٩٤٥/٢/٢٠ لە دوای وەرگرتنی دەسەڵاتی کۆمۆنیستەکان بەسەرکردایەتی ماتلیس دکۆرس لە–مەژەر ، هەنگاریا– کە ئەم وولاتە بەچەندین قۆناخی شەڕی یەك لە دوای یەکدا تێپەڕیە، کە بووە هۆی ئەوەی کە شەڕ لەنێوان هێزەکانی سووپای مەژەرو هێزەکانی سووپای سۆڤیەت بووەستێ و بەرەو ئارامی و ئاوەدانکردنەوەو گەشە کردن هەنگاو بنێ لەسەر شێووەی یەکیەتی سۆڤیەت لەهەموو بوارە جیاجیاکاندا .

١٩٤٥/٢/١١ پارتی دیموکراتی ئەزەری لە ئێران حکوومەتی کۆماری ئازربایجانی ڕاگەیاند بە سەرکردایەتی جەعفەر بشاوری لە ناوچەکەدا.

١٩٤٥/٢/١٢ بەرپابوونی ڕاپەرین لە ڕۆژهەلاتی کوردستانی داگیرکراوی ژێر دەسەڵاتی ڕژێمی شا لە ئێران ، کە یەکگرتووی بەرگری کورد بووە هۆی ڕەتکردنەوەی تەواوی ڕامیاریەتی داپلۆسین و بە زۆر مل کەچ پێکردن لەلایەن ڕژێمی فارس لە ئێران.

١٩٤٥/٢/١٢ سەرکردەی کورد مستەفا بارزانی ، لێژنەی ئازادی پێك هێنا . کە یەکەم ئامانجی ئەو لیژنەیە ڕزگار کردنی باشووری کوردستان بوو لەڕێگەی ئاشتیانەو هەلسووراندنی کاروباری شۆرش ، کە لەو کاتەش ئەفسەرە کوردەکانی ناو پارتی هیوا کاریان لە ناو لێژنەی ئازادی دەکرد لە هەرێمی باشووری کوردستان.

هجوم الحلفاء الغربيين على ألمانيا.

۱۹٤٥/۳/۱٦ ڕاگەیاندنی کۆچی دوایی نووسەرو ڕووناکبیرو شاعیری ناوداری ئێراقی و عەرەبی و جیهان – مەعروف ڕەسافی – لە شاری بەغدای پایتەختی ئێراق و گۆڕەکەی لە گۆڕستانی – ئەعزەمیە – لەتەك هاوڕێی شاعیری – جەمیل

سدقی زەهاوییدا.

جێگەی ئاماژە پێکردنە کە – مەعروف عەبدولغەنی – ناســـراو بـــە مـــەعروف رەسـاق، لـە سـاڵی ١٨٧٥ لەگـەرەکی –قراگـول – لـە شـــاری بەغـــدا چـــاوی بـەجیهان هـەڵهێناوە...لـە نـژاد کـوردن و باوکی لـە عەشـــیرەتی – جـــەبارە – بـووە. کـە عەشـیرەتێکی کوردیـەو تـاکوو ئێـستاش پێــــی دەگووترێـــــت عەشیرەتی جەباری و لە پارێزگای کەرکوك نیشتەجێن.

ئـەم شـاعیرە نـاودارە لایـەنگری شۆرشـی شـێخ مـەحمودی حەفیـد بـووە لـە هەموو بوارەکانیدا دژی هێزەکانی سووپای بەریتانیای داگیرکەر... سەرەتای خووێندنی بەفێربوونی قورئانی پیرۆز بووە بەیارمەتی و پاڵپشتی – فاتمـە جاسـم – ی دایکـی، کـە لـە نـژاد عـەرەبی بـەدەوی بـووە. دوای فێربـوونی نووســین و خووێندنـەوە لـە پـۆلی یەکـەمی سـەرەتایی لـە قوتابخانـەی رەشـیدیەی سـەربازی وەرگـیراوەو لـە بـارودۆخێکی نـا لـەبار خووێنـدنی تەواوکردووە، دوای ئەوە دامەزراوە بەمامۆستای قوتابخانەی سەرەتایی .

دوای ئـەوە بۆتـە مامۆسـتا لـە پـەیمانگا لـە زمـانی عـەرەبی... لـە دوای راگەیانـدنی دەسـتووری عوسمـانی لـە سـاڵی ١٩٠٨ خـاوەنی رۆژنامـەی – ئەقدام – ی تورکی لە ئەستەمبۆڵ بووەو داوای لێکردووە بابەتی بە زمانی عەرەبی بنووسێت . مامۆستا رەسافیش بەرەو شاری ئەستەمبۆڵ چووە بۆ کارکردن لەو رۆژنامەیەدا. دوای ئەوە لە بواری پەروەردەکاری کردووە.

مـەعروف رەسـاق لـەدوای مردنـی خـۆی – ١٧ – دانـراوی وەك کـەلتوور جێهێـشتووە و بـووە بـە سەرچاوەیەکی رەسـەنی شـیعرو نووسـین لـەبواری ئەدەبدا لە ئێراق و وولاتانی عەرەبی و جیهان.

١٩٤٥/٣/٢٢ دامەزراندنی کۆمکاری عەرەبی– الجامعة العربية – لە نێوان شانشینی میسر، شانشینی ئێراق / شانشینی ئوردن ، شانشینی یەمەن، کۆماری لوبنان، شانشینی سووریا، شانشینی سعوودیە لە شاری قاهیرە راگەیاندرا

شایانی باسە کە زیاتر لە ٢٢ دەوڵەتی عەرەبی سەربەخۆی سنووری و دەسەڵاتی هەیە ، بەڵام تاکوو ئێستا نەیان توانیە یەکگرتووی هەلوویستیان هەبێت .

لەگەل ئەوەشدا ئێراق و سووریا و جەزائرو میسرو مەغریب و لوبنان و سوودان ، کە وولاتەکانیان لە چەندین نەتەوەو ئاینی جیاجیا پێك هاتوون، بەتایبەتی ئێراق و سووریا ، کەخاکی باشوورو رۆژئاوای کوردستانی پێوە لکێنراوەو بەو پەری بیروو بۆ چوون و هەلوویستی نامرۆڤانە مامەلە لەگەڵ کوردو خاکی کوردستاندا دەکەن .

ئەویش لە بەعەرەبکردن و راگوواستن و داگیر کردن و هێنانی عەرەبە رەوەندو بەدوی بیابانەکانی سعوودیەو نیشتەجێ کردنیان لە ئێراق ، لەسەر خاکی کوردستان بە تایبەتی لە هۆزە عەرەبەکانی شەمەرو جبوورو عەمدان و لهێب و چەندین هۆزی دیکە... هەروا سووریاو ئێران و تورکیا لە شێوازێکیدیکەدا.... ؟ !

١٩٤٥/٣/٣٠ کۆمەلێك لە رۆشنبیران و کەسایەتی ناوداری کورد بەلگەنامەیەکی مافەکانی کوردیان ئاراستەی کۆنگرەی سانفرانسیسکۆ کرد ، کە لەدوای تەواو بوونی کتابی باسیلی نیکتین بوو، کە خۆی لەسێ خالی گرنگ گرتبوو ئەویش :–

١– دان نان بە مافی رەوای کورد لەسەر خاکی خۆیدا .

٢– ئەنجامدانی دانیشتنێکی تایبەتی کۆنگرە کە ، لە بارەی کێشەی کورد بێت لە کوردستان .

٣– پێك هێنانی لێژنەیەکی نێوودەوڵەتی ، لەپێناو لێکۆلینەوە لەسەر کێشەو مافەکانی کوردو خاکی کوردستان.

١٩٤٥/٤/٨ بلاوکردنەوەی راگەیاندنی یاسای گشتی لێبووردن لەلایەن رژێمی شانشینی لە ئێراق ، بەڵام بەپێی برگەو خاڵەکانی ئەو یاسایە، ئەو سەربازو پۆلیس و فەرمانبەرانەی نەدەگرتەوە ، کە لە دامو دەزگاکانی میری کارەکانیان بەجێ هێشتبوو بۆ بەشداری کردن لە شۆرشی کورد لە باشووری کوردستاندا .

١٩٤٥/٤/١٤

بـــــەپێی فـــــەرمانی وەزاری ژمـــارە ٢٢٠/ چـــەندین شـــووێن لـــە شارۆچـــكەی عـــــەفرین بەشـــووێنەوار ناســـــاندران هـــــەروەك نووسـەر دكتـۆر – شـــــەوقی شـــەعس – لـــە پەرتوكەكـــەی بـــەناوی – حەلـــەب مێژووەكـــەی و لایەنـــە شووێنەوارەكانی تۆماری قەزای كرتاخ ، باس لـەوە دەكات ودەتوانرێ بـەم جـۆرە بـاس لـەو شـووێنەوارانە بكرێـت، كـە بەشـووێنەواری سـووری ئەژماردەكرێ .

تاوەری حەیدەر ١– بەشێك لەكەنیسەی – نروعربوا – ٢– سومعە ج س. / ٣– كەنیسەی گەروە ٤/ – كەنیسەی كاتیرداكی – ئەم شووێنانەی – كمار داگیركەر بۆی هەیە نۆژەن و وەبەرهێنانی تیابكات. ج س ١– كەنیسەی/ ٢– جواسـق /٣– شـووێنەواری قیوربـە/ ٤– قـەلأی كالوتـە/ ٥– فـاخرتین /٦– دەرگەی گەوورە.

هـەروا لـە گـەڵ چـەندین نـاوی دیكـە، كـە تۆمـاركراوە لەلایـەن حكوومـەتی فەرەنـسا لـە سـاڵی ١٩٨١... جگـە لـەوەی كـە وەزارەتـی رۆشـنبیری سـووری هەنـدێك گـردو تەپۆلكـەی وەكـوو گـردو تەپۆلكـەی شـووێنەواری ئـەژماركرد، كەچـی لـەو تەپۆلكـەو گردانـە فـەرامۆش كـراون وەك شـووێنەواری دێـرین ئەژمارنەكران. كە ئەم تەپۆلكانە لە ناحیەی – جزیریش – ناویان هاتووە، كە بریتین لە تەپۆلكەی – ئیسكان – عەقرەب – جمە – سلور – جاجی – هنۆ – جزیریە – فریریە. قربە. عین. گوركان. ئەمەو وێرای دەیـان گـردو تەپۆلكـەی

دیکه له ناحیەو ناوەندین عفرین  که ژمارەیان گەلێك زۆرن.
جێگـەی ئامـاژە پێکردنـه کـه ناوچـەی عفـرین دەکەوێتـه بەشـی رۆژئـاوای کوردستانی لکێنراو به سووریا. شارێکه جوانی و شووێنەواری تێدایه که بۆ سـەردەمه جیاجیاکـان دەگەرێتـەوە، ئـەو پارچـه زەویـه بچووکه نیـشتیمانی مـرۆڤ بـووە لـه دێـر زەمانـەوە کـه کـۆنترین مرۆڤـی  تیـا ژیـاوە، کـه بـه – هۆموارکتـۆس – ناسـراوە بـەر لـه نزیکـەی ملیۆنێـك سـاڵ پیایـدا تێپـەربووە بەرەو رۆژهەلاتی ئاسیاو له رۆژئاواش بەرەو ئەوروپا .
له ناوچەی عەفرین ئەشکەووتی – دودییە- هەیە. لەوێ مرۆڤی- نیاندەرتال – پـێش سـەد هـەزار سـاڵ بەر لـه ئێـستای تیـا ژیـاوە... هـەروا نزیکـەی چـل هەزار ساڵ پێش ئێستا مرۆڤی ژیریش لەوێدا ژیاوە لەناوچەی – عینـدارا – که یەکەمین گووند بووە کشتووکاڵیان لێ دامەزراندووە.
هــەروا داهێنانــەکانی شارســتانی وولاتــی نێــوان دوو رووبارەکەشــیان لـەخۆگرتبوو. هـەروا لـەو ناوچـەیەدا چـەندین گـەل و دەووڵـەت هـەبوونـه. وەك له سەرچاوەکانی مێژوو ناویان هاتووە وەك:-
هۆریـەکان – میتانیـەکان –- حـسیەکان – ئاشـووریەکان – ئارامیـەکان – گەلی ئۆرانۆو –  میدیاکان –فارس و یۆنانیەکان – رۆم- عەرەکان لەنەتـەوەو دەووڵەتی دیکەشی گەیشتوونەته ئەم ناوچەیه وەك :-
تورکـەکان – خـاچ پەرسـتەکان – مەگۆلـەکان – ئەمـەو جگـه لەدانیـشتووانه رەسـەنەکە، بەلام بەداخـەوە بـەهۆی پیشـەی خۆپەرسـتی و بـەر چـاوتەنگی و هەستی شۆڤینی نەتەوەی عەرەب و دەسەلاته یەك لەدوای یەکەکانی سـووریا لەلایــەن پــارتی بەعــسی لــه ســووریا، بــەردەوام بوونــه لەشــێوواندن و رەشـکردنەوەو وێرانکردنـی بـەدەیا شـووێنەوار لـەم بەشـه کوردسـتان و لـه کوردسـتان.

١٩٤٥/٤/٢٠ دامەزراندنی یەکەم ئەنجوومـەنی ئاشـتی لەلایـەن وولاتـه سـووێند خۆرەکـان ، واتـه ئـەو وولاتانـەی هاوپـەیمان و تـەوەری شـەڕ بـوون لەجـەنگی دووەمـی جیهاندا.

١٩٤٥/٤/٢٥ له دوای دامەزراندنی ئەنجوومەنی ئاشتی لەلایەن وولاته سووێند خۆرەکان ، دامەزرانـدنی کۆمەڵـەی گـشتی نەتـەوە یـەکگرتووەکان راگەیانـدرا لەســەر

جیهاندا.

١٩٤٥/٤/٣٠ لـە کاتـژمێر ٣,٥ی پـاش نیـوەڕۆ ، هیتلـەرو خۆشەویستەکەی ئیڤان براون ، بە دەستی خۆیان ،خۆیان کووشت ، لەبارەگا پۆلایینەکەی خۆی لەژێر باڵاخانەی بارەگای ڕاوێژکاران ، دوای خۆکووشتنیان پاسەوان دڵسۆزەکەی تەرمی هتلەرو خۆشەوویستەکەی لە قۆرتێکی قوڵ لە گۆرەپانی

باڵەخانەکە شاردنیەوە ... دوای خۆکووشتنی هتلەر . یاریدەرەکەی ، دۆنیز

جێگەی گرتەوەو بڕیاری خۆ بەدەستەوەدانی هێزەکانی سووپاو حکوومەتی فاشی ئەڵمانیای بۆسۆڤیەتو هاوپەیمانان ڕاگەیاند لە وولاتەکەید .

جێگەی باسکردنە کە ئەدلف هتلەر لە ١٨٨٩/٤/٢ لە شاری بوورنوو لە وولاتی نەمسا لە دایك بووە .

کە شارۆچکەیەکی بچووکە لە سەر کەناری زێی ئالاَن ، کە ئاوەکەی لە ئەلمانیا بەرەوئەو ناوچەیە لە نەمسا دێتە خوارێ .

دوای ماوەیەك لە لە دایك بوونی هتلەر خێزانەکەی ملیان دەگوازنەوە شاری – لینز – لە نەمسا ، لەو شارە چووە قوتابخانەی سەرەتایی کە قوتابییەکی سەرکەوتوو بوو لە خوێندندا . بەلاَم دوای ئەوەی چووە قوتابخانەی ناوەندی بەرەو تەمەڵی دچوو لە خوێندن ، ئەمەش بە هۆی حەز نەکردنی لە خوێندن ، بەلکوو حەزی لە بواری هونەری بوو زیاتر ، دوای ئەوە هتلەر لە ساڵی ١٩٠٧ چووە شاری ڤیینا لە پێناو هێنانە دی ئاواتە هونەریەکانی لەو شارەدا .

بەلاَم ئەو ئاواتانەی نەهاتە دی بە هۆی سەر نەکەووتنی لە تاقیکردنەوەکاندا لە کۆلیژی هونەرە جوانەکان ، . بە هۆی هەژاری و کەم دەرامەتی هتلەر کاتەکانی ژیانی لە ژوورە بچووکەکان و لە گەرەکە هەژارەکان دەبردە سەر و چەندین جار شەوانە لە سەر تەختە دارەکانی ناو باخەکان و شەقامەکان شەوانی ژیانی بەسەر دەبرد . دوای ئەوەی کە پارتی نازی لە ئەڵمانیا لە هەڵبژاردنەکاندا لە ساڵی ١٩٣٢ لە ٤٠٪ دەنگی بە دەست هێنا و بووە گەوورەترین پارت لە ئەڵمانیادا .

دوای ئەوە سەرۆکی ئەڵمانیا – پۆڵ فۆن هایندنبرگ – هتلەری بە ڕاوێژکاری ئەڵمانیا دامەزراند . دوای ئەوەی کە هتلەر پۆستی ڕاوێژکاری گرتە دەست ڕامیاریەتی تاکرەوی گرتە بەر لە سەر ئەڵمانیا و بەرەو جیهان لە پەیووەندیەکانیدا.

١٩٤٥/٤/٣٠ بلاَوکردنەوەی یەکەم ڕۆژنامەی ئازادی لەلایەن پارتی کۆمۆنستی ئێراق ، دوای ئەوە بوو بە ڕێگەی کوردستان ، کە لەلایەن لیژنەی هەرێمی پارتی کۆمۆنستی ئێراق بلاَو دەکراوە ، دوای ئەوەش لەلایەن پارتی کۆمۆنستی کوردستان لەبلاَو کردنەوەی بەردەوام بوو لە باشووری کوردستان ، سەرەڕای پچرانی ماوە ماوە بەهۆی بارودۆخی ئێراق و کوردستان .

شایانی باسە کە ڕێگەی کوردستان لەڕۆژنامە هەفتەییەکانی هەرێمی کوردستان ڕۆڵی بالآی هەبووەو هەیە لەبەڕۆشنبیر کردن و بەرز کردنەوەی ئاستی نەتەوەیی و نیشتمانی و بەرگریکردن لەمافەکانی گەلی کوردستان ، ئەویش بە دۆزینەوەی چارەی هەموو ئەو گرفتانەی کە هاتوونەو دێنە بەر داهاتووی گەلی کوردستان ، لە هەموو بوارە جیاجیاکانی ڕامیاری و ئابووری و ڕۆشنبیری و کۆمەلایەتی کەلتوورو داب و نەریت و مێژووو زمان شووێنەوارو شارستانیەت و پەیوەندیە هەمەلایەنەکان لە کوردستاندا .

١٩٤٥/٤/٣٠ لە دوای بەرزکردنەوەی ئالآی چەکووش و داسی درووشمی یەکیەتی سۆڤیەت لە سەر تەلاری دەسەلاتی ئەڵمانیای هتلەری- رایخشتاخ- لە بەرلینی پایتەختی ئەڵمانیای ئەو کات ، کە هتلەری نازی بەخۆی خۆی کووشت ، لە دوای سەرکەووتنی یەکیەتی سۆڤیەت بەسەر ئەلمانیا ، دوای ئەوە ئەڵمانیا دابەش کرا بەدوو ئەڵمانیای رۆژهەلات بە پشتگیری یەکیەتی سۆڤیەت و ، ئەڵمانیای رۆژئاوا بە پشتگیری ئەمەریکا تاکوو کۆتایەکانی سالآنی ١٩٨٩ بەیەکگرتنەوەیان.

'هانة الكبرى بحق الكبرياء النازي: جندي روسي يرفع العلم السوفيتي فوق الرايخناغ (REICHTA' المجلس التشريعي الالماني.

١٩٤٥/٥/١ لـه كـارێكی بوێرانـەدا – بفـرۆڤ و، كانتیاریـا– كـە دوو سـەربازی سـووپای سووری سـۆڤیەت بـوونو لـە كـوردی كۆمـاری ئازربایجـانی سـۆڤیەت بـوون ، ئـەوان توانیـان ئـالای سـۆڤیەت لـە سـەر تـەلاری دەسـەڵاتی ناوەنـدی بـاڵای ئەڵمانیای هتلەری رایخشتاخ بەرزكەنەوە لە بەرلینی پایتەختی ئەڵمانیادا.

١٩٤٥/٥/٢ شـاری بـەرلینی پایتـەختی ئـەڵمانیا لەلایـەن هێزەكـانی سـووپای سـووری سۆڤیەت لە كۆتایی جەنگی دووەمی جیهان داگیركرا .

ريمس (REIMS) في السابع من أيار ١٩٤٥: الجنرال غودل (JODL) في الوسط، يوقّع استسلا الجيوش الألمانية للحلفاء دون قيد أو شرط.

١٩٤٥/٥/٧ كاتژمێر ٢,٤١ دەقیقەی پاش نیوەڕۆ ئەڵمانیا چەکی خۆ بە دەستەوەدانی لەگەڵ هاوپەیمانان مۆرکرد ، لەلایەن –ڕیمس –بەبێ مەرج لە کاتی کۆبوونەوەی لەگەڵ ژەنەڕاڵ گۆدل ، کە ئەو ڕێکەووتنەش لەناوەندی شەوی هەشتی ئەیار جێبەجێکرا بەمۆرکردنی کۆتایی بە خۆ بە دەستەوەدانی ئەڵمانیا لەبارەگای سەرکردایەتی سۆڤیەت لەشاری کار شورست ، لەنزیك شاری بەرلینی پایتەختی ئەڵمانیا ، بە ئامادە بوونی مۆرکراوان – فیلد مارشال کایتل لەلایەن ئەڵمانیا ، بەئامادە بوونی ماریشاڵی سۆڤیەتی جۆکۆف و مارشاڵ جۆتیدیرو ژەنەڕاڵ سیاتزو ژەنەڕاڵ دی لاتردی تاسینی ، لە شارەکەدا .

١٩٤٥/٥/٨ بەرپابوونی قەسابخانەی ستیف ، ئەویش بە ئەنجامادنی لەلایەن هێزەکانی سووپای فەرەنسا ، کە زیاتر لە ٤٥,٠٠٠ هەزار هاووڵاتی لەگەلانی جەزائر شەهید کران ، کە ئەمەش بووە هۆی ئەوەی کە چەندین ڕێکخراوی نهێنی دابمەزرێن ، لە پێناو بەرپاکردنی شۆرشی جەزائیرو سەرکەووتنی ، لە ئەنجام بووە بەرەی رزگاری نیشتمانی جەزائر لە وولاتەکەدا .

١٩٤٥/٥/٩ کۆتـایی هـاتنی جـەنگی دووەمـی جیهـان ، لـە نێـوان یەکیـەتی سـۆڤیەت و ئـەڵمانیا و هاوپـەیمانان ، بەسـەرکەووتنی هێزەکـانی سـووپای سـووری سۆڤیەت و وولاتانی تەوەری هاوپەیمان لە جیهاندا .
جێگەی ئاماژە پێکردنە کە هێزەکانی سووپای سووری سۆڤیت لەم رۆژەدا توانی شاری بەرلینی پایتەختی ئەڵمانیای هتلەری داگیر بکات و ئەو رۆژە کرا بە رۆژی جەژنی سەرکەووتن بە سەر فاشیزم و سەر جەمی چەپرەوانی جیهان . کە هەموو ساڵێك یادی ئەم رۆژە دەکرێتەوە .
لە هەمان کات پێشبرکێیەکی زۆر توند لە نێوان هێزەکانی سووپای سۆڤیەت و ئەمەریکا بۆ داگیر کردنی شاری بەرلین ، هەر چەندە کەوتنی ئەڵمانیا کۆتایی تەواوەتی بە جەنگی جیهانی دووەم نەهێنا لە سەر چەندین لایەن لە جیهاندا .

١٩٤٥/٥/٢٣ دەست پێکردنی جەنگی هندی چینی بە گۆرینەوەی پەلاماردانی یەکتری لە رێگـەلی راگەیانـدن و دوایـی ، لـەنێوان هێزەکـانی سـووپای کۆلۆنیـالی فەرەنـسی و شۆرشـگێرانی – ئـەلفیت مینـە– کـە وردە وردە پـەرەی سـەندو بـەرەو شـەڕی سـەنگەری هـەنگاوینا لـە شـاری هـابفۆنگ لـە دوای سـاڵێك لەوململانێیەدا.

١٩٤٥/٥/٢٤ لـە ئاهـەنگی سـەرکەووتنی یەکیـەتی سـۆڤیەت بەسـەر ئـەڵمانیا لەجـەنگی دووەمـی جیهـان ، سـتالین پیرۆزبایی لـە گـەلی رووسـیا کـرد ، نـەك گـەلانی یەکیـەتی سـۆڤیەت ، کـە گـەلی رووسـیای بەئومـەی سـەرکردە دەزانـی لـە یەکیەتی سۆڤیەتدا ، لەگەڵ چەندین بابەتی دیکە لەوتارەکەیدا ، کە ئەمـەش سـەرتایەك بـوو بـۆ دروسـت بـوونی کێـشە لـەنێوان چ دەسـەلاتی کۆمـارە جیاجیاکـان و چ پێـك هاتـەکانی نەتـەوەیی گـەلانی یەکیـەتی سـۆڤیەت لـە کێشووەرەکەدا .

١٩٤٥/٦/٢٦ مۆرکردنی پەیمانی سانفرانسیسکۆ، لەهەمان کات بەپێی ماددەو برگـەکانی ئەو پەیمانە ، رێکخراوی یونسکۆی سەر بە نەتەوە یکگرتووەکان دامـەزرا ، لـە پێنـاو پەرەپێـدان و گەشـە پێکردنـی بـواری پـەروەردەیی لەجیهانـدا ، بەتایبەتی لە وولاتانی هەژارو تازە پێگەیشتوو لەجیهانی سێیەمدا.

١٩٤٥/٧/١٦ یەکەم تاقی کردنەوەی بۆمبی ئەتۆمی لە بیابانی – نیومەکسیکۆ– ئەنجامدرا

لەلایەن ئەمەریکا ، کە ئەمەش بووە هۆی وەرگیرانی لێکدانەوەی رامیاریەتی جیهان لە گۆرینی هێزی تەرازو لە بواری ئابووری و سەربازی بەهێز ، لە دەستپێکردنی رامیاریەتی جیهانگەری لە هەموو بوارە جیاجیاکان لە جیهاندا.

١٩٤٥/٧/١٩ جێگری راوێژكاری رامیاری مەندووبی سامی بەریتانیا لە پارێزگای هەولێر كابتن جاكسۆن ، راپۆرتێكی بەرز كردەوە لە بارەی باری هەندێ ناوچەی كوردستان ، كە پەیوەندی بەناوچەی بارزان هەبوو لە جمووجۆڵی چەكدارانی گوندەكانی ناوچەكەو گرنگی دان بە چاندنی درەختی سێو لە ناوچەی روستێی سەر بەقەزای چۆمان لەباشووری كوردستان.

كە ئەمەش دەبێتە هۆی گرنگی پێدان بە جوولەكەكان لەو ناوچەیەدا، جاكسۆن گوندی رۆستێی دەست نیشان كرد ، بۆ ئەو كارەی كە لەو كات دانیشتووانی گوندی رۆستێ ١٠٠ماڵ بووە ، لەگەڵ ٣٠ ماڵی جوولەكە،...بەڵام مستەفا بارزانی ئەو بیروو بۆچوون ونەخشەیەی رەتكردەوەو دژی وەستا ، ئەویش بە هۆی نیازە خراپەكان و كاردانەوەی لەسەر داهاتووی باشووری كوردستان.

١٩٤٥/٧/٢٣ مستەفا بارزانی كۆبوونەوەی لەگەڵ – ئەلكرندمرید– ئەنجامدا لە بارەی كوردو ناوچە جیاجیاكانی كوردستان ، لە ناوەندەكانی رامیاریەتی نوێی ناوچەو هەرێم و جیهان ، لە دوای جەنگی دووەمی جیهان لە هەرێمەكەدا .

١٩٤٥/٨/٢ گرێدانی كۆنگرەی بۆتسدام لە رۆخەكانی شاری بەرلینی ئەلمانیا لە دوای خۆبەدەستەوەدانی ئەلمانیا ، بەهۆی سەرنەكەووتنی ئەلمانیا لەجەنگی دووەمی جیهان.

كە سەرۆكی ئەمەریكی ترومان و سەرۆكی سۆڤیەتی ستالین و سەرۆك وەزیرانی بەریتانیا چرچل بەشداریان لەو كۆنگریەدا كرد ، كە بەكۆنگرەی شێوازی دەسەڵاتی ئەلمانیاو دا هاتووی چۆنیەتی دەسەڵاتەكەی دیار كرا لەپەیووەندیە نێو دەوولەتیەكاندا .

١٩٤٥/٨/٤ رژێمی ئیمپرتۆریەتی یابان خۆ بەدەستەوەدانی بەجیهان راگەیاند لەسەر پشتی باریجەی – میسوودی– لە كەنداوی تۆكیۆ بەهۆی سەرنەكەووتنی لە جەنگی دووەمی جیهاندا .

١٩٤٥/٨/٥ هێزەكانی سووپاو پۆلیسی رژێمی شانشینی لە ئێراق لەپارێزگای هەولێر لە

باشووری كوردستان ، به پالپشتی هێزەكانی سووپای بەریتانیا هێرشیان كرده سەر ناوچەی بارزان له باشووری كوردستان و رووبەرووبوونەوەیان لەگەڵ هێزی چەكدارانی ناوچەكەوبەرگری كردن له ناوچەكه ، له ئەنجام بووه هۆی توانینی دەست به سەراگرتنی مەڵبەندەكانی پۆلیس لەمێرگەسۆرو زێبارو بلەو شێروان مەزن داگیر بكەن ، ئەویش بەریسوا كردنی هەڵوویستی رژێمی شانشینی له ئێراقدا .

١٩٤٥/٨/٦ خەباتی رامیاری ئافرەتانی كورد دەستی پێكرد وەك ئامینەخان كه بەرپرسی ئافرەتانی پارێزگای كەركوك بوو له باشووری كوردستان، دوای ئەو حەبسەخانی نەقیب لەپارێزگای سلێمانی له ١٩٤٦/٤/٢، دوای ئەویش خاتوو مینەخانی هاوسەری پێشەوا قازی محەمەد لەشاری مەهاباد له رۆژهەلاتی كوردستان ، لەگەڵ خەدیج مەجدی ریحان و كوپرای چەند ئافرەتێكی دیكەی ناودارله كوردستان .

١٩٤٥/٨/٦ دامەزراندنی پارت و گروپ و رێكخراو كۆمەڵەی پیشەیی جەماوەری له پارێزگای سلێمانی له باشووری كوردستان لەلایەن كەسایەتی و رووناكبیرانی پارێزگاكەدا .

١٩٤٥/٨/٦ یەكەم بۆمبی ئەتۆمی لەشاری هێرۆشیمای یابانی درا له لایەن هێزەكانی سوپای ئاسمانی ئەمەریكا... كه بووه هۆی گیان له دەستدانی ٧٣٠,٠٠٠ هەزار هاوولاتی له هەموو تەمەنێكی جیاداو زامدار بوونی ١٦٠,٠٠٠

هەزار هاوولاتی لە ماوەی /٩ چرکەدا، ئەویش بەوێرانکردنی شارەکە زیاتر لە٨٠٪، کەبەدرەنـدەترین کـارە تیرۆریـستەکانی دەسـەلات دەژمێردرێـت لـە جیهاندا.

جێگە روونکردنەوەیە کە ئامانجەکانی ئیدارەی ئەمـەریکا هەر لـە سـەرەتای دامەزراندنیـەوە لـە ١٧٧٥/٧/٤ تـا ئێـستا بـەردەوام بـوون و بـووە لـە خـۆ زاڵکـردن بەسـەر وولاتـانی جیهـان لـە هـەموو بوارەکـان بـە تایبـەتی لـە بواری ئـابووری و بازرگـانی و سـەربازی لـە رێگـەی بتـەوکردن و بـە هێزکردنـی رامیاریەتی جیهانگەری ، لە هەمان کات دروستکردن و پێك هێنـانی گـروپ و رێکخـراوی تیرۆرسـتی و یارمەتیـدانی لـە رێگـەی پیـاوانی سـیخووری ئیدارەکەیدا .

ئەویش لە پێناو شێواندن و ئاڵۆز کردن و لە باربردنی ماف و ئەرك و ژیانی گـەلانی لاواز و بـێ توانـای ئـابووری و ریگـە گـرتن لـە دەوولـەتانی دژ بـە رامیاریەتی خۆی و هاوپەیمانەکانیدا . هەروا کردەوەو کردارەکانی ئەمـەریکا راستگۆن لە جێ بە جێکردنی ئامانجەکانی ئیمپریالیزم ، دژ بە هـەموو بیروو بۆ چوون و هەڵوویستەکانی مرۆڤایـەتی لـە هـەموو بـوارە جیـا جیاکـان ، بـە تایبـەتی لـە بـواری نەتـەوەیی و نیـشتیمانی و نـژادی و زمـان و مێـژوو و کەلتوورو داب و نەریت و شارستانیت ، لە جیهاندا .

هـەروا جگـە لەمـەش لێـدانی ئاشـکرا بـە وێرانکردنـی ناوچـەو گونـد و شارۆچـکەو شـارو وولات ، کـە نموونـەش :- لێـدانی هـەردوو شـارەکانی هیرۆشیماو ناکازاکی یابانی بوون لـە ١٩٤٥/٨/٦ و ١٩٤٥/٨/٩ ، بە بریـاری سەرۆکی ئەمەریکا – تۆرمـان – و راوێژکارانی ... هـەروا سـەرۆکی ئەمـەریکا – تۆرمان – رەزامەندی لـە سـەر دامەزرانـدنی بنکـەی ئاسمـانی بۆ هێزەکـانی سووپای ئەمەریکا لە – زەهران –دا لە ١٩٤٥/٩/٢٨ ، کە ببێتە یەکەم بوونی سـەربازی ئەمەریکا لـە دوورگەکە .هـەروا سیخوورەکانی ئەمـەریکا لـە سـاڵی ١٩٤٦ توانیـان دەسـت بە سـەر ٢٥٠,٠٠٠هـەزار تـەن لـە گـازی – تـایۆن – دا بگرن لە ناوچەی جۆرجیان لـە نەمسا دا . لـە جیـاتی ئـەوەی ئـەو جـۆرە مادە هەڵووەشـێنێتەوە ، بـەلام بـە دزی هـەر هـەمووی بـۆ ئەمـەریکا گوواسـتەوە لـە پێناو سوود وەرگرتن لەو مادەدا.

هـەروا بە ئامۆژگـاری و پـشتیووانی ئەمـەریکا لـە سـاڵی ١٩٤٩ شـەڕێکی نـاو

خۆیی لە یۆنـان هەڵگیرسـاند ، کە لـە ئـەنجام بووە هۆی کـوژرانی زیـاتر لـە ١٥٤,٠٠٠ هەزار کەس و زیندانی کردنی زیاتر لە ٤٠,٠٠٠ هەزار کەس و لە سێدارەدانی زیاتر لە ٦٠٠٠ هەزار کەس بە پێی یاسای سەربازیدا .
کە ئەویش بالوێزی ئەمەریکا لە یۆنان – ماکویگ – دانی بەو تاوانە نا ، کە هەموو پێداوویستیەکانی ئەو شەڕە ناو خۆییانەی یۆنان لە لایەن ئەمەریکا ئامادە کرابوون ، ئەویش لە نێوان ساڵەکانی ١٩٤٧ – ١٩٤٩ . هەروا بە ئامۆژگاری و پشتیووانی ئەمەریکا لە ١٩٤٩/٥/٣ لە ڕێگەی موخابەراتی ناوەندی ئەمەریکا کودەتای سەربازی لە سووریا ئەنجام درا بە سەر کردایەتی – حوسێن زەعیم – کە کودەتایەکەش لە بالوێزخانەی ئەمەریکا لە سووریا پیلانی بۆ کێشرابوو لە شاری دیمەشق . هەروا هێزەکانی سووپای ئەمەریکا لە ١٩٥٠/٦/٢٦ پەلاماری کۆماری کۆریای باکووری لە بەرژەوەندی کۆماری کۆریای باشوور . لە کێشووەرەکەدا .
هەروا ئیدارەی ئەمەریکا لە ١٩٥٢/٥/١٠ پشتگیری ژەنەراڵ – باتیستای – دا بە هەڵسانی بە کودەتای سەربازی دژی دەسەڵاتی کۆماری ، دوای وەرگرتنی دەسەڵات ڕژێمێکی دکتاتۆری لە کووبا چەسپاند کە بەستراو بووەوە بە ئەمەریکا ... هەروا بە ئامۆژگاری و پاڵپشتی ئەمەریکاو دوورکەوتنەوەی یەکیەتی سۆڤیەت لە یارمەتی دانی کۆماری کوردستان ، لە ئەنجام هێزەکانی سووپای ئێران توانیان لە ١٩٤٦/١٢/١٧ ئەم ۆکۆمارە لەناو ببەن و پێشەوا قازی محەمەد و هەڤاڵانی دەسگیر بکەن ... هەروا بە ئامۆژگاری ئەمەریکا لە ڕێگەی – کیم ڕوزفلت – مەفید – تیوودور ڕۆزفلت – کودەتایەکی سەربازی لە ١٩٥٣/٨/٩ ئەنجام بدەن بە ناو لە بردنی حکوومەتی – موسەدەق لە ئێران.
هەروا ئیدارەی ئەمەریکا لە ڕگەی موخایەداتی ناوەندی توانی لە ١٩٥٤/٦/٢٧ کودەتایەکی سەرازی لە گواتیمالا ئەنجام بدات ، دوای ئەوە هەڵسا بە بۆردوان کردنی پایتەخت و چەند ناوچەیەکی دەووروبەری شارەکە بە فرۆکەی جەنگی سەربازی ئەمەریکا .
هەروا ئەمەریکا توانی لە ١٩٥٨/٧/٢٥ وولاتی لوبنان بە هێزی سووپا داگیر بکات ، لە ڕێگەی – ئیستوولی شەشەم– ی ئەمەریکا بۆ پشتیووانی کردن لە حکوومەتی – کمیل شەمعوون – ئەمەش لە ئاکامی شۆڕشی ١٩٥٨/٧/١٤

بوو لە ئێراق بە رووخاندنی رژێمی شانشینی لە ئێراق و راگەیاندنی رژێمی کۆماری لە ئێراقدا .

١٩٤٥/٨/٧ بە هۆی هێرشی درندانەی هێزەکانی سووپای رژێمی شانشینی لە ئێراق بە پشتیووانی هێزەکانی سووپای ئاسمانی بەریتانیا بۆ سەر ناوچەی بارزان ، بووە هۆی ئەوەی ، کە مستەفا بارزانی و هەڤاڵەکانی بەرەو رۆژهەلاتی کوردستانی داگیر کراوی ژێر دەسەلاتی رژێمی شا لە ئێران هەلکشێن لە هەرێمەکەدا .

١٩٤٥/٨/٨ لەدوای هێرشەکەی سووپای رژێمی شانشینی لە ئێراق بۆ سەر ناوچەی بارزان ، فرۆکە جەنگیەکانی سووپای بەریتانیا ناوچەی بارزان و دەوروبەری لەباشووری کوردستان بۆردومان کرد لە ناوچەکەدا .

١٩٤٥/٨/٩ دووەم بۆمبی ئەتۆمی لە شاری ناکازاکی یابانی درا لەلایەن هێزەکانی سووپای ئاسمانی ئەمەریکا... کە بووە هۆی گیان لەدەست دانی ٢٥٠,٠٠٠ دووسەدو پەنجا هەزار هاوولاتی لە هەموو تەمەنێکی جیاواز و زامدار بوونی ١٤٦,٠٠٠ هەزار هاوولاتی لە ماوەی /١٠ چرکەدا ...؟...!.

گەر بلێم رژێمی سەرمایەداری ئیمپریالیزمی ئەمەریکا سەرچاوەو یارمەتی دەرو دامەزرێنەری هەموو جۆرە تیرۆرو تیرۆریستانە لە دوای رژێمە عەرەبە ئیسلامیەکان لەجیهان. واتە جیاوازی لە نێوان ئیمپریالیزمی ئەمەریکاو ئیمپراتۆریەتی ئیسلامی ، نیە تەنیا لەبیروو بۆچوونەبێت لە جیهاندا.

یەکەم :- داگیرکردنی سامان و بەرووبوومی وولاتان بەتایبەتی سامانی نەوت لە جیهاندا.

دووەم :- بەداگیرکردنی خاك و بە عەرەب کردن و راگوواستنی نەتەوەو هێنانی عەرەب بۆ سەر خاکی گەلان ، لە پێناو دەرچوون لەبیابانی عەرەبی ، لە بەر ئەوەی خاکی رەسەنی عەرەب گەرسامانی نەوت نەبێ ، جێگەی ژیانی تیا نیە هەتا بۆ ئاژەل و گیانەوەر لە ناوچەکەیاندا .

١٩٤٥/٨/١٤ به هۆی لێدانی ئەو دوو بۆمبە ئەتۆمیە لە لایەن ئەمەریکا لە دوای جەنگی دووەمی جیهان و خۆبەدەستەوە دانی یابان ، کە دوای ئەوە رووی کردە بواری ئابووری هەمەجۆری تەلنۆلۆژیای سەردەمی لەپەرسەندن و گەشەکردنێکی بێ وێنە لە جیهانی ئێستا ، کە یەکەم وولاتە لە بواری ئابووری و پیشەسازی بازرگانی لەجیهاندا.

١٩٤٥/٨/١٥ دوای رازی بوون و خۆ بەدەستەوەدانی هێزەکانی یابان لە سەر رازیبوونی دەوڵەتە هاوپەیمانەکانی ئەمەریکاو یەکیەتی سۆڤیەتی رێکەوتن لەسەر دابەشکردنی کۆریا بۆ هێڵی/ ٣٨ هێلی/ ٣٨ کە کۆریا ئەم هێڵەی بۆ دانراو باکووری هێلی/٣٨ بەر یەکیەتی سۆڤیەت کەوت و خوارووی هێلی ٣٨ بەر هێزەکانی ئەمەریکا کەوت.

ئەوە بوو ئەم هێڵە بووبە هێڵێکی سیاسی سنووردار، کە هەر یەکە ئیدارەیەکی جیاوازیان پێکهێناو دوو بەشی لێ دروست بوو کە زۆر هەوڵیاندا لەوکاتەی لە ١٩٤٥/٨/١٠ رژێمێکی سیاسی لێدروست بکەن ، بەڵام بێ هودە بوون بە گەیشتنە ئەنجام و کۆریای باکوورلە باکووریهێڵی/ ٣٨ بەیارمەتی ئیدارەی سۆڤیەت رژێمێکی بەناوی کۆریای دیموکراتی

دروست بکات و رایگەیەنێت لە کێشوەرەکەدا.

١٩٤٥/٨/١٦ دامەزراندنی پارتی دیموکراتی کوردستان لە رۆژهەلاتی کوردستانی داگیر کراوی ژێر دەسەلاتی ئێران لە لایەن پێشەوا قازی محەمەد راگەیەندراو، کاردانەوەی کاریگەری کردە سەر بزووتنەوەی رزگاریخوازی کورد لەرۆژهەلاتی کوردستان ، کە ئەنجامی بووە هۆی راگەیاندنی کۆماری کوردستان لە مەهاباد.



١٩٤٥/٨/١٧ وولاتی ئەندۆنیسیا سەربەخۆیی خۆی بەدەرچوونی لە ژێر دەسەلاتی پۆلەندا راگەیاند ، بەسەرکردایەتی سۆکارتۆو جێگرەکەی محەمەد ، کە بەرەو پەرەپێدان و پەرەسەندن و گەشەکردن هەنگاوینا لە وولاتەکەو بەرەو جیهان بە ناوی – کۆماری ئەندۆنیسیا– لە شاری جاکارتای پایتەختدا . کە ژمارەی دانیشتووانەکەی ، ٩,٣٠٠,٠٠٠ ملیۆن کەسە . هەروا ژمارەی دانیشتووانی وولاتەکەی ،٢١٨,٣٥٠,٠٠٠ ملیۆن کەسە . هەروا رووبەری خاکی وولاتەکەی ، ١,٩٠٤,٥٧٠ کیلۆ موتر چوار گۆشەیە . هەروا چڕی دانیشتووانەکەی ، ٢٩٧ کەس لە یەك میل چوار گۆشەدا . هەروا نژاەکانی ، گاووبوون ٤٥٪ . سوودانی ١٤٪ . مادووربوون ٧,٥٪ . مالایۆ ٥٪ . لە وولاتەکەدا .

١٩٤٥/٨/١٨ کۆبوونەوەی لیژنەی نوێنەرانی هاوپەیمانان لە بارەی لێکۆلینەوەی کارە درندانە نا لەبارەکانی رژێمی فاشی لە ئەلمانیا... پێشنیاریان کرد بە کۆبوونەوەی وەزیرەکانی دەرەوەی ئەو وولاتانە کە لە شاری مۆسکۆی پایتەختی یەکیەتی سۆڤیەت ، دوای ئەوە لەم رۆژەدا کۆبوونەوەی هەرسێ

وولاّتــی رووســیاو بــەریتانیاو ئەمــەریکا لــە لەنــدەنی پایتــەختی بــەریتانیا ئەنجامــدرا ، ئــەویش بــە بەدامەزرانــدی داداگــای نێوودەوڵــەتی لــە پێنــاو داداگاییکرنی تاوانبارانی جەنگ لەجیهاندا . بە دامەزرانمدنی چەندین دادگا لـەو وولاّتانـەی کـە تاوانـەکانی جـەنگی دژ بـە مرۆڤایـەتی تێدا ئـەنجام دراوە لەجیهاندا.

١٩٤٥/٨/١٩ راگەیاندنی فەرمانی عورفی دژی بزووتنەوەی رزگاری لـە ئێراق وبە تایبەتی کورد ، لەلایەن رژێمی شانشینی لـە ئێراق بەسـەرۆکایەتی ژەنـەرالی بـەریتانی – دانتــون– کــە ئــەویش دەســتی کــرد بەهێرشــی بــەرفراوان بۆســەر ناوچــە جیاجیاکانی باشووری کوردستان.

١٩٤٥/٨/٢٠ زیاتر لە ٤٠٠ چەکداری شۆرشگێرە کوردەکانی رۆژهـەلاتی کوردسـتان بـەرەو باشووری کوردستان بەرێکەووتن ، لە پێناو یارمەتیدانی هێزە چەکدارەکانی کــوردو بــەرگری کــردن لــە کــوردو کوردســتان ، دژی رژێمــی شانــشینیو هێزەکانی بەریتانیای داگیر کەرو یاوەرەکانی لەهەرێمەکەدا .

١٩٤٥/٩/٢ بەخۆبەدەستەوەدانی ئەڵمانیای فاشی هتلـەری لەجـەنگی دووەمـی جیهـان ، کۆتـایی هــات بەســەرکەووتنی یەکیــەتی ســۆڤیەتو وولاّتــانی هاوپــەیمان لەهەردوو کێشووەری ئاسیاو ئەورووپادا .

١٩٤٥/٩/٢ وولاّتــــی ڤیتنــــام ســــەربەخۆیی خــۆی راگەیانــد بەســــەرکردایەتی قارەمــــــانو تێکۆشــــــەرو رابــەری ڤێتنــامی – هۆشــی منــە– کەیەکێکــــــە لەســــــەرکردە دیمــوکرتیو نیــشتمانپەروەرەکانی ڤێتنــامو جیهــان. بــە نــاوی – کۆمــاری

ڤێتنام- لە شاری هانۆی پایتەختدا
کە ژمارەی دانیشتووانی شاری هانۆی ٣,٣٨٠,٠٠٠ ملیۆن کەسە . هەروا ژمارەی دانیشتووانی وولاتەکە ، ٧٨,٨٠٠,٠٠٠ ملیۆن کەسە . هەروا رووبەری وولاتەکە ، ٣٣١,٦٩٩ هەزار کیلۆ مەتر چوار گۆشەیە . هەروا چڕی دانیشتووانەکە ، ٥٦٩ کەس لە یەك میل چوار گۆشەدا . هەروا نژادەکانی، ڤێتنامی ٩٥٪ . چینی ٣٪ .ماونگ ، خمیر ، تای . لە وولاتەکەدا .

١٩٤٥/٩/٤ هێزەکانی سووپای رژێمی شانشینی لە ئێراق بەپشتیوانی هێزەکانی سووپای بەریتانیا ، پەلاماری ناوچەی هاودینانیان دا لەگەل دەووروبەری و داگیر یان کردو رووبەرووی پێکدادان بوونەوە لەگەڵ چەکدارانی ناوچەکە ، کە بەتووند ترین پێکدادان دەژمێردرێت لەناوچەکە لەوکات لە هەرێمەکەدا .

١٩٤٥/٩/٥ هێزەکانی سووپای سووری یەکیەتی سۆڤیەتی لە دوای کۆتایی هاتنی جەنگی دووەمی جیهانو سەرکەووتنی، پەلاماری کۆماری بوولگاریای داو داگیری کرد ، بەلام دوای سێ رۆژ بەجێی هێشت بەپێی رێکەووتنی لەگەڵ دەسەلاتی بوولگاریا ، بەپێی بارو دۆخی ئەوکات لەهەرێمەکەدا .

١٩٤٥/٩/١٠ راپەرینەکانی ناوچەی بارزانو دەووروبەری دەستی پێکرد بە تایبەتی لە ناوچەی مەیدانی- مۆرك - لە باشووری کورستان دژی هێزەکانی سووپای شانشینی لە ئێراق بە پشتیووانی بەریتانیا.

١٩٤٥/٩/١٢ سەر کردەی رووسی - بافرۆف - داوای لە ئەفسەرە رووسەکان کرد لە ئێران بە پێك هێنانی شاندێکی کوردی و رەوانە کردنی بۆ شاری باکۆ لە رۆژهەلاتی کوردستان ، هەروا بەلێنی بەکابتن نمازۆف دا کە ئەفسەرێکی پەیووەندیدار بوو ، لە نێوان کوردو رووس لەسەر داوای پێشەوا قازی

محەمەد . ئەویش بەپێك هێنانی شاندێك لە سەرۆك عەشیرەتەكانی كوردو ڕەوانە كردنیان بۆشاری تەورێزو لە وێووە بۆ باكۆ.
ئەویش لەپێناو گفتووگۆ كردن لەسەر كێشەی كورد ، كە شاندەكە لە ٥٠ كەسایەتی كورد پێك هاتبوون بەسەركردایەتی پێشەوا قازی محەمەد ، بەگەیشتنی شاندەكە با فرۆف ڕایگەیاند ، كەداهاتووی مافی كورد یاری پێ ناكرێ لەكوردستان..؟..!.

١٩٤٥/٩/٢٥ هێزەكانی سووپای ڕژێمی شانشین لە ئێراق بەپشتیووانی فرۆكە جەنگیەكان و بەهاوكاری ٣٠٠ جاشی عەشیرەتی سوورچی و ٥٠٠ لە هۆزی بەرواری لە باشووری كوردستان ، هێرشیان كردە سەر ناوچەی بارزان ، ئەویش بە ناچار بوونی مستەفا بارزانی و شۆرشگێران بەرەو شاخی شێرن هەڵكشێن و بەرگری لەخۆیان بكەن لە ناوچەكەدا .

١٩٤٥/٩/٣٠ سەركەووتنی شۆرشی بارزانی بەسەر هێزەكانی سووپای شانشینی لە ئێراق ، كە بووە هۆی گوواستنەوەی شۆرش بۆ قۆناخێكی دیكە لە كوردستان ، بەرزبوونەوەی هەستی نەتەوەیی و نیشتمانی بەتایبەتی لە باشوورو ڕۆژهەلاتی كوردستاندا .

١٩٤٥/١٠/١١ بەر لە دامەزراندنی پارتی دیموكراتی كوردستان شۆرشی بارزان بەهۆی هێرشی سووپای ڕژێمی ئێراق و بەهاوكاری سەرۆك عەشیرەتە جاشەكان ، بۆمبارانی توندی ناوچە شاخاویەكانی هەرێمی باشووری كوردستانیان كرد ، لەلایەن فرۆكە جەنگیەكانی ڕژێمی شانشینی لە ئێراق و بەریتانیا ، كە بووە هۆی نسكۆی شۆرشكە ، لەوكات هێزەكانی بارزان خزانە ناوخاكی ڕۆژهەلاتی كوردستان ولەلایەن ڕێبەرانی كۆمەلەی شۆرشەكە پێشوازی گەرمییان لێكرا لە هەرێمەكەدا .

١٩٤٥/١٠/١٦ دامەزراندنی ڕێكخراوی فاو ، كە بە ڕێكخراوی دەستەی نەتەوە یەكگرتوەكان دادەنرێت بۆ خۆراكی كشتووكاڵیەكان و بارەگای سەرەكی ڕێكخراوەكە لە شاری ڕۆمای پایتەختی ئیتالیایە.

١٩٤٥/١٠/٢٣ پێشەوا قازی مەحەمەد سەركردایەتی ژێكاف ، كە خۆیان لە بەرامبەر ئێران بە تەنیا دەبینیەوە و ئامۆژگاریەكانی بافرۆڤیان بەجێگەیاندو بەبێ ئەوەی ،

کە کۆمەڵەی ژێکاف هەڵووەشێننەوە کۆنگرەیان لە مەهاباد گرێداو پارتی دیموکراتی کوردستانیان بەرەو دامەزراند هەنگاوینا لە رۆژهەڵاتی کوردستان.

١٩٤٥/١٠/٢٤ دامەزراندنی رێکخراوی نەتەوە یەکگرتوەکان راگەیەندرا بەجێگرتنەوەی کۆمەڵەی گەلان ، لە هەمان کات هەڵووەشاندنەوەی کۆمەڵەی گەلان راگەیەندرا ، بەپێی بارو دۆخی نوێی دوای جەنگی دووەمی جیهان و پەرەسەندن و پێشکەووتنی لە پەیووەندیە نێوو دەووڵەتیەکان لەجیهاندا .

١٩٤٥/١٠/٢٥ گرێدانی کۆنگرەی یەکەمی پارتی دیموکراتی کوردستان لە رۆژهەلاتی کوردستان لە شاری مەهاباد ، کە پێشەوا قازی محەمەد بەسەرۆکی پارت هەلبژێردراو .
لە گەڵ ئەندامانی لێژنەی ناوەندی و سکرتێری کۆمیتەی ناوەندی و چەندین بریاریان دا ، کە گرنگترین بریاری مافی چارەی خۆنووسیی کورد بوو لە رۆژهەڵاتی کوردستاندا.

١٩٤٥/١٢/٦ بڵاوکردنەوەی یەکەم ژمارەی گۆڤاری کوردستان لە رۆژهەڵاتی کوردستان ، کە بەرەو دەنگی دامەزراندنی کۆماری دیموکراتی کوردستان بوو لە شاری مەهاباد بەسەرکردایەتی پێشەوا قازی محەمەد لە هەرێمەکەدا .

١٩٤٥/١٢/٦ دامەزراندنی هێڵی شەمەندەفەر بۆ یەکەم جار لە شاری کەرکوك لە باشووری کوردستان لە لایەن رژێمی شانشینی لە ئێراق.

جێگـــــــــەی باســـــکردنە کـــە هێلـــــــــی شـــەمەندەفەر لـــە نێـــــوان شـــــاری کەرکوك و بەغدای پایتەختی ئێراق، کـە ئـەو هێلـەش کـەرکوك و کفـری و کـەلاروو خانـەقین و بغدا بە یـەك دەبەستێتەوە. بەلاّم هێلـی شـەمەندفەری ئێستای شاری کەرکوك لە سالّی /١٩٨٦ دەستی پێکردوو لـە سالّی /١٩٨٧ دا کەوتە کار کردن. ئەم هێلـە بەستراوتەوە بە تـەواوی سنوورەکانی ئێراق و سووریا و سعوودیە و ئوردن، کـە پارێزگـاو شـاری کـەرکوك بـە تـەواوی بە شـارەکانی باشـووری ئێـراق دەبەسـتێتەوە، لـە پێنـاو بەرزکردنـەوەی بـاری ئـابووری و بازرگـانی و گوواسـتنەوەی هـەردوو بـواری مـەدەنی و سـەربازی و پێداویستیەکانی لە ئێراق

بـەلاّم لـە دوای پرۆسـەی ئـازادی لـە ئێـراق و رووخانـدی رژێمـی بـەعس لـە ئێراق، ئەویش بە هۆی بۆردمانکردنی هێلە ئاسنینیەکان لە لایەن هێزەکانی سـووپای ئەمـەریکاو هاوپـەیمان بـووە هـۆی وێرانکردنـی ئـەم هێلانـەو لـە پەککەووتنی لە کارکردن لە ئێراق.

سەرەرای ئەوەی کە هێلی ئاسنی شەمەندەفەر گرنگیەکی کاریگـەری لـە سـەر ئاسانکردنی هتاتووچۆو گوواستنەوەی کـەل و پـەل و کالاّکـان و شمکـەکانی بازرگانی و چەندین بواری دیکە دا هەیە، بۆ بتەوکردنی ژێرخـانی ئـابووری و بازرگانی لەو وولاّتەدا ، بە تایبەتی لە کوردستان... کە بریار وایـە هێلـەکانی ئاسـنی نێـوان شـاری کـەرکوك و هـەولێر و سلێمانی و دهـۆك و زاخـۆ بـەردی بناخـەیان لـە سـالّی /٢٠٠٩ بۆ دابنـرێ و دەسـت بکـرێ بـە دروسـتکردنی ئـەم هێلە فراوانە لە هـــەرێمی باشووری کوردستان.

سەرچاوە:– لێدوانی بەرێوەبەری هێلی ئاسنی شاری کەرکوك – شاکر محەمەد.

١٩٤٥/١٢/١٥ پێشرەوی ئەنجوومـەنی نەتەوایـەتی ئازربایجـان –جەعفـەری– لـە ئاهـەنگێکی شـکۆدار خـووڵی یەکـەمی ئەنجوومەنەکـەی کـردەوەو داوای لـە پێشەوا قـازی محەمەد کرد ، کە پێنج ئەندامی پارتی بنێرێتە ناو ئەو ئەنجوومەنە نۆبەرەیە لە کۆماری ئازربایجان لە هەرێمەکەدا .

١٩٤٥/١٢/١٥ لـە سـەرەتای داگیرکردنـی وولاتـی ژاپـۆن ، واتـە یابـان لەلایـەن هێزەکـانی سووپای ئەمەریکا ، بەبریاری سەرۆکی ئەمەریکاو پەیدا بوونی مەترسیان لە پەیووەنـدی بەهێزی نێوان دەسـەلاتی ژاپـۆن و ئـاینی شـنتۆ... لـە بەر ئـەوە بریاریاندا بە لەناو بردنی ئەو هاوکاریەو دەستیان بەسەر زۆربەی زەویەکانی ئاینی شنتۆ داگرت ، لە پێناو ئاسانکردنی مەرامـەکانیان لـە تـەواوی ژاپـۆن و کار لێنەکردنیان لە ناو کێشووەرەکەو جیهاندا .

١٩٤٥/١٢/١٦ گەورەترین خۆپیشاندان لە رۆژهەلاتی کوردستان لە گۆرەپانی چوار چرا لـە شـاری مـەهاباد لـە لایـەن گـەلی کوردسـتان ئەنجامـدراو ئـالای کوردسـتان بەرزکرایەوە لە شارەکەدا .

١٩٤٥/١٢/١٦ دووەمـین کۆنفرانـسی وەزیرانـی دەرەوەی وولاتـانی هاوپـەیمان ، لـە شـاری مۆسکۆی پایتـەختی سـۆڤیەت ئـەنجام دراو بەردەوام بوو تـاکوو ١٢/٢٢ ، کـە کێـشەی ئێـرانو چـۆلکردنی هێـزە هاوپەیمانـەکان لـەئێران بـووە تـەوەرێکی سـەرەکی گفتـوو گۆیـان ، کـە وەزیـری دەرەوەی بەریتانیا– بیڤن– مەبەسـتی دەرچوونی سووپای سووری سۆڤیەت بوو لە ئێران.
ئـەویش بـە تایبـەتی لـە رۆژهـەلاتی کوردسـتان ، لەناوەنـدی کۆنفرانـسەکە کۆمۆسیۆنێك لە ئەمەریکاو بەریتانیاو سۆڤیەت دامەزرا ، بۆ رێنمـایی کردنـی حکوومـەتی ئێـرانو هانـدانی دەسـەلاتی ناوەنـدی تـاران ، ئـەویش لـە پێنـاو هێوور کردنەوەی بارو دۆخەکە . بەتایبەتی لە رۆژهەلاتی کوردستان .

١٩٤٥/١٢/١٧ دامەزرانـدنی بـانکی نێوودەوولـەتی ، بـۆ کارەکـانی بیناسـازیو ئـاوەدان کردنـەوە ، کـە ئـەو رێکەووتنـە لەلایـەن ٤٤ وولات مـۆرکرا لەشـاری بریتـۆن ، ودزو لـە١٩٤٦/٦/٢٥ دەسـتی بـەکارەکانی کـرد لـە لـە ناوچـەوهەرێمە جیـا جیاکان جیهاندا .

١٩٤٥/١٢/١٧ لـە ئاهـەنگێکی جـەماوەری مـەزن لـە لایـەن دانیـشتووانەکە لەشـاری مـەهاباد

ئالای کوردستان بەرزکرایەوە ، لەو کاتەش پەیوەندی لەگەڵ حکوومەتی ناوەندی تاران هەرمابوو...بەڵام جمووجۆڵو بەرز بوونەوەی هەستی نەتەوەیی رۆژ لە دوای رۆژ بەرەو یەکخستن هەنگاوی دەنا، بەتایبەتی لەبواری نەتەوەیی و نیشتمانی بەرەو راگەیاندنی کۆماری کوردستان لە شاری مهاباددا.

١٩٤٥/١٢/١٩ وەزیری دەرەوەی بەریتانیا – ئەرنست بیڤن و – وەزیری دەرەوەی یەکیەتی سۆڤیەت – میاتسلاف مۆلۆتۆف – لەکاتژمێر ٧,١٠ ی ئێوارە کۆبونەوەیەکیان ئەنجامداو دوای کۆبونەوەکە سەرۆکی یەکیەتی سۆڤیەت – ستالین – پێشووازی لەهەردوو وەزیرکرد...لە رۆژی دوایی بەریتانیا کۆنووسی کۆبونەوەکەی ئاراستەی وەزارەتی دەرەوەی ئەمەریکا کردو بەشێوەیەکی فەرمی لە ئەرشیف پارێزراوە... جێگەی ئاماژەیە کە لە کۆنووسەکەدا هاتبوو کە هەردوو شاندی سۆڤیەت و بەریتانیا گفتووگۆیان لەسەر کردبوو ئەویش:–

١– کێشەی نەوتی باکوو ئێرانی کرد، لەدوایی باسی کێشەکانی تورکیاکرا... کە بیڤن لەستالینی پرسی – چ گرفتێکیان لەگەڵ تورکیا هەیە...؟ ستالین لە وەڵامدا گووتی :– رەنگە بەهەڵە لە زاراوەکە بگەن... بەڵام ئاماژەی بۆ شەڕی دەروونی کردو بیڤن لە وەڵامدا گووتی : ئێمە هاوپەیمانی تورکیاین و دەمانەوێت لەمەسەلکە بگەین... ستالیش بۆی شیکردەوەو گووتی :– لێرەدا دوو مەسەلە لەئارادایە. یەکەم : دەبارەی تەنگە بەرەکان و دووەم : دەربارەی داواکاری لکاندنی هەردوو ناوچەی قارس وئەردەهانی تورکیا و یەکیەتی سۆڤیەت. لە هەمان کات – ئەرنست بیڤن – گووتی :– ووتەی وا لە ئارادایە کە ئێووە دەتانەوێت بنکەیەك لەتەنگەبەرەکان دابمەزرێت.

٢– لەمەدا ستالین لایەنگری لێکرد دەربارەی شارەکانی قارس و ئەردەهان لەباکووری کوردستان، و ستالین گووتی :– تورکیا دەستی بەسەردا گرتووەو دەیەوێت سنوور بگەرێنێتەوە دۆخی بەر لەرێککەووتنی فارسی و مۆسکۆی ساڵی ١٩٢١. چونکە پێی وایە یەکیەتی سۆڤیەت لە ساڵی ١٩٢١ لاوازبووەو تورکیاش سوودی لەم بارودۆخە

وەرگرتووەو هەردوو ناوچەکەی بەخۆیەوە لکاندەوە، هەروا لە کۆنووسەکەدا هاتووە ستالین دەڵێت : - رێکەووتنامەی - مۆنرۆ - دەربارەی تەنگەبەرەکان مافی ئەوە بە تورکیا دەدات هەر دەمژمێرێك بیەوێت تەنگەبەرەکە دادەخات، ئەمە سەبارەت بە ڕووسیا زەحمەتی دروست دەکات، چونکە تورکیا دەتوانێت چ کاتێك بیەوێت فشار بخاتە سەر. بۆیە مۆسکۆ داوای ئەوە دەکات هاتووچۆ لەرێگای تەنگەبەرەکە ئازادبێت.

٣- ستالین دووەمین مەسەلەی دیکە دەوروژێنێت ، کە ئەویش ئەوەیە تورکیا دەستی بەسەر خاکێك داگرتووە پێشتر ئەرمەنەکان و جۆرجیەکانی تێدا دەژیان. بۆ راستکردنەوەی ئەو رەوشە - پێویست بەوە دەکات سنوور بۆ ئەو سەردەمە بگەرێتەوە کە لە سەردەمی قەیسەری ڕووسیادا هەبوو... بەڵام ئاخاوتن لەسەر شەڕی دژی تورکیا هیچ بنچینەیەکی نیە... بەڵام بەبیروبۆچوونی ستالین مەسەلەکە بە وتوویژکردنی لە نێوان ئەمەریکاو بەریتانیا چارەسەردەبێت.

٤- هەروا بیڤن لە ستالین دەپرسێت بەشێوەیەکی دیاریکراو چیت دەوێت...؟ سەرۆکی سۆڤیەت ستالین لە وەڵامدا دەڵێت : - گەرانەوەی خاکی ئەرمەن و جۆرجیەکان بۆ خاوەنی فەرمی خۆیان وەك ئەو بارودۆخەی بەر لەرێککەووتنامەی ساڵی ١٩٢١ کەو لەهەمان کات بیڤن گوتی :- :ئەو زەویانە بۆ ماوەیەکی درێژ بەدەست ڕووسیای قەیسەری ناکێشێتەوە... ستالین لەگەڵیدا هاورابوو.

٥- بەڵام پێی گووت ئەرمەن و جۆرجیەکانی بەبەردەوامی لە سەری ژیاون، بیڤن بە پرسیارێکی دیکە کێشەی تەنگەبەرەکان دەوروژێنێتەوەو دەڵێ:- بەتەواوی مۆسکۆ چی دەوێت... ستالین لە وەڵامدا گووتی : - دەیەوێت بنکەیەك بۆ بۆ سۆفیەت تێدابمەزرێت لاپەرەکانی دیکەی بەڵگەنامەکە ئاماژە بۆ ئەوە دەکەن کە ستالین دەستی بە جێ بە جێکردنی پلانەکەی کردبوو، بەڵام بەشێوەیەکی پلەپلەکراو لە رێگای بریاری ئەنجوومەنی سۆڤیەتی باڵا لە ١٩٤٦/١٠/١٩ دەربارەی داواکاری ئەرمەنی لەجیهان، ئەویش بۆ گەرانەوەیان بۆ یەکیەتی سۆڤیەت،

بەمەرجێك ئەو ئەرمەنانەی كە دەگەڕێنەوە ڕەگەزنامەی سۆڤیەتیان پێبدرێت... پلانەكەش ئەوەی بەدیارخست كە ئەرمینیای سۆڤیەت جێی ملیۆنەها ئەرمەن نابێتەوە، كە ئەمەش فاكتەرێكی فشارە لەسەر توركیا بۆ ئەوەی بێڵێت بگەڕێتەوە سەر خاكی خۆیان، كە لێی ڕاگوێزراون لە ڕۆژهەڵاتی توركیا، هەروا بەڵگەنامەكان دەڵێن :- كە ستالین بەتەنێ كاری لەسەر ئەوە نەكرد و هەموو ئەرمەنەكانی جیهانیش بباتە ڕووسیا بەلكوو بەخوودی توركیاشەوە بۆ سەر سۆڤیەت.

سەرچاوە: گۆڤاری عەرەبی كوێتی .

١٩٤٥/١٢/١٩ ڕژێمی كۆماری دووەمـــی وولاتی نەمسا ڕاگەیەندرا لە سەر بنەماكانی دەستووری و ڕێنماییەكانی ساڵی ١٩٢٠دا. بە ناوی – كۆماری نەمسا – لە شاری – ڤییەنا – كە ژمارەی دانیشتووانەكەی ، ١,٨٧٠,٠٠٠ ملیۆن كەسە . هەروا ژمارەی دانیشتووانی وولاتەكە، ٨,٦٥٠,٠٠٠ ملیۆن كەسە . هەروا ڕووبەری خاكی وولاتەكە ، ٨٣,٨٦٠ هەزار كیلۆ مەتر چوار گۆشەیە . هەروا چڕی دانیشتووانەكەی ، ٢٦٧ كەس لە یەك میل چوار گۆشەدا . هەروا نژادەكانی ، ئەڵمانی ٩٥٪ . هەروا هەندێ لە كروات و سلۆڤینی تیایە . لە وولاتەكەدا .

١٩٤٥/١٢/٣١ هێزەكانی سووپای ئەمەریكا لەخاكی ئێران كشانەوە بەتایبەتی لە ڕۆژهەڵاتی كوردستانی داگیر كراوی ژێر دەسەڵاتی ئێران ، بەهۆی لە بارچوونی بارودۆخ و پەیووەندی لە نێوان نەتەوەی فارسی داگیر كەر لەگەڵ

کوردو سەرهەڵدانی بارو دۆخی نوێ بەپێی پەرەسەندنەکانی دوای جەنگی دووەمی جیهان ، بەرزبوونەوەی رۆڵی یەکیەتی سۆڤیەت لەیارمەتی و پشتگیری کردنی گەلانی چەوساوەو ژێر دەستە، لەوانەش یارمەتیدانی کورد لەرۆژهەلاتی کوردستان.

## ١٩٤٦

١٩٤٦/١/١ هەڵووەشاندنەوەی بریاری تاکرەوی ئیمپراتۆری ژاپۆن بەداماڵینی خواوەندیەکان لەسەر تەواوی ژاپۆن ، دوا ووشە بۆ ئیمپراتۆر بێت لەسەر وولاتی یابان ، بەلام بریاری تەواوی دەسەلات درا بە دەست پەرلەمان و حکوومەت ، کە ئیمپراتۆر وەك مرۆڤێکی ئاسایی بێت و بەشداری بەرەو پێش بردنی باری هەمەلایەنەی وولاتەکەی بدات بەهاوکاری پەرلەمان و حکوومەت لە وولاتەکەدا .

١٩٤٦/١/٧ دامەزراندنی ئۆرگانی گۆڤارێکی کوردی لە پێناو بلاوکردنەوەی یەکەم ژمارەی گۆڤاری – کوردستان– لە شاری مەهاباد لە رۆژهەلاتی کوردستانی داگیر کراوی ژێر دەسەلاتی رژێمی شا لە ئێراندا . کە زمانحاڵی پارتی دیموکراتی کوردستان بوو بە سەر کردایەتی پێشەوا قازی محەمەد لە هەرێمەکەدا .

١٩٤٦/١/٧ بەهاوکاری و یارمەتیدانی ئەمەریکاو بەریتانیا رژێمی شاهەنشاهی لە ئێران پەلاماری کۆماری ئازربایجانی داو لە ناوی برد ، لەدوای کشانەوەی هێزەکانی سووپای سووری یەکیەتی سۆڤیەت لە ناوچەکەدا لە سەر بنەمای بەرژەوەندیەکاندا.

١٩٤٦/١/١٠ یەکەم دانیشتنی رێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان ئەنجامدرا بەبەشداری ٥١ وولات ، ئەویش بەهەڵبژاردنی سەرۆکی کۆمەڵەی گشتی و گفتووگۆ کردن لە سەر داهاتووی رێکخراوەکەدا لە چارە سەر کردنی کێشە هەڵوواسراوەکان لە جیهاندا .

١٩٤٦/١/١١ بلاو کردنەوەی یەکەم ژمارەی رۆژنامەی کوردستان لە شاری مەهاباد لە رۆژهەلاتی کوردستان ، لەلایەن پارتی دیموکراتی کوردستان بەرابرایەتی پێشەوا قازی محەمەد لە هەرێمەکەدا .

١٩٤٦/١/١٩ بەهۆی پشتگیری بزووتنەوەی رزگاریخوازی کورد لە رۆژهەلاتی کوردستان

لەلایەن دەسـەڵاتی یەکیـەتی سۆڤیەت ، رژێمی شا لـە ئێران سـكاڵا نامەیەکی نـارەزایی بەرامبــەر هێزەکـانی سـووپای سـۆڤیەت ئاراسـتەی ئەنجوومــەنی ئاسایـشی نێوودەوڵـەتی کـرد ، بەرامبـەر بەو یارمـەتی دانـەی کـورد لەلایـەن دەسەڵاتی سۆڤیەت.

١٩٤٦/١/٢٢ لەگۆرەپانی چوار چرا لە ناوەراستی شاری مەهاباد لە رۆژهەڵاتی کوردستانی ، کۆماری کوردستان بە سەرکردایەتی پێشەوا قازی محەمەد راگەیەندرا... کە بووە هۆی لێك ترازانی پەیووەندی لە نێوان کوردو دەسەڵاتی فارسی لە ئێران ، ئەویش بەدروست بوونی بارودۆخی نوێ لە ناوچەکەو هەرێمو جیهاندا.
شایانی باسە کە ئەو کات دەسـەڵاتی یەکیـەتی سۆڤیەت رۆڵـی گرنگی هـەبوو لـە راگەیانـدنی ئـەو کۆمـارە کوردسـتانیە لەمێـژووی بـوونی بزووتنـەوەی رزگـاریخوازی کـورد ، لـە هـەردوو لایـەنی باشـیو خراپـی لـەداهاتووی کـورد لەوکاتەدا لە کورستان ، بەتایبەتی لە رۆژهەڵاتی کورستان.

١٩٤٦/١/٢٦ سـەر کـردەو رابـەری بزووتنـەوەی رزگـاری کـورد لـە رۆژهـەڵاتی کوردسـتان ، پێشەوا قازی محەمەد پێکهێنـانی حکوومـەتی کوردی راگەیاند ، کە خۆی لە ١٤ چواردە وەزیر دەگرت ، لەپێناو هەلسووراندنی کاروباری حکوومەتایـەتی و دامەزرانـدنی دامو دەزگاکـانی دەسـەڵاتی نـوێی کـوردی لەرۆژهــەڵاتی کوردستاندا.

١٩٤٦/٢/٤ لە دوای هەوڵ و ماندووبوونێکی زۆر ، ئەویش بە دامەزراندنی یەکیەتی بزووتنەوەی شۆرشگێری ئافرەتان لەلایەن ئافرەتی شۆرشگێری كوردی ناودار خاتون – حەبسەخانی نەقیب – لە شاری سلێمانی لەسەر ئەركی بنەماڵەکەی لە باشووری كوردستان.

١٩٤٦/٢/١١ لە دوای دامەزراندنی یەکەم کابینەی حکوومەتی کۆماری کوردستان لەشاری مەهاباد لە رۆژهەڵاتی کوردستان ، بەرابەرایەتی پێشەوا قازی مەحەمەد سەرۆکی پارتی دیموکراتی کوردستان ، کە ئەو کابینەیە لە هەموو کەسایەتیەکانی کورد لە کوردستان پێك هێنرابوو بێ‌جیاوازی هەرێمەکان لە کوردستاندا .

١٩٤٦/٢/١٧ كۆمەڵێك لە رووناکبیرو کەسایەتی کورد سکالانامەیەکیان ئاراستەی رێکخراوی نەتەوە یەکگرتوەکان کرد ، بە زمانی فەرەنسی لەبارەی کورد لەهەموو بوارەکان . بەتایبەتی لە هەردوو بواری گەل و نیشتمان لەباشووری کوردستانی لکێنراو بە ئێراق.

١٩٤٦/٢/٢١ بڵاو کردنەوەی یەکەم ژمارەی گۆڤاری – هەڵاڵە– لە شاری بۆکان لە باکووری کوردستانی داگیر کراوی ژێر دەسەڵاتی رژێمی تورکیا .

١٩٤٦/٣/٢ هێزەکانی سووپای بەریتانیا لەخاکی ئێران و رۆژهەڵاتی کوردستان کشانەوە ، کە ئەم کارەش بووە هۆی ماوەدان بەهێزەکانی سووپای رژێمی شا لە ئێران

، لەپێناو پەلاماردانی بزووتنەوەی رزگایخوازی كورد لە هەرێمەكەدا .

١٩٤٦/٣/٦ رۆژنامـەی كوردسـتان لـە رۆژهـەلاتی كوردسـتان ، لـە سـەر وتارەكەیدا بـلاوی كردەوە ، كە دەلّێ:-
وولاتـانی پـەیمانی ئەتلەسـی بروایـان وایـە كـە خزمـەتی گـەلانی ژێردەسـتە دەكات لە دوای جەنگی دووەمی جیهان بە سەركەووتنیان بەسـەر فاشیەت....
بـەلام دەسـتگیری سـۆڤیەتیان بـۆ ئـەو كێـشەیە پـشتگوێ خـست بەكێـشەی دیمـوكراتی و مـافی گـەلانی بـچووك ، وەك بزووتنـەوەی رزگـاریخوازی گـەلی كوردستان.
هـەروا رۆژنامـەی كوردسـتان لـە رۆژهـەلاتی كوردسـتان لـە ژماه /٢٣یـدا بـلاوی كـردەوە ، كـە ئـەو گـەمارۆ ئابوورییـەی كـە رژێمـی شاهەنـشاهی لـە ئێـران ، خـستوویەتیە سـەر هـەرێمی رۆژهـەلاتی كوردسـتان و كۆمـاری كوردسـتان لەمەهاباد.
ئەمــەش وەك بــەكارهێنانی چــەكە دژی كــورد ، لــە پێنــاو چـۆكداداان بـە بزووتنەوەی رزگایخوازی كورد لە كوردستان ، رامیاریەتی رژێمـی شـا لـەپێناو دوورخستنەوەی گەلی كوردو دژی كوردە لەو هەرێمە هـەموو بوارەكـان لـە سـەر خاكی داگیر كراوی لە لایەن شا لە ئێراندا.

١٩٤٦/٣/٢١ بەبۆنەی جەژنی نەورۆزی سەری سالّی كوردی ئاهـەنگێكی گـەوورە لـە شـاری بەغدای پایتەختی ئێراق سازدرا لە باخچەی هۆلّی شانشین فەیسەل و- هـۆلّی گـەلّ- كـە لـەو ئاهەنگـە چـەندین ووتـار خووێندرایـەوە بـەم بۆنەیـە لـە لایـەن ئاهەنگێران لە شارەكەدا . هەروا لـە گوند و شارۆچكە و شـارەكانی باشووری كوردستانیش بە هەمان شێووە ئاهەنگ گێردا لە لایەن گەلی كوردستان .

١٩٤٦/٣/٢١ یەكـەم ژمـارەی گۆڤـاری — هەلاّلـە — لـە شـاری بۆكـان بلاّوكرایـەوە... بـەپێی ئامانجـەكانی كۆمـاری كوردسـتان... گۆڤـاری هەلاّلـە كـە گۆڤـارێكی ئـەدەبی رامیـاری بـوو بەسـەر نووسـەری ناسـراوی كـورد — حەسـەن قزلـچی — و بەیارمەتی — هەژار موكری — و — عەباس حەقیقی — و — هێمن موكری شـاعیر بـوو ... كـە تـوانی بـەپێی بـاری ئـەوكاتی رامیـاری رۆلـی خـۆی لـە بـواری

رۆژنامەوانی و رۆشنبیری و زمان و مێژوو داب و نەریتی کوردستان ببینێ لە رۆژهەڵاتی کوردستان.

سەرچاوە :گۆڤاری – خاك – ژمارە:١٣٠.

١٩٤٦/٣/٢١ بڵاوکردنەوەی یەکەم ژمارەی گۆڤاری هاواری نیشتمان لەشاری مەهاباد لە رۆژهەڵاتی کوردستان.

١٩٤٦/٣/٢٣ هێزەکانی سووپای سووری سۆڤیەت بریاری کشانەوەی لەخاکی ئێران دا ، بەتایبەتی لە رۆژهەڵاتی کوردستان راگەیاند ، کە لە ماوەی ٤٥ رۆژدا بێت لە هەمان کات ، بە هۆی رێکەووتنان ئەویش بە دامەزراندنی کۆمپانیای نەوتی تێکەڵاوی سۆڤیەتی ئێرانی ، کە ئەمەش هۆکارێکی سەرەکی بوو لەپێناو رووخاندنی کۆماری کوردستان لە شاری مەهابادو چۆڵ کردنی گۆڕەپانی رامیاریو بە یارمەتی دانی هێزەکانی سووپای شا لە ئێران.

١٩٤٦/٣/٢٥ سەرەك وەزیرانی ئێراق – تۆفیق ئەلسووێدی– لە شاری قاهرەی پایتەختی میسر ، لە ووتارێکیدا لە خوولی کۆبوونەوەی کۆمکاری عەرەبی، ئەوەی راگەیاند، کە لە ئێراق کێشەی نەتەوایەتی نیە ...بەڵام گەووەرەترینو ئاڵۆزترین کێشەیە لە کیشووەری ئاسیا ، کێشەی کوردو خاکی کوردستانە . لەناو چوار دەووڵەتی شۆڤینی دژ بەیەکتری کە تورك وفارسو عەرەبن لە کێشووەرەکەدا .

١٩٤٦/٣/٢٦ لە ئەنجامی گفتووگۆی بەردەوام بە پاراستنی بەرژەوەندی تایبەتی ئابووریو بازرگانی و سەربازیو رامیاری ، لە نێوان بەرپرسانی رژێمی شا لە ئێرانو بەرپرسی باڵای یەکیەتی سۆڤیەت گرۆمیکۆ بڵاوی کردەوە ، بە کشانەوەی هێزەکانی سووپای سووری سۆڤیەت لەخاکی ئێراندا ، لە ماوەی پێنج تا

شەش هەفتە لەکاتی بڵاوکردنەوەی ڕێکەووتنەکەیان لەناوچەو هەرێمەکاندا.

مۆڵەتۆڤ، محەمەد ڕەزا شا، ستالین، ساعید

١٩٤٦/٤/١ لە ئەنجامی لێك كشانی دەریا گوومەلەرزەی زەوی لەناوچەی تسۆنامی لەدوورگەی وبسان رویدا ، کە بووە هۆی گیان لەدەست دانی ١٦٥ هاووڵاتی، کە بەرزی شەپۆلەکانی ئاو کە گەیشتە ٣٥ مەتر زیاتر لە ناوچەی گوومەلەرزەکەدا.

١٩٤٦/٤/١ لە دوای کشانەوەی هێزەکانی سووپای فەرەنساو دام و دەزگانی و هەڵگرتنی باری ئینتداب لە سەر سووریا ، ئەویش توانی سەر بە خۆیی خۆی ڕاگەیەنێ وەك دەووڵەتێکی سەربەخۆ لە هەرێم و ناوچەو جیهان .

ئەویش لە شاری دیمەشقی پایتەخت ، کە ژمارەی دانیشتووانەکەی ١٧٨٠٠٠٠ ملیۆن کەسە بە پێی ئاماری ٢٠٠٣ . هەروا ژمارەی دانیشتووانی وولأتەکەی ١٥,٧٨٠,٠٠٠ ملیۆن کەسە . کە لەو ژارەیە ژمارەی دانیشتووانی کورد ٢,٧٥٠,٠٠٠ ملیۆن کەسە . هەروا رووبەری خاکی وولأتەکە ١٥٨,١٨٠ هەزار کیلۆ مەتر چوار گۆشەیە . و لەو رووبەرە ١٧,٠٠٠ هەزار کیلۆ مەتر چوار گۆشەی خاکی کوردستانە بە پێی پەیمانی لۆزانی ١٩٢٣/٧/٢٤ لە لایەن هاوپەیمانان پێی لکێندراوە . هەروا نژادەکانی ، عەرەب ٨٢٪ . کورد ١٢,٥٪. رەگەزەکانی دیکە ٥,٥٪ . هەروا چڕی دانیشتووانەکەی ٢٢١ کەس لە یەك میل چوار گۆشەدا لە وولأتەکەدا .

١٩٤٦/٤/٤ پارتی رزگای کورد لە باشووری کوردستان ، راگەیاندنێکی دژی ووتارەکەی سەرەك وەزیرانی ئێراق تۆفیق ئەلسوویدی لە کۆبوونەوەی کۆمکاری عەرەبی لە سەر کێشە کورد بلأوکردەوە ، کە دژی کورد و داهاتووی کێشەکان بوو لە کوردستاندا

١٩٤٦/٤/٤ رۆژنامەی تایمزی بەریتانی بابەتێکی بلأو کردەوە ، کە تیایدا هاتووە – رووسیا ٢٠ دەبابەو کۆمەلێك لەچەك‌و تەقەمەنی بۆ حکوومەتی کوردستان لەشاری مەهاباد رەوانە کردووە ، لەهەمان کات پیلانێکی رووسی ئامادەیە لە دەست تێووەردان‌و تێکدانی باری تورکیاو ئێران‌و ئێراق ، بەبەکارهێنانی کورد لە پێناو نیازەکانی خۆی لەناوچەکەدا ، کە ئەمەش بووە هۆی ئەوەی کە هەردوو حکوومەتی تورکیاو ئێران هەلسن بە گەورەکردن‌و ئالۆزکردن‌و قوول کردنەوەی بارو دۆخەکە ، لە نێوان بزووتنەوەی کوردو وولأتانی داگیرکەری کوردستان لە لایەن هاوپەیمان.

١٩٤٦/٤/١٨ لە دوای دامەزراندنی رێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان لەجێگەی کۆمەلەی گەلان ... هەروا لە بڕیاری بلاوکراوەی نەتەوە یەکگرتووەکان لەمادەی /١٦ی بڕیارەکە دا هاتبوو ، کە رژێمی شانشینی لە ئێراق دەبێ دەستگیر بێت بەبنەمای برگەکان‌و سەرپێچی یاسای ناوخۆیی نەکات‌و گۆرنکاریشی لێنەکات ، تەنیا لەدوای رێکەووتنی ئێراق‌و نەتەوە یەکگرتووەکان.

١٩٤٦/٤/٢٣ مۆرکردنی رێکەووتننامەی دۆستایەتی‌و هاوکاری لە نێوان کۆماری کوردستان لە مەهاباد‌و کۆماری ئازربایجان ، ئەویش لە ژێر چاودێری

ڕووسەکان بۆ ماوەی ٢٠ ساڵ ، کە هەردوو لا لـە سـەر ئـەم خاڵانـە ڕێککـەووتن ئەویش:-
ئالووگۆڕی نووێنـەری رامیاری لـە نێوانیان و، دانانی خاوەن کاری کـورد لـەو شووێنانەی کە کوردی تێدا زیاترە ،... هەروا لەو شووێنانەی کە ئازەری تێدا زیاترە- مۆرکردنی ڕێکەووتننامەی بازرگانی - یارمەتیدانی یەکتری لە بواری سەربازی - دەست پێکردنی گفتووگۆ لەگەل دەسەلاتی ئێران و چەندین کاری هاوبەشی دیکە لە ناوچەکەدا .

١٩٤٦/٤/٢٤ هێزە چەکدارە بارزانیەکانی ناو کۆماری کوردستان لـە نزیـك شـاری سـەقز لـە ڕۆژهەلاتی کوردستان ، هێزی سووپای ڕژێمی ئێرانیان گەمارۆدا لە گوندی - قاراوا- لـە ناوچەکە ، کە ژمارەیـان ٨٠٠ سـەرباز دەبوو، لە ئەنجامی شـەڕی نێوانیـان ١٢ سـەربازی ئێرانـی کـووژران و زامـدار کردنـی ١٧سـەربازو بـەدیلگرتنی ٢٠٠ سـەرباز، دوای تـەواو بـوونی شـەڕەکە ، هێـزە چـەکدارە بارزانیەکان پاشەکشەیان کرد لەناوچەکەدا.

١٩٤٦/٤/٢٩ هەلگیرسـانی شـەڕ لـە نێـوان هێـزی سـووپای شـا لـە ئێـران وهێـزی کـورد ، بـە نـاوی شـەڕی -تـاران- لەناوچـەی سـەقزی ڕۆژهـەلاتی کوردسـتان دژی هێزەکانی سووپای ڕژێمی شا لە ئێران.

١٩٤٦/٥/٣ سەر لەشکری هێزەکانی سووپای ئێران - ڕازم ئارا - شەڕی لەگەڵ کوردو ئازەریـەکان وەسـتاند ، کـە لـەو کاتـە هێـزی چـەکداری کوردسـتان لـەو پـەڕی خـۆراگری بـوون بـۆ شـالاو بردنـە سـەر دووژمنـانی کـوردو کوردسـتان لـە هەرێمەکەدا .

١٩٤٦/٥/٩ هێزەکانی سووپای سووری سۆڤیەت ، بەپێی ڕێکەووتنیان لە گەڵ ڕژێمـی شـا لـە ئێـران ، لـەخاکی ئێـران و ڕۆژهـەلاتی کوردسـتان کـشانەوە، دوای ئـەوە پەرلـەمانی ئێـران پاشـگەز بـووە فـەرمانی شـا کـە دانـی نـەنا بـە ئیمتیـازی کۆمپانیای نەوت ، نە کۆمپانیای هاوبەشی نەوتی نێوان یەکیـەتی سۆڤیەت و ڕژێمی ئێران.

١٩٤٦/٥/١٠ کردنەوەی وێستگەی ڕادیۆی دەنگی کۆماری کوردستان لە شـاری مـەهاباد لـە ڕۆژهـەلاتی کوردسـتان ، کـە زمانحـالی پـارتی دیمـوکراتی کوردسـتان و حکوومـەتی کۆمـاری کوردسـتان بـوو لەشـاری مـەهاباد بـە پەخـشکردن لـە هەرێمەکەدا .

١٩٤٦/٥/١٢ بڵاوکردنەوەی یەکەم ژمارەی رۆژنامەی- هاواری کوردستان- لەشاری مەهاباد لە رۆژهەڵاتی کوردستان.

١٩٤٦/٥/١٥ هەڵگیرسانی شەڕێکی گەورەی -مل قەرەنی یان مامە شاهە- لە نێوان هێزە چەکدارەکانی بارزانی و هێزەکانی سووپای رژێمی ئێران لەسەردەمی حکوومەتی دیموکراتی کوردستان لەڕۆژهەڵاتی کوردستان ، لەئاکامدا هێزە چەکدارەکانی کورد سەرکەوتنیان بەدەستهد هێنا لە ناوچەکەدا .

١٩٤٦/٥/٣١ سەر کردەی کورد مستەفا بارزانی وەك ژەنەراڵ لەئەرکانی هێزەکانی سووپای کۆماری کوردستان وەرگیرا ، لەلایەن پێشەوا قازی محەمەد لەشاری مەهاباد لە رۆژهەلاتی کوردستان .

١٩٤٦/٦/١ سەرکردەو کەسایەتی ناوداری کورد - باباعەلی شێخ مەحمود - پۆستی وەزارەتی ئابووری لە حکوومەتی شانشینی لە ئێراق گرتە دەست لە وولآتەکەدا .

١٩٤٦/٦/١٢ نووێنەری حکوومەتی ناوەندی رژێمی شا لە ئێران موزەفەر فەیروز لە دوای ئامۆژگاری سۆڤیەت بۆ پارتی توودەی ئێران ، ئەویش بەیارمەتی دانی سەرکردەی هێزەکانی سووپا لەگەڵ حکوومەتی ئازربایجان بە نووێنەرەکەی -جەعفەری بشاور- پەیمانی چارەسەری کێشەی ئازربایجانیدا ، بە چارەسەرێکی ئاشتیانە و بەدامەزراندنی دکتۆر چاوید لە پارتی ئازربایجان بەپارێزگای ئازربایجان دامەزراند ، و پارتی توودە چووە ناو ئەو حکوومەتە لە هەرێمەکەدا لە ناو سنووری ئێراندا.

١٩٤٦/٦/١٥ هێزەکانی سووپای رژێمی شا لە ئێران لەناوچەی سەقز لە هەرێمە رۆژهەڵاتی کوردستان ، توانی چەند گردۆلکەیەك داگیر بکات لەئەنجامی شەڕێکی سەخت لە نێوان هێزەکانی سووپای ئێران و هێزەکانی سووپای کۆماری کوردستان.

١٩٤٦/٦/١٥ لە دوای بڵاوکردنەوەی پرۆگرامی کۆمۆسیۆنەکە ، لە رادیۆی - بی بی سی- پارتی توودەی ئێران - واتە پارتی کۆمۆنیست - هێرشێکی توندی دەست پێکرد ، کە دژی کۆمۆسیۆنەکەو تەواوی پێشنیارەکانی وەستاو لەبەیاننامەیەك لەرۆژنامەی - مەرد- ی زمان حاڵی پارتی توودە بلاوکرایەوە

لە ئێران.

١٩٤٦/٦/٢٨ هێــزە هاوبەشــەكانی ئــەمنی رژێمــی شانــشینی لــە ئێــراق تــوانی خۆپیــشاندانەكەی گــەلانی ئێــراق دامركێنێتــەوە ، كــە ئــەو خۆپیــشاندانە لــەپێناوی دیموكراتیــەت و مــافی مــرۆڤ بــوو لــە ئێــراق بەگشتی و لەكوردســتان بەتایبەتی لە هەرێمەكەدا .

١٩٤٦/٦/٢٩ پــارتی تــوودەی ئێــران بەرەیــەكی بــەناوی – جبهە موتلفە احزاب ازادیخواز – دامەزراند ، كە كارێكی دوو لایەنەو زیانی خۆی هەبوو لەم كارەیدا .
یەكەمیان :– پارتی توودە بێ ئەوەی هیچ مافێكی نەتەوەیی بۆ نەتەوە غیرە فارسەكان دابنێ.
دووەمیان:– بەتایبەتی كوردو ئازەر لەئێران بسەلمێنێ كە هەولی راكێشانی پارتی دیموكراتی كوردستان بدات لە رۆژهەلاتی كوردستان.

١٩٤٦/٧/٤ وولاتــــی فلــــپین ســــەربەخۆی خــۆی راگەیانــــد بـــــەپێی رێكەووتن و مۆلــەت پێــدانی لــە لایــەن كۆنگرێـــــــــــسی ئەمـــــــــــەریكا لەهەرێمەكـــــــــە. ئەویش بە نـاوی – كۆماری فلپین – لە شاری مـانێلای پایتـەخت ، كـە ژمـارەی دانیشتووانەكەی ،١,٧٥٠,٠٠٠ملیـۆن كەسە .
هەروا ژمارەی دانیشتووانی وولاتەكەی ،٦٨,٥٠٠,٠٠٠ ملیۆن كەسە . هـەروا رووبەری خاكی وولاتەكەی ،٣٠٠,٠٠٠ هەزار كیلۆمەتر چوار گۆشەیە . هـەروا چــڕی دانیــشتووانەكەی ، ٥٩٤ كــەس لــە یــەك میــل چــوار گۆشــەدا . هــەروا نــژادەكانی ، زیـاتر لـە ٥٠ كۆمەلـەی نـەژادی تیایـە سـەرەڕای ئـەوەی كـە ٪٩٥

دانیشتووانی ناوەند دەکرێن بە فلیپینی کە ئەویش کۆمەڵگایەکی نەژادی هندی پۆلیسیە . لە وولاتەکەدا .

١٩٤٦/٧/٦ سەرۆکی ئەمەریکا جۆرج بۆش لە دایک بووە.. خووێندنی زانکۆی لە ساڵی ١٩٦٨ تەواو کرد ، دوای ئەوە پەیوەندی کرد بەپاسەوانی ئاسمانی نیشتمانی لەوویلایەتی تکساس لەبنکەی ئیلیفتۆن لینال... بەشداری لەپێک هێنان و سەرۆکایەتی کۆمپانیای بۆش کردووە لەتووێژینەوەی نەوت و غاز بۆماوەی ١١ ساڵ.. لەبنەماڵەی برسکووت بۆشە، کاری لە ئەنجوومەنی پیرانی فیدراڵی کردیە لەنێوان ساڵەکانی ١٩٥٢-١٩٦٣.. بەردەوام بووە لەکارەکان تاکوو وەرگرتنی پۆستی سەرۆکی ئەمەریکا لە ١٩٨٩ بۆ ماوە دوو خوول لەدەسەلات لە سەر وویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا .

١٩٤٦/٧/١٢ بەرپابوونی راپەرینە مەزنە ناودارەکەی – گاوربـاخی– لە پارێزگای کەرکوک لە باشووری کوردستان ، لەلایەن کرێکارانی کۆمپانیای نەوتی باکوور لە ئێراق ، واتە لەباشووری کوردستان ، کە کاردانەوەی

کاریگـەری باشـی کـردە سـەر جوولانـەوەی رزگـاری گـەلی کوردسـتان دژی رژێمی شانشینی لە ئێراق.

١٩٤٦/٨/١٢ بلاوکردنەوەی یەکەم ژمارەی رۆژنامـەی –چەمچەمال– لەشاری سلێمانی لە باشووری کوردستان.

١٩٤٦/٨/١٦ لە بریارێکی کوردانە دامەزراندنی پارتی دیموکراتی کوردستان لە هەرێمی باشووری کوردستانی لکێنراو بە ئێراق .

لەلایەن چەندین کەسایەتی نیشتمان پەروەرو رووناکبیری کورد راگەیەندرا ، بەسەرکردایەتی مەلا مستەفا بارزانی لە هەرێمەکەدا.

١٩٤٦/٩/٨ لـە ئـەنجامی راپرسـی گـەلانی بوولگاریـا بـە هەلووەشـاندنەوەی رژێمـی شانـشینیو راگەیانـدنی رژێمـی کۆمـاری مللـی بوولگاریـاو دوای ئـەوە کۆمۆنستەکان دەسەڵاتیان گرتە دەست لە وولاتەکە بەپشتیوانی یەکیەتی سۆڤیەت لە کێشووەرەکەدا.

١٩٤٦/٩/١٢ لە راپۆرتێکی گفتووگۆ لە نێوان کوونسلی بەریتانیا لەشاری تەبریزو قاسم ئاغا خـانی زادەو دەڵـێ:– قاسـم ئاغـا دەڵـێ پێـشەوا قـازی محەمـەد هـیچ دەسـەڵاتێکی لەسـەر سـەرەك هۆزەکـانی کـورد نیـە لـە هـەرێمی رۆژ هـەڵاتی کوردستان .

بەرامبـەر بەوانـەی کـە بـە ئامۆژگـاری رووسـەکان دەجوولێنـەوە ، پێـشەوا ناتوانێ کۆتـایی بەو کێشانە بینـێ بەر لەوەی پرس بە رووسەکان نەکات ، بەڵکوو ئەمەش رامیاریەتیەکە بۆ هەنگاو نان بەرەو دامەزراندنی دەوولەتێکی هەمیشەیی کوردی لە کوردستان.

١٩٤٦/١١/٢ لـە ژێـر چـاودێری ئەمـەریکا رژێمـی شانـشینی یابـان دەسـتووری نـوێی وولاتەکەی راگەیانـد ، لـە دوای خـۆ بەدەسـتەوەدانی بە وولاتـانی هاوپـەیمان لەکۆتایی جەنگی دووەمی جیهان ، کە لەلایـەن هێزەکـانی سـووپای ئەمـەریکا داگیر کرابوو لە جەنگدا.

١٩٤٦/١١/٦ دامەزراندنی رێکخراوی یۆنسکۆی سەر بەنەتەوە یەکگرتووەکان بە بەشـداری ٢٦ وولات لەجیهاندا.

١٩٤٦/١١/١٥ لە کەش و بارێکی گوونجاودا سەرەك وەزیرانی رژێمی شا لە ئێران فەرمانیدا بە هێزەکـانی سـووپا ، ئـەویش لـەپێناو گـەراندنـەوەی کۆمـاری ئازربایجـانو کۆمـاری کوردسـتان بـۆ ژێـر دەسـەڵاتی خـۆی ، بـەبیانووی نـوێ کردنـەوەی

ریفرانـدۆمی گـشتی لـەووڵاتی ئێـران بەگـشتیو لەهەرێمـەکان بەتایبـەتی لـە ڕۆژهەڵاتی کوردستان.

١٩٤٦/١١/٢٧ بالوێزی ئەمـەریکا لـە تارانی پایتـەختی ئێـران – جورج تالێن– ڕایگەیانـد ، کـەوا ئەمـەریکا بەتـەواوی یەکیـەتی خـاکی ئێـرانو دەسـەڵات شاهەنشاهی لـە ئێـران بـەهێز دەکـات ، ئـەویش بـە وەسـتانی دژ بـە پـارتی دیمـوکراتی کوردستانو بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی کورد لـە کوردسـتان ، بە تایبـەتی لـە ڕۆژهەڵاتی کوردستاندا .

١٩٤٦/١٢/٧ هێزەکانی سووپای ڕژێم شا لە ئێران بەپشتیووانی ئەمەریکا هێرشیان کردە سـەر کۆمـاری ئازربایجـان ، کـە ئـەم کۆمـارە دەکەوێتـە باکووری ئێـران ، کـە هێرشەکە چوار ڕۆژی خایاندو لەئەنجام بووە هـۆی ڕووخانـدنی کۆمارەکـە لـە هەرێمەکەدا .

١٩٤٦/١٢/١٠ نووێنەری کورد لە پەرلەمانی ڕژێمی شانشینی لە ئێراق ئەحمەد عوسمان لـە شاری بەغدا ، کۆچـی دوایـی کـرد ، کـە نـاوبراو نووێنـەری پارێزگـای هـەولێر بوو لە پەرلەمانی شانشینی لە ئێراقدا...!!!.

١٩٤٦/١٢/١١ لـە دوای لێـدانی هـەردوو بـۆمبی ئـەتۆمی لـە سـەر شـارەکانی هیرۆشـیماو ناکازاکی یابان ، ئەم کارە تیرۆرستیە نامرۆڤان وای لەچەند ووڵاتێك کـرد ، کـە کووبـاو هندسـتان و پەنـەما پێـشنیارێك بخەنـە بـەردەم کۆمەڵـەی گـشتی نەتەوەیــەکگرتووەکان ، بــەو مەبەســتەی لەجینۆســاید بۆکۆڵنــەوەو وەك تـاوانێکی نێوودەووڵـەتی بناسرێت ، بەمەحکوم کردنی، ئـەوە بـوو کۆمەڵـەی گشتی پێشنیارەکەی لە ١٩٤٦/١١/٩ بەلیژنەی یاسایی سپاردو .
ئەویش لەهەمان مانگدا تووێژینەوەی لەسـەر کـرد ، تـاکوو بـوو بەپڕۆژەیـەكو دوای ئەوە وەك بڕیارێك لەکۆمەڵەی گشتی دەرچوو ، کە تیایدا دەڵێ:–
جنیۆسـاید تاوانێکـە بـەپێی یاسـای نێوودەووڵـەتی نکـۆڵی کردنـی بـوونو ژیانی تەواوی کۆمەڵ گرووپی ئادەمیزادە لە جیهاندا .

١٩٤٦/١٢/١١ لـە دوای پـەلاماردانی حکوومـەتی تەمـەن کـوورتی ئازربایجـان لـە هـەموو کارێکی حکوومەتایەتی وەستا ، بە هـۆی بارودۆخی ڕامیاریو ئـابووری لـە نێـوان ڕژێمـی شـا لـە ئێـرانو دەسـەڵاتی یەکیـەتی سـۆڤیەتی کۆمۆنیـستی لەهەرێمەکەدا...!..؟.

١٩٤٦/١٢/١٣ بە بڕیاری حکوومەتی ڕژێمی شا لە ئێران هێزەکانی سوویا چوونە ناو پارێزگای تەورێز ، بێ ئەوەی دەسەڵاتی سۆڤیەت چ کاردانەوەیەکی نارەزایی دەربڕێ بۆ رزگار کردنی سیستەمی ستالین، کە ئەو ڕژێمەی خۆی بەشداری لە ... راندنی کردبوو لەو هەرێمەی ژێر دەسەڵاتی ڕژێمی ئێران .

١٩٤٦/١٢/١٥ لە دوای گەرانەوەی هێزی چەکدارە بارزانیەکان بۆ شاری نەغەدەو دەووروبەری ، سوویای ڕژێمی ئێران بەرەو شاری مەهاباد بەرێکەوتن و گەمارۆی شارەکەیاندا ، لە ئاکامدا بووە هۆی سەرەتای کۆتایی هێنان بە کۆماری کوردستان لە ڕۆژهەڵاتی کوردستان.

١٩٤٦/١٢/١٥ نوێنەری کاروباری بازرگانی سۆڤیەت لە ڕۆژ هەڵاتی کوردستان لەشاری مەهاباد– ئەسدۆف– بارەگای خۆی لە مەهاباد گوواستەوە بۆ شاری ورمێ و نیشتەجێ بوونی لە کوونسلی سۆڤیەت لە شاری ورمێ لە هەرێمی ڕۆژهەڵاتی کوردستان.

١٩٤٦/١٢/١٧ لە دوای گەمارۆدانی شاری مەهاباد لەلایەن هێزەکانی سوویای ڕژێمی شا لە ئێران بەپشتگیری ئەمەریکا ، پەلاماری کۆماری کوردستانیان داو لە ئەنجام ئەو کۆمارە رووخێندرا ، ئەویش بەدەستگیرکردنی پێشەوا قازی محەمەد و ئەندامانی حکوومەت و سەرکردایەتی کۆماری کوردستان لە ڕۆژهەڵاتی کوردستان.

تێبینی :– ئەم ویستووە وێنەی پێشەواو ئەندامانی حکوومەتەکەی ... ئەویش .

١٩٤٦/١٢/١٩ هێرشەکانی– ئەلفیت مینە– بۆ سەر بنکەکانی سەربازی لە شاری هانۆی پایتەختی وولاتی ڤێتنام ، لە چەندین شاری دیکە ، کە ئەو مێژووە مێژووی دەست پێکردنی شەڕی هندی چینیە لە دانراوەکانی مێژوولە کێشوەرەکەدا

.

بەتایبەتی لەگەڵ دەست پێکردنی سەرکردەی کۆمۆنیستی هۆشی منە و ژەنەراڵەکان بەرەو شەڕی پارتی زانی دەستی پێکرد و دوای ئەوە بەرەو ناوچە شاخاویەکانی باکووری وولاتەکە دەستی پێکرد لە وولاتەکەدا.

١٩٤٦/١٢/٢١ سەر کردەی کورد مستەفا بارزانی و میرحاج و عزەت عبدالعزیزو نوری ئەحمەد تەها ، سەردانی شاری تارانی پایتەختی ئێرانیان کرد لە پێناو گفتووگۆ کردن لەگەڵ بەرپرسانی ئەنجوومەنی وەزیرانی ئێران ، بەڵام سەردانەکەی بارزانی ئەنجامی بێ سوود بوو ، لەدوای رووخاندنی کۆماری

کوردستان و گۆڕینی هاوکێشەکە لەناوچەو هەرێمەکەدا .

١٩٤٦/١٢/٢٤ لە دایك بوونی چوارەم کۆماری فەرەنسا ، ئەویش بەدارشتنی دەستووری کۆماری چوارەم لەسەر بنەماکانی دەستووری کۆماری سێیەمی فەرەنسادا .

## ١٩٤٧

١٩٤٧/١/١ بۆ یەکەم جار هەلوویستەکانی سەرۆکی یەکیەتی سۆڤیەت جۆزێف ستالین ، بە هەڵە هەلگەڕایەوە سەری بەرامبەر بە بەڵێنەکانی رژێمی شا لە ئێران ، ئەمەریکا کە فەرمانیدا بە کشانەوەی هێزەکانی سووپای سووری سۆڤیەت لەخاکی ئێران و چۆڵ کردنی گۆڕەپانی رامیاری بۆ ئێران و خواستەکانی ئەمەریکاو بەریتانیا .

کە ئەمەش بووە هۆی لەناو بردنی کۆماری ئازربایجان و دوای ئەویش کۆماری کوردستان لە مەهاباد، بە بە هێزکردنی کاری سیخوڕی سەربازی و ئاسمانی لەسەر جمووجۆڵی سەربازی و دەریایی سۆڤیەت ، بە گەمارۆدانی بزووتنەوەی رزگاریخوازی کورد لەباشوورو رۆژهەلات و باکووری کوردستان لە هەموو بوارە جیاجیاکانی پەرەسەندن و رووداوو گۆرانکاریەکان لە ناوچەو هەرێمەکاندا.

١٩٤٧/١/١٨ دەستگیرکردنی دامەزرێنەرو سکرتێری پارتی کۆمۆنستی ئێراق یوسف سەلمان یوسف – فەهد– و هەڤاڵەکانی حازم و ، سارم ، لە شاری بەغدای پایتەخت ، لەلایەن ڕژێمی شانشینی لە ئێراق.

شـــــایانی باســـــه دامەزرێنـــــەری پـــارتی کۆمۆنیـــــستی ئێـــراق سـەلمان یوسف سـەلمان- فەهـــد- لــەدایك بــووی ســـاڵی ۱۹۰۱... ئـــەو بنەماڵـە مەسـیحیە لـە با کـووری کوردسـتانی ژێـر دەسـەڵاتی عوسمـانی بـە هـۆی شـاڵاوە دڕندانەکـەی دەســـەڵاتی عوسمـــانی ، بەتایبـەتی لـە ساڵی ۱۹۱۵ ڕوویـان لـە شـاری موسـڵ کـردووەو لـەوێ لـەدایك بـووە ، کـە بـەئاین مەسـیحی بـووە... بـەڵام لـەڕووی نەتـەوەیی نازانـدرێ ئەرمەنیـە یـاخوود کـوردە یاشەرکەسـیە... بـەڵام گـرنگ ئەوەیە کە عەرەب نیە لە نەتەوەدا .

۱۹٤۷/۱/۲۳ لـە دوای سـاڵێكو یـەك ڕۆژ لـە ڕاگەیانـدنی کۆمـاری کوردسـتان لـە شـاری مەهاباد لە ڕۆژهەڵاتی کوردستان ، فەرمانی دادگا کردنەکە ڕاگەیەندرا بە لـە سێدارەدانی پێشەوا قازی محەمەدو هەڤاڵانی لە لایـەن دادگای ڕژێمی شا لـە ئێران.

۱۹٤۷/۱/۲۳ خاتوومیگاواتی سۆکارتۆ لە شاری جاکارتای پایتـەختی ئەندۆنیسیا لـەدایك بووە ، کە ئافرەتێکی بەهرەدارو لێهاتوو بووەو تاکوو پۆستی سـەرەك کۆماری ئەندۆنیسیای گرتە دەست لەوڵاتەکەیدا .

۱۹٤۷/۲/۱۰ مۆرکردنی پـەیمانی ئاشتبوونەوە لەلایـەن نووێنـەری ئیتالیا لـە گـەڵ ئـەو ۲۱ دەووڵەتەی کە بەشداری شەڕیان کرد بوو دژی ئیتالیا، ئـەویش گـەڕاندنـەوەی سنووری ئیتالیا بۆ ئـەو کاتـەی کە سـنوورەکەی چۆن بوو لـە ساڵی ۱۹۳۸دا لە کێشووەرەکەدا .

۱۹٤۷/۲/۲۲ مستەفا بارزانی بە ئامۆژگاریو بڕیاری شا لـە ئێران بـە هێزەکـانی سـووپای ئێـران ، لـە ناوچـەی نەغـەدە دوورخرایـەوە بـە هـۆی ئـاڵۆزی بـارودۆخی

رۆژهەلاتی کوردستان و بوونی هێزی چەکداری لە دوای رووخاندنی کۆماری کوردستان لەشاری مەهاباد لە هەرێمەکەدا .

١٩٤٧/٣/١٨ شەڕی بەرەی شنۆو نەغەدە بەرپابوو لە رۆژهەلاتی کوردستان دژی هێزەکانی سووپای ئێرانی داگیرکەر لەسەر خاکی کوردستان.

١٩٤٧/٣/٢٤ بەرپابونی شەری نێوان شۆرشگێرە کوردەکانی رۆژهەلاتی کوردستان لەگەل سوپای ئێران لەناوچەکانی خانەو هەلەج و ناوچەی مەرگەوەر لەناوچەکەکدا.

١٩٤٧/٣/٢٩ مۆرکردنی رێکەووتننامە لە نێوان رژێمی شانشینی لە ئێراق و رژێمی تورکیا ، لە گەل چەندین رێکەووتنی دیکەی دۆستایەتی و دراوسێیەتی ، بە تایبەتی لەسەر هەردوو زێی دیجلەو فوورات، بەسوودوەرگرتن لە هەردوو لایەنی داگیرکەری زێیەکانی فوورات و دیجلە ، لە ناوخاکی باکوورو باشووری کوردستانی داگیر کراو لە لایەن دەولەتەکانیان بەپێی پەیمانی لۆزانی١٩٤٧/٧/٢٤ مۆر کراو لە لایەن وولاتانی هاوپەیمان بە سەر کردایەتی بەریتانیا .

جێگەی ئاماژە پێکردنە کە لەو رێکەووتن هاورێیەتیە و دۆستایەتیە و دراوسێیەتیە ٦ شەش پرۆتۆکۆل رەزامەندی لە سەر کرا ، بە تایبەتی پرۆتۆکۆلی ژمارە/١ ، کە چەندین برگەی لە خۆ گرتبوو، ئەویش بە رێکخستنی بەرژەوەندیان لە سەر هەردوو زێی دیجلەو فوورات .

دوای ئەوە رێکەووتن لە سەر ئەوەی کە باشترین جێگە تورکیایە بۆ دەست بە کار بوون لە سەر ئەم جۆرە پرۆژانە و شارەزایانی سووری و ئێراقی دەتوانن سەردانی تورکیا بکەن بۆ ئەم مەبەستە .

لە پێناو پارێزگاری کردن لە کەمنەکردنەوەی ئاو و دروستکردنی چەندین بەنداو و دەریاچە و گۆم ، لە پێناو بەرژەوەندنە تایبەتیەکانی نێوانیان لە ناوچەکەدا .

١٩٤٧/٣/٢٩ پێشەوا قازی محەمەدو هەڤالانی دادگایی کران لە لایەن دادگای شۆڤێنی رژێمی شا لە ئێران لەرۆژهەلاتی کوردستان ، لەدوای رووخاندنی کۆماری کوردستان لە شاری مەهاباد و ، بە دەستگیر کردنیان لەلایەن هێزەکانی

سووپای ئێران بەپشتیووانی و پشتگیری ئەمەریکاو بەریتانیا و یاوەرەکانیان لەناوچەکەدا.

١٩٤٧/٣/٣١ لــە ســێدارەدانی سەرۆکی هەرێمی رۆژهەڵاتی کوردستان پێشەوا قازی محەمەدو هەڤاڵانی لە گۆرەپانی چوارچرا لە ناوەراستی شاری مەهاباد... کە بە دەستەکانی خۆی پەتی سێدارەی بەرزکردەوەو بووە رۆژێکی شکۆدار لەمێژووی بزووتنەوەی رزگاریخوازی کوردو کوردستان ، چونکە راگەیاندنی کۆماری کوردستان و لەسێدارەدانەکەی لەیەك ئاستەنگی راگرتبوو ، لەپێناو کوردو خاکی کوردستاندا .

جێگەی ئاماژە پێکردنە کە پێشەوا قازی محەمەد لە ساڵی ١٩٠١ لە شاری مەهاباد لە رۆژهەڵاتی کوردستان چاوی بە جیهان هەڵهێناوە لە شارەکەدا . ناوی تەواوی – قازی محەمەد قازی عەلی میرزا قاسم میرزا ئەحمەد – ە و دایکی لە تیرەی فەبزوللا بەگییە ، کە ئەوانیش لە مێژەوە ناوبانگی گرنگیان هەبووە لە ناوچەی موکریان لە هەرێمەکەو لە کوردستاندا .

خووێندنەکانی ئاینی تەواو کردووە لە گەڵ فێربوونی زانیاری دیکە بە پێی بارودۆخی ئەو کاتدا و مرۆڤێکی رووناکبیرو زاناو شارەزا بووە لە هەموو بوارە جیا جیاکاندا .

هەروا لەو سەردەمەدا کە بۆ یەکەم جار قوتابخانەی تازە لە شاری مەهاباد

کراوەتەوە ، پێشەوا قازی محەمەد کراوە بە سەرۆکی فەرهەنگی ئەو ناوچەیە ، بێ ئەوەی یارمەتی لە هیچ کەس و وموو چە لە میری وەرگرێت ، خەلکی زۆر هاندەدا بۆ فێربوونی زانیاری و هەموو جۆرە هوونەرێك .
هەروا پێشەوا قازی کێشەی لە گەڵ دەرەبەگەکاندا هەبوو بە هۆی عەشیرەتگەری و لە هەمان کاتدا پشتگیری تەواوی لە هەژارو کاسبکارو جووتیارانی کوردی بەرنەداوەو خەباتی لە پێناودا کردووە و کەسایەتیەك و سەرکردەیەکی نیشتیمانپەروەر و نەتەوە پەروەر بووە لە هەموو بوارە جیا جیکاندا .
هەروا لە سەرەتای جەنگی یەکەمی جیهانیەوە قازی محەمەد و بنە ماڵەکەی ناوبانگیان دەرکردووە لە موکریاندا ، دوای ئەوە بە هۆی چالاکی و ووریایی خۆیەوە توانی ئەم دەسەڵاتە لە سەرانسەری کوردستان پێبگرێتەوە .
لە دوای مردنی باوکی قازی عەلی لە ساڵی ١٩٣٨ ، ئەرکی سەر شانی زیاتر بووە و کرا بە قازی شاری مەهاباد و ئەم کەسایەتیە لە هەموو بوارەکاندا رۆڵی باڵای سەرکردایەتی کردنی هەبووە لە لایەنەکانی رامیاری و پارتایەتی و نەتەوەیی و نیشتیمانی و کۆمەڵایەتی و پەیووەندیە هەمە لایەنەکان لە کوردستاندا .

١٩٤٧/٤/٣ سەر کردەی کورد مستەفا بارزانی لە شەڕی – بەری زەر – ی لە باشووری کوردستان ، بەسووکی زامدار بوو ، ئەویش بەهۆی سەرکردایەتی کردنی شەڕەکە لەلایەن خۆیەوەو زیانی باشیش بەدووژمنی کوردو کوردستان و داگیرکەران گەیەنرا لە ناوچەکەدا .

١٩٤٧/٤/٤ گرێدانی کۆنگرەی دامەزراندنی پارتی بەعسی عەرەبی سۆشیالیست لە سووریا ، بەسەرکردایەتی مێشێل عەفلەق و سەلام بەیتارو مەدحەت بەیتار. دوای ئەوە لە مانگی/ ١٩٤٥/٧ داوایەکیان ئاراسەی وەزارەتی ناوخۆی سووریا کرد ، بۆ پێدانی مۆڵەت بەجوولانەوەکەیان ، بەلام لەم مێژوو مۆڵەتیان پێدرا لە لایەن دەسەڵاتی سووریا .

١٩٤٧/٤/١٧ لـــه دوای لـــه نـاوبردنی کۆمـاری کوردســـتان ، لـــه شــاری مـــههاباد ، لهلایـهن رژێمـی شـا لـه ئێـران . بریـاری بـــارزانی بـــهرهو یهکیـهتی سـۆڤیهت بـووه هـۆی ئـهوهی ، کهخێزانـــــــــه بارزانیـــــــهکان

بگهڕێنـهوه بـۆ نـاو ئێـراق و خـۆ بهدهسـتهوهدانیان بـه دهسـهڵاتی رژێمـی شانـشینی لـه ئێـراق ، لهگـهڵ ئـهو خێزانانـه ، ئهفسهری شۆرشـگێر مـستهفا خۆشناوو هەڤالەکانی کە سووپای ئێراقیان جێ هێشتبوو چوو بوونـه ریـزی هێـزه چـهکدارهکانی بـارزانی لـه شـاری مـههابادو بهشـداری کردنیـان لـه راگهیاندنی کۆماری کوردسـتان لـه مـههاباد ، یاداشتهکانی مستهفا خۆشـناو به درێـژی باسـی ئـهوه دهکـات ، لـه رووی راکردنیـان لـه نـاو سـووپای ئێـراق و چـوونیان بـۆ ریـزی چـهکداره بارزانیـهکان و چـۆنیهتی گهرانـهوهیان لهگـهڵ چهندین لایهنی دیکهدا...؟...!.

١٩٤٧/٤/٧ کۆچـــی دوایـــی داهێنـــــــهری ئوتوومبێلی – فۆرد ، هنـری فـۆرد – لـــه فایـــهرلان – لـــه دێریـــۆزنی لـــه وویلایـهتی مهشـیکان له ئهمهریکا.

جێگهی روونکردنهوهیه که هنری فۆرد لـه ١٨٦٣/٧/٢٠ لـه کێڵگهکـهی خـۆی له شاری – گرین فیلد –ی وویلایهتی مهشیگان له وویلایهته یهکگرتووهکانی

ئەمـەریکا چـاوی بـەجیهان هـەڵهێناوە لـە شـارەکەدا. کـە داهێنـەرو بەرهـەم هینـەرێکی ئەمـەریکی بـووە، هـەروا هێنـری فۆرد دامەزرێنـەری کۆمپانیـای – فۆرد –ی ئۆتۆمبێلْ دروستکردن بووەو ئۆتۆمێلەکەی کە جۆری – T – بوو، کە لە بواری ئۆتۆمبێلْ شۆڕشێکی گەورەی لە بواری گوواستنەوەو گەیاندن و پیشەسازیدا بەرپاکرد، کە بە شێوەیەکی بەرچاو بووە هۆی گۆڕانکـاری مەزن لە شارسـتانیەت و کەلتووری ئەمەریکایەکاندا.

لـە سـەراتادا ولیـەم فـۆردی بـاوکی لـە ناوچـەی –کـۆرك – ی ئیرلەنـدا لـە دایـك بووە و کۆکچبەری روو لە وویلایەتە یـەکگرتووەکانی ئەمـەریکا دەکـات، بـەڵام مـاری فـۆردی دایکـی لـە وویلایەتـی مەشـیگان لـە دایـك بـووە، لـە دایـك و باوکێـکی کۆچبەری بەلژیکـی.

فۆرد لە سەرتای هەرزەکاریدا باوکی کاتژمێرێکی گیرفانی پیْ دەبەخشێت کە زۆر پێـی خۆشـحالْ بـوو، فـۆرد لەتەمـەنی ١٥ سـاڵیدا وەك وەسـتای چاکردنەوەی کاتژمێر ناوبانگی دەرکرد، کە جاری وا هـەبوو ١٠ – تا – ١٢ جـار کاتـژمیرێکی هەلدەوەشـاندەوە و چـای دەکـردەوە. هـەر لەوتەمەنـەدا ئارەزووی ئۆتۆمبێلْ بووە.

مردنـی دایکـی لـە سـاڵی ١٨٧٦ کاریگـەری خـست سـەر دەروونـی فـۆردو لـە هەمان کات باوکی چاوەروانی لە فۆرد دەکرد کە هەوڵـەکانی لە پێنـاو کـاری کێڵگەداریـدا خـەرج بکـات، بـەڵام فـۆرد لـە سـاڵی ١٨٧٩ رووی لـە شـاری – دیترۆیـت – کـردو لـەویْ وەك شـاگردێك کـاری میکـانیکی دەسـت پێکـرد. لـە ساڵی ١٨٨٢ دا گەرایەوە – دێربۆرن – و لـە کێڵگەکـەی خۆیـان سەرپەرستی مەکینـەکانی وێـستینگهای دەکـرد تـا لـە دوایـدا تـوانی لـە کۆمپانیـای وێستینگهای وەك وەستای چاککردنەوەی ئامێری هەڵسیْ دەست بەکاربێت.

دوای ئەوە هنـری ولیـەم فـۆرد لە سـاڵی ١٨٨٨ لە گـەلْ – کلارا ئالابریانت – هاوسـەر گـیری پێـك هێنـا. دوای ئـوە فۆرد لـە سـاڵی ١٨٩١ وەك ئەنـدازیارێك تـونی کـاتێکی بـاش بـۆ تاقیکردنـەوەو ئەزموونـەکانی لـە سـەر ئـامێری – گازۆلین – تەرخان بکات.

دوای ئـەوە لـە سـاڵی ١٨٩٦ تـوانی تـوانی ئۆتـۆمبیڵی - Qua ricycle لـە– شێووە گالیسکەیی بیْ ئەسپ دابهێنێت و بە پارەی فرۆشتنی ئـەو ئۆتۆبێڵـە توانی دانەیەکی باشترو پێشکەوتووتر دروسـت بکـات، دوای ئـەوە لـە سـاڵی

١٩٠٣ دا و لـه تەمـەنی ٤٠ ساڵیدا بـه هاوکـاری - 11 - وه بەرهێنـەری دیکـەو سـەرمـایـەی ٢٨٠٠٠ هـەزار دۆلار کۆمپـانـیای فـۆردی ئۆتۆمبێـل سـازیان دامەزراند.

سـەرەتا هنـری ولیـەم فـۆرد نموونەیـەکی لـەو ئۆتۆمێلـە خـسته روو کـه دەیتـووانی دووری یـەك میـل لـه مـاوەی 39.4 چـرکەدا ببرێـت و لـه کاتژمیرێکدا ١٤٧ کیلۆمـەتر ببرێـت. فۆرد کەسـایەتیەك و مرۆڤێکـی بەرهـەم هێنەر بوو، نزیکەی ١٦١ داهـێنانی لەو بـوارەدا تۆمار کـردووه و وەك تاکـه خـاوەن ئۆتۆمیـڵی فۆرد، کە به دەوڵەمەنـدترین و بەناوبانگترین کەسـەتی جیهان دادەنرێت.

هـەروا سیستەمی – فۆردیزمی – داهێنا کە ئـەویش بریتـی بـوو لـه بەرهـەم هێنـانی ژمارەیـەکی زۆر لـه ئۆتۆمبێلْ و بـه نرخێکـی هـەرزان کـه دەتـوانی لـه مـاوەی ٩٣ خوولەکـدا ئۆتۆمبێلێـك بەرهـەم بـێنێ و لـه هـەمان کاتـدا مـافی رۆژانـەی کـاری کرێکـاران بـەرز دەکـرەوه بـۆ پێـنج دۆلار لـه رۆژێکـدا بـۆ ٨ کاتژمێر کارکردن، لە کاتێکدا لـه کۆمپنیاکـانی دیکـەدا تـەنها دوو دۆلار دەدرا بۆ ٩ کاتژمێر کارکردن.

دوای ئەوه فـۆرد توانـی زیاتـر لـه ١٥ ملیـۆن ئۆتۆمبێـلی فۆرد لـەو مۆدێله بفرۆشێت... بەم جۆره فۆرد بەردەوام بوو لە کاری بەرهەم هێنانی ئۆتـۆمبێلی فۆرد تا کۆچی دوایی کرد و تاکوو ئێستاش ئەم کۆمپانیایه بەردەوامه لـه بەرهەم هێنانی بە پێی گۆرانکاریەکانی سەردەمی پیشەسازی لە جیهان.

١٩٤٧/٤/٢٥ مستەفا بارزانی لە دوای سەردانەکەی بۆ تارانی پایتـەختی ئێران گەرایەوه باشووری کوردستان.

١٩٤٧/٥/١٦ دامەزراندنی فیستیڤالی نێوو نەتـەوەیی سینەمایی کـان لـه باشـــووری فەرەنـــسا راگەیانـــدرا...کـــه ئـــەم فیـــستیڤاڵه ســـاڵانه ئەنجامـــدەدرێت کـــه لـــه ٢٠٠٧/٥/١٦ یـادی شەسـت

سالەی كە بەنمایشكردنی فلیمی – هۆنگ كولگیی – شەوانی دەربەدەریم – كرایەوە... كە ئەمەش لەدوای نمایش كردنی فلیمەكان و هەلبژاردنی فیلمە سەركەوتووەكان خەلات دەكریت لە نیوو بواری سینەما دا لە وولا تە جیا جیا كان لە جیهاندا.

١٩٤٧/٥/١٨ مستەفا بارزانی و هەڤالەكانی گەیشتنە ناو سێ گۆشەی سنووری دابەشكراوی كوردستان و لەگەڵ هێزەكانی سووپای توركیا تووشی شەڕهاتن ، لە بەر ئەوە ناچار بوون بەرەو رۆژهەلاتی كوردستان هەنگاو بنێن بۆ جێبەجێكردنی پرۆگرامی كۆچرەوەكەیان لە كوردستان بەرەو ، بۆ یەكیەتی شۆڤیەتدا .

١٩٤٧/٦/١ بلاوكردنەوەی یەكەم ژمارەی رۆژنامەی كوردستان لە رۆژهەلاتی كوردستان لە شاری مەهابادو بە بەردەوام بوونی لە دەرچوونی رۆژنامەكەدا لە لایەن چەند كەسێكی رۆشنبیری سەر بە رژێمی شا لە ئێران ، لە دوای رووخاندنی كۆماری كوردستان لەلایەن رژێمی شا لە ئێران بەپشتگیری ئەمەریكاو بەریتانیا لە هەرێمەكەدا .

١٩٤٧/٦/٥ وەزیری ئەمەریكی لە ووتارەكەیدا ڕایگەیاند ، كەوا وولاتەكەی ڕووبەڕووی هەموو تەحەدیەكان دەبێتەوەو گوتی:–

ئێمە لە ئەركەكانمان ڕاناكەین ، ئەمەش بە بووژاندنەوەی ئەورووپا ڕاگەیاندراو وەبەرهێنەرە ئەمەریكیەكانە كە ڕۆڵی تێدا دەبینێ ... ئەمەش دواتر ناوی لێنرا پلانی مارشال .

شایانی باسە پاش تێپەڕبوونی دووساڵ بە سەر ڕاگەیاندنی نەخشەی مارشال لە ١٩٤٩/٥/٢٣ بەسەرپەرشتی ڕاستەوخۆی هاوپەیمانان دەستووری بنچینەیی ڕاگەیاندراو بەم جۆرە ئەو گۆڕانە دیموكراسیە لیبڕالیەی روویدابوو ، ماددەیەكی دەستووری و ووردەكاریەكانی ڕۆژانەی پێویست بوولە بەرەو جیهاندا .

١٩٤٧/٦/١٥ مستەفا بارزانی بەرەو یەكیەتی سۆڤیەت بەرێكەووت بەخۆیوو ٥٠٢ كەس لە هەڤالانی ، كە زۆربەی هەرە زۆری لە خزم و كەس و كاری بوون ، ئەویش بەرێگای شاخە بەرزەكانی سەر سنووری كوردستانی داگیر كراو لە لایەن هەردوو رژێمی شۆڤینی ئێران و توركیا لە سەر خاكی كوردستاندا .

١٩٤٧/٦/١٨ پەڕینەوەی مستەفا بارزانی و ٥٠٢ كەس لە هەڤالانی لەرووباری ئاراس بەرەو

سنوورەکانی یەکیەتی سۆڤیەتی پێشوو ، ئەویش لە پاش شەڕێکی دژووار لەگەڵ هێزەکانی سووپای هاوبەشی ڕژێمەکانی ئێران و ئێراق و تورکیا لەسەر خاکی کوردستاندا .

١٩٤٧/٦/١٩ سەرەك وەزیرانی شانشینی لە ئێراق سالح جەبر ئەو چوار ئەفسەرە کوردە پالەوانەی لەسێدارەدا... کە ئەوانیش – عزەت عەبدولعەزیز، مستەفا خۆشناو، خەیروڵلا عەبدولکەریم، محەمەد قوودسی – بەهۆی بەشداریکردنیان لە دامەزراندنی کۆماری کوردستان لە شاری مهاباد لەرۆژ هەڵاتی کوردستان.

١٩٤٧/٧/٥ دامەزراندنی یەکیەتی پۆستەی جیهان ، کە ئەویش لەپێناو ڕێکخستن و پەرەپێدانی خزمەت گوزاری پۆستەبوو لەجیهان ، بە پێی دابەشی جووگرافی ، کە هەر پێنج ساڵ جارێك کۆنگرەیەکی نێوودەووڵەتی دەبەستێ... کە لە ١٩ ئەندام پێك هاتووە ، لەهەمان لێژنەی جێبەجێکردن و گەیاندن ، ئەویش بەپێی ئەو پرۆگرامەی کە کۆنگرە بۆی دادە ڕێژێ.... شایانی باسە ئەو ڕێکخراوەیە دامەزراندنی دەگەڕێتەوە بۆساڵی ١٨٧٥دا.

١٩٤٧/٧/١٢ کۆچی دوایی شاعیرو نووسەرو ڕووناکبیری ناوداری گەلی کوردستان مامۆستا – دڵدار– لە شاری هەولێر لە باشووری کوردستان ، و هەر لە شاری هەولێر ، تەرمە پیرۆزەکەی بە خاك سپێردراوە لە گۆرستانی ژێر بازاری هەولێری نوێی ئێستا.

شایانی باسە کە مامۆستا دڵدار لە ١٩١٨/١٠/٢٠ لە شاری شاعیران و هونەرمەندان کۆیسنجق چاوی بە جیهان هەلهێناوە و خاوەنی مارشی نەتەوەیی کوردی- ئەی رەقیب - ە ، هەروا دڵدار کە زانی لە کاتی راگەیاندنی ئەم کۆمارە لە ١٩٤٦/١/٢٢ سروودی ئەی رەقیب لە کاتی راگەیاندنی کۆماری کوردستان لە شاری مهاباد لە رۆژهەڵاتی کوردستان بۆتە مارشی راگەیاندنی ئەو کۆمارە و لە خۆشیا دەستی کردۆتەگریان . کە ئێستا بۆ سەرەتای کردنەوەی زۆربەی هەرە زۆری رادیۆو تەلەفزیۆنە ناوخۆیی و ئاسمانیەکانی کوردی بۆتە سروودی هەمیشەیی لە کوردستاندا ... ؟.. بەڵام داخەکەم...!

١٩٤٧/٧/١٨ هندستان سەربەخۆیی خۆی بەدەرچوونی لەژێر رژێمی شانشینی بەریتانیا راگەیاند ، کە بە یەکەم دابەشکردنی هندستان کێشووەرکە دادەنرێت ، ئەویش بەجیا بوونەوەی پاکستان لە هندستان و مانەوەی هندستان لەناو رایەلەی کۆمەنوولسی بەریتانیادا ، بە ناوی - کۆماری هندستان - لە شاری نیودەلهی پایتەختی هندستان - کە ژمارەی

دانیشتووانی،١٠,٥٥٠,٠٠٠ ملیۆن کەسە .
هـەروا ژمـارەی دانشیتووانی وولاّتەکـەی ، ١,٢٥٠,٠٠٠,٠٠٠ ملیـار کەسـە .
هەروا رووبەری خاکی وولاّتەکەی ، ٣,٢٨٧,٠٩٠ کبلۆ مەتر چوار گۆشـەیە .
هەروا چڕی دانیشتووانەکەی ، ٨٧٩ کەس لە یەك میل چوار گۆشەدا . هـەروا نژادەکانی ، هندی ئاری ٧٢٪ . دراڤیدی ٢٥٪ . مـەگۆل و ئەوانیدیکە ٣٪ .لـە ناو ئەو ڕەگەزانە زیاتر لـە ٧٥٠,٠٠٠ هـەزار کـورد هەیە ، کە هـەڵگری ئاینی زەردەشتین . لە وولاّتەکەدا .

١٩٤٧/٧/٣١ هەڵووەشاندنەوەی کۆمەڵەی گەلان ، لە دوای کۆتایی هاتنی جەنگی دووەمی جیهـان و دامەزرانـدنی ڕێکخـراوەی نەتـەوە یـەکگرتووەکان و بەشـە جـۆراو جۆرەکـانی ، کـە لەچـەندین ڕێکخـراوی جیاجیـا پێـك هـاتووە ، لـەپێناو چارەسەرکردنی کێشە نێوودەووڵەتیەکاندا.

١٩٤٧/٨/١٤ وولاّتـی پاکسـتان وەك وولاتێکـی نیمـچە سـەربەخۆ دەرکـەووت بەیـەکێك لـە وولاّتـانی دومنیـون ، کـە لـە ژێـر دەسـەلاّتی بـەریتانیا بـوو، کـە مـافی نیمـچە سـەربەخۆیی وەرگـرت و بــە بـەریتانیا بەسـترابووەوەو دەسـەلاّتدارەکانی پاکستان لەژێر دەسەلاتی سەرەك وەزیرانی بەریتانیا بوو بە دامەزراندنیان لـە وولاّتەکەدا . هەروا لە ڕۆژی ١٩٤٧/٨/١٥ سەربەخۆیی خۆی بە جیابوونـەوەی لە هندستان راگەیاند .
دوای ئەوە لە سالّی ١٩٥٦ بە تەواوی سەربەخۆیی وولاّتەکەی بە دەرچوونی لـە ژێـر دەسـەلاّتی بـەرینانیا لـە وولاّتەکیـدا راگەیانـد و بـووە وولاّتێکـی سەربەخۆی نێوو دەووڵەتی لە کێشووەرەکەدا .

١٩٤٧/٩/٥ بـەرپابوونی خۆپیـشاندانی ئیـسلامە کوردەکـان بەسـەرکردایەتی جـودت حمیدوللاخان بەداواکردنی گەرانەوەی هەرێمی کشمیر بۆ سەر پاکستان بەلاّم هێزی پۆلیس بەگوللە توانیان خۆپیشاندانەکە دابمرکێننەوە لە هەرێمەکەدا .

١٩٤٧/٩/٢٠ کۆچی دوایی نووسەرو رووناکبیرو کەسایەتی ناوداری کورد حوسێن حوزنی موركیانی لە شاری بەغدای پایتەختی ئێراق.
جێگـەی ئامـاژە پێکردنـە کـە مامۆسـتا حوسـێن حـوزنی موکریـانی ...کـە بە

حوزنی داماو ناسراوە ... کوری سەید لەتیف موکریانیە و لە ١٨٩٤/١٠/٢٢ لە گەرەگی حەسانیانی شاری مەهاباد لە رۆژهەلاتی کوردستانی داگیر کراوو ژێر دەسەلاتی فارس لە ئێران چاوی بە جیهان هەلهێناوە لە هەرێمەکەدا .

هەروا لە سالی ١٩٠٦ شاری مەهابادی جیٚ هیٚشتووە و لە سالی ١٩١٥ لە ئەلمانیا چاپخانەیەکی کریووەو گەراوەتەوە شاری حەلەبی ئیٚستای وولاتی سووریا و دەستی کردووە بە کاری چاپەمەنی ... لە سالی ١٩٢٥ دەچیٚتە باشووری کوردستان و لە شارۆچکەی رواندزی سەر بە پاریٚزگای هەولیٚر ، چاپخانەکە دادەمەزریٚنیٚت و یەکەمین ژمارەی گۆڤاری زاری کرمانجی لە ١٩٢٦/٥/٢٥ لەم شارۆچکە بلاو دەکاتەوە و بەردەوام دەبیٚت تا ١٩٣٢/٧/٢٣ ، کە سەر جەم ژمارەکانی زاری کرمانجی ٢٤ ژمارە بوونە لە هەریٚمەکەدا .

دوای ئەوە کارەکانی دەگوازیٚتەوە بۆ شاری سلیٚمانی و دوای ئەوەیش دەگەریٚتەوە شاری هەولیٚر ، هەروا لە شاری هەولیٚر گۆڤاری رۆناکی لە ١٩٣٥/١٠/٢٤ بلاو دەکاتەوە تا لە ١٩٢٦/٥/١٦ ، کە سەر جەم ژمارەی گۆڤارەکە ١١ ژمارە بوونە ... دوای جەنگی دووەمی جیهان مامۆستا حوسیٚن حوزنی موکریانی روو لە شاری بەغدا دەکات و سەرپەرشتی گۆڤاری دەنگی گیٚتی تازە دەکات لە شارەکەدا

هەروا مامۆستا حوسیٚن حوزنی موکریانی خزمەتیٚکی بیٚ ویٚنەی بزووتنەوەی رۆشنبیری کوردی کردووە و چەندین کتیٚبی بە نرخی بە چاپگەیاندووە و بۆتە سەرمایەکی بیٚ ویٚنە بۆ کورد و بزووتنەوەی رزگاری کورد لە کوردستان بە گشتی و لە باشووری کوردستان بە تایبەتی ، لە هەموو بوارە جیا جیاکان

و بەردەوام بوونی ئەم کەسایەتیە لە کارە پیرۆزەکانی تاکوو ماڵئاوایی لە گەل و نیشتیمانەکەی دەکات لە شاری بەغدای پایتەختی ئێراق .

١٩٤٧/٩/٢٨ لەکارێکی ناکاویدا لە چاوپێکەوتنی رەخنەگر – هانزفیرنردیشترو نووسەر – ئەلفرید ئەندریش – و ژمارەیەك لە نووسەرە ئەلمانەکان ئەم چاوپێکەوتنەش لە پێناو دەرچواندنی گۆڤارێکی ئەدەبی نوێ بوو بەناونیشانی – ئەلعەقرەب – کە ببێتە زمان حاڵی گەنجەکان لە ئەلمانیا لەدوای جەنگی دووەمی جیهانی لە ١٩٣٩ – ١٩٤٥ – بەلام ریشترو ئەندریش لەهەمان ساڵ گۆڤارێکیان دامەزراند بەناوی – ندا – کە سەرکەووتنێکی باشیان لێ بەدەست هێنا ، کە هەر ژمارەیەکی زیاتر لە ١٠٠ هەزار دانەی لێدەفرۆشا.

بەلام لەوکات دەسەلاتدارانی ئەمەریکا لەشاری بەرلین ئەو گۆڤارەیان لە دەرچوواندن قەدەخەکرد... بەهۆی رەخنەگرتنیان لە هەڵس و کەوتەکانی هێزەکانی سووپاو بەرپرسانی ئەمەریکاو فەرەنساو بەریتانیا – هەروا گرڤاری عەقرەبیش بەهەمان شێووە مامەڵەی لەگەلدا کرا بە هۆی نووسینی رەخنەگرتن لەهەڵس و کەووتی ئەو وولاتانە.

دوای ئەوە ریشتر و هاورێکانی بیریان لەسەنتەرێکی بە بەڵگە گەیشتنی نووسەرانی گەنج کردەووە. هەوڵی ئەوانە بوو، کە چیرۆکێکی سەرسورمان و لە دوایی ناوزەند بوون بە کۆمەڵی /٤٧... دوای ئەوە ئەو کۆمەڵە گەنجانە هەنگاوی باشیان بەرەو پێشەوە دەنا لە پێناو بەرۆشنبیر و زانستی و بەرگری کردن لە بوارەکانی ماف مرۆڤ لە ئەلمانیا، لە ئەنجام چەندین کەس لەو گەنجانە توانیان پاداشتی نۆبل و بروانامەی بالا بەدەست بێنن لە بوارەکانی ژیان.

لە پێناو گەیشتن بە کۆمەڵگایەکی مەدەنی و بەهێزکردنی ئەلمانیا لەهەموو بوارەکان... کە ئێستاش ئەلمانیا بۆتە یەکەم وولاتی ئابووری بەهێز لەجیهان لەتەك یابان و ئەمەریکا لە جیهان.

١٩٤٧/٩/٢٩ لە پەناهەندەییدا مستەفا بارزانی لە پارێزگای – نەخچەوان –ی کۆماری ئەرمینیای سۆڤیەتی گووازراوە بۆشاری باکۆی پایتەختی کۆماری

ئازربایجانی یەکیەتی سۆڤیەت.

١٩٤٧/١٠/٢٣ رژێمی شا لە ئێران رێکەووتننامەی نەوتی لەگەڵ دەسەلاّتی یەکیەتی سۆڤیەتی مۆرکراو هەلووەشاندەوەو بە ئارەزووی خۆی مامەلەی لەگەڵ کوردو رۆژهەلاّتی کوردستانی ژێر دەسەلاّتی رژێمەکەی دەست پێکرد لە هەرێمەکەدا.

١٩٤٧/١٠/٢٤ لە ئاکامی خۆپیشاندان و دەربرینی نارەزایی و کێشەو ململانێ تێکۆشەرانی هەرێمی کەشمیر ، توانیان بەشێکی زۆر لە وولاّیەتی کەشمیر رزگار بکەن و حکوومەتی کشمیر پێك بێنن بەناوی – ئازاد کەشمیر– لە هەرێمەکەدا .

١٩٤٧/١١/٧ راگەیاندنی جیهانی لە بارەی دژی رەگەز پەرستی بەرامبەر بە ئافرەت لەلایەن کۆمەڵەی گشتی نەتەوە یەکگرتووەکان.

١٩٤٧/١١/٢٩ لە بریارێکی رێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان ، ئەویش بەدابەش کردنی فەلەستین بە دووبەش ، کە بەشی یەکەمی کەوتە ژێردەسەلاّتی جوولەکەو بەشی دووەمی کەوتە ژێردەسەلاّتی عەرەب ، دوای ئەوە لە ٥/١٥ دامەزراندنی دەووڵەتی ئیسرائیل و ١٩٤٨ راگەیاندرا بە دان پێنانی لەهەمان کاتدا ، لەلایەن ئەمەریکاو بەریتانیاو تورکیاو وولاّتانی دیکەی جیهان .

هەروا دیاریکردنی سنووری دەووڵەتی یەهوودی لەلایەن کۆمەڵەی گشتی رێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان ، بە دامەزراندنی حکوومەتی کاتی ئیسرائیل و دەست بەکار بوونی دەسەلاّتی بەسەر یافاو بەشێك لە باشووری رۆژئاوای جەلیل و عەکاو زیب ، هەروا بەسەر دانیشتووانەکانی سنوور ، کە دەگاتە سنووری لوبنان و گەرەکی یەهوودی لەناو پەرژینی شاری قوودسی کۆن .

ئەمەش بووە سنووری دەووڵەتی ئیسرائیل ، کە هۆکاری بنەرەتی و سەرەکی بەرپابوونی کێشەو ململانێی نێوان ئیسرائیل و عەرەب دەستی پێکرد لەناوچەو هەرێمەکەدا .

١٩٤٧/١٢/٧ یەکەم هەلاّتنی هێزەکانی سووپای فەرەنسا روویدا بەرامبەر شۆرشگێرانی – ئەلفیت مینە–ی ڤێتنام ، لەناوچەی سۆنگ لۆ .

کە بووە هۆی دەست پێکردنی گفتووگۆ لە نێوان نووێنەری سامی فەرەنسی و نووێنەری ڤێتنامیەکانی لایەنگیر لە کەنداوی – ئەلونگ– بە

مــۆرکردنی رێکەووتننامــەی نێوانیــان بــەناوی رێکــەووتنی ئــەلۆنگ لــە ناوچەکەدا .

## ١٩٤٨

١٩٤٨/١/١ دامەزرانــدنی یەکیــەتی گــومرگی لــە نێــوان شانــشینی بەلــژیکاو هۆڵەنــداو لاکسمبۆرك بەناوی – بنیکلس– کە رۆڵی گرنگی هەبوو لە بواری بازرگانی و ئالووگۆری کەلووپەلی پیشەسازی و کشتووکالی و تادوایی لەجیهاندا .

١٩٤٨/١/٤ وولاتی میانمار له دوای خــــەبات و تێکۆشـــــــانی بــەردەوام تــوانی ســــــەربەخۆیی خـــــــۆی بەدەرچــــــوونی لــەژێر دەســەڵاتی شانـــــــشینی بـــــــەریتانیا رابگەیـــــــەنێ ، کەزیاتر لە ٢٢٤ ساڵ لەژێر دەستی بەریتانیا بوو لە هەموو بوارە جیاجیاکان بەمانەوەی لەناو رایەلەی کۆمەنوولسی بەریتانیا. بە ناوی کۆماری بۆرما لە کێشووەرەکەدا .

ئەم وولاتە پێی دگووترێ – میانمار – لەهەمان کات پێی دەگـووترێ بۆرما – کـە نـاوی پایتەختەکـەی – راگـۆن ، رایخـۆن – و ژمـارەی دانیـشتووانەکەی ، ٣,٩٥٠,٠٠٠ ملیــۆن کەســە . هــەروا ژمــارەی دانیــشتووانی وولاتەکــەی ، ٥٥,٣٨٠,٠٠٠ ملیۆن کەسە . هەروا رووبەری خاکی وولاتەکەی ، ٦٧٦,٥٥٠ هەزار کیلۆ مـەتر چـوار گۆشـەیە . هـەروا چڕی دانیشتووانی ، ١٧٤ کـەس لـە یەك میل چوار گۆشەدا . هەروا نژادەکانی ، بۆرمیەکان ٦٨٪ . شان ، کارخین ٣٠٪ . لە وولاتەکەدا .

١٩٤٨/١/١٥ مۆركردنی پەیمانی – پۆرتسمۆث – لە نێوان رژێمی شانشینی لە ئێراق و بەریتانیا ، كە بەو هۆیەوە كاروباری تەواوی دەسەلاتی ئێراق كەوتە ژێر دەسەلاتی شانشینی بەریتانیاو بە بەهێزبوونی رامیاریەتی راوێژكاری بەریتانیا لەسەر ئێراق .

لەهەموو بوارە جیاجیاكان بەتایبەتی لەسەر سامانی نەوت و گاز، كە ئەو كاتەش هەمووی لەخاكی باشووری كوردستان بەهەم دەهێندرا لە پارێزگای كەركوك و شاری خانەقین لە هەرێمەكەدا .

١٩٤٨/١/١٩ سەركردەی كورد مستەفا بارزانی ووتارێكی لە پێش كۆنگرەی باكۆی پایتەختی كۆماری ئازربایجانی یەكیەتی سۆڤیەت خووێندەوەو باری كوردو شۆرشەكانی كوردی لە كوردستان یەكەیەكە روونكردەوە ، كە كوردە ئاوارەكانی رۆژهەلاتی كوردستان و باشووری كوردستان و باكووری كوردستانی لكێنراو بەئێران و ئێراق و توركیا بەشداریان تێدا كرد ، بەگەیاندنی دەنگی كورد بەجیهانی دەرەوەی كوردستان.

١٩٤٨/١/٢٥ وەزیری دارایی پێشووی حكوومەتی شێخ مەحمودی حەفیدو كەسایەتی ناوداری شۆرشگێری كورد ، كەریم عەلەكە لە شاری سلێمانی كۆچی دوایی كردووەو گۆرەكەی لە شاری سلێمانیە لە هەرێمی باشووری كوردستان .

١٩٤٨/١/٢٧ ئەنجامدانی خۆپیشاندان و راپەرین لە هەموو شارەكانی ئێراق بە تایبەتی لە پارێزگاكانی باشووری كوردستان دژی دەسەلاتی شانشینی لە ئێراق ، ئەویش بە هۆی مۆركردنی پەیمانی پۆرتسمۆتی دژ بە گەلانی ئێراق لە نێوان

ئێراق و بەریتانیا.

١٩٤٨/١/٣٠ بانگەشــەکردنی گانــدی دامەزرێنــەری وولاتــی هندســتان بــۆ رێزگــرتن لــە موسلمانەکان بە دڵی هیندۆسەکان نە ئەبوو، بەڵکوو هەندێك چین و تووێژی ئــەم تایەفەیــە بەخیانــەتکاریان وەســف کــردو ئــەوە لــەم رۆژەدا کەســێکی هندۆســی توونــدرە ســێ گوولــەی ئاراســتەی گانــدی کــردو تــیرۆری کــرد کــە لەوکاتە گاندی تەمەنی ٧٩ ساڵ بوو.

١٩٤٨/١/٣٠ شۆرشــگێرو پێــشەواو رابــەرو دامەزرێنــەری کۆمــاری هندســتان- گانــدی- لەلایــەن بەرهەلــستکارانی تــیرۆر کــرا... شــایانی باســە ئەو بنەماڵەیــە بەهۆی هەلووێــستی بوێرانــەو شۆرشــگێریان لــەپێناو بەمــەدەنی کردنــی گــەلانی هندســتان ، هــەموویان رۆڵی ســەرکردایەتی هندســتانیان گرتــە دەســت و هــەر هــەموویان لــە ناوەنــدەکانی دەســەلاتیان تــیرۆر دەکــران ، ئــەو بنەماڵەیــە دامەزرێنەری پــارتی کۆنگرەی هندســتان بــوون . لەهــەمان کــات رۆڵی گرنگیــان هــەبووە لــە دامەزرانــدنی جوولانــەوەی - حرکــة عــدم الانحیــاز- لــەنێوان وولاتــانی تــازە پێگەیــشتوو و دیمــوکرتی و نیــشتمانخواز لــە هــەموو کێشووەرکان.

١٩٤٨/٢/٤ گــــەلانی وولاتــــی ســــــــــریلانکا سەربەخۆیی خۆیان لــــەدوای هــــەول و کۆشــــشێکی بــــێ وچان راگەیاند . بە ناوی – کۆماری ســەریلانکا – نــاوی پایتەختەکــــــەی – کۆلۆمبۆ – یەو هەروا ژمارەی دانیشتووانەکەی، ١,٨٦٥,٠٠٠ملیۆن کەسە لە شارەکەدا

هەروا ژمارەی دانیشتووانی وولاتەکەی ، ١٩,٩٠٠,٠٠٠ ملیۆن کەسە . هەروا

رووبـەری خـاکی وولاّتەکـەی ، ٦٢,٦١٠ هـەرا کیلـۆ مـەتلر چـوار گۆشـەیە . هەروا چڕی دانیشتوانەکەی ، ٧٨٧ کەس لە یەك میل چوار گۆشـەدا . هـەروا نژادەکانی ، سنهالیۆن ٧٥٪ . تامیل ١٨٪ . مەراکشی ٧٪ . لە وولاّتەکەدا .

١٩٤٨/٢/١٠ کۆچی دوایـی دەرهێنـەرو داهێنـەری سـینمایی نـاوداری ڕووسـیا و جیهـان- ئارنستیلن .

شایانی باسە لە سالّی ١٩٥٨ لە شاری برۆکسل لیژنەی ناوبژیووان لەمێژوو نووسانی سینەما لە کۆی ٢٦ دەنگ لەو وولاّتانەی کە پێکهاتبوو، فیلمی- زرێپۆشی بوتمکین- بەچاکترین فیلمی سینەمایی لەجیهان راگەیاندرا ، کە لەلایەن ئەو ناودارە بەرهەم هێنرابوولە وولاّتەکەیدا .

١٩٤٨/٢/١٣ کۆمەلێك لە کەسایەتیو جەماوەری پارێزگای هەولێرو شارۆچکەی کۆیە لە باشـووری کوردسـتانی لکێنـدراو بـەئێراق ، سـەردانی شـاری بەغـدای پایتـەختی ئێراقیـان کـرد ، لـە پێنـاو بەشـداریکردن لـە خۆپیـشاندان دژی مـۆرکردنی پـەیمانی پۆرتـسمۆث ، کـە دوا بـەدوای ئـەوانیش کەسایەتیو جـەماوەری پارێزگـای سـلێمانی بـەرەو شـاری بەغـدا بەرێکـەووتن لـە پێنـاو رەتکردنەوەی بیری داگیرکەران.

١٩٤٨/٢/٢٦ شـاندێکی گـەورەی کـورد ، کـە زیـاتر لـە ٥٠٠ هـاوولاتی پێـك هـاتبوو لـە شارۆچکەکانی رانیـەو زاخـۆو پارێزگـای سلێمانی لـە باشـووری کوردسـتانی لکێنراو بەئێراق ، گەیشتنە شاری بەغداو لـە گۆرەپـانی کۆشـکی شانشینی دەسـتیان کـرد بـە رێپێـوان بـەرەو گۆرسـتانی - بـاب المعظـم- بەشـەقامی رەشید.

کـە ئـەو کـارەش لەکاتـژمێر دووی پـاش نیـوەرۆ دەسـتی پێکـرد ، ئـەویش بەجلووبەرگی کوردیو هەر کوردیش خۆیـان رێکخـەری ئـەو رێپێوانـە بـوون ، وەك نامەیـەکی کـراوە بـۆ دەسـەلاّتدارانی شانـشینی ئێـراقو بـەریتانیا لـە وولاّتەکەدا .

١٩٤٨/٣/١٧ مـۆرکردنی پـەیمانی زەمـانی کۆمەلاّیـەتی لـە شـاری برۆکـسل لـە نێـوان بـەریتانیاو فەرەنساو بەلـژیکاو هۆلەنـداو لۆکـسمبۆرگ ، لـەپێناو نەخـشەی هاوبەشـی هاوکـاری وولاّتـانی ئـەورووپای رۆژئـاوا ، لەگـەلّ ئەمـەریکا لـەپێناو بـەرگری کـردن لـە رۆژئـاوا... دوای سـالێك ئەمـەریکاو هۆلەنـداو ئـەو پێـنج

وولاتـەی كـە لـە سـەر پـەیمانی برۆكسل مۆریـان كردبـوو ، وەك ئیتالیـاو دانیمـاركو نەرویـژوپورتووگالو ئیسلەندا چـوونە ریـزی ئـەو رێكخـراوە لەجیهاندا.

١٩٤٨/٣/٢١ بەپێی بارودۆخی ئەوكاتی ئێراق ، بۆ یەكەم جار كورد توانی جەژنی نەورۆز بە هەلگیرساندنی ئاگری نەورۆز یاد بكاتەوە لە شاری بەغداو هەروا گوندو شارۆچكەو شاخە بەرزەكانو شارەكانی كوردستانی لكێنراو بەئێراقدا .

١٩٤٨/٣/٣٠ بلاوكردنەوەی یەكەم ژمارەی رۆژنامەی – نزار– لەلایەن مامۆستا عەلائەدین سجادی ، كە بەزمانی عەرەبی و كوردی لـلاو دەكرایەوە ، كە یەكەم جار لە ١٥رۆژ جارێـك بەچاپدەگەیەنراو دەگەیـشتە دەسـت خوێنـەران لـە ئێـراق و بەتایبەتی لە باشووری كوردستان .

١٩٤٨/٤/٧ دامەزرانـــدنی رێكخـــراوی تەندروســـتی جیهـــان ، ی ســـەر بەنەتـــەوە یـــەكگرتووەكان ، لـــە پێنـــاو بـــەرگریكردن لـــە بلاوبوونـــەوەی هـــەموو جـــۆرە نەخۆشیەكو چارەسەركردنو یارمەتیدانی لیقەوماوان لەجیهاندا.

١٩٤٨/٤/١٤ دامەزرانـدنی یـەكێتی گشتی قوتابیـانی ئێـراق لـە لایـەن پـارتی كۆمۆنیـستی ئێـراق ، ئـەویش بـە یاكردنـەوەی گرێـدانی كـۆنگرەی – سـیباع – لـە شـاری بەغدای پایتەختی ئێراق.

١٩٤٨/٤/٢١ لە دوای راگەیانـدنی سەربەخۆیی وولاتـی هندستانو پاكستان ، كـــە ئـــەو دوو وولاتـــەش بوونـــە هۆكـــــــاری داگیركـــــردنو دابەشـــــكردنی هـەرێمی كـشمیر لـە نێـوان هندسـتانو پاكـستان ،... هەرهنـدیش كێـشەی كـشمیری بـەرز كـردەوە بـۆ رێكخـراوی نەتەوە یەكگرتووەكانو... لە هەماكات رێكخراوی نەتەوە یەكگرتوەكانیش

بڕیاری ژمارە/ ١٨ی دەرکرد ، لەبارەی کێشەی کشمیر بۆ چارەسەرکردن ، بەڵام هند دەستگیر نەبوو بەبڕیارەکەو تاکوو ئێستاش . کێشەی کشمیر بە هەڵوواسراوی ماوەتەوە لەنێوان هندو پاکستان، هەردوو وڵاتیش خاوەن چەکی ئەتۆمن و گەلەکانیان لەوپەری هەژاری دا دەژین لە وڵاتەکانیان و کێشووەرەکەدا .

١٩٤٨/٥/١٢ نووسەرو ڕۆژنامە نووس تارق محەمەد سەعید جامباز لە شاری هەولێر پایتەختی باشووری کوردستان چاوی بە جیهان هەڵهێناوە . خوێندنی سەرەتایی و ناوەندی و ئامادەیی و زانکۆی لە هەولێر تەواوکردووە .

بکالۆریۆس لە یاساو سەرنووسەری گۆڤاری یاساپارێزی کە گۆڤارێکی یاساییە بەزمانی کوردی دەردەچێ و ١٨ پاشکۆی بەچاپ گەیاندووە.

لە کۆتایی شەستەکان بەشداری لەخەباتی ڕێکخستنی یەکێتی قوتابیانی کوردستان کردووە هەر بە پلەی ئەندام و دواتر ئەندامی لقی هەولێر بووە تاکو دەستەی باڵا وەرگرتووەو بەشداری لە شۆڕشی ئەیلولدا کردووە

دوای نسکۆی ١٩٧٥ هەرچەندە پاڵەپەستۆو چاوسوورکردنەوەو هەڕەشەو گوڕەشەی لێکراوە ، بەڵام خۆڕاگرانە نەبۆتە بەعسی و بەرگی جەیشی ناشەعبیشی نەپۆشیووەو نووسینەکانیشی بە زمانی کوردی و عەرەبی بۆ داکۆکیکردن لە ناسنامەی تایبەتمەندی نەتەوەکەی تەرخانکردووە ، دوای ڕاپەڕینە مەزنەکەی ١٩٩١ بۆتە پەرلەمانتار لەخوولی یەکەم لە ساڵی ١٩٩٢ و دووەمی پەرلەمانی کوردستان لە ساڵەکانی ٢٠٠٥- ٢٠٠٩ و جێگری

سەرۆكی لیژنەی پێداچوونەوەی پرۆژەی دەستووری هەرێمی كوردستان- ئێراق بووە ، ئەندامی لیژنەی یاسایی و بەشداری لە لیژنەی پشتیوانی پەرلەمانی كوردستان بۆ لیستی هاوپەیمانی كوردستانی لە پەرلەمانی ئێراق بۆ نووسینەوەی دەستووری ئێراق ٢٠٠٥ كردووەو لە سەر پێشنیازی ئەو دەستوورەكە لە لایەن – un- نۆسەدو پەنجا هەزار دانەی لێ چاپ و بلاوكراوەتەوەو هەر لەلایەن ئەوو سێ پەرلەمانتاری دیكە وەرگێردراوەتەوە بۆ سەر زمانی كوردی و لە دەستەی دامەزرێنەری سەندیكای رۆژنامە نووسانی كوردستانەو ئەندامی یەكێتی نوسەرانی كوردو سەندیكای پارێزەرانی كوردستانەو... هتد.

كە دەستنووسی – اعلام الكرد العراق– لە نووسینی پارێزەر جەمال بابان سالی ٢٠٠٢ درا بە دەزگای رۆشنبیری و بلاوكردنەوەی كوردی لە شاری بەغدا ئەوسا بەرێوەبەری گشتی دەزگاكە لەسەر ناوی (٣٠) سی كەس بە پێتی – X- ئێكس نووسی كە نابێ ناویان لەم دەستنووسەدا هەبێ كە ئەمانەن – ئیبراهیم ئەحمەد ، مستەفا بارزانی ، دلشاد مەریوانی ، رەفیق سالح ، سیروان شاكر ، گارق جامباز ، عەبدوللا ئاگرین... ولە سالی ٢٠٠٦ لە سلێمانی چاپكرا.

لەچەندین كۆنگرەی نێوودەوولەتی لە هەندەران و كوردستان لە بارەی فیدرالی ٢٠٠٥ لە ئیتالیاو ٢٠٠٧ لە ئەلمانیاو ٢٠٠٨ لە هەولێر بەشداری كردووەو ئەم بەرهەمانەشی بە زمانی كوردی عەرەبی بەچاپ گەیاندووە:-

١ – محەمەدو سێویّو سورمێ خانو قورشیدی چاو بەخار (دوو تراژیدی فۆلكلۆری كوردی)، ١٩٨٣. ..تێكستی هەشت چیرۆكی ئەفسانەی كوردی، ١٩٨٦... چل كەزی، ١٩٩٠.

هەفتەنامەی گۆڤار (هەفتەنامەیەكی حزبی (هیوا) لەهەولێر، ١٩٩٨.

مراسیم وقرارات مجلس قیاده الپوره (١٩٦٣- ٢٠٠٣) المتعلقه بكوردستان، ٢٠٠٤. گ٢.

الـتگهیر العرقـی (تغـییر القومیـه) للكـورد والتركمـان ق كركـوك، ٢٠٠٤. گ٦....زمانە فەرمییەكان لە دەستووری ولاتە فیدرالیەكان، ٢٠٠٥.

القانونی هادی الچاوشلی مواقف کوردیه مجهوله، ٢٠٠٥.
حزبی هیوا لە لیوای هەولێر، ٢٠٠٥.
اماکن العباده المدمره للمسلمین والمسیحیین والایزیدین لفتره ما قبل عملیات الانفال السیئه الصیت وامتداداً لما بعدها فی کوردستان- العراق، ٢٠٠٦.
پەرلەمانتارانی خولی دووەمی پەرلەمانی کوردستان (٢٠٠٥- ٢٠٠٩)، ٢٠٠٧.
اعچاو برلمان الدوره الپانیه لبرلمان کوردستان- العراق، ٢٠٠٨.
من اباده اللغات الی قانون اللغات الرسمیه فی العراق الاتحادی، ٢٠٠٨.
اوراق فیدرالیه من کوردستان- العراق، ٢٠٠٨.
لیال کوردیه فی الف لیله ولیله مع کتابات ئخری، ٢٠٠٨.
پەرلەمانتارانی لیستی هاوپەیمانی کوردستان لەپەرلەمانی عێراقدا، ٢٠٠٩
پەرلەمانتارانی خولی دووەمی پەرلەمانی کودرستان (٢٠٠٥- ٢٠٠٩)
پرسیاربارانی حکومەت دەکەن. ٢٠٠٩.
چحایا عملیات الانفال من المسیحیین والایزیدیین، گ٢، ٢٠٠٩.
لەناودارانی دەڤەری سۆران شێخ کاك ئەمینی سەران (١٨٧٤- ١٩٤٠) پارێزەر/ گارق جامباز، ٢٠٠٩.
Kerkük'te Kürt Ve Türkmen Soykirimi (Kimlik Değiştirme) 2009. Ethnic Cleansing (Kurds and Turkmans) Forced to Change their national identities in Kirkuk Matli D. Translated from Arabic by: khammd, Sami M. Sheiko. 2009
٢ – عملیات الانفال لعام ١٩٨٨ فی کوردستان- العراق جریمه العصر المنسیه (موپوقه بقوائم الاسما و الاگفال والنساو) الجزو الاول مع نهله محمد، ٢٠٠٤.
شزرات من واقع المراه الکوردستانیه خلال الاعوام (١٩٩٢- ٢٠٠٩)،

کوردستان العراق نموذجاً. گ٥. مع نهله محمد، ٢٠٠٩.
ئاماری دانیشتوانی قەڵای هەولێر ١٩٢٢ لەگەڵ نەژاد بەرزنجی، ٢٠٠٦.
ڕەواندوز شارەکەی پاشای گەورە لەگەڵ مەولود شێخانی ٢٠٠٦.
اتفاقیه السلام الشامل بین حکومه جمهوریه السودان/ والحرکه الشعبیه لتحریر السودان، مع المحامی کریم محمد صوفی، ٢٠٠٥.
نصوص الدساتیر فی الدول العربیه مع المحامی کریم محمد صوفی، ٢٠٠٥.
قەندیلۆکە وەرگێڕان لەگەڵ عەباس محمد حسین، ١٩٧٩.
پەرلەمانتارانی خولی یەکەمی پەرلەمانی کوردستان (١٩٩٢- ٢٠٠٥) لەگەڵ نیعمەت عەبدوڵا پیرداود، ٢٠٠٨.

BIST FROM OF THE REALITY OF KURDISTAN WOMEN, 2004- 1992, IRAQI KURDISTAN AS AN EXAMPLEk

Tariq Jambaz & Nahla Mohammad, IRAQ KURDISTAN NATIONAL ASSEMBLY MPs, Kurdistan-2006.

٣ – لە تەك ئامادەکردنی دەستووری (١٥) وڵاتانی فیدراڵ و (٥) لەهەرێمەکانیان و (٣) چاپەمەنی لەبارەی زمانە فەرمییەکان لەوڵاتانی فرە زماندا.

٤ – سەرنووسەری گۆڤاری یاساپارێزییە، گۆڤارێکی یاساییە بەزمانی کوردی دەردەچێت، و18 پاشکۆی بەچاپ گەیاندووە.

٥– دەیان لێکۆڵینەوە لە گۆڤارو ڕۆژنامەکان بەزمانی کوردی و عەرەبی بڵاوکردۆتەوە

١٩٤٨/٥/١٤ ڕژێمی شانشینی لە ئێراق – حووکمی عورفی – لە هەموو ئێراق... ڕاگەیان، کە ئەمەش بووە هۆی پاشگەزبوونەوەی ڕژێمی شانشینی بەم نیمچە

ئازادییەی کە لە ئێراق هەبوو کە بە خەبات وتێکۆشانی گەلانی ئێراق و مل کەچنەکردنی بەرژێم هاتبووە کایەوە.

هەر لەو کاتەش سەرجەم هێزە نیشتیمانی و دیموکراتەکان رووربەرووی شالاوێکی درندەی فراوان هات، لە گرتن و تۆقاندن و دروستکردنی دلّە راوکێ لە ناو دەروونی گەلانی ئێراق، بە تایبەتی لە دوای لەکار کەووتنی حکوومەتی محەمەد سەدرو دامەزراندنی حکوومەتێکی تازە لەلایەن نووری سەعید... ئەمەش بووە هۆی گەماڕۆدانی جوولانەوەی نەتەوەیی و نیشتیمانی و کۆمەلایەتی لە ئێراق.

١٩٤٨/٥/١٤ ئەنجوومەنی نیشتمانی یەهوودی- واتە کنیست- سەربەخۆیی دەوولّەتی ئیسرائیلی راگەیاندو ، یەکەم پۆستی سەرۆکی دەوولّەتی ئیسرائیل

لەلایەن - حایم وایزمان- گرترا دەستو یەکەم سەرەك وەزیرانیش لەلایەن دیڤید جریۆتی گرترا دەست ... شایانی باسە ئیدارەی ئەمەریکا بەر لەو راگەیاندنە دانی بە دەوولّەتی ئیسرائیل نابوو شان بەشانی بەریتانیا لە جیهاندا .

کە پایتەختی وولاّتەکەی شارەکانی - ئۆرشلیم و قوودس - ە و ژمارەی دانیشتوانەکەی ، ٨٠,٠٠٠ هەزار کەسە . هەروا ژمارەی دانیشتووانی وولاّتەکەی ، ٦,٣٥٠,٠٠٠ ملیۆن کەسە . هەروا رووبەری خاکی وولاّتەکەی ٢٦,٦٥٠ هەزار کیلۆ مەتر چوار گۆشەیە . هەروا چڕی دانیشتووانەکەی ، ٦١٧ کە لە یەك مبل چوار گۆشەدا . هەروا نژادەکانی ، جوولەکە ٨٥٪ . عەرەب ١٥٪ . هەروا لە ژمارەی تەواوی دانیشتووانی ئەو وولاّتە زیاتر لە

٢٧٠,٠٠٠ هەزار کورد ی تیا نیشتە جێیە . لە وڵاتەکەدا .

١٩٤٨/٦/٢٤ لە دوای دابەشکردنی ئەلمانیای هتلەری ، ئەویش بە ئەلمانیای رۆژهەلاتی سەربە یەکێتی سۆڤیەتو ، ئەلمانیای رۆژئاوای سەر بە ئەمەریکا ، دەست کرا بە دورستکردنی پەرژینی بەرلین لەنێوان هەردوو ئەلمانیای رۆژئاواو رۆژهەلات ، لەناوەراستی شاری بەرلینی پایتەختی ئەلمانیای هتلەری ئەوکاتدا لە کێشووەرەکەدا .

١٩٤٨/٧/١٠ کۆچی دوایی مێژوونوس‌و روونـاکبیرو کەسـایەتی نـاوداری کورد و وەزیری بەرگری‌و جێگری یەکەمی پەرلەمانی ئێراق – محەمەد ئەمین زەکی .
لە تەمەنی ٦٨ ساڵیداو ، کە تەرمەکەی لە گردی سەیوان لە شاری سلێمانی نێژراوە. لە هەرێمی باشووری کوردستان .

١٩٤٨/٧/٢١ خۆتیرۆرکردنی ئارشێك گۆرکی لە تەمەنی ٤٢ ساڵیدا ئەمەش بەهۆی نالەباری باری ژیان و تەندروستی و هۆکاری دوورکەوتنەوەی خێزانەکەی لێی.
شایانی باسە ئەم نیگارکێشەی قوتابخانەی نیورۆك لە ساڵی ١٩٠٤ لە ئەرمەنستان لەدایك بووە .
لەدوای کۆمەڵ کووژیەکەی ئەرمەنی دەربەدەر دەبێت و لە ساڵی ١٩٢٥ دەگاتە شاری نیویۆرکی ئەمەریکا.

١٩٤٨/٧/٢٩ پێشبرکێی یارییەکان جامی جیهانی – ئۆلەمپیات – لە شاری لەندەنی پایتەختی بەریتانیا ئەنجامدراو بەردەوام بوو تاکوو رۆژی ٨/١٤ی هەمان ساڵ.لە نێوان یاریزانانی وڵاتانی بەشدار بوو لە یاریە جیا جیاکاندا .
نێبینی:– وێنەی یاریەکانی ئۆلەمپیات لە ئەنجامدانی هەموو یاریەکان لە گەڵی دانەنراوە .

١٩٤٨/٨/٥ کۆریای باشوور سەربەخۆیی خۆی راگەیاند ، لەدوای دان پێنانی لەلایەن رێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان بەشێووەیەکی یاسایی، ئەویش لەدوای دابەشکردنی کۆریا ، بە دووبەشی دژ بەیەکتری کۆمۆنیستی و سەرمایەداری ، لە نێوان ئەمەریکاو یەکیەتی سۆڤیەت، لەدوای جەنگی دووەمی جیهان ، ئەویش بەدابەشکردنی چەندین وولاتانی دیکەی جیهان لە نێوان خۆیان لەوانە ئەلمانیاو ڤێتنامیش لە جیهاندا

ئەم راگەیاندنەش بەناوی کۆماری کۆریای باشوور بوو لە نیمچە دوورگەی

کۆریا لە کێشووەرەکەدا . لە شاری – سیئۆل –ی پایتەخت ، کە ژمارەی دانیشتووانەکەی ، ١١,٨٦٥,٠٠٠ ملیۆن کەسە . هەروا ژمارەی دانیشتووانی وولاتەکەی ، ٤٩,٨٩٥,٠٠٠ ملیۆن کەسە . هەروا رووبەری خاکی وولاتەکەی ، ٩٩,٠٢٠ هەزار کیلۆ مەتر چوار گۆشەیە . هەروا چڕی دانیشتووانەکەی ، ١٣٠٥ کەس لە یەك میل چوار گۆشەدا . هەروا نژادەکانی ، کۆری ٩٩٪ . لە وولاتەکەدا .

١٩٤٨/٨/٢٩ لە پەناهەندەیی مستەفا بارزانی و هەڤاڵەکانی لە شاری باکۆی پایتەختی ئازربایجانی سۆڤیەتی گوواستراونەوە ، بۆ ناوچەی شاری تاشقەندی پایتەختی کۆماری ئۆزبەگستانی سۆڤیەتی کۆمۆنیست لە کێشووەرەکەدا .

١٩٤٨/٩/٩ لە دوای دابەشکردنی وولاتی کۆریا ، بەدوو وولاتی لێك جیا کەرەوە بە ناوی ، کۆماری کۆریای باشوورو کۆماری کۆریای باکوور– کە کۆریای باکووری دیموکراتی میللی سەربەخۆیی خۆی راگەیاند بەپشتیووانی یەکیەتی سۆڤیەت ، بەرامبەر بە کۆریای باشووری لایەنگیری ئەمەریکا... شایانی باسکردنە کە تاکوو تەواوکردنی ئەو مێژوونامەیە ، کێشەو ململانێ لە نێوان هەردوو کۆریا بەردەوام بووە بەتایبەتی بەرامبە بە کۆریای باکوور بەهۆی بوونی توانای چەکی هەمە جۆری ئەتۆمی لەناوچەی نیمچە دوورگەی کۆریادا.

ئەم راگەیاندنەش بە ناوی – کۆماری کۆریای دیمەکراتی مللی – لە شاری – پیونگیانگ– ی پایتەخت ، کە ژمارەی دانیشتووانەکەی ، ٣,٩٩٠,٠٠٠ ملیۆن کەسە . هەروا ژمارەی دانیشتووانی وولاتەکەی ، ٢٣,٥٨٠,٠٠٠ ملیۆن کەسە . هەروا رووبەری خاکی وولاتەکەی ، ١٢٠,٥٤٠هەزار کیلۆ مەتر

چوار گۆشەیە . هەروا چڕی دانیشتووانەکەی ، ٥٠٧ کەس لە یەك میل چوار گۆشەدا . هەروا نژادەکانی ، کۆریەکان ٩٩٪ . لە وولاّتەکەدا .
کە کۆمەڵەی گشتی نووێنەری کۆریا لە باکوور، دامەزراندنی کۆماری میللی دیموکراتی کۆریایان راگەیاند، کە بووە هۆی کردنەوەی لاپەرەیەکی دیکە لەمێژوی خەباتی ئەو وولاتەو لەهەمان کات بووە هۆی سەرهەلدانی کێشە لەگەڵ ئەمەریکا لە ناوچەکەدا ، بەهۆی سەرکەووتنی ئەمەریکا بەهێزی سەربازی لەیابان لە دوای کۆتایی هاتنی جەنگی دووەمی جیهاندا .

١٩٤٨/١٠/٩ مۆرکردنی رێکەووتننامەی دژ بە ئەنجامدانی کردەوەکانی جینۆساید دژ بەگەلانی ژێر دەستەو داگیرکراو، کە لە برگەی /٢ ی رێکەووتنەکەدا هاتیە ، کە جینۆساید بریتیە لە کردەوەیەکی دژ بە مرۆڤ و لەناوبردنی نیمچە ، یاخوود تەواوی بەچارەی نەتەوەیی، یاگروپێك لە وولاّ جیا جیاکانی جیهاندا.

شایانی باسە کە رژێمە دژ بە یەکترەکانی تورکیا ئێران و ئێراق و سووریا ، هەریەك لەوانە بەشێکی دیاریکراو لە رووبەری خاکی کوردستانی گەلی کوردیان پێ لکێنراوە بەپێی پەیمانی لۆزانی ١٩٢٣/٧/٢٤ لە لایەن وولاّتانی

هاوپەیمان بە سەر كردایەتی بەریتانیا ، ئەو رژێمانە درێخیان نەركدووە لە كرداری جینۆساید بەرامبەر بەكوردو نیشتمانەكەیدا چ لە بەعەرەبكردن و بە تورككردن و بە فارسكردن و بە گوواستنەوەی خێزانی كورد لەجێگەی رەسەنی خۆیان و بە هێنانی خێزانی نەتەوەكانی خۆیان بۆ ناوچەكانی كوردستان لە ناوچەكەدا .

ئەویش بەگۆرینی دیمۆگرافیای جووگرافی خاكی كوردستان و كرداری بە كۆمەلكوژی و زیندەبەچال و وێرانكردنی گوندو شارۆچكەو كانییاو دارستان و كیمیا باران و ئەنفال.. هەریەك لەو دەسەلاتانە بەپێی خواست و ویست و ئامانجەكانیان و ، بەپێی بارودۆخی ناوچەو هەرێم و جیهان ئەنجامیان داوە بە رامبەر بە گەلی كورد لە سەر خاكی كوردستاندا.

١٩٤٨/١٠/٢٨ دەسەلاتی نوویێی ئیسرائیل ئالای دەوولەتەكەیان بەرز كردەوە ، كە پێك هاتووە لە ئەستێرەی داود ، بەرەنگی شین – كە هێمای دەوولەتی ئیسرائیلە –، لە نێوان دوو هێلی شین ، كە هێماكە بۆزێی نیل و زێی فورات دەكات ، كە جوولانەوەی سەهیۆنیزم بە سنووری دەوولەتەكەیان دادەنێن... ئەی كورد... بەلام عەرەب قەیناكە.

١٩٤٨/١١/٥ كۆچی دوایی نووسەرو فەرهەنگ نووسی كورد مامۆستا – تاهیر سادق – لە شاری سلێمانی لە باشووری كوردستان ، لەتەمەنی ٧٣ سالیدا ، تەرمەكەی لە گۆرستانی سەرچنار بەخاك سپێردرا ، شایانی باسە كە مامۆستا تاهیر لە سالی ١٩١١ لە شاری كۆیە لە بنەمالەیەكی ئایینی و زانست پەروەر ، بنەمالەی دایەخەجێ لەدایك بووە ... لە سالی ١٩٣٩ بووەتە ئەندامی پارتی هیوا.

١٩٤٨/١١/١٠ کۆچـــی دوایـــی هۆزانـــەوان مامۆسـتا – زیـوەر– لـە شـاری سـلێمانی لـــە باشـــووری کوردسـتان ،کـە تەرمەکـەی لـە گۆرسـتانی گـردی سـەیوان لـە شـاری سـلێمانی بـە خـاك سپێردراوە لە شارەکەدا.

جێگـەی باسکردنە کـە شـاعیرو نووسـەری نـاوداری کـورد مامۆستا زێوەر لە ساڵی ١٨٧٥ لـە شـاری سلێمانی لـە گـەڕەکی کانیسکان چـاوی بـە جیهـان هـەڵهێناوە ، نـاوی تـەواوی – عەبـدوڵلا محەمـەد ڕەسـووڵە و لـە بنـچەدا خـەڵکی دەڤـەری پـشدەرن لـە هەرێمەکەدا

دوای ئـەوە ڕووی لـە قوتابخانـە کـردووەو ، هـەروا لـە حـووجرەی فـەقێیاتی خووێندوویـەتی ، دوای ئـەوە لـە ١٩٢١/٢/١٩ بـە مامۆسـتا دامـەزراوە لـە قوتابخانـەی نموونـەی سـەعادەت بـە مووچـەی ١١٠ ڕووپیـە ، دوای ئـەوە لـە سـاڵی ١٩٣٠ مامۆسـتایەتیەکەی گوازراوەتـەوە بـۆ ناحیـەی بەرزنجـە وبـە مامۆستا ماوەتەوە تـا بەسزایەك دوور خراوەتـەوە ، ئەویش بۆ دابراندنی لە کۆمەڵ و ڕۆشنبیران و لێ ئاگا نەبوون لە ڕووداوی سەردەمی خۆی ، تا ساڵی ١٩٣٨ و لـە وێـووە بـۆ بیـارە و لـە وێـشدا لـە سـەر کـار لادراوە بـە خانەنـشین کردنی لە کارەکەیدا .

هەروا مامۆستای شاعیر چەندین بەرهـەمی خستۆتە بەر دەستی خووێنـەرو ڕۆشنبیران لە وولأتەکەیدا ، وەك :– ژیانی پێغەمبەران ، دەسـتە گوڵی لاوان ، چیرۆکی خیۆی ناو مزگەوت ، داستانی سۆزناڵ گەریلا ، کە ئەمـە شـیعرە بـە زمـانی فارسـی لـە سـاڵی ١٩٨٨ چاپکراوە – سـۆزی نیشتیمان ، فەرهـەنگی زێـوەر ، لـە گـەڵ چـەندین ووتـارو بابـەتی دیکـەو دەستنووسـەکانن ، کـە مامۆسـتا زێوەر بەردەوام بووە لە کارەکـانی تـا ماڵئـاوایی کردنـی لـە گـەل و نیشتیمانەکیدا لە شاری سلیمانی لە باشووری کوردستاندا .

١٩٤٨/١١/١٩ بە هۆی کێشەی هاوسەری لە نێوان شای ئێران محەمەد رەزاو هاوسەرەکەی خاتوو فوزیە خان ، کە داوای تەلاقی لە شاە رەزا کرد بە هۆی خیانەتی هاوسەریەتی و ، لە ئەنجام خاتوو فەوزیە داواکەی پەسەند کرا بەتەلاقدانی لە شا رەزا .

محەمەد شا بە ئارەزووی خۆی هەلس و کەووتی لەگەڵ ئافرەتانی خواستیاری خۆی دەکرد.. شایانی باسە هاوسەری شای ئێران خاتوو فوزیەخان خوشکی شانشین فاروقە کە شانشینی میسر بووەو لەنژاد دەگەڕێنەوە بۆ سەر بنەماڵەی محەمەد عەلی پاشای دامەزرێنەری وولاتی میسر ناسراو بوون بە بنە ماڵەی خدیووی ، کە لەرەچەلەکدا نژادیان کوردە . لە پارێزگای دیاربەکر لە باکووری کوردستان روویان لە ناوچەیەدا کردووە لە کێشووەرەکەدا .

١٩٤٨/١١/٢٨ تیمێکی گەرۆکی بیانی سەردانی هەرێمی باشووری کوردستانی کرد لە پارێزگای هەولێرو دۆڵی

بالیسان... کە ئەو گەرۆکانە سەردانی چوار شووێنیان کردووە، لەم دۆڵەدا بەمەبەستی پشکنین. ئەوانیش :– گردی دێگە – گردی شلیمۆن – گوندی بالۆکاوە – گردی کانی کەلەك – کە لێکۆڵینەوەی ووردیان لە چۆنیەتی ئەو شووێنەوارانەی کە لە و گوندو گردانە هەبوو کردووە.

لە ئەنجامی لێکۆڵینەوەکانیان دەرکەوتووە، کە ئەم شووێنەوارانە بەر لە ساڵی زایینی شارۆچکە بوونەو لە ئەنجامی شەڕو پێکدادان لە سەردەمی –

ئەخمینیـەکان – ویـران کـراون. ئـەویش بـەپێی دۆزینـەوەی ئـەو ئێـسقان و پروسـکانەی کـە لـەم شـووێنانە دۆزراونەتـەوە. لـە ئاکـام وای بۆچـوون کـە بەکۆمـەڵ لـە نـاوبران و ئـەم هەولـەش بەشـێوەیەکی بابـەتی لـە گـۆ ڤـاری – سۆمەری ئێراقی – لە سالی ١٩٥٠ تۆمارو بلاوکراوەتەوە. هەروا – نووسەری ناوداری کـورد – ئایـەتوللا محەمـەد مـەردۆخی زەکـی – لـەکتێبی – کـورد و کوردستان دەڵێ :–

بالوکـاوە و گـردی دیگـە – لـە سـەردەمی ئەخمینیـەکان شـاربووەو کـۆنترین شارسـتانی ناوچـەکە بـووەو پاشـان دەڵـێ : – ئـەم دوو شـووێنە ئەوەنـدەی قـەلای هـەولێر بـووەو بـە کـۆنترین شـار دادەنرێـت و هـەروا دەڵـێ : – سەرچـاوەیەکی ئـاوە زۆرکـانی کەلـەك هـەبووە. هـەموو دەشـتی بالوکـاوە و بالیسانی پێ ئاودێرکراوە.

جێگەی ئامارژە پێکردنە کە ناوی بالیـسانی چەند بیروو بۆ چوونێك هەیە لە یـەکتر جیـاوازن... دەڵـێن ووشـەی بالیـسان وشـەیەکی ئارامیـە. واتـە ئـەو باخانـەی کـە کەوتوونەتـە بەرزاییـەکان و لەدەشـتایی نـین. هـەروا هەنـدێکیش دەلێن بالیسان ووشـەیەکی فارسیە – بال – واتـە – قـوول – یـان – سـال – واتە پێشاندان – بالیسان. بال پێشاندان.

لە رووی مێژوویـەوە بالیسان دەوولەتێك هـەبووە بـەر لـە ٣٠٠٠ هـەزار سـال پێش زایین بەناوی – دێگە – کە تا ئێستا گردێك لـەخوارووی بالیـسان ماوە بـەناوی – گـردی دیگـە – لـە دوای – دیگـە شـاکورەکەی – شـاجوان – بۆتـە پاشـای ئـەم دەوولەتـەو بـەهاتنی سـووپای – ئەفراسـیان – دەسـەلاتی لەدەستداوە... بەلام نەزانراوە سنووری دەسـەلاتی تا کام جێگە رۆیشتووە.

هـەر وەك لـەکتێبی – صـبح الاعـشی – باسـی گـردی –بالوکـاوە – دەنگـارەی ئێستا لە – توتمە – کراوە، کە قەلای گەوورە لە – معجم البدان – ی یاقووتی حەمەوی – داهاتووە، کە هاورایە لەگەل – محەمەد مـەردۆخی – کە دەلـێ :– ئەم دوو شوێنە دوو قەلای سەخت و قایمیان لێبووە و باخ و باخاتێکی چرو پر لەدەوریان بوونە.

بالیسان لـەدۆلی خۆشـناوەتیەو بەرامبـەر شـاخی هەورێیـەو ٢٢ کیلۆمـەتر لـە رۆژهەلاتی خەلیفان دوورە بەلای گوندی بێراوە.

سەرچاوە :– مێرگ ژمارە /٢٩ لاپەرە/٨.

١٩٤٨/١٢/٩ کۆمەڵـەی گـشتی ڕێکخـراوی نەتـەوە یـەکگرتووەکان بڕیـاری ژمـارە /٢٦٠ی دەرکرد ، بە قەدەخەکردنی تاواندنەوەی ڕەگەزی مرۆڤایەتی کە لـە مـادەی /٤ ی بڕیارەکە هـاتووە:- بەسزادانی هـەر کەسێ یاخوود هـەر دەسـەڵاتدارێك ، یـاخوود وولاتێك ، کـە هەڵدەسـتێ بـەو تاوانـە ، جـا دەسـەڵاتدار بـێ یـاخوود بەرپرسانی کـار بەدەسـتی ئـەو وولاتانـە ، یـان فەرمانبـەری ڕەسمـی دەووڵـەت بێ..

شـایانی باسـە ئـەم بڕیـارە لـە ٥٪ی جێبـەجێ نـەکراوە تـاکوو ئێـستاش بەرامبەر بەگەلانی دابەشکراوو داگیرکراو ، کاری جینۆساید بەردەوام بووە لە هەموو بوارە جیـا جیاکـان ، لەوانە بەرامبـەر گـەلی کـوردو نیشتمانەکەیان لـە هەرێم و ناوچەو کێشووەرەکەدا .

١٩٤٨/١٢/١٠ لـە شـاری واشـنتۆنی پایتـەختی ئەمـەریکا ووتووێـژ لـە نێـوان باڵیۆزەکـانی دەووڵـەتانی پـەیمانی برۆکـسل و کەنـەدا و وەزارەتـی دەرەوەی وولاتـە یـەکگرتووەکان، بـۆ دروسـتکردنی پـەیمانی نـاتۆ دەسـتی پێکـرد بەرامبـەر پـەیمانی وارشـۆی نێـوان وولاتـانی سوشیالیـست، لـەدوای جـەنگی دووەمـی جیهان، کە ئەویش لە مانگی /١٩٤٩/٤ بڕیاری دامەزراندنی بۆ دەرکرا.

١٩٤٨/١٢/١٠ ئەنجوومـەنی ئاسایـشی نێوودەووڵـەتی جـاری مـافی مرۆڤـی ڕاگەیانـد لـە کۆشکی – شابوو– لە پاریسی پایتەختی فەرەنسا ... جێگـەی باسـکردنە کـە ڕاگەیانـدنی جـاری گـەردوونی مـافی مـرۆڤ لـە دوای جـەنگی جیهانیـدا دژ بـە هتلەرو دۆستەکانی بوون ، کە نزیکەی ٦٠,٠٠٠,٠٠٠ ملیۆن کـەس کـووژران ، زۆربەی وولاتانی ئەوروپا زیانێکی زۆریان لێکەووت و وێران کران .

ئـەویش بـۆ ئـەوەی جـارێکی دیکـە درندایـەتی و بەربەریـەتێکی ئـەوا روونەداتـەوە ، پێوویـستە جیهـانێکی نـوێ لـە سـەر بناخـەی ئـازادی و ڕێزگرتنـی مـافی مـرۆڤ و یەکـسانی لـە نێوانیـان دابمەزرێنـدرێت . دەبـێ دژایـەتی و تـەنگوو چەڵەمەی نێوان وولاتـان بـە ڕێگـەی گفتووگـۆ چارە سـەر بکرێت لە جیهاندا .

دوای کۆتـایی هـاتنی جـەنگی دووەمـی جیهـان لـە مـانگی /١٩٤٥/٤دا لـە کۆنفرانسی – سان فرانسیسکۆ – نووێنەرانی ٥١ وولاّتـی ڕێکخراوی نەتـەوە یەکگرتووەکانیان لە پێناوی پاراستنی نـەوەی نـوویّ لـە کارەسـاتی جـەنگ ، کە دوو جار ئێش و ئازارێکی بـە سـەر مرۆڤایەتیـدا هێنـابوو لـە جیهانـدا پێك هینا .

ئەویش بە بەرپرسیاری پاراستنی ئاشتی و پشتگیری لـە شـەڕێکی جیهـانی نوویّ سپێردرا بەو سێ وولاّتەی کە لە جەنگدا سـەرکەووتوون – ئەمـەریکا – بەریتانیا – یەکیـەتی سـۆڤیەت – چینی مللـی – لـەم دەزگایـەدا بناخەیـەکی مەعنەوی بۆ وەرگرتن و قبـوولکرنی گـەلانی سـەر بەئایین و فەرهـەنگ جیـاواز دانرا , کە پسپۆری شارەزایانی زۆر وولاّتان بە سەرۆکایەتی زانـای فەرەنـسی – ڕێنـیّ کاسـن – و پـسپۆری ئەمـەریکا – ئێلێونـۆر ڕۆزفێلّـت – لـە سـەر ئـەم پرسە کاریان کردوو ناوەڕکی بابەتەکەیان ئامادە کرد .

دوای ئەوە کەوتە بەر دەستی ئەنجوومـەنی ئاسایشی نەتـەوە یەکگرتووەکان و چەندین هەموارکردنی لە سەر کراو لە ئاکامدا ئەم ڕاگەیاندنە پەسەند کرا ، کە خۆی لە ٣٠ بەند دەگریّ و یەکـەم بەنـد دەڵـێ :–

هەموو مرۆڤان بە ئازادی لە دایك دەبن و یەکسانیشن لە نرخ و بایـەخ و مافدا , عەقل و ویژدانیان پیّ بەخشراوەو دەبیّ بە گیانێکی بریانە ڕفتـارو هـەڵس و کەووت لەگەڵ یەکتردا بکەین ... دوا ژمارەشی کە ماددەی ٣٠سییە دەڵیّ :–

هیچ دەقێکی ئەم بانگەوازە نابێت وا لێکبداتەوە کە ڕێگە دەداتە دەوڵەتێك یا کۆمەڵیك یا تاکەکەسێك کە چەند مافێکی ئەوەیان هەبێت کە چالاکی یان کارێك بکەن بە مەبەستی تێکدانی ماف وئازادییەکانی ئەم بانگەوازەدا .

١٩٤٨/١٢/١٨ کۆچی دوایی شاعیری نەتەوەیی و نیشتمانی کورد مامۆستا– فائق عەبدوللا – بێکەس– لە شاری سلێمانی. جیگەی ئاماژە پێکردنە کە شاعیری گەورەی کورد بێکەس ناوی تەواوی – فائق عەبدوللا بەگ کاکە حەمە مەعروف – ە .

ئەم شاعیرە ڕووەو دیموکراتی و پێشکەووتن بووە لە ئەدەبی کوردیدا , کە لە گوندی – سیتك – لە تەك شاری سلێمانی لە ساڵی ١٩٠٥ چاوی بە جیهان هەڵهێناوە .

لە دوای مردنی باوکی لە ساڵی ١٩١٠ لە نێوان کەس و کارو خزمەکان ژیانی بە سەر دەبرد لە پارێزگای سلێمانی و پارێزگای کەرکوك لە هەرێمی باشووری کوردستان.

ئەم شاعیرە مەزنە لە ڕاپەڕینی ٩/٦ دژی بەریتانیاو شانشینی لە ئێراقی بە زۆر دروستکراو بەژداری کردووەو ڕۆڵی بالآی هەبووە . بەم هۆکارانە ماوەی سێ ساڵ ژیانی بردۆتە سەرو لە دوای ساڵی ١٩٣٣ بە مامۆستا دامەزراوە لە قوتابخانە جۆراو جۆرەکان .

ئەم کەسایەتیە شاعیرێکی میللی و رامیاری و نەتەوەیی و نیشتمانی بووە ، لە هەموو بوارەکانیدا و تاکوو ئێستاش شیعرەکانی ڕۆڵی خۆیان ماوەو دەمێنێ لە هەموو بوارەکانی بە بەرزکردنەوەی هەست و ڕۆشنبیری و داب و

نەریت و کەلتووری کورد لە کوردستاندا .

١٩٤٨/١٢/٢١ بڵاوکردنەوەی یاسای ئیرلەندا ، کە کۆماری ئیرلەندا نەك دۆمنیۆن لە ناو رایەڵەی کۆمەنوولسی بەریتانیا .

کە بەریتانیا رەزامەندی لەسەر هەردوو کارەکە دەربری ، کە لە ساڵی ١٩٤٩ ئەنجامدرابوو، دوای ئەوە ئیرلەندا لەساڵی ١٩٨٥چووە ناو کۆمەڵەی ئابووری ئەوروپا کەئێستا یەکیەتی ئەوروپایە لە کێشووەرەکەدا .

## ١٩٤٩

١٩٤٩/٠٠/٠٠ کۆچی دوایی تێکۆشەرو خەباتگێرو کەسایەتی ناوداری نەتەوەیی و بنەماڵەی حاجی رەشید ئاغا ، رەمزی نافع رەشید مەموونەدی لەشاری هەولێر لە هەرێمی باشووری کوردستان

شایانی باسە مامۆستا رەمزی لەساڵی ١٩١٧ لەشاری هەولێر لەبنەماڵەیەکی ناسراو لە عەشیرەتی مەموونەد چاوی بە جیهان هەڵهێناوە لە شارەکەدا ... هەروا قوتابخانەی سەرەتایی و ناوەندی لەشاری هەولێر تەواو کردیە... لەبەر نەبوونی قوتابخانەی ئامادەیی لەهەولێر چۆتە شارەی کەرکوکی هەرێمی باشووری کوردستان و ساڵێکی خوێندنی لەوێ بردۆتەسەرلە شارەکەدا.

هەر لەوکاتەشدا ئەندامی پارتی هیوا بووە لەکەرکوك... دوای ئەوە پۆلی پێنجەمی زانستی لەشاری بەغدا تەواو دەکا لەساڵەکانی ١٩٣٧-١٩٣٨ لەئامادەیی ناوەندی - الاعدادیة المرکزیة -... لە ساڵی ١٩٣٩ دەچێتە بەیروتی پایتەختی ئێستای لوبنان و لەزانستگای ئەمەریکی دادەمەزرێ و

مــاوەی دوو ســاڵی خووێنــدن لــەو زانــستگایە تــەواو دەكــات و پلــەی – فریشمان– بەدەست دێنێ لەو وولاٌتەدا .

ماموٌستا رەمزی هەرلەشاری بەیروت پەیوەندی لەگەڵ كوردەكانی لوبنان و سووریاو توركیا بەهێز دەكات ، لەپێناو ئامانجەكانی گەل و نیشتمان ، وەك كامەران بەدرخان– نورالدین زانا– محەمەد ئەرمەغانی... دوای ئەوە بۆ تەواو كردنی خووێنـدن دەچێتە شاری ئەسـتەموٌڵی ئێـستای توركیـاو دەچێتە كۆلێـژی – رۆبـەرت كۆلیج – لـەوكات و ساتەشـدا جـەنگی دووەمی جیهـانی هەڵگیرسا . لەو كاتەشدا دەسەلاٌتدارانی ئەڵمانیاش بەدوای كەسێك دادەگەڕا ن ، كەسـووتەمەنی هەمـە جۆریـان بـۆ دابـین بكـات ، ئـەویش بەگەیـشتنیان بەچاڵە نەوتیەكانی لە باكووری ئێراق – واتە هەرێمی باشووری كوردستان– لێكنــدراو بــەئێراق ، لــەپێناو بــەدرهێنانی ئامانجــەكانیان لــەو هــەرێم و ناوچانەدا.

كـە ماموٌسـتا رەمـزی نـافع رەشـید بـووە هۆكـاری ئـەو ئامانجەیان و لەهـەمان كـاتیش رەمـزی خوولیـای بـەدی هێنـانی ئامانجـەكانی گـەلی كـورد بـوو ، لـەوكات و سـاتەی شـەڕو ململانێـی نێـوان وولاٌتـانی هاوپـەیمان و ئـەڵمانیا لەلایـەن یـەكێتی سـۆڤیەت و ئـەڵمانیا لەلایـەكی دیكـە ، ئـەمـەش وای كـرد كـە بەرژەوەندی هەردوولا یەك بگرێ و رەمزی ئامـادەی خۆی نیشاندا بـۆ ئـەوەی كار بكات لەگەڵ ئەڵمانەكان تاكو هەریەك بگات بەئامانجی خۆیدا .

ئەمـەش بەهۆی هەڵوویـستی رژێمـی تـورك . ئینجـا ماموٌسـتا رەمـزی لەگـەڵ ئەڵمانەكان دەچێتە ئەڵمانیا بەمەبەستی مەشـق كـردن ، ئـسەویش لـەپێناو – كـردەوەی تـامودت –. ئـەو كردەوەیـەش ئامـانجی ئـەوبوو كـە شۆڕشـێك لـە كوردستان هەڵگیرسێنێ بۆ ئەوەی ئینگلیزەكان لەم وولاٌتە دەربكات..!.

لەدوای تەواو بوونی مەشقەكەی ماموٌستا رەمـزی سـووێندی خـوارد بەئالاٌی كوردسـتان و بەرامبـەر بەبـەر پرسـی – فـۆن كایرتـل– كـە سـەرۆكی ئەوسـای ئـەڵمانیا كەخیانـەت و كەمتەرخـەمی نـەكات لـەم كردەوەیـە ، لەهـەمان كـات ئەڵمانیـەكانیش سووێند یان خـوارد بـەئالاٌی ئـەڵمانیا لەسـەر هـەمان بابـەت ، ئەویش لە پێناو گەشتن بە ئامانجەكانێن .

هــەروا لــەمانگی/١٩٤٣/٧ تیپـە چـوار كەسـیەكە ، – كـردەوەی مـامودت– بەسـەرۆكایەتی بەرێووبـەری – موولـەر– بـوو.. سـەعات سـفریان لەوكاتـدا

دەستی پێکرد ... یەکێ لەفرۆکەکانی -کۆندۆر- دەکەوێتە ئاسمان و بەسەر هەرێمی- قرم- ی نێوان سنووری ئێران و یەکێتی سۆڤیەت ، لە سەر زەریای رەش و بەناو جەرگەی خاکی تورکیا بەرەو کوردستان بە رێدەکەوێ ... کە ئاڵای کوردستان لەفرۆکەکە خرابوو لەدەرەوەی دەشەکایەوە بەرەو ناوچەی بیتووێنی سەربەقەزای رانیەی پارێزگای سلێمانی لە هەرێمەکەدا .

بەڵام بەهۆی هەڵە کردن نەیانتوانی لەوێ بێنە خوارێ بەڵکوو بەرەو پارێزگای دهۆك روویان گۆری و لەگوندی فلێفل ، کە دەکەوێتە باکووری رۆژئاوای شاری موسڵ هاتنە خوارێ... لەوێ بە قاچاخ بەسوواری پاسە تەختەکانی ئەو سەردەم و بەولاغ و کاروان دەگەنە موسڵ و لەگەرەکی - نەبی یونس- بەرەو ناوچەی گوێرو پارێزگای هەولێر بەرێدەکەون تادەگەنە گوندی بێوکە.

لەوێ ئەڵمانەکان دەستگیر دەکرێن و دوای ئەوانیش مامۆستا رەمزیش لەگوندی بنەسڵاوەی رۆژهەڵاتی شاری هەولێر دەستگیر دەکرێ و بەرەو شاری موسڵی دەبەن و لەوێش بۆ شاری بەغدا. لەوێش بۆ شاری قاهرەی پایەختی وڵاتی میسرو دوای ئەوە دەیگەرێننەوە بۆ شاری بەغدا .

لەگەڵ کۆتایی جەنگ مامۆستا رەمزی دەردێتە دادگای عورفی و بڕیاری لەسێدارەدانی بۆ دەردەچێت.... بەڵام لەدوای ئەوە بڕیارەکە دەگۆرێ بۆ بەندی هەتاهەتایە ، دوایی لەساڵی ١٩٤٧ بڕیاری ئازاد کردنی بۆ دەردەچێ بەهۆی نەخۆشیەکی کووشندە.. شایانی باسە راوێژکاری وەزارەتی ناوخۆی ئێراق - سیسل جۆن ئیدمونس - روو لەمامۆستا رەمزی دەکات و پێی دەڵێ:-

لە کاتی لێکۆڵینەوە بۆمان دەرکەووت کەتۆ تەنیا بۆ کوردت کردیە نەك بۆ دووژمنانی ئێمە ، گەرنا تووشی رووبەرووی سزای گەوورە دەبوویتەوە ... خووێنەری بەرێز.

بەهۆی شکانی کێلی سەرگۆرەکەی نەتوانرا مێژوو کۆچی دوایی مامۆستا رەمزی بدۆزرێتەوە.سەرەرای ئەوەی کە زۆر لە نووسەر و مامۆستان و دکتۆران ، بە دەیا بابەتیان لە مامۆستا رەمزی نافع نووسیووە لە گۆڤارەکاندا.

١٩٤٩/١/٨ دوای كەووتنی كابینەی سەرەك وەزیرانی رژێمی شانشینی لە ئێراق محەمەد سەدر موزاحیم پاچەچیو سەرەك وەزیرانی پێشووی رژێمی شانشینی ، . نوری سەعید دەیەمین كابینەی نوێی خۆی راگەیاند بەبوونی بەسەرەك وەزیرانی ئێراق.
شاینی باسە لە زۆر سەرچاوەی ئێراقو بیانیو كوردی ، وای دیاریدەكەن ، كە نوری سەعید كوردەو هەندێ دەڵێن توركمانە ، بەڵام بەهەرحال بەپێی ئەو سەرچاوانە نوری سەعید لە رەسەندا باوو باپیرانی دانیشتووی خاكی كوردی باكووری كوردستانی داگیر كراوی ژێر دەسەڵاتی توركیانە لە پارێزگای دیاربەكر لە هەرێمەكەدا .

١٩٤٩/١/١٧ لە هەوڵێكی بەردەوام بە پەخش كردنی یەكەم زنجیرەی تەلەفزیۆنی كۆمیدی بە ناوی – زاكولدبیرگز–و ، ئەو زنجیرە كۆمیدیە تەلەفزیۆنیەو، لەهەمان كات بەردەوام بوو لە پەخشكردنی كە بەباشترین زنجیرەی ڕابواردن دادەنرێت لەجیهاندا.

١٩٤٩/١/٢٠ لە ووتاری سەرۆكی ئەمەریكا تۆرمان ، بۆ گەلی ئەمەریكا سەرۆكی ئەمەریكا تۆرمان بەرپرسیاریەتی راستەوخۆی خودی خۆی بە لێدانی هەردوو بۆمبی ئەتۆمی لە شارەكانی هیرۆشیماو ناكازاكی وولاتی یابان لە ساڵی ١٩٤٥ دەكات ، كە بە كردەوەیەكی تیرۆریستانەی جیهانی دادەنرێت لەگەڵ سەرەتای دەست پێكردنی جەنگی سارد لە نێوان هەردوو جەمسەری دژ بە یەكتری بە تایبەتی لە نێوان حكوومەتی ئەمەریكا ویەكیەتی سۆڤیەت لەجیهاندا.

١٩٤٩/٢/٤ بە هۆی توندرەویو تاك رەوی دەسەڵاتی شا لە ئێران محەمەد رەزا شا لە زانكۆی تارانی پایتەختی ئێران هەولی كوژرانی درا ، بەڵام رزگاری بوو

لەپیلانەکەدا .

١٩٤٩/٢/١٢ لە کارێکی ناکاوی ئەویش بە لە ناوبردنی دامەزرێنەری ڕێکخراوی ئیخوان مسلمین و کەسایەتی ئاینی عەرەبی – حەسەن بەننا– لە شاری قاهیرەی پایتەختی میسر تیرۆر کرا..

١٩٤٩/٢/١٤ دامەزرێنەرو سکرتێری پارتی کۆمۆنیستی ئێراق یوسف سەلمان یوسف– فەهد– لە لایەن رژێمی شانشینی لە ئێراق لە سێدارە درا لەگەڵ دوو لە هەڤاڵەکانی –حازمو سارم – کە ئەندامانی بیرۆی رامیاری پارتەکە بوون لە ئێراقدا.

١٩٤٩/٢/٢٤ مۆرکردنی ڕێکەووتننامەی – رۆدۆس– لە دووگەی رۆدۆس ، لە پێناو وەستاندنی شەڕ لە نێوان میسرو ئیسرائیل لە سەر داوای بریاری نەتەوە یەکگرتووەکان لە ١٩٤٨/٨/١٦ ، ئەویش لە پێناو سەقامگیرکردنی ئاشتیو ئارامی لە نێوان ئیسرائیلو عەرەب لە هەرێمەکەدا.

١٩٤٩/٣/٨ بە پێی ئەو ڕێکەووتننامەیەی ، کە لە کەنداوی ئەلونگ مۆرکرا فەرەنسا دانی بەسەربەخۆیی ڤێتنام نا، بەرێکەووتنی لە نێوان باودای و سەرۆکی فەرەنسا ئۆریۆك بەراگەیاندنی یەکگرتووی ڤێتنام لە ژێر یەکیەتی دەووڵەتی فەرەنسا.

١٩٤٩/٣/١٣ سەر کردەی کورد مستەفا بارزانیو دوو لە هەڤاڵانی لەلایەن دەسەڵاتدارانی وولاتەکە لە شاری تاشقەندی پایتەختی کۆماری ئۆزبەگستان گوواسترانەوە بۆ شاری چەمبای سەر دەریای ئۆراڵو لەوێ وەك دەست بەسەرمانەوە لە شارەکەدا .

١٩٤٩/٣/٢١ دوو ئاهەنگی بەرچاو بە بۆنەی جەژنی نەورۆز لە شاری هەولێر لە هەرێمی باشووری کوردستان ساز کرا ، کە یەکەمیان بەهۆی مەسعوود محەمەد بوو بۆ لایەنگیری– پ.د.ك– و دووەمیان بەهۆی دلداری شاعر بوو بۆ لایەنگیری چەپەکان.

١٩٤٩/٣/٢٩ رژێمـی شـۆڤێنی تورکیا یەکـەم وولات بـوو لـە جیهـان دانـی بـە دەوولـەتی ئیسرائیل نا لە دوای ئەمەریکا،... شایانی باسە پەیووەندی نێوانیان تاکوو ئێستا بەردەوامـە ، بەتایبـەتی لـە بـواری سیخووری سـەربازیو رامیـاری ، ئەویش لەپێناو پەلاماردانی بزووتنەوەی رزگاریخوازی کورد لـە کوردستان . بـە بـەهێزکردنی جێپێگـەی خۆیـان لەرامیاریـەتی نێـوو دەوولـەتی ، چـونکە دەوولـەتی ئیسرائیلو کەسایەتیە ئیسرائیلیەکان رۆلی سـەرەکیو بنـەرەتیان هەیە لە رامیاریەتی دەرەوەی ئەمەریکاو بەریتانیادا .

١٩٤٩/٤/٤ مـــــــــۆرکردنی پەیمانی باکووری ئەتلەسی- ناتۆ-ی سـەربازی لـە نێـوان ئەمـەریکاو بـــــــەریتانیاو فەرەنــــــساو هۆلەنـــــــداو لۆکـــــسمبۆرگو کەنەداو بەلژیکا ، دژی رژێمـی سۆشیالیستی سـۆڤیەتو وولاتـانی هاوپـەیمانی سـۆڤیەت ، لـە هـەموو بوارەکـان . بەتایبـەتی لـەبواری سـەربازیو سـیخووری سـەربازیو چاودێری تەکنەلۆژیای دەریاییو ئاسمانیو گەردوونی لە جیهاندا .

١٩٤٩/٥/٩ لە دوای کۆچی دوایی شانشینی مۆناکۆ ، کورەکەی ئـەمیر- رینیـە-کـە کـورە گـەوورەی بـوو جێگـەی بـاوکی گرتـەوە بەئـەمیری سـێیەمی مۆنـاکۆ لـە سـەر وولاتەکەدا .

١٩٤٩/٥/١١ لە دوای راگەیاندنی سەربەخۆیی دەوولەتی ئیسرائیلو بەرزکردنـەوەی ئالای ئیـسرائیل بـە پـشتیووانی ئەمـەریکاو بـەریتانیا، بـە ئەنـدامی رەسمـی لـــەرێکخراوی نەتـــەوە یـــەکگرتووەکان وەرگـــیراو رۆڵـــی ســـەرەکی نوواندووەودەنووێنێ لەرامیاریەتی هەمە لایەنە لە جیهاندا .
بەتایبـــەتی لـــە رۆژهـــەلاتی ناوەراســـت و بەتایبـــەتی لـــە پەیووەندیـــە

هەمەلایەنەکان لەسەر وولاتانی عەرەبیدا.

١٩٤٩/٦/١٣ لـە ناکـاو بەهائـەدین نـوری لەشـاری سـلێمانی گەیـشتە بەغـدا لـەپێناو سەرکردایەتی کردنی پارتی کۆمۆنیست لە ئێراق ، ئەویش لەدوای شکست هێنـانی پـارتی کۆمۆنـست ، بـە لەسـێدارەدانی فەهـدو هـەڤاڵانی، لـە٦/٢٥ی هەمان ساڵ هەندێ لە کورد لـەوکات ڕێکخستنێکی کۆمۆنیستیان پێك هێنا لەتەك ڕێکخستنەکانی شاری بەغدا ، کە کوردەکان سەرکردایەتیان دەکرد ، هەروا لە سلێمانی ڕێکخراوەکانی پارتی کۆمۆنیست ، کە ئەکرەم یامیلکی و کەریم سۆڤی سەرکردایەتیان دەکرد.

بەڵام لە دوای دەستگیرکردنی بەهائەدین نوری لە١٩٥٣/٤/١٣ کەریم ئەحمەد داود . کاروباری پارتەکەی دەبرد بەڕێووە بە سەرکردایەتی حەمید عوسمان لـــە بەندینخانـــەی بەعقووبـــە تائـــەو کاتـــەی کـــە لەبەندینخانـــە هـــەڵات لە١٩٥٢/٦/١٦... هەردوو کەسایەتی ناوداری کورد کـەریم ئەحمـەدو حەمید عوسمـان کەهـەردووکیان لـەدایك بووی پارێزگـای هـەولێر بـوون لـە باشـووری کوردستاندا.

١٩٤٩/٩/٢٣ خـوولی جـەنگی سـاردو گەشـەکردنێکی کـەمی لـە بەرهـەم هێنـانی چـەکی ئـەتۆمی بەخۆیـەوە بـینی. لەوانەیـە دەسـتپێکی یەکیـەتی سـۆڤیەت بـۆ هەنگاونان لە بەرهەم هێنانی چەکی ئـەتۆمی بگەڕێتـەوە بۆ سەرەتای ساڵی ١٩٤٢، واتە لەناوەڕاستی جەنگی دووەمی جیهانی و یەکەمین تاقیکردنەوەی ئەتۆمی لەم ڕۆژەدا ئەنجامدرا.

١٩٤٩/١٠/١ لـــــــــە دوای تێکۆشـــانێکی بـــێ ووچـان ئـەویش بـە ڕاگەیانـدنی کۆمـاری چـینی مللـی نـوێ ، لەلایـــەن ماوتـــسی تـــۆنگ ، لەهـــەمان کـات شـاری پـەکین کـرا بەپایتـــەختی کۆمـــاری چـــین و ،

شوان لای پۆستی سەرەك وەزیرانی چینی نوێی كۆمۆنیستی گرته دەست له كێشووەرەكەو جیهاندا. ئەویش بە ناوی – كۆماری چینی مللی – له شاری پەكینی پایتەخت كه ژمارەی دانیشتووانەكەی ،١١,٤٥٠,٠٠٠ملیۆن كەسه
هەروا ژمارەی دانیشتووانی وولاتەكەی ، ١,٣٥٠,٠٠٠,٠٠٠ملیار كەسه .
هەروا رووبەری خاكی وولاتەكەی ، ٩,٥٩٦,٩٦٠ ملیۆن كیلۆ مەتر چوار گۆشەیه ، هەروا چڕی دانیشتووانەكەی ، ٣٥١ كەس له میل چوار گۆشەدا .
هەروا نژادەكانی ، هانه چینیەكان ٩٢٪ . مەگۆلی و تبتی و كۆری و كورد ٨٪ . زیاتر له ١٧٥,٠٠٠ هەزار كورد له وولاتی چین نیشته جێن . له وولاتەكەدا

.

١٩٤٩/١٠/١٦ هێزەكانی سووپای یۆنان توانیان به یارمەتی تەواوی ئەمەریكا سەركەووتنی سەربازی بەدەست بێنن به له ناوبردنی كۆمۆنیستەكانی یۆنانو ، راویان بنێن بەرەو یۆگسلاڤیا ، ئەمەش بەهۆی شەڕی ناوخۆی نێوان هەردوولا بوو لەنێوان چەكداره كۆمۆنیستەكان و دەسەلاتی شانشینی له یۆنان له وولاتەكەدا .

١٩٤٩/١١/١٣ پسپۆری شووێنەوارزان – خاتوو كارلتۆن –، ئەشكەووتی هەزار مێردی پشكنی و له ئاكامدا چەند پارچه ئێسك و باڵ و بربرەی دۆزیەوە. بەلام هیچیان ئێسكی مرۆڤی سەرەتایان نەسەلماند. پاشان له سەر زەوی ئەشكەووتەكه چاڵێكی دوو مەتر به قوولی ١٥ سم هەلكەند، له ئاكام دووپارچه ئەستێ دۆزرایەوە.
شایانی باسه شاخی هەزار مێرد ٦ ئەشكەووتیی تیایەو سێی بچووك و سێی گەووره له سەر یەك هێڵ لەدامێنی شاخەكەوە بەدی دەكرێت دەمی ئەشكەووتەكه فراوانەو نزیكەی ٢٥ مەتر دەبێت و جێگەی هەزار كەسی تیادەبێتەوە... یەكێ بەكوونی ئەشكەووتەكان ١٠ مەتر دەبێ و تەسك و رووناچێ، هەروا یەكێكی دیكەیان گەر به سنگه خشكێ برۆی دوای ٦ مەتر دەگەیته كانیەك.
ووشەی هەزار مێرد، یانی هەزار پیاو. یاخوود بەپلەو پایەی سەربازیەوە واته هەزار مەرد.
بەلام هەندێكی دیكه پێیان وایه له هەزار مێرگەوە هاتووه چونكه دەڤەرەكی تەرو بەئاوە... هەروا له چارەكی یەكەمی ئەم چاخەدا چەند پسپۆرێك

سـەردنی ئەشـکەووتی هـەزار مێردیـان کـردووە، لەوانـە پـسپۆر سـپایزەر لـە ساڵی ١٩٢٦ و خاتوو گارودی ئەمەریکی لە ساڵی ١٩٢٨. خاتوو گـارۆدی کـە گەیـشتە کوردسـتان لـە ئەشـکەووتی - زەرزی - یـەوە دەسـتی پێکـرد کـە دەکەوێتـە سـەر زێـی بچووك، کـاری دووەمـی خـاتوو گـارۆدی ئەشـکەووتی هـەزار مێـرد بـوو، کـە ١٨ رۆژی خایانـدو تـوانی چـەند چـاڵێك لەبـەردەم دەرگاکەو ناوەراست بپشکنێ، لـە میانەی پشکنینەکەیدا کۆمـەڵێ پروسك و ئاگردان و ئامێری بەردە ئەستێی لێ بدۆزێتەوە کە مێژوویەکەی دەگەراوە بۆ ٣٠ تا ٥٠ هەزار ساڵ بەر لەو پشکنینە لە هەرێمی باشووری کوردستان.

١٩٤٩/١١/٢٥ لـە گۆڤـاری - المـصور- ی مانگانـەی میـسری لەلاپـەرە /٥٦ یـدا کەچاوپێکەووتنی لـە گـەڵ نووسـەری گـەورەی ئـوردنی - عـەباس محەمـەد حـەقاد- ئەنجامـدا ، ئـەویش بەبۆنـەی یـادەوەری سـەد سـاڵەی دامەزرێنـەری ووڵاتی میسر - محەمەد عەلی پاشا - لە درێژەی چاوپێکەووتنەکەدا عەباس محەمەد حەقاد دووپاتی ئەوە دەکاتەوە کە محـەمـەد عـەلی پاشا نەتورکەو نـە ئەلبانیـە ، بـەڵکوو بەرەچـەلەك نـژادی کـوردەو بنەکاڵەکـەی لـەپارێزگای دیاربەکری باکووری کوردستانی ژێر دەسەڵاتی تورکیا ، روویان لەناوچەی قاهرەی پایتەختی میسر. کردووە.

محمد علي في ديوانه بالقلعة يستقبل وفد بعض الدول الأجنبية
ويرى من بينه وكلاء طومسون وابراهيم

ئـەویش بـەهۆی پـەلاماره درندانـەكانی پێشووی ئیمپراتۆریـەتی عوسمـانی، هـەروا بـەهۆی لێهـاتوویی وكەسـایەتی بنەماڵەكـەی و نـەوەكانی دەسـەڵاتدار بوونـە تـاكوو كۆچـی دوایـی شانـشین فـاروق كەنـەوەی محەمـەد عـەلی پاشا بوونله سەر میسردا .

هـەروا عـەباس محەمـەد حـەقاد ، كـە خۆشـی كـورده لـە بنەمالـە ناودارەكـانی دانیشتووی ئوردنـەو ئـەوانیش بەهۆی پـەلاماره درندانـەكانی ئیمپراتۆریـەتی عوسمانیو لایەنگیری دەسەڵاتی سەلاحەدینی ئەیوبی بوونەو كۆچیان بـەرەو ناوچەی فەلەستینو ئوردون كردووه .

تاكوو ئێستاش كە ژمارەی كورد لە ئوردون زیاتر لە ١٠٠٠٠ هـەزار كـورد لـە ئـوردون هەیـەو چـەندین پلـەو پایـەی بـەرزیان لـەدامو دەزگاكـانی حكوومـەت هەبووه لە ئوردن ... جاخوا دەزانێ لە میسر ژمارەی كـورد چـەنده ... بـەڵام بە داخەوه ... كورد.... ؟ ...!

١٩٤٩/١٢/٨ لـە دوای كۆتـایی جـەنگی دووەمـی جیهـانی كۆمـاری چینی نیشتمانی راگەیەنـــدرا لـــە دوای گوواســـــتنەوەی دەسەڵاتی پێشوو بـــۆ دوورگـــەی تـــــــــايوان بەجیابوونەوەی لە چینی میللی بەپشتیوانی ئەمەریكا. لە شـاری — تـایبی — پایتـەخت ، كـە ژمـارەی دانیـشتوانی ، ٢,٧٨٠,٠٠٠ ملیـۆن كەسـە لـە شارەكەدا

هـەروا ژمـارەی دانیـشتووانی وولاّتـەكـەی ، ٢٣,٨٦٠,٠٠٠ ملیـۆن كەسـە . هەروا رووبەری خاكی وولاّتەكەی ، ٣٦,٠٠٠ هەزار كیلۆ مـەتر چوار گۆشـەیە . هـەروا چڕی دانیشتووانەكەی ، ١٧١٦ كـەس لـە یـەك میل چوار گۆشـەدا . هەروا نژادەكانی ، تایوانی ٨٦٪ . چینیەكان ٪ . لە وولاّتەكەدا .

## ١٩٥٠

١٩٥٠/١/١٨ چینی میللی بەرسمی دانی بە دەسەلاتی- هۆشی مینە-ی ناو رایگەیاند بەیارمەتیدانی دەسەلاتی نوێی ڤێتنامو دوای دووهەفتە کەمتر نوێنەرانی ئەنجوومەنی فەرەنسی رەزامەندیان کرد لەسەر رێککەوتن لەگەڵ ڤێتنام و کەمبۆدیاو لاوس بە- ٤٠١ - دەنگ دژی -١٩٣- دەنگ ، بۆ رۆژی دوایی یەکێتی سۆڤیەت دانی بەسەربەخۆیی ڤێتنام نا ، سەرەڕای چاودێری کردنی شەڕی سەر زەوی لەو کاتدا لەلایەن وولاتانی پەیوەندراردا.

١٩٥٠/١/٢٣ لە بڕیارێکی کنیسەی ئیسرائیل توانی شاری قوودس بکاتە پایتەختی دەووڵەتی ئیسرائیل بە هۆی چەندین کێشەی نادیار لە نێوان عەرەب و ئیسرائیل لە ناوچەکەدا .

١٩٥٠/١/٢٦ هیندستان رژێمی کۆماری راگەیاند لە دوای بە دەستهێنانی سەربەخۆیی و جیابوونەوەی لەپاکستان ، لەدوای سەدان کێشەو گیروگرفتی هەڵوواسراوی سنووری و ئایینی و هەرێمی کەشمیری دابەشکراو داگیرکراو لەنێوان هندوپاکستان.

١٩٥٠/٤/٢٦ دامەزراندنی کۆمەڵەی مامۆستایان لە شاری هەولێر لەرێگەی هەڵبژاردنی دیموکراتی لەلایەن کۆمەڵێك مامۆستای رووناکبیر لەهەرێمی باشووری کوردستان.

١٩٥٠/٥/ ١٤ دەست پێکردنی هەلبژاردن لە تورکیا لە نیوان پارتە رامیاری و نەتەوەیی و کۆمەلایەتیەکان. ئەنجامی هەلبژاردنەکان کە پارتی دیموکراتی توانی ٤٠٣ کورسی لە کۆی ٤٨٢ کورسی پەرلەمان بە دەست بێنێ.

بەلام پارتی گەلی کۆماری کە لە لایەن دامەزرێنەری کۆماری تورکیا دامەزرابوو، توانی ٦٩ کورس لە کورسیەکانی پەرلەمان بەدەست بێنێ، هەروا پارتی دیموکراتی نیشتمانی توانی یەك کورسی بەدەست بێنێ.

ئەمەش بەهۆی توونـد رەوی و نا لەباری پارتی دەسەلات - مستەفا ئەتا تورك، و عسمەت ئەینوونوو بوو - کە ماوەی ٢٧ ساڵ لەسەر تورکیا دەسەلاتداربوون و ئەنجامی بووە هۆی سەرنەکەوتنێ بێ وێنە لە هەڵبژاردنەکان و بە دەست لە پۆستەکانی سەرۆکایەتی لەلایەن ئەینوونوو لە دەسەلات و هەڵبژاردنی جەلال بایار بە سەرەك کۆماری تورکا.

هەروا بە راسپاردنی عەدنان مندرسی بە سەرەك وەزیران و پێکهێنانی

حکوومەتی نوێی دوای هەڵاتنی کەمالیەکان لە دەسەڵات، ئەمەش بەهۆی گۆڕانکاریەکی گەوورە لە رامیاریەتی تورکیا لە هەموو بوارە جیاجیاکان.

١٩٥٠/٥/١٤ لەهەڵبژاردنەکانی سەرۆکایەتی کۆماری تورکیاو پەرلەمان پارتی دیموکراتی سەرکەووتنی بەدەست هێنا بەرامبەر پارتی گەلی کۆماری لە وولاتەکەدا .

١٩٥٠/٦/١٩ نووسـەرو شـاعیری نەتـەوەیی بـەناو بـانگی کورد – پیرەمێرد – لە سەر داوای خـۆی لـە دوای مردنی لەگردی مامە یارەی شـاری سـلێمانی لـە باشـووری کوردسـتان تەرمەکـەی نێـژاروە پیرەمێـرد زیـاتر لـە– ١٠– دێرە هۆنراوەی لەشێووەی پەنـدی پێـشینان هۆنیووەتـەوە ، سـالانێکی زۆر سەرپەرشـتی هـەردوو

رۆژنامـەی ژیـن و ژیانـەوەی کـردووە لـەبلاو کردنەوەیـدا ، هۆنراوەکـانی مەولـەوی وەرگێراوەتـە سـەر زمـانی سـۆرانی، مـەم و زینـی بەپەخـشانە هۆنیووەتەوە، – ١٢– سـووارەی مەریوانی کردۆتـە چیرۆك ، مەحمود ئاغای شـیووە کـەلی لەشـێووە شـانۆگەریدا نووسـیووە ، چـەند پەنـدو گوزشـتەی کوردی لەژێر ناوی گاڵتەوگەپدا بلاوکرۆتەوە لە کوردستاندا.

١٩٥٠/٦/٢٥ بە نـاوی ئـەوەی کـە هێزەکـانی سـووپای کۆریـای باشـوور دەیـەوێ پـەلاماری هێزەکـانی سـووپای کۆریـای باکوور بدات و پێـنج فرقـەی سـەربازی کۆریـای باکوور چوونە ناو خاکی کۆریای باشوور بە سەرکردایەتی –کیم ئیرسین– و گەیشتنە دەووروبەری سیئۆلی پایتەختی کۆریای باشوورلە ناوچەکەدا.

بـەلام دوای دوو ڕۆژ ، واتـە لـە ٦/٢٧ لـە سـەر داوای نەتەوەیـەکگرتووەکان و

هێزەکانی سووپای ئەمەریکا پاڵە پەستۆیان خستە سەر هێزەکانی سووپای کۆریای باکوورو کێشەکە کۆتایی هات ، ئەویش بەکشانەوەی هێزەکانی سووپای کۆریای باکوور لەخاکی کۆریای باشوور لە کێشووەرەکەدا .

هەر لە هەمان رۆژدا هێزەکانی سووپای کۆریای باکوور پەلاماری کۆریای باشووری داو رۆژی دوایی لەلایەن نەتەوە یەکگرتووەکان تاوانبار کراو داوای کشانەوەی هێزەکانی لێکردو سەرۆکی ئەمەریکی – هاری تۆرمان– دەنگی بەهێزی ئاسمانی و دەریاییدا بۆ جێبەجێکردنی بڕیاری نەتەوەیەکگرتووەکان

١٩٥٠/٦/٢٧ سەرۆکی ئەمەریکا تۆرمان ناچار بوو ئاگاداری بداتە هێزەکانی کە سەرکردایەتی سەرۆکی هێزەکانی بەشی قووڵایی رۆژهەڵاتی ئاسیای دەکرد – مکارسەر – بە پەلە جی بە جێبکات بۆیە – مکاسەر سەرکردایەتی – ولیام وبین – بەرەو شەڕەکە رۆیشت و دەستیپێکرد و لەم شەڕەدا هەتاکوو لە رۆژی ٦ تاکوو ٧/٢١ سەرکردەیەکی ئەمەریکی بەدیل گیرا.

١٩٥٠/٧/١٥ بڵاوکردنەوەی یەکەم ژمارەی رۆژنامەی ئاکرێ لەناوچەی قەزای ئاکرێ لە باشووری کوردستان.

١٩٥٠/٨/٧ بەرپرسی سەربازی ئەمەریکا لە دوای ئاڵۆزبوونی باری سەربازی – مکاسەر – سەرکردەیەکی دیکەی دانا کە سەرکردەی هێزەکانی فرە رەگەزی دەکرد، وەکوو هێزەکانی بەریتانیاو تورکیا و کەنەداو ئوستralیا و تایلاندو فەرەنساو یۆنان و نیوزیلەندا و هۆلەندا و کۆلۆمبیا و بەلژیکا و ئەسیوبیا و ۆکسمبۆرك و ئەفەری کیای خواروو ئەمەریکاشی دەکرد، لەوکاتە بوو هێزە کۆمۆنیستەکان توانیان پاشەکشە بەهێزی ئەمەریکا وکوریای خواروو پێ بکەن کە ٢٥ فرقەی سەربازی بوون لە هەرێمەکەدا.

١٩٥٠/٨/١٧ ڕژێمـی كۆمـاری ئەندۆنوسـیا لـە لایـەن سـوهارتۆ ڕاگەیانـدرا لـە دوای دەرچـوونی تەواوی هێزەكانی سـووپاو بەرپرسـانی هۆڵەنـدا لـە وولاتەكەیـدا . لـە

شـاری – جاكارتـا– ی پایتـەخت ، كـە ژمـارەی دانیـشتووانەكەی ، ٩,٣٠٠,٠٠٠ ملیۆن كەسە

هـەروا ژمـارەی دانیـشتووانی وولاتەكـەی، ٢١٨,٣٥٠,٠٠٠ میـۆن كەسـە . هـەروا ڕووبـەری خـاكی وولاتەكـەی ، ١,٩٠٤,٥٧٠ ملیـۆن كیلـۆ مـەتر چـوار گۆشـەیە . هـەروا چـڕی دانیـشتووانەكەی ، ٢٩٧ كـەس لـە یـەك مبـل چـوار گۆشـەدا . هـەروا نـژادەكانی ،گـاوبوون ٤٥٪ . سـوودانی ١٤٪ . مـادووربوون ٧,٥٪ . مالایۆ ٥٪ . لە وولاتەكەدا .

١٩٥٠/٨/٢٨ . نووسـەرو ڕوونـاكبیری ئیتـاڵی – نـشیزاریافیزی– لـە ئاكـامی خـواردنی – ٢٠– دانەلەحـەبی نووسـتن كۆچـی دوایـی كـرد ، ئەمـەش بـەهۆی نووسـینی ڕۆمانەكەی بە ناوی – لەنێوان ئافرەتان– دا، كە ڕۆملنێكی خەمپێدان بوو لە لایەن پیاوان بەرامبەر بە ئافرەتان .

١٩٥٠/٩/٨ لە دوای هەوڵێكی بەردەوام بووە هـۆی مـۆركردنی پـەیمانی ئاشـتبوونەوە لـە گەڵ یابان لە شاری – سان فرانسیسكۆ– لـەنێوان وولاتـانی ڕۆژئـاوا ، بـەپێی ئـەو پـەیمانـە ، كـە ئـەو زەویانـەی كـەیابان داگیریكردبـوو لـەخاكی چین دەبـێ هەمووی بگەڕێتەوە بۆ چینی میللـیو ئـەو كەلوپـەلو ناوچانەی كە لـەدوای جەنگی یەكەمی جیهان دەستی كەوتبوو لەگەڵ داگیركردن .

١٩٥٠/٩/١٥ سەركردەی هێزی سووپای نەتەوە یـەكگرتووەكان – ژەنـەڕاڵ دۆگـلاس مـاك–

بـەکاری هاتنـە خـوارەوە لـەهێلی نێـوان هـەردوو کۆریـا ، کـە بـووە هـۆی پاشەکشەکردنی هێزەکانی سووپای کۆریایی باکوورو هێزەکانی سووپای چینی مللی و چووە ناوشارەکەو بووە هۆی پەرت و بڵاو پێکردنی هێزەکانی نەتەوەیەکگرتووەکان .

١٩٥٠/٩/٢١ نووسـەرو روونـاکبیری فەرەنـسی- باسـیلی نیکـتین - گووتوویـەتی :- لـە سـنووری سـاڵی ١٩٠٩ عەبـدولرەزاق بـەدرخان سـەردانی پترۆسـبۆرگی پایتـەختی رووسـیای قەیـسەری ئـەوکاتی کـردووەو پـرۆژەی کوردسـتانی سەربەخۆی بۆ حکوومەتی رووسیای قەیسەری هەڵگرتبوو.
بـەڵام دەسـەڵاتدارانی رووسیا رەزامەنـدیان لەسـەر داوا کـە نـەکرد بـەپێی پرۆژەی داواکاریەکە بە هۆی بەرژەوەندی ئەو کاتی رووسیای قەیسەری لە کێشووەرەکەدا .

١٩٥٠/١٠/٣ هێزەکـانی سـووپای فەرەنـسا لـە مـانگی/٦ یارمەتیـەکانی سـەربازی لـە ئەمـەریکا وەرگـرت و هێرشـی کـردە سـەر هێزەکـانی سـووپای شۆرشـگێری ڤێتنامی - ئەلفیت مینە- لەناوچەی - کاو بانگ- کە .
ئـەویش بـووە هـۆی شـکانی هێزەکـانی سـووپای فەرەنـسا بەرامبـەر شـاڵاوەکانی سـووپای - ئـەلفیت مینـە- و کـشانەوەیان لەشـارەکە دوای زیانێکی -٢٠٠٠- سەربازی و بەدیل گرتنـی- ٣٠٠٠- سـەربازی فەرەنسی، تـا بـووە هـۆی ئـەوەی کـە هێزەکـانی سـووپای فەرەنسا لەناوچـەی - لانـگ سۆن- بکشێنەوە و ناوچەکە چۆڵ بکەن لە پـێش هێزەکانی - ئـەلفت منـە - لە ناوچەکەدا .

١٩٥٠/١١/١ ئـەدیب و رووناکبیری نـاوداری جیهانی مامۆستا – برنادشۆ – کۆچی دوایی کردووە.
شـــایانی باســـە مامۆســـتا برنادشۆ ووتە بەنرخەکانی ئەو کـە لـە پیـاوە زانایـە تـاکوو جیهان و مرۆڤایەتی مابێ رۆڵی کاریگەری خۆی هەیە لە هەموو بوارە جیاجیاکاندا وولاتە جیا جیاکانی جیهان .

١٩٥٠/١١/٣ بڕیـاری ژمـارە/٣٧٧ ی کۆمەڵـەی گـشتی نەتەوەیـەکگرتووەکان کـە پـشت دەبەستێ بەو بڕیارە ، گەر هات و ڕێکخراوی نەتەوەیەکگرتووەکان توانـای کـارکردنی نـەما ، یـاخوود نـەیتوانی بڕیـاری گوونجـاو لەکێـشەوبارودۆخی وولاتانی جیهان وەربگرێت بەرامبەر بە هەر دەوڵەتێك وکێشەیەك بەناوی – یەکێەتی لەپێناو ئاشتی– لەجیهاندا .
لە سەر وولاتە جیا جیاکان لە جیهاندا .

١٩٥٠/١١/٤ ڕێکەووتننامەی ئەوروپا بۆ پاراستنی مافی مرۆڤ و ئازادیە بنەرەتیـەکان مۆر کرا ، لە نێوان وولاتانی ئەندام لە ئەنجوومەنی ئەوروپا ، ئەویش بەماوەدانی پەنابـەری بـۆ هـەر وولاتێـك ، گـەر پێـشێلی مافـەکانی مـرۆڤ نـەکرێت لـە وولاتەکەیدا.

١٩٥٠/١٢/١٦ بڵاوکردنەوەی یەکەم ژمارەی رۆژنامەی هەولێر لە شاری هەولێر لە لایەن کۆمەڵەی مامۆستایانی لقی هەولێر بەسەرپەرشتی مامۆستا عزەدین فەیزی و عەبدولمەجید حەسەن لە باشووری کوردستان .

**دەرچوونی عەرەب لە بیابانی گەورەی دوورگەی عەرەب و بوونیان بە چەندین دەوڵەت لەرێگەی فتووحاتی ئیسلامیەوە لە کێشوورەکەدا . کە لە نەخشەکەدا ئەوە دەسەلمێنێ .**

# سەرچاوەکان

١- میدیا (ئی - م- دیاکۆنۆف) دار الحکمة -لندن.

٢- چەند لاپەریەك لە مێژووی کورد- لازاریف.

٣- الثقافة الجدیدة- گۆڤارێکی مانگانەی پارتی کۆمۆنیستی ئێراقە.

٤- بیری نوێ- گۆڤارێکی وەرزی پارتی کۆمۆنیستی کوردستانە.

٥- کوردستان والکرد- جواد مەلا- وطن مقسم وامة بلا دولة.

٦- رادیۆی لەندەن- پرۆگرامی السائل والمجیب.

٧- رۆژ ژمێری - پانۆرامای کوردستان.

٨- چەند لاپەڕەیەك لەمێژووی کورد بەشی /١-٢، د. کەمال مەزهەر ئەحمەد.

٩- هەولّم داوە لەتەلەفزیۆن و گۆڤارو رۆژنامەکان کۆم کردۆتەوە لەگەڵ نووسینەکانی خۆم کە دەستنووس بوونەو بابەت لەدوای بابەتی جیاجیا بڵاوکراونەتەوە.

١٠- کوردستانو کورد- شەهید دکتۆر عەبدولرەحمان قاسملۆ.

١١- شۆرشی شێخ عووبێدوللای نەهری- محەمەد حەمە باقی.

١٢- شۆڕشەکانی شێخ سەعیدی پیران لەباکووری کوردستان.

١٣- کورد- باسیلی نیکیتین- وەرگێرانی: دکتۆر نووری تاڵەبانی.

١٤- المشکلة الکردیة في الشرق الاوسط- د. حامد محمود عیسی.

١٥- ساڵنامەی کوردستان- دانانی: عەلی کەندی - چاپی سێیەم - تاران- ٢٠٠٦.

١٦- تأریخ الدولة العثمانیة - مامۆستا محمد فرید المحامي، چاپی نۆیەم - دار النفائس- بیروت.

١٧- سنتان ڤی کوردستان- ١٩١٨-١٩٣٢ - دیلبوە- آ- هی فەرمانرەوای رامیاری هەولێر- وەرگێرانی: فوئاد جەمیل -چاپی یەکەم- بەیرووت.

١٨- القانون الدولي العام - دکتور عصام العطیة - چاپی شەشەم- ٢٠٠١ - وەزارەتی باڵای فێرکردنو تووێژینەوەی زانستی- بەغدا.

١٩- رۆژنامەی (الحیاة) چاپی بەیرووت - ژمارەی ساڵەکانی ٢٠٠١-٢٠٠٢-٢٠٠٣-٢٠٠٤-٢٠٠٥- ٢٠٠٦ -٢٠٠٧.

٢٠- رۆژنامەو گۆڤارەکانی هەرێمی کوردستان- خەبات - کوردستانی نوێ - گولان- رامان - کاروان - سەردەمی عەرەبی- رێگای کوردستان- گولانی عەرەبی- سەنتەری برایەتی.
٢١- فەرهەنگی رووداوەکانی کوردستانو ولاتانی جیهان- دانانی: عەلی کەندی - چاپی یەکەم- تاران - ٢٠٠٥.
٢٢- کەناڵی ئاسمانی تەلەفزیۆنی جەزیرە - پرۆگرامی ( في مثل هذا اليوم).
٢٣- اسرائيل الكبرى - دراسة في فكر التوسعي الصهيوني - دكتور اسعد زوق - دار الحمراء- بيروت. الطبعة الرابعة - ٢٠٠٣.
٢٤- تأريخ اوروبا فى العصر الحديث- دانانی : هـ. ا. ل. فيشر- دار المعارف- چاپی نۆیەم.
٢٥- قصة الحضارات - دانانی - ول ديورانت - وەرگێرانی: محمد بدران- مصر- مهرجان القراة للجميع.
٢٦- معجم الحروب - دانانی : دكتور فردريك معتوق- چاپی یەکەم- بەیروت- لوبنان.
٢٧- لمحات اجتماعية عن تاريخ العراق الحديث - دكتور على الوردى - توزيع مكتبة الصدر- تاران - ئێران.
٢٨- التاريخ الاسلامى - دانانی: دكتور محمد شاكر - المكتبة الاسلامية- چاپی هەشتەم- بەیروت - ٢٠٠٠.
٢٩- الارهاب الدولي وانعكاساته على الشرق الاوسط خلال الاربعين قرنا- دانانی سفير: دكتور حسين شريف- الهيئة المصرية العامة للكتاب- ١٩٩٧- میسر.
٣٠- دراسات في الحركة الكردية المعاصرة- ١٨٣٣ -١٩٤٦ دانانی: دکتور عوسمان عەلی- چاپخانەی رۆشنبیری حکومەتی هەرێمی باشووری کوردستان.
٣١- القاموس السياسى - ئامادەکردنی: احمد عطية - چاپی سێیەم- دار النهضة العربية -شارع عبدالخالق - قاهیرە - میسر.
٣٢- تاريخ الوزارات العراقية - دانانی : عبد الرزاق ئەلحوسنی - چاچی شەشەم- بیروت - ١٩٨٢,
٣٣- نەتەوەکانو دەوڵەتی سۆڤیەت - هیلین کاریردا کلوس- وەرگێرانی بۆ زمانی عەرەبی: هزى عبود - بەیروت - چاپی یەکەم- ١٩٧٩.
٣٤- مقالاتی - شەهید سامی عەبدولرەحمان- باشووری کوردستان- هەولێر.
٣٥- عەبدولکەریم قاسم - رؤية بعد الشعرين- حسن العلوى- چاپی یەکەم- العراق..
٣٦- الحياة السرية لصدام حسين - دانانی: انيس الرغيدى- چاپی یەکەم -٢٠٠٤- میسر.

٣٧- راپەڕینی کوردە عەلەویەکانی دەریسم- هانز- لۆکای کبیسیر- ١٩١٩-١٩٢١ قۆچگیری- وەرگێرانی لەفەرەنسیەوە - نەجاتی عەبدوڵلا.
٣٨- کوردستانی پشت قەفقاس- دکتۆر -ئەفرسیاو هەورامی - لەبڵاوکراوەکانی - ژین- باشووری کوردستان- سلێمانی.
٣٩- تاریخ العراق بین احتلالین - پارێزەر - عەباس عەزاوی چاپی یەکەم- هەشت بەشەکە.
٤٠- شەرەفنامە -شەرفخانی بەدلیسی -وەرگێرانی هەژار- ١٩٧٣ لەلایەن کۆڕی زانیاری کورد بەچاپ گەیاندراوە- چاپخانەی نعمان - نەجەف.
٤١- کوردو کوردستان - بەرگی ١-٢-٣ محەمەد ئەمین زەکی - لە دار اسلامی بغداد بەچاپگەیاندراوە -١٩٣١.
٤٢- کوردو عەجەم - نەوشێروان مستەفا ئەمین - مێژووی سیاسی کوردەکانی ئێران - سەنتەری لێکۆڵینەوەی ستراتیژی کوردستان-سلێمانی -٢٠٠٥.
٤٣- کورد - تورك - عەرەب- سیسیل جون ئیدمۆندی- وەرگێرانی حامد گەوهەری- دەزگا، چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس- ٢٠٠٤.
٤٤- فی الاداب (ف. إ. لینین) - وەرگێرانی لە رووسیەوە- یوسف حلاق بڵاوکردنەوەی وەزارەتی رۆشنبیری - دیمەشق -سوریا -١٩٧٢.
٤٥- مێژوو - دکتۆر کەمال مەزهەر ئەحمەد - بە یاریدەدەری ئەمینداریتی گشتی رۆشنبیری ولاوان چاکراوە -بەغدا ١٩٨٣.
٤٨- چەند لاپەڕەیەك لە مێژووی گەلی کورد - دکتۆر کەمال مەزهەر ئەحمەد- بەرگی دووەم- ئامادەکردنی: عەبدوڵلا زەنگەنە- هەولێر - چاپی یەکەم - ٢٠٠١.
٤٩- یاداشتەکان - رەفیق حلیمی -بەشی یەکەم و دووەم - کوردستانی ئێراق شۆڕشەکانی شێخ مەحمود -چاپخانەی رۆشنبیری - بەغدا - ١٩٨٨.
٥٠- هەڵوێستنامە- عەلی کەندی - بەرگی یەکەم - چاپی یەکەم- هەولێر- ٢٠٠٦.
٥١- قصة الدیانات -سلیمان مەزهەر - کتێبخانەی مەدبولی - چاپی دووەم - میسر - ٢٠٠٣.
٥٢- کوردستان لە ساڵەکانی جەنگی یەکەمی جیهان - دکتور کەمال مەزهەر ئەحمەد - وەرگێرانی بۆ عەرەبی: دکتور محەمەد مەلا عەبدولکەریم - چاپی دووەم -بەغدا - ١٩٨٤.

٥٣- راپەڕینی شێخ سەعیدی پیران – ڕۆبەرت ئۆلسن –١٨٨٠–١٩٢٥ وەرگێرانی ئەبوبەکر خۆشناو- زەنجیرە کتێبی دەزگای چاپو پەخشی سەردەم – سلێمانی –١٩٩٩.

٥٤- تاریخ الاکراد- تۆماس بوا- وەرگێرانی – محەمەد تیسیر مبرفات – دار الفکر المعاصر- بیروت –لوبنان – چاپی یەکەم –٢٠٠١.

٥٥-حول مسألة الاقطاع بين الاكراد – أ. شامیلیۆف- وەرگێرانی- دکتۆر کەمال مەزهەر ئەحمەد – چاپی دووەم- بەغدا – ١٩٨٤.

٥٦- قضايا كردية معاصرة – كركوك والانفال –الكردو توركيا – دكتور جبار قادر – دار ئاراس للطباعة والنشر – چاپی یەکەم – ٢٠٠٦.

٥٧- کورد لەجەنگی رووسیا لەگەڵ ئێران و تورکیا . پ. ی- ئەڤیریانۆف –وەرگێرانی لە رووسیەوە دکتۆر ئەفرسیاو هەورامی –سلیمان –٢٠٠٤.

٥٧- كركوك وتوابعها حكم التاريخ والضمير – دراسة وثائيفة عن قضية الكردية في العراق – دکتور کەمال مەزهەر ئەحمەد= بەشی یەکەم – وەزارەتی رۆشنبیری حکومەتی هەرێمی کوردستان –سلێمانی .

٥٨- المستبد – زهیر ئەلجەزائری – صناعة القائد – صناعة الشعب- چاپی یەکەم – بیروت –بەغدا –٢٠٠٦.

٥٩- عصر ناپلیۆن – تاريخ الحضارة الاوروبية فى ١٧٨٩–١٨١٥ – ول ديورانت – وەرگێرانی دکتۆر عەبدولرەحمان عەبدوڵلا شێخ – دار الجبل – بیروت –٢٠٠٢.

٦٠- تاریخ الرومان – دانانی نجيب ابراهيم طراد –تقديم دكتور محمد رينهم عزب – مكتبة ومطبعة القدر–١٩٩٧.

٦١- موسوعة الفلسفة – دانانی دکتۆر عەبدولرەمان بەدەوی – بەرگی – ١–٢–٣. تاران – ئێران .

# کورتەیەك لە ژیاننامەی - نووسەر

گـەر بـەراوود لـە نێـوان ژیاننامـــەی نووســـەران بکەینـــەوە ، بۆمـــان دەردەکەوێ کە نووسـەران ، یـاخوود دانـەران ، جـا لـە هەر بووارێك بن ، بگرە لە نووســـینەوەی مێـــژووو جووگرافیـــا و زمـــان وکـەلتوورو داب ونـەریت و شارستانیەتی هەر نەتەوەیەك لە سەر گۆی زەویدا . کە ژیاننامەی نووسەران زۆر لە یەك دەچێ ، جا لە بوواری هەژاری و کەم دەرامـەتی بێت ، یـاخوود لـە ئاسـتی بڕوانامـەی خووێنـدن بێـت ، یـاخوود لـە ئاسـتی پەیووەندیـە کۆمەلآتیەکان بێت .

بەلآم سەرچاوەی بوونی توواناى نووسەر لە هەموو بووارە جیاجیاکانـدا ، هۆکـاری چ ئـێش وئازار و نالەباری ئەو نووسـەرەیە لـە نـاو پەیووەندیـەکانی کۆمـەلگاو لـە نێـوان کۆمـەلگاو دەسەلآتدا .

ئەویش بە هۆی چەوسـانەوەو نـەبوونی داد پـەروەری لـە دەسـەلآ ت و پەیووەندیـەکان لـە هەموو بووارەکانی ڕامیاری و ئابووری بازرگانی و نەتەوەیی و نیشتیمانی و کۆمەلآیـەتی و ڕۆشەنبیری و زمان و مێژوو داب و نەریت و و کەلتوورو شارستانیەت .

بەتایبەتی کۆمەلگای کوردو مێژووی چەوسانەوەی داگیرکردنی و لەت لـەتکردنی لەلایـەن ڕژێمـەکانی دابـەش کـەر، لـە پێنـاو پاراسـتن و بتـەووکردن وبـە هێـز کردنـی بەرژەوەندیەکانیان . بە دروستکردن و پێکهینانی دەوولەت لەسەر خاکی گەلانی دیکە لە هەرێم و ناوچەو جیهاندا ، لەوانەش گەلی کوردو خاکی کوردستان .

جا عەلـی کەندیش یەکێکە لەو نووسەروو دانەرانـەی کـە بـەو قۆناخـە نـا لەبارانـە تێپـەر بـووەو بۆتـە هـۆی سەرچـاوەی پێنووسـەکەی بەنووسـین و گەیانـدنی پەیامەکـەی بـۆ کۆمەلگای گەلی کوردستان . کە ئەویش:-

ناوی تەواوی — عەلی عوومەر عەلی فەتاح - ە و ناسراو بووە بە — عەلی کەندی — و لە ساڵی ١٩٥٣ لە گووندی سەر بەشاخ ، کە مەڵبەندی هۆزی سیانەو سەر بەناحیەی دیبەگەی سەربە قەزای مەخموری پارێزگای هەولێرە لە باشووری کوردستان ، چاوی بە جیهان هەڵهێناوە ، لە بنەماڵەیەکی هەژاری جووتیار لەم گووندەدا .

هەروا عەلی کەندی بۆ یەکەم جار لە لای مەلای ئاینی ئیسلام دەستی کردووە بە خووێندن لە حووجرەی فەقێیان لە مزگەوتەکان .

دوای ئەوە لە ساڵی ١٩٦٠ چۆتە قوتابخانە لە قەزای مەخموور . جا لەوکاتە بەهۆی هەژاری خێزانەکەی و نەبوونی توواناى دارایی باوکی ، لە گەڵ خووێندن لە پشووی هاوینە کاری کردووە ، بە کاری بەرخەوانی و شووانی و درووێنە کردن و جووت کردن و کاریدیکەی کە لە توواناییدا هەبووە ، لە پێناو بەرەو باش بوونی باری گووزەرانی ژیانی خێزانەکەو یارمەتی دانی باوکی لەم بووارەدا .

هەروا دوای تەواوکردنی قۆناخی خووێندنی سەرەتای و دەرچوونی بە پلەی دووەم لە سەر ئاستی قەزای مەخموور لە خووێندن ، و بەهۆی باری رامیاری و بیروو بۆچوونی ئەو خێزانەوە ، لە هەمان کات بە هۆی هەڵوویستی عەلی کەندی فەرمانی دەست گیر کردنی لە مانگی/ ٧/١٩٦٦ لەلایەن داروودەستەکەی رژێمی بەعسی بۆ دەردەچێ لە قەزاکەدا .

هەر بەم هۆکارەش لە ١٠/ ٩ / ١٩٦٧ ڕووی لەشاخەکانی کوردستان کرد بە پەیووەندی کردنی بە پێشمەرگەی شۆرشی ئەیلولی مەزن لە لقی پێشمەرگەکانی پارتی کۆمۆنیستی ئێراق لقی / هەرێمی کوردستان ، لە دەڤەرەکانی ڕانیە و قەڵادزێ و ڕەواندوزو پارێزگاکانی سلێمانی و هەولێرو بە ردەوام بوونی تاکوو ٢٠ /٣ /١٩٧٢ .

لەو ماوەیەشدا بەهۆی خراپی باری خێزانەکەی لە کاتە بەردەستەکانی کاری کردووە بۆئەوەی ژیانی خۆی و خێزانەکەی بەرەو باشتر ببات لەو کاتدا .

دوای ئەوە گەراوەتەوە پارێزگای هەولێرو چۆتە قەزای مەخموور بۆ کاری پارتایەتی و بۆتە کادیر لە قەزای مەخموورو بە بەردەوام بوونی لە پایەکانی لە پارتی کۆمۆنیست تاکوو ١٩٧٩/٣/١٢ ، کە ئەندامی لیژنەی ناوخۆی پارتی کۆمۆنیست بووە لە لیژنەی پاریزگای هەولێر لە باشووری کوردستان .

دوای ئەوە لە ١ / ٧ / ١٩٧٥ چۆتە شاری مۆسکۆی پایتەختی یەکێتی سۆڤیەت ، ئەویش بە خووێندنی لە پەیمانگای زانستە کۆمەڵایەتیەکان ، ی سەر بە ئەکادیمیای زانستی کۆمەڵایەتیەکانی یەکێتی سۆڤیەت ، بۆ ماوەی دوو ساڵ بە دەر چوونی بە پلەی زۆر باشە

لە پیمانگایەدا ، تاکوو ١٥/ ٨ / ١٩٧٧ دا و دوای ئەوە گەراوەتەوە کوردستان لە پارێزگای هەولێر قەزای مەخموور لە دەڤەرەکەدا .
دوای گەرانەوەی لە سۆڤیت لە ١٩٧٨/١٢/١٢ خێزانی پێك هێناوە و باوکی پێج کورە ، و هەموویانی بە ئامانجێکی باش گەیاندوو لە پلەکانی فەرمانبەریەتی و سێ لە کورەکانی خێزاندارن لە شاری هەولێردا .
هەر لە ١٩٧٩/٣/١٢ بە فەرمانبەر دامەزراوە لە بەرێوەبەرایەتی گەشت و گوزار لە هاوینە هاواری سەلا حەدین لە کۆمەلگای سەرە رەش لە پارێزگای هەولێر ، بە بەردەوام بوونی کاری فەرمانبەرێتی . سەرەرای ئەوەش لە دوای سالی هەشتاکان بەهۆی مل کەچ نەکردنی بۆ داخوازیەکانی دارو دەستەکی بەعس لە کوردو عەرەب ، کە لە ١٩٨٢/٢/١٣ لەلایەن بەرێوەبەرایەتی ئەمنی هەولێر دەست گیر کراوەو رەوانەی — الهیئة الخاصة — لە شاری کەرکوك زیندانی کراوەو بۆ ماوەی حەوت مانگ گیراوە تاکوو ٦ / ٨ /١٩٨٢ . ئازاد کراوە بێ ئەوەی هیچ کەسێك لە ئەندامان و لایەنگرانی پارتەکان و کە سایەتیەکان تووشی ئێشوو ئازارو ئەشکەنجە بکات — واتە ئیعتراف نەکردن — و بە سەربەرزی لەو زیندانانەی شەقلاوەو مسیف سەلاحەدین وهەولێرو کەرکوك دەرچووە .
دوای ئەوە بۆ جاری دووەم لە ١٩٨٥/٥/١٩ لە لایەن پیاوانی موخابەراتی پارێزگای مووسڵ ، کە لەو کاتە سەرباز بوو لە مەدرەسە قتالی مووسڵ دەستگیر دەکرێ و رەوانەی موخابەراتی گشتی شاری کەکوك دەکرێت ، کە ئەم بەرێوەبەراتیە گشتیە بۆ هەموو شارەکانی کوردستان بوو وەك موسل و کەرکوك و هەولێرو سلێمانی ودهۆك . کە فەرمانی دەست گیرکردنی لەلایەن بەرێوەبەرایەتی ئەمنی هەولیرو ئەمنی باکوورو ئیستخبارات و موخابەرات لە هەردوو پارێزگای مووسڵ وهەولێری بۆ دەرچوو بوو .
لەئاکام لەم رۆژەدا دەستگیرکراو لە زیندانەکانی موسل وکەرکوك مایەوە تاکوو ١٧ / ٩ / ١٩٨٥ بە ئازادکردنی لە دوای داد گایی کردنی ، کە هیچ بەلگەیەك نەیتووانی تاوانباری بکات بەهۆی دان نەنانی بە کارە نەهێنیەکانی کە لەو کاتدا ئەنجامی دەدا .
هەروا بۆ جاری سێیەم لە ٢٥ / ٩ /١٩٩٠ لە لایەن ئەمنی هەولێر دەستگیرکراوەتەوە لەسەر هەمان بیروو بۆچوو ن وهەلوویست . بەلام بۆ ماوەیەکی کەموو دوای ئەوە ئازاد کرا.
لە دوای ٣/١٢ /١٩٧٩ تاکوو راپەرینی گەلی کوردستان لە ١٩٩١/٣/٥ بە سەدان جار لەلایەن بەرێوەبەرایەتیەکانی ئەمن و ئیستخبارات و موخابەرات لە پارێزگای هەولێر بانگ

هێشت کراوەو لێکۆڵینەوەی لە گەڵ کراوەو لە دوای ووتە ناشیرینەکانیان و ئیهانـە کردنـی علی کەندی ئینجا رێگەیان پێداوە لە بەرێوەبەرایەتیەکانیان دەرچێ .

سەرەرای ئەوەش بۆ دووجار لە رێزی سەربای سووپای ئێراق بووە بۆماوەی ٤,٥ چوارساڵ و نیوو ، بەلاّم ئـەو کەسانەی کـە کـورد بـوون و رەفیـق حزبیـی و ئـەمن جاشـی خـۆ فـرۆش ودووژمنی کوردو کوردستان بوون دژی مامۆستا عەلـی کەندی بوون بـە نووسـینی راپـۆرت لەسـەری و بـە زینـدانی کردنـی ...؟...! . کـە ئێـستاش لـەجاران رۆلأیـان و بـاری ژیانیـان باشـترە لـە هـەمان دام ودەزگـا ئەمنیـەکان و حکوومـەت و خـاوەنی هـەموو شـتێکن ، لـە حکوومـەتی هـەرێمی کوردسـتان و ، بـەلاّم مامۆسـتا عەلـی کەنـدی تـا تـەواو بـوونی ئـەم مێژوونامەیە خاوەنی – یەك سم زەوی نیە نەك لـە سـەر گـۆی زەوی بگـرە لەسـەر خـاکی کوردستانیشدا و ماوەی ژیانی لە کرێ چیبایەتی بردۆتە سەر لەم بـارو دۆخـە تەنگـەدا ، و عەلی کەندیش هەر وەك جارانە لە بیروو بۆچوون و هەلۆوێستەکانی بەردەوامەو رۆژێـك لە رۆژانیش مل کەچی هیچ لایەنێك نەبووە نە لەرابردوو ولە ئێستادا ، بۆ سەلماندنی ئەم ووتان . نووسینەکان ودانراوەکانیشی شاهیدن بۆ ئەم راستیانە .

## لە بەرهەم و بلاّکراوەکانی– نووسەر

لە گەڵ ئەوەشدا عەلی کەندی لە بارەی دەسـتکردنی بـە نووسـینەکانی کـە دەگەرێتـەوە بـۆ ساڵی ۱۹۷٤ ، کە لـەو کاتـەی لـە شـاری بـەغا بـوو ، یەکـەم بابـەتی لـە رۆژنامـەی – تـەریق ئەلشەعب – کە زمانحالی پارتی کۆمۆنیستی ئێراق بوو ، لە سەر باری رامیاری و نەتەوەیی بلاّوکردەوە لە رۆژنامەکدا . دوای ئەوە لە نووسین بەردەوام بووە بە پێی باروو دۆخەکانی رامیاری و نەتەوەیی و بووارەکانیدیکەدا . بەرهەمەکانیشی ئەمانەن :-

١- ساڵنامەی کوردستان ، کە یەکەم بەرهەمی نووسنەکانە .
٢- فەرهـەنگی رووداوەکـانی کوردسـتان و وولاّتـانی جیهـان ، کـە بـۆ یەکـەم جارە لـە کوردستان – چاپی یەکەم /٢٠٠٥ .
٣- مێژوونامە – کە ئێستا لە بەردستدایە ، چاپی یەکەم / ٢٠٠٦ .
٤- زانین – کە فەرهەنگێکی – کوردی – عەرەبی – رووسیە ، کە ئەویش بەرەوە بە چاپگەیاندن هەنگاو دەنێ .

٥- نەخشەی جیهان – بە زمانی کوردی بە ناونیشانی – کورد لە نێوو نەخشەی رامیاری جیهان – کە بۆ یەکەم جارە لە کوردستان . ئەم نەخشەیە ١٠٠٠٠ دە هەزار دانەی لێ چاپکرا لە ئێران ، بەلاَم لە لایەن دەزگاکانی ئیتلاعاتی ئیران دەستگیر کرا . دوای ئەوە وەك هەدییە لە ٢٠٠٨/٨/٤ پێشکەش بە وەزارەتی پەروەردەی حکومەتی هەرێمی کوردستان کرا ، لە ریگەی بەرێووە بەری گشتی پرۆگرام و چاپەمەنیەکان – کاك ئاراز نەجمەدین – لە هەولێر .

٦- سالنامەی کوردستان – بە شێووەی بچووك – تقویم مەنزەدی – کە بۆ یەکەم جارە لە کوردستان .

٧- هەلۆووێستنامە – ٢٠٠٦ – بەرگی یەکەم ، کە ئامادەیە بۆ چاپکردن .

٨- ئینسکلۆپیدیای کوردستان و جیهان –چاپی دووەم /٢٠٠٨ .

٩- ئافرەت لە پەیووەندیە کۆمەلاَیەتیەکاندا ، هەنگاو دەنێ بەرەو بە چاپگەیاندن .

١٠- دەفتەری زانیاری – بەندە بە پارکی سامی عەبدولرەمان لە شێووەی – شریت – کە ٢,٥٥ مەتر درێژیەتی ،ئەویش بۆ یەکەم جار بووە لە کوردستان .

١١- بلاَوکردنەوەی زیاتر لە – ٧٥ – بابەت و لێکۆلێنەوە لە بووارەکانی رامیاری و نەتەوەیی و جووگرافی وپەیووەندی کۆمەلاَیەتی و ئافرەت و توویژی گەنج ، لە رۆژنامە وگۆڤارەکان ، لە سەر باروو دۆخی کوردو رووداوەکان لە گەلّ وولاَتانی داگیر کەری کوردو کوردستان و رامیاریەتی لە پەیووەندی نێوو دەوولەتیدا .

١٢- لە دوای ئەوانە ، ئەوا ئینسکلۆپیدیای مێژوونامەکە بە چووار بەرگ/٤ کەوتە بەردەستتان ، وەك بلێی هەگبەی مێژوو لە بەر دەستا بێت لە هەموو بووارەکانی – رووداوو بە سەر هات و رێکەووتن و شەرو ئاشتی و نەتەویی نیشتیمانی و رامیاری و جووگرافی و سەربازی و ئابووری و بازرگانی کۆمەلاَیەتی و رۆشنبیری و مێژوو وزمان و داب و نەریت و کەلتوور و شارستانیت , لە گەلّ رووداوەکانی پزیشکی و گەردوونی و وەرزش و رووداوەکانی فرۆکە و گرکان و گوومە لەرزەو ئاژەلّ وچەندین بوواری دیکە لە جیهاندا .

# زنجیرەی چاپکراوەکانی ساڵی ٢٠٠٩ی
# بەڕێوەبەرایەتی گشتیی ڕۆژنامەنووسی و چاپ و بڵاوکردنەوە
# بەڕێوەبەرایەتی بڵاوکردنەوەی هەولێر

| ژ | ناوی کتێب | ناوی نووسەر | بابەت | نرخ | لاپەڕە |
|---|---|---|---|---|---|
| ٣٦٢ | البعد السياسي للمشكلات القومية "الكرد نموذجا" | د.خليل اسماعيل محمد | دراسة | ١٠٠٠ | ١٠٤ |
| ٣٦٣ | خۆری نارابخا کەرکوک و ژیانی عەبدولڕەحمانی نفووس | زانیار سەردار | لێکۆڵینەوە | ١٠٠٠ | ١٠٤ |
| ٣٦٤ | الاعلام... والصحافة | صابر محمود عبدالله | دراسة | ١٥٠٠ | ١٢٠ |
| ٣٦٥ | هەڵوێستەکان، دەسکەوتەکان و وتارو دیمانەکانی (سەرۆک مسعود بارزانی) | ئا: مستەفا سلیم | وتارو دیمانە | - | ٥٥٢ |
| ٣٦٦ | لە درزی هزرەوە | بەهزاد حەویزی | وتار | ١٥٠٠ | ٢٥٦ |
| ٣٦٧ | توانەوە | غەفوور ساڵح عەبدوڵلا | ڕۆمان | ٢٠٠٠ | ٢٠٤ |
| ٣٦٨ | مصباح القلوب و مفرج الكروب | ملا عبدالرحمان ملا طه | الجزء الاول | ٦٠٠٠ | ٧٨٤ |
| ٣٦٩ | مصباح القلوب و مفرج الكروب | ملا عبدالرحمان ملا طه | الجزء الثاني | ٧٠٠٠ | ٨٩٦ |
| ٣٧٠ | ڕێزمانی ئامرازی پەیوەندی | د. شێرکۆ بابان | لێکۆڵینەوە | ٣٠٠٠ | ٣١٢ |
| ٣٧١ | مێژووی هونەری فۆتۆ | د. فەرهاد پیرباڵ | لێکۆڵینەوەی مێژوو | ٣٠٠٠ | ٩٦ |
| ٣٧٢ | پەلکە زێڕینە | سەید مەولود بێخاڵی | فۆلکلۆر | ٢٠٠٠ | ٨٠ |
| ٣٧٣ | کێ پەنیرێ من ڤەگوهاست؟ | و:ناهیدا دری | چیرۆک | ١٥٠٠ | ١٠٤ |
| ٣٧٤ | کانەبییان | ڕەزا سەید گوڵ بەرزنجی | ڕۆمان | ٢٠٠٠ | ٢٢٤ |
| ٣٧٥ | مناخس الالم | د.بشير الطوري | شيعر | ١٠٠٠ | ٢٢٤ |
| ٣٧٦ | مسرحيتان كوميديتان | عادل دنو | مسرحية | ١٠٠٠ | ٤٨ |
| ٣٧٧ | چنینەوە | د. لەتیف محەمەد حەسەن | شیعر | ٢٠٠٠ | ٤٤٨ |
| ٣٧٨ | کورد و سیستمی نێو دەوڵەتی | د.عوسمان عەلی میرانبەگ | لێکۆڵینەوە | ١٥٠٠ | ١٥٢ |
| ٣٧٩ | ئاسمانی گەڵا بابردووەکان | نەرمین جەعفەر | شیعر | ١٠٠٠ | ١٢٠ |
| ٣٨٠ | گۆڤەندێك لە هەڵبەست | موسی زاخۆرانی | شیعر | ١٠٠٠ | ١٠٤ |
| ٣٨١ | کەلەپووری کوردەواری | عەباس چنارانی | فۆلکلۆر | ٣٠٠٠ | ٢٨٨ |
| ٣٨٢ | تراژیدیای کوردان | وریا ڕەحمانی | ڕاپۆرتی سیاسی | ٢٠٠٠ | ٢٠٨ |
| ٣٨٣ | بانگهێشتێك بۆ سەرهەڵدان | ئاشتی فەلەکەدین | ڕۆمان | ٢٠٠٠ | ٢٠٨ |
| ٣٨٤ | لە پێناوی تازەگەریی فیکریدا | نەجات حەمید ئەحمەد | گشتی | ٢٥٠٠ | ٥٤٤ |
| ٣٨٥ | ئاگرپژێن و بوومەلەرزەکان | و: نەمیرە ئیسماعیل | زانستی | ٣٠٠٠ | ١٤٤ |
| ٣٨٦ | ملحمة سيامند وخجه | مصطفى خۆشناو حمو | لێکۆڵینەوە | ١٠٠٠ | ١١٢ |
| ٣٨٧ | گەشت و گوزار | قادر بارەجان | گشتی | ٥٠٠٠ | ٤٠٠ |
| ٣٨٨ | نامەیەك لە قوبرسەوە | ئازاد کەریمی | کورتە چیرۆك | ١٠٠٠ | ٨٠ |
| ٣٨٩ | چەند لایەنێك ژدیرۆکا ئیسلاما سیاسی | و. جەمال عەبدوڵا | لێکۆڵینەوە | ١٠٠٠ | ٩٦ |
| ٣٩٠ | چالاکیەکانی وەزارەتی ڕۆشنبیری/٢٠٠٨ | ئا: ڕوقیە عەبدوڵا | چالاکی | --- | ١٦٠ |

| ٣٩١ | جەژنێك بۆ پیر | ڕەووف مەحمود پوور | لێكۆڵینەوە | ٤٠٠٠ | ٣٦٨ |
|---|---|---|---|---|---|
| ٣٩٢ | دواپین هەستی ترسناك | سەرهەنگ جەمال | ڕۆمان | ١٥٠٠ | ١٣٦ |
| ٣٩٣ | پەرەسەندنی کوردستانی نوێ | و: جەمیل محەمەد ئەرگوشی | رامیاری | ٤٠٠٠ | ٦٤٠ |
| ٣٩٤ | فرمێسك و تەمەن و خەون | ماریە ئەحمەد | شیعر | ١٠٠٠ | ١٧٦ |
| ٣٩٥ | بركان التنهدات | دانیال شابۆ | شیعر | ١٠٠٠ | ١٦٠ |
| ٣٩٦ | دیپلۆماتیك | ماجید نوری | پرۆژە | ٥٠٠ | ٤٠ |
| ٣٩٧ | مێژووی هاوچەرخ | خالید هەرکی | مێژوویی | ٤٠٠٠ | ٦٦٤ |
| ٣٩٨ | ناوکبڕینی بۆشایی | محەمەد باوەکر | شیعر | ١٥٠٠ | ١٢٠ |
| ٣٩٩ | لەپێناوی تازەگەری فیکریدا - بەشی دووەم | نەجات حەمید ئەحمەد | گشتی | ٢٥٠٠ | ٤٠٨ |
| ٤٠٠ | ڕنسا | محەمەد وەسمان | پەروەردەیی | ٢٠٠٠ | ٨٠ |
| ٤٠١ | ستاتیکای شاکاری کوردی | تاریق کارێزی | شێوەکاری | ١٥٠٠ | ١٢٠ |
| ٤٠٢ | ماڵئاوایی | مجول ئیسماعیل | شیعر | ١٠٠٠ | ٨٠ |
| ٤٠٣ | کورد... عەرەب... شۆڤێنیزم | بەهرام محەمەد (کاکل) | سیاسی | ٢٠٠٠ | ٢٤٠ |
| ٤٠٤ | ڕەنگدانەوەی زەمبیل فرۆش لە ئەدەبی میللی کوردیدا | ئیدریس عەبدوڵلا | لێکۆڵینەوەی ئەدەبی | ٢٠٠٠ | ٢٤٠ |
| ٤٠٥ | ئەفسانەی میرە گوڵ | محەمەد ڕەشید فەتاح | ڕۆمان | ١٥٠٠ | ٢٦٤ |
| ٤٠٦ | کەلەپوورنامەی کوردەواری | یاسین حەسەن گۆران | فۆلکلۆری | ٢٠٠٠ | ٢١٦ |
| ٤٠٧ | کورتنووسی لە زمانی کوردیدا | وشیار بەشیر مستەفا | زمانەوانی | ١٥٠٠ | ٢٢٤ |
| ٤٠٨ | المدن ولعبة الاجيال | محمد مسعود محمد | دراسة | ٣٠٠٠ | ٣٧٦ |
| ٤٠٩ | أمتلىء عشقا منك | فريدون سامان | ترجمة شيعرية | ١٥٠٠ | ١٣٢ |
| ٤١٠ | هونەرێ ئەڤاندنێ | د. لەزگین ئاڤدرەهمانی | ڕۆمان | ٣٠٠٠ | ٢٠٠ |
| ٤١١ | خەزینا زانستی د (١٠٠٠٠) پرسیار و بەرسڤادا | محەمەد ساڵح پێندرۆیی | ڕۆشنبیری گشتی | ١٠٠٠٠ | ٨٣٢ |
| ٤١٢ | دیوانی خاڵۆ | مەهدی فاتیح | شیعر | ٤٠٠٠ | ٤٦٤ |
| ٤١٣ | گرافیکەکانی کوردستانی | محەمەد عارف | هونەری شێوەکاری | ٥٠٠٠ | ٦٧٢ |
| ٤١٤ | یۆگا | و: حەمید گەردی | گشتی | ٤٠٠٠ | ٦٢٤ |
| ٤١٥ | شەوێ بەیادی گەڕانەوەت | دەرباز یونس | شیعر | ١٥٠٠ | ٢٠٤ |

